

# رۆشنبیری نوێ



ژماره 108 ساڵی 1985

راپۆرتێکی تایبەتی بەبۆنەی تێپەربوونی 25 ساڵ بەسەر
کۆچی دوای مامۆستا رەفیق حلمی نەمردا.

## - لەم ژمارەیەدا -

# ڕۆشنبیری نوێ

ژمارە 108

کانوونی یەکەمی
ساڵی 1985

کۆڤارێکی وەرزیە بۆ لێکۆڵینەوە	دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی	دەری دەکات





نەخشەکێشان و دەرهێنانی هونەری نەسرین خضر

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الكردية	ساحه الخلانی بغداد/ تەلەفون ـ 8875795 پێنج خەتە

# پێ ناوی بۆ شەهیدانی وەتەن شیوەن وگرین



## ● «باوکی دانا» ●

شەهیـد رێـزو پایـەیێکی زۆر بەرزی هەیـە، خوای گەورەو میهرەبان موژدەی پێداون، کە شوێنیان بەهەشتەو نەمرن. .

شەهید. . ئەو مرۆڤ و قارەمانەیە کە لە پێناوی بەرگریکردن لە بیـرو باوەڕو پاراستنی وولات و بەرپـەچـدانـەوەی دوژمن و داگیرکەر سینگی خۆی دەکاتە قەڵغان و گیانی خۆی لە پێناویدا پێشکەش دەکات.

رۆڵەی خاکی پیرۆزی عیراقیش. . . هەر لە دێر زەمانەوە بە ئازایـەتیو دلێـریو شۆرشگێـریو نیشتمـانپـەوەری ناسـراون و هەرگیـزاو هەرگیـز درێغیـان نەکـردووەو درێغیش ناکەن لە پێناوی سەربـەخـۆییو سەربـەرزیو شکـۆمـەنـدی. . ئەگـەر بێت و لاپـەرەکـانی مێـژوو هەڵـدەینەوە دەبینین ناوی چەندان پاڵەوان و قارەمانی تێدا تۆمار کراوە. .

گەلی عیـراق قەت ملی بۆ داگیـرکـەرو ئیمپـریـالیزم و چڵکاو خۆرەکانی، کەچ نەکردووە، بەڵکو دەستیان خستۆتە نێو دەستی یەکتـرو بەرەو رووی دوژمن بوونـەتـەوە. . هەرچـەنـدە دوژمن هەوڵی دابێت بۆ تەگەرە خستنە بەردەم کاروانی تێکۆشانی. . . بەڵام کاروانی گەلی تێکۆشەری عیراق قەت نەوەستاوە. . .

شاعیـران و رۆشنبیـرانیش لەگەڵ کاروانی تێکۆشەران بوون و تووشی دەردەسـەریو چەرمـەسـەری بوون. بەڵام وورەیـان بەرنەداوەو لە کاروان جێنەماون. . هەردەم چقڵی چاوی دوژمن بوون. هەرچەندە دوژمن هەوڵی ئەوەی داوە دووبەرەکی بخاتە نێـو گەلی عیـراق بەڵام نەیتـوانیـوە، ئەگـەر بێت و سەیـری هۆنـراوەکـانی پیـرەمێـردو گۆران چەنـدان هەستیـاریتـری کورد بکەین ئەو راستیەمان بۆ دەردەکەوێت، کە شاعیری کورد دەرکی بە گرنـگـیـتـی یەکـێـتـی کوردو عەرەب کردووە، چونـکـە باوو باپیـرانمـان لە کۆنـەوە لەسەر ئەم خاکە پیرۆزەدا ژیاون و بۆ یەکتـر وەك قەڵغـان بوون بۆیـەش دوژمن هەرگیـز نەیتـوانیـوە زەفەریان پێ بنات.

لە هەمـوو شۆرش و راپـەرینێکـا گەلی عیـراق دژی دوژمن یەکیان گرتووە. مێژوو زۆر بە شانازیەوە لە دوو توێی لاپەرەکانیا

ئەم راستی‌یانەی تۆمار کردووە. . هەروەها شاعیران و رۆشنبیران داوای قوربانیدان و خۆبەخت کردنیان کردووە، واتە شەهیدبوون لەپێناوی نیشتماندا، چونکە هەروەك نازم حیکمەتی شاعیر دەڵێت:

«من نەسووتێم تۆ نەسووتێیت، ئەو نەسووتێ، چۆن لە تاریکی‌یەوە دەڕۆین بۆ رووناکی» بەڵێ. ئەگەر سەیری هۆنراوەکانی شاعیران بکەین دەبینین هەموویان باسی یەکێتی عیراق و برایەتی کوردو عەرەب و تێکۆشان دەکەن لە پێناوی سەربەرزی عیراقدا.

هەروەها زۆر بە شانازیەوە باسی شەهید دەکەن. . ئەو قارەمانانەی ،کە لە پێناوی خاکی وڵات گیانیان دەبەخشن هەروەك پیرەمێردی شاعیر دەڵێت:

پێی ناوێ بۆ شەهیدانی وەتەن شیوەن و گریَن

نامرن ئەوانەی والەدڵی میللەتا ئەژین

بەڵێ شاعیرانمان رۆڵەی دڵسۆزی ئەم گەلەن و بیرو باوەڕیان بە کاروانی خەبات و پێش خستنی گەل بەخشیوە، لە ریزی تێکۆشەران بوون و لەناو دڵی هەموو نیشتمان پەروەرێکدا بوون، جا بۆیە کە شاعیر دەڵێ پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین، مەبەستی ئەوەیە کە شەهید ئەو قارەمانەیە کە نیشتمان شانازی پێوەدەکات و باوەشی بۆ دەکاتەوەو لە لاپەرەکانی مێژووش ناوی بە شانازیە وە تۆمار دەکرێت و لەناو دڵی میللەتا دەژیت و خوێنیش دەبێتە نەوتی چرای خەبات و تێکۆشان و لەبەر ئەو روناکی‌یەدا گەل دەجەنگێت لە پێناوی شکۆمەندی‌و سەبەرزی، بۆیە نابێت بۆ شەهید بگرین بەڵکو شانازی پێوەبکەین و هەمان رێچکەی ئەو بگرینەبەرو ئەو ئاواتەی کە لە پێناویا شەهیدکرا. لە پێناوی هەمان ئاوات و ئامانج دا خەبات بکەین. . لە پێناوی پاراستنی وڵات و سەربەرزی‌و شکۆمەندی.

لە پێناوی خاکی پیرۆزی نیشتمان. . چونکە نیشتمان پێش هەموو شتێك لە هەموو شتێك پیرۆزترە، لە ماڵ و مناڵ و خزم و کەس وکار پیرۆزترە، مرۆڤ هەرچی لە کیس بچێت دەتوانێت بیگەڕێنیتەوە، بەڵام ئەگەر نیشتمانی لە کیس چوو قەت ناتوانێت بیگەڕێنێتەوە.

ئەمەیە بیرو باوەڕی مرۆڤی تێکۆشەر کە لە پێناویا گیان دەبەخشێت، لە پێناوی ئەو نیشتمانەی کە خاوەن مێژوویەکی مەزن و قوربانیەکی بێ‌سنورە. .

گیان زۆر ئازیزە بەڵام ئەگەر نیشتمان و خاکی پیرۆز پێویستی بە بەخشینی هەبێت لە پێناوی پاراستنی‌دا ئەوا، بەوپەڕی شانازیەوە بەرەو پیری دەڕۆین. .

گەلی عیراق لە پێناوی نیشتماندا بەو پەڕی شانازیەوە بەرەوپیری مەرگ دەڕۆن. . . لە پێناوی هەق و بیروباوەڕدا لە مردن سڵ ناکەن بەڵکو پێش برکێ دەکەن لەپێناوی شەهیدبووندا. . بۆ ئەوەی سەری چیا کەشەکانی کوردستان بەرزتر بێت و نەوی نەبێت. .

لەم راستیەوە. . گەلی عیراق لە جەنگی رەواماندا، جەنگی قادسیەی صدام، بە رابەرێتی شۆرەسواری ئازاو لێهاتوو صدام حسین بەرپەچی دوژمنیان دایەوە بۆ ئەوەی بە هەموو جیهان بسەلمێنن کە عیراقی بەعس زۆر لە نەخشەو پیلانەکانی دوژمن و بەکرێگیراوان بەهێزترە. .

جا ئەو شەرەی کە بەسەر عیراقیەکاندا سەپێندرا بێ‌گومان کاری لە هەست و هۆشی ئەدیبانمان کردووە، چونکە ئەدیب بەر لە هەموو کەسێك هەست بە ئێش و ئازارو بەختیاری گەلەکەی دەکات. .

جا کە عیراقی پێشکەوتنخوازو سۆشیالیست لەلایەن بەکرێگیراوەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم هێرشی کرایە سەرو شارو گوندەکانی درایە بەر تۆپ و دوژمن پڕ بە دەم هاوار دەکات کە نیازی داگیر کردنی عیراقە. .

دوژمن دەیەوێت ئەگەرە بخاتە بەردەم رێبازی شۆرش و دەسکەوتە مەزنەکانی گەلی عیراق. . بێ‌گومان ئەم بارو دۆخە هەستی ئەدیب دەجوڵێنێت هەروەها ئەو جەنگاوەرانەی کە سنیگی خۆیان کردۆتە قەڵغان و بە خوێنی گەرم و گەش خاکی پیرۆزی عیراق دەپارێزن و داستانی قارەمانێتی تۆمار دەکەن و ئێستاو دوارۆژی پرشنگداری عیراق دەپارێزن. .

خەندەی سەر لێوی کۆرپەکانمان دەپارێزن، دەسکەوتە

مەزنـەکـانی جەمـاوەر دەپـارێزن، سەربەخۆیی سیاسی و ئابوری دەپـارێـزن. . بێ‌گـومـان مایـەی شانـازیـەو هەستی ئەدیبـانمان دەجـوڵێنێت. . ئەدیبـانمـان تا رادەیێـك دەوری خۆیـان بینیـوەو خامەی پیرۆزی خۆیان خستۆتە کارو وەکو عیراقیەکی دڵسۆزو بەشەرەف.

هەست و نەستی جەماوەریان دەربریوە، بەوەی کە سەرکەوتن لە جەنگی ڕەوامانـدا جەنگی قادسیـەی صدام بۆ عیـراقیەکانەو بەربـەرچ دانـەوەی دوژمن بەرگـری‌کـردنـە لە کامـەرانی گەل و پێشکـەوتنی وولات و دەسکـەوتـەکـانی جەمـاوەرە. . هەروەهـا پەنجـەیـان بۆ یەکێتی عیـراق و برایـەتی مێژ ووی کوردو عەرەب درێـژکـردووە، هەروەهـا هانـی لاوەکـانـمـانـیـان داوە بۆ خەبـات کردن و قوربـانـیـدان. . وەپـەردەیـان لە لە ڕووی چەپەڵی ڕژێمی خومەینی جادووگەر هەڵداوەتەوە. . ئەگـەر بێت و سەیـری گۆڤارو ڕۆژنامەکان و نامیلکەکانی کوردی بکەین، بەتەواوی ئەو ڕاستی‌یەمان بۆ دەردەکەوێت. .

ئەوجا چ بە چیرۆك یا هۆنراوە یا ووتاری سیاسی. . لەمانە:

باوکـی ئاوات، باوکـی دۆسـت. باوکـی ئارا کە بەردەوام چیرۆکی جەنگی‌یان بلاوکردۆتەوەو تیایدا پەنجەیان بۆ پاڵەوانێتی جەنگاوەرانی عیراق درێژ کردووەو باسی قوربانیدان و خوبەخت کردن و ئازایەتی عیراقیەکان کردووە، کە چۆن پێش برکێ دەکەن بۆ قوربانیدان لە پێناوی خاکی پیرۆزی نیشتمان. .

هەروەهـا کاکی.شاعیـر (مکـرم تاڵـەبـانی) بە هۆنـراوەکـانی هەستی گەلی دەربریوە.

داستـانی قارەمـانێتی و ئازایـەتی لە بەرەکـانی جەنگـا لە باشـوورەوە تا باکـور بە جارێ هەژانـدویـەتی و وەك شاعیـرێکی کوردی دڵسـۆزو نیشتمـانپـەروەر هەستی خۆی دەربریوەو پەردەی لەسەر ڕووی چەپەڵی خومەینی هەڵماڵیوە. .

هەروەها مامۆستا مصلح جەلالی و برادەران ئەکر م مەحمود سەمین و فوئاد حسین و مولود حمد. . . هتد. .

بە ووتاری سیاسی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی کوردی‌دا زۆریان لە بارەی جەنگی ڕەوامانەوە، نووسیوەو بە تێرو تەسەلی هەموو لایەنەکانیان شی‌کردوتەوەو پەردەیان لەسەر ڕاستی هەڵداوەتەوەو باسی ئەو داستـانـانـەیـان کردووە، کە جەنگاوەرانی ئازاو دلێری عیراق تۆماریان کردوون.

هەروەها باسی باری شڵەژاوی ناوخۆی ئێران و کێشەی نێوان مەلاکـانیـان کردووە بەرامبـەر بەپێـەوی بەرەی ناوخـۆی عیراق و یەکێتی ڕۆڵـەکـانی و باوەڕیـان بە سەرکـردایـەتی پارت و شۆڕش لەپێش هەموویانەوە سەرەك کۆماری ئازاو دلێر صدام حسین.

جا ئەوەی مەبـەستمـانـە لێـرەدا ڕوونی بکـەینـەوە جەنگی قادسیـەی صدام. .ی نەمـرە کە نەوەکـانی کیسـراو ڕۆستـەم بەسەرمانیانا سەپاند.

بۆچی ئەم شەڕەیان بەسەرمانا سەپاند؟

پاش زیـاتـر لە تێپـەڕبـونی پێنـج ساڵ بەسـەر ئەم شەڕەو سوربـوونـی ڕژێمی خومـەینی لەسـەر خۆش کردنی ئاگـری جەنگ. . . وەلامی ئەم پرسیارە ڕوون بۆتەوە، ئەم شەڕە بەهۆی ناکۆکی نیە لە نێوان دوو وولاتی هاوسێی موسڵمان، کە عیراق لە یەکەمین ڕۆژەوە هەوڵی چارەسەرکردنی داوە.

بەڵکـو ئەمـە هەڵـوێستی کاربـەدەستـانی عەجـەمەکانە دژ بە عیـراق و نەتـەوەی عەرەبی، ئەگـەر بێت و سەیـری لاپـەڕەکـانی مێـژ وو بکـەین بەتـەواوی ئەو ڕاستی‌یـەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە عیـراق بەدرێـژایی مێـژ وو هەوڵی نەداوە کە شەر لەگـەڵ ئێـران بکات بەڵکو هەردەم باوەڕی بەوە هەبووە، کە ناکۆکی بە ڕێگەی ئاشتی چارەسـەربکـرێت، جگـە لەو حاڵەتە نەبێت، کە هێرش براوەتـە سەر خاك و ئاوی و بەنـاچـاری، چەکی هەڵگـرتـووەو بەرگری لە سەربەخۆیی و سەربەرزی خۆی کردووە.

جا پاش شۆڕشی 17 ـ 30 تەمموزی نەمرو چارەسەرکردنی بارو دۆخی سیاسی و ڕۆشنبیری و ئابوری و کۆمەلایەتی بە گوێرەی تیـورێکی زانستی و شۆڕشگێـرانـە لەژێـر سایـەی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست ، ئیمپریالیزم و کۆنەپەرست و بەکرێگیراوان هیچ دەرفەتێکیان نەما. .

شۆڕش لە سەرەتاوە ڕووی کردە ئاڵۆزترین مەسەلە کە وەك گرێ کوێرەیەك بوو، لە بەردەم کاربەدەستانی پێشووی عیراق، ئەویش مەسـەلـەی گەلی کوردمـانـە ئەوەبـوو بەیـاننامەی 11ی ئاداری ساڵـی 1970 وەك چوارچـێـوەیـێـکـی دروسـت

چارەسەرکردنی ئاشتی و دیموکراتیانەی مەسەلەی کوردی بلاوکردەوەو هیواو خواستی گەلی کوردی هێنایە دی بەمەش پەیوەندی برایەتی کوردو عەرەب خرایە مەودایێکی باشترو هەنگاوێکی فراوانی بەرەو پێشەوە نا. .

هەروەها دەستی کرد بە ئاوەدان کردنەوەی کوردستان و چارەسەکردنی نەبەڕەتی کشتو کاڵ و بلاوکردنەوەی هوشیاری کۆمەلایەتی و سیاسی و رۆشنبیری. . ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە گەلەکەمان زیاتر لە دەورویشتی شۆڕش گردبێتەوەو بیرو باوەڕی ڕەسەن لە ناخی دروونی گەلدا ریشەی دابکوتێت. ئەو حەلە گەلیش قوربانی دەدات لە پێناوی پاراستنی دەسکەوتە نیشتمانیەکانی. .

هەروەها شۆڕشی بەعس ڕۆژ لەدوای ڕۆژ توانی ئەوە بۆ گەل بسەلمێنێت، کە توانای فەرماندەیی گۆڕانکاری و هێنانەدی هێمنی و ئاسوودیی و سەربەرزیو سەربەستی نیشتمانی هەیە. .

هەروەها گەورەترین دەسکەوتی شۆڕش بیناکردنی مرۆڤی نوێی عیراق بوو. .

ئەو مرۆڤەی ئامادەیە بۆ قوربنیدان لە پێناوی پاراستنی شۆڕش ودەسکەوتەکانی جەماوەر. . ئیمپریالیزم و ئەلقە لە گوێکانی کەوتنە ا پیلان گیران دژی شۆڕشی بەعسی کە بەرژەوەندیەکانی لەم ناوچەیەدا هێنابووە لەرزین. . بە هەموو جۆرێك هەوڵیان دا تەگەرە بخەنە بەردەم کاروانی ئامانجە پیرۆزەکانی شۆڕشی عیراق بەلام نەیانتوانی ڕاستەوخۆ زەفەری پێ‌ببەن. . ئەوە بوو خومەینی بەکرێگیراویان هێنایە سەر تەختی حوکم بۆ ئەوەی لەژێر پەردەی ئایینی ئیسلامی پیرۆزدا بتوانێت نەخشەو پیلانەکانیان بۆ جێبەجێ بکات. . بەتایبەتی پاش ئەوەی بۆیان ئاشکرابوو کە شای گۆڕبەگۆڕ ناتوانێت ئەم دەورە بگێڕێت چونکە زۆر ئازاری پیاوە ئاینییەکانی دابوو. .

ئەوە بوو ئەو ریش پانە جلەوی حوکمی گرتە دەست و شۆڕشی گەلانی ئێرانی دزیو دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی پیلانەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم دژی عیراق و نەتەوەی عەرەبی لەژێر پەردەی ناردنی شۆڕش بۆ دەرەوەی وولات هەرچەند شۆڕشە ناموبارەکەکەی خومەینی دژی ئایینی ئیسلامی پیرۆزەو دژی خواستی گەلانی ئێرانە کە قوربانیەکی زۆریان دا لە پێناوی ئازادیو دیموکراتی کەچی دەبینین ئەو تێکۆشەرانەی کە دەوری سەرەکیان هەبوو لەبەرپاکردنی شۆڕش، یا لە دەرەوەی ئێران دان یاخود لە بەندیخانە بیناکردنی مرۆڤی نوێی عیراق بوو. .

ئەو مرۆڤەی ئامادەیە بۆ قوربانیدان لە پێناوی پاراستنی شۆڕش و دەسکەوتەکانی جەماوەر. . ئیمپریالیزم و ئەلقە لە گوێکانی کەوتنە پیلان گیران دژی شۆڕشی بەعسی کە بەرژەوەندیەکانی لەم ناوچەیەدا هێنابووە لەرزین. . بە هەموو جۆرێك هەوڵیان دا تەگەرە بخەنە بەردەم کاروانی ئامانجە پیرۆزەکانی شۆڕشی عیراق بەلام نەیانتوانی ڕاستەوخۆ زەفەری پێ‌ببەن. . ئەوە بوو خومەینی بەکرێگیراویان هێنایە سەر تەختی حوکم بۆ ئەوەی لەژێر پەردەی ئایینی ئیسلامی پیرۆزدا بتوانێت نەخشەو پیلانەکانیان بۆ جێبەجێ بکات. . بەتایبەتی پاش ئەوەی بۆیان ئاشکرابوو کە شای گۆڕبەگۆڕ یاخود لە سێدارە دراون. گەلی کوردیش لە کوردستانی ئێراندا کە دەوری سەرەکیان لەم شۆڕشەدا هەبوو بەو نیازەی کە بگەنە ئاواتی خودموختاری خۆیان کەچی خەلاتی ئاخوند بۆ گەلی کورد بۆردومان کردنی شارو لادێکان و لە سێدارەدانی لاوەکانی کورد بوو. . تێکۆشەرە عەجەمەکانیش حاڵیان لە کورد باشتر نیە بەڵکو بە ئاگرو ئاسن دەنگیان کپ دەکرێتەوە. . ڕاونان و ئازاردان و گرتن و لە سێدارەدانی تێکۆشەران بەردەوامە.

خومەینیو داردەستەکەی وەکو گورگ و سەگ بەربوونەتە گیانی خەڵك. جەماوەری ئێران بەتەواوی لێیان دوور کەوتونەتەوە چونکە لە سای سەری ئەم فێڵبازو بەکرێگیراوانەدا گەلانی ئێران ژیانیان بوو بە دۆزەخ و ئێرانیش لە هەموو بوارەکانی ئابوریو کۆمەلایەتیو ڕۆشنبیری دواکەوت. ئێستا گەلانی ئێران حەسرەت بۆ سەردەمی شای گۆڕبەگۆڕ دەکێشن. .

ئەوجا ئەم شەڕەی کە خومەینی فێڵباز بەسەرمانی‌دا سەپاند بە ئاواتی تەگەرە خستنە بەردەم ڕێبازی شۆڕشی 17 ـ 30 تەمموزی نەمر سەری نەگرت، چونکە مرۆڤی نوێی عیراق، کە شۆڕشی بەعس شانازی پێوە دەکات،

باوەری بە سەرکـردایـەتـی پارت و شۆرش زۆر بەهێـزەو لە پێنـاوی پاراستنی خاك و دەسکـەوتـە مەزنەکانی جەماوەرو ئێستاو دوارۆژی پرشنگـداری عیـراق و سەربـەستی و سەربـەرزی و شکـۆمـەنـدی لە مردن سڵ ناکاتەوە. . هەروەك سەرەك کۆماری تێکـۆشـەر صدام حسین دەڵێت: عیـراقی نوێ یەك حاڵـەتـە لە فاوەوە تا زاخـۆ. . هەمـوو بینـا دەکـەن و بۆ بەرگـری کردن لە نیشتمان دەجەنگێن. . هەموو پر باوەرن بە پاشەرۆژ و هیوای فراوان».

واتە عیراقیەکان بە کوردو عەرەب و کەمایەتیەکانیەوە باوەریان بەسەرکردایەتی زۆر بە هێزەو درێغی ناکەن لە خۆبەخت کردن لە پێنـاوی پاراستنی ئەو دەسکـەوتـانـەی کە لەژێر سێبەری شۆرشا بۆیان جێبەجێ کراوە.

هەروەهـا عیـراقیـەکـان بۆیـان سەلمێنـدراوە، کە رژێمی خومەینی تاوانبارەو ئەو شەرەی بەسەرماندا سەپاندووە بۆ ئەوەی دەسـەلاتی ئیمپـریـالیـزم بۆ ناوچـە بگەرێنێتەوەو سوریشە لەسەر درێژەپێدانی جەنگ.

لەو کاتـەی عیـراقی مەزن بەرابـەرێتی پێشـەوامـان صدام حسین تێدەکۆشێ لە پێناوی ئاشتی و چارەسەرکردنی گیروگرفتی نێـوان هەردوو وولات لەم روانیـنـەوە عیـراق زۆر بەگـەرمی پشتگیـری هەمـوو ئەو هەنگـاوە ئاشتیخـوازانـەی کۆمـەڵ و ئەو دەوڵەتانەی کردووە، کە کەوتنە نێوان هەردوو لا، بەلام رژێمی خومەینی بەکرێگیراو سەرەرای بەزینی لە هەموو بەرەکانا سورە لەسەر ئەم جەنگە و بە کوشت دانی لاوەکانی ئێران جا هەروەك سەرەك کۆماری تێکۆشەر صدام حسین دەڵێت: دوژمن ناتوانێ لە شکـاوی بەولاوە هیچی تـر بدۆزێتـەوە، لەسـەریـەتی ئەگـەر پاشـمـاوەی عەقـڵ لای حوکـم راکـانـی ئێـران ماوە وەلامی پێـداویستی سەردەم و گەلان و سەربـەستی بدەنـەوە کە ئەوەیـە عیـراق سەربـەست بژی و ئیـران سەربـەست بژی، کەسیـان دەست درێـژی نەکـەنـە سەر ئەوی‌تـریـان و هەریـەکەیان رێزی سنـوری ئەوی‌تـریـان بگـرێ و دەست نەخـاتـە کاروبـاری‌یـەوەو سوپاکان بگەرێنەوە سنوری دەوڵەتی و رێککەوتنی ئاشتی مۆربکرێ.

هەروەك سەرەك کۆمار دەست نیشانی کردووە دوژمن جگە لە مل کەچ کردن بۆ ئاشتی هیـچ رێگـایێکی‌تـری لە بەردەمـا نیە، ئەگینـا عیـراق ناچـارە کە زۆر بەتـوندی لێ‌بدات و گشت دەزگا ئابوریەکانی وێران بکات تا کرنۆش دەبات و دان بە مافی رەوای عیراقدا دەنێت.

سەرکەوتنیش هەر بۆ عیراقە چونکە ئێمە لەسەر هەقین بۆیە خوای گەورەو میهرەبانیش لەگەڵ ئێمەدایەو سەرۆك صدام حسین کە شۆرەسوارێکی ئازاو لێهاتووە رابەرێتمان دەکات و دەورێکی سەرەکـی هەیـە لە سەرکـەوتنمـان. . هەروەك فەرمـانـدەی دامەزرێنەر هەڤال میشیل عفلق دەڵێت «هاورێ صدام حسین نمـوونـەی پلەی بێ‌هـاوتـای کارامـەیی و داهێنـان و پێگەیاندنی تیـوریـەکی کاربـوو کە هەمـوو رواڵـەتـە تایبـەتیـەکـانی واقیعی وولات و رواڵـەتـە تایبـەتیـەکـانی هەمـوو قۆنـاغێ لە قۆنـاغـە شۆرشگێـریـەکـانی بگـرێتـەخـۆ لە چوارچێـوەی ئاسـۆی گشتی جوولانـەوەی عەرەبی، کە دەسـەلاتی دانـا لە خزمـەتی بیـرو باوەرداو تەرخـانی کرد بۆ خزمـەتی گەل. هەمـوو ئەم هۆو لاو رواڵەتانەی کە لەدوای جیاوازی تاقیکردنەوەی عیراقەوەن. بوون بە هۆی ئەوەی عیـراق بتـوانێ بەرپـەچی دەست ـ درێـژی خومەینی بداتەوەو سەرکەوتن دابین بکات».

ئازایـەتی جەنگـاوەرانی عیـراق بەرابـەرێتی سەرۆکی پیشـەوا صدام حسین لە سەرانسـەری جیهاندا دەنگی داوەتەوە، بەرامبەر رووڕەشی و بەزین و چەپـەڵی و درنـدایـەتی رژێمی خومـەینی رەگـەزپـەرست کە چەنـد جارێـك دیلەکـانی عیراقی گوللەباران کردووە. . کە لە هیچ یاسایەکی زەمین و ئاسمانا نەهاتووە دیل بکوژرێت. .

بەلام ئەم ئەڵقە لە گوێیانەی ئیمپریالیزم و ئایینی ئیسلام کوجا مەرحەبا. .

نەمری و سەربەرزی بۆ شەهیدە قارەمانەکانمان کە بەخوێنی پاکیان داستانی سەرکەوتنیان لە قادسیەی صدام تۆمار کرد. .

سەرکەوتن بۆ گەلی عیراقی مەزن بە رابەرێتی شۆرەسواری ئازاو لێهاتوو صدام حسین.


سەرچاوەکان:

1 ـ الصراع العراقي الفارسي بغداد /1983

2 ـ گۆڤاری روشنبیری نوێ ژمارە 106 ساڵی 1985

3 ـ بەیان ژمارە 106ی نیسانی ساڵی 1985

4 ـ وتاری سەروك کۆمار لە هەولێر 1985/4/4

5 ـ وتاری فەرماندەی دامەزرێنەر لە 1985/4/7



# ڕۆژی شەهیدان ڕۆژی سەرکەوتنی عیراق و عیراقی یەکانە

● سمیره محمد علي ●

لەم ڕۆژە گەلی عیراقی مەزن، لەسەرتاپای عیراق دا ئاهەنگ بە بۆنەی ڕۆژی شەهیدانەوە دەگێڕن. . ڕۆژی شکۆدارەکان کەوا وادەو بەڵێنی خۆیان بە جێ‌هێنا، گیانی پاکی نازداریان کرد بە قوربانی زەوی‌ی پیرۆزو ئازیزی عیراق و شەرەفمەندی گەل و ئاسایشی، گیانی خۆیان لە پێناوی نیستاو پاشەڕۆژی عیراقدا بەخشی.

شەهیدان لە گیانی گەل و نەتەوەو بیری مێژوودا نەمرن وەکو نیشانەیێکی قوربانی‌دان و فیداکاری دەمێننەوە نیشانەی پاڵەوانیەتی‌و قارەمانیەتین ،وەکو ئەم ڕۆژە پێش چوار ساڵ دوژمنی ئیرانی رەگەزپەرستی کینە لە دڵ و خوێن رێژ تاوانێکی گەورەی دەرحەق بە مرۆڤایەتی کردووە، کە هیچ یاسایێك لە دنیادا، هیچ رژێمێك لە مێژووی جەنگ دا کردەوەی نارەوای وای نەکردووە، ئەویش کوشتن و تیرە باران کردنی دیلەعیراقی‌یەکان لە شەڕی بسیتین دا ڕۆژی 1981/12/1 هەرچی ڕێکەوتنامەی نیو دەوڵەتی هەیە لە بارەی دیلی جەنگ کردەوی وای تێدا بەدی ناکرێت، چونك هەمیشە بەندو یاسای چاکی تیایە بۆ مامەڵەکردنی دیلەکان بە شێوەیێکی مرۆڤایەتی. .

دوور بێت لەکوشتن و برین، بەڵام خومەینی خوێن مژ بە مەشەوە نەوەستا، هاتوو، کردەوە چەپەڵەکەی لە ئەوردوگای گورگاندا ڕۆژی 1984/10/2 دیسانە دووبارە کردەوە، دیلە عیراقییەکانی داوتە بەرگوللەو تیر بارانیکردوون.

دوژمنی ئێرانی خوێن ڕێژ ئەم کردەوە پیس و چەپەڵانەی کە دەیکات کینە لەدڵ و ڕقە بەرایەتی خۆی بە درێژایی مێژوو، دژی گەلی عیراق و وولاتی عەرەب، دەردەبڕی دوژمنایەتیو تاوانباری خۆی بەرامبەر بە وولاتەکەمان .. بەمە بەڵگەیێکی تری ئاشکرای زیادکرد بۆ لە ڕێ لادانی ئایینی ئیسلامیو بیروباوەڕەکانی ئەوەشی سەلماند کەوا بەم کردەوە ناپاك و چەپەڵانە بازرگانی بە ئیسلام دەکات وەکو سەرپۆشێك بە کاری دەهێنێ بۆ بیروباوەڕو ئامانجە چەپەڵەکانیو هێنانەدی تەماعکاریو فراوانکاری، بەڵام ئەوەی دەردەکەوێت ئایینی ئیسلامی دووره لەم تاقمە بێمێشك و گەوجەو لەو ڕێرەوە ناپەسەندەی گرتویەتیە بەر، تائێستا ڕژێمی ئێرانی تاوانبار.. بە خراپی لەگەڵ دیلە عیراقییەکان دەجوڵێتەوەو هەرچی ڕژێم و یاسا هەیە لە وولاتان نارەزایی خۆیان دەربڕیوە، بەڵام خومەینی تەلەکەبازو داروەستەکەی دەڵێی بایەکەو بەلای گوێیانەدا دەڕوا، بە پێچەوانەی عیراق کەوا هەمیشە مولتەزیمەو بە باشی مامەڵەی دیلە ئێرانییەکانی کردووە ئەویش بە شەهادەتنامەی دەستەی نێودەوڵەتیو ڕێکخراوی خاچی سوور.

هەرچەندە شەڕی دوژمنکاری عیراق و ئێران پێی ناوەتە شەشەمین ساڵەیەوە عیراقییە بە جەرگ و نەبەردەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەوە دووپات دەکەنەوە کەوا هەمیشە ئامادەن بۆ فیداکاریو قوربانیدان لە پێناوی نیشتیمانی ئازیزو مەزن و بەرگریکردن لە سەربەخۆیی عیراق و بیروباوەڕەکانی شۆڕشە مەزنەکەیو دەستکەوتەکانی... تائێستاش عیراقییەکان بۆ بەر بەرەکانی جەنگ، بە بەرەکانی سەربەرزیو شەرەفمەندی کێبڕکێ دەکەن ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، وورەیان بەرزتر دەبێ ،بێ هێزیو نائومێدی نازانن چییە، بەو پەڕی هیواو ئازایەتییەوە دەجەنگن چونکە هێزیان لە سەر کردەی ئازیزو خۆشەویستمان هەڤاڵی تێکۆشەر صدام حسین وەردەگرن

هەروەها گیانی خەباتیشیان هەر لە سەرکردە ئازیزەکەمانەوە وەردەگرن، چونکە نیشانەی قارەمانیەتیو ئازایەتی عیراقەو لە مێژووی عیراقیدا سەرکردەی وا ئازا دەرنەکەوتووە. کە ناوی عیراق و ئابرووی عیراق بپارێزێت، سوپای بە جەرگی عیراق لە هەموو بەرەکانی جەنگدا (زرباطیە، جەسان، ڕۆژهەڵاتی بەسرە ـ سیدەکان، حاج ئومەران، ڕۆژهەڵاتی دیجلە ـ عزێر .. هتد) بەو پەڕی بە جەرگییەوە جەنگاون بە زەبری تۆپ و تفەنگ و مووشەك و فڕۆکە، ئێرانی دوژمن بە عیراقیان لەت و پەت کردوە، لاشەی دوژمنیان لە گۆڕەپانەکانی شەڕ پرش وبڵاوکردۆتەوە. خومەینی واز ناهێنێت نەوجەوانان و منداڵانی ئێران بەنارەوا بەرەو ئاگرە سوورەی شەڕ ڕەوانە دەکات بەبێ ئەوە کە هیچ قازانج و هیچ شتێکی دەست بکەوێت لە نوشوستیو شکاوی زیاتر ،مێشکیان دەپرژێ، خوێنیان دەرژێو ئەوەشیان لێدەمێنێتەوە بە نا ئومێدی دەکشێنەوە دواوە.. خومەینی بەرەو چ گۆماوێکی خوێناوییان دەبات؟

خومەینی بۆ وادەکات؟

خومەینی چی دەوێ؟

خومەینی تاکەی لە سەر کەللەرەقیەتیو مل هوڕیەتی خۆی دەمێنێتەوە؟

بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانە دەڵێین خومەینی دەیەوێ عیراق داگیربکات و بیکاتە گۆڕەپانێکی کوشتارو وێرانی ،ئەمەش بێگومان دەبێتە مایەی لە دەست چوونی سەربەخۆییو، وون بوونی هەرچی شۆڕش هێناویەتەدی. خومەینی کوێرایی‌دا دێ کە عیراق وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن شارستانیەتیی پێشکەوتوو ببینێت. گەلی عیراق و سوپای عیراق بوونەتە پەرژینێك لە سەرانسەری سنووری عیراق، بەرگری لە عیراقی مەزن دەکەن. قەڵایەکن سنگیان لەبەر گوللەو تۆپی دوژمندا. ڕاگەتووە بۆ پارستنی سەربەرزی عیراق ـ لەبەر ئەوە ناوی شەهیدەکان لە بیر ناچێتەوەو بەگەرمی یادیان دەکەینەوە، لە دڵمانا دەنگ دەدەنەوە، لە گوێمان ناویان دەزرنگێتەوە.

تاقمی گومان لێکراو تا دێت ڕق و کینەی بەرامبەر عیراق و گەلە ڕاگرتووەکەی زیاتر دەبێت و چ تۆپ و چەکی هەیە کە لە زەمانی شای گۆڕ بە گۆڕدا کۆکرابووەوە هەمووی لە شەڕی ئەم چەند ساڵەی ڕابوردوودا بە کار هێنا هیچی بۆ نەکراو هیچی بۆناکری هەمووی، ئەم کردەوە ناپاك و درندایەتیەی خۆی - ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هێزەکانیان دەشکێت و ناتوانن بستێك لە زەوی عیراقی مەزن بە چاو ببینن. . ئەو زەوییەی باوباپیرانمان هەر بە پیرۆزیو پاکی دەمێنێتەوە هیچ دوژمنێك نەك خومەینی بەڵکو چ قەزافی شێت و چ حافظ ئەسەدی دایك جوولەکە ناتوانن پیلان دژی عیراق و گەلە ڕاگرتووەکەی سازبکەن ،وە هیچ هێزێك لە جیهاندا ناتوانێ پشتمان لە زەویبدات ،چونکە نەبەردین دەست دەخەینە چاوی دوژمنەوە بۆ ئەوەی مافی خۆمان بپارێزین تۆبەیان پێ بکەین و جارێکیتر نەتوانن بیر لەوە بکەنەوە کە زەرەر بە عیراق بگەیەنن، دەجاڵە داماوەکانی قوم و تاران با تێبگەن، بەڵام کورد ،واتانی ئەو کەسە کەسە حەرفێکی بەسە، شەش ساڵەی جەنگ هیچ تێنەگەیشتن سوپای عیراق و گەلە نەبەزەکەی ئامادەیە شەش ساڵیتر بجەنگن و هەتا هەتایەو بە ئومێدو بە هێزێکی نوێیەوەو بە تواناتریش دەبن، 40 ملیون ئێرانی تووش کەساسیو داماویو دەردەسەری بوون بە دەست ئەم دەجاڵە گەوجە بە شۆڕشێکی سەرتاپاگیر نەبێت لە ناو ناچێت ،ڕۆژی نزیك بۆتەوە بەڵام بە دەست کەس لە ناو ناچێت، مەگەر بە دەست عیراقییەکان نەبێ ،هەر عیراقییەکان لە ناوی دەبەن.

بەڵێ گەلی خوراگری عیراق سەرکەوتوەو هەمیشە سەردەکەوێت بە قوربانیو فیداکاریو ئەو بایەزەردەی لە ئێرانەوە هاتووە تێکیان شکاند، عیراقیان لە دەست درێژکاری ئێران پاراست، پاڵەوانانی عیراق، جوانترین و پیرۆزترین داستانی پاڵەوانییەتی و خۆڕاگرتن و کەوتنیان تۆمار کرد. ئەوەشیان سەلماند کەوا ڕۆڵەو نەوەی ئەو پیاوە مەزنانەن کە بە درێژایی مێژوو دژی دوژمن جەنگاون و بەسەریدا سەرکەوتوون و بیروباوەڕی دادوەریو ڕاستیو ئاشتییان بڵاوکردۆتەوە، دەوری کوردو کەمایەتییەکانی تری عیراقی دیسانەوە دیارو ئاشکرایەو شان بە شانی برا عەرەبەکان سەریان لە دوژمن شێواندوە وەکو گەلێکی یەکگرتوو بە ناوی عیراقەوە دەجەنگن و ناویان چووەتە لاپەڕەکانی مێژووەوە، لە شاخەکانی کوردستان تا دەگاتە زەڵکاوەکانی خواروو دەستی عیراقی بەرزو دیارەو عیراق دەپارێزێت. حوکمڕا گومان لێکراوەکانی ئێران هێشتا هەر خەو بەوە دەبینن گەلی عیراق مل کەچ بکەن، بەڵام بە هەڵە چوون و خەیاڵیان خاوە ووێڵن، ئەم خەوە پڕوپوچەڵانەیان قەد بۆ نایەتە دی.

ئێمە لەم ڕۆژە نەمرە لە مێژووی تازەماندا ووتە بە نرخەکەی سەرەکی فەرماندە (صدام حسین) مان بیردەکەوێتەوە کە دەفەرموێت [شەهیدان لە هەموومان شکۆدارترن. . ] ئەم ووتە بە نرخە لاپەڕەی پرشنگدارو شەرفمەندەیمان لە جەنگ وەبیردەخاتەوە، کە چۆن ئەو پیاوە مەردانە دڵسۆزانە گیانی پاکی خۆیان بەخشی لە پێناوی بەرگریکردن لە عیراق و ئەو سەرکەوتنە مەزنانەمان وەبیردەخاتە کەوا بە خوێن تۆماریان کرد.

لەم ساڵەدا کەوا بەبۆنەی ئەم ڕۆژە پیرۆزەوە ڕۆژی شەهیدان ئاهەنگ دەگێڕین ،هەست بە دڵنیاییەکی گەورەو بڕوا بە خۆبوون و پاشە ڕۆژ دەکەین، ئەو عیراقەی کەوا شەهیدانی گیانی خۆیانیانی بۆ بەخشی هەمیشە پارێزراوو سەرکەوتوو دەمێنێتەوە

## شەهیدبوون و کاری بنیاتنانی مرۆڤی نوێ لە جەنگی قادسیەی صدام‌دا

نرخی شەهیدان بە درێژایی مێژوو ڕەسەنایەتێکی بە خۆیەوە وەرگرتوە بۆ هۆی ڕۆحی واتە گیانیو بیروباوەڕ بووە، هەروەها مردن هەمیشە لە پێناوی بیروباوەڕ ڕێگایەك بووە بۆ گەیشتن بە پلەی قارەمانیەتیو ئازایەتیو قوربانیدان - ڕێگایەکە بۆ ڕەچاوکردن و گۆڕینی لە واتا وسیفاتی بیری بۆ ڕاستییەکی هەست پێکراو و چەند شێوەیێکی گرتۆتەوە، بە درێژایی ساڵان شەهیدان، بوونەتە نیشانەیێکی نەمر کە جێگای ڕێزلێگرتن و

شانازی پێوەکردنن ـ بوونەتە نموونەیێک لە هەموو بوارەکاندا پەیڕەویان بکرێن ـ هەرچەند مێژووی تازەمان سەری هەڵدایەوە، تێگەیشتنی (مفهومي) شەهیدبوون زیاتر پەیوەندی بە بیرو باوەڕو سەربەخۆییەوە پتەو بوو. شەهید بە نەمری لە زەمیرو دڵ ودەروونـدا بە زیندوویی دەمێنێتەوە هەروەها بەخشش تا ڕادەی قوربانیدان و شەهیدبوون ئەوە دەگەیەنێت کەوا هاوولاتی عیراقی کاتێك شەهید دەبێ وشەرەفی شەهید بوون وەردەگرێ لە جەنگی قادسیەی صدام دا. قوربانی دەدات و بەرگری لە پێناوی تاقیکردنەوەیەك دەکات کە تەمەنی تا ئێستا زیاتر لە (17) حەڤدە ساڵەو ئەم عیراقییە بەشدارییەکی زۆری کردووە لە بنیاتنانی وولاتەکەیو لە لێپرسینەوەی بنیاتنانیدا هەست بەوە دەکات کەوا ئەم تاقیکردنەوەیە کاتێك تووشی مەترسی دەبێت و دوژمنان چاوی تەماحکاری تێدەبڕن... دەبێ ئامادە بن بۆ بەرگری لێ کردنی لێرەدا تاقیکردنەوەیێکی سەرتاپاگیر وەدەردەکەوێت کەوا هەموو گەلی عیراق و ملیونەها کەسیان دەگرێتەوە ،تاقیکردنەوەیێکی تایبەتە خۆی پەروەردەی کردووەو لێپرسراوێتی.

بەخششی عیراقی لە جەنگی قادسیەی صدام هەمیشە پەیوەندی بە بنەڕەت و پێوان هەیە بە ئاشکرا توانای شۆڕش دەردەبڕێت بۆ گەیشتنی دەروونی مرۆڤی عیراقیو بنیاتنانی باوەڕی جەنگی..

ئەمەش سەرکەوتنی سوپاییو زانیاری وسایکولۆژی ودەست دەهێنێت و ڕاگرتنی بەرەکانی جەنگ و بەرەی پەرەپێدان و پێشکەوتنی شارستانیەتی بەردەوام دەبێت

لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کەوا جەنگی قادسیەی صدام، باری سایکۆلۆژیو وورەی گەلی عیراقی ڕۆژ بە ڕۆژ بەرزتر کردووە بە هۆی ئیرادەی بەرهەڵستیکردن و سووربوون کەوا بە سەر توانای بەردەوامیان بۆ جەنگ ڕەنگی داوەتەوە وبەردەوام سەرکەوتنی سوپاییان تۆمارکردووە بە درێژایی بەرەکانی جەنگ کە دەگاتە زیاتر لە هەزار کیلومەتر، هەروەها گەشەسەندنی ئابووری وولات و ئامادەکردنی پێویستییەکانی ئاسایش و هێمنی بۆ هەر بستێکی خاکی عیراق. ئەمانە پاڵنەری چاکن بۆ پاراستنی وورەو گیانی سەرکەوتن، لە لایەن مرۆڤایەتییەوە کەوا ڕەسەنایەتی بیروباوەڕی حزبی سەرکردە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست دەریبڕی ڕێز لێنانی شەهیدەکانەو ئەو بایەخ پێدانە بێ هاوتایەی حزب و شۆڕش داویەتی بە خێزانی شەهیدان و دان نان بە قارەمانیەتیو ئازایەتییان، جێگەی شانازیکردنە، لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی جەنگدا، شەهید بوون لە پێناوی نیشتیمان تاقیکردنەوەی شۆڕشگێری لە عیراق وای لێهات ببێتە بەرزترین مەدالیا، تێکۆشەرەکان و هەموو بە شەرەفمەندەکان کەوا لەگەڵ شۆڕش و حزبن وەریبگرن بەشداریکردن لە بەرەکانی جەنگدا وای لێ هات ببێتە داواکارییەك بۆ هەموو عیراقییەکان.. عیراقی خودی خۆی تێدا وەدیدەهێنێ بەڵێن و پەیمانی بۆ نیشتیمان و نەتەوەو شۆڕش و سەرکردایەتیە مێژووییەکەیو لە سەرووی هەموویانەوە سەرەکی لێهاتوو وە شاسواری نەتەوە (صدام حسین) تازە دەکەنەوە، تاقیکردنەوەی بەعسی پێشڕەو لە مەیدانی بنیاتنانی سایکولۆژیو بیری مرۆڤ ئەوە دەسەلمێنێن کەوا شەهیدبوون وەکو نرخێکی بەرز پلەو پایەی قارەمانیەتی بێهاوتاو جیاکەرەوەیە..

بەم جۆرە عیراقییەکان هەر وەکو سەرەکی تێکۆشەر صدام حسین خوا بیپارێزێ دەفەرمێ (کاتێك هەرەشە لە نیشتیمان دەکرێت پێویستە هەموو لە سەنگە ڕێکدا بن کەوا نیشتیمان دەپارێزێت و پەرژینی بنەڕەتی لەژێر سەرکردایەتی ئەو بەشەی چوونەتە ریزی سوپاوە ـ ئەمە نموونەیێکی بێ هاوتا دەبێت بۆ قوربانیدان و فیداکاری، لە پێناوی گەل و نیشتماندا...

سەرچاوەکان

1 ـ ڕۆژنامەی الثورە ژمارە ـ 4945، ساڵی 1983/12/1
2 ـ ڕۆژنامەی الراصد ژمارە ـ 762 ساڵی 1984
3 ـ ڕاپورتی ناوەندیی نۆیەم گۆنگرەی هەرێمانە ـ حزیران ساڵی 1982

شەش سالێ بورین لەسەر شەرێ مەزنێ پاراستنێ

# شەرێ قادسیا صدام

جسیم ابراهیم دوسکی

ئەم بابەتە لە کۆڕێکی فراوان دا لە ناوچەی (سمێل)دا بە بۆنەی تێپەربوزونی پێنج ساڵ بەسەر جەنگی رەوامان دا پێشکێش کراوە

1 ـ هندی باشترە سەرکەفتن مەزنترە.

2 ـ بوچی بو شەر؟

3 ـ ئارمانجا عیراقێ چ بۆ؟

4 ـ سەرکەفتن دەستکەفتەکێ نوی بو.

5 ـ بزاڤێت پێك ئینانێ د دەمێ شەریدا.

6 ـ هنـــدی باشتـرە سەرکـەفتن مەزنتـرە گەلێ عیـراقێ بەرف سالا شەشـــێ ڤە چو لگـــەل شەرێ مە یێ پیـــروز شەرێ قادسیـا صدام و عیـراق موکـوم ترە و بهێنتـرە ژ هەر دەمەکی و ڤان پێنج سالێت بوری گەلێ عیراقێ پتر ئێك گرتی بو و کرە شانەکا ب ئیکڤە مایی و دەست ژ ئێك بەرنە دا و بەرڤ چوتا سالا شەشێ ژ شەری و بسەر بلندی بو هەمی عیراقیا بوری ژ دەمێ بنەجیهـ کرنا روحا سەرکەفتنێ و گەهشتنە سەرکەفتنا دیماهیێ یا کو دوژمنا پێ زانی بەری هەڤالا. ئو دیار بونا بنەجیهـ کرنا روحا سەرکەفتنێ ئەو بو کو نەهێـلای خومـەینی زفـرینا لەشکرێ عیراقێ بو توخیبێ بخـــو بکـــار بینیت بو موکـــوم کرنـــا بنگـــەهێت خوییێت لەشکەری. ژ داخازیا رەنگێ نوی یێ شەری کارکرنا هاو ولاتیێت عیـــراقی ژلایێ لەشکـــەریو سیـــاسی بو رابـونێ بشـەری توخیبی و بەردەوامیـا شەری چونکی ئەو یەکـەمین رێکە بو گەلێ عیراقێ بو بدیماهی ئینانا شەری دژی رژێما خومەینی.

2 ـ بوچی بو شەر و بوچی درێژ بو؟

دیار بو ژ راگەهاندنا ئەمریکی و صەهیونی کو د هاڤێتە عیراقێ و پاڵڤە دانەکا دیار د دەتە ئیرانێ و ئەو باش دزانن ئەگەر و ئارمانجێت شەری چنە و دسەر هەمیێ را پاڵدانا ئیـــرانێ دکـر و خەلـك تێت گەهـانـد کو عیـراقێ یادەست بشـــەری کری و ئەو باش دزانـن کاکـێ دەست پێ کریـــە جونکی یا دیار بو بو هەمی جیهانێ ئەگەرێ شەری چونکو گەلەك جارا رژێما ئیرانێ دوو بارە دکر بەری شەری و د دەمێ شەریدا و هەتا ڤێکاڤێ کو بوچی ئەڤ شەرە کر دژی عیراقێ. بپشتی رژێما شاهی چوی بچەند روژەکا خومەینی راوەستـا و دیـارکـر ئارمـانـج و پیـلانێت خو بو بەلاڤ کرنـا شورەشـا خو ئەوا د بێژنێ (شـورەشـا ئیسـلامی) لجیهـانا ئیسلامێ چونکی ما نا وێ د ناڤ ئیرانێ دا دیماهیا وێ روخیان و هەرفتنە ڤێجا دەست بێکر ژ عیراقێ و ئارمانجا وی ئەو بو گهـورینـا حوکمێ عیـراقێ برێکا راکرنا هەڤرکیا ناڤخویی و چەك کرنا وێ و فرێکرنا لەشکەرێ ئیرانێ بو داگیـر کرنـا عیـراقێ. خومـەینی و کرێگـرتێت وی دەست بشەری کر دژی عیراقێ ئەڤە هەمی رژێما خومەینی دیار کر بەری شەری باشـــە دێ چەوا حوکـم لعیـــراقێ ئێتـــە گوهـــارتنێ و عیـراق ئێتـە داگیـر کرن و شورەشـا وی ئێتـە بەلاف کرن بێ شەر؟

ئەڤە دیار بو ئو دەلیل یێت پێ هەین ئو گەلەك ژێ یێت چوینە رێکخراوا دەولەتێت ئێك گرتی دا بێنە سەحکرنێ بو

دیار کرنا یێ دەست بشەری کری.

لڤێــرێ دیــار بو کو نە بەس خومــەینی بریــارا شەری دا بەلکو دەست پێ کر بو پێك ئینانێ بلەشکەری و بزاڤ کرن بو تێپەرینێ لتوخیبێت عیراقێ.

3 ـ ئارمانجا عیراقێ یابدروستی چبو؟

ئەرێ هەر دەولەتەکا هەبیت ئەگەر دیت کو جیرانێ وێ .بێ خوبێك دئینیت بو ئێرش کرنێ لسەر دەولەتا دی بکارێ لەشکــەری بجهـ ئینــا ئەرێ دێ چکــەت؟ لڤێــرێ دوو رەنــگــێـت بەرسڤێ یێت هەین ئێــك ژ ێ ئەوە کو راوستت هەتا کو ئێرش دێتە سەر و بەس بەیانا و ئاخفتنا دژ ی وێ بکــەت و دەست بشکــایێتــا بکــەت و شنــوی بزاڤێت رزگار کرنێ بکەت و ئەو هەمی چ نائینیت، وەکی هندە رژێمێت عەرەبی کری لگەل ئیسرائیلی کو وان دزانی بدروستی کو دێ ئیسرائیل ئێرشێ ئینتە سەر ئەردێ وا و ئەوا بئاخافتنێ و بەیــانێت بێ فایــدە دکــرە هەــەوار هەتا کو ئەردێ وان داگیر بوی وخەلکێ وێ دەربەدەر کری وەکی (حافظ اسد) کری کو جولان و لبنان بدەست صەهیونیا ڤە بەردای.

و هندی بەرسڤا دووێ یە ئەوە کو دەلیڤێ نەدەتە دوژمنێ خو کو دربێ خو دانیت و ئەو بەرێ لێدەت ڤێجا ئان برێکا لیدانا بنکەهێت دوژمنی ئان ئێرشێ بکەتە سەر کو دەلیڤێ بدەست ڤە بەرنەدەت و بێتە گوهارتن جهـ و دەمێ شەری وشــەر بێتــە کرن لســەر ئەردێ دوژمنی لڤێـرێ یێ بریــارا شەری دای و دەست بشەری کری نەشێت ئارمانجێت خو بجهـ بینیت و وولات دێ ئێتە پاراستن و گوند و باژێر دێ ئێنە پاراستن و بهزارا مروڤ دێ ئێنە پارستنێ.

عیــراقێ ئەڤ رێکــە بژارد کو لێــدانــا بنگەهێت هێزێت خومــەینی وچارەســەر کرنــا ئێــرشا وی لسەر ئەردێ عیراقێ بشتی عیــراقێ نەشیــایی برێکــا ئێمنــاهیێ ڤێ گفتــو گوێ بدیمــاهی بینیت ئارمــانجــا عیراقێ ئەڤــە بو کو نەهێلیت خومــەینی ئێــرشێ بکــەتــە سەر عیــراقی و ئەردێ وێ داگیر کەت ئینا قوماندار یا پارت و شورەشێ بریارا مێرانە دا روژا 1980/9/22 و هێزێت ئیرانی پاشڤە برن.

4 ـ سەرکەفتن دەستکەفتەکێ نوی بو.

شورەشا 17 ـ 30 تیرمەها پیروز گەلەك دەست کەفتێت مێــژ ویی یێت مەزن دابــون وەکی خومــالی کرنــانــەفتێ و ئوتونومی بوگەلێ کورد و بدیماهی ئینانا هەڤرکیێت نافخویی پبێك ئینانا بەرا نیشتمانی و پێك ئینانا چڤاتا نیشتمانی و نەهێلانا نەخویندەوایێ و گەلەك ژ دەستکەفتێت دی. بەلێ دەستکەفتێ سەرکەفتنا عیراقا صدام لسەر هێزێت خومەینی ئەوێت کو دهــاتــە هژمــارتنێ هێــزا پێنجێ بو د جیهــانێ دا ئەڤ سەرکەفتنە هاتە هژمارتن لگەل دەستکەفتێت دی یێت شورەشێ و پاراستن بو بو دەستکەفتێت دی چونکی ئەگەر خومەینی ئێرش کربا و عیراق داگیرکربا دا دەستکەفتێت دی هەمی بەرزەبن.

ئو سەرکــەفتنــا عیــراقێ ژ هەمی لایــەکی و تایبــەتی ئەو دربێت ئاســمــانی ئەوێت فروکێت عیــراقێ دانــاینــە جەزیرا (خــەرج)ژ روژا 1985/8/15 و هەتــا ڤێــگــاڤێ درب لدیف دربی و ناهێلن کار و بارێت جارەســەرکــرنێ کاری تێدا بکەن و ئاگری ژێ بتەمرینن و سوتنا خەرج یا ئیرانی دربــەکــا مەزن بو بو رژێمــا ئیــرانی جونکــو ئەو سەروکــانیا دوژمنــداریــا شەرێ خومــەینی بو. و عیــراق بگــەلێ خویێ قارەمــان ڤە نەبــەس لشــەری بســەرکــەفت بەلکو سەرکەفتنا عیراقێ یا دیارە لهەمی لایێت دی ژ لایێ ئاڤاکرنێ و پێشڤە چونێ و خوجهیا وێ لناڤ دەولەتێت جیهانێ.

5 ـ بزاڤێت پێك ئینانێ ددەمێ شەریدا

عیراق نە خازتیێ شەری بو

بەلکو خودانێ حەقی بو

عیراقێ نەدڤیا ببیتە شەر و هەر بزاڤە کا هاتیە کرن بو پێك ئینانێ عیراقێ گەلەك هاری کاری یا بو دای هەر ژ سەرێ شەری و هەتــا ڤێگــاڤێ وەکی روژا 1980/9/28 سەروکێ قومــانــدار صدام حسین ی دیــار کری کوئــەم د ئامــادەینــە بو پێــك هاتنێ چەنــد هاریکــارییێت هاتینە کرن ژلایێ کونگــرا ئیســلامی و رێکخــراوا دەولــەتێت ئێك گرتی و ژ لایێ دەولــەتێت بێ لایــەن (عــدم الانحیــاز) ڤە

بەرسڤا وان عیراقێ گەلەك لاو یادای ئوجیهان هەمی بێ دزانن هەروسا عیراقێ گەلەك بزاڤ کرن کو شەر چێ نەبیت ژ سەرێ شەری بەلێ سەر رەقیا رژێما خومەینی و دوژمنداریا وا بو عیراقێ و گەلێ عەرەبی بەلکو گەلێ ئیسلامی هەمیێ بو ئەگەرا شەری و چەند دەست درێژی و زێدەکاڤی لسەر باژێر و گوندێت عیراقێ کرن ژ روژا 1980/9/4 و هەتا 1980/9/22 و ئەڤە چەند ژ وان زێدەکاڤیا:

1) 9/4 گولله باران کرنا مەخفەر و باژێرێت عیراقێ (4) جارا و توپ باران کرنا مەندلی و زرباطیا و نەفت خانە

2) 9/5 توپ باران کرنا مەخفەر و باژێرێت عیراقی (4) جارا

3) 9/6 گولله باران کرنا مەخفەر و باژێرێت عیراقێ دیسا (4) جارا

4) 9/7 گولله باران کرنا مەخفەر و ئەردێ عیراقێ (3) جارا و تێپەرینا فروکەکا لەشکەری (سمتیه) لئاسمانێ عیراقێ

5) 9/8 گولله باران کرنا مەخفەر و گوندێت عیراقێ شەش جارا و تێپەرینا فروکەکا لەشکەری یائیرانی و توپ باران کرنا وێ باژێر و مەخفەرێت عیراقێ (2) جارا.

6) 9/10 گولله باران کرنا مەخفەر و ئەردێ عیراقێ جارەکێ.

7) 9/11 توپ باران کرنا نەفتێ و تێپەرینا فروکەکا لەشکەری یائیرانی لئاسمانێ عیراقێ.

8) 9/12 گولله باران کرنا فروکەکا عیراقێ یا مەدەنی و ئێرشێت فروکێت لەشکری لسەر مەندلی (3) جارا و گولله باران کرنا پاپورا عیراقی یا تەدریبێ لدەڤەرا (شط العرب).

9) 9/14 گولله باران کرنا گوندێت عیراقێ جارەکێ.

10) 9/15 گولله باران کرنا زەورەقەکا دەوریێ ل (شط العرب) و توپ باران کرنا نەفتێ لخانقین

11) 9/16 توپ باران کرنا بیرێت نەفتێ لدەڤەرا میسان و تێپەرینا زەورەقەکا لەشکەری یا ئیرانێ لئاڤا عیراقێ.

12) 9/17 گولله باران کرنا پاپورەکا عیراقی

13) 9/19 گولله باران کرنا مەخفەر و گوندێت عیراقێ لدەڤەرا بەصرا.

14) 9/20 گولله باران ژ سەفینەکا ئیرانی بو دەوریاتێت عیراقێ لبەصرا. و تێپەرینا دوو فروکێت لەشکەری لئاسمانێ عیراقێ.

15) 9/21 گولله باران ژ زەورەقەکا لەشکەری یا ئیرانی بو رەخێ عیراقێ و گولله باران کرنا پاپورەکا بەریتانی و (برج سیطرة الموانئ العراقیة)و پاپورەکا کویتیو حەفارەکا عیراقی .و توپ باران کرنا نەفتێ لدەڤەرا بەصرا و پاپورەکا ستفافوری ل(شط العرب) رافعەکا عیراقی گولله باران کرنا (امریة خفر السواحل العراقیة) لدڤەرا بەصرا و توپ باران کرنا مەندلی و خانقین و قرەتو.

هوسانێ بو وە دیار بو کو رژێما خومەینی یاشەر خواز ئەو بو یا تەعەدا کەر و دیسا ئەوە یا دەست پێکەر و ئەڤ زیدەکاڤێت مە بو هەوە رون کرین و لگەل هندەك زێدەگاڤیێت دی وەك سوتنا قونصلیا عیراقي ل (محمرة)و یوپەج کرنا کەل و پەلێت وێ و سوتنا ئالایێ عیراقێ ل پایتەختی و دیسا بەلاڤکرنا گوتارا ل روژناما و ئێزگێت خومەینی دژی عیراقێ و فرێکرنا کرێ گرتیا بوناڤ عیراقێ دا زەرەرا بگەهیننە ئاشتیێ و تە ناهیا میللەتێ عیراقێ دیسا مەزن و وەزیرێت ئیرانێ هەمی دەما ل وەعز و خیطابێت خو دا هێرش د برنە سەر عیراقا 17 ـ 30ی ئێرمەهی بەرامبەر ڤان کارێت نە مروڤایەتی و بەرامبەر ڤێ تەعدایێ و دەست درێژیێ عیراق نەچار بو کو بەرەڤانیێ ژ خوبکەن و ئاخ و دەستکەفتێت خو بپارێزیت ئەڤجا سوپایێ عیراقێ یێ دلشێر زیانەکا مەزن ژ مالی و مروڤا گەهاندە رژێما خومەینی یانە فام و ژ روژا ئێکێ یا شەری هەتا ڤێکاڤێ لەشکەرێ حەقیێ لەشکەرێ قادسیا صدام هەریێ سەرکەفتیە و بئانەهیا خودێ دێ هەریێ سەرکەفتی بیت و ئەڤ لە لەشکەرەدێ گەلێ ئیرانێ ژ زولم و تاریستانا خومەینی رزگار کەت.

# سەلاحەددین لە شەڕفرۆشانی خاچدروشمان (خاچ پەرستان) شەڕەکەی کڕی

د. موحسین محەمەد حوسەین
کۆلێجی پەروەردە / زانکۆی بەغدا

## پێشەکی:

هەر کە وتەی «شەڕفرۆشتن» بەرگوێمان دەکەوێت، مێژوونووسە بەناوبانگەکەی بەریتانیا «ئەرنۆلد توینبی»و بیردۆزەکەیمان دێتەوەیاد کە ڕووداوەکانی مێژووی پێ لێکداوەتەوەو بە بیردۆزەی «شەڕفرۆشتن و شەڕکرین»[1] ناسراوە، هەروەها ئەو وتەیەشیمان دێتەوەبیر کە لە بارەی «چاکییەکان یان باشییەکانی بەڵا»وە[2] وتوویەتی، بەڵێ ئەوە بە تاقیکردنەوەی توانای خۆبەخۆی ئەو میللەتە دادەنرێت کە تا چ ڕاددەیێک بۆیدەکرێت دەستەویەخەی ئەو شەڕفرۆشییە ببێتەوە.

موسوڵمانانیش بە درێژایی مێژووی تەمەندرێژی خۆیان لە ڕووی شەڕفرۆشییێکی زۆردا چوونەتە نەبەردو لەو سەریشەوە بە تینێکی زیاترو سەربەرزییێکی شۆخترەوە گەڕاونەتەوەو هەموو شەڕپێفرۆشتنێکیش لەوانەی پێشووی زیاتر کارامەییو شارەزایی تازەیتری بۆ ڕەخساندوون و وورەیانی قایمتر کردووە. شەڕفرۆشیی خاچدروشمانیش یەکێک بووە لەو شەڕفرۆشییانەی کە بەخەیانی گرتووە. ئەو شەڕفرۆشییە کە بە شێوەی دەستدرێژییێکی ئاشکرا ڕوویدا بزووتنەوەیێکی بەرفراوانی بارخستن و نشینەیی بەدوواهات و ئاواکارییێکی (الاستیطان) تەواو کەناراوەکانی شامی گرتەوە هەر لە ئەنتاکیاوە کە کەوتووەتە باکوور تا گەیشتە عەسقەلان و (کەرەك) کە کەوتوەتە ئەوپەڕی باشووری ئەو کەناراوانە، سەرەڕای (بەیتولمەقدیس)و میرنشینەکەی (ئەلڕەها) لەناوچەی جەزیرێ.

موسوڵمانانیش کاتێک لە قورسایی ئەو مێردەزمەیە بەخەبەرهاتن، دیتیان کە وا وولاتەکەیان لەلایەن خاچدروشمانی داگیرکارەوە داگیرکراوە بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو دەستوبرد هێزو توانای مەیدانداریو ڕووبەڕووبوونەوەیان بەبەرخۆدا هێنایەوە ئنجا شەڕکڕیاری لە ناوەوە، واتا جموجووڵی بەرگری لە ڕێی

**زیندوکردنەوەی توانای پڕ شارەزایی‌و چاوکراوەیی‌و لە ڕێی دووبارەڕاستکردنەوەی دۆخی خۆیاندا، بوو بە چاوگەی ژیاندنەوەی خۆبەخۆی بزووتنەوەو چالاکی. ئەم کارەش ئەوەی چاك بوو کە لە قۆناغی ڕەنگدانەوەی چاولێپۆشی (السلبی)یەوە هاتە سەر قۆناغی بەرپەرچدانەوەی ڕاست و دروست بین و چاوکراوە، دەنا نەدەبوو.**

**بێگومان، ئەوە شتێکی ئاسایی‌بوو کە ئەو کارە شەڕفرۆشی‌یە دەستدرێژکاری‌یەی خاچدروشمان کردیان هەر دەبوو بەرپەرچدانەوەیێك - دوای ماوەیەکیش بێت - دروست بکات و خەباتێکی نارێکوپێکیش بهێنێتەگۆڕێ، ئەوەبوو لە سەرەتاوە ناشی‌یانەو بەبێ شارەزایی‌یێکی تەواو. شێوازی ئەو خەباتە ناتەواوە دیاری‌کرا، هەرچەندیشە شەڕفرۆشی‌یەکە قووڵ و گران بوو. ئەو دەستدرێژی‌یە هەندەرانکارە - کە خۆی لەخۆیدا شەڕفرۆشی‌یە - لە شەرکریاری‌ی ناوەوە بەهێزتربوو، بگرە ئەمیان لەویانەوە هەڵقووڵاو دروست بوو. چونکە شەڕفرۆشی‌ی هەندەرانکار وەزەنی بۆ مان و ژیان هەیە، هەرچی شەرکریاری‌ی ناوەوەشە ئەمەیان شەرکریاری‌یەکە بۆ چۆنێتی‌و چاکەی ئەو مان و ژیانە دێتەمەیدان، جا با بزانین ئەو شەرکرینە لە خاچدروشمانی شەڕفرۆش چۆن چۆنی ڕووی‌داو بە چی گەیشت.**

## لێکۆڵینەوە

موسوڵمانان - چ فەرمان بەدەست و چ گەل - لە سەرەتاوە ئەوەندە گوێ‌یان نەدایە ئەو داگیرکاری‌یە ناکاوەی لە ووشکانی‌و لە دەریاشەوە قەوما، چونکە لەشکرو هێرشی داگیرکاران - هەرچەندیشە گەورەو گران بوو - بەڵام لەوە نەدەچوو کە مەترسی‌یێکی گەورەی لێ‌بووەشێتەوە، بەتایبەتیش وولاتی موسوڵمانان لە[illegible]هاتووانەی کە پشتیان لە ژێر باری گرانی دواکەوتوویی‌ی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپادا چەمابووەوە، شارستانێتی‌یێکی ڕەسەنترو سامانێکی پترو دەوڵەمەندترو شارنشینتر هێزێکی زیاترو نشینەیێکی زۆرترو جبەخانەو خاروباری ئامادەو پوختەتر بوو، بەڵام دۆخی رامیاری‌ی موسوڵمانانی ڕۆژهەڵات ئەوەبوو پچڕپچڕ بوون و یەکێتی‌یان نەبوو بەتایبەتیش وولاتی شام کە بووبووە مەیدانی دەستدرێژکاری‌ی خاچدروشمەکان. لەو سەرزەمینەی شامدا مل ملانێ لە نێوان میرە سەلجوقی‌یە هاوکینەکاندا بەرپابوو بوو، بە تایبەتیش دوای مردنی (تەتش) لە ساڵی 488ك - 1095زدا، ئەوەبوو دوای خۆی ،هەردوو کوڕەکەی (ڕەضوان و دەقاق) لە حەڵەب و دیمەشق جێگەیان گرتەوە، هەروەهاش ئەو دەورەی کە (فاطمی)یەکان لە میصردا گێڕایان، ئەوەبوو «مەلیك ئەلئەفضەل شاهنشاه» کە وەزیری خەلیفەی فاطمی‌یەکان بوو، بەرەو قودس هات و خستی‌یە سەر میصر. دۆخی ڕۆژهەڵات لە سەدەی پێنجەمی کۆچی‌دا کە سەدەی یازدەهەمی زایین دەگرێتەوە، ئاوەهابوو کە باسمان کرد. هەرچی دۆخی موسوڵمانانی ڕۆژئاواش بوو، واتا (ئەندەلوس و سقیلە)وە نەبێ لە هی ئەمان باشتربووبێت ،چونکە ئەستێرەی خیلافەتی ئەمەوی‌یەکانی ئەندەلوس بەرەو ئاوابوون دەچوو، ئسپانی‌یەکانیش لە باکوورەوە بە ئامانجی دەرکردنی موسوڵمانەکان دەستیان کرد بە بزووتنەی (سەندنەوەی ئسپانیا)، هەروەها نۆرمانیش لە ساڵی 409ك - 1018ی زایندا بۆ یاریدەدانی ئسپانیان کەوتنە لەشکرڕانی. سەرەڕای ئەوانەش تای گاورانی ڕۆژئاوا لە تەرازووی ناوجەرگەی دەریای ناوەڕاستدا کەوتە لاسەنگی‌و پیزایی‌یە ئیتالی‌یەکانیش ئەوەبوو لە ساڵی (407ی‌ك - 1016ی‌ز)دا دورگەی سەردینیایان داگیرکرد، نۆرمانیش دوای شەڕێکی سی ساڵە کە تا ساڵی 484ی‌ك - 1091ی‌ز[ت] درێژەی کێشا دورگەی سقلیەیان لە موسوڵمانان سەندەوە. هەلومەرجێکی وەها هیچ جێگای سەرسوڕمانی تێدانی‌یە کە ببێتە هەلێك و بنەمایێکی دەم شیرینکەری هەندێك لە نۆرمانەکان - بە میر بۆهەمەندیشەوە -و فەرەنگەکانیش سەربار، کە دەم لەوە داچەقێنن چ لە ڕۆژهەلات و چ لە ڕۆژئاوادا چەند پاشانشینێك بۆ خۆیان دابمەزرێنن. لەبەرئەوە ئێمە دەڵێین کە هێرشەکانی خاچدروشمان بۆ سەر ڕۆژهەڵات تەواوکاری‌یێکی زنجیرەی ئەو

هێرشانەبوون کە لەوەپێش لە ڕۆژئاوادا سازکران، مێژ وونووسی بەناوبانگیش (ئیبنولئەثیر) هەروەهای ووتووە (کە لەمەودا ئەوەش دەبینین)[4].

لە ساڵی (490ی ك ـ 1095ی ز)دا پاپا فەرەنسایی یە شەرخوازەکە (ئوربانی دووەم) خۆی بە فیت و گاڵدان پاپایەتی یەکەی بە خەبەر هێناو ڕای پەڕاندو دەستی کرد بە کۆششی یەکخستنی توانای خەڵکەکە بە لەناوبردنی پاشاگەردانی ی دەرەبەگی و نەهێشتنی خراپەکاریی سوارچاکان و لێخوڕینیان بەرەو ڕۆژهەڵات کە لەوێ دەستەڵاتی خۆیان بسەپێنن و ئالای خۆیانی لێ هەڵکەن. ئەو دەورەی ئەو کابرایە لەوەدا گێڕای وەکو یەکێك وایە کە بە هاش وهەوش گیانی ڕق و کینە لە دەروونی خەڵکی دا بهەروژێنێت و بە ووتاردان و درۆو دەلەسە هەموو شتێکی ڕاست و ڕاستەقینە لە بەرچاوی ساکارو نەفامان لێڵ بکات و بی یان خەڵەتێنێت و وەهایان لێ بکات بکەونە دووی خەیاڵی شتێك کە دەنگی هەبوو، ڕەنگی نەبوو. جاروبار دەماری کەللەشەقی ی تێدا دەبزواندن و جارجارەش ئاگری کینەی ڕەگەزپەرستی ی لە دڵ و دەروونیاندا خۆش دەکرد. بەڵام ڕاستی یەکەی ئەوەبوو کە پاپایەتی (بەو هەموو فروفێڵەشەوە) نەیتوانی مەبەستی ڕاستەقینەی دڵی خۆی بشارێتەوە، ئیتر نیشانەی گەنجینە ژێرزەوی کەوتووەکان و دەشتە بە پیتەکان و مەملەکەتە گەورەکان و بازرگانی یە .قازانج مسۆگەرکراوەکانی عیراقی؟ هەموو بۆ هەڵ دان کەوا گشتیان چاوەڕوانی ئەوانن.

ئەم ڕەفتاری قایل کردن و تامی دان و لیك ڕاکێشان و دەمارئاژنینە، واتا «ئەم کرداری مێشك شۆشتنە» بە شێوەیەکی بەردەوام دەکرا تا خاچدروشمان کەوتنەخۆو لە ماوەی دوو سەدەدا هەشت لێشاوی دوابەدوای یەکیان بە پشتووی جیاواز لەیەك هێنایە سەر وولاتی موسوڵمانان.

ئەگەر بۆ هۆیەکانی سازدانی ئەو هێرشانە بگەڕێین کە خاچدروشمان کردیان دەبینین کە پاپایەکی وەکو ئەو کابرایە یەکێکە لە ڕیزی چەند هۆیەکی تریشدا، کە شاو سوارچاك و میرەکانیش یەکێکن لەو هۆیانە، ئەمانەش دەیانویست نیازی اترسناکبازی و داگیرکاری و وولاتانگیری و دەستەڵاتداری ی خۆیان وەدی بهێنن ـ لێشاوی بەردەوامی نورمانەکانیش ـ لەو ڕۆژانەدا ـ کە لە باکوورەوە هەڵدەقوولاو ملیان لە دەریاکان دەناو لە ڕووباران پەڕینەوەو بەرەوئنگلستان و فەرەنساو ئیتالیاو سەردینیاو سقلیە دەهاتن ئەوەش هۆیەکە لەو هۆیانە. دواییش بازرگانانی ئیتالی و بوندوقی و جنێفی و بازرگانە پیزایی یەکان و بازرگانانی تریش کەوتنە چاوەچاوی ئەوەی بازرگانی ی وولاتی ڕۆژهەڵات بگرنە دەستی خۆیان و ڕچەو ڕێگای ڕۆژهەڵاتی ئاوەدان و پڕ سامان و شارستان بۆ خۆیان بەتاڵان ببەن.

بە کورتی، ئەو شەڕانە ئەنجامێك بوو لە ئەنجامەکانی ئەو کۆنگرەیەی کە ئەو پاپایە لە شاری «کلیرمۆنت» لە فەرەنسەدا بانگی کۆبوونەوەی بۆ هەڵدا.

خۆ ئەگەر شەڕەکانی خاچدروشمان ـ بە لایەنی کەمیشەوە ـ بە شەڕی گاوران و موسوڵمانان دابنێین و بەو چاوە سەیری بکەین، ئەوا دەتوانین لەم ڕووەوە بە دەماری ئەو بزووتنەوەیەی دابنێین کە لە ڕۆژئاوادا (بزووتنەوەی سەندنەوە)یان پێ دەگوت و ئەم جارەیان ملی نا لە ڕۆژهەڵات، دەشتوانین بنەمای هاوبەشی هەردووکیشیان پیشان بدەین کە لە هەردوو ناوچەکەدا بریتی بوو لە شمشێرپاچی گەلی موسوڵمانان. بەڵام وا دیارە کە گاورانی ڕۆژئاوا وولاتی ئەندەلوسیان بە موڵکێکی پەتی ی خۆیان دادەناو دواییش وەها دەرکەوت کە لە کوشتاری عەرەبی موسوڵمانی ئەو وولاتەدا قرکاری و بنەبڕکردنێکی توندوتیژ یان خستەکار.

بەڵام ئامانجی ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵاتدا وا دەرکەوت کە دەیانویست هێزەکانی ئیسلام ـ کە هێزی کارهەڵسووڕێنی ناوچەکە بوون ـ بە جارێ لەناوببەن ـ هەر بەو جۆرە، ڕۆژئاوا ـ کە د. حەسەن حەبەشی پێی وایە ـ سەرگەرمی ئەوەبوو کە هەندێ ناوچەی عەربنشینی ڕۆژهەلات لە چوارچێوەیێکی ئەوتۆدا بکەن بە ماڵ کە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی یەکانیش پێکەوە بە مەبەستی جێکردنەوەو ·اکدنی ئەورووپایی یەکان[5] تێیدا بکەونەکار،

لەو تێبینی یانەش کە سەرنجیان ڕاکێشابێت ئەوەیە «، مێژوونووسی گەورە ـ ئیبنولئەثیر ـ لە باسی شەڕەکانی

خاچــدروشـمــانـــدا که له سالی (491ی‌ك ـ 1098ی‌ز)دا له باکووری شام گچکه شارەکەی ئەنتاکیایان داگیرکرد، وای بەلاوە باش بوو که باسـەکـەی یەکـەوڕاست بەو شـەڕانـەی ئەندەلوس و سقلیـەوە دەست پێ‌بکـات که له نێـوان موسـوڵمـانان و گاوراندا ڕوویدا. ئەمـەش ئەوەمـان بۆ دەردەخـات که ئەو مێـژ ووننووسە دنیادیتەو شارەزایە بە ووتەی ڕەوان بزووتنەوەی خاچدروشمانی له قوڵـەکـانی ئسپـانیـاو سقلیـەو باکووری ئەفـەریقـاو شامـدا پێکـەوەبـەسـت و بە یەك بزووتنـەوەی دانـا، شـەڕەکـانی خاچدروشـمـانیشی له ئەنـدەلـوسـدا کرد بە ڕچەی ووتەو باسی شەڕەکانی شامیان. ئەوەتا ئیبنولئەثیر له باسی ڕووداوەکانی سالی (491ی‌ك)دا ـ ئەوەی ووتمان ـ دەڵێت: «دەوڵەتی فەرەنگ له سەرەتـای دامـەزران و ڕەگـداکـوتان و بەهێزبوونی‌دا بەرەوووڵاتی موسوڵمانان هاتن و له سالی (471ك ـ 1085ی‌ز)دا هەندێکیان داگیـرکـرد، ئەوەبـوو له ووڵاتی ئەنـدەلـوس شاری (تـولەیتولە)و هەنـدێ شاری‌تـریـان گرت، ئەوجـا له سالی (484ی‌ك ـ 1091ی‌ز)دا بەرەو سقلیـە چوون و ئەویشیـان کردبـەمـاڵ و، لایـانـدایـە کەنـارەکـانی ئەفـەریقـاش و (واتا تونس) هەندێکیان لێ‌کـرد بەمـاڵ و لێیـان سەنـدرایـەوە، دوایی جێگـەی‌تـریـان لێ‌دەسـتکـەوتـەوە. کاتێکیش سالی (490ی‌ك ـ 1098ی‌ز) هاتەبەرەوە ئەم جا بەرەو ووڵاتی شام کەوتنەرێ»[6]

واتا ئیبنولئەثیر بە چاوێکی گشتبین (نظرة شمولیة) سەرەنجی لەو مەتـرسی‌یـەی دەرەوە داوەو هەر دەسـتـدرێـژی‌یەکیش تووشی هەرلایێکی جیهانی موسوڵمان نشین بووبێت چ له ڕۆژهەڵات و چ له ڕۆژئاوادا بە لقێکی ئەو لێشاوە گەورە داگیرکاری‌یە بەتەگبیرە ڕێکـوپێکـە دەستـەنقەستەو گەلەکۆمەکتامێزە له قەڵەم داوە که بۆ لەنـاوبـردنی گەورەتـرین هێـزی شارسـتـانێتی‌ی ئەو سەردەمـەی سەدەکـانی ناوەڕاست، واتـا بۆ ڕامـاڵکـردنی دەوڵەتە عەرەبەکەی موسـوڵمـانـان کەوتبـووە لرفەو له نرکەو لوورەدا [illegible] بووەستێت، له لایـەکـ[illegible]ـەوە ئەم مێـژ ووننـووسـە بە چاوە تیـژەکـ[illegible]ی هۆی سەرکـەوتنی ئەو داگیـرکـاری‌یـە سێ‌قـوڵی‌یـە پڕدەستکـەوتـە دەستـووبـردەی سەرکەوتنی ئەو داگیرکاری‌یەی بە تەواوی دۆزی‌یـەوە که بریتی‌بـوون له ڕەفتـاری پچـڕپچـڕی‌و دووبـــەرەکی‌و ئیـــرنـــەخـــۆری‌و بی هیممـــەتی‌ی ئەمیرە موسوڵمانەکانی زووتر، ئەوانەی که دەوڵەتەکەی ئیسلامیان دامـەزرانـدبـوو[7] ڕای مەردانـەی ئەو مێژ ووننووسە بۆ ئەمڕۆش ـ هەرچەندیشە سەدەی ئەو تا ئەم سەدەیەی ئێمە[8] سەرزەمانێکی دوورودرێـژ یـان کەوتـووەتە نێوان ـ لەگەڵ ئەو ئەرکە پیرۆزەی که پێـویسـتـە مێـژ ووننـووسێکی پاك و ڕاستی‌خـواز چ عەرەب بێت و (چ عەرەبیش نەبێت) بچێتـە ژێـر بـاری له هەر کاتێکـدا نیشتمـانـەکـەی تووشی مەتـرسی‌ی داگیـرکـاری‌ی سەربـازی‌و ڕامیاری‌و شارستانێتی‌ی بیانی‌یان بێت نەخوازەلا بەو شێوە ئاڵۆزو گرانەو بەو چەکە قڕکەرە بە هێزترانەی که ئێستا هەیە،[9] یەك دەگرێتەوە؟

ئێمـە لێـرەدا باسی کارەسـاتی سەربازی‌و درێژەی چەنوچۆنی‌ی ئەو کارەساتانە ناکەین چونکە تەنیا ئەو ڕەشەکوژە دڕندانەیەی له یەك شاردا کردیان که مەبەستمان شارەکەی قودسە بەڵگەیێکی ئاشکـرای ئەو کارەسـاتـە خوێنینانەیە، ئەوەبوو لەو شارەدا کەوتنە شمشێـرپـاچی گەردنی موسـوڵمـانـان و سەربـڕی‌یەکی ئەوتۆیان نایەوە مووچرکە بە دڵ و دەروونـدا دێنێت، بە جۆرێك که خوێنی بێ‌تـاوانـان بە شەقـامـەکـانـدا چۆڕاوگەی بەست و بگرە لافاوی خوێـن دای له ئاوزەنـگـی‌ی ئەسـپ سوارانـی خاچــدروشـم، که ئێـوارەش داهـات و ڕۆژئـاوابـوو، دیـاربـوو که تینـووێتی‌ی دەروونیـان بە خوێنی موسوڵمانان شکاندووە، جا ئەوجا چوون و بە ڕیز ڕوو له خوای گەورە بۆ سوپاسگوزاری‌ی ئەو سەرکەوتنەی که بەسەر عەرەب و موسـوڵمـانـانـدا پێی بەخشیـون لەپی بە خوێنی بێ‌تـاوانـان ـ سووربوویان بۆ بەرزکردەوە.[10] ستیڤن ڕەنسیمان دەڵێت:

قەسـابکـاری‌ی (بەیتولمەقدیس) داخێکی قووڵی پڕ دەروونی له هەموو لایێکی جیهاندا چەسپاند، سەربڕراوانیش بە تەواوی چەنـدبـووبن ئەوە نەزانـراوە، بەڵام ئەوەی زانـراوبێت ئەوەیە که شارەکـە نشینـەی موسـوڵمـانی تێدانـەمـا. ئەم مێـژ ووننـووسـە ئەورووپی‌یە ناسراوە درێژەی پێ‌دەدات و دەڵێت: موسوڵمانان تا ئەو کاتەش ئامادەبوون که دەست بە ڕووی فەرەنگەوە نەنێن و جێگـایـان بکـەنەوەو پێیان قایل بن چونکە بووبوونە سەربارێك و

هۆیێکی تازەی ئەو دۆخـە رامیـاریـیـە ئاڵـۆزەی کە ئەو سەدەیەی گرتبووەوە، بەڵام دوای رەشەکوژەکەی قودس ئیتر پێیان داگرت و سوور بوون لەسەر ئەوەی کە پێویستە دەریان کەن، دەمارگیریی ئیســلامــەتیش نەووروژابـو بەڵکـو دەمـارگیـریی گاورگـەریی (خـاچـدروشمـان) ووروژانـدی، ئەو خوێنـرشتنەش کە کردیان بەڵگەیێکی روون و ئاشکرایە. لەبەرئەوە هەر هەوڵ و کۆششێك کە ـ دوای ئەو بەزمە ـ هەندێك لە ژیرپیاوانی لاتین «مەبەست خاچدروشمانە» دایان بۆ دۆزینەوەی زمینەیێك کە هەردوولا

بتـوانن بنـاغـەی ژیـانی هاوکـۆمـەکی لەسـەر دابمـەزرێنن، بیــرەوەریی ئەو قرکــاری‌یــەی کردبــوویــان «بـە وێنـەی ئەم رەشـەکـوژیـیەی دێریاسین و ـ وەکو ئەم سەربرکاری‌یەی سەبراو شاتێلا» دەهاتەوەیادو ببراوبڕ تەگەرەی دەخستە رێگای پێکهاتن؟[11]

## دوادانەوەی ڕێکوپێکی شەڕفرۆشی‌ی خاچدروشمان:

دوادانـەوەی دەستـدرێـژکاری‌ی خاچدروشمان بەو دەستوبردە نەکرا کە جەماوەری چاوکراوەی خەڵك خۆزگەیان بۆدەخواست، چونکـە کارێکی دەستـوبـردی وەهـا ماوەی دەوێت و پێویستی بە رێکخستن و تەگبیـرەو دەبێت هەمـوو ریزەکانی بۆ یەك بخرێت و سەرکــرادیـەتی‌یێکی ئەوتـۆی پێـویستـە بێت کە بە گرانیی ئەو رووداوە گران بێت و بتوانێت بچێتە ژێرباری ئەو بەرپرسیاری‌یە گەورەیەو ئنجا نۆرەهێرشی پرتوانای خۆی دەست پێبکات.

سەرەتاش لە عیراقەوە، لە موسڵەوە دەستی‌پێ‌کرد کە هەموو کاروبــارێکی لەژێـر دەستی (شـەرەفـوددەولـە مەودود) لە ساڵی 501ی‌ك ـ 1107ی‌م دا جێگای خۆی گرتبوو. ئەو پیاوە لەسەر ~~قایـل بوونی براکـەی بە پشتی ئەو توانی‌ی~~ لە دڵ و دەروونی موسوڵمانانـدا هەستی شەڕگەڕاندنەوەو گیانی شەڕکرین و حەزی لە دەم دانەوەی دەستدرێژکاری زیندووبکاتەوەو بۆ رێگەی غەزاو ئازادکردنی خاك بیانخاتەجۆش و تا چوار ساڵ پێش مردنیشی بۆ راپـەڕانـدنی ئەو ئەرکـەی کە خۆی بۆ تەرخـان کردبوو بە گەرمی تێ‌کۆشاو وورەی‌بەرنەدا. لەو راسپاردەیەشدا کە بۆ جێ‌نشینانی خۆی جێی‌هێـشتبــوو داوای ئەوەی لێ‌کــردبــوون کە لەســەر پێ‌وشوێنی خۆی برۆن و لە خەباتی رێکوپێك درێغی نەکەن و بەردەوام بن.

ئەمــانیش، ئەوەی زانـراوبێت وورەیـان بەهێـزبـووەو لەسـەر درێـژەپێـدانی رووبـەڕووبـوونەوەی دوژمن سووربوون. ئەمەش وەهــای لە میــرانی جزیــرەی فورات کرد ـ بە تایبـەتیش میر ئێلغــازی کوری ئەرتــەق ـ فەرمــانبـەدەستی ماردین کە دووی ئاوات و کردەی مەودود بکەون و لەسەری برۆن.

ئەوەبوو میر ئەرتەق لە ماوەی نێوان ساڵانی (512 ـ 517 ك 1118 ـ 1123ی‌ز)دا چەنــد هێــرشــێــکــی کردە سەر خاچـدروشمـان و حەڵـەبی خستـەوە سەر موڵکەکانی خۆی. کە (عیمــادوددین زەنگی)ش لە ساڵی 521هـ / 1127 دا بوو بە فەرمانبەدەستی موسڵ، ئەوجا موسڵ جڵەوی سەرکردایەتی‌کردنی سەردەمی بەئـاگـاهـاتنـەوەی موسوڵمانانی گرتەدەست و لەسەری رۆیشت ئەوەبـوو دوای چەسپـانـدنی بناغەی فەرمانڕانی‌ی خۆی کارێکی سەربــازیی قارەمـانـانـەی بەجێ‌هێنـا، ئەم ئیشـەشی ئەوەبــوو کە هات سەری لە خاچـــدروشمـان شێـوانـدو وەهـای خەڵـەتـانـدن کە گوایـا ئەم لەشکرڕانی‌یەی بۆ سەر ئەوان نی‌یەو سەرگەمی کارێکی‌ترە لە دیاربەکرو لە تاوانا خاچدروشمانی هەر لە بیــریش نەمـاوە، تا بە تەواوەتی چاوگێـران و هەواڵقـۆستـانی (المــراقبــون والاستخبــاریــون) خۆی لەوە دڵنیـایـان کرد کە «جـۆســلان»ی خاچـدروشمیش ـ میـری رەهـا ـ هەر وای لێ تێگـەیشتـووەو بە فێڵەکـەی نەزانیـوە، ئەوجا «عیمادوددین» دوای ئەوەی بە تەواوەتیش دڵنیـایی لەسـەر موسڵیشـەوە پەیداکرد، ئەم شارەی جێ‌هێشت و بە لەشکرەوە رووی‌کردە رۆژئاواو لە فورات پەڕی‌یـەوەو لە مانگی (جـەمـادی لئـاخیـرە)ی ساڵی 539ی‌ك ـ کانـونی یەکـەمی 1144 ی‌زدا لەنـاکـاو پەلامـاری رەهای داو تا ماوەی بیست وهەشت رۆژ کوشتاری لەگەڵداکرد، دوای ئەوەش بەرنگی بەرنـەداو وەهـای تەنگـەتـاوکـرد تا بە تۆپـزی‌و بە زۆری کوتــەك داگیـری‌کـرد، ئەوجـ[illegible] تـاو شاری (سـروج) یشی کەوتەوەدەست و هەموو ئەو ناوچانەی رۆژهەڵاتی فور[illegible] کە بە دەست فەرەنگــەوە بوون ـ بیــرە ـ ی لێ‌دەرچێت، دەنــا پاکی سەندەوەو خستیە ژێر ئاڵای خۆی.

کاتێك هەواڵی رووخانی میرنشینێکی خاچدروشمان کە لە ناو وولاتی ئیسلامدا بنکەی لێداوەو عیمادوددین زەنگی داگیری کردووەتەوە، گەیشتە هەموو لایێکی کەرتەی ئەوروپا، بەم هەواڵە ترسێکی تەواو دایگرتن و کەوتنە هاوارو هانای براکانی رۆژهەڵاتیان و بۆ سازکردنی هێرشێکی خاچدروشمانەی تازە دەستیان بە بانگهەڵدان کرد، پاپای تازەش پیرۆزبایی لەم بانگەوازە کردو لویسی حەوتەمی شای فەرەنساو، کۆنرادی سێهەمی شای ئەڵمانیش بۆیان سەندەوە (استجابا لها)و دوو لەشکری گەورەیان سازداو کاروانی لەشکرڕانیی تازە واتا هێرشی دووەمی خاچدروشمان بەرەو نیشتمانی موسوڵمانان کەوتەڕێ. ئەم لەشکرڕانییەش ڕێگای ووشکانیی گرتەبەر، بەڵام دوایی ئەو دوو شا مەزنە بۆ ئەوەی سەربازەکانیان لێك نەکەون هەریەکەو لەشکری خۆی بە ڕێگاییێکی جیاوازدا برد.

بەڵام شای ئەڵمان زۆربەی سەربازانی لەشکرەکەی خۆی لە ئاسیای بچووکدا لە کیس چوو، لەبەر ئەوە ناچار گەڕایەوە بۆ پایتەختەکەی دەوڵەتی ڕۆمان (پیزەنتی) واتا بۆ شاری قوستەنتینییە، دوایش شای فەرەنسا هەوڵی ئەوەی دا کە لەگەڵ شای بەیتولمەقدیس لەڕێی سازکردنی هێرشێکی هاوتەگبیردا بۆ سەر دیمەشق، پێکهاتنێك ببەستێت، ئەو پێکهاتنە هەرچەندیشە کراو هاتەگۆڕێ بەڵام هێرشەکە سەرنەکەوت و زوویەزوو شکا، چونکە نورەددین مەحمود لە حەڵەبەوەو سەیفوددینی غازیی براشی لە موسڵەوە بە هەڵەداوان گەیشتنە ئەوێو نەیانهێشت دیمەشق بکەوێتە ژێر چنگی فەرەنگەکانەوە، شکستی ئەم هێرشەش دڵخۆشییێکی تەواوی خستە ناو بەرەی موسوڵمانانەوەو، ئیتر گیانی بەرگری تا دەهات پرباوەڕترو سەرتر دەبوو، ئەوەبوو لە سەردەمی کوڕەکەی زەنگیو (ئەلموجاهید نورەددین مەحمودی)ی جێنشینیدا یەکێتیی نێوان موسڵ و شام و میصر دامەزراو هێزی موسوڵمانان قورسایێکی زیاتری خستە سەر پاشانشینەکەی بەیتولمەقدیس، بەڵام لەو قۆناغەدا نەیانتوانی ...گری بکەن.

ئەو ڕووداوانەش کە لە میصردا دوابەدوای یەك ڕوویدا ،بوو بە هۆی ئەوەی کە نورەددین مەحمودو خاچدروشمان بۆ داگیرکردنی میصر بکەونە پێشەبڕکێ. ئەوەبوو ئەو وولاتی میصرە هەر لە نێوەڕاستی سەدەی شەشەمی کۆچی/دوانزەهەمی زایینەوە لەسەر فەرمانڕانیو پلەوپایەی وەزیری ڕقەبەرێو بەربەرەکانییێکی وەهای تێ کەوتبو کە پەشێوی باڵی بەسەردا کێشابوو. لەبەرئەوە خاچدروشمان بە توندی چاویان لەو دۆخەی میصر بڕیبوو، دۆخێکی وەهاش پەیدابوو کە دەتوانین ناوی بنێین (مەسەلەی مصر لە سەردەمی فاطمی یاندا) لەو کاتەدا کە وەزیرەکانی دەوڵەتی فاطمی بەوە قایل بوون کە ساڵانە پارەیێکی زۆر بدەن بە خاچدروشمان بۆ ئەوەی لە بەڵایان بەدووربن دوژمنایەتیی دوو وەزیرە براکەش «ضرغام» و «شاور» کە لەسەر پلەو پایەی وەزیری کەوتبووە نێوانیان، بوو بە هۆی ڕاستەوخۆی ئەوەی کە لەشکرڕانیی شام (هی نوری)و لەشکرڕانیی خاچدروشمانیش بۆ سەر میصر دەست پێبکات و هەردوو لەشکرەکە لە شامەوە ڕوویان کردە میصر.

چونکە ئەو کاتە ئەو دوو وەزیرە هاودژە هەریەکەو خۆیان دابووە پاڵ یەکێك لەم دوو هێزە تا بە پشتیوانیی ئەمان بگەنە پایەی وەزارەت.

لە هێرشی سێهەمی شامدا کە هەمووی ئەسەدەددین شێرکۆ - سەرکردەی لەشکرەکەی نورودین - سەرکردایەتیی کردو (سەلاحەددین یوسف کوڕی ئەییوب)ی برازاشی لەگەڵ بوو، ئەو لەشکرەی نوری لە میصردا دایکوتاو شێرکۆ بوو بە وەزیر، دوای مردنیشی، برازاکەی جێگای گرتەوە، ئەم خیلافەتی فاطیمی پووچ کردەوەو لایدا، دوایش نورودین مەحمود مردو سەلاحەددین هاتە جێگایو یەکێتیی میصرو شام و جزیرێی بە موسڵیشەوە، لەژێر ئالای خۆیدا تەواوکرد بۆ ئەوەی خاچدروشمان لە نێو هەردوو کەڵبەی ئەو شێرەدا گیربکات، بێگومان یەکێتی لەڕێی ئازادیدا بووبوو بە ڕێگەو شێوازی خەبات و بووبووش بە - ئامانج - و، لەڕێی یەکێتییەوە کوتەکی پشتشکێن لە داگیرکاران دەدرێت، چونکە مانەوەی داگیرکاران لەسەر پرشوبڵاویو جۆراوجۆریی سەرکردایەتییەکان وەستاوە، هەروەها ئەو سەرکەوتنە

مۆڵەتکارەش کە لە داگیرکردنی زەمینەکانی ئیسلام لە شامدا هێنایانەدی بەهۆی کورکوڕێنی (التشرذم)و فەرمانڕانەکان و پچرپچری ریزەکانی موسوڵمانانەوە وەدەستیان هێنا. ئەمەش وەنەبێت نهێنیی یێك بوو بێت و نەزانراوبێت، بەڵام چارەسەرکردنی، رەنگ رشتن و پیلان و خۆبەختکردنی دەویست، لەبەر ئەوە سەردەمی سەلاحەددین لە مێژووی شەڕەکانی خاچدروشماندا (هـ. أ. ر. جب)[12] وتەنی، لەوە گەورەترە کە بە ڕووداوێکی سەرپێیی دابنرێت. ئەو رۆڵەیە هەناسەیێکی کەم وێنەو جۆشاوەری مێژووی مرۆڤکرد دەنوێنێت، چونکە ئەو خوو رەوشتە بەرزەی ئەو لە سەری سووربوو، ئەو ئاڵای یەکێتی و یەك ریزیی‌یەی ئەو لێی‌هەڵکردبوو، بە جارێ تۆوی گومان و بێ‌ووره‌یی نەهێشت و هەڵپەی چاوچنۆکی و چاوبرسێتی و خۆپەرستیی میرەکانی لەپێ‌خست.

چاوگە عەرەبی‌یەکان و چاوگەکانی تریش دەڵێن کە سەلاحەددین کەسێکی بەگەوهەرو قارەمان بووە، لە خەبات و جیهاددا کۆڵنەدەرو پرپشوو بووە، چاوتێرو خاوەن خو و رەوشتێکی چاك بووە، بۆیە هەتاهەتایە ناوی شەکاوەیەو بووەتە یەکەپیاوی ئاڵا باڵای هەموو مێژووی شەڕەکانی خاچدروشمان.

سەلاحەددین بەرنامەیێکی مەزن و فراوانی بۆ بەهێزکردنی درێژەپێدان و بەردەوامیی کاروانی خەبات و رەوتی جیهادو شەرکرینێکی بەرێوجێ و رێکوپێك داناو، ساڵی 582 ی‌ك / 1186 ی‌ز داهات و دانەهات تا سەلاحەددین بوو بە گەورەهێزی ناوچەکەو بەوەش توانیی لە شەڕی یەك لایی (حطین)دا کە لە ساڵی 583 ی‌ك 1187ی‌ز دا ڕوویدا کوتەکی گەورەو پشتشکێنی خۆی لە دوژمن بووشێنێ.

ئەو شەڕەی (حطین) هەر ئەو شکاوی‌و راکردنەی بەرەی جەنگ نی‌یە کە بەسەر خاچدروشمان هات، بگرە لەووش گەلێ گەورەتر بوو، لە ڕاستیشدا بەڵایەك و کارەساتێکی گشتگیر بوو تووشی ئەو دوژمنە داگیرکارە بوو، ئەوەبوو دوژمن لەو شەڕەدا شۆختترینی سوارچاکانی کوژران یان بەدیل گیران و (جی‌لوزبنان)ی شای بەیتولمەقدیس خۆشی لەگەڵ کۆمەڵێ لە گەورەمیرانی خاچدروشم و سوارچاکانیان بە دیل کەوتنە ژێر دەستی سەلاحەددین و هەر بە دەستی خۆشی میرە خاچدروشمە چەقاوەسووەکەی قەڵای کەرەك (ئەرنات رینۆدی شاتیون)ی کوشت. سەرەرای ئەوەش ئەو شەڕەی حطین، بوو بە هەلێکی تاقیکردنەوە کە نیشانەی لێزانی و کارزانی و توانای لەشکرشکێنی‌ی بە سەلاحەددینەوە دەرەوشاندەوە.

ئەوەبوو نەیهێشت دەستکەوتی ئەو سەرکەوتنەی بەفیڕۆ بروات و کەوتە دووی خاچدروشمانی ئاڵۆزو هەرچی شارو قەڵاکارو بنکەیان هەبوو هەمووی گرت، ئەوجا بۆ ئەوەی ڕێگای یارمەتی‌ی رۆژئاوایان لێ‌بگرێت پەلاماری بەندەرەکانی باشووری عەکای داو داگیریانی‌کردو شاری بەیتولمەقدیسیشی سەندو داگیری‌کرد.

ئا بەو جۆرە، لە سایەی ڕەنگرشتن و نەخشەکاری‌ی ژیرانەوە کە پێشەواو سەرۆکە مەزنەکان، پشت بە لێشاوی لایەنگیری‌ی لەدوانەهاتووی کۆمەڵانی خەڵك لە رێی دوادانەوەی شەڕی شەڕفرۆشان بە شێوەیەکی قارەمانانە کردیان، ئەو کۆشکە مەزنە خاچدروشمکارە بەرفراوانەی کە بێگانەی داگیرکار لەسەر زەمینی شامدا دایمەزراندبوو کەوتە لەرزەو قڵشان و زووبەزووش ڕوخا.

بەڵام سەرەڕای ئەو لێ‌بووردەیی‌یەو ئەو رەفتارچاکی‌یەی کە سەلاحەددین لەگەڵ دوژمنی شکستخواردوودا نواندی، سەرەڕای ئەوەش کە نەیهێشت هیچ تۆڵەیێکی ئەو تاوانباری‌و خوێنرشتنەیان لێ‌بکرێتەوە کە دوای داگیرکردنی بەیتولمەقدیس لەو شارەدا کردیان و ئەوەبوو لە پێشەوە باسمان کرد، کەچی دەنگدانەوەی سەر کەوتنەکەی سەلاحەددین لە شەڕی حطین و هەواڵی سەندنەوەی شاری پیرۆز - دووبارە ساهەستی گشتی‌ی لە رۆژئاوای ئەورووپادا کولاندەوەو ئەوەندەشی پێ‌نەچوو گەورە شای رۆژئاوای ئەو سەدەیە، کە بریتی‌بوون لە فەرەنساو ریتشارد شێردڵی شای ئنگلستان، گەیشتە رۆژهەڵات.

بەڵام خواوراست ئیمپراتۆرەکەی‌ی ئەڵمانیا لە ڕووبارێکی ئاسیای ... ڕێکدا خنکاو نەگەیشتە شام، زەلامەکانیشی بە شێوەیێکی زۆر خراپ پرشوبڵاوبرنەوە. هەرچی فیلیپ ئۆغستی شای فەرەنساشە ئەویان لە بەهاری (587 ی‌ك/ 1190 ی‌ز)دا گەیشتەجێ‌و دەستوبرد کەوتە کۆمەکی خاچدروشمە کۆنەکانی

ئەوێ کە گەمارۆی (عەکا)یان دابوو، تا گرتیان، بەڵام شای فەرەنسا دوای ئەوە، بە بیانووی ئەوەوەی کە نەخۆشە، گەڕایەوە بۆ وولاتی خۆی.

هەرچی ریتشارد شێردڵیشە ئەوە ناودارترینی پیاوگەلی ئەو هێرشەو مەیدانبازی بەناوبانگی دەستەویەخەی سەلاحەددین بووە.

چونکە دوای خنکانی باربارۆساو گەڕانەوەی ئۆگستس، پشەواییکی خاچدروشمی لە خۆی زیاتر نەدی. لەبەر ئەوە هەوڵ و کۆششێکی زۆریدا تا دۆخی زەمینەی شام وەکو پێش شەڕەکەی حطین لێبکاتەوە. ئەو شایەی ئنگلستانە هەرچەندیشە داگیرکردنی هەندێ جێگەی وەکو یافاو نیساریەو ئەرسوفی لەسەر کەناراوەکانی فەلەستین، بۆ ڕەخسابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی ئاوات و مەبەستی هێرشەکە بهێنێتەدی کە ئەویش داگیرکردن و سەندنەوەی بەیتولمەقدیس بوو، گرتنی ئەو شارە وەنەبێ تەنیا ئاواتی هەر ئەو هێرشە بووبێت بگرە وەکو خۆیان هاواریان بۆدەکرد ئامانجی هەموو لەشکرڕانییێکی خاچدروشمان بووە. جگە لەوەش سەلاحەددین دەرفەتی بە ریتشارد نەدا دەستیشی کرد بە ڕاونای خاچدروشمان و زیانی گەورەگەورەشی لێدەدان.

ئەنجام ریتشارد بۆی دەرکەوت کە زیانی لە دەستکەوتی پترەو جەنگ لەگەڵ موسوڵمانانندا درێژەی کێشاوەو ئامانجێکی ئەوتۆشی وەدی نەهێناوەو خۆشی نەخۆش و ناساغ کەوتووە، لە لایێکی تریشەوە دۆخی وولاتەکەی خۆشی وەهابوو کە دەبوو بگەڕێتەوە، لەبەرئەوە ناچار نامەی ئاشتیخوازیی بۆ سەلاحەددین ناردو دەڵێت: «موسوڵمان و فەرەنگ لەناوچوون، وولات کاول کراو وێران بوو، لەکیسی هەردوولامان چوو، سامان و رۆحی کۆمەڵانی هەردوو ئایینەکە لە کەڵك کەوت، ئەم بەڵایە ئەوەی پێویست بوو بۆی کرا... دەبا ئاشت ... ئەم کەشەنگییە دوانەهاتووە ... بحەسێنەوەو دانیشین»[٣٠]

ئەوەبوو هەوپاکیی نامەو نامەکاریی نێوانیان هەردوو لایانی خستە گفتوگۆو ئەنجام لە پایزی (ساڵی 588 یك / 1192 ی ز)دا بە مۆرکردنی ئاشتبوونەوەکەی ڕەملە کۆتایی هات، بەپێی ئەو ئاشتبوونەوەیەش شاری بەیتولمەقدیس لەژێر سایەی موسوڵماناندا مایەوەو ڕێگاش بە گاوران درا کە زیارەتی لێبکەن دوای مۆرکردنی ئەم پێکهاتنە ڕیتشارد گەڕایەوە بۆ وولاتی خۆیو سەلاحەددینیش لە بەهاری دوای ئەو ساڵە واتا لە بەهاری ساڵی (589 یك / 1193 یز)دا کۆچی دوایی کردو لە ژیانیشیدا ئەوەبوو کۆڵی نەداو درێغیی نەکردو لێدانێکی ئەوتۆی لە خاچدروشمان دا کە بڕاوبڕ نەهاتنەوە سەرخۆیان تا لە دوادواییدا بە تەواوی لە شام دەرکران.[٤]

بە تێشکانی ئەو هێرشە گەورەیە، بزووتنەوەی خاچدروشمی وەکو تەختەی تابووتی بۆ بتاشرێت وابوو، چونکە خاچدروشمانی ئەورووپا تووشی لێدانێکی کوشندەی ئەوتۆ بوون کە نائومێدییێکی تەواو هەستونەستیانی بەجارێ سست کردو کارێکی وەهای پێکردن کە بڕایبڕ بیری ئەو جەنگەپیرۆزە، بەو شێوەیەی کۆنی، جارێکیتر بە مێشکیاندا نەیەت و لێگەڕێن بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی ناو خۆیان.

**(کۆتایی)**

تینی هاواری بەناوبانگی (خودا وەهای ویستووە)ی پڕبەبینی کۆمەڵانی ووروژاوی کۆنگرەکەی ساڵی 1095ی (کلیرمۆنت) لە فەرەنسا، کە بۆ ژنەفتنی ووتارە ئاگرینەکەی پاپا، لەوێ خڕبووبوونەوە، ئەوەندە بڕیکرد کە دیمان. ئەوەبوو لەو ووتارەدا پاپا داوایلێکردن کە خاچ هەڵگرن و زەمینەی (وەکو دەڵێن) ئەوەدنیا داگیربکەن. بەڵام دوای بەسەرچوونی ـ نزیکەی ـ دوو سەدە بەسەر ئەو ساڵەداو، دوای کوشت و کوشتارێکی درێژخایەنی تێداچووی سەرنەگرتوو، ڕۆژئاوا ـ لە ترسی شەڕکرباری ـ لە هاواری گەوجانەی خۆی وەکو مشت لە درەوش گەڕایەوەو ـ ناچار ـ بەوەی کە بوو قایل بوو و، هاتە سەر ئەو بڕوایەش کە ئەو شەڕکرباریەی تووشیبوون، بەهۆی ئامادەبوون و قایمکاریی موسوڵمانانەوە لەوەوە پەیدابوو کە موسوڵمانان بڕیاری تەواویان دا کە ڕەگوڕیشەی دەستدرێژی لە بنەوە دەرکێشن، ئەو دەستدرێژییەی کە لە ناکاوی سەرزەمانێکدا توانیی کەموزۆر سەرکەوتنێك بە دەست بێنێت

بەلام بڕیاری ئەو سەرکەوتنەی کە سەردەمی بە ئاگاهاتنەوەی جەماوەر دایەو، ئەو دەستپێشخەریو دەستەویەخەیەی کە لە شالاوی موسوڵمانانەوە بەری بە دەستدرێژییەکە گرت واتا ئە (شەرکری)یەی کە موسوڵمانان درێغییان لێ نەکرد، ئەوانە هەمووی کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵکو بە خوێن و ئارەقەو ماڵێکی زۆر نیشتەسەریان. بەلام ڕاستییەکەی ئەوەبوو کە هەموو شتێك دەبوو لەرێی سەرکەوتن و سەربەرزیی نیشتماندا وەکو ئاوخواردنەوە بێت.

**پەراوێزەکان:**

1) سەیری کتێبی «بحث في التأریخ»ی کورتەکراوەی (د. سی. سمرفل) بەرگی 1 لاپەڕە 87و دوای ئەو لاپەڕەیەش بکە.
2) هەمان چاوگە 1/118
3) د. تقي‌الدین عارف. صقلیه وعلاقتها بدول البحر المتوسط الاسلامیة.
4) ئا ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی کە دانەر (محمد العروسی المطوي) کتێبەکەی ناوبنێت (الحروب الصلیبیة في المشرق والمغرب).
5) د. حسن حبش. پیشەکی‌ی کتێبی «اعمال الفرنجە» ل:5
6)الکامل، چاپی بەیروت بەرگی 1،ل 272 (حوادث سنة 491)
7) د.فیصل السامر، ابن الأثیر، ل41.
8) ئیبنولئەثیر لە ساڵی (630 ی.ك /1232 ی.ز)دا لە موسڵ کۆچی‌دوایی کردووە.
9) ن.م.ص
10) د.زکی النقاش، العلاقات ...بین العرب والافرنج ل:23.
11) ستیفن ڕەنسیمان، مێژووی شەڕەکانی خاچدروشمان.
12) جب 1 صلاح الدین، ص:117 ـ 118
13) ابن شداد، سیرة صلاح الدین. 194 ابو شامة. الروضتین، 193/2
14) د.عاشور، الحرکة الصلیبیة، ب2 ل 899
15) بنوارە کتێبەکەی د.جوزیف نسیم یوسف «العدوان الصلیبي علی بلاد الشام» ل369

## چاوگەکان


1) ابن الاثیر، ابو الحسن عزالدین علی بن ابی الکرم محمد الجزری الشیبانی (مەرگی 630ك / 1233ز) الکامل في التأریخ. چاپی دارصادر. داربیروت. بیروت 1966
2) ابن شداد، ابو المحاسن بهاءالدین یوسف بن رافع الاسدی (مەرگی 632ك / 1234ز) النوادر السلطانیة والمحاسن الیوسفیة (سیرة صلاح الدین) تحقیق د.جمال الدین الشیال، چاپی / الدار المصریة، قاهیره، 1964
3) ابوشامة، ابومحمد شهاب الدین عبدالرحمن بن اسماعیل المقدسی (مەرگی 665ك / 1216ز) الروضتین في اخبار الدولتین، چاپخانەی وادي النیل، 1287 ـ 1288ك دوو بەرگە.
4) ئەرنۆڵد توینبی، لێکۆڵینەوەیەك لە مێژوو. کورتەکراوەی (د.سي ،سمرفل) وەرگێڕانی مامۆستا طەباقر، چاپخانەی (وزارة المعارف)، بەغدا 1955.
5) د.تقي الدین عارف الدوري: صقلیة علاقاتها بدول المتوسط الاسلامیة. لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندن، دار الرشید للنشر، چاپی دار الطلیعة، بیروت، 1980
6) جب، ه.أ.ر: صلاح الدین الایوبي، دارسات في التأریخ الاسلامي، حررها یوسف ایبش، طبعة المؤسسة العربیة للدراسات والنشر، بیروت 1973
7)د. جوزیف نسیم یوسف: العدوان الصلیبي علی بلاد الشام. دار النهضة العربیة للطباعة والنشر. بیروت 1981
8) د.حسن حبشي: پێشەکیی کتێبی «اعمال الفرنجة وحجاج بیت المقدس» دانراوەی خاچدروشمێکی نەناسراوە: وەرگێڕان و پێشکەشکردنی د. حبشی. چاپی دار الفکرالعربي. القاهرة 1958

9) د.زکي النقاش: العلاقات الاجتماعیة والثقافیة والاقتصادیة بین العرب والفرنج خلال الحروب الصلیبیة .منشورات دار الکتاب اللبناني للطباعة والنشر، بیروت 1958
10) ستیفن رنسیمان: تأریخ الحروب الصلیبیة. وەرگێڕانی د.السیدالباز العریني. چاپی دارالثقافة، بیروت 1968
11) د.سعید عبدالفتاح عاشور: الحرکة الصلیبیة چاپی مکتبة الانجلو المصریة. چاپخانەی البیان العربي. القاهرة، 1963
12) د. فیصل السامر: ابن الاثیر مطبوعات وزارة الثقافة والاعلام. بغداد 1982
13) محمد العروسي المطوي، الحروب الصلیبیة في المشرق والمغرب دار الکتب الشرقیة ،تونس 1954.

# بەکارهێنانی هێزی چەکدار لەپێناوی دەست رۆیشتوویی لە جیهاندا هێزی دەریایی‌و زەمینی‌و ئاسمانی‌و جەنگە ئەستیرە کامیان ئەم فرمانەیان پێ جێبەجێ ئەکریت؟

حیلمی علی شریف

جیۆپۆلیتیکس بەم ناوەی ئیستایەوە باس و لیکۆلینەوەیەکی تازەیە، زاناو پسپورە جوگرافیا ناسەکانی دەوڵەتە سەرمایەدارو ئیمپریالی‌یە گەورەکانی جیهان هانیویانەتە کۆری زانستی ئادەمیزادەوە.

پەیوەندی‌یەکی توندوتۆڵی بەچارەنووسی گەل و ولاتە پچوك و مام ناوەندی‌یەکانی جیهانەوە هەیە، وە لەگۆرەپانی ولاتە گەورە چاوبرسی‌یە چەوسێنەرەوەکانەوە هەڵئەقولێت و هی‌خۆیانەو لەوانەوە بلاوبۆتەوە، وەپێش ئەمانیش هەر لەدەوڵەتە هاوشانە کۆنەکانی جیهانیانەوە بەشێوەیەکی‌تر هاتۆتەکایەوە.

کورتـه بیـرخستنـەوەیـەك دەربـارەی ناوەرۆك و مەبـەست و ئامـانجـەكـانی جیـۆپـۆلیتیكس و ئارەزووی دەوڵـەتـە گەورە چاوبرسی‌یـەكـان بۆ ئەوانـەی چوار بەشـەكەی پێشویان لە چوار ژمـارەی رۆشنبیـری پێشـودا دیـوەو بۆ ئەو خوینـەرانـەی هەر ئەو بەشانەیان نەخوێندوەتەوە بەپێویست ئەزانم، بەتایبەتی لەم بەشەدا كە ئیتر بابەتەكەی پێ تەواو ئەبێت وە ئامرازێكی سەرەكی گرنگی زۆر كەوتـوو لەسـەر كومـەڵگـەی مروڤایەتی چ بەسەرو چ بەماڵ تیاشیی ئەكریتەوە.

جیـۆپـۆلیتیكس كەزانستی پێـوەنـدی زەوی‌یە بەكارو كردەوەی سیاسی‌یەوە، یان وەكو پێی ئەڵێن سیاسەتی زەمین (علم سیاسة الكـرة الارضیـة)ە چەنـد زانـاو پسپـۆڕیـك لەم چەنـد دەساڵەی دواییدا گەو هەرەكەیان بۆ خەڵكی جیهان خستۆتە رووكە ئۆتۆماوڵ Otto Maull بەم جۆرەی خوارەوە لێی ئەدویـت.[1]

«جیـۆپـۆلیتیكس دەوڵـەت بەبیـروبـاوەریكیو شكی راوەستـاو نازانێت، بەڵكـو بە بووە یەكی زینـدوی ئەزانێت و كە بەهـۆی جوگرافیاوە دەوڵەت گەورەتر ئەكریت ئیتر جیۆپۆلیتیكس نەخشەی دوارۆژ ئەكیشیت و وەلامی ئەم پرسیـارانە ئەخاتە پێش چاو. ئایا دەوڵەت دەرفەتی پێویستی بەتەواوی كەوتۆتە دەست؟ ئەم دەرفەتە لە چ لایەكەوەكە لەگەڵ زروفی جوگرافیدا بگونجێت دەست پێ ئەكات و ئەبی روو بكریتە چ لایەك؟».

بەڵام (جـون كیفـەر) ئەڵیت[2] «ئـەم تیـۆری‌یـە لەئـەنجامی شارستانێتی‌یەكی پیشەسازی‌یانەی باڵا بەرز تەشەنە ئەكات».

هەروەهـا (قـەشـە ئەدمـونـدویلش)لای وایـەكـە[3] «بـاس و لێكۆڵینەوەیەكە، دەربارەی جوگرافیای ئادەمزادو زانستی سیاسـەت جێ‌بەجێ كردن».

وئـەوزانـاو پسپـورانـەی كەوتـوتـەتـە كۆری باسكـردنی جیـۆپـۆلیتیكسـەوە، هەموو چاویان بریوەتە ئەو بەشەی زەمین كە لەرووی ئابوری‌و بەرهەم و كەرەسەی خاوو دانیشتوانی‌یەوە نرخ و بایەخێكی گەورەو شایستەیان هەیە، هەروەكو زیندەوەریك باسی زەمین و دەوڵـەتیـان كردووە. ناوجـەرگـەی جیهـان و دەوروپشتی ناوجەرگەو دەست و پەلی ناوجەرگەیان دەست نیشان كردووە.

جیـۆپـۆلیتیكسـەكـانی ئەڵـەمـانی، ئەڵەمانیایان بەناوجەرگەی جیهـان دائـەنـا (Heart Land) وە دورگـەی جیهـان كە ئەڵـەمـانیـا ناوەنـدەكـەی بوو بەو رووبـەرە پان و بەرینـەی لە قارەی ئاسیـاو ئەوروپـاو ئەفـەریقـا پێـك هاتبـوو وە لەنـزیـك رۆخـەكـانی ئەم دوورگـەیـەوە قارەو دورگـەكـانی نزەهلكەوتبوون وەكو ئەمەریكاو ئوستـرالیاو گرینلاند. . . وەسیر هالفوردماكندەر)ی ئینگلیزی كە جێگـری سەرۆكی كومـەڵـەی جوگـرافی شاهانەی بەریتانیا بوو، لای‌وا بو ئەڵەمانیاو روسیا ناوجەرگەی جیهانن وەئەوروپاو ئاسیاو ئەفـەریقـا دورگـەكـەین، بۆیە ئەیوت[4] «هەر لایەك روژهەڵاتی ئەوروپـای بەدەستـەوە بێـت ناوجـەرگـەی جیهـانی دەست ئەكـەویت. . وە هەرلایـەك دورگـەی جیهـانی بەدەستـەوە بێت هەموو جیهانی دەست ئەكەویت». . بەڵام نیكولاس سپیك مان Nicolas. J. Spykman پروفیـسـور لەزانكـوی یاڵ yale لەولاتـە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا بەپیچەوانەی ماكیندەر ئەیوت[5] «ئەوی دەست و پەلی (الاطـراف) جیهـانی بەدەستـەوە بێت ئوراسیـای ئەكەویتە دەست، وەئەوی ئوراسیای بەدەستەوە بێت چارەنوسی جیهانی ئەكەوێتە ژێر دەست//.

هەروەهـا ئەم ئایـدولـوجی‌یـەتـە لەسـەر چەنـد رەورەوەیـەك ئەرۆیشت بەرێوە تاكو بەهۆی ئەم رەورەوانەوە بگات بەئامانجی تەواوی كەدەست خستنی هەمـوو جیهـانـەو ژیـر دەست كردنی هەمـوو دانیشتـوانێتی. بەپێی ئەم ئایـدیـولـوجی‌یـەتە، دەوڵەت بووەیـەكی زینـدووە، خاوەن هەست و كردەوەیـە، وەكـو مروڤ لەدایـك ئەبێـت و گەورە ئەبێت و پێ ئەگـات و پیـر ئەبێت و ئەمرێت. وەمان و ژیانی دەوڵەتان بەندە بەدوو یاساوە، یاسای گەشـە كردن و یاسـای لەناوچوون یاسای گەشەكردنیش، بەسەر زەوی گەلانـدا كشـان و «دەرفـەتی بایـەخـدار»یـان «ناوچەكانی ژیان» (Lebens Raum) ئەگریتەوە. وە «ماهان» لەو بروایەدابوو كەدەوڵـەت یان ئەبێ گەشـە بكـات یان بپـوكێتـەوە، چونكـە لای‌وابوو هیچ دەوڵەتێك بێ جوڵان و بزوتنەوە ناتوانێت دەست بەخاك و قەوارەی خۆیەوە بگرێت.

كە ئەمـە مەبـەست و ئامـانجی خاوەنـانی ئایـدیـولوجی‌یەتی جیۆپولیتیكس بێت دیارە ئەم مەبەست و ئامانجانەش جێ‌بەجێ كردنیـان گەرەكـە، بێ‌گـومان بەدی هینانیشیان تەنیا دووریگایان هەیە، یەكەم ریگای سیاسی‌و دیبلوماسی دووەم ریگای جەنگ، واتا بەكار هینانی جەنگ لەپیناوی دەست خستنی رووبەری نوێ لە هەلـومـەرجێكـدا كەریگـای سیـاسی‌و دیبلۆمـاسی دەسەڵاتی

جێ بەجێ کردنی ئەم ئامانجەی نەبێت. بەلای ـ لەنین ـ ەوە وا بوو، کە جەنگ لەنێو دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان خۆیانداو لەنێو ئیمپریالیستەکان تاکە تاکەو بە جووتەو بەکۆمەل و دەوڵەتە سوشیالیستەکان دا دوای هەر تەنگوچەڵەمەیەکی ئابوری، کە ئەکەوێتە نێو جیهانی سەرمایەداری یەوە یاسایەکی ئاسایی و ناچاری یە. هەروەها بارون فون بلەف لەساڵی 1799دا لە کتێبی «گیانی سیستەمی تازەی جەنگ»دا ئەڵێت[٦] «سەبارەت بەوەی لەم جیهانەدا شت هەیە بەش ئەکریت و شت هەیە وەرئەگیرێت کەواتا ئەبێ جەنگ روو بدات، وە جەنگ کوتایی نایەت تاکو ئەو دەوڵەتانەی هەن بەسنووری پێویستی خۆیان شاد نەبن»!

هەروەها «راتزل» ئەڵێت[٧] «لەسەر ئەم ئەستیرە بچکولەیە هەر جیگای یەك دەوڵەتی مەزنی تیا ئەبێتەوە».

هەر بەپێی ئەم بیروباوەرە هیتلەر لەکتیبی «کفاحی»دا دەربارەی سیاسەتی دەرەوەی ئەڵەمانیا ئەڵێت[٨] «نابێ دوو هێزی گەورە لە ئەوروپادا بێنەکایەوە، چونکە هەوڵ دان لە پێناوی پێك هینانی هێزێکی عەسکەری تر لەسەر سنووری ئەڵەمانیا وەکو هێرش بردنەسەر ئەڵەمانیاوایە».

کەپسپوری جیوپولیتیکس و سەرکردەو عەسکەری یە گەورە بریار بەدەستەکانی (صناع القرار) دەوڵەتە گەورە چاوبرسی یەکان ئەم رێبازە بگرنە بەر وەهیچ دەوڵەتێکی سەرزە مینیش بەئارەزووی خۆی دەست لە ئازادی و سەربەخۆیی خۆی هەڵنەگریت، کەواتا رێبازی سیاسی و دیبلوماسی بەربەست ئەبێت و ئیتر دەرگا بۆ بەکار هێنانی هێزو هەلگیرساندنی جەنگ ئەکەویتە سەرگازی پشت وەبەم جۆرەش لەدوای هەرەس هێنانی سیستەمی کۆمونیستی سەرەتایی لەنێو کۆمەڵگەی مروڤایەتیدا واتە لە پەیدابوونی رژێمی کۆیلەییەوە ئیتر جەنگ بووە بەرێبازی هەلبژاردەی چینەخاوەن دەسەلات و کاربە دەستەکانیانەوە دژ ی گەلان و چینە چەوساوەکان و دەوڵەتە پچوك ومام ناوەندی یەکان و هەروەها دەوڵەتە زۆردارەکان لەناو خوشیاندا واتا جەنگ بووە بەرەفتارێکی ئاسایی نێو کومەلگای مرۆڤایەتی و بەزۆر جیگای خۆی لەم سەرزەمین دا کردۆتەوە.

دەربارەی سیاسەت و جەنگ، ماوتسی تونگ بەباشی ئەم بابەتەی روون کردۆتەوەو ئەڵێت[٩] «جەنگ دریژەی سیاسەتە بۆیە جەنگ خودی سیاسەتەوە کارێکی سیاسەت پۆشە، وە لەکۆنەوە هیچ جەنگێك بەرپانەبووە سیمای سیاسی نەبوبیت. جەنگی ئیمە دژ ی ژاپون، جەنگێکی شورشگیرانەیە، ئامانجی دەرکردنی ئیمپریالی ژاپون و دامەزراندنی چینی تازەی خاوەن ئازادی و یەکسانی یە» هەروەها لەسەر باسەکەی ئەروات و ئەڵێت «بەلام جەنگ خاسی یەتی تایبەتی خۆی هەیە بۆیە بەم واتەیە جەنگ بەپێ ی واتا گشتی یەکەی لەئاستی سیاسەتدانی یە. جەنگ بەریگایەکی تر دریژەی سیاسەتە. لەکاتێکدا سیاسەت ئەگاتە قوناغێك کە ئیتر ناتوانێت بەریگای ئاسایی بەرەو پێش بروات، لەپێناوی لەناوبردنی کوسپی ریگاگری سیاسەت، جەنگ هەڵئەگیرسێت. بۆ نمونە کەرەوتی نیوە سەربە خۆیانەی چین ریگای پێشکەوتنی سیاسی لە ئیمپریالی یەتی ژاپون داخست، ئیترژاپون رێبازی جەنگی گرتە بەر تا ئەو کۆسپانە لابەرێت. هەروەها ژاپونیش کۆسپ بوو لەپێناوی سەرکەوتنی شورشی دیموکراسی لەچین دا. بۆیە لەچینیش شۆرش بەرپابوو تا ئەو کوسپە لابەرێت. بەم پێ یە ئەتوانین بلێین سیاسەت جەنگێکی سپی کارەو جەنگیش سیاسەتێکی خۆنیاوی یە.

جەنگ خاسی یەتی تایبەتی خۆی هەیە، کۆمەلێك ریکخراوی جەنگی وکومەلێك شێوەی جەنگ و کرداری تایبەتی جەنگی لێ ئەوەشێتەوە. ریکخراوەکان هیزە چەکدارەکان و هەموو شتێکی بەو ریکخراوە بەستراوانەن. وە شێوەکانیش تاکتیك و ستراتیجی یەتی سەرکردایەتی جەنگن. بەلام کردار شێوەی تایبەتی چالاکی کۆمەلایەتی یە کە هەر سوپایەك لەکاتی جەنگ دا تاکتیك و ستراتیجی یەتی تایبەتی لەلەهی خۆی ودژ ی دوژمنەکەی بەکار ئەهێنێت. بویە تاقی کردنەوەکانی جەنگ، تاقی کردنەوەی تایبەتین. پێویستە هەموو بەشداربووانی جەنگ لە پێناوی سەرکەوتنی دا خۆیان لەگەڵ جەنگ دا بگونجێنن و دەست لەرەوشتی رۆژانی ئاشتی هەلگرن.

پێش ماوتسی تونگ، کلاوزڤیتز بە هەمان شێوە، کە جەنگ بەشێوەیەکی تر دریژەی سیاسەتە، لە جەنگ دوواوەو دەربارەی پێوەندی نێوان جەنگ و سیاسەت کلاوز فیتز ئەڵێت[١٠] «ئیمە واتێ ئەگەین کە جەنگ لە هەموو هەلومەرجیکدا ئامرازی سیاسەتە، نەك شتێکی سەربەخۆ. ئیمە ئەوە ئەزانین کە پێوەندی یە سیاسی یەکانی نێوان حکومەتەکان و نەتەوەکان جەنگ پەیدا

ئەکەن. . بەلام دڵنیاین لەوەی کە جەنگ هیچ شتێك نی یە ئەوە نەبێت کە بەیارمەتی چەند هۆیەکی تازەی ترەوە درێژەدانە بە پێوەندی یە سیاسی یەکان. . ئەو شیرازە سەرەکی یانەی لەکۆری رووداوەکانی جەنگ دا دێنەکایەوەو پێوەی بە ستراون ئەو شیرازە سیاسی یانەن کە لەکاتی جەنگ دا لەسەر رەوتی خۆیان ئەرۆن بەرێوە تاهێنانەدی ئاشتی. . ».

بۆیە لەگەڵ درۆست بوون و پێك هاتنی دەوڵەتەوە هێزی چەکدار پەیدابووە، وە ئەم هێزە چەکدارانە دوو فرمانیان خراوەتە ئەستۆ، پاراستنی ئاسایشی ناوخۆو پاریزگاری ولات لە پەلاماری دەرەوە، بەلام فەرمانرەوا زۆر دارە چەوسینەرەوەکان هێزی چەکداریان بۆ داگیرکردنی ولاتان و گەشەکردنی روو بەری خاکەکەی خۆشیان بەکار هیناوە. ئنجا کە هیزی چەکدار بخریتە ژیر باری داگیرکردنی ولاتانی ترەوە ئەبێ بیریش لەوەبکریتەوە کەچ جۆرە هیزیکی چەکدار یان چەند جۆر هیزیچەکدار ئەم فرمانەی پێ جێبەجێ ئەکرێت.

بێ گومان لەسەرتای پەیدابوونی دەوڵەت داتا ماوەیەکی زۆریش تەنیا هێزی پیادەو چەکی سەرەتایی زۆر ئاسایی هەبووە، وەکو شیروتیرو رم و گورزو گۆپاڵەو. . . و دوای ئەوەی پاپۆری (باگیر) پەردەدار (شراع) پەیدابووە ئنجاهیزی دەریاییش هاتۆتەکایەوە. ئیتر لەگەڵ پێش کەوتنی پیشەسازیو تەکنۆلوجیادا وە بەکار هینانی خەلوزی بەردو دوای ئەو نەوت و پەیدابوونی هیزی هەلم و داهاتنی چەکی تەقەدار حاڵ و باڵی هەردووهیز، هێزی زەمینیو هێزی دەریایی، بازی گەورە گەورەی سەر سورمێنەری بەرەو پێش ناوە، ئنجا لەدوای ساڵی 1900ەوە هێزی ئاسمانیش هاتە کۆرەوەو تا ئەمرۆ کەروکێت و جەنگی ئەستێرەش بۆ تەمەترسی یەکی گەورەو رووی کردۆتە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی.

بێ گومان فەرمانرەواکانی دەوڵەتە گەورەکان بەتایبەتی ئەوانەی چاویان لە خاك و سامانی دەوڵەتانی ترە، خۆیان و شارەزاو پسپۆرو دەزگە کاریگەرەکانیان شەووروژ بیریان لەوەکردۆتەوە بەچ ریگایەك و بە چ هێزیك و پەنابەرنە بەر چ رێبازیك تا بەئامانجی داگیرخوازی خۆیان بگەن.

هەردەوڵەتێك ئەم رێبازەی گرتبێت، بیری لەوە کردۆتەوە کە ئەبێ هیزو توانای عەسکەری بالا دەستی هێزوتوانای هەموو دەوڵەتێکی تری سەرزەمین بێت، یان بیری لەوەکردۆتەوە کە جۆرە هێزێك و جۆرە چەکێکی بەدەستەوە بێت بە هیزترو کاریگەر تری هەموو هێزو چەکێکی تری دەست دەوڵەتانی تری سەرزەمین بێت. وەئەم فەرمانرەوایانە لە سیاسەت کاریشدا هەر بیریان لە سەرکەوتن کردۆتەوەو بەس! سەرکەوتنیش بۆ داگیرکردن و خۆ گەورەکردن و دەسەلات پەیداکردن لەنێو دەوڵەتانی تردا. هیتلەر ئەڵێت «دەربارەی سیاسەت بروا بە هیچ یاسایەکی رەوشت کارانە ناکەم، سیاسەت یاری یەکە هەموو فرووفێلێکی تیارەوایە، یاسای یاری یەکەش بە دەست یاری کەرەکانەوە تا لەگەڵ ئارەزوی خۆیانا ئەیگونجێنن ئالوگۆرئەکرێت».

هەروەها دەربارەی هەمان جۆرە سیاسەت، سیاسەتی دەوڵەتە گەورە داگیرکەرەکان و نستون چەرچل سەرەك وەزیرانی پێشووی بەریتانیا لە دیدەنی گۆرستانێکدا کەچاوی بەم رستە نووسینە ئەکەوێت. ئەڵێت «. . . لیرەدا سیاسەت مەداری مەزن و پیاوی راست ئارامی گرتووە. . .» جێگای سەرسام بوونە یەکەم جار لەژیانما دوو پیاو ئەبینم لەگۆرێکدا پێکەوە نێژرابن. . ».

هەروەها چەرچل پاش شکستی ئەڵەمانیا لە جەنگی دووەمی جیهاندا دەربارەی یەکیتی سوڤییەت کە ئەرکی هەرە گەورەی جەنگی کەوتە ئەستۆو 20 ملیون کەسی لەو جەنگەدا کوژراوو سوپای سوور بەرلینی پایتەختی ئەڵەمانیای لەنازی یەکان رزگارکرد ئەڵێت «بەرازە دەست نیشان کراوەکەمان نەکوشت!» واتە نەمان توانی یەکیتی سوڤییەت لەناو بەرین.

جارێکیش لە فەرەنسیسی یەکەم شای فەرەنسا ئەپرسن بۆچی هەمیشە ئەچیت بەگژ شارڵ ی پێنجەم شای نەمسادا؟ لەوەلامدا ئەڵێت «چونکە هەردووکمان یەك ئامانجمان هەیە، ئەویش داگیرکردنی ئیتالیایە».

ئیتر بەم کورتە پێشەکی یە ئەچینە سەر خودی بابەتەکە. کە جیۆپۆلیتیکس یان ئایدیولوجی یەتی ئەم زانستە رێنیشان دەری فەرمانرەواکانی دەوڵەتە گەورە تەماع لەخاك و سامانی گەلانی تر کردوویێت وە هۆکانی سیاسیو دیبلوماسی لەئاستێکی تایبەتی دا لەچارە سەرکردنی کیشەو بەرەی نێوان دەوڵەتان دەستەوسان رابوەستن، ئیتر جەنگ ئەبێت بەتاقە رێبازی چارەسەرکردنی هەموو تەنگوچەڵەمەیەکی نێو دەوڵەتان کە خودی خۆشی درێژەی

سیاسەتە یان هەر سیاسەتێکی خوێناوی‌یە. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر هەموو کەسێکی ئەم سەرزەمینە هیچ نەبێت شارەزاییەکی گشتی دەربارەی ئەم بابەتە بووەی ناوکومەڵگەی مرۆڤایەتی هەبێت بەتایبەتی رۆڵەکانی نەتەوەی کورد کە مێژووەکەمان بەخوێن لاپەرەکانی نووسەراوەتەوە چ ئەو خوێنەی لەشەرری نێوان دەوڵەتە گەورەکان دا رژابێت و رژێنرابێت چ ئەوەی لەپێناوی پاراستنی کوردستان و دەست خستنی مافی نەتەوایەتی کرابێت بە قوربانی.

بێ گومان جەنگ زانست و یاسای تایبەتی هەیەو ئامرازو دەزگەی جۆراو جۆریشی تیا بەکار ئەهێنرێت کە ناوەرۆك و ئامانجی هەڵگیرساندنی لە ناوبردنی هێزی چەکداری دوژمنە بەکوشتن و گرتن و پەك خستنی، واتە لەکۆری جەنگ دوورخستنەوەی.

ئامرازو دەزگەی جەنگیش لەسەرەتاوە وەکو هەموو ئامرازو دەزگاکانی تری دەست کومەڵگای مرۆڤایەتی ئاسایی‌و بێ ئەرك و کەم زیان بووە، بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنی رەورەوەی زانست و تەکنولوجیادا ئەمیش شان بەشانی ئەوانی‌تر پێش کەوتووەو بەرەو هەورازتر رۆیشتووە، تەنانەت گەلی جار پێشەسازی جەنگ ئەوانی‌تری بەجێ هیشتووە وەکو ئێستا روون و ئاشکرا لەبەر چاوماندایە، هەموو پسورو پزیشکە پیشکەوتووەکانی سەرزەمین بەدەست نەخۆشی شێرپەنجەوە تووشی سەرە خولێ بوون، کەچی لەکۆری ئاسمانەوانی‌دا هیچ نەبێت یەکیتی سوڤیەت و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گەیشتوونە تەپایەو ئەندازەیەکی باوەر نەکردەنی.

ئەم دەزگەو ئامرازانەش لەسەرەتاوە هەر لەهێزی زەمینی‌دا ئەبینراو دوای ئەوە لەهێزی دەریاییداو جا لە هێزی ئاسمانی‌داو وا ئیستا لە هێزی بۆشایی ئاسمانیشدا تارماییەکی رەشی بەسەر کۆمەڵگای مرۆڤاتیدا کیشاوە کەپێ‌ی ئەلین جەنگە ئەستیرە.

هێزی زەمینی‌و دەریایی زۆر کونن، وە هەریەکەیان یان هەردووکیان بەپێ‌ی هەلکەوتی زەوی‌و دووررو نزیکی‌یەوە لە دەریا بچوك و گەورە، بێ هیزو بەهیز دروست کراون و کەوتوونەتە دەست دەوڵەتان.

بەڵام هێزی ئاسمانی کەفرۆکەی جەنگی بربرەی پشتێتی هێزێکی نوێ‌یەو لەدوای ساڵی 1900 ـ ەوە کەوتوتە دەست دەوڵەتە گەورگانی ی سەرزەمین و وردە وردە نرخ و بایەخی دراوەتی.

سەبارەت بەهێزی زەمینی، پێکەوەنانی لەوانی‌تر ئاسان تربووە بەتایبەتی لە نیو ئەو دەوڵەتانەی رووبەری فراوانیان بەدەستەوە یەو دانیشتوانیان زۆرەو پیتو بەرەکەت و سامانی خاکەیان ئەم لایەنەی ژیانی بۆ مسوگەر کردوون، یان بە هی ولات وگەلانی‌تر جێ‌بەجێ‌یان کردووە. بەڵام هێزی دەریایی کە نوی ترەلە هێزی زەمینی‌و تەکنولوجیای پێشکەوتوتری گەرەکە، لەولاتی سەردەریاشدا نەبێت پێك نایەت، جاهەندی ولات هەبووە هەر بەهێزی دەریاییەوە ناوبانگی دەرکردووەو هەندی ولاتی‌تر هەردوو هیزەکەی هەبووە بەلام لە هێزیکیاندا دەست رویشتوتر بووە وەکو بەریتانیاو روسیای قەیسەری.

وەهەر هێزیك لەم هیزە باسکراوانەوە کەوتە گەشەکردن و بایەخ پێ‌دان نرخ و بایەخی هێزەکانی‌تر لەنگ ئەکات، هەرچەندە هەندی ولاتی دەست نە رۆیشتوو کەهێزە چەکدارە کانیان هەر بۆ خۆ پاراستن تەرخان کردووەو ئەوەندە تەماعکاران چاویان تێ‌نەربون.

ئەوەندە لەم کۆرەدا بین برکێ‌یان نەکردووە لەلایەکی تریشەوە کەنیاز داگیرکردن و مسوگەر کردنی دەرفەتی بایەخدار (المجال الحیوی) وکشان بەسەر خاکی ولاتان نەبووبیت گەلێ دەوڵەتی سەرزەمین وەك یەك بایەخیان بەهەر سێ جورە هیزە چەکدارەکە داوەو هەموویان بەیەك دەزەگاو پشتیوانی یەکتری لەقەڵەم داوە.

جاسەبارەت بەوەی دەوڵەتە گەورەکان وە داگیرکردن دوای پەیدابوونی هێزی دەریایی بە شێوەیەکی فراوان بوون بەدیاردەیەکی روون و ئاشکرای ئەم سەرزەمینە هێزی دەریایی گەلێك جار تەقەللای‌داوە هەربەوەی دەستی لەقەراغ ئاوێك یان دورگەیەك گیربێت دەسەلاتی خۆی بەسەر ناوچەو وشکاییە پان و بەرینەکاندا بسەپێنێت وەکو فینیقی‌یەکان و یونان و دەوڵەتی شارەکانی ئیتالیا لەسەدەکانی ناوەراستداو پورتوگال و هۆلەندی‌یەکان و فەرنسایی‌و ئنگلیزەکانیش یەك لەدوای یەك ملی ئەم بەربەرکانی‌و رێبازی چاولە خاك و سامانی ولاتان و گەلانی تریان گرتبووە بەر. بویە یەکەم جار بەباسی هێزی دەریایی بابەتەکە دەست پێ ئەکەین.

ئەمە جگەلەوەی کە باسکردنی هیزی دەریایی ئەبێتە

بەراوردکردنێکیش لە نێوان هێزی دەریایی و هێزی زەمینیدا.

## (هێزی زەریایی)

نیاز لەم باسە ئەولایەنەی هێزی دەریاییە کەتوندوتۆڵ بە ئایدیولوجیەتی جیۆپۆلیتیکسییەکانەوە بەستراوە کە بیر لە هێزی دەریایی دەوڵەتێك ئەکەنەوە تاکو بیگەیەنە ئاستێکی ئەوتۆ، دەوڵەتەکەی پێ بکەن بەگەورە ترین دەوڵەتی سەرزەمین و سەری دەوڵەتانی تری لەئاستی ئەو دەوڵەتەدا پێ دابنەوێنن، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە لایان وابووە کە هێزی دەریایی بۆ جێبەجێ کردنی ئەم نیازە لە هێزی زەمینی بەکەڵك و بایەخدارترە چونکە بە ئاسانی و بێ هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکی ئەوتۆ ئەتوانێت بگاتە هەموو سوچوکوچە یەکی زەمین.

ئەوی راست بێت ئەلفریدثایەر ماهان ئەدمیراڵی ئەمەریکایی لەهەموو پسپورو ئایدیولوجیستە دەریاییەکانی تری جیهان زیاتر لە باسی هێزی زەریاییدا دەست رویشتوو بەناو بانگ ترە.

لەساڵی 1890دا کتێبێکی بەناوی (هێزی زەریایی مێژوو بەرەوکۆی ئەبات) بلاوکردەوە بوو بە یەکێك لەسەرچاوە گەورەکانی جیۆپولیتیکسی زەریایی. بیرو باوەری ماهان نەك هەر لەولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا جێگایەکی دیارو شایستەی هەبوو بەلکو فەرنساو ئیتالیاو روسیاو ژاپون و گەلێ دەوڵەتی پچوکی دەریایش دوی کەوتن و کەڵکیان لێ وەرگرت.

هۆی پێش کەوتنی ماهان ـ پش لەم کۆرەدا ئەوەبوو لەولاتێکی گەورەی خاوەن ساحل لە سەر دوو ئۆقیانوس ئەتلەنتی و پاسفیکدا وەکو ئەفسەرێکی زەریایی کاری ئەکردو بیروباوەری خۆی بلاو ئەکردەوە، جا لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بە هۆی برادەرێتی لەگەڵ تیودۆر روزفلت وە هەنری کابوت لوج دا، هەمیشەو کار بەدەستە دەست رۆیشتووەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای ئەو کاتەدا کە لە قاوغی ئەوسایان بچنە دەرەوەو روو بکەنە ئەودیو دەریا واتا ئەوولاتانەی لەوبەر دەریاوەن.

لەپێش ماهان دا دەوڵەتی ئەمەریکا ئامانجێکی دوو لانەی بە هێزی دەریایی سپاردبوو، یەکەم پاراستنی سنوورە دەریاییەکانی ئەمەریکا دووەم هەڵکوتانە سەر پاپۆری بازرگانی ولاتانی ناحەز بە ئەمەریکا کە ئەم دوو فرمانە هێزی دەریایی ئەمەریکای خستبووە قەوارەیەکی تەنگ و ئامانجی پەل هاویشتن بوناو ولاتانی تری ئیفلیج کردبوو. چونکە بەلای جیوپولیتیکسەکانی ئەمەریکاوە پیویستە بە هێزی دەریایی دەست بەسەر ولاتانی تردابکیشن.

لە ساڵی 1884دا سەرەکی کولیجی زەریایی لە نیوپۆرت ئەمیرال ستیفن ـ ب ـ لوس داوای لەماهان کرد دەربارەی مێژوو تاکتیکی دەریایی بیروباوەری خۆی بۆ خوێندکارانی کۆلێجەکە باس بکات ئیتر دوای ئەمە ناوبانگی شارەزایی دەریایی لە جیهاندا بلاوبووەوە.

ماهان لە ساڵی 1859وە ئەفسەرێکی دەریاییە، لە ساڵی 1878دا کتیبی «ئەفسەرو سەرباز لەکاروباری زەریایی فێرکردن» بلاوکردۆتەوەوە لە ساڵی 1883دا کتیبی «ئاوی کەنداو دورگەی بلاوکردۆتەوەوە لە ساڵانی 1890 و 1892 و 1905دا سێ بەرگی گەورە کتیبی بلاوکردۆتەوە کە بەپایەی مێژووی دەریایی و سیاسەت و تاکتیك و ستراتیجییەتی زەریایی ئەژمێردرێن.

ئەدوارد میدئیرڵ دانەری کتێبی «پێشەنگەکانی ستراتیجییەتی نوێ» دەربارەی ماهان ئەڵێت[11] «ماهان دەربارەی ستراتیجییەتی نوێ ئەم بایەخانەی خوارەوەی هەبووە: ـ

1 ـ فەلسەفەیەکی بۆ هێزی دەریایی داناوە، نەك هەر لەناو دامەزراوە دەریاییەکان بەلکو لە دەرەوەی ئەوانیشدا رێزی لێ گیراوەوە خۆی گەیاندۆتە ناو دەزگاو ریکخراوە حکومەتییەکانی زۆر ولاتانی جیهانەوە.

2 ـ تیۆری یەکی نوێی بۆ ستراتیجییەتی زەریایی دانا.

3 ـ سەرکەوتووانە تاکتیکی دەریایی ئەنرخاند.

سەبارەت بەوەی ماهان ئەوەندەی بە هێزی زەریایی رەوانە ئەبینی کە تەنیا بەشێك بێت لەقەوارەی گشتی هیزی چەکدارو فرمانی پاریزگاری پاپۆری بازرگانی ولات و یاریدەدانی هێزی چەکداری پاریزەری ولاتی پێ بسپیریت، ئەم شەش خاڵەی خوارەوەی بەمەرجی گرنگ و پێویست ئەزانی کە هێزیکی دەریایی مەزنی پێ دابمەزرێت لە ئوقیانوسەکانە وەبەرەو ولاتانی تر ببرێت و ببێت بە دەزگایەکی کاریگەری سیاسی پایەی

ولاتی پێ بەرزبکاتەوە:

1 ـ هەڵکەوتی جوگرافی.
2 ـ گونجاوی سروشتکار.
3 ـ گەورەبوون و کشانی هەرێم.
4 ـ دانیشتوان.
5 ـ رەوتی بیرو باوەری خەڵکی وڵات واتا رەوتی نەفسییان.
6 ـ رژێمی سیاسی دەوڵەت و ئاراستە کردنی خەڵکەکەی.

بەلای ماهانەوە هەلکەوتێکی جوگرافی نایابی بەریتانیا هێڵە دەریاییەکانی لە بەریتانیاوە بۆ ژووروی ئەوروپاو بەپێچەوانەشەوە، خستۆتە ژێر دەسەلاتی یەوە، هەروەها سەبارەت بەوەی دوورگەی گرنگ و بنکەی ستراتیجی وەکو جەبەل تاریق ی بەدەستەوەیە دەریای سپی ناوەراستی گەوتۆتە ژێر دەسەلاتەوە کە بەم دەسەلاتداریتی یە، لە کۆری بازرگانی و جەنگ ـ ی جیهاندا دەوڵەتێکی زۆر دەست رویشتووە.

دەربارەی گونجاوی سروشتکار ئەڵێت ئەمیش خەڵکی ئەخاتە سەر ئەو بارەی شوێنێکی شایستە بۆ وڵاتەکەیان دابمەزرێنن، چونکە سەردەریایی هاتوو چۆی خەڵکەکەی لەدەریای پان و بەریندا ئاسان ئەکات وە بەندەری ریکوپێکیش ئەبێ بە پشتیوان وە چۆنیتی خاکەکەش یان خەڵکەکەلە زەریا دوور ئەخاتەوە یان بۆمسوگەر کردنی باری ژیان و گوزەرانیان بەرەو زەریا رایان ئەکێشێت.

دەربارەی ئەم خاڵانە ماهان لای‌وایە، کە گەل پێویستە ئەو راستییە بزانێت کە «ئەوهێزەی پێویستە هەبێت لەگەڵ ئەو هێزەی کەخۆی هەیە دوو شتی‌چوون یەك نین بۆیە پێویستە ئاستێکی لەنگەر گرتوو لەنێوانیادا هەبێت».

واتە پێویستە هەموو نەتەوەیەك بای ئەوەندەی کەڵکی لێ ئەبینێت هێزی بە دەستەوە بێت.

دەربارەی بەریتانیا ئەڵێت ئەو بازرگانی یە زەریاییە فراوانە دەسەلاتی دامەزراندنی دامەزراوانی زەریایی بەریتانیایان کرد بە دەوڵەتێکی خاوەن هێزی زەریایی مەزن.

لە بەشەکانی پێشوودا بەدووررو درێژی باسی خەلك و هەریم و گەورە بوونی هەرێم و کشان بەسەر خاکی وڵاتاندا کراوە بۆیە لێرەدا بە کورتی باسی خاڵە باس نەکراوەکان ئەکەین.

دەربارەی خاڵی پینجەمیش بە پێویستی ئەزانێت کە خەڵکی ئەووڵاتەی هێزی دەریاییان هەیە بەبێ ئارەزوویەکی نەفسی تایبەتی ناتوانن هێزێکی دەریایی گەورە دابمەزرێنن چونکە ئەبێ ئارەزووی دەرپاوانی بکەن وەحەز بەدەستەلاتداری بکەن تا ئەو شتە بەرهەم بهێنن کە بازرگانی پێش ئەخات. جا لێ هاتوویی حکومەت بەمەرجی گەورەی سەرکەوتنی ئەم فرمانە لە قەڵەم ئەدات چونکە هێزی دەریایی‌و ژمارەی کەشتی وتفاق و چەکی دەریایی‌و دەزگا دەریاییەکان بەدەست حکومەتەوەیە.

دامەزراوە دەریاییەکان ئەبێ لەئاستێکدابن کەلەکاتی جەنگدا بەپەلە گەشە بکەن. ئەوانە ئەتوانن دەرپاوانەکان بو جەنگ و خۆ راگرتن بەرامبەر دوژمن سازبدەن.

هەروەها بیروباوەری ستراتیجی، کە لەلایەن حکومەتەوە نەخشەی ئەکێشریت هێزی دەریایی ئەخاتە سەر ریبازی سەرکەوتن یان دەستەوسان وەستانن.

فەرەنسا بەنموونە ئەهێنێتەوە کە هەمیشە میرە دەرپاوانەکانی خۆی هان ئەدا بەپانایی ئوقیانوسەکانا گەشت و گوزار بکەن بێ ئەوەی ئارەزووی پێکا هەلبژانێکی ئەوتۆ لەگەڵ هێزی دەریایی وڵاتانی‌تردا بکەن کە پاپورەکانیان دوو چاری زەرەرو زیان بکەن.

بەم جۆرە بیروباوەرە هەمیشە هێزی دەریایی فەرەنسا دەستەوسان بەرامبەر هێزی دەریایی بەریتانیا ئەوەستا.

ئەوی راست بێت ئەلفرید ماهان لە سەرەتای ژیانی‌یەوە دوژمنی ئیمپریالیزم بوو، بەڵام دوای ئەوەی تێکەڵی هێزەکانی دەریایی ئەمەریکا بوو وەکەوتە نەخشەکیشانی دامەزراندنی هێزێکی زەریایی گەورە گەیشتە ئەو بروایەی کە پەیوەندی‌یەکی زۆر توند لە نێوان وڵاتان داگیرکردن و هێزی دەریایی‌دا هەیەو لەم بارەیەوە ئەڵێت[12] «دەوڵەتی دەریایی بەژێر دەستەکردنی وڵاتان جێ‌پێ‌ی خۆی لە خاکی بێگانەدا ئەکاتەوە، وەدەرگا بۆ بازرگانی خۆی ئەخاتە سەرپشت و ناوچە یەکی نوێ بۆ پاپورەکانی ئەدۆزێتەوەو وکاری زیاتر بۆ خەلکەکەی پەیدا ئەکات و بەمەسامانیان ئەخاتە بەردەست».

بۆیە ماهان دوو خاڵی زۆر لاگرنگ بوو، یەکەم هێزی دەریایی دەربارەی چارە نووسی جیهان چی‌پێ ئەکریت، دووەم

هێزی دەریایی و هێزی زەمینی کامیان گرەوی سەرکەوتن ئەبەنەوە.

بۆیە ماهان دەپەراندنی هێزی دەریایی دوژمنی لەدەریاو ئۆقیانووسەکاندا بەگەوهەری بیروباوەڕی ستراتیجی ڕاست ئەزانی. لەم بارە یەوە ئەڵێت[13] «دەست بەسەر چەند پاپۆڕیکدا گرتن، ژمارەیان زۆر بێت یان کەم سامان و دەرامەتی میللەتەکەی لەبن ناهێنێت، بەڵکو ئەم فرمانە بەوە جێبەجێ ئەکریت ئاڵای ئەو میللەتە لەدەریاکانا نەشەکێتەوە، بەهێزێك ئەکریت ڕێگای هاتوچۆی بازرگانی لە پاپۆڕەکانی دوژمن بەبستێت، ئەمەش بەهێزی دەریایی گەورە نەبێت نایەتەدی».

بێگومان کەماهان دەربارەی دەریاو دەریاوانی و هێزی دەریایی و ئنجا بیرکردنەوە لەدەست بەسەر دەریاو ئۆقیانووسەکانی جیهاندا گرتن تادەست بەسەر زەمیندا بگیریت، دەستی کرد بە نووسین.

ئەوساکە ئەورووپا کەوتبوە کۆری شۆرشی پیشەسازییەوە وچینی بۆرجوازی وەکو چینێکی شورشگێری حەز بەچوونە کۆری کشتوکاڵ و پیشەسازییەوە کەوتبوە چالاکی و جوڵانەوە، هەروەها بەرە بەرە چینی دەرە بەگ و پایزگار خوازەکان ڕێگایان بۆ ئەم چینەو زانست و پیشەسازی نوێ و هێزی چەکداری خاوەن تەکنولوجیای بەرز چۆڵ ئەکرد وەهێزی دەریایی چ هی بازرگانی یان هی عەسکەری وەکو لاوێکی چالاکی خوێن گەرمی تاقەسواری مەیدان بەرەو پێش ئەرویشت بەرێوە بەڵام لەگەڵ پێگەیشتنی چینی بۆر جوازی و پیشکەوتنی پیشەسازی و تەکنولوجیا لە هەموو کۆرو مەلبەندێکی ژیاندا هێزی زەریاییش پێ ئەگەیشت و کامڵ ئەبوو، بۆیە ئایدیولوجییەتی ماهانیش پانەندی ئەم یاسایەبوو، لەزۆر ڕووەوە بیروباوەڕی ڕاست و بایەخداری دەربارەی هێزی دەریایی بلاوکردۆتەوەو لە هەندی ڕووشەوە سەبارەت بەوەی ڕەورەوەی پیشکەوتن، بیروباوەڕەکانی بەجێ هێشتووە، دوو چاری ڕەخنەو هێرش بووە.

لەسەرەتای نووسینەکانیدا نەفرۆکەو نەژێردەریایی (غواصە) دەستیان هەبووە لەکۆری جەنگی دەریاییدا بۆیە کە ئەم دوو ئامرازە چەکدارە هاتنەکایەوە هەندی تیۆری دەریایی جەنگی لەئاستیانا پاشەکشییان کرد. وئەم لێکۆڵینەوەیە کەوتە نێو ئایدیولوجیستە عەسکەری یەگەورەکانی ولاتە گەورەکانەوە.

کەلە جەنگی یەکەمی جیهاندا هەندی پاپۆڕی ئەڵمانی لەئاسمانەوە درانە بەر بۆمباو ناچار بوون خۆیان بە دەوڵەتە هاو پەیمانەکان (الحلفاء)دا بەدەستەوە، تاقیکردنەوەیەکی نوێ کەوتە کۆری جەنگی دەریاییەوەو عەسکەرییەکان کە تا ئیستا هەر لەم جۆرە دیاردەیە ئەکۆڵنەوە وەکو ئەدواردمید ئیرل ئەڵێت[14] «مرۆڤ لەدوو ڕای لەگومان بەدوور نزیك نەکاتەوە»:

1 ـ پاپۆری جەنگی بەبێ پایزگاری کەرێکی ئاسمانی ناتوانێت لەدەریای تەنگە دا دەریاوانی بکات، چونکە فرۆکەی دوژمن لەبنکەی زەمینییەوە هەڵئەکوتێتەسەری.

2 ـ ئەبێ پاپوری جەنگی لەدەریای سەر بەتاڵ دا لەدوو چەك بپارێزریت، فرۆکەو ژێردەریایی.

بۆیە لە جەنگی دووەمی جیهان دا پەنابرایە بەر ستراتیجییەتێکی دەریایی نوێ و پاپۆری فرۆکە هەڵگر لەریگا زەریاییە دوورەکاندا وەکو هێزێکی پاریزەرو هێرش بەر خرایە کۆری جەنگەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ماهان هەر بە ئایدیۆلۆجیستی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەزانراو لەسەر نەخشەی ئەو ئەرویشتن بەرێوە.

بەپێی لێکۆڵینەوە مێژووییەکانی ماهان لەساڵی 1890دا لەولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یاسای دەریایی لەکونگریسی ئەمەریکادا بریاری لەسەردرا.

ئیتر شان بەشانی دروست کردنی پاپۆری جەنگی هەمە جۆرە، دەست کرا بە دروست کردنی (بارجە)ش. مستەر هەربەرت وەزیری دەریایی ئەمەریکا بەپێی بیروباوەڕی ماهان کە لەکتیبی «هێزی دەریایی لە ساڵی 1793 ـ 1812دا چی لەشورشی فەرەنساو ئیمپراتۆرییەتی فەرەنسا کردووە» بریاریدا کە پاپۆری جەنگی گەورە پاریزگاری سنووری دەریایی پێبسپێریت. هەربەرت بروای بەوە هەبوو کەهێزی دەریایی سوودی نیشتمانی لە دەرەوەی ولات پێ ئەپارێزریت و لەکاتی ئاشتیشدا ئەبێت بە پشتیوانی دیبلوماسی یەت.

ئیتر ئەمەریکا بەپێی بیروباوەڕی ماهان کەوتە دەست درێژیکردن، کوبای لەئیسپانیا سەندەوەو دەستی گرت بەسەر دەریای کاریبیدا وپورتوریکوی خستەسەر ولاتەکەی خۆی، هەروەها لە ساڵی 1898دا دەستی بەسەر فلیپین ـ یشداگرت وە

لەسەر سیاسەتی خۆگەورەکردن و داگیرکردن ڕۆیشت بەرێوە تا لە ساڵی 1899دا ئەرخەبیلی ساموا ـ شی کەوتە ژێر دەستەوە لە ساڵی 1901دا دوای کوشتنی ماك کینلی، تیۆدور ڕوزفلت سەرکۆماری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای کەوتە دەست ئیتر بەتەواوی فەلسەفەی ماهان دەربارەی هێزی دەریایی لەکۆشکی سپیدا جێ‌پێی خۆی قایم کردو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەهۆی سیاسەتی دەریا خوازی ڕوزفلت ـ ەوە بووبە دەوڵەتێکی دەریایی گەورەی جیهان.

ئەدوارمید ئیرل ئەڵێت[15] ئەگەر ئەلفرید ماهان لە ساڵی 1914دا نەمردایە لە ساڵی 1915 چەپڵەی بۆ سەرەك ویلسون لێ‌ئەدا، کە داوای لەکونگریسی ئەمەریکا کرد کە هێزی دەریایی ئەمەریکا بگەیەنێتە ئاستی بەهێزترین هێزی دەریایی لە جیهاندا».

وەهەر بەکردەوە یاسای دەریایی ساڵی 1916 هێزی دەریایی ئەمەریکای گەیاندە بەهێزترین هێز لە جیهاندا.

پرۆفیسور جەنەراڵ کارڵ هوسهوفەری ئەڵمانی بەماهان ئەڵێت[16] «ماهان جیۆپۆلیتیکسیکی هەڵکەوتووبووە بەرێگا یەکی ڕاست ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای خستۆتە سەر ڕێگای مەزنێتی‌یەوەوە ئەو سیاسەتە مەدارەکانی ئەمەریکای فێرکردووە وەك هێزیکی جیهان گەردی خاوەن ڕوو بەرێکی پان و بەرین بیر لە خۆیان بکەنەوە».

ماهان ئەوەندە ناوبانگی دەرکرد کە لە ساڵی 1893 ـ 1895دا چووبو بەریتانیا شێوی ئیوارەی لەسەر خوانی شاژنی بەریتانیا خواردو سەرەك وەزیرانیشیان لەگەڵدا بەشداربوو جگە لەوڕێزونازناوەی لە هەردووزانکۆی ئۆکسفوردو کێمبرج ـ ەوە لێی نراو، کرا بەمیوانی یانەی دەریایی شایانەی بەریتانیا کە هەر بۆ هاوولاتی خۆیان تەرخان کرابوو.

ئەمیراڵ ڕاؤول کاستکس ـ ی فەرەنسایی ئەڵێت[17]

بیروباوەری ماهان دەربارەی پێویستی سەر دەستەیی هێزی دەریایی و دامەزراندنی هێزیکی ڕیکخراوی کاریگەر پایەیەکی بەهێزی تیۆری ستراتیجی عەسکەرییە.

وەدەربارەی بیرو باوەری ماهان سەبارەت بە هێزی دەریایی کە ئەبێ پەیداکەری ولاتانی ژێر دەستەبێت و بازرگانی لەوبەر دەریاوە پەیدابکات لە ساڵی 1894دا ئیمپراتوری ئەڵەمانیا نامەیەك بو برادەرێکی خۆی ئەنێرێت وئەڵێت[18] «من ناخوێندمەوە، بەلام لەکتێبەکەی ماهان تێ گەیشتووم وە هەوڵ ئەدەم هەمووی لەبەربکەم، چونکە لەکتێبە هەرە بەنرخەکانە، ئەم کتێبەلە هەموو پاپوریکمانـدا هەیە، هەموو ئەفسەرە دەریاییەکانم شتی لێ فێر ئەبن».

وە ئەلفرید ڤۆن تیربتز کە ئاراستەکەری سیاسەتی دەریایی ئەڵەمانیا بوو ئەیوت کە ماهان باسی ئەم دوو وشەیە (هێزی جیهانی) ئەکات نیاز لەو هێزەیە کە دەستکەوتی لەهەموو سەرزەمینێدا هەبێ.

هەرچەندە ئەڵەمانەکان پشتیان بەهێزی زەمینی لە هێزی دەریایی زیاتر ئەبەست وە بەر بەرکانی‌یان لەگەڵ هێزە دەریاییە دوژمنەکانی خۆیاندا بەفرۆکەو ژێر دەریایی ئەکرد، بەلام هەر شوێنێکی شایستەیان بوبیروباوەری ماهان لە کۆری ستراتیجی‌یەتی دەریاییدا دانابوو.

ئایدیۆلوجیستەکانی ئەڵەمانی سەربە هێزی زەمینی ئەیانوت هێزی دەریایی بەرامبەر پێش کەوتنی هێزی زەمینی وتەکنولوجیای چەکی زەمینی نوێ لەپاشەکشێدایە.

بێ‌گومان پەیدابوونی لەغەم و طورپیدو فرۆکەی جەنگاوەرو بومبا هاوێژ گەلێك لە بۆچوونەکانی ماهان و هاوبیرەکانی لەگرێژەنەبرد ئەو هەوڵ و تەقەللایەی ڕوژ ئاواییەکان دوای ساڵ 1917 دایان بۆ زیندە بەچاڵ کردنی شۆرشی بۆلشەویکی نەونەمام، بەلام گەشەکردنی هێزی زەمینی یەکێتی سوفییەت بۆ هەموو جیۆپۆلیتیکەکانی سەلماند کە هێزی زەمینی هێزێکە بەرەو هەوراز ئەکشێت و سەر ئەکەوێت.

لەهەمووی خۆشتر بیروباوەری ئەمیراڵ ڕائۆل کاستکسی فەرەنسایی بوو کە پێنج بەرگی گەورەی لەسەر ستراتیجی‌یەتی دەریایی نووسیوە، لەو بڕوایەدا بوو کە پایەی دەریایی بەریتانیا وردە وردە هەرەس ئەهێنێت و بەهۆی ئەم هێزەوە دەستکەوتێکی کە متری لەچەرخی پاپۆری چارۆکەدار (السفن الشراعیە) دەست ئەکەوێت کەچی لەم دواییەدا مارگرێت تاتشەر، سەرەك وەزیرانی ئیستای بەریتانیا دورگەی فۆکلاندی هەربە هێزی دەریایی لە جەنەراڵەکانی ئەرجەنتین سەندەوە.

دیسان کاستکس وەکو گەلێك خاوەن تیۆری ئیتالیایی و فەرەنسایی بڕوای بەوە هەبوکە هیزی دەریایی هیرش بەر کات و

ریگا یەکی زۆری ئەوێت تاکو جیگایەکی نیشانەکراو گەمارۆبدات وە ژیردەریاییو هیرش بردنی ئاسمانی کاروکردەوەی هێزی دەریاییان لاوازکردووە. وەبڕوای بەوە هەبوو کە یەکێتی سۆڤییەت وچین خۆیان لەمەترسی هێزی دەریایی رزگارکردووە.

هەروەها بەرگێك کتیبی بۆ بەربەرەکانی هێزی زەمینیو هێزی دەریایی تەرخان کردو بەراوردی چەرخی جەنگیزخان و هی ستالینی تیاکرد، یەکێك لە ئەمیراڵە فەرەنساییەکان کە هاوبیری کاستکس بوو بڕوا بەوەی کەستالین دیارە ستالین وەکو فەرماندەی هێزیکی گەورەی زەمینی لە دواوۆدا فەرنسا لە تەنگوچەڵەمە رزگار ئەکات، پەیکەرێکی نیو بالای بۆ ستالین دروست کردبوو، ئەوەبو پێش بینییەکەشی لە جەنگی دووەمی جیهاندا هاتەدی.

بەڵام وڵاتی ژاپون کەلە دورگەیەکی گەورەو چەند دورگەیەکی تر پێك هاتووەو ئەبوایە لەهەموو هێزیك زیاترپشتی بەهێزی دەریایی ببەستایە کەچی ئایدیولوجییەتی دەرییاییو ستراتیجییەتی جەنگی، جیاوازی یەکی دیارو ئاشکرای هەیە لەگەڵ دەوڵەتە دەرییاییەکانی سەرزەمین دا.

ژاپۆن کەلە لەساڵی (1894 ـ 1895)دا جەنگی دژی چین هەلگیرساند ولە ساڵی (1904 ـ 1905) دژی روسیا لە هەردوو جەنگەکەدا بەتەمای ئەوەبوو جەنگێکی بین بڕی سەرکەوتووبێت. هەوڵیدا رێ بەستە لەو دوو وڵاتەبکات کەچی لەساڵی 1941دا لە جەنگی دووەمی جیهانیدا لەسەر ئەم رێبازە نەرویشت بەریوە. لەگەڵ ئەوەشدا شارەزابوون لە تاکتیك و ستراتیجییەتی ژاپونی کارێکی دژواروو گرانە چونکە ژاپونییەکان هەرشتە لەکاتی خۆیدا باسی ئەکەن و لیٚ ی ئەکۆڵنەوە، گۆیش نادەنە ئەو باس و لیکۆڵینەوانەی راستەوخۆ پەیوەندی بەخۆیانەوە نەبێت. ئەمە جگە لەوەی کەبە پیٚ ی سیاسەتی حکومەتانی ژاپۆن کەس نابیٚ بیروباوەرو رێبازی ژاپون لەناو گەلاندا بلاوبکاتەوە بەڵکو هەر باسکردن و لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی کاروباری عەسکەری هەبێت ئەبیٚ لە شوێنی نهێنیدا بپاریزرێت، بویە لەژاپون ئایدیولوجیستی وەکو ماهان و کۆرپیو کاستکس پەیدانەبووە.

بیٚ گومان رەوشتورەفتاری ژاپۆنییەکان چ لە کۆری تیۆریو بلاوکردنەوەداو چ لە کۆری تەماعکاریو داگیرکردن دا پەیوەندییەکی توندو تۆڵی بەهۆیە مێژوویی و ئایدیولوجییەکانی خۆیانەوە هەیە کەهەرلەسەرەتای کوچ کردنیانەوە بۆ ئەم پارچە زەوییەی ئیستاتیایا ئەژین تا ئەمرۆژەی ئیستایان خۆی گرتووەو راست بۆتەوە.

هەڵکەوتی ژاپون لەئاسیادا وەکو هەڵکەوتی بەریتانیا لە ئەوروپادا وابوو بەڵام بەریتانیا کەوتبووە تەك چەند دەوڵەتێکی ئەوروپایی بەهێزو ژاپۆن کەوتبۆوە نزیك دەوڵەتانی بیٚهێزەوە. ئەمە جگە لەوەی کە چەند هۆیەکی تر یارمەتی دەست دریژی ژاپونییەکانی داو ریگای جەنگ خوازی بۆ خۆش کردن وەکو نەبوونی هێزیکی چەکداری گەورە لە ناوچەکەیاندا، واتە لەخوارووی رۆژ هەڵاتی ناوەراستداوە هەلکەوتی دوورە دەستی وڵاتی ژاپون و هەلکەوتی دورگەکانی ژاپون لەناو ئوقیانوسی باسفیك دا. لەگەڵ ئەم هەمو هەلومەرجە لەبارەداو گەلی هەلومەرجی لەباریتر کە باسکردنی هەموویان لەم نووسینەدا جیگای نابێتەوە، ژاپونییەکان هیزی دەریاییان بۆ گواستنەوەی سەربازو پاراستنی پاپوری سەرباز هەڵگر بەکار ئەهانی هەرچۆن لەکاتی خۆیدا لەخاکی پیشووی خۆیانەوە بەهەمان ریگا لەنیشتمانی ئیستاپانا، دابەزیون و داگیریان کردووە. خەلکی ئیستای ژاپون سەدەیەکی رەبەق جەنگ و کوشتاریان لەگەڵ خەلکەرەسەنەی ژاپون دا کردووەتا بەزۆر بەرەو ژووررووی ژاپۆن راویان ناون و خۆیان لە شوێنی ئەواندا دامەزراندووە. هەر لەوکاتەوە وەکو لە جەنگی دووەمی جیهانیشدا بەپاپورەکانیان سەربازیان گواستۆتەوە سەرو شکانیو بەهێزی زەمینی سنوورە سەر زەرباییەکانیان لە شوێنەکانیتر داماڵیوەو ئەم شان و ئەوشانی هێزەکانی دوژمنیان بەهێزی زەمینیتە نیوە.

بەم شێوەیە چیموتینو، کە یەکەم ئیمپراتۆری ژاپۆن بووەو لەنێوان ساڵی 660 تا 585ی پێش زایینی فەرمانرەوابووە، لە دورگەی کیۆشۆوە کە کەوتۆتە خوارووی ژاپۆنەوە لەدەریاکانی ناوخۆوە خۆی گەیاندۆتە شاری ئوساکا لەسەر رۆخی خوارووی دورگەی هونشو.

بەڵام هەوڵ وتەقەللای قوبلای خان ئیمپراتۆری مەغول کە لە سالی 1274و 1281 زایینیدا ژاپون داگیربکات ژاپۆنییەکانی راچڵەکاند. مەغولیکان دورگەی تسوشیمایان

داگیرکردو سەربازیکی زۆریان لەرۆخی کیوشودا دابەزان و زەرەرزیانیکی زۆریان لە پاپورەکانی ژاپون دا. ژاپونی‌یەکان گورج و گۆلی‌یان کرد بە دەستکەلای خۆیان بەلام مەغولی‌یەکان پاپۆرەکانیان بەکۆکۆیی بۆخۆیان ئەکرد بەقەلای خۆپاراستن.

هەر لەسەر ئەم رەوتە ژاپونی‌یەکان لەدوای جەنگی ژاپون وروسەوەتا سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهان پاپۆرە جەنگی‌یەکانی خۆیان بەشێوەیەك دروست ئەکرد کە تیژ رەووو فرە ئاگرهاوێژ بێت، پاپورەکانیان لەیەك کاتدا ئەیان توانی هەموو چەکە دامەزراوەکانیان بەکار بهینن، جگە لەوەی بەهوی تەکنولوجیای هایدرولیکی و کارەباوە درەنگ لەکار ئەکەوتن و بەرگەی زەرەروزیانی دوژمنیان لە پاپوری هاوشانی خۆیان زیاتر ئەگرت.

لەساڵی 1937دا کەژاپون لەناکاو جەنگی دژی چین هەلگیرساند ژاپونی‌یەکان پشتیان بە هیزی زەمینی بەست و پاپوریان هەر بۆ سەرباز گواستنەوە بەکار هانی، تەنانەت نەیان ویرا بارجەکانیان بخەنە کۆری جەنگەوە، بەپاپۆرە کۆنەکانیان سەربازەکانیان لەرۆخی خاکی چین دا دائەبەزان و هەربەو پاپۆرانەش دابەزینەکەیان پاریزگاری ئەکرد.

هەرچەندە ئەمیراڵ یۆنای وەزیری زەریایی ژاپون لە ساڵی 1937دا ئەیوت[19] «سیاسەتی هێزی دەریایی ئیمە تێك دانی بنکەی فرۆکەو فرۆکەخانەکانی دوژمنە، تاکو فرۆکەکانی دوژمن نەگەنە خاکی سەرەکی ژاپون» بەلام هەر نیازی لەوەبوگەلانی ناوچەکەو ئەوروپا بەم قسانەفریو بدات گوایە نیازی خۆ پاراستنە نەك داگیرکردن» کەچی بەکردەوە رۆخەکانی کوریاو فروکەخانەو بەندەرو بنکە عەسکەری‌یە گرنگەکانی چینیان داگیرکرد. وەهەر دوای ئەوە روویان کرد هندی چینی هەرلە کوریاوە تا تایلاندو سنوری مەلایو.

ئەوی راست بێت تیوری‌و نەخشەکانی ئەمیرال توجوی سەرەك وەزیران هیچ جیاوازی‌یەکی ئەوتوی لەگەڵ هی‌پیشینیانی ژاپونی‌دا نەبوو.

واتە ئەرکی گەورەی جەنگ نەخریتە سەر هێزی دەریایی. بێ‌گومان بەشدابوونی ژاپون لە جەنگی دووەمی جیهانی‌و لەگەڵ دوژمێکی گەورەی خاوەن هیزێکی دەریایی سامدار هیزی ئەمەریکا کەوتنە جەنگەوە، ناچاری کردن کەچاویك بە نەخشەی جەنگی رابوردوویانا بخشیننەوە. چونکە ژاپون شوێنە ستراتیجی‌یەکانی لەکیس چووە گەلی شوینی بایەخدارو گرنگ لەنزیك خاکی ژاپونەوە کەوتنە دەست دوژمنانی ژاپونەوە جگە لەوەی دوژمنەکانی ژاپون پر بەدڵ حەزیان بە پەلاماردانی ژاپون ئەکرد.

لەگەڵ ئەمانەشدا هەموو، ئەدوارد میدئیرل دەربارەی ئەم باسە ئەلێت[20] «هێزی زەریایی ژاپون، پشتیوانی سوپای ژاپونی پێ سپیرراوەوە هەروا ئەگونجیت کە لەگەل ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو بەریتانیا جیاوازی هەبێت چونکە لای ئەوان هیزی دەریایی هێزە گەورەکەیەو پشت بە هێزیکی زەمینی پچوك ئەبەستێت. هەروەها لەگەڵ بیرورای فەرەنسایی‌و ئەڵەمانیشدا جیاوازی هەیە چونکە ژاپون هەموو ئامانجەکانی لەسەر زەمین وەبە هوی هێزی زەمینی‌یەوە دەست ئەکەون».

بەکورتی ئایدیۆلوجی‌یەتی هێزی دەریایی بەپێی بۆچوونی جیۆپولیتیکسی لەسەر دوو پایەی سەرەکی دامەزراوە، یەکەمیان لای خاوەنانی ئەم ئایدیولوجی‌یەتە لە هەموو هیزەکانی‌تر گرنگ و بایەخدار تربووەو هێزی سەرەکی بووە بۆجێبەجێ کردنی ئاوات و ئامانجەکانیان نەك وەك ئاسایی بەشیك بێ لە هێزی گشتی ولات ولایەنێکی فرمانی هێزی چەکداری پێ بسپیریت. دووەم ئەم هێزە فرمانی لە سنووری ولات پاراستن رەت ئەبێت و ئەبێ بگەینرێتە ئاستێك بەئارەزووی فەرمانرەواکانی بە زەریاو ئۆقیانوسەکانی جیهاندا بسوڕێتەوە واتە بێت بەدەزگەیەك ئیمپراتۆری‌یەتی پێ دابمەزرێت و جیهانی پێ بخرێتە ژێر دەسەڵاتەوە.

بۆیە فردریك راتزڵ بەچاولێ کەری لەماهان کتیبی «دەریا سەرچاوەی مەزنیتی نەتەوەیە»ی بلاوکردەوە وەهەر لەم بارەیەوە ریچارد هینینگ لەبەراوردکردنی هێزی زەمینی‌و دەریاییدا ئەلێت[21] «... ئەو دەولەتە مەزنانەی لە مێژ ووی نوێ داهاتونەتەکایەوە، هەموو دەوڵەتی دەریایین و پشتیان بەهێزی دەریایی بەستووەو دەستیان بەسەر ریگای دەرییاییدا گرتووە».

## (هێنری زەمینی)

هێنری زەمینی هەروەکو هێزی دەریایی‌و ئاسمانی وبۆشایی

ئاسمان راستەوخۆ بەستراوە بەجیۆپۆلیتیکسەوە، نیازیش لە هێزی زەمینی ئەو هێزەیەکە دەست رویشتوو بێت لەئاست هیزەکانی تردا. دەربارەی ناوەرۆکی جیۆپۆلیتیکسی جیمس فیرجریف لە کتێبی (جوگرافیاو هێزی جیهانی)دا.

Geography and World Power

ئەڵێت[22] «سێ هەزار ساڵ لەمەو پێش مەڵبەندە هێزدارەکانی جیهان بریتی بوون لەناوجەرگەی پچوك پچوك جاریك لبەم لاولەولای رۆژهەلاتی ناوەراست و جاریك لەم لاولەولای ئەوروپا لە - میسرو عیراق و فارسی رۆژ ئاوا (نیازی میدیایە)و گریك و رۆماو بێزەنتی‌یەکان و بەغدای عەباسی‌یەکان و قاهیرەی فاتمی‌یەکان و مەمالیك و ئەستەمووڵی عوسمانلی‌و ئیسپانیاو پورتوگال و فەرەنساو ئینگلتەرەو هولەندە. ئەم مەڵبەندە سیاسی یانە لەئەنجامی دوو بەرەکی‌یەکی درێژخایەندا یەك بەدوای یەکدا ئەهاتن و ئەمانە (جیهانی بایەخدار بوون)، هەروەها جیمس فیرجریف درێژە بەباسەکەی ئەدات و ئەڵێت ئەم جیهانە پشت بەستوو بەهەلومەرجی جوگرافی تایبەتی خۆی توانی گەل و دانیشتوانی خۆی پێش بخات و داهاتی خۆی گەشە پێ‌بکات ئنجا دوای ئەوە رووبکاتە هەریم و داهاتی بێگانە لەو ناوچانەدا کە پێ‌گەیشتن و پێشکەوتنیان لەمان لەدوا تربووە».

بێ‌گومان لە خوێندنەوەی ئەم بەشە پچوکەی کتێبەکەیدا بۆمان دەرئەکەوێت کە زۆر بەوردی لەناوەرۆکی جیۆپۆلیتیکس گەیشتووەو سیاسەتی جیۆپۆلیتیکسی ئەو دەوڵەتانەشی روون کردۆتەوە، پێش ئەوەی ئەم جورە سیاسەتە ئەم ناوە نوێ بەشی لێ بنرێت.

ئنجا ماکیندەر ئەڵێت[23] «هەموو سەدەیەك جیۆپۆلیتیکسی خۆی هەیە». ئیمەش لەم چەند لاپەرەیەدا باسی هێزی زەمینی ئەکەین. لەبەر تیشکی زانستی جیۆپۆلیتیکسی ئەوکاتەی هێزی زەمینی لەهێزی‌تر لەهەندی لای سەزەمینیدا گرنگە و دەست رۆیشتوتر بوو.

هاڵفورد ماکیندەر جێگری سەرەکی کۆمەڵەی جوگرافیای شاهانەی بەریتانیا لەوتاریکدا کە لە ساڵی 1904 خوێندویەتی بەوە ئەڵێت[24] «ئەوانە مێژووی جیهانیان دروست کردووەوە لەمەولاش دروستی ئەکەن، دانیشتوانی رۆژهەلاتی ئەوروپاو دەشتەکانی رۆژهەلات و ناوەراستی ئاسیان، تەنگیان بەدانیشتوانی کەنار دەریاکانی ئاسیاو ئەوروپا هەلچنیوە». ئنجا ئەڵێت «راستە هێزی دەریایی پایەیەکی گەورە بوو، کە هێزێکی جیهانی پێ‌دابمەزرینرێت، بەڵام لەسەدەی بیستەمدا لەچاو سەدەی نۆزدە هەمدا بنکەی زەمینی زیاتری پێویستە لەبەر ئەوە هەر بە هێزێکی زەمینی دوورگەی جیهانی (ئەوروپاو ئاسیاو ئەفەریقا)ی ئەخرێتە ژیر دەستەوە.

وەئەم دورگەیەش هەر لەریگای زەمینی‌یەوە ئەبی بۆی‌بچیت».

بەلای ماکیندەرەوە، ئەڵەمانەکان دووچاری هەڵەیەکی گەورە بوون کە نیوەی ولاتی خۆیان لەناو ناوچەرگەدایە «Heart Land» وەنیوەکەتری لە ئەوروپای کەنار دەریادایە هێرشیان بردەسەر ناوجەرگە - روسیا - بەتایبەتی لەکاتێکدا کە بە جەنگی بەریتانیاشەوە هێزێکی گەورەی دەرییاییەوە خەریك بوون.

شارەزا عەسکەری‌یەکان لایان وایە کە تەنانەت فرۆکە خانەو بنکە جەنگی‌یە زەمینی‌یەکانی‌تر پاریزگاری‌یان لەناوچە جەنگی‌یە دەریاییەکان ئاسان ترە.

کە لە ساڵی 1943دا هەروەکو دەیان ساڵ لەوە پێش یەکیتی سوڤییەت بەڵگەی سەرکەوتنی یەك لەدوای یەکی ئەخستە پیش چاوی دەوڵەتان، ئەوەندەی‌تر پشتی ئەو جیۆپۆلیتیکسانەی بروایان بەسەرەتای (هەریمی ناوجەرگە) هەبوو قایم ترکرد.

هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو جەنەراڵ هۆسهوفەر زۆر بەوردی نوسینەکانی هاڵفورد ماکیندەری ئەخوێندەوەو ئەبو بەهاوبیری‌و بەپێی دەستکەوتی ئەڵەمانیا داوای جێ‌بەجێ کردنیانی ئەکرد.

لای هۆسهوفەر وابوو ئەگەر یەکیتی سوڤییەت وئەڵەمانیا کە بەناوجەرگەی جیهانی ئەزانین یەکبگرن کە خاوەنی هەموو هەلومەرجێکی ستراتیجین، بەمە ئەڵەمانیا ئەگاتە پایەی هێزێکی جیهانی. بەقەلا یەکی گەورەی ئەزانی کەلە (رووباری ئالپەوە لەرۆژ ئاوای ئەوروپاوە تا رووباری ئامور لەرۆژ هەلاتی ئاسیادا ئەگرێتەوە)وە ئەمە ئەبێت بەبنکەیەکی ناوەکی هێزە ئەڵەمانی‌یەکان ئەتوانن بۆ هێرش بردنە سەر هەموو لایەك بەکاری بهێنن. پیشەسازی‌یە بایەخدارەکانی لەهەریمە ناوەکی‌یە دوورەکانن، سامانی ئوکرانیاو قەفقاس و ئوراڵ ئەکات بەیەك.

ئەڵـەمـانیـا ئەکـات بەو دەوڵـەتـە بێ هـاوتـایـەی کە ئابووری یەکی پڕبەپێستی خۆی لەبەر دەستابێت.

هەروەها دەربارەی هێزی جیهانی گەورە فەردیك راتزل ئەڵێت [illegible] «پێـوەنـدی یـەکی تونـد لە نێوان هێزی زەمینی و هێزی سیاسی دا هەیە، رووبەری گەورەو داهاتی ئەم رووبەرە گەورەیە هەر لە دەوڵـەتی زەمین فراوانـدا دەست ئەکـەوێت، وەکـو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو روسیاو ئوسترالیا، کە بەراورد ناکرێن لەگـەڵ دەوڵـەتـەکـانی ئەوروپای رۆژئاوای خاوەن زەوی پچوك و داهاتی کەم».

وە لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی کە ئەمەریکاو دەوڵەتە رۆژئـاوایـیـەکـانی ئەوروپـا پەیمـانە عەسکەری کانیان دامەزراند بەلای عەسکەری بە ستراتیجی یە رۆژئاواییەکانەوە هەربۆ ئەوەبوو بە هێزی دەست وپەل (الاطراف) هێزی ناوجەرگە (Heart Land) گەمـارۆبـدەن. ئیتـر رەنگـە ئەم پێشـەکی یـە کورتە بەس بێت بۆ هاتنە سەر گەوهەری باسی هێزی زەمینی.

گەلێـك زانـایـانی عەسکـەری لایـان وایـە، کە هێـزگەیاندنە گۆرەپـانی مەبـەست و جەنگ، مۆڵەتی دەست پێشکەری ئەداتە دەست و ئەم دەست پێشکەری یەش گرەوی جەنگی زۆر جارێ بەبریتەوە.

بێ گومان هێزگەیاندنیش لە کاتی پێویستدا هۆی راگەیاندنی تایبەتی ئەویت کە ئەویش بە جێگاوکاتەوە بەستراوە.

رۆمـانی یـەکان لەلایەکەوە پاپۆڕیان دروست ئەکردو لەلایەکی ترەوە ریگـایـان ئەکـردەوە بەم جۆرە لەچـاو گەلانی تری جیهانی کونـدا پێشـتـر کەوتن. هەروەهـا سوپـای ئیـسـلام بەهۆی ولاخ و ئەسپ و سوار چاکی یـەوە لەجم و جول و هاتـوچۆدا سوپـاکانی دوژمنانی ئیـسلامیان بەزاندو بۆیان بۆ بەهەلو مەرجێکی لەبارکە گرەوی جەنگی پێ بەرنەوە.

هەروەها پروسیا لە ساڵی 1870دا لەکاتی جەنگی پروسیاو فەرەنسـادا بەشـە مەنـدوفـەر هێزەکانی خۆی گەیاندە ناوچەکانی جەنـگ کەچی فەرەنسـاییـەکـان سەربـازەکـانی خۆیـان بەپێ ئەختەریگا کە ئەمە دەست پێشکەری خستە تەك لەشکری پروسیا.

ئەوی راسـت بێـت ئەوەتـی پاپـۆری چارۆکـەدار (الـسـفن الشـراعیـە) کەوتـوتـە ناو ئاوەوە تا ساڵی 1830 هێـزی دەریایی بووبـوو بەهێـزێکی بایـەخـداری گرنـگ بەڵام دوای پەیدابوونی شەمەندوفەر ئیتر وردە وردە هێزی دەریایی تا ئەهات بەرەوکزی ئەرویشت وە هەر لەبـەر ئەم هۆیـەش بوو، ستـراتیجی یـەتی بەهێڵی ئاسن سەربازو تفاقی عەسکەری گواستنەوە، باری هێزی دەریایی لەنگ کردو بوو بەپایەیەکی گەورە بۆ سەرخستنی هێزی زەمینی بەسەر هێزی دەریاییدا.

پشت بەستـووبـە بایـەخی ئەم ستـراتیجی یـەتـە روسیـای قەیسـەری بەشێکی ئاسیـای، واتـە تاشقـەنـدوسـەمـەرقەندو کۆشکاو ئەشخـابـادی لەگـەڵ روسیـای ئەوروپـاییـدا بەست بە یەکـەوەو ریگای خستە سەر سنووری ئەفغانستان و ئیران کە دوو دەوڵەتی جیـاکـەرەوەن (الـدول الحـاجزة) خاکی روسیایان لە هندستان و خلیج جیا ئەکردەوەوری بەست بوون بەرامبەر هێزەکانی رووس.

لەلایـەکی تریشـەوە ریگـایـەکی تری زەمینی یـان گەیـانـدە کەنارەکانی دەریای ژاپون و دەریای چین و ئوقیانووسی باسفیك بەم پێیە بەکار هینانی هێڵی ستراتیجی ئاسن هێزێکی زەمینی روسی بایـەخـداری هانی یـە کایـەوە کە ئەم هێزە هەررەشەی لە ناوچـەکـانی رۆژ هەڵاتی نزیـك و ناوەراست و دووری سەر بە بەریتانیای مەزن ئەکرد.

سەبارەت بەوەی کە بەریتانیا دوو چاری هەررەشەیەکی تریش بوویـوو بەنـاچـاری بو ئەوەی هێـزێکی گەورەی زەمینی روسی و هێـزێکی دەریـایی گەورەی بەریتـانیـا بەیـەکـا هەڵنـەپژێن، ریککـەوتننـامـەیـەکی لە ساڵی 1907دا لەگـەڵ روسیـای قەیسەری دا مۆرکرد.

ئەم مەتـرسی یـەش هەر هێڵی ئاسن (سکـك الحـدیـد) دەسکەلاکەی بوو، ئەڵەمانی یەکان هێڵێکی ئاسنیان تا ئەنازۆل راکیشا وەپرۆژەی هێڵێکی تریشیان لەبەرلین - هەوتا بەغدا خستە ناونـاوانـەوە تاکـو بەم ریگـازەمینی یـە گورجـەدا هێـزی زەمینی بگـەیـەنـنـە - دوورگەی عەرەبی، وەئەو هێڵە ئاسنانەی تورکەکان ئەنـازۆڵیـاو بە رۆژهـەڵاتی نزیـك و ئیمچـەدوورگـەی عەرەبەوە

بەست هەمـووی بە سەرمـایـەی ئەڵـەمان و شارەزایی ئەندازیارە ئەڵەمانیەکان دروست ئەکرا ئەم هێڵە ئاسنانە هێزە زەمینی‌یەکانی ئەڵـەمـانیـاو تورکیـای ئەگەیانە کەنار کەنداوی سوێس. ئیتر ئەم هەڕەشە دوولانەیە یەکێکیان دژی هندستان و ئەویتریان دژی میسر بەریتانیای ناچار کرد پەنابەریتە بەرهێزی زەمینی وپارەیەکی زۆری تیا خەرج بکات.

هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو ژاپونی‌یەکان لە ساڵی 1941دا لەچەنـد لایـەکەوە بەئاسانی بەسەر هێزی بەریتانیادا سەرکەوتن ئەوی راست بێت هیزی جەنگی بەریتانیا لە جەنگی جیهانی یەکـەمـدا، لەچـاو جەنگی دووەمی جیهـانی‌دا باش و لەبارتربوو رەنگـە ئەوەش لەبـەر ئەوە بێت، لەلایـەکـەوە سامان و دەرامەتی ئەوسای باشتربوو وەلەلایەکی ترەوەلە جەنگی دووەمدا قورسایی هێـزە زەمینی‌یـەکـانی زیـاتـر بە سەرەوە بوو. ئەوەبـو لە شەرری دەنکەرك و مەندەلای‌دا زەرەروزیانێکی زۆری لێ‌کەوت. بەڵام تیکـەڵ بوونـی هێــزیـکی زەمینی مەزنی یەکیتی سوڤییــەت و هێـزیکی دەریـایی مەزنی وڵاتـە یەکگـرتووەکانی ئەمەریکا لەپاڵ بەریتـانیــادا بەجــەنگی دووەمی جیهــانی باری بەریتــانیـای لەدورانەوە خستەسەر سەرکەوتن.

زۆر دەمێکە کۆمەڵێك شارەزایانی عەسکەری سەربە جەنەراڵ هوسهــوفــەر کە لەنــاوچــەی زەریــای ناوەراست دا بەم جۆرە کاروبارانەوە خەریك بوون لایان وابوو، کە بەئاسانی لەزەمینەوە هێـرش ئەبـرێتـە سەر بنکە دەریاییەکانی بەریتانیا. هەر جۆزیف مایزەر ئەیوت ئەم توپە دووربردە تازانە هەموو دەزگاو دامەزراوە دەریـاییـەکـانی ئینگلیـزی لەجەبەل تاریق دا بێ بایەخ کردووە. چونکـە لە ناوچـە نزیکـەکـانی ئیسپـانیـاو لە ناوچەی مەراکیشی ئیسپانیاییەوە بە ئاسانی ئەیانتوانی توپ بارانیان بکەن.

هۆسهوفەر خوشی دەربارەی لاوازی بنکەدەریاییەکانی ئینگلیز لەئـاست بنکـەی چەکی زەمینی‌دا ئەیـوت[26] «هـەرچـەنده بنکە دەریـــایـــەکـانی ئینگلیـز لە هونـگ کۆنـگ و سـەنغـافـوورەدا بۆ خزمـەتگـوزاری هێـزی دەریـایی بەکەڵکن بەڵام قەڵای بەرگری ئەوتـۆیـان نی‌یـە لە ئاست هێرشی زەمینی‌و هێزیکی چەکداری نۆی‌دا خۆیــان پێ‌رابـگــیــرێـت». ئەوی راســت بێــت پێش بینی‌یــەکــەی هۆسهــۆفــەر لەجـەنگی دووەمی جیهـانی‌دا هاتەدی‌و ژاپونی‌یەکان سەنغافوورەیان گرت.

هەروەهـــا دوورگـەی کریت بەهـۆی سەربـازی پەرەشـوتی ئەڵـەمـانی‌یـەکـانـەوەگیرا کە ئەبوو لەدەریاوە بۆی بچونایە. دوای ئەمـەش فرۆکـە جەنگی‌یـەکـانی ئەڵەمان بەبوردومان کردن هێزە زەریاییەکانی ئینگلیزیان لەدەریای ناوەراست و دوورگەی ماڵتەدا بەجــۆریــك شپـرزە کرد پێ‌یـان نەکـرا دەست بخـەنـەریگـای دابەزاندنی چارەکە ملیۆنێك سەربازی ئەڵەمانی لەئەفەریقادا.

بەکـورتی بەلای عەسکـەری جیـۆپـۆلیتیکسی‌یەکانەوە ئاستی جوڵانــەوەی لەشکــرو چەکـوتفـاقی جەنگی وەهـۆو پایـەی ئەم جوڵانــەوانــە هەردووکــیــان بایــەخــێــکــی ئیــجــگــار گەورەیان هەیە. بۆیە ئەڵێن لەسەرەتاوە ئەسپ و ولاخ بایەخیان بەهێـزی زەمینی‌داوە ئنجـا پاپـۆری باگێـر (پـەردەدار) بایەخی بە هێــزی دەریـایی‌و دوای ئەم جاریکی‌تـر هێـزی زەمینی بەهـۆی شەمەندوفەر ماشێنی مرۆڤ هەڵگرو بار بەرەوە گەوتۆتەوە برەو.

بەڵام گەو هەری ئەم بابەتە هەردێتەوە سەر ئەو رێبازەی، کە لە چ جیگـا یەك و لەچ چەرخ و زەمـانێکـدا چ هێـزیـك ئەبێت بەهێــزی جیهــان گیـروو ئامـانجی دەوڵـەتێکی گەورەی تەمـاع لەخاکی دەوڵەتان و سامانی دەوڵەتان کردوو جێ‌بەجێ ئەکات.

**( هێزی ئاسمانی)**

هەروەکـو ماهـان سەر دەستـەی هەمـوو ئایـدیـولوجیستەکانی هێــزی دەریـــاییـــەو کلاوز فتـز هی هێـزی زەمینی‌یـە هەروەهـا سیڤیــریسکی لە ئایــدیــولـوجیستـە بەنـاو بانگـەکـانی هێـزی ئاسمـانی‌یـە. هێـزی ئاسمـانیش هەروەکـو هێزی دەریایی وردە وردە دوای پەیـدابـوونی پێ‌گـەیشتووەو گەورەو دەسەلاتداربووەتا گەیشتـۆتـە ئەو پایـەیەی کەسانی‌وا هەڵکەون بە شاهێزی بزانن و ئومێدی دەسەلاتداریتی جیهانی پێ بسپیرن.

ئەوی‌راست بێت ئەوگیــروگــرفت و کۆسپ و تەگــەرانــەی دێنەریگای هیزە زەمینی‌و دەریاییەکانی دەوڵەتان لەئاستی هێزی ئاسمانی‌دا زۆر بێ بایەخ و بێ دەسەلات ئەبن. فرۆکەوان کە هەزاران پێ لەســەر زەمین بەرز ئەبێتــەوە ئنجــا گردێتی زەمینی بەتـەواوی دێتـە بەرچـاو، نەشـاخ و کێـوو نەدەریـاو نەدارستان و جەنگـەڵ ونـە سەرمـاو گەرمـاو نەریگـەو بانی دووروودرێـژ ئەبن بەکوسپی سەرە ریگەی.

بۆیە نووسەرانی گۆڤاری «Fortunet - فۆرچونێت» لە ساڵی 1943دا لایان وابوو ئەوانەی بتوانن دەست بەسەر بنکەستراتیجی یە ئاسمانی یەکاندا بگرن ئەبن بەگەورەترین هێزی سەرزەمیی.

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەروەکو هی هێزی زەریایی دۆست و ناحەزی هەبووە، بەڵام نیاز لەلێکۆڵینەوەکە بەپێی بیروباوەڕی جیۆپۆلیتیکسی ئەوەیە کە ئایا دەوڵەتێکی خاوەن هێزێکی ئاسمانی کاریگەرو دەست ڕۆیشتوو بەسام ئەتوانێت بگاتە پایەی یەکەم دەوڵەتی مەزن لە جیهاندا؟ وە ئایا بەم هێزە جیهانی ئۆقارام ئەکرێت وەدەستی بۆ بەسەر هێزەکانی تردا!

**وە دەست بۆ بەسەر هێزەکانی تردا ئەگێرێت؟**

**ئەگەر نیازم لەم لێکۆڵینەوەیە ئەوە نەبێت کە بۆ ئەم نیازە باسی هێزی ئاسمانی بکرێت**

خۆ هەموو ئەفسەرێکی هێزی ئاسمانی یان فڕۆکەوانێکی عەسکەری ئەوسەرەتایە ئەزانێت کە هێزی ئاسمانی و فڕۆکەی جەنگی چەکێکە لەتەك چەکە زەمینی و دەریاییەکاندا فرمانی پاراستنی وڵاتی پێ سپێرراوە. یان لەکاتی جەنگدا پێش هێرش بردنی پیادەو بەشەکانی تری هێزی زەمینی بنکەو لەشکرو سەنگەرەکانی دوژمن بۆردومان ئەکات و لەکاتی کشانەوەی هێزیشدا پەلاماری دوژمن ئەدات و سەر لە لەشکرە هێرش بەرەکە ئەشێوێنێت، کە بەئاسانی نەتوانێت هەڵبکوتێتە سەر هێزە کشاوەکەو زیانی زۆری لێبدات. تازیاتر باسەکەمان ڕوون بکەینەوە، پەنا ئەبەینە بەر ئەو تیۆرییانەی دەربارەی هێزی ئاسمانی بلاوکراونەتەوە.

بێگومان کەباسی هێزی ئاسمانی ئەکرێت پێویستە پێش هەموو شتێك بیر لە فڕۆکە بکرێتەوە، چییەو چی پێ ئەکرێت.

یەکێك لەوکەسانەی بەشداری تیۆری دانانی هێزی ئاسمانی بوون «دۆهێ» بوو وەدوای دۆهێ ئنجا «میتشل» ئەم دووانە وتوویژ یکیان خستە ناوناوانەوە نزیکەی بیست ساڵی خایاندو لەگەڵ تەواو بوونی جەنگی دووەمی جیهاندا کۆتایی پێ هات.

بناغەی سەرەکی ئەم بیروباوەڕەش بەوە دامەزرابوو، کە فڕۆکە لەهەموو چەکێکی‌تر خێراو بەرز ڕەوو وێران کەرترە، بۆیە شاچەکی جیهانە دیارە ئەوانەی کلاسیکیانە ئەیان ڕوانی یەهێزی ئاسمانی وەك بەشێکی‌تر جێگایان بۆ تەرخان کردبووە، وە بەپێچەوانەی ئەم بیروباوەڕەتازەیە فڕۆکەیان ئەخستەخانەی چەکێکی هاوکاری چەکەکانی‌ترەوە.

ئەگەر برریك لەسەرەتاوە چاو بە بایەخی هێزی ئاسمانی‌دا بخشێنین بەتایبەتی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، کە نەخشەدانان بۆ هێزو دەسەڵاتی فڕۆکەی جەنگی هەر لەخانەی پێش بینی‌دابوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەساڵی 1921دا بەچەکی ئاسمانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەنزیك ڤیرجینیاوە کۆنە باریجەیەکی ئەڵەمانی ئۆستفریزلاند ـ یان نقومی بن دەریاکرد ونیازیان لەم کردەوەیە ئەوەبوو کە بەناحەزانی دەسەڵاتی جیۆپۆلیتیکسانەی هێزی ئاسمانی بسەلمێنن کە هێزی ئاسمانی دەسەڵاتێکە لەوکاتەوە کەوتۆتەکایەوە نەك هێزێکی دەسەڵاتداری دوا ڕۆژ بێت.

ئایدیۆلۆجیستی هێزی ئاسمانی جیلیودۆهێ لە ساڵی 1869 هاتۆتە جیهانەوەو لە ساڵی 1930دا لە تەمەنی شەست و یەك ساڵی‌دا کۆچی دوایی کردووە. لەسەرەتای ژیانی عەسکەری‌یەوە ئەفسەری تۆپخانە بووەوە لە ساڵی 1909دا باسێکی دەربارەی هێزی ئاسمانی نووسیوەوە لە ساڵی 1915دا بڕوای بەوە هەبووە کە بە جەنگێکی فراوان بەهێزی ئاسمانی ورەی هاووڵاتیانی دوژمن لەرەگوریشە هەڵئەکەندرێت. لەو بڕوایەدا بوو هێزی ئاسمانی ئەتوانێت نەتەوە دوژمنەکان تەفروتونابکات.

ئەوەندەش بەرق وکینەوە بیروڕای خۆی دژی سەرکردە عەسکەرییە ئیتالییەکان بلاو ئەکردەوەو قسەی ئەکرد تادایان بەدادگاو بە ساڵێك زانـدانیان گەیاند، بەڵام لە ساڵی 1920 زیندانییەکەیان لەسەر لابرد وەلە ساڵی 1921دا گەیاندیانە پلەی جەنەراڵی.

ئیتر لەم ساڵەدا نووسینە گرنگەکانی ئەکەونە پێش چاو وەلەکاتی سەرکەوتنی فاشستەکانا لەرۆماکرا بە قومیسیری ئاسمانی بەڵام دوای ئەوە خۆی دەستی لەکار کیشایەوەو خۆی بۆ کارو باری ئایدیۆلۆجی تەرخان کرد.

بەڵام ولیم میتشل پاش دۆهێ بە دەساڵ هاتۆتە دنیاوەو لە ساڵی 1936داکۆچی دوایی کردووە لە ساڵی 1898دا لە هێزی پیادە دابووە دوای ئەوە ئەفسەرێکی بچوك بووە لە ئالاسکا، بایەخی ستراتیجی ئالاسکاو ناوچەی «قطبی» سەرنجی ڕاکێشاوە لە ساڵی 1916دا فێری فڕۆکەوانی بووەو لە ساڵی 1917دا لەهێزی ئاسمانی ئەمەریکادا کاری کردووە. ئیتر وردە وردە لە

هێزی ئاسمانی‌دا پلەی بەرزبۆتەوە تاکو چەند هەفتەیەك پێش تەواوبوونی جەنگی یەکەم بووە بەسەرکردەی ئەم هێزە.

سەبارەت بەوەی بەپێویستی ئەزانی کە هێزی ئاسمانی بەشێك نەبێت لەسوپاو هێزی زەریایی بەڵکو هێزێکی یەکگرتووی سەربەخۆ بێت، کەوتە ناحەزی‌کردن لەگەڵ بەرێوەبەرانی ئەودوو هێزەتا دایان بە دادگای عەسکەری‌و پێنج ساڵ نیشانی عەسکەری‌یان لێ داماڵی. لە ساڵی 1926دا دەستی لەکارکێشایەوەو ئەو دەساڵەی لەژیانا مابووی بۆکاروباری نووسین و دامەزراندنی هێزێکی ئاسمانی سەربەخۆی تەرخان کرد.

بەڵام بیروباوەڕی دۆهێ لەدوای ساڵی 1921 دەربارەی هێزی ئاسمانی گەلاڵەبوو بەتایبەتی دوای ئەو نووسینەی بەخەیاڵیا هاتبو دەربارەی ئەوجەنگەچاوەڕوان کراوەی لەنێوان ئەڵمانیاو فەرەنسادا ڕوودەدات. ئەوەی ڕاست بێت پایە سەرەکی‌یەکانی تیۆری دۆهێ دەربارەی هێزی ئاسمانی ئەمانەی خوارەوەبوون: -

1 - فڕۆکە چەکێکی هێرش بەرە، خاسی‌یەتی بەراورد نەکردنی هەیە، ئەوپێش بینی‌یەش ناکرێت، کە بتوانرێت بەباشی بەر بەرەکانی بکرێت.

2 - بەویران بوونی ناوچە ئاوەدانەکان ورەی خەڵکەکەی هەرەس ئەهێنێت.

بەپێی ئەم دووپایەیە بیری لەم خاڵانەی خوارەوە کردەوە:

أ - تا بەباشی پارێزگاری وڵات بکرێت، پێویستە لەکاتی جەنگە دا ئاسمانمان لەژێر دەسەلاتدابێت.

ب - ئەبێ لەسەرەتای جەنگە دا بیرلە ویران کردنی پیشەسازی‌و ناوچە ئاوەدانە پڕ خەڵکەکانی دوژمن بکەینەوە نەك لە دامەزراوە عەسکەری‌یەکان.

حـ - نابێ بە جەنگی ئاسمانی بیرلە لەناوبردنی هێزی ئاسمانی دوژمن بکەینەوە بەڵکو پێویستە ئەو دزگاو فابریقەو دامەزراوانە تێك وپێك بدەین کە ئەبنە سەرچاوەی بوون و چالاکیان.

د - ئەبێ هێزی زەمینی بەشی پارێزگاری‌کردنی پێ بسپێریت و نەیەڵێت دوژمن لەزەمینەوە پێشڕەوی بکات و دەست بەسەر ڕێگاو بان و پیشەسازی‌یەکان و دەزگاکانی هێزی ئاسمانیماندا بگرێت. تاکو هێزی ئاسمانیمان فرمانی ئیفلیج کردنی تفاق و کەلوپەل بە هێزەکانی دوژمن گەیاندنی پێ بسپێرریت و کارێك بە گەلی دوژمن بکات بیر لەدرێژەدان بەجەنگە نەکاتەوەو ورەوتوانای بروخێنێت.

هـ - ئەبێ فڕۆکەی جەنگی ئەوتۆ دروست بکرێت، کە فڕۆکە بومبا هاوێژەکانی دوژمنی پێ لەناوببرێت وەلەهەمان کاتدا بەکارو باری خۆ پاراستن و ویران کاریش هەڵسێت.

دەربارەی خاڵی سێیەم دۆهێ خەیاڵی لەوە ئەکردەوە کە پێشەکی پێویستە بنکەو تۆپە تەیارەشکێنەکانی دوژمن لەناو ببرێت تاهێزی ئاسمانی بە سەربەستی‌دەستی کوشندە لەدوژمن بوەشێنێت وزەمینەی هاتوچۆو چالاکی ئاسمانی بۆ تەخت ببێت.. بەڵام چ دەوڵەتێکی گەورە هەیە بیر لەوە نەکاتەوە، کە ئەم بنکەو تۆپی تەیارە شکێنی خۆی بەجۆرێك نەپارێزێت، کە نەیەڵێت بگات بەومەرەیە.

هەرچەندە لەناو دەوڵەتانی پچوك و مام ناوەندی‌دا دوورنی‌یەکارە ساتی وارووبدات وەکو «ئیسرائیل»یەکان لە جەنگی 1967دا بەمیسریان کردو هێزی ئاسمانی‌یان فڕۆکەخانە جەنگی‌یەکانی میسریان غافڵ گیرکردو هێزی ئاسمانی میسریان ئیفلج کردو ئاسمانی میرو بیابانی سیناوکۆرەکانی جەنگیان بۆ چالاکی ئاسمانی خۆیان خستە سەرپشت وە بەپێی نەخشەیەکی‌ترو بەیارمەتی دەزگا ئەلکترونی‌یە سەر لێ شێوێنەکانیان هەمان مەبەستیان لەئاسمانی لوبنادا لە پەلامارەکەی ئەم دواییەیاندا دوو پات کردەوە.

سەبارەت بەویران کردنی شارەکانی دوژمن ئەیوت ئەگەر ناوچەیەکی بچوك بە 20 تەن بومبای فڕۆکە ویران ببێت ئیتر بەپێی ڕووبەری هەر شارێك چەند ئەوەندە بومبای پیابماڵێت هەمووی وێران ئەکەیت و خەڵکەکەی دوای چەند جارێك هەموو ئەوشارە، یان ئەوشارانە چۆڵ ئەکەن و ڕوو ئەکەنە دەشت و دیهات و هاوار بۆ حکومەتەکەیان ئەبەن کە ئیتر دەست لە جەنگە هەڵگرێت.. هەروەها لەبەکار هێنانی بومبای هەمە جۆردا، سوتێنەرو کیمیایی‌و جۆرەکانی‌تر بیری لە گیانی مرۆڤایەتی‌و یاسای نێو دەوڵەتان نەئەکردەوەو بەکارهێنانی هەموو چەکێکی لەپێناوی دەست گرتن بەسەر وڵاتان و سەرکەوتن دا

بەرەوا ئەزانی بۆ یەئەلێت «لەپێناوی دەسکەوتی تایبەتی و مانەوەدا نرخی هیچ بیروباوەڕێك نامێنێت و هیچ پەیوەندییەك خۆی بۆراناگیرێت، ئەرازووی مرۆڤایەتی تێك ئەچێت و یەك سەرەتا بەدەستەوە ئەمێنێت، ئەویش لە بریتی ئەوەی بت کوژن تو بەرامبەرەکەت بکوژە!!».

بەڵام ئەدوارد میدێرل لای وایە کە دۆهێ دەربارەی فرمانی وێران کاری فڕۆکە ئەم خاڵانەی خوارەوەی فەرامۆش کردووە.

1 ـ هەندی خانەو بینا هەیە بەرگەی ویران کاری ئەگرێت و فڕۆکە زیانێکی ئەوتۆی پێ ناگەیەنێت.

2 ـ هەموو جارێك فڕۆکەکان نیشانەکانی خۆیان ناپێکن.

3 ـ زۆر جێگای ویران کراو هەیە لەجیاتی جارێك چەند جارێکیتر بەفیرۆ بوردومان ئەکرێتەوە.

وەنەبێ دۆهێ وەکو بەرزەکی بانان رزگاری بووبێت و بیرورا نامرۆڤایەتییەکانی بێ گیروگرفت بلاوبووبێتەوە، گەلێك کەسانی مرۆڤ پەروەرو ئازادی خواز لیّی راپەریون بیروباوەرە دوژمن بە مرۆڤایەتییەکانیان راسواکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دۆهێ پیاوێکی بەسەبرو لەسەر خۆ بووەو هێمنانە وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە. کەوەڵامی جەنەراڵ باستیکو ئەداتەوە ئەلێت[27] «... ئەگەر چەکی ئاسمانی کیمیایی لەجەنگی داهاتوودا چەکێکی کاریگەری لەناو بەربێت ئەوە دەست کردی من نییە، لەبەر ئەوە لەپێناوی ئەمەدامن نەشایستەی ستایشم و نەهی بەدناوی».

دەربارەی ویرانکاری شارو دامەزراوە پیشەسازی وئابوورییەکان بیرورای میتشڵ لە بیرورای دۆهێوە زۆر نزیك بوو، جیاوازییە ئاشکراو دیارەکانی نێوانیان ئەوەیە میتشڵ تورەو قسەرەق بووە لەگەڵ رەخنەگران و ناحەزانیا، دۆهێ هێمن و لەسەر خۆبووە.

میتشڵ دەربارەی ویرانکاری شارەکانی دوژمن ئەلێت[28] «پێویست ناکا بۆ ویرانکردنی شارێك هەموو خانووەکانی بەسەر یەکدا بروخێنرێن و بکرێن بەکەلاوە، بەڵکو خەلك و دانیشتوانەکەی ناچار بکرین کاروباری رۆژانەیان پێ نەکرێت و خانەکانیان بەجێ بهێڵن. بە چەند بومبایەکی بەگاز داگیراوە ئەم ئامانجە جێبەجێ ئەکرێت...».

هەر بەپێی ئەم رەوتە ئامانجەکانی هێزی ئاسمانی بەم جۆرەی خوارەوە دەست نیشان ئەکرد «ویران کردنی فابریقەکان، دەزگاکانی هاتوچۆکردن، ئەو ناوچانەی خواردەمەنییان تیایە، کێلگەکانی کشتوکاڵ، ئەو ناوچانەی سووتەمەنییان لێوە دێت، ناوچە ئاوەدانەکان...».

هەروەها بەپێویستی ئەزانی هێزی ئاسمانی هێزە زەمینیو دەریاییەکانی دوژمن تێکوپێك بدات.

دیارە هاریترومان سەرەك کۆماری پێشووی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەم رێبازەی سەرەوەی میتشل ـ ی بەراست ئەزانی بۆیە چل ساڵ لەمەوپیش دوو بومبای ئوتومیدا بەدوو شاری ژاپون داو نزیکەی چارەکە ملیونێك ژاپونی بێتاوانی کوشت.

بێگومان میتشل ئاوێکی باشی بوکار بەدەستانی دوا رۆژی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا رشتووەو ئامانجی جیۆپۆلیتیکانەی بو بەرێوە بەرەپشت پەردەکانی ئەم وڵاتە روون کردۆتەوە، بۆ مۆنۆپۆلی و ملیاردیرە خاوەن پیشەسازی دەزگا ئابوورییە گەورەکانی ئەم وڵاتە. وە ئەمیش وەکو هەموو خاوەن بیروباوەرێکی نوێ دوو چاری دوو بەرەکیو ناکۆکی بووە بەتایبەتی لەگەل عەسکەرییە کلاسیکێکانی ئەمەریکادا، چونکە ئەم هێزی ئاسمانی بە پێشەنگ لەقەلەم ئەداو هێزی زەریایی وزەمینی بەدەستکە لاویاریدەدەر.

دوا بەدوای میتشل، ئەلکسەندەر سیڤرسکی، کە فڕۆکەوانێکی عەسکەری بوو، بەرەگەز روسەوخۆی کردووە بە ئەمەریکایی لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا بە شداربووەو ئیتر خووی داوە ئەفڕۆکە دروست کردن و لەم مەیدانەدا جێدەستی دیارە.

کەکتیبی «بەهۆی چەکی ئاسمانی یەوە سەرکەوتن»ی دانا وتی بیروباوەرەکانی میتشل دەربارەی چەکی ئاسمانی هانیداوم ئەم کتێبەدا بنێم.

بروای زۆر بەوە بووەکە چەکی ئاسمانی نابێ بەشێك بێ لەهێزی زەمینی چونکە چەکی سەرەکی دوارۆژە.

لەکاتی خۆیدا لای وابوو کەدوای پینج ساڵ بێوچان گرتن فڕۆکە ئەتوانێت 25 هەزار میل بەدووری زەمیندا بسوڕێتەوە بۆیە گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ئیتر کەشتییە گەورە فڕۆکە هەلگرەکان بەکەلکی بەکارهێنان نایەن، چونکە فڕۆکەیوا دێتە کۆری کارکردنەوە لە بنکەو فڕۆکە خانەکانی کەنار دەریاوە ئەگەنە هەموو

شوێنێکی پێویست.

بێگومان ئەوە باشترە لە خاکی نیشتمانەوە فرۆکەی جەنگی بفرێت و پەلاماری دوژمن و شوێنە ستراتیجی‌یەکانی بدات تا ئەوەی مشووری بنکەو فرۆکەخانەی لەم ولاّت ولەو ولاّتی بۆ بخورێت. بەلاّم ئایا فرۆکەی وادێتەکایەوە بێ فرۆکە خانەی دوورەولاّت ئەم فرمانەی پێ جێبەجێ بکریت و کەم مەسرەف تریش بکەویت لەسەر دەولّەت.

بۆیە گەلێك فەرماندەی ئاسمانی و زەمینی و دەریایی سوپای ئەمەریکا بیروراکانی سیڤێرسکی‌یان بە هیچ ئەزانی و داهاتنی ئەو جۆرە چەك و فرۆکانەشیان بەخەیالّ پلاّو لەقەلّەم ئەدا.

سیڤێرسکی کە هێزی ئاسمانی ئەمەریکاو یەکیتی سۆڤییەتی بەراورد ئەکرد ئەیوت[29] «دەرفەتی دەسەلاّتی ئاسمانی سۆڤییەتی شێوە هیلکەییەو هەموو کەرتەی ئەفەریقاو خوارووی رۆژهەلاّتی ئاسیا ئەگرێتەوە، بەلاّم دەرفەتی دەسەلاّتی هێزی ئاسمانی ئەمەریکا شێوە بازنەییەوە ئەو ناوچە ناوکۆییەی ئەکەوێتە ژێر دەسەلاّتی هەردوو لایانەوە بە هۆی هێزی ئاسمانی‌یەوە ئەنجامی چارە نووسی تیا دێتەدی «AREA OF DECISIOn» . مەلّبەندی ئەو ناوچەیەش دەوروپشتی قوتبی ژووروە یان پێ ئەلّێن ناوچەی ناوراستی نیمچەقوتبی (The ARCTic MEDITERANEAN) .

هەروەها سیڤێرسکی کە ئەیویست ئەمەریکا دەولّەتێکی گەورەی جیهانی بێت، بەپێویستی ئەزانی ئوبالّی پاراستنی رۆژئاوای جیهانّ بگریتە ئەستۆ.

وە سەرچاوەی هێزی نیشتمانی بەم دوو پایەیەی خوارەوەی ئەزانی:

1 ـ ئەوەی دەولّەت خاوەنێتی.

2 ـ چۆن وە بەچ شێوەیەك کەلّکی لی‌وەرئەگریت.

بەشی یەکەمی برێتی‌یە لە خەلك و شارستانیتی وزانست و بنکەی ماددی‌و ئابوری. بەشی دووەمیش، دەرفەتی ئاسمانی، ئوقیانووس و دەریاو دوورگە، بەشەکانی وشکانی و کەنار دەریاکان و هەریمی ژووروو کە بەناوچەیەکی ستراتیجی هێزی ئاسمانی ئەزانی.

ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەپێ ئەم بۆچوونەی سیڤێرسکی هەریمی قوتبی ژوورووی کرد بە سەنگەری پێشەوەی خۆی‌و بەدەزگای رادارو فرۆکەخانەو دەزگای ئاوو هەوانا‌سین قایمی کرد، لەبەری ئەو بەری قوتبی ژوورووشەوە سۆڤییەتی‌یەکان بەهەمان شێوە ولاّتی خۆیان قایم کرد.

نیاز لەناوچەی ناوراستی نیمچەقوتبی دەریای قوتبی‌و دەشتاییە کەنار دەریاکانیتی، ئەکەویتە نێوان ئەمەریکای ژووروو ئاسیاو ئەوروپاوە. چەند دەولّەتێك خاوەنیتی، بەلاّم 49٪ی رووبەری ئەم ناوچەیە بەر یەکیتی سۆڤییەت کەوتووە. بەشەکانی‌تری بەر ئەمەریکاو کە نەدەو دانیمارك و نەرویج فینلەندە کەوتووە.

ئەم ناوچەیە دوای پێشکەوتنی بە ئاسمانا فرین بایەخی پەیداکرد چونکە فرۆکەی بازرگانی بەسەر قوتب دا بە 24 سەعات لە ئوسلۆوە ئەگاتە تۆکیو کەچی هەر بەریگای پیشودا 53 سەعات ئەخایەنێت.

وەریگای ئاسمانی لەنێوان نیویورك و مۆسکودا 4675 میلەو لە نێوان پەکین و سان فرانسیسکو 6600 میلە هەردوو ریگاکە بەسەر ناوچەی نیمچە قوتبی‌دا پیابرۆن 3000 میل کورت ئەبێتەوە.

جارێك جورج مارشالّ وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمەریکا دەربارەی بایەخی ستراتیجی ئەم ناوچەیەوتی «گرینلاند وەك ئەلقەیەکی بایەخداری سیستەمی پاریزگاری عەسکەری ئەمێنیتەوە، کە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو روژئاوای جیهانی پێ بپارێزین». هەروەها، کە دانیمارك لە ئایاری سالّی 1947دا یادداشتێکی پیشکەش کردو تیایا داوای کشانەوەی هێزە ئەمەریکاییەکانی لەگرنیلاندداکرد لەوەلامداوتی[30] «لەپێناوی ریککەوتننامەیەکی نوێ‌ولاّتە یەکگرتووەکان ئارەزوی گفتوگۆکردنی هەیە، بەلاّم ئەم ریککەوتننامەیەی ئیستای پێ لانابریت و هیزەکانیشی لەگرنیلاند ناکێشێتەوە».

هەروەها جەنەرالّ ئارنۆلّدوتی[31] «ئەگەر جەنگی سێیەم هەلّگیرسێت قوتبی ژووروو ئەبێتە مەلبەندە ستراتیجی‌یەکەی». هەروەها واستن لەوتارێکدا بەناوی «کەنەدە ناوچەی دامەزراندنە» ئەلێت[32] «لەناوچەی ناوراستی نیمچەقوتبی‌یەوە دەستی ئاسمانی لەولاّتە یەکگرتووەکان ئەوە شێنرێت، هەروەها هەر لەم ریگایەوە بەر پەرچ ئەدریتەوە، سەبارەت بەوەی بازنەگەورەی نیمچەقوتبی پاراستنی‌گرانە شەررە روکێتیش

(الصواريخ) هەر ئەم ریگایە ئەگریت و بەسەر ئەم ناوچەیەدارەت ئەبیت».

دەربارەی هیزی ئاسمانیو خوورەوشتی دیکتاتوریانەی هیتلەریش میجەر جورج فیلدنج ئەلیوت لە سالی 1939دا لەوتاریکدا ئەلیت[33] «رازی دەرونی دیکتاتور نادیارەو ئامانجەکانی تارمایی دای ئەپۆشیت و ناوی تۆقاندنی لی ئەباریت، ئەمرۆ دزیو داگیرکردن بالی بەسەر ئەورووپادا کیشاوە، داگیرکردنیش بەبی هیزی چەکداری ئاسمانی جیبەجی ناکریت».

بەکورتی لەو بینبرکییەی ئەکەویتە نیوان دەولەتە گەورەکانی جیهانەوە چ لەپیناوی داگیرکەریدا بیت یان لەپیناوی خۆ پاراستندا یاسایەکی دیرین و لەگۆران نەهاتوو لەنیواندا فەرمانرەوایە کە هەر لایەك هەموو هیزوتوانای زانیاری وئابوریو عەسکەری ئەخاتە کاربۆ دەستخستنی چەکیکی کاریگەر، ئامانجە تایبەتیکانی خۆی پی دەستەبەر بکات. دوای سازکردنی ئەم چەکە دوژمن و ناحەزانی ئەولاخاوەن چەکە تەقەللا ئەدەن چەکیك بدۆزنەوە مەترسی ئەم چەکە تازەیەی پی لەناو بەرن و ئامانجی خاوەن چەکەکەی پی پوچەل بکەنەوە. ئنجا چەك و هیزیکی چەکداری نوی بهیننەکایەوە بالا دەستی هەموو هیزیکی چەکداری پیشوبیت وەکو ئیستا ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەسەروکایەتی رونالدریگن دەستی داوەتە چەکدارکردنی بۆشایی ئاسمان کەبە جەنگە ئەستیرە ناوبانگی دەرکردووە.

## (جەنگە ئەستیرە Spaee War)

هەر زانستیو تەکنولوجیا بەتایبەتی عەسکەری پیش ئەکەویت خیرا پی بەپیی ئەم پیشکەوتنە نەخشەی دەزگا عەسکەری گەورەکانی دەولەتە هەرە گەورەکانی جیهانیش لەگەلیا ئەگۆرریت.

هەرچەندە نیازو ئامانج هەر لە جیگای خۆیانا ئەمیننەوە واتا دەولەتانی گەورەی چاوبرسیو تەماعکار ئەبی هەر دەسەلاتدارو دەست رویشتووبن (هیمنة) بەسەر جیهاندا بەلام لەهەرکات و جیگایەکدا پەنا ئەبەنە بەر جۆرە شیوەو تاکتیکیك. ئەمە جگە لەوەی کەداهاتی ئابوریو کەرەسەی خاوی ستراتیجی نرخ و بایەخی ناوچەیەك بەرز ئەکاتەوەو هی ناوچەیەکیتر دینیتە خوارەوە، وەکو هەموو ئەزانین رۆژیك لەرۆژان ئالەت و حیل وزەردە چەوە (بهارات) سەربەسەری خۆیان ئالتونیان ئەکردو هندستانیان کردبوو بەدورری تانجی ئیمپراتورییەتی بەریتانیا کەچی ئیستا نیمچە دورگەی عەرەبی ئەوشوینەی هندستان و بگرە زیاتریش بۆ دەولەتانی روژئاوا بەتایبەتی بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گرتوتەوە. هەرلەم رۆژانەدا رۆنالدریگن وتی ئەم ناوچەیە، دەرفەتیکی بایەخدار (مجال حیوی)ی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایەو پاریزگاری کردنی پیوەندیکی توندوتۆلی بە ئاشتیو ئاسایشی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە هەیە.

ئەمەلەلایەك لەلایەکی تریشەوە دەولەتە گەورەکان بەپیی هیزو توانای خۆیان جیگاگۆرکی لەگەل یەکتریدا ئەکەن چ ئەوانەی دۆستی یەکترین یان ئەوانەی دوژمن و ناحەز بە یەکتریبوون. کە کاتیك ئیمپراتورییەتی بەریتانیا رۆژ لەخاکیدا ئاوانە ئەبوو ئوبالی پاراستنی دەولەتانی روژئاوای هاوپەیمانی گرتبووە ئەستۆ کەچی هەر خۆی دوای ئەوەی دەولەت و میللەتە ژیر دەستەکانی بەشۆرش و بەئاشتی یەك لەدوای یەك لیی داماڵران و ئەو داهات و دەرامەت و سامانەی جارانی بەدەستەوە نەما ئۆ بالی ئەم پاریزگارییەی پی هەلسورینیت، خۆی داوای لەولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاکرد کە فرمانی جیهانی روژئاوا گوایە جیهانی ئازاد! بگریتە ئەستۆ. وەلە پاش ئەوەی سەردەمیك بین برکیو ناکۆکی گەورەو دەست رویشتوویی لەنیوان بەریتانیاو فەرەنساداو لەنیوان بەریتانیاو ئەلەمانیادا بوو وائیستا کەوتوتە نیوان دوو دەولەتی زۆر گەورەوە، یان دوو بەرەی گەورەوە بەسەرۆکایەتی ئەمەریکا ویەکیتی سوفییەت. بۆیە هەر لایەکیان باسی دەسەلات و دەستکەوت و دەست رویشتوویی خۆیان ئەکەن خیرا مەترسی لاکەیتر ئەخەنە پیش چاو.

هەرچەندە گەوهەرو ناوەرۆکی ناکۆکی نیوان ئەم دوو دەولەت و بەرەیە لەگەل هی دەولەتانی باسکراوی پیشودا زۆر جیاوازە، ئەوسا ناکۆکیبوو لەنیوان دوو دەولەتی داگیرکەری ئیمپریالی وئیستا ناکۆکییە لەنیوان ئیمپریالیو سۆشیالیزمدا. بەلام شیوەو قەوارەی ناکۆکی یەکە لەچاو جارانـدا ئەم

جیاوازی‌یەی هەیە سەرکەوتنی ستراتیجی و پیشکەوتنی دەزگاکانی عەسکەری یەکێتی سوڤییەت بەرەی سۆشیالیستی و بزوتنەوەی ئازادی خوازانەی گەلان بەرەو پێش ئەبات و دەسەڵاتی رۆژئاوا لە جیهانی سێیەمدا بەرەو لێژی ئەبات و ئەمەریکاو رۆژئاوا ئەتۆقێنێت، وبەپێچەوانەی شەوە بەرەو پێش چونی دەزگا ستراتیجیەکانی ئەمەریکا دڵە لەرزە بە سەرکردەکانی یەکێتی سۆڤییەت ئەگەیەنێت وزیانێکی گەورەش بە بزوتنەوەی رزگاری خوازی گەلان و سەربەستی و دەسەڵاتی دەوڵەتە سەر بەخۆکانی جیهان ئەگەیەنێت.

وەکو لەباسی هێزی دەریایی و زەمینی و ئاسمانی‌دا باسمان کرد سەرچاوەی مەبەست و ئامانج، دەست خستنی ناوچە پرپیت و بەرەکەت و داهاتەکان بوو کە جیۆپولیتیکسەکان پەیی کات و زەمان پێیان ئەوت ناوجەرگەی جیهان (Heart Land).

وەگەورەیی و دەسەڵات داری و دەست رویشتوویان بەوە ئەزانی ئەم ناوجەرگەیەیان بەدەستەوەبێت.

بەڵام لەوکاتەی کەزانستی جیۆپولیتیکسی بەشێوەیەکی روون و دیار کەوتەناو ناوانەوە زانستی و پیشکەوتنی تەکنۆلوجیای پیشەسازی و عەسکەری لەئاستێکدا بوو ئیستاش لەئاستێکی تردایە، کە بەراوردکردنیان چۆتە خانەی سەر سورمێنی‌یەوە! بۆیە پیش کەوتنی ئەم لایەنەو لەماوەیەکی زۆر کەمی میژووی مرۆڤایەتیدا نەك پیشکەوتن بەهەنگاو هەڵهێنان بەلکو بەبازی گەورە گەورە هۆو دەزگاکانی هاتو چۆکردن و راگەیاندن ئەوەندە زەمینیان پچوك کردۆتەوە، هەندی شت لە چەند چرکەیەکدا لەم پەری جیهانەوە ئەگاتە ئەو پەری. مانگی دەست کرد یاری فتبوڵمان بۆ ئەخاتە هەمووماڵێکی دەیان دەوڵەتی سەرزەمینەوە دەزگای کەمپیوتەر کاری هەزاران مرۆڤی شارەزامان لە چەند هەناسەو دەقیقەیەکدا بۆ جێبەجێ ئەکات. فرۆکەی مرۆڤ هەڵگرو بارو هەڵگر ریگای ساڵ و مانگی بۆ کردونی بەسەعات و دەقیقە.

بەم پێ یەچەك و نەخشەی ستراتیجی عەسکەریش گۆرراوەو ناوچەرگەی جیهان و دەست و پەلەکانیشی هەمان یاسا ئەیان گریتەوەو مل کەچی یاسای ئەم پیشکەوتنەن. بەڵام داخ ئەوەیە لەبرێتی ئەوەی ئەو سەدان ملیار دولارەی بۆ چەکی فرە کوژو وێران کار خەرج ئەکریت بۆ زانست و ئابوری و رۆشنبیری و تەندروستی مرۆڤایەتی بەکار بهینرایە نەهەژاری ئەماو نەکۆیرەوەری لەنێو کومەڵگەی مرۆڤایەتیدا.

ئیتر بەم پێشەکی یە کورتە دێینە سەر مەبەستی باسە کە ئەویش دوای ئەوەی چەکی ئاسمانی لەچاو چەکی بوشایی ئاسماندا بوو بە چەکێکی بەجێ‌ماوو یاریدە دەر ئیستا ئەم چەکە نوێیە بووە بەچەکێکی کاریگەری بەسام، ئارەزووی جیۆلیتیکسانەی دەوڵەتە گەورە چاو برسی‌یە تەماعکارەکانی پێ جێبەجێ بکریت.

ئەم چەکە یان ئەم هیزە لەناو دەزگاکانی راگەیاندنی رۆژئاوادا بە جەنگە ئەستێرە ناوبانگی دەرکردووە بۆیە ئیمەش هەر بەم ناوەوە بابەتەکە باس ئەکەین. بۆ باسکردنی ئەم بابەتەش ئەبێ باسی جەنگی بوشایی ئاسمان و کەرەسەو ئامرازو دەزگاکانی بکەین.

پیاوانی یاسازانی نێو دەوڵەتان بیروڕای جیاوازیان دەربارەی بۆشایی ئاسمان و مافی دەوڵەتان هەیە.

پرۆفیسور ڤون کارمان دەربارەی ئاسمانی زەمین و بۆشایی ئاسمان (الفضاء الجوی والفضاء الخارجی) ئەڵێت[34] ئاسمانی زەمین لەزەمینەوە (86888) مەترەیە ئیتر هەتا هەتایە بۆشایی ئاسمان دەست پێ ئەکات. هەرچەندە ئەم پێ ناسینە لەهەموو لایەکەوە پەسند نەکراوە بەڵام بەشی زۆری یاسا زانانی نێو دەوڵەتان لایان وایە بۆشایی ئاسمان دوای تەواوبوونی بۆشایی زەمین دەست پێ‌ئەکات. جا دەربارەی دەسەڵاتی هەر دەوڵەتێك بەسەر ئەم دوو بۆ شاییەدا دیسانەوە چەند بیرورایەك هەیە.

هەندێك وای بەباش ئەزانن کە هیچ دەوڵەتێك دەسەڵات نەگریت بەسەر ئاسمانی زەمین و بۆشایی ئاسماندا و هەموو دەوڵەتان لەپێناوی قازانجی ناوکۆیی خۆیان دا تیایا سەربەست بن چونکە ئەم بۆشاییە لە ئاوی سنوور وڵات وسنووری زەمینی ناچێت. هەرچەندە هەندێك هەن ئەم سەربەستی یەش ئەخەنە چوارچێوەیەکی تایبەتی‌یەوە.

هەندێ یاسا زانی‌تر ئەڵێن ئەبێ ئاسمانی زەمین وەکو سنووری زەریایی و سنووری زەمینی لەژیر دەسەڵاتی دەوڵەتدابێت، چونکە ئاسمانی زەمینی وەکو ئاوو زەمین موڵکی دەوڵەتی خاوە نەکەیەتی.

بەڵام بەشێکی‌تر ئەڵێن پێویستە بخرێتە چوارچێوەیەکەوە

دەوڵــەت لە بەشـێـکـێـدا بێ سنــوور دەســەڵاتــدار بێـت وە لەبەشێکی‌تردا ئازادبێت. بەم پێیە بەرزایی ژوور زەمین ئەکەن بەسێ بەشــەوە: یەکــەم ناوچــەی خواروو کە ئەبێ بەتــەواوی بەدەســت دەوڵــەتــەوە بێـت. دووەم بەش، دوڵــەت نیــمچــە دەســەڵاتـێکی تیــدا هەبێت وەکــو ئەوەی فرۆکــەی بیگــانــە دەستکەوت و ئاسایشی نەخاتە مەترسی‌یەوە.

بەشی سێـیـەمیش هەمــوو دەوڵـەتـان تیـایـا ئازادبن و فرۆکـە بەســەر بەستی بەنــاویــا بفـرێت وەك چۆن کەشتی دەوڵـەتـان لەئۆقیانووس و دەریاکانا دوور لەسنووری تایبەتی دەوڵەتان بەسەر بەستی هاتوو چۆ ئەکەن.

ئەوی راست بێت ئەگەر لەئاسمانی زەمین دا چەندو چۆنێکی بەســا ناسی بکــریت بەڵام لە بۆشــایی ئاســمــانــدا (الفضـاء الخـارجي) ئەو چەنـد چوونـە جیگـا پەنجـەی نامێنێت. چونکە بۆشایی ئاسمان بووە بەموڵکی ناوکۆی نێو دەوڵەتانی سەرزەمین و کێ‌دەست رویشتوویێ گەشت و گوزاری خوی تیدا ئەکات.

دەربارەی ئەم بابەتە، نەتەوە یەکگرتووەکان ئەم سەرەتایانەی خوارەوەی بلاوکردەوە: -

1 - بۆشایی ئاسمان و ئەستیرەکان لەپێناوی دۆزینەوەو بەکار هیناندا هەموو دەوڵەتان چون یەك و بەپێی یاسای نیو دەوڵەتان ئازاد بن تیایا.

2 - هیـچ دەوڵـەتێـك بۆشــایی ئاسمــان و ئەستیرەکان نەکات بەموڵکی خۆی.

3 - هەر دەوڵـەتێـك هەر چالاکی یەك لە بۆشــایی ئاسمــاندا ئەنوێنێت ئەبێ بروای بەو سەرەتایە هەبێت بەپێی پەیمانی نەتەوە یەکگرتــووەکــان بجـوڵێتــەوەو پاریـزگـاری ئاشتی‌و ئاســایشی نێو دەوڵەتان بکات و هاوکاری‌و هاوبیری نێو دەوڵەتان رەچاو بکات و ئەکـاتی پێـویستـدا یاریـدەی کەشتی‌و کەشتی وانـانی ئاسمــانی بدات و لەمەترسی لەناوچون رزگاریان بکات.

4 - ئەبێ ئەم چالاکی‌یــە ئاسمــانیـانە دەستکەوت و قازانجی مرۆڤایەتی تیارەچاو بکریت.

5 - هیــچ دەوڵـەتێـك نابێ بەرەڵــلایانە بە هیچ چالاکی‌یەکی بۆشایی ئاسمان هەڵسێت.

6 - برواکــردن بەمــافی دەوڵــەت دەربــارەی ئەو شتـانــەی هەڵیئەداتە بۆشایی ئاسمانەوە.

7 - برواکـردن بەو سەرەتـایـەی بەنـدە بەیـاریدەدانی کەشتی وانانی بۆشایی ئاسمان و ناردنەوەیان بۆ دەوڵەتەکانیان.

بێ‌گومان ئەم سەرە تایانەی ریکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاوینــەی ئاوات و ئارەزووی کۆمــەڵگـەی مرۆڤـایـەتی یەو ئەبێ بۆشــایی زەمینی‌و بۆشــایی ئاسمــان بەپێی ئەم سەرەتـایـانـەو لەمانەش باشترو پیشکەوتووتر لەپێناوی خیرو خۆشی‌و سەرفرازی مروڤــایــە تیـدا بەکـار بهینـریت، بەڵام وەکـو لە خوارەوە لێی ئەدوێین بزانین رەوتی دەوڵەتان بەرەو کوێ ئەچیت.

هەروەکـو لە کۆمـەڵگەی مرۆڤایەتیدا بەرهەمەکانی ئەبنەمایەی پیشکـەوتن و سەرفـرازی‌و کامـەرانی هەروەها بەرهەمی ئەوتۆشی لەســەدەی بیستــەمــداتێ کەوتـووە کە رەگـەزی مرۆڤی لەبـریتی جارێك چەند جارێ لەناو ببریت.

ئەوی راست بێت چەرخی بۆشایی ئاسمان کە مرۆڤایەتی بۆ جەنگــە ئەستیــرەی ئامــرازی ئوتــوم و تیشکی وزەداری لیـزەر کێش کردووە لە رۆژی 4ی ئوکـتــۆبــەری ساڵـی 1957 - ەوە دەست پێ‌ئەکات، کە یەکیتی سۆڤییەت سپوتنیکێکی بەرۆکێت هەڵـدا بەئـاسمـانـا. ئەوکـاتـەش چەکی ئوتـومی‌و هایدروجینی هیشتالای هەردوو دەوڵەتە گەورەکەی جیهان لەچاوئیستادا ساواو بەخـۆدا نەهـاتـوو بوو وەهـەر لەوکاتەوە تائیستاش شارەزایانی ئەم بابەتەلایان وایەکە یەکیتی سوڤییەت لەمەیدانی زانستی رۆکێت (صــاروخ)دا لەدەوڵـەتـانی‌تـر دەســەڵاتـدارتـرە. ئیتـر دوای ئەم دەست پێشکـەری‌یـەی یەکیتی سوڤییــەت کە کۆمـەڵانی خەلکی جیهــان وەك بەرهــەمێکی گەورەی زانست و تەکنـولـۆجیـای تازە بەخـۆشی‌و سەرسـامی‌یـەوە پێشـوازی‌یان کرد ئەمەریکاش کەوتە خۆی تاکـو لەخێـل بەجێ نەمێنێت. لەلایـەکـەوە نەوەکـا بەرەی رۆژئـاوا ورە بەربـدەن و لەلایـەکی تریشەوە تای تەرازووی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوای پێ‌لەنگە نەبێت.

ئیتـر ئەم بین بیـرکی‌و بۆربـۆرینـەی نێـوان یەکیتی سوڤییـەت وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کاری گەیاندە ئاستێك کە ئەبێ شێــوەی بەکــارهێنــانی مانگی دەست کردوو چوونــە بۆشــایی ئاسمــانــەوە روون و ئاشکــرابێت. بۆیــە ئەم دوو دەوڵــەتــە ریککەوتننامەیەکیان دەربارەی ئەم بابەتە مۆرکرد کە بەپێی ئەم ریککــەوتننــامــەیــە هەر مانگێکی دەست کرد هەڵئەدەن بەئاسمانا

ئەبی دەربارەی هەڵدان و خاسیەتەکانی ئاگاداری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن.

لەگەڵ ئەمەشدا شارلی شلدون سەرۆکی بەشی زانستی کتیبخانەی کۆنگریسی ئەمەریکایی و کۆن ترین پسپوری تەکنۆلوجیای بۆشایی ئاسمان لەراپۆرتێکدا ئەڵێت[35] «50٪ی مانگی دەست کردی ئەمەریکاو سوڤییەت بۆ کاروباری عەسکەری بەئاسمانا هەڵدراوە، وە 60٪ی گەشتەکانی ئەمەریکاییەکان لەم کۆرەدا، وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا کردویەتی و سوڤییەتەکانیش لەم مەیدانەدا هەر وابوون».

هەروەها لە هەمان راپۆرتدا ئەڵێت «ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سەرەتای چەکی ئاسمانی یەوە واتە ساڵی 1957 تاکۆتایی ساڵی 1970، (514) مانگی دەست کردی بەدەوری زەمین دا هەڵداوە کە (273)یان کاروباری عەسکەری یان پێ سپیرراوە جگە لە (41) مانگی دەستکردی تر وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا مەسرەفی کێشاوە.

بەڵام یەکیتی سوڤییەت لەهەمان ماوەدا (465) مانگی دەستکردی هەڵداوە، (294)یان کاروباری عەسکەری یان پێ سپیرراوە».

شارلی شلدون بروای وایە کەولاتەیە کگرتووەکانی ئەمەریکا تا 30ی حزەیرانی ساڵی 1971، (60) ملیار دولاری لە بەرنامەی عەسکەری و ئاسایی دا خەرج کردووەو یەکیتی سوڤییە تیش هەروابووە.

وە پەیمانگای ئاشتی نیو دەوڵەتان لە ستۆکهوڵم هەر ئەڵێت ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تاکۆتایی ساڵی 1967، نزیکەی (30) ملیار دولاری لە چالاکی عەسکەری بۆشایی ئاسماندا خەرج کردووە.

کەواتا پێویستە بزانین مانگی دەست کرد لەکۆری کاروباری عەسکەری دا بوچی بەکاردێت کە بەکورتی ئەمانەی خوارەوەن:

1 ـ دەست نیشان کردنی هەرشتێکی مەبەست لەسەر زەمین.

2 ـ ئاگادار بوون لەهەڵدانی هەر ڕۆکێتێکی بالستیکی دوورڕەوو قارەبەر، وە ئەو ڕۆکێتانەی لەژێر ئاوی کانەوە (غواصە) هەڵئەدرێن.

3 ـ ئاگادار بوون لەتەقینەوەی ئوتومی لە بۆشایی زەمین و دەرەوەی زەمیندا.

4 ـ تەقینەوەی تەقەمەنی ئوتومی لەناوچەی مەبەست (هدف)دا تۆمارکردن وە تومارکردنی وزەو کردەوەی.

5 ـ ئاگاداربوون لەوزەرەروزیانەی لەشارو مەڵبەندە پیشەسازی یەکان و بنکەو بەندەروهێڵی هاتوچۆکردنی دوژمن ئەکەوێت پاش هێرش بردنە سەری.

6 ـ یاریدەدانی ئاراستەکردنی ڕۆکێتی دوور ڕەو چ لە بنکەی زەمینی یان دەریاییەوە یان ئاسمانی یەوە هەلبدرێت وە ئەگەر هەڵەیان کرد هەڵەکانیان راست ئەکاتەوە.

7 ـ دۆزینەوەی لەشکری کۆکراوەی عەسکەری (تحشدات عسكرية) لە هەموو لایەکەوە.

8 ـ ئاگادارکردنی ئەلکترونانەی هێزە زەریاییەکان و هێزی ئاسمانی و بنکەی ڕۆکێتە ستراتیجی یەکان دەربارەی هەر کارێکی پێویست.

بۆیە ڕۆژنامەی ئەستێرەی سووری سوپای سوڤییەت لەنووسینێکدا دەربارەی مانگی دەستکرد ئەڵێت «جاسووس لەهەر بەرزاییەکەوە جاسووسی بکات هەر جاسووسە».

ئەوی راست بێت تەنانەت مانگە دەستکردە عەسکەری یەکانیش بەکار هێنانیان لەهەندی لاوە بۆ ئاشتی نێو دەوڵەتان بەخیر گەررا.

پاش ئەوەی یەکیتی سوڤییەت بە پشکنینی ولاتەکەی نەلە زەمینەوەو نەلە ئاسمانەوە رازی نەئەبوو وەلای وابو ئەمەریگای شارەزابوون لە نهێنی یە عەسکەری یە کانیان بو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەخاتە سەرپشت وەئەم رازی نەبوونە دەربارەی سنووردانان بوچەکی ستراتیجی بوو بوو بەکۆسپێکی گەورەی هەر ڕێککەوتننامە یەك لەنێوان یەکیتی سوڤییەت وولاتە یەکگرتووەکاندا.

کەچی لەدوای ئەوەی لە ساڵی 1962دا یەکیتی سوڤییەت مانگیکی دەستکردی هەڵدا بە دەوری زەمینداو دوای (8) ڕۆژ هانی یەوە خواری، ئیتر نیکیتاخرۆشۆف لەساڵی 1963دا وتی[36] «ئیتر پشکنینی راستەوخۆ بایەخێکی ئەوتۆی نی یە چونکە ئەستیرەی دەستکرد ئەتوانی ئەوفرمانە جێ بەجێ بکات». بەمە دوای ئەوەی مانگی دەستکرد کیشەو بەرەی پشکنینی سازکرد،

ریککەوتننامەی سالت 1 لە تەموزی سالی 1972دا لەنێوان یەکیتی سوڤییەت و ولاتەیە کگرتووەکانی ئەمەریکا مورکرا.

لەگەل ئەوەشدا ئەم سوچە پچکولە رۆشنە ئەوکەلێنە گەورە پرمەترسییانە پر ناکاتەوە کە دەزگامۆنۆ پولییەکان و عەسکەرییە چاو سوورەکانی ولاتە گەورەکان بەتایبەتی هی ئەمەریکا ئەیکەنە دیواری ئاشتی جیهان و ئارامی ژیانی گەلانەوە.

لەسالی 1961دا دوکتور والتەر دور نبرجەر لەکتیبی «Space as Military arena» دا پیش نیاز ئەکات، کە ئەمەریکا چەند سەد بۆمبایەکی ئوتومی بە دەوری زەمیندا هەلبدات کە خاکی یەکیتی سوڤییەت و ولاتە سۆشیالیستەکانی تر بگرێتەوەو ئامادە بێت بوکاتی مەبەست. وەوەزارەتی بەرگری ئەمەریکا ئەم پیش نیازەی بەراست زانی.

هارولد براون لەوتەیەکیدا ئەلێت «هێزی یەکیتی سوڤییەت لەکوری بۆشایی ئاسماندا وای لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کردووە کەهەر ئەبێ لەگەلیا بکەوینە بین برکێوە».

وەلە 19ی ئابی 1980دا ولیام دیکستون نوێنەری پارتی جمهوری وتی [37] «یەکیتی سوڤییەت خەریکە بگاتە ئەو ئاستە سامناکەی تیشکی لیزەر بۆ کاروباری عەسکەری بەکار بهێنێوە CIA یش دلنیایە کە یەکیتی سوڤییەت چەکی هەیە بەتیشکی لیزەر ئیش ئەکات. کە ئەمەش چەکێکە ئەتوانێت ئیش لەو مانگە دەستکردانە تێك بدات کەبۆ جاسوسییەت بەکاردین» وەکە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەرنامەی دروست کردنی رۆکێتی M.X ی دانا بیانووەکەی خستە سەر ئەم خالانەی خوارەوە:

1 ـ هێزی ستراتیجی ئوتومی سوڤییەتی هەرەشە لەرۆکێتە دوورڕەوەکانی ئەمەریکا ئەکات.

2 ـ ئەبێ هێزی بەرگری ئوتومی ئەمەریکا لەو ئاستەدا بێت کەفرمانی خۆی پێ جێبەجێ بکریت.

3 ـ ئاستی تەکنولوجی و کارکردەی هێزی ئوتومی ئەمەریکا کەلە پەنجاکان و شەستەکانەوە دەستی کردووە بە گەشەکردن ئەبێ هەرروو لە پیشکەوتن بێت.

ئەوی راست بێت یەکیتی سوڤییەت هەموو جارێك بەم شێوە راگەیاندنەی ئەمەریکا ئەلێت بیانوی خۆ چەکدارکردن و سوڤییەت بەجێ هێشتنە لە کوری چەکی ستراتیجی و بۆشایی ئاسماندا.

وەلای وایە کە کاربەدەستانی ئەمەریکا بەم جۆرە پروپاگەندانە بودجەی پرۆژە ستراتیجییەکان بەکونگریسی ئەمەریکا ئەسەلمێنن و خەلکی باج دەری ئەمەریکا بێدەنگ ئەکەن و گەلانی جیهانی پێ ئەخەلەتێنن. وەلە پال ئەم روون کردنەوەیەشدا ئەندرۆپۆف سکرتێری گشتی پارتی کومونیستی سوڤییەتی کەتازە بۆ ئەم جێگایە هەلبژێرابوو وتی «با ئەمەریکا زۆر چاك ئەوراستییە بزانێت کە هەرگیز نایەلین لەم گۆرە پانەدا ئیمە بەجێ بهیلێت».

بێگومان هەموو دەولەتێکی شەرو خوازپێش هەلگیرساندنی جەنگ خۆی خستۆتە بەرگی دەولەتێکی بەشخوراوی زۆر لێکراوی لە دەولەتان بەجێ ماوەوە وەهەولۆتە قەلای شەرر خوازانەی بەخۆ لەبەجێ ماوی رزگار کردن لەقەلەم داوەو ئەلەمانیای نازی نمونەی ئەم سیاسەت و دیبلوماسییەتەی ئەم سەدەیەمانە.

بەلام دەولەتێك بەتەنگ ئاسایش و ئاشتی جیهان و رەنجی کریکاران و چینەمام ناوەندییەکانی ولاتەکەی خۆیەوە بێت و بیر لەوە بکاتەوە، کە باجی میللەت کۆکراوە بەفیرۆ نەدات وەکو ئەمەریکا (240) رۆکێتی M.X و وبنکەکانی هەلدانی بە (60) ملیار دولار دروست ناکات یان ریگایەکی ئاشتی خوازانە ئەگرێتە بەرو سەدان ملیار دولاری بەفیرۆچوو لەبریتی چەکی لەناو بەر لەپێناوی بەختیاری وپیشکەوتنی کۆمەلگای ئەمەریکاو جیهان ئەخاتە کارەوە.

سەیر ئەوەیەگەلی چەکی پێشکەوتوو تەکنولوجیا بەرز هەیە کەسەدان ملیار دولاریان لەم چەند سالەی دواییداتیا خەرج کراوە، هەموو خراونەتە گەنجینەی چەکی بێ کەلکەوە چونکە لەوچەکانە باشترو بەهێزترو نیشانە پێك تر دروست کراوە، یان بەپارەو پولێکی بێ شومار ئەیا نفروشنەوە بە دەولەتانی جیهانی سێیەم و بەفروفێل و پیلان ئەشیان کەن بەگژ یەکتری داتا چەکەکانیان پێ لەناو بەرن و سەرمایەی کۆکراوەیان پێ لەبن بهینن و هەمیشە لەژیر باری قەرزی ئەم دەولەتانەدا بەتایبەتی هی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا رزگاریان نەبێت و ولاتەکانیان بازاریکی دەرگا لە سەرپشت بێت لەئاستی ئەم دەولەتە ئیمپریالییانەدا.

كەتازە رۆكێتى تیژ رەوی دوور رەو هاتبووە کۆری بەکارهێنانەوە، خرۆشۆف وتی پێویستە چەکە کلاسیکی یەکان وەکوتۆپ و تانك و فرۆکە بخەینە مۆزەخانەوە. بەلاَم ئیستا دەیان جۆر لەو چەکانەی لەوساخرۆشۆف باسی ئەکردن ئەبێ هەربخرینە مۆزەخانەوە!

وەکە لە دەزگاکانی راگەیاندنی دەولەتە گەورەکانەوە بلاوئەکریتەوە ئەم بۆربۆرینە هەر بەردەوامە هەرلایەك چەکێکی نوێ ئەدۆزیتەوە خیرا لاکەی تر یان بیرلە چەکێك ئەکاتەوە ئەم چەکەی پێ پوچەلَ بکاتەوەیان چەکێکی لەوچەکە بەهێزو وزەتر بهێنیتەکایەوە. بێ گومان بۆ ئەوەی باشتر لەم بابەتە بگەین پێویستە کورتە باسێك دەربارەی ئەم بۆر بۆرێنە بخەینە پێش چاو.

لەسالَی 1967دا سوڤییەتی یەکان لە تاقی کردنەوەکانی سیستەمی خولگەی وردە بەشی بوردومان کەردا (FOBS) سەرکەوتن. ئەم سەرکەوتنەش ئەو مانایە ئەگەیەنێت کە ئەتوانن مانگێکی دەستکردی بە ئۆتۆم چەکدارکراوی وێرانکەر بە دەوری زەمیندا بسوورێننەوە. ولەکاتی پێویستدا لەئیستگاکانی سەرزەمینەوە بەهۆی دەزگای ئاگادارکردنی تەرخانکراوی تایبەتی یەوە ئاگاداری بکەن، ئیتر ئەم مانگە دەستکردە یەکسەر رووی خۆی وەرئەگیرێت و مەبەستی بۆنیشانەکراو ئەپێکێت و لەناوی ئەبات.

لەم بارەیەوە ماکنماراوتی دەزگاکانی رادار تەنیا پیش سێ دەقیقە بەتەقینەوەی ئەم مانگە دەستکردە ئەزانن. وە لەبەر ئەوەشە ئەتوانێت هەموو بنکەکانی بومبا ئۆتومی هاویژەکانمان ویران بکات.

لەسەرەتای دروست کردنی ئەم چەکەوە خرۆشۆف لەسالَی 1964دا لە دیدەنێکی چەند نوێنەریکی پەرلەمانی ژاپونی لەمۆسکودا باسی ئەم چەکەی لەدەم دەرچوو وتی بەم زووانە چەکێکی ئیجگار تۆقێنەرمان ئەکەویتە دەست (قنبلة الرعب).

هەروەها لیۆنید بریجینیف لە جەژنی پەنجا سالَەی شورشی ئوکتوبەردا وتی «ئیستا سوپای سوڤییەت چەکێکی بەدەستەوەیە نەرادار ئەتوانێت وەك پێویست پێ ی بزانێت و نەدووری ریگاش نرخێکی هەیە، لە رۆژهەلاَت و رۆژئاواو باکورو باشوورەوە ئەتوانێت دەستی- خۆی بوەشێنێت.

پسپورە ستراتیجی یەکان بروایان وایە کە جەنگی داهاتوو بەبەکار هێنانی ئەم جۆرە چەکەو بە یارمەتی چەکی ستراتیجی قاررەبر دەست پێ ئەکات، دەست پی کردنەکەش ئەوەندە کوترپرو لەناو بەر ئەبێت. دوژمن مۆلَەتی پەلاماردانەوەو تۆلَە سەندنەوەی بەدەستەوە نامێنێت. بۆیە شارەزایانی جیۆپۆلیتیکسی بۆشایی ئاسمان ئیستا ئەلَین «ئەوەی بۆشایی ئاسمانی بە تەواوی خستەژیر دەستی خۆیەوە ئیتر جیهانی ئەکەویتە ژیردەست».

شارەزایانی ئەمەریکایی کە بەتەمای ئەوەن بە تەقاندنەوەی (2000) میگا تەنی وزەی ئۆتومی نیوەی دانیشتوانی ولاَتی دوژمن و دووسێ یەکی پیشەسازییە گرنگەکان لەناو بەرن هەرچەندە بەشی زۆریان بە 100 تا 200 میگاتەنی سەرەتای هاویشتنیانەوە لەناو ئەچن.

واپێش بینی ئەکەن کە نیوەی دانیشتوانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو یەکیتی سوڤییەت لەناو ئەچن. هەروەها ئەلَین هێزی خۆ پاراستن بەوە ئەبێت هەموو مەبەستە عەسکەرییەکان (الاهداف العسكريه) لەناو بچێت و نرخی خۆپاراستنیش ئەوەیە دانیشتوان و توانای پیشەسازی لەناو ببریت.

ئەمەریکا زۆر دەمێکە ستراتیجیەتێکی سێ کوچکەی دامەزراندووە کە ئەمانەی خوارەوەن:

1 ـ رۆکێتی بالاستیکی، کە بنکەی سەرزەمین بیان هاوێژێت.

2 ـ فرۆکەی دوور رەو.

3 ـ ژیر دەریایی (غواصه) رۆکێت هەلَگر.

لەسالَی 1980 ـ 1981دا ولاَتە یەکگرتووەکان سێ جۆر رۆکێتی قارپری هەبوو ئەمانەش: تیتان 2 وە منتمان 2 وە منتمان 3بوو. لە سالَی 1963وە رۆکێتی منتمان 2ی هەیە قورسایی لەکاتی هەلَداندا (150)تەنەو وزەی تەقینەوەی (9) میگاتەنە. بەلاَم منتمان 3، چەپکێکی لەیەك جیاوازی پێوەیە، هەر یەکەی بەر مەبەستێکی نیشانەکراو ئەکەوێت و هەر یەکە شیان وزەی تەقینەوەیان 340 کیلوتەنەو بەم جۆرە رۆکێتە ئەوتریت (MiRV) رۆکێتی کروزی ستراتیجی کە لە ئاسمانەوە هەلَئەدریت ئەگاتە (2500) کیلومەترە بەلاَم ئەو جۆرەی لە دەریاو سەرزەمینەوە هەلَئەدرێت و کومپانیای جەنەرال دینامیکس دروستی ئەکات 3000 کیلومەترە ئەروات.

هەروەهــا بەرنــامــەی گەشــەکــردنی ڕۆکێت بەردەوامــە، بەرنامـەیـەکی ئەمـەریکـا ئەوریگـایەی گرتۆتە بەر کەلە فرۆکەی جەنگـی 15 F وە ڕۆکـێـت دژ ی مانـگـی دەسـت کردو ڕۆکێتی دوژمن هەڵبـدرێت وە ئەم ڕۆکێتـانــەش پارچـە تەقیـوەکـانیـان مەبـەسـتـەکـانی (الاهـداف) دوژمن پەك ئەخات یان هەر پارچە پارچەی ئەکات.

هەروەهــا ڕۆنـاڵـدریگن فرمـانی بەرهـەم هێنـانی ڕۆکێتێکی تایبەتی بە دەزگاڵی پرسراوەکان کرد کە پێی ئەڵێن ترایندیت (D.S) 2 وە لەســاڵـی 1990دا ئەکـەویـتــە دەسـت سوپـای ئەمـەریکـاوە. ئەم ڕۆکێتـە لەژێـر دەریـایی (غـواصـه) ئوهـایودا بەکـاردێت، چوار دەسـەری ئۆتـومی هەیـە، هەریەکەی (150) کیـلوتــەنــەوە (1207) کیلومـەتــرە ئەروات و هەر لە نزیــك. کەنارەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانەوە ئەتوانرێت بهاوێژ ڕێت.

بەڵام دەربارەی ژێر دەریایی، هێزی دەریایی ئەمەریکا 73 ژێر دەریایی هێرش بەری بەدەستەوەیە کە هەر بۆ تێك شکانی ژێر دەریایی دوژمن دروست کراوە. دەزگا ئاگادارەکانی ڕۆژئاوا ئەڵێن ژێردەریایی ئەمەریکا لەچاو هێنی سوڤییەت دا لەدوو لاوە بایـەخـدارتـرە. یەکـەم ماشێنـە بزۆینـەرەکانیان بێ دەنگ ترن، دووەم دەزگا هەستکارەکانیان دوور ڕەوترن.

بۆیــە ئەمــەریکـا زۆر بایـەخێکی گەورەی بەپێشخستنی ئەم لایەنەداوەو لەسەر وشکایی نزیك هەر دوو ئۆقیانووسی ئەتلەسی و باسفیك، بەتایبەتی لەنزیك دوورگەی (کەمشەتکا)ی سۆڤییەتی و دەریای بارنتسی نەرویجەوە دەزگای هەستیار (حاسات)ی دامەزراندووە.

بەم جۆرە سەرکردایەتی عەسکەری ئەمەریکا لەم دوو ڕێرەوە بایـەخـداره دەریـاییـەوە، کە تەنیـا دوو ڕێرەوی سۆڤییەتی یەکانە بەرەو ژووررووی باسفیـك و ئەتلەسی، هاتــوچــۆکـردنی هێـزە دەریاییەکانی سۆڤییەتی خستۆتە ژێرچاوە دێری خۆیەوە.

وڵاتـە یەکگـرتـووەکـان دوای ئەم سێ کوچکەچەکە بایەخێکی زۆری بە مەکۆی بۆ شایی ئاسمان داوە نەك هەر لەبەر ئەوەی جێگـایـەکی گرنگی لەنێـو چەکـە سـتـراتیجی یـەکانا بۆ ئەگریتەوە بەلکـو لەبـەر ئەوەی چەنـد جارێـك بەکـار ئەهێنـرێت وەلـە چاو چەکی تری هاوتای خۆیا زۆر کەم مەسرەف ترە.

ئەم چەکـە ئەتـوانێت جگـە لە فرمـانی شارستـانیتی و زانستی لەکـۆری جەنگی داهـاتـووداو هەر لە ئێستـاشـەوە ئەم فرمانانەی خوارەوە جێبەجێ بکات: -

1 - مانگی دەست کردی نوێ چ بۆ مەبەستی عەسکەری یان زانستی بەدەوری زەمینـدا بلاوبکـاتـەوە، وە ئەومـانگـە دەستکـردانـەی پێـویستیـان بەچـاککـردنەوە هەیە چاکیان بکاتەوە یان بیان گورێت بە هیتیتر. هەروەها ئەتوانێت لەتۆیی خۆشیا مانگی دەستکردی یەدەگ هەڵبگرێت.

2 - ئەتوانرێت وەکو بنگەیەکی سەرکردایەتی چ بۆئاراستە کردنی کاروبــاری زەمین یان بۆهی بوشــایی ئاسمــان بەکــار بهێنــرێت واتــە وەکــو تەختــە ڕەوانێکی سەرکـردایـەتی لەئاسمان لەنگەر ڕاگرتوو بەکار بهێنرێت.

3 - بۆ بەگـژمـانگی دەستکـردی دوژمنـدا چوون بەکار بهێنرێت وەئەو مانگە دەستکردانە بەدیل بگرێت بێ ئەوەی پێویستی بەتەقینەوەو پەك خستنیان هەبێت.

4 - ئەتـوانـرێت بکـرێت بەتـەختـە ڕەوانێکی ئاسمـانی بو بەکار هێنــانــی تیـشکی لیـزەرو بومبــای ئۆتــومی. وەلــەم بارەیــە تاقیکـردنـەوەیـەك لەوانـەی بەدەستیـانـەوەیـە خستنـەخـوارەوەی ڕۆکێت یان مانگێکی دەستکردە بەتیشکی لیزەر.

دەربــارەی جەنـگـی بۆشــایـی ئاسمـان چالاکـی یەکیتی سوڤییــەت و ولاتــە یەکگــرتـووەکـانی ئەمـەریکـا هەردووکیـان ڕوویکردۆتە ئەومە بەستەی کە بتوانن مانگی دەستکردو ڕۆکێتی دوور برد بەئـاسمـانـەوە بخەنە خوارەوە هەردوولاشیان پشت بەم چەکانە ئەبەستن:

**1 - تیشکی لیزەروتیشکی تەنۆکەیی (جُسَیم)**

Particle Beam Accelerator: + تیشکی لیزەر بریتی یە لەتیشکێکی ڕووناکی زۆرچر کە زۆر بەباشی ئاراستە ئەکرێت بەڵام تیشکی تەنــوکــەی (جُـسـیم) گەردیلەی نیــوتــرون یان هایــدروجین بەخیــراییــەکی سەرســورهێنــەر فرێ ئەدات. کەتیشکی ئەم دووچەکە ئیجگار وزەدارو سوتێنەرولە ناوبەرە.

2 - مانگی دەستکــردی ڕاوکـەری بکـوژ (القمـر القـاتـل): سەرچاوەکانی ئەمەریکا بلاوی ئەکەنەوە کە یەکیتی سوڤییەت لە ساڵی 1968دا لە هەژدە تاقیکــردنــەوە یانـزە تاقی کردنـەوەی

لەسەر ئەم جۆرە چەکە سەرکەوتوو بووە.

وەئەڵێن سۆڤییەتی یەکان ئەتوانن مانگی دەستکردی راوکەری لەنــاو بەربخـەنـە خولگـە (مدار)ی مانگی دەستکردی نێچیرەوەو پێ ی بخەنەخوارەوە، یان لەکاری بخەن.

هەر دەربـــارەی جەنگـــە ئەستێـرە، رونـاڵـدریگن کە بووە بە پاڵـەوانی ئاگـر خۆشکـەری جەنگە ئەستێرە سێ مانگ لەمەوپێش ئاگاداری کۆنگرێسی ئەمەریکا هاوپەیمانەکانی و تەنانەت یەکێتی سۆڤیـەتیشی کـرد کە لەکـۆری جەنگە ئەستێرەدا تاقی کردنەوەیەك ئەکـــات بریتـی ئەبێت لەوەی فرۆکـەیـــەکی جەنگی F15 ـ ی هەڵگری رۆکێتێکی دوونهوم 20 هەزار مەترە بەرز ئەبێتەوە، ئەو سارۆکێتـەکـە ئەهـاوێژ یت، ئەویش نهومی یەکەمی (50) هەزار مەتـرە بەرز ئەبێتـەوە، ئنجـا لەو بەرزاییـەوە سەرە تێکدەرە خاوەن ئامـرازی پاڵ پێـوەنـەرەکـەی ئەچێتە خولگەی مانگی دەستکردی دوژمنەوە، لەنێوان (200تا 1500 کیلومەترە) کە هەر بەگەیشتنی بەمانگە دەستکردەکە تێکویێکی ئەدات.

ئەمـەریکـاییـەکان ئەڵێن ئەم پەلەقاژێ یەمان بۆ ئەوەیە خۆمان لەکۆری تێکدانی مانگی دەستکردا بگەیەنینە ئاستی یەکێتی سۆڤییەت.

هەروەهـا وڵاتـە یەکگـرتووەکانی ئەمەریکا لەسەرەتای مانگی 10/1985دا مەکـۆیـەکی عەسکەری یان کەناوی ئەتلانتس بوو هەڵـدایـە بۆشـایی ئاسمـانەوە کە هەرچەندە هیچ دەنگو باسێکی ئەوتۆیان لەسەر بڵاو نەکردەوە، بەڵام ئاگادارانی ئەم جۆرە بابەتە ئەڵێن نیاز لەوەیە چەکی خاوەن تیشکی لیزەر لە بۆشایی ئاسماندا بڵاوبـکـەنــەوە کە رۆکێتی ئۆتــۆمی زەمین بۆزەمین و ئاسمـــان بۆزەمینی پێ لەنــاوبـــەرن. دەزگـــا زانستی یـەکـانی (نـاسـا)ی ئەمـەریکـایی ئەڵێن مەکـۆی ئەتلانتس ئامرازی جاسوسی کردن و وینـەگـرتنی ئیجگـار وردوگـرنگی لەگـەڵ خۆیـا هەڵگـرتـووە کە بەئاسانی ئەتوانێت مەبەستەکانی (اهداف) خۆی ببینێت و هەر یەکـەیـان بە جوانی لە یەکتـری جیـابکاتەوە، هەروەها ئەتوانێت ژێرئـاوی یـە ئۆتـۆمی یـە سۆڤییـەتی یـەکـان (الغـواصات النووية السوفياتية) کە ئەمەریکاییەکان زۆر لێیان ئەترسن دەست نیشان بکات.

ئاژانسی رۆیتـەر دەربـــارەی ئەتـــلانتس ئەڵێت فرمـانی ئەم مەکـۆیـە لەتـۆیی نهێنی دا نەمـاوە بەڵکـو بریتی یە لە هەنگاوێکی پێشکەوتووانە دەربارەی بەرنامەی جەنگە ئەستێرەو لێکۆڵینەوەکانی هەروەهـا دەربـارەی جەنگـە ئەستێـرە پەیامنێری ئاژانسی رۆیتەر لەواشنتون تشارلز دینگەر ئەڵێت[38] «ئەگەر بەهۆی هەر شتێکەوە بێت مرۆڤ هۆشی خۆی لەدەست چوو ئەوا ئاگرێك لەئاسمانەوە بەر ئەبێتە سەر زەمین کەسەدان جار بیکات بەزوخاڵ!».

بەرامبـەر بەم هەڵـوێستـەی وڵاتـە یەکگـرتـووەکانی ئەمەریکا لەبیـرەوەری شۆرشی ئۆکتـــۆبـــەردا وەزیـــری بەرگـــری یەکێتی سۆڤیـاتی وتی «ئـەبێ ئەمـەریکاو پەیمانی ئەتلەسی ئەوراستی یە چاك بزانن کە هەرگیـز نایـەلین لەکـۆری چەکی نوێ دا لە ئێمـە پێشکەوتو تربن».

ئێـســتـر لە کۆتــایـی باســەکــەدا ئەڵێـیـن کە لە سەرەتــاوە جیۆپۆلیتیکسی یەکان ئەیان وت کێ ناوچەرگەی بە هێزی زەمینی و داهـــا تەکـــا نی یـەوە دەست کەوێت، دەست بەسـەر جیهـانـدا ئەگـــرێت و دوای ئەوان جیــۆپــۆلیتیکسی یــە زەریـا خوازەکـان وتیـــان کێ لەزەریـــادا باڵا دەست بوو ئەوە جیهـــانی ئەکـەوێتـە بەردەست و دوای ئەمـــان ئەو جیــۆپــۆلیتیکسی یـانـەی هێـزی ئاسمـانی یـان لاگـرنگتـر و بایـەخـدارتر بوو ئەیان وت کێ خاوەن هێزێکی ئاسمانی کاریگەر بێت دەست بەسەر جیهاندا ئەگرێت ئیستـالای جیـوپـولیتیکســەکـانی ئەمـەریکـا وایـە کێ لەبۆشایی ئاسمـان چەکی گرنگتـرو بە سامتـری هەبێت و لەدەوڵـەتـانی تـر دەست رویشتـــووتـر بێت، جیهـان وەکـو هیلکـەیـەکی پاککـراو ئەکەوێتە بەردەستی.

لەکۆتایی پێنجەمین بەشی باسەکەدا کە ئیتر بابەتەکە هەمووی لەگـوفـاری رۆشـنبیـری دا تەواو ئەبێت پێویستە ئەوراستی یە روون کەینەوە، کە بۆچی ئەم بەشە شم وەکو بەشەکانی تر لاگرنگ بوو لە کاتێکـدا نەتـەوەی کوردو عیـراق هەمـووی نەبـەتـەمای ئەوەن رۆژ یـك لەرۆژان ببن بەخـاوەنی هێـزێکی چەکـداری ئەوتـۆ کە جیهـــانی پێ ژ یـــر دەستـە بکـەن و نەپێش بینیش ئەکـرێت بەم هەلـومـەرجـەی ئیستـا بەدەستەوەیە بتوانن بگەنە ئەو پایەیە کەواتا ئەی بۆچی ئەم خۆ خەریك کردنە بەبابەتێکەوە کە بەشی ئێمەی تیدانی یە؟!

یەکـەم: لەبـەر ئەوەی کۆمـەڵگـای مروڤـایـەتی کە کۆمەڵگای کوردستـــان بەشێکیتی ئەبی بچێت بەگـــژ جەنـــگ و جەنـــگ خوازاندا چونکە تەنیا لە جەنگی دووەمی جیهانی دا (80) ملیون

کەسی تیاکوژرا کە 20 ملیونی سوڤییەتی و (5) ملیونی پوڵەندی و (5) ملیـونی ئەڵـمـانیو ئەوانی تری گەلانی‌تـر بوون کە ئەو جەنگە لەچاو جەنگە ئەستیرەدا وەکو شەررە قۆچەقانی وایە!!

دووەم:

هەموو ئەزانین کە ئەم دوو جەمسەری ناکۆکی کارەی جیهان یەکێکیـان (یـەکیتی سوڤییـەت) کەوتـوّتـە ژووررووی هەمـوو کوردستـانو نەتـەوەی کوردو عیـراقـەوەوە ئەوی‌تـریـان (ولاتـە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا) بنکەو هێزە کاریگەرو دەستکەوتەکانی کەوتـونـەتـە خوارووی ناوچـەکـەمـانـەوە. رۆناڵدریگن بەئاشکرا ئەڵێت هەروەهـا سەرۆکـەکـانی ئەمـەریکای ئەم چەند دەساڵەی پێشووی ئەمەریکا کە ئاسایشی دوورگەی عەرەبی بەشێکی لە جیاکردنەوە نەهاتووی ئاسایشی ئەمەریکایە.

هەروەهـا هەرگیـز نابێ لەوخـەیـاڵـە دابین کە یەکیتی سوڤییـەتیش، پاریـزەری خۆیو ولاتـە سوشیـالیستـەکانی‌ترو هاو پەیمـانـەکـانی کەقـازانـج و دەستکـەوتێکی زۆروو تایبـەتی لەم ناچەیەدا هەیە هەروا بەگالتەوە سنووری خوارووی ولاتی خۆی بۆ پیلانەکانی ئەمەریکاو هاو پەیمانەکانی بەرەڵلابکات.

واتـە ئەم ناوچـەیـەکـە کوردستـان سەرە ریگـای هاتـووچـۆو سنـووری خوارووی یەکیتی سوڤییـەت و ناوچـەی جیاکەرەوەو پیا هەلپـژانی ئەم دوو هیـزە گەورە بەسـامـەیـە، هەر جەنگێکی چاوەروان کراو بقەومێت ئەبێ بە مەلبەندی کوشتن و ویران کردن وەکـو لە جەنگی یەکـەمی جیهـانـدا لە خانـەقین و ورەواندزورو بەشـێکی زۆری کوردستـانی تورکیـاو ئیـران روویدا. بەلام ئەمجـارە چ ویـران کردنێـك، بێ‌گـومـان ویـران کردنێك ئەبێـت کەوشکوتەرر پێکەوە بسوتێن. لەبەر ئەوە پێویستە نەتەوەی کورد پێش هەمـوو شتێـك شارەزای ئەم بابـەتـە زانستەبن، ئنجا شان بەشـانـی ئازادیو ئاشتـی خوازانی جیهـان خەبـات بکـەن کەجیهان و ئەم ناوچەیە لە جەنگێکی لەناو بەری کاولکەر رزگار بکەن.

---

سەبارەت بەوەی پروفیسور جەنەراڵ کارڵ هوسهوڤەر خاوەنی قوتـابخـانـەیـەکی جیۆپۆلیتیکسی تایبەتیو ناوی لە هەموو بابەتە جیـوپـولیتیکسی‌یـەکاندا لەناو ناواندایە بەپێویستم زانی مێژووی ژیانی بخەمە پێش چاوی خوێنەرانی بەریزەوە:

## (مێژووی ژیانی کارڵ هوسهوڤەر)(39)

ئەفسەرێکی عەسکەریو زانایەکی جیۆپۆلیتیکسی‌یە لە ساڵی 1887 خوێنـدنی لە قوتـابخـانـەی ماکسیمیلیـانی شاهـانـە تەواوکـردوە. هەر لەسـاڵی 1887دا چوّتـە بەشی تۆپخـانـەی شاهـانـەی باڤـاری‌یەوەو، وە هەر لە سوپای باڤاریای ئەلەمانی‌دا ژیـانی عەسکـەری بردوّتـەسـەر. لەساڵی 1889دا خوێندنی لە ئەکادیمی‌یەی عەسکەری تەواو کردووەو بووە بەئەفسەرێکی یەك ئەستیـرەو لەدەر چوونـەکـە شیـاپلەی (شـرف)ی خەلات کراوە. لەنێوان ساڵی 1890 ـ 1892دا نیرراوە بۆ قوتابخانەی تۆپخانەو ئەنـدازیـاریو دوای گەرانـەوەی بۆ جیگـای پێشـوی خۆی بۆیان نووسیوەکە کاروباری بەشی تایبەتی پێ بسپیرن.

لە 1895دا دوای تاقی‌کـردنـەوەیـەکی تایبـەتی لە کولێجی ئەرکـانی جەنگ وەرگیـراوەوە لەسـاڵی 1898دا خوێندنی تەواو کردووەو بووە بەئـەفـسـەری دوو ئەستیـرە. وەلـە ساڵی 1899 ـ 1901دا بەپێی ئامـوژگـاری لیـژنـەی ئەرکـانی جەنـگ بەکارو باری عەسکەری دووساڵ گەشتیان پێ‌کردووە. دوای ئەوە بەسێ ئەستێرەیی بووە بەفـەرمـانـدەی هیـزێکی پچـوکی تۆپخانە. لە 1904دا بووە بەمـامـۆسـتـای مێـژوو لە کولێجی عەسـکـەری. لەزستانی 1980دا چووە بۆ ژاپۆن و لەهاوینی 1910دا گەراوە تەوە ئەڵەمانیا.

هەر لەو ساڵەدا بووە بەماموستا لە کولیجی ئەرکانی جەنگ تا شارەزایـی خۆی لەکـاروبـاری عەسـکـەری رۆژهـەلاتـدا روون بکـاتـەوە. لەهـاوینی 1911دا گەراوەتەوە بەشی تۆپخانەو لەسـاڵی 1912دا خانـەنشین بووە. لەسـاڵی 1914دا پلەی یەکـەمی (شـرف)ی دکتـورای لە جوگـرافیاو مێژوو جیولوجی لە زانکۆی میونیخ ـ ی باڤاری شاهانەدراوەتیو هەر جەنگی یەکەم هەڵگیرساوە داوایان لێ کردووە بگەریتەوەسوپا.

لەساڵی 1919دا بەجـەنـەراڵی خانەنشین بووە بە فیرکردنی قوتابیانی زانکۆی میونیخ ـ ەوە خەریك بووە. لە 1921 کراوە بە پروفیسـوری زانستی جوگرافیا لە هەمان زانکۆ.

لە 1924دا بووە بەپروفیسور لە ئەکادیمی‌یەی ئەڵەمانیا ئنجا

له ساڵی 1933دا بووه به پروفیسور له زانیاری جیوپولیتیکس و عەمیـدی بەشی زانیـاری له زانکـۆی میـونیخ وه وه هەر لەهەمان ساڵدا بووه به بەڕێوەبەری پەیمانگای لێکۆڵینەوەی جیۆپۆلیتیکس لەم زانکـۆیـــه. لەنێـوان 1934 ـ 1937دا بووه به عەمیـــدی ئەکـادیـمی یـــەی ئەڵـــمـــانیـــاوه له 1938دا بووه به سەرەکی ڕێکخراوی میللی ئەو ئەڵمانانەی لەدەرەوەی ئەڵمانیا ژیاون.

له 1944دا ئەلبریخت ـ ی کوری کوڕ راوەو جیستابۆی نازی خۆشی بەنـدکـردووه. له 1945دا ئەمـەریکـاییـەکـان لەزیندان ڕزگاریان کردووه. وه له 8ی تشرینی دووەمی 1945دا لاشەی خۆیـو ژنـەکـەی لەبـاخچـەی خانوویەکی بچوك لەشاخی ئالپی باڤاریا دوزرایەوه وادیاربووه هەردووکیان بەژەهر خۆیان کوشتووه.

لەسەرەتای ئەم باسەوه تا ئەلقەی پینجەمی که ئەم بابەتەی پێ تەواو ئەبێت.

## لەم سەرچاوانەو چەند سەرچاوەیەکی‌تر کەڵك وەرگیراوه:


1 ـ جیوپولیتیکس ـ الدکتور علی محمد المیاح

2 ـ الاصول العامة في الجغرافیا السیاسیة والجیوبولیتیکا مع دراسـة تطبیقیـة علی الشـرق الاوسـط ـ الدکتور محمد ریاض استاذ الجغرافیا بجامعة عین الشمس.

3 ـ دراسـات في الجغـرافیـا السـیـاسیة ـ الدکتور صلاح الدین علی الشامی استاذ الجغرافیا بکلیة الاداب جامعة القاهرة بالخرطوم.

4 ـ القانون الدستوری ـ نظریة الدولة ـ الدکتور منذر الشاوی.

5 ـ القانون الدولی الخاص وفق القانونین العراقي والمقارن ـ الدکتور ممدوح عبدالکریم حافظ.

6 ـ الخلیج العربي دراسة الجغرافیا السیاسیة ـ الدکتور صبري فارس الهیتی.

7 ـ السر المعروف مبدأ نکسن وکسنجر في اسیا.

8 ـ توینبی منهج التأریخ وفلسفة التأریخ.

9 ـ الأمیر ـ لمکیافللی.

10 ـ اراء واحادیث في اللغة والادب ـ ساطع الحصری

11 ـ سـتـراتیجیـة صراع القـوی الکبـری في الـوطن العـربي ـ محمد عبدالمجید حسون.

12 ـ الحرب من الفضاء ـ اللواء ارکان حرب خضر الدهراوي

13 ـ الاسـتـراتیجیـة الامیـرکیـة الجـدیـدة ـ المؤسسـة العربیة للدراسات والنشر.

14 ـ رواد الاستراتیجیة الحدیثة ـ تألیف ادوارد میدایرل ترجمة ـ الامیرالای 1. ج محمد عبدالفتاح ابراهیم

15 ـ مؤلفات ماوتسي تونگ المختارة المجلد االرابع.

16 ـ مجلة الف باء العدد 892 ـ مقال لـ (عزیز الرفاعی) عن حرب النجوم.

17 ـ جریدة الثورة ـ 1985/9/5 ترجمة فریال مروکی، عن لوماتان عن التسلح في الفضاء الفرنسیة.

18 ـ جریدة الثورة ـ 1985/10/9 مقال لـ (الدکتور محمد ریاض حمزة) عن مهمة اتلانتس.

19 ـ بسام العسلی ـ مشاهیر قادة العالم ـ فون مولتکه.


## پەراوێزەکان

1 ـ الدکتور علي محمد المیاح ـ الجیوپولیتیکس ص 2

2 ـ نفس المصدر ........ ص 2

3 ـ نفس المصدر ........ ص 3

4 ـ نفس المصدر ........ ص 28

5 ـ نفس المضدر ........ ص 33

6 ـ نفس المصدر ........ ص 8

7 ـ نفس المصدر ........ ص 11

8 ـ نفس المصدر ........ ص 11

9 ـ مؤلفات ماوتسى تونگ المختارة ـ المجلد الثانى ـ ص 213
10 ـ بسام العسلى ـ مشاهير قاده العالم ـ فون مولتكه ص 45
11 ـ ادواردميد ارل ـ رواد الاستراتيجية الحديثة ـ ص 123
12 ـ نفس المصدر ........................... ص 133
13 ـ نفس المصدر ........................... ص 173
14 ـ نفس المصدر ........................... ص 181
15 ـ نفس المصدر ........................... ص 197
16 ـ نفس المصدر ........................... ص 213، 214
17 ـ نفس المصدر ص 203
18 ـ نفس المصدر ص 206
19 ـ نفس المصدر ........................... ص 344
20 ـ نفس المصدر ........................... ص 357
21 ـ الدكتور علي محمد المياح ـ الجيوبوليتيكسى ص 38
22 ـ الدكتور محمد رياض ـ الاصول في الجغرافيا السياسية والجيوبوليتيكا مع دراسة تطبيقية على الشرق الاوسط ص 68
23 ـ نفس المصدر ........................... ص 65
24 ـ الدكتور على محمد المياح ـ الجيوبوليتيكس ............ ص 26
25 ـ الدكتور محمد رياض ـ الاصول العامة في الجغرافيا السياسية والجيوبوليتيكا ........................... ص 79
26 ـ الدكتور على محمد المياح ........................... ص 50
27 ـ ادوارد ميدل ارل ـ رواد الاستراتيجية الحديثة ص 404
28 ـ نفس المصدر ........................... ص 405
29 ـ الدكتور على محمد المياح ـ الجيوبوليتيكس ص 54
30 ـ نفس المصدر ........................... ص 59
31 ـ نفس المصدر ص 59
31 ـ نفس المصدر ........................... ص 59
32 ـ نفس المصدر ص 59
33 ـ ادوارد ميدل ارل ـ رواد الاستراتيجية الحديثة ص 459
34 ـ اللواء اركان حرب خضر الدهراوى ـ الحرب في الفضاء ص 195
35 ـ نفس المصدر ص 21
36 ـ نفس المصدر ص 37
37 ـ نفس المصدر ص 221
38 ـ جريدة الثورة ـ 1985/10/9
39 ـ ادوارد ميدارل ـ رواد الاستراتيجية الحديثة ص ـ 101 ـ 102 ـ 103




ئاسیای بچوك و سه رووی میزوپوتامیا له هه زاره ی دووی پێش زایین ( 3000 ـ 1000 ب.ز )

د. جمال رشيد أحمد
**كولیجی ئاداب ـ زانكۆی بەغدا**

# گۆڕانە ڕووداوە مێژوویە مەزنەكانی هەزارەی دووەمی پ.ز لە ئاسیای بچووك و سەرووی میزۆپۆتامیادا

پشكنینی شوێنەواری ئەركیولوژی و لێكۆڵینەوەی زمانەوانی ئەوەیان دەرخستووە، كەوا یەكەمین بزووتنەوەو جوولانەوەی ئەو كۆمەڵە هۆزە كۆچەرانەی لە نێوان خۆیان دا بەشێوە ئاخاوتنێكی لێك نێزیك قسەیان دەكردو لە سەردەمی ئەمرۆدا بە (هیندو ـ ئەورووپی) نێو ـ دەبرێن لەو ناوچانەوە دەستی پێكردووە، كە كەوتۆتە خواررووی رووسیای

ئێستەوە، بەواتا لەو دەشتەوە، كە لەنێوان گۆمی (ئاراڵ)و رووباری (دانوب) دایەو[1] ئەم جوولانەوەیەش لە هەزارەی سێی پێش زاییندا بووە، جا بە هەردوو لقی رۆژهەلاتی و رۆژ ـ ئاوایی بەرەو لێوارەكانی خواررووی زەریای رەش

بەلای رۆژهەلات و رۆژئاوادا رۆیشتوون و چوونەتە نێو وولاتی بەلکان و ئاسیای بچووك، ئەم چوونە دوای رێبڕین و پەڕینەوە لە رووبارانی دۆن و دنیپەرو دنیستەرو دانوپ روویداوە. پێشرەوەکانی ئەم کۆچەرانە لە کێوی قەفقاس رەت بوون و لە رووبارانی کورو ئاراکس و هی‌دی پەریونەتەوە، جا هاتوون لە چیاکانی زاگروس لە سەرووی وولاتی میزوپوتامیادا نیشتەجێبوون. دوای ئەم دیاردەیە گۆڕانێکی جەوهەری لە پێوەندێکانی زمانەوانی‌و ئەتنیکی دانیشتوانی ئەسلی‌و کۆنی وولاتی یونان و ئاسیای بچووك و باکووری وولاتی میزوپوتامیاو کێوی زاگروس دا روویدا، پاشان ئەم کۆچ کارییە گرنگە سنووری بناخەی ئەو مەرجانەی دانا، کە بوون بەهۆی پەیدابوونی ئەو میللەتانە، کە لە هەزارەی دووەمی پێش زایینـدا بە نێـوی (ئـاخی‌و ئیونی)و دۆری لە یونانداو لیدی‌و هیتی لە ئاسیای بچووکداو میتانێکانیش لە سەرووی میزوپوتامیادا.

لە دوای رووخانی دەسەلاتداریتی میکینی،[2] گریکە کۆنەکان بیرەوەرێکی نادیاریان سەبارەت بەو کۆچە فراوانەی باپیرانیان پاراستبوو، لە دوای کۆچی ئەمانەوە دۆریکان لە ناوچەی (بـارنسـوس)ەوە لە نێوەراستی یونانەوە دەستیان بە بزووتنەوە کردو لە (ئەرگولیس و میکینی)یەوە پەڕینەوە، ئەو وولاتەی دوای ئەم کۆچە خوورەوشتی ژیانی دۆریانی پێوە دیاربوو، ئەم هەلمەت بردنە هاوبەشێکی جەوهەری لە هەرەس بردن و کۆتـایی پێهێنـانی کتـوپـری کەلچـەری میکینی کرد.

لە دوای ئەم کۆچـانـە لە ناوچـەی رۆژهـەلاتی وولاتی یونـانـدا ،وولاتـەوەییکی نیشتـەجێبـوونی گریکـەکـان دەستی‌پێکـرد، کە لەگـەل تێپەربوونی رۆژگاردا بوو بەهۆی پەیـدابـوونی کۆمـەلێـك شاری گریکی لە بەری رۆژئـاوای ئاسیای بچووك، کە دەتوانین سێ کۆمەلەی ئەو نیشتەجێ بووانە دەست نیشان بکەین.

1 ـ ئاخی‌و ئەیولی، کە لە ناوچەی تسالیاوە هاتبوون و لە دوورگـەی لیسبـوسدا نیشتەجێ‌بوون و کۆمەلیك شاریان بنیات ناو ناوچەکەش بە نێوی (ئەیولیس)[*] ناسرا.

لە سەرەتادا ناوی (ئاخی) یان لە شێوەی (ئاخایوی) AKhaiwoi وەیا (ئاخایۆی) Achaioi هاتووە:

هومیـر ناوی ئەم ئاخیـانـەی لەگـەل دانـای)و (ئـەرگی) یەکاندا نووسیوە، کە دۆستایەتی تەروادەیان کردووەو، بەپێی گوتـەی هومیـر نیشتمـانیـان دوورگـەکانی رۆژئاوای یونان و کریت و رودوس و ناوچـەی‌تـر بوون، لەو ناوچـانـەی، کە کەلچەری میکینی کە لە سەدەی 14 ـ 13 پێش زایین دا تێدا بلاوبۆوە. بەلام بیرورای جیاواز جیاواز هەیە دەربارەی ئەو کاتـەی، کە ئەمـانـە لەو ناوچـانـەدا پەیـدابـوون، وا دەردەکـەوێت، تێکـەلاو بوونی ئاخییـان لەگـەل دانیشتوانی کەلچـەری میکینی بەهـۆی ژن خواستن و یەکبـوونیـان لە ژیـانی لەشکـری هاوبـەش دا بووە، کە لەژێـر فەرماندەی سەرکـردایـەتـی میـکـنـی‌دا روویداوە. بەلام دیـاردەی سوارچـاکی‌و حەزکـردن لە شەر لەلای هۆزە کۆچـەرەکانەوەو پەیـدابـوونی (دۆری) لەم ناوچـانـەدا هۆی دەسەلاتداریتی رامیاری‌و لەشکری بۆ سەر شارە کەلچەرێکانی میکینی، لە کاتێکی دواتـردا مێـژوونـووسی پلوپـونیز (نیمچە دوورگەی مورە) باسیان دەکات.

2 ـ لە باشـووری (ئـایـولیس)دا Aeolis (ئـەو ناوچـەیەی هۆزی ئیـولی تێـدا نیشتـەجێ بـوون)و کەوتبووە ئەو پارچە زەویـیـەی نێـوان دۆلی هیـرمـوس و دۆلی میـانـدەرەوە ئیونی‌یەکانی تێدا نیشتەجێ‌بوون، کە رۆژهەلاتێکان نێوی (یونان)یان لەم هۆزە ئیونیانەوە وەرگرتووە، بەواتا بەرێگەی ئەوانـەوە ئاشنـایـەتیان لەگەل وولاتی یونان دا پەیداکرووە، سەرەتـای دەرپـەرینیـان دەورو بەری ئەو شارو ناوچـانە بوو وەك ئەتیکاو ئەرگولیس، کە لە دواییدا ئەم ناوچەو بەشێك لە وولاتی لیدیا (رۆژئاوای ئەنادۆلی تورکیا) بە ئیونیا نێودار بوو.



لە لایەکی ترەوە ناوی (یونان) لە زمانانی رۆژهەلاتی دا گۆرینی واژەی (ئیونی) Ione یە، کە خۆیان دانیشتوانی ئاسیای بچووکن لە بەرەی رۆژئاوایەوە، ئەم نێوە لەنێو ئەلیازەی هۆمیرۆسدا هەر یەك جار هاتووە، ئەوانە یەکەم گریکن، کە دەولەتە کۆنەکانی رۆژهەلاتی نێزیك پێوەندییان لەگەلدا پەیداکردووە، جا گەلانی ئەم ولاتانە نێوی (یائونیین)یان بە گۆرینەوە بەسەردا دابرین، ئەم گۆرینەش لەگەل خۆرسکی زمانی هەر گەلێك لەو گەلانەدا رێك دەکەوت و بۆیە بوو یڤانی Yavani و یونانا Yauns و یونان Yunan بە پێی گۆتەی دکتۆر عەبدولەتیف ئەحمەد عەلی ئەم نێوە گۆرراوە، لە سەرەتادا لە کوبرس سەری هەلداوە، چونکە پێوەندیکی بەتینیان لەگەل (ئوگاریت)دا واتە (رأس شمرا)ی ئەمرۆدا هەبووە، کە کەوتبووە لێواری سوریاو ئاشورێکانیش بەنێوی یەمانی Yamani ،[6] ناسیویانن.

3 ـ لە خواروری (ئەیونیا)دا (دوری) Dori ژیاون، بەلام لە سەردەمانی جیاواز جیاوازداو لە دوورگەی رودوس و دوورگەی دی لای گۆشەی باشووری رۆژئاوای ئاسیای بچووك دا[7] و ولاتی پلوپونیز (نیمچە دوورگەی مورە) کردەوە لە ولاتی یونان دا سێ هۆز بەنێوبانگ بوون، هیللیس Hylleis پامفیلوی Pamphyloi و دیمانیس، جا پاشان

ئەرخیتیسون لە ئەتینە (نموونەیەکی ئیونی) سەدەی پێنج پ.ز



گەیشتنە خوارووی ناوچەکانی ئیجە، کە لەپێش ئەوانەوە (11 پ.ز)، لە کۆتایی سەردەمی برونزی لەلایەن ئاخییانەوە داگیرکرابوو هەروا لە باشووری لە دوورگەکانی خوارووی ئیجاو دودیکانیس و خوارووی ئەنازۆل دا بوون و ئەو کردنەوانە نیشتەجێبووانە لەلای یونانیکان بە (هەوڵ دانانی سەرکەوتووی کریسفونتیس) ناویانگیان دەرکردبوو، کە بۆ گەڕاندنەوەی میرات و دەسەڵاتدارێتی خۆیان بوو و کوڕە مامی هرقل ئیوریسنیش فەرمانڕەوای میکینای لێی زەوت کردبوون.[8]

لەم بوارەدا جون گارستانگ دەڵێت: «خاوەنی رامیاری هیتییان دانی بە سەربەخۆیی پاشایانی ئەم هۆزە یەك گرتووانەی گریکیدا نابوو» هەروا دەڵێت: «پادشای هیتی بەشێوەیەکی پایەبەرزی نێوی سەرۆکە ئاخییەکانی دەهێناو وەکو برا نێوی دەبردن»[9] بەهەر حال دەتوانین بڵێین «لەگەڵ سەرەتای سەردەمی برونزی یانی لە دەوروبەری ساڵی 1900 پ.ز وەیا دوای ئەم ساڵە، کە لێکۆڵەرەوان لەسەر کاتەکەی رێك نەکەوتوون، بەرەو نیمچە دوورگەی بەلکان نەتەوەیێکی نوێ، کە بۆ خێزانی گەلانی هیندو- ئەورووپی دەگەڕێنەوە هاتن و پەیدابوون و ئەو وێرانکارییەی لەم قوناخەدا کۆمەڵێك بنکەی خان ویەرالی گرتەوە بەهاتنی ئەم نەتەوەیەی دەبەستنەوە، دکتۆر عەبدول لەتیف ئەحمەد عەلی وای بۆ دەچێت، کەوا ئەمانە وەکو کۆمەڵێکی داگیرکەر، هێرشیان نەهێناوە، بەڵکو کۆمەڵ کۆمەڵ یەك لەدوای یەك و بەرە بەرە هاتوون و کۆچەکەشیان ماوەیێکی دوورو درێژی زۆری ویستووە. شارستانێتیان لە شارستانی دانیشتوانی ئەسلی ئەم ناوچانە چاکتر نەبووە. کە زۆربەیان جووتیار بوون و خەریکی کشتوکاڵ بوون، بەڵام لەگەڵ هاتنی هۆزی نوێ لەم کۆچ کەرانە، ئەمانە دەستیان بەسەر کاروباری دانیشتوانی کۆندا گرت و کاریگەریان کەلچەری ئەوانیشیان پێوەدیاربوو و لە ئەنجام دا بوونە چینی فەرمانڕەوا ئەمەش لەبەر سەرکەوتنیان لە یاسای سوپایی و سوارچاکیداو هونەرانی شەڕکردن. نیوەراستی سەدەی شازدە (دەوروبەری 1550)هێشتا دەستی پێ نەکردبوو، کە دانیشتوانی ئەم نیمچە دوورگەیە لە دوو رەگەز وەیا دوو زنجیرە تێکەڵ بوون، کە ئەوانیش زنجیرەی هیندی - ئەورووپی و زنجیرەی دانیشتوانی زەریای سپی ناوەراست.[15]

لەلایەکی ترەوە ناوچەکانی ئاسیای بچووك و بەتایبەتی پشت چیاکانی تورروس و کیلیکیا دیسانەوە رەگی هیندو- ئەورووپی (بەری رۆژئاوای) بەسەردا زاڵ بوو، ئەمەش بە پێچەوانەی سەرووی وولاتی میسۆپۆتامیاو کێوانی زاکرۆس بووە، کە رەگی رۆژهەلاتی ئەو کۆمەڵە بوو، کە لە دواییدا سنووری بۆ شارستانێتی و خووڕەوشتی ئەو گەلانە کە لەو ناوچەیەدا سەریان هەڵ داوە، داناوە.

و دەربارەی «ئەنتوان مورتگات» دەڵێت: «لە سەرەتادا ئەم گەلانە کۆمەڵە ئادەمیزادی یەکگرتووی تەواو نەبوون، بەڵکو برێتی بوون لەو (دانا)نەی، کە لە ئەنجامی یەکگرتنی

نموونەیەکی یۆنانی لە هونەری دروستکردنی گوڵدان (سەدەی پێنج پ.ز)



کۆمەڵە ئادەمیزادێکی جیاوە پێك هاتبوون»،[11] گەلی هیثی، کە لە نەتەوەکانی هیندی رۆژئاوایی پێك هاتبوو توانی بنچینەکانی زمانی خۆی لە نێوەراست و باشووری ئاسیای بچووك دا بچەسپێنێت. بە هۆی شارەزابوون لە زمانی هیثی رەسمیدا، پسپورەکان وای بۆچوون، کە لە بەری رۆژئاوای ناوچەکانی بەلکان بە پەرینەوە لە هلسپونت (دەردەنیل)و پوسفور کشاونەتەوە ئەم ناوچانەو بەرەو رۆژهەڵات هاتوون و لە نیشتمانی هەرە دواییان دا کە رووباری هالیس (قزل ایرمق لە تورکیادا) سنووری بۆ دانابوون، نیشتەجێ بوون. بەڵام تۆژینەوەی دی ئەم بیروباوەڕە رەت دەکاتەوەو لایەنگری ئەو بیرەیە، کەوا لە رێی قەفقاسیاوە هاتوون.[12]

هیثیکان چ لە رێگەی قەفقاسیاوەو چ لە رێگەی بەلکانەوە هاتبنە تورکیەی ئەمرۆ ئەوە بێگومان تێکەڵاوییان لەگەڵ کەلچەری میسوپۆتامیادا هەبووە، ئەمەش بەرێگەی ناوچەکانی رۆژهەڵات و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك بەڵگەش بۆ ئەمە وەرگرتنی نووسینی مێخی بووە، هەروەکو ئاشکرایە نووسینی مێخی یەکەم جار لە وڵاتی میسوپوتامیادا پەیدابووە، ئەوجا بە وڵاتانی دراوسێدا بڵاوبۆتەوە. لە لایەکیدی دامەزرانی ئیمپراتۆریەتی هیثی، کە بەرەو رۆژهەڵات و باشوورەوە پەرەی سەندوەو تەنیوەتەوە لە یەکێتی نیمچە دەوڵەتانی ناوچەیی ئەم هەریمانەدا سەری هەڵداو چینێکی هندی ـ ئەورووپی بەسەریدا زاڵ بوو، ئەو چینەی لەو ماوە کۆنەدا لەم وڵاتەدا ژیاون دەگەرێنەوە سەر



ئەو کۆمەڵانەی بە زمانی (نیسی)[13] دوواون، بەڵام لە سەردەمی دەولەتی هیتی نێوەڕاست دا لوڤی و هوری دەوری ڕامیاریان تێدا بینیوە[14] بۆیە زۆربەی نێوی پاشایانیان بە زمانی لوڤی بوون و ئەو ماوەیەش سەدەی پازدەم تا سەرەتای سەدەی چواردەمی پێش زایین دەگرێتەوە.[15]

بەڵام شانشینێتی (مملکە)ی نوێ، کە لە سەدەی چواردەم تا سەرەتای سەدەی دوازدەمی گرتۆتەوە، پاشاکانیان هووری بوون و نێویان هووری بووە، بەڵام نازنێویان لەکاتی بوونیان بە پاشا بە زمانی هیتی بووە. هەروەکو لە تابلۆی (یازل کەیا)، کە لە تورکییەیە دەردەکەوێت، ئەم تابلۆیە بە نووسینی هیرۆگلوفی و بە زمانی لوڤی تۆمارکراوەو نێوی کەسی و نێوی خوداوەندانی هوری تێدا هاتووەو یەکەم پاشای ئەم شانشێتنی تازەیە (شوپیلولیوما)ی یەکەم بووە (سەرەتای سەدەی چواردەم) ئەم پاشایە شەری لەگەڵ میتانیان کردووەو لە دوایی دا ڕێککەوتنێکی لەگەڵیان مۆر کردوە.[16] بە هەرحال ئەمانە بەو نەتەوە کۆنە مشەختانە دادەنرێن، کە بەرەو ناوەڕاستی ئاسیای بچووك کۆچیان کردووەو لە سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زایین دا لەم هەرێمەدا پەیدابوون. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆژی دا ئەوە روون بۆتەوە، کەوا ئەوانە تێکەڵاویان لەگەڵ گنسی دیدا لەم ناوچەیەدا لەدوای نیشتەجێ بوونیان پەیدا کردووە، بۆیە هۆزە هیندو ـ ئەورووپییە کۆچ کەرەکان بۆ ئەم ناوچەیە ڕۆشنبیری حاتی و هووریان کاری تێ کردوون و، لەگەڵ بوونی هێندێك جیاوازی لەسەردەمی کۆن دا لەنێوان دانیشتوانی ئەم ناوچانە، لە ئەنجامی یەکێتی ڕامیاری دەوڵەتی حیتی، کە لە یەکگرتنی سەرۆکە هۆزانی جیاواز لە رووی گینس و زمانەوە دامەزرابوو، و لە سەدەی هەژدەهەمی پێش زایین، ئەم رەگەزە جیاوازانە تواونەوە، کۆمەڵەی حیتی بە زمانانی (نیسی و لوڤی و پالایی) دواون لەچاو ئەو هەرێمانەی، کە ئەم هۆزانە لە ئەنازۆڵ دا تێیدا ژیاون.[17]

هەندێ لە نەخش و نیگاری بەردینی هیتییان لە بوغازکویی (خەتتوساس) ەقەرەبل ئەمەلاتیە و گیاورقەلعەسی



دەستکردی برونزی کاشییان



چەند دەستکردێکی برونزی وڵاتی کاشییان (لورستان) / کۆتایی هەزارەی دووی پ

بەم جۆرە دەتوانین بلێین ئەو چینە سەرمایەداری دەوڵەتی حیثی، کە لە هیندی ئەورویی رۆژئاوایی پێك هاتبوون لە سەرەتای هەزارەی دووی پێش زایین[18] بە دەرکەوتن (ئەو قۆناخەی کە لەگەڵ پەیدابوونی خزمانیان لە یونان و سەرووی میسۆپۆتامیادا رێك دەکەویت) کۆنترین هەوالی پاشایانیان لەسەر خشتێکدا نێوی هاتبێت نێوی دوو پاشان (ئەنتیتاو باوکی پوتخانا)، ئەم خشتەش لە حاتوساس (بوغاز کوی) دۆزراوەتەوەو هەر دووکیان پاشای (کوشار) بوون و بەسەر سەرکردەکانی ناوچەییان داداون و ئەننیتا بەسەر پاشای حاتوساس و دەست و دایەرەکەیدا لەسەدەی حەڤدەمی پێش زایین دا زاڵ بووە، جا لەدوای ئەوەی پاشاییکی دی بەشێوەی (تابارنا) لە دەوروبەری ساڵانی 1680 ـ 1650ی پێش زایین دا نێوی تۆمار کراوەو ئەم پاشایە کایادوکیاو کیوانی تورووسیو هەرێمانی دی داگیرکردووە.[19] وای بۆ دەچن کەوا (تابارنا) وەیا (لابارنا) نازنێویکە پاشایانی حیثی پێی نێودار بوون.[20] لەدواییدا ئەم حیثییانە وایان لێهات لە ساڵی (1340)ی پ.ز. ببنە هێزێکی دیاربووی رۆژهەلاتی نیزیک،[21]

پایتەختەکەیان لە سەردەمی حاتوسیلی یەکەم دا لە (بوروسخندە) بۆ (حاتوساس) نیزیکی بوغاز کوی ئەمرۆ (1650 ـ 1620پ.ز) گوێزرایەوە ئەم پاشایە زەوی وزاریکی زۆر فراوانی لە ئەنادۆل و باکووری سوریەدا داگیرکرد، هەروا مورسیلی یەکەمی کوریشی لە ساڵی 1595 (1650ە) بەسەر بابلی داداو کۆتایی بە بنەماڵەی ئاموریان و ئەو یاسایەی حەمورابی دایناببوو هێنا.[22]

ئەم داگیرکردنە کتورپریەی مورسیلی یەکەم بۆ خاکی میسوپۆتامیا بۆشاییکی رامیاری لەم ناوچەیەدا پەیداکرد، کاشێکان (دانیشتوانی لورستان و چەمەکانی سەرووی رووباری دیالە)، کە لەم ناوچەیەدا بلاوبیوون وە، ئەم بۆشاییەیان بەهەل زانیو هەروا پاشایانیان لە هەمان بنەچەی چینی فەرمانداری وولاتی حیثیان و میتانیان



(گنسی هیندو ئاورویی رۆژهەلاتی) بوون و بەم رێگەوە توانیان وولاتی سومەرو ئەکەد داگیربکەن و جۆرە یەکێتییەکی شارەکان کەژێر سەرکردایەتی خۆیان دابمەزرێنن. لەکاتی ئەوان دا ئەو وولاتە بە (کاردونیاش) نێودار بوو.

لە دوای مردنی مورسیلی یەکەمی حیثی کێشەی سەرکردایەتی سەری هەڵداو لە کۆتایی ئەو کێشەیەدا پاش ساڵی 1530 پ.ز (تیلپینوس) ناوێك دەستی کرد بەرێکخستنی کاروباری دەوڵەتی هیثییان و بەدیهێنانی ژیانێکی یاسایی.

لە دوای ئەمە سەرچاوەکان یارمەتی ئەوەمان نادەن بۆ ئەوەی شوێن ئەو رووداوانە بکەوین، کە لەم وولاتەدا رووی داوە تاوەکو پەیدابوونی شانشینی نوێ (1400 ـ 1200 پ.ز)، لە سەردەمی شوپییلیومای یەکەم (1380 ـ 1340پ.ز) ئەم وولاتە گەیشتە مەزنێکیوا وولاتی ئارزاوا[23]ی داگیرکردو جەنگیشی لەگەڵ میتانیان دا کردو لە سەردەمی مونالیس (1306 ـ 1282پ.ز) ناخۆشیان لەگەڵ میسردا زۆر توندبوو و هەروا لەسەردەمی رمسیسی

دووەم دا جەنگێکی کوشندە لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتەکە لەنێـزیـك قادش لە ساڵی 1288 پ.ز رووی‌داو لەکـاتی فەرمـانـرەوایی هاتوسیلی سێیەم دا (1275 - 1250پ.ز) بەهۆی ژن و ژن خواستنەوە رێك کەوتنێك لەنێوانیاندا پەیدابوو.

دەوڵـەتی حیثی (دەوڵـەتی نوێ) لەپـر رووخـا، وای بۆ دەچـن بە هۆی کاریگـەری هێـرشـی هۆزانـی زەریـای کۆچ کەرەوە بەرەو ئاسیای بچووك بووبێت.

بەڵام نیمچە شانشینەکانی سەر بەوان، کە سەربەخۆیی خۆیـان هەبـوو وەکـو کیلیکیـاو فریگیـاو سوریـا لەبـەر دەسەڵات دارێتی ئاشوریان[24] خۆیان پێ رانەگیراو نەمان، دوای ئەم رووخـانـە (لـە سەدەی دوازدەی پ.ز)[25] دانیشتـوانی باشـووری رۆژهـەڵاتی ئاسیای بچووك بەنێوی (حیثی) لەنێـو تیکستی بێگـانـان داو لەوانە (العهد القدیم) نێـوداربـوو، ئەم دانیشتـوانـە بە زمـانی لوڤی (لـویـانی) دواون. لە لایـەکی‌دییـەوە ئەوە دەبینـدرێت کەوا لە لیـدیـا (رۆژئاوای ئاسیای بچووك) شوێنەوارێك هەیە بۆ هەزارەی یەکی پێش زایین دەگەرێتەوەو ئەوەش پێشان دەدات، کەوا زمـانی لیـدی زۆر لە زمـانی حیثی نێـزیکـە (ئـەگەر لەگەڵ زمـانی لیکی‌و زمـانـانی دی ئەنـادۆل بەراوردبکـرێن). لە هێنـدێـك باردا دەتـوانـدرێت بگوترێت بەردەوامی حیثیە لە راستـی‌دا ووشـەی حیثـی بۆ دەربـریـن لە دانیشتـوانی شانشینەکە هەمووی دەربراوە، نەك هەر بۆ کۆمەڵەیێك.[26]

بە شێـوەیـێکی گشتی لە تۆمـارەکـانی بوغـاز کوی‌وا دەردەکەوێت زمانی حیثی دابەش کراوەتە سەر دیالێکتێکی میـری بۆ نووسین و دیـالێکتێکی رەمـەکی، کە گەل پێی دواوەو بە (نیسی) وەیـا (نیسـارتی) نێـودار بووە، بەڵام لە ناوچەکانی باشووری ئەو ووڵاتە ئەوا خەلکی بە دیالێکتی (لووی)[27] وەیا (لویانی) قسەیان کردووە.

بە بیـروڕای جورج رۆ (زاراوەی - حیثی) لەگـەر بەمـانا فراوانـەکـەی تەمـاشـابکـرێت کۆمـەلیك نەتەوەی پەنابردوو دەگرێتەوە، کە سێ گەلن و بە سێ زمانی هیندو ئەورووپی جیـاواز (لـویـانی، بلایکی‌و نسـاتی) گفتـوگۆیان کردووە. لەوانەدا لویانێکان یەکەم کۆمەڵ بوون، کە گەیشتنە ئاسیای بچـووك و زمـانـەکـەی خۆیـان بە نووسینی هیـرۆگلۆفی تۆمـارکـردووەو لە رۆژئـاوای کیلیکیـا بەدرێـژایی لێوارەکەی نیشتـەجێ‌بـووبـوون، بلایکێکـان لە هەرێمە گردۆڵکەکانی (سیڤـاس) بوون، بەڵام نسـاتی کە لە شاری (نیسـا)، وە هاتـووە لە کەبـەدۆکیـادا دابـەزیبـوون، لە راستی‌دا شاری نیساوەیا نیشا هەر شاری کانیس - کولتبە بووە».

هەروا جورج رۆ ئەوەی دەخـاتـە سەر کەوا (ئـەوانـە لە سوریـاوە نووسینی مێخیـان خواستـووەو بۆ نووسینی زمـانـە هیندو ئەوروپیە تایبەتیەکەی خۆیان بەکاریان هێناوە.

پاشایانی حیثی لە سەردەمی کۆنەوە پیاوانی ئاینیان، کە سەر بە خوداوەنـدانی ووڵاتـەکانیان بوون، هەڵس وکەوتیان لە بەجێ‌هێنانی خوورەوشتی ئاینیدا ئەوەندە بەرزبووە، بۆیە گەل بەچاوێکی پر لە رێزەوە تەماشایان کردوون و گەلیش لەو باوەرەدا بوو، کەوا توخـمێکی خوداوەنـدی هەیـە، کە پشتـگیـری فەرمـانـرەوایی کاتی دەکـات. (تیشـوب) خوداوەنـدی ئاسـمـان بوو، و کە لە هەمـان کات دا خوداوەندی هەرە مەزنی پاشاو گەلی حیثی بوو، پاشا پیاوە ئاینی هەرە مەزنی ئەم خوداوەندەبوو، بەڵام ئاینی ووڵات لەپێش حیثێکـان دا وادیـاربـوو پەرستنی دیـاردەی سروشتی بووە. کە رەگی باوەرکـردنی تێـدا روا بە هێـزی رەگـەزانی وەکـو زەوی دایـك دەردەبـرا، بەڵام لەسـەردەمی یەکێتی هۆزەکان داو لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتدا خوداوەندی هەتاو هەر خۆی خوداوەندی شەربوو، و لەلای حیثێکان لە هەموو خوداوەنـدان پیـرۆزتـربـوو، و پەیکـەریکیشی لە ئاریننا دۆزراوەتەوە، پاشایان لە هێرشەکانیان دا هەرگیز دیاری‌یان لێ نەدەبـری‌و زۆر بەگـەورەیی تەمـاشـایـان دەکـردو ئەم خوداوەندە لەسەرووی هەموو خوداوەندیانی حیثیان دا بوو، و جێگری باوەرپێکردن و پارێزگەری پەیمان و بەڵێن و هەروا بێ نەواو مشەختانیشی دەپاراست.

ئەم ڕووداوانەو ڕۆلی هیندو ئەوروپیکان لەو گۆڕانانەی بەسەر لایەنە مادیو نامادیکان دا هێنای دانیشتوانی کۆی باکووری وولاتی میسۆپۆتامیاشی گرتەوە، کە هووری بوون، تایبەتیتی بە دەوری ڕامیاریو کەلچەری لەنێو سنووری وولاتەکەیان دا دای، کە هەتا کێوی زاکرۆس لە ڕۆژهەلاتیەوەی تا زەریای سپی نێوەڕاست لە ڕۆژئاوایەوەیو ئەرمەنستان لە باکووریو دەشتی ئاراپخا (کەرکوك) لە باشووریدا گرتبۆوە.



ئەمەش بۆ هوی ئەوەی دەسەلاتدارێتیان بگاتە وولاتی میسۆپۆتامیاو سوریاو فەلەستین لە هەزارەی دووی پێش زایین، لەبەر ئەوەی زمانی هوری هیچ پێوەندیکی بە کۆمەلەی زمانانی سامیو هیندو ئەورووپیەوە نییە، بۆیە بەزمانێکی ناوچەیی وولاتی سوبارتو دەژمێردرێت، بەلام ... ەکەرانی زمانی هووری هەر لە سەرەتای هەزارەی دووری پێش زایینەوە بوونە سەر بەچینێکی ئورووستوکراتی ڕامیاری، کە بە زمانێکی هیندو ئەورووپی دەدوان و ئەم زمانەش لەدواییدا بوو بەزمانی دەولەتێك، کە لەسەر شان و ئەستۆی هووریان دایان مەزراندو نێویشی (دەولەتی میتانی) بوو، لە دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك دا بیروڕای ئایینی لەلای ئەو کۆچ کەرانەدا کە بنەچەیان هۆزی حثیو یونانیبوون و لەمەوبەر لێیان دووام چەسپا بە ڕادەیێك ئەستێرەی خوداوەندە نەتەوەیەکانیان لەنێوان خوداوەندە ناوچەیەکانی هووریان دا زۆر زێتربوو، و پێوەندی دەروونیشیان لەگەلّ ئەو بارەدا تێکەلاویکی باشی پەیداکرد.

نێوی کەسی هووریان بۆ یەکەم جار لەنێو تۆماری ئاینیدا بینراوە، کە بۆ هەزارەی سێی پێش زایین دەگەڕێتەوە ئەم تۆمارانە لە وولاتی میسوپۆتامیادا دۆزراونەتەوەو شێوەی زمانێك دەست نیشان دەکا، کە دانیشتوانی بەری ڕۆژهەلاتی دیجلەو کێوی زاکرۆس[29] پێی دواون.

بەپێی بیروڕای جورج ڕۆ خەلکی ماوەی سەدەیێك لەمەوبەر شارەزایی زێتر سەبارەت بە هووریان وەرگرت، لەوکاتەدابوو، کە نێویان لە تێکستێکی مێخیدا هاتبوو، کە لە شێوەی نامەدابوو و لە (تل العمارنە) دۆزرابۆوە لە میسردا،[30] باوەکو ئەم نێوە لە (العهد القدیم)دا لە (سفر التكوین) لە شێوەی (الحوریتیون)دا هاتووە، بەلام جیجر توانی پێوەندی ئەم دارشتنە ناوچەییە بەشێوەیێکی ڕاست و ڕەوان بەنێوی خوداوەندی هەتاوەوە بدۆزێتەوە کە (خوار - خور) وەیا (هوڤار - هور)[31] بووە. ئەمەش شێوە ڕۆژئاوایەکەی نێوی (سوار - سور) بووە، کە لە زمانی



نیشانەی خودای خۆر لە ولاتی میزۆپۆتامیادا کە لە حەلەب دۆزراوەتەوە

مـــوزەخـــانـــەی حـــەلـەب

بنەچەی ئەوانەوە هاتووە، کە لە باکووری هیندستان دا لە هەمان قوناخ دا نیشتەجێ بوون.

بوونی ئەو نێوە لە باکووری وولاتی میسۆپۆتامیادا دەوری رامیاری لە پێوەندێکانی دەوروونی و مەتریالی دانیشتوان داو پەیدابوونی وەکو چەمکێکی ئایینی یا نەتەوەیی واتایەکی مێژوویی زۆر گرنگ بەدەستەوە دەدات، چونکە لە سەرەتاداو لە راستی دا ئەوە ناگەیەنێت، کە کۆمەڵە مرۆڤێکی رێك کەوتوو تەبا بن لە رووی نەتەوایەتیەوە بەو ئەندازەیەی چەند کۆمەڵێکی جیاواز لە هۆزان دەگەیەنێت، کە هاوبەشی پەرستنی خوداوەندی (خور ـ هور)یان کردووەو تێکرا ئەم هۆزانە لەنێو چوارچێوەیێکی بیری هاوبەشدا خوو رەوشتی پێرەوکردووەو هەموو دانیان بە مەزنی و سەرکردایەتی خوداوەندی هەتاودا (خور ـ هور) ناوە، ئەو نێوەی کە ئێستەش لە زمانی کوردیدا هەر واتای هەتاو (رۆژ) (خۆر) دەبەخشێت و پیرۆزیشی لەنێو هێندێك هەرێمی کوردەواریدا هەر ماوە. لەگەڵ ئەوەی دانیشتوانی باکووری وولاتی میسۆپۆتامیا بەنێو خوداوەندێ (هور) نێودار بووە، بەڵگەش بەدەستەوەیە، کەوا ئەم خوداوەندە مەزنترین خوداوەندانی ئەم ناوچەیە بووە، بەهۆی نێونانی هێندێك لە پاشایان و هێندێك لە نێوانی جوگرافی بەم نێوە. وەك نێوی پاشا (هوڤار داتادانی خوداوەندی هەتاو وەیا خۆر) نێوی جوگرافی وەکو (خومور داتو ـ خورداتو)، ئەمانە پێوەندیان بەنێوی ئەم خوداوەندەوە هەبووەو[32] لە دوایدا بەنێوی هوریيان، هەتا وای لێهات ئەو زمانەی، کە لەنێو ئەمانەدا بلاو بۆوە (وا دەردەکەوێت زمانێکی هاوبەشی دینی چینی پیاوانی دیندار بووە) لەنێو نووسراوانی حیثیدا (تێکستی بوغاز کوی) بە شێوەی (خوریلی)[33] وەیا (هورلیلی) کە دانیشتوانی کوردستانیش و ئەرمەنستانی کۆنیش لە دوا سەدەکانی هەزارەی سێی پێش زایین دا پێ دواون و کاریگەریشی هەتا دوا ساڵانی ئیمپراتۆریەتی حیثی (1400 ـ 1190 پ.ز)[34] هەر مابۆوە.

لە دوای نەمانی (دەوڵەتی میتانی) یەکێك لە زمانانی نەتەوایەتی هوری ناوچەیی (وەیا شێوە زمانێکی) «بوو بە زمانی دەوڵەتی ئورارتو»[35]، کە لە دەوروبەری گۆمی واندا خۆی گرتبۆوەو شاری توشپا (توروشبا) لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پێش زایین دا (سەدەی نۆیەم ـ هەشتەمی پێش زایین) بوو بە پایتەختی[36] ئەو دەولەتە.

لەنێو تێکستەکانی ئاشوری و بابلیدا نێوی ئەم دەولەتە لە شێوەی (ئورارتو)دا بینراوە، هەروا ئەم نێوە لەنێو تەوراتیش دا هاتووە، بەڵام لە شێوەی (ئارارات) دایە، لەگەڵ ئەوانەش دا بەهۆی ئەو نەخش و نیگارانەی، کە دانیشتوانی ئەم هەرێمە بە نووسینی مێخی بۆیان جێهێشتووین خۆیان بە خۆیان گوتوە (هالدی ـ بە «هـ»یکی گران)و نیشتمانیشیان بە (هالدیا ـ خالدیا)و هەروا بە (بیاینا)ش نێوبراوە.[37]

لە راستیدا نێوی (خالد ـ هالد) نێوی خوداوەندێکی مەزنی ئایینی نەتەوەکانی هوری بووەو لە وێنەی پیاوێکی ردێن درێژدا بووە کە لەسەر شێرێك وەیا لەسەر سەری شێرێکی ئەفساناوی راوەستاوە، دانیشتوان لەو باوەرەدابوون خێزانی ئەم خوداوەندە خوداوەندی ئەروبانی وەیا

(باگبارتو)[38] بووە.

لەپاڵ ئەوانەداو لەگەڵ دەوری نێوی ئەم خوداوەندە هووریکا دوو جۆرە خوداوەندیان هەبووە، ناوچەیی وەك خوداوەندی تیشوب (خوداوەندی رەشەبای کێوان)و خێزانەکەی (هیپا ـ خیپا)، کە جۆرە خوداوەندی دایك بووە. جۆری دووەمیان بێگانەبووە وەکو خوداوەندانی وولآتی میسوپوتامیاو هی‌دی.

لە سەدەی سێزدەم و دوازدەمی پێش زایین دا پاشایانی ئاشوری لە وولآتی هووری‌و هالدیان دا هەستیان بە هەبوونی کۆمەڵێك شانشینی یەکگرتوو کردووە، کە بەنێوی (نایری) نێوداربووو کەوتبۆ ناوچەی باشووری گۆمی وان (ناوچەی نەیری وەیا نەهری کوردی. . . ج. ر). ئەمە لە کاتێك دا، کە ئاشور بێ‌هێزبوو، بەڵام لەدوای سەدەی دوازدەهەمی پ. ز کە هێزداربوون بەرامبەر بە پاشایانی (بیاینا) وەستان لەو ناوچەیەی، کە لە دواییدا بە ئورارتویان نێو دەبردو هەرێمی نایری کۆن و ئەو ناوچانەش، کە سەر بەو وولآتە بوون و درەنگتر بە ئەرمەنستان نێودار بوو.[39]

ئەگەرچی (هالد) خوداوەندی هەرە مەزنی وولآتەکەیان بوو، ئورارتێکان لەرووی رامیارێوە خۆیان بەجیهان بەنێوی (خالدی) نەناساندوە، بۆیە زاراوی رامیاری (ئورارت)وەیا (ئوراشت) هەروا وەکو نێوی دەوڵەتێك مایەوە.

لە سەردەمی هەزارەی دووەمی پێش زاییـن دا هۆزانی وولآتی (بیاینی) هەروەکو دانیشتوانی ناوچەکە بەخۆیان دەگوت (یەکیان گرت)، لە هەرێمی بەری رۆژهەلآتی ئاسیای بچووك داو ئەوسا پێیان دەگوت یەکێتی هۆزانی (ئوررو ئاتری)، کە بوو بە ناوکی شانشینی ئورارتو، لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین دا ئەم هۆزانە بە نەتەوەی کۆچکەر نەدەژمێردران، بەڵکو دانیشتوانی بنجی‌ی ئەم هەرێمە بوون، لەوانەیە لە سەرەتادا لەرووی زمان و کەلچەرەوە پێوەندییان بە جیهانی قەفقاسیوەو پشتی ئەویشەوە هەبووبێت، بەلآم پێوەندیان لەگەڵ جیهانی (هوری)دا بەهێزتر بووە. لە سەردەمێکی درەنگتردا ئەو پێوەندییە کەلچەریەیان لەگەڵ دراوسێی بەری باشووریان، کە ئاشوری بوون سەری هەڵدا ووشەی ئورارتو لەنێو زمانی ئاشوری‌دا پەیدابوو.[42] ئێستەش ئەرمەنی دانیشتووی دەووروبەری گۆمی وان و گۆمی وورمێ ووشەی ئورارتی لەنێو شێوەی[43] گفتوگۆکردنیان دا بەکاردێت، هەروەکو مێژوو نووسی سۆڤێتی ئەڤرییف دەڵێت، ئەمەش پێوەندی زمانەوانی ئورارتی بە جیهانی قەفقاسیوە پێشان دەدات، ئەمەش لەکاتێك دا ئەگەر زمانێکی مردووی ئەم زمانانەی قەفقاسی نەبێت. لەسەدەی پێنجەمی پێش زایین دا، وەیا لە دوای نەمانی دەوڵەتی ئورارتی‌دا بە لایەنی کەمەوە بە سێ سەدە هیرۆدۆت نەتەوەکانی ئەم ناوچەیەی، بەتایبەتی لە رۆژهەلآتی ئاسیای بچووکەوە باس کردوەو بەنێوی (ئەرمەن، ساسپیر، ئەلارودو ماتیێنی)،[44]

هیرۆدۆت ( 484 ـ 425 پ.ز)



هیــرۆدۆت بەپێ شوێنی جوگـرافیـان مەبـەستی لەم ناوانـە (ئـەرمـەن، ئیبیـری ـ کە بەشێکن لە گورجی، و ئورارتـو و میتـانی ـ هینـدی ئەورووپی بووە، کە لەگـەڵ هووریـان دا تێکـەڵ بوون ـ)، بەواتـا ئەم مێـژ وونـووسـە توانیـویەتی لە رووی زمـانـەوانیو ئەتنـوگـرافیـوە ئەم نەتـەوانە لێك جیاواز بکـاتـەوە، لەگـەڵ ئەوەی نێـوی (هـوری)یشیان لە سەدەی دووەمی پێش زایین دا بەسەردا زاڵ بوویێت. هیرۆدۆت لە پەرتـووکی سێـیـەمی مێـژ ووکەیدا، کە نێوی نۆزدە هەرێمە کارگێرێکانی سەر بە ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی باس دەکات، هەرێمی سێزدەهەم وولاتی ماتیینیە (وەیا وولاتی میتانییان) هەروا باسـی ساسـپـیـری[45] (کـە نەوەی گورجییـانن)و ئەلارودی (نـەوەی ئورارتـویـانن)، وا دیـارە نێـوی هوریيان لەگـەڵ نەمـانی پەرستـراویـان لەم قۆناخەدا لەنێوچووە، کە ماوەی سێ سەدەیـەك بەسـەر رووخـانی شانشینی ئورارتوو ئاشوریان دا تێپەریوە.

پێـویستــە لەوانــەی لەمــەوبــەر باسکـران جیـاوازی بخـرێتـەنێـوان ئەو باسـانـەی، کە پێـوەنـدییان بە قۆناغانی مێژ وویی‌یەوە هەیەو دەوری هەر نێوێك لە نێوانی. ئایینی، رامیــاری، ئەتنــوگــرافی دابنــدرێت، کە لە باکــووری میزوپوتامیادا دۆزراونەتەوە وەك (هوری، میتانی، ئورارتو، بیایناو هالدی.. هتد). هووری نێونانێکی ئایینی گشتیەو واتایەکی گشتی هەبووە لە هەزارەی یەکەمی پێش زایینەوە بەواتا لە سەردەمی نووسینەوەوە.

وشـەکـە نیشـانـەیـە بۆ ئەو نەتەوانەی لە وولاتی زۆزان (سـوبـارتـو)دا ژیاون و خەڵکەکە باوەڕیان بە خوداوەندێکی مەزن هەبووەو نیشانەکەی کەوانەی ئەو هەتاوە بووە، کە بە هەردوو باڵـە ئاوەڵـەکـانی‌لـە ئاسمان دایە. بێ‌سوو ئەمانەی بەم نێـوە هاوبـەشـە یەکیـان گرتبـوو لە ناوچـەیێکی فراوانی وولاتی زۆزان (سـوبـارتـو)دا لە سەردەمـانێکی زۆر کۆنەوە ژیاون و هەبوون و رەوشتی ئاینیشیان لە پەرستگەکان دا بە زمانێکی هاوبەش بووەو زمانەکەش زمانێکی زیندوو بووەو ئەوسـا لە پاژ (جـزء)ێکی ئەم ناوچـەیـەدا قسـەی پێ‌کراوەو تایبەتێتی خۆشی هەبووە لەنێو زمانانی دیدا، بۆیە هێندێك نێــوی سوبــارتـی، کە بۆ هەزارەی سێیــەمی پێش زایین دەگـەڕێتـەوەو پێشـان دەدات، کەوا زمـانی سوبـارتـو هیـچ پێوەندیکی بە زمانی هورییەوە نییە، ئەگەرچی ئەم دیاردەیە زۆر راستــە، بەڵام هەر دەبێ چەنــد کۆمــەڵێکی هووری کشـابنــەوە ناوچــەی کشتـوکـاڵی پەرەسـەنـدووی بەری باشورەوە، کە لەسەردەمی زنجیرەی بنەماڵی ئوری سێیەم دا بووەو، بە رادەیێـك بووە هۆی کوژانـەوەی ئەستێـرەی نێوی (سـوبـارتـو) بەشێـوەییکی گشتی بەرامبەر بەو نێونانە ئایینیە گشتیەی ئەمانەوە وەکو (هووری)و لە بەرامبەر نێوی رامیاری دەوڵەکەیان کە (میتانی)بوو. لە راستی‌دا سنووری رامیاری ئەم دەوڵەتە، کە لە سەرەتادا چینێکی هیندو ئەورووپی نێو کۆمەڵگەی هووری پەیدابوو لە سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زایین دا ئەم وولاتەی هەموو گرتبۆوە.

بۆیــە بۆ نووســەرانی مێــژ وو زۆر سەخت بوو بتـوانن جیاوازی لەنێوان نێوی (هووریو میتانی)دا بدۆزنەوە، کە چەمکی ئایینیو رامیاریان تا دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی ئاشۆریش هەر هەبووە.

جا لەبەر ئەوەی دەوڵەتی ئورارتو بەهۆی سنوورو ئەو بارو دۆخـەی دەورەی هەبـوونی دابـوو وەکـو هێـزێکی رامیـاری لەچـاو جارانـدا زۆر سنـووردارتـر بووە، بۆیـە هەر لەگـەڵ رووخانیدا نێوەکەشی یەکجاری نەما تەنیا شێوە عیبرێکەی نەبێت، کە لە کێوی (ئارارات) دایە، بەڵام نێوی وولاتی (بیاینا) نە دوای پەیدابوونی دەوڵەتی ئورارتی زۆر بەدەگمەن لەنێــو نووسینی مێخیدا بەرچــاو دەکـەوێت، بەڵام نێـوی (هــالــدی وەیــا وولاتی هالـدیـا) لە زۆر باردا بەنێـوێکی (هووری) دەچێت و نێوی خوداوەندی (هالد) بەر لە پەیدا بوونــی دەوڵــەتـی ئورارتـی هەروا لەســەردەمـیو لەدوای پەیــدابــوونیشیدا هەر هەبـووە، زۆربـەی بنکـەی پیـرۆزو پەرستگــەکـانی ئەم خوداوەنـدانـە لەنێـو جەرگـەی وولاتی کوردەواری ئەمـرۆدا بووە، ئەمـە دەوری دانیشتـوانی کۆنی کوردستــان لە زینــدووکــردنـەوەی رەوشتی ئایینی پێشـان

دەدات، ئەو رەوشتەی بەندیواری بە پێوەندی دەروونی ئەم خوراوەندەوە بووە لە باکووری رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك و باکووری وولاتی میسوپوتامیادا بەگشتی. هەتا لە سەردەمانی ئیسلامیش دا کوردی ئەم ناوچە بیروزانەو بنەچەیان و هەرێمەکەشیان و خۆیان بۆ خالدی کوری وەلید گەڕاندۆتەوە، ئەمەش لەبەر نێزیکی ئەم دوو نێوەیە.

لە راستیدا ئەو خوداوەندە رۆڵێکی دیاریکراوی لە بنیاتنانی بیروباوەڕی چینی دەسەلات داری شانشینی ئورارتودا وەکو خوداوەندی جەنگ هەبووە، کەچی خوداوەندی (هوور) لەم شانشینەدا بەنێوی (شیڤینی) دەرکەوتوەو دروشمەکەشی هەر کەوانەکەی خۆر بووە بە هەردوو باڵەکانێوەو لەگەڵ هەمان چەمکی بلاوبووی ئەوسا، کە سەبارەت بەو خوداوەندەوە لەمەوبەر هەیبووە. بەڵام خوداوەندی سێیەمی دەوڵەتی ئورارتو، خوداوەندی رەشەبای شاخ وکێوان بوو و نێویشی (تیشیب) بووە، کە هەمان نێوی

تیشوب خودای مەزنی
هیتییان و هورییان



کەوتە ژێر کاریگەری تەواوی ئەوانەوە، بەم جۆرە رەگەزی هووری دەسەلاتدارێتی بەسەر باکووری عیراق و سوریاو جەزیرەدا[illegible] پەیداکرد، بەڵام ئەوانە بە نێوی (هوور)ەوە، وەیا (خوور)وە هیچ رۆڵێکی رامیاریان نەنواندووە، بەڵکو نێوی ماتێنی لایەنە راما[illegible] شانشی هوورییانی (تیشوب)ی هیتی و هوورییان بووە. هەروەکو لە پەیکەرەکەیەوە دیارە، خێزانی ئەم خوداوەندە (هیبا) جۆرە (خوداوەندیکی دایك) بووەو لە هەمان کات دا خوداوەندی نیشتمانی هوورییان بووە، بناخەو بنچینەی ئایینی و زمانەوانی هوورییان ئەوە پێشان دەدات، کەوا گەلێکی چیایی بووبن و شانشینی خۆیان لە دۆڵانی هەرەسەرووی سەرچاوەکانی رووبارانی دیجلەو فورات دا لە سەردەمی ئەکەدیدا دامەزراندووە، هێندێك نێوی کەسی تاك تاك کە لە نێو راپۆرتی ئابووریدا دۆزراوەتەوەو بۆ سەردەمی فەرمانرەوایی زنجیرەی بنەماڵەی ئوری سێیەم دەگەڕێتەوە، ئەوە روون دەکاتەوە کەوا هوورییان لە وولاتی سومەردا کۆمەڵەی بچووکیان لە کۆچەران پێك هێناوە. دکتۆر جورج رۆ ئەم دیاردەیە بەم جۆرە باس دەکات و دەڵێت: «لە چارەکی یەکەمی هەزارەی دووی پێش زایین دا لە (هلال الخصیب// عیراق و سوریاو لوبنان)دا هاتن و چوون و پەیدابوونی هووریان بەرەو زیادبوون دەرۆیشت لە هێندێك ناوچەی تایبەتیدا بۆ ئەوەی هێمنانە دەستی بەسەردا بگرن، تا وایان لێهات رێژەییکی هەرە زۆری شاری (ئالالاخ)ی سووری نێوان حەلەب و ئەنتاکیە لە (1800) پ.ز پێك بهێنن، هەروا نێوو تێکستی ئاینیش لە ئەرشیفی (ماری)و (شاربازێر)دا دۆزراونەتەوە، بە سەدەییك لە دوای ئەم سەردەمە هوورییەکان بەتەواوی باکووری عیراقیان داگیرکردو، و شاری (گاسور)ی نێزیك کەرکووکیان زەوت کردو نێوەکەشیان گۆڕیوە بۆ (نوزی)..

زمان و خوورەوشتی (دانیشتوانی پێشوویان کە سامی بوون وەرگرت و بەم پێیە بوونێکی بووژاوەیان بۆ خۆیان پێکەوەنا، هەروا (تەپە گەورە)و گردی بەلای (نێزیك موسل)یش

داپۆشیبوو، لەبەر ئەوەی میتانیان خوداوەندیانی هووریان پەرستوەو کە فەرمانرەوایەتی کۆمەڵگەی هووریان چ لە رووی ئایین و چ لەرووی رامیاریەوە بێت وەرگرتووە، ئاڵۆزێکی بەرادەیەك دروست کردووە کە دەربارەی ئەمە ئەنتوان مورتگات بڵێت: «هەرگیز ئەوە روون نەبۆتەوە، کە چۆن جیاوازی چەمکی (پاشای هووری) لە چەمکی (پاشای دەوڵەتی میتانی)دا دەکرێت»[48] لە کاتێك دا کە لە رووی ئایین و باوەڕەوە هووری بووەو لە رووی یاساوە میتانی، بۆ ئەوەی ئەم دیاردە رامیاریەی نیوەڕاستی سەدەی هەزارەی دووەمی پێش زایین و کاریگەرێتی لە گۆڕینی زمانەوانیدا روون بکرێتەوە کە بە قۆناغی یەکەمی سەرهەڵدانی رەگی زمانی کوردی دەژمێردرێت، پێویستە باسی میتانیان و بوونی رامیاریان و رۆڵیان لە کەڵچەری رۆژهەڵاتی نیوەڕاست و نیزێك دا روون بکرێتەوە لەو قۆناخەی، کە دەکەوێتە پێش کۆچ کاریە مەزنەکانی دووەمی هۆزانی هیندو ئەوروپیەوە، ئەمەش پێویستی بە لێکۆڵینەوەیێکی سەربەخۆ هەیە، ئومێدەوارم لە ژمارەی داهاتووی ئەم گۆڤاردا بتوانم بڵاوی بکەمەوە.

## سەرچاوەو تێبینیەکان

1 ـ هۆزەکانی (هیندو ئاوروپایی) لە سەرەتادا لە وولاتی ئۆکرانیاوە تا سەرووی ئەلمانیای ئێستا بنکەی ژیانیان (ژینگەیان) دانابوو. بڕوانە:

Charles Burney: David Marshall Lang., The People Of The Hills. London 1971, P. 86, 87.

لە ڕاستیدا زاراوەی (هیندو ئاوروپایی) بەو خێزانە زمانەوانیە فروانە دەگوترێت، کە چەند میللەتانی جیهان دوور لەیەك، (وەك ئەمەریکا) لە هیندستان، پێی دەدوێن. هەموو زمانە ئاوروپیەکان (بێجگە لە باسکی ئەسپانیاو فینلەندیو هونگاری)و زمانەکانی ئەرمەن و کوردو فارس و ئەفغان و تاجیك و ژمارەیێکی زۆر لە شێوەکانی هیندی لە کەرتی ئاسیادا لەم خێزانە زمانەوانیە دەژمێردرێت. لە سەردەمە کۆنەکانیشدا زمانی هیثیو سانسکرتیو گریکیو لاتینیو میتانیو چەند زمانێکی تر دەکەونە بەر ئەم خێزانە زمانەوانیە. پەیوەندی لەنێوان ئەم زمانانەدا چ لەلایەن ووشەوەو چ رێزمانەوە زۆر ئاشکرایەو لەم ڕاستیەدا وا دەردەکەوێت، کە لە بنەرەتدا هەموو ئەم زمانانە سەر بە زمانێکی گشتی هیندوئاوروپی بوون، کە پاشماوەیێکی نووسراوی بەجێ نەهێشتوە (بۆ ئەم بابەتە بڕوانە:

G. V. Childe., «The Aryans», London 1926.

C. S. Coon., Races of Europe, New York 1939.

ئەو زمانانەی ئەمرۆ، کە لەم زمانە گشتیە جیابۆنەتەوە، لە کاتی بەراووردکردنی واژەکانیاندا، وا دەردەکەوێت، کە ژیانی ئەو میللەتە هیندیئاوروپیە کۆنانە بەکۆچەرایەتی بە تایبەتی بە بەخێوکردنی ئەسپەوە بەسەرچووەو هەندێکیشیان خەریکی کشتوکاڵ بوون. ئەمە بێجگە لەوەی کە خەریکی پیشەسازیەکی سەرەتایی بوون و، هەموویان وەکو خێزان و تیرەو خێڵ لەژێر سێبەری پەرستنی چەند خودایێکی تایبەتیدا رێکخراوبوون و، بەپێی دابەش کردنی ناوچە زمانەوانیەکان لە چەرخە مێژوییە سەرەتاییکانداوا دەر دەکەوێت، کە نیشتەجێی بنەرەتیی ئەم میللەتانە پێش بڵاو بوونەوەیان بەجیهاندا نێوان زەریای بەلتیك و زەریای رەش بووەو ئەو دەشتە فراوانەکە کەوتۆتە خوارووی روسیای ئەمرۆوە).

کۆچ کردنی خێڵەکانی هیندوئاورپایی بەچەند شێوەی جیاجیا لە یەکتر بووەو لە چەند کاتێکی جیاوازدا رویداوەو دەتوانرێت بوترێت، کە لە کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زایین دا دەستی پێ کردوە.

(بڕوانە Georges Roux., Ancient Iraq L. 1964 P. 203, 205)

هەروەها بڕوانە وەرگێراوی ئەم کتێبە:

(جورج رو، العراق القديم بغداد 1984. ص 307،

308 له زۆربەی زۆری ناوچەکانی ئاوروپاو له هیندستان و سەرووی میزوپوتامیاو ئاسیای بچوکدا ئەم کۆمەڵە زمانانە بوونەتە زمانی چینی دەستەڵاتدارانی ئەو ناوچانە هەر لە سەرەتای هەزارەی دووهەمەوە، پاشان پەلیان هاویشتۆتە بۆ شوێنانیتر وەکو کەرتەی ئەمەریکاو ئوسترالیاو ئەفریقیا.

ئەم کۆمەڵە زمانە هیندو ئاوروپاییانە بەم دە لقە زمانەی خوارەوە بە گشتی دابەش دەکرێت (بە پێی بیروباوەری ئینسوکلوپیدیای بەریتانی):

1 ـ زمانە (ئەنەدۆڵ)یەکان لە هەزارەی دووەمی پ.ز وەکو هیثی، پالایی، لووی.. هتد.

2 ـ هیندو ئیرانی: ئاڤێستایی، فارسی کون، سانسکریتی، پالی، زمانەکانی پاکستان و هیندستانی ئەمرۆ..

3 ـ گریکی (یونانی).

4 ـ ئیتالی: وەکو ئوسکانی، ئومبری، لاتینی، زمانە رۆمانە نوێکان کە لە لاتینییەوە سەریان هەڵداوە وەکو فرەنسی، ئیسپانیو ئیتالیو پورتوگالی و رومانی.

5 ـ زمانە جەرمانییەکان: وەکو ئیسکەندەنافی (دانیمارکی، سویدی، نەرویگی، ئایسلاندیو فەیروسی)و ئەلمانیو هولەندی (نیدەرلاندیو فلاماندیو زمانی بوێرەکان لە خوارووی ئەفریقیادا) هەروەها فریزیو ئینگلیزیو زمانی گۆثی.

6 ـ ئەرمەنی.

7 ـ توخاری (پاشماوەی چەند دەقێکە لە تورفانی ناوەراستی ئاسیادا دۆزراوەتەوە دەگەرینەوە نیوەی دووهەمی هەزارەی یەکەمی پ. ز).

8 ـ کەلتی: وەکو ئێرلەندی، وێلش، سکوتلاندی، گایل، مانکس و گالی.

9 ـ بەڵتیکو ـ سلاڤی: وەکو لیثوانی، لاتی، سلاڤییەکان وەکو روسی، پولونی، چیکی، سلوڤاکیو سربیو خەرواتیو بولگاری.

10 ـ ئەلبانی.

بۆ ئاگاداریی فراوانتر سەبارەت بەم بابەتە بروانە ووشەی (هیندو ئاورووپیو هیندوئاری.. هتد) لە:

ئینسوکلوپیدیای بەریتانی.

2 ـ میکینی یا میکینای مەلبەندی شارستانیەتییەکی ناوداری گەورەیە کە لە سەردەمێکی کۆندا لەو ناوچانەدا بووە، کە بە جیهانی یونان لە مێژوودا بەناوبانگە. ئەم شارستانیەتییە لە (1600 پ.ز)ەوە دەستیپێکردوە کە دەکەوێتە بەر سێهەم چەرخی شارستانیەکیتر، هەر لە هەمان جیهاندا کە بە (مینەوی)ە یا ئیجی یا کریتی) ناسراوەو لە ساڵی (1100پ.ز) ئەو شارستانیەتییە کزبووە، واتە سەد ساڵ پاش کزبوونی شارستانیەتی مینەوی.

ئەم شارستانیەتییە بەنێوی شاری میکینی، کە کەوتبۆوە بەشی ژووروی رۆژهەلاتی دوورگەی (پلوپونیز)ەوە، ناو بانگی دەرکردبوو، پاشان بوەتە پایتەختی (ئاگامیمنون) سەرۆکی گشتی هێزەکانی یونان بەسەر تروبادا (طروادة).

سەبارەت بە ئەم بابەتە بەگشتی بروانە:

ئینسوکلوپیدیای بەریتانی، بابەتی Mycenae

هەروەها بروانە: دوکتور لطفی عبدالوهاب یحیی، الیونان ـ مقدمة في التأريخ الحضاري. بيروت 1979. ص 82 وما بعدها.

3 ـ بروانە آ. پێتری. مدخل الى تأريخ الاغريق وأدبهم وآثارهم. بغداد 1977 ص 9. ترجمة الدكتور يوئيل يوسف عزيز.

4 ـ بروانە هەمان سەرچاوە.

5 ـ ئینسوکلوپیدیای بەریتانی، بابەتی achaeans

6 ـ د. عبداللطيف أحمد علي، التأريخ اليوناني (العصر الهلادي)، الجزء الاول، بيروت 1976 ص 8. هەروەها بروانە ئینسوکلوپیدای بەریتانی، بابەتی Iones

7 ـ آ. پیتری، ص 9 ومابعدها.

8 ـ ئینسوکلوپیدیای بەریتانی، بابەتی Dorians

9 ـ جون گارستانج، امبراطورية الحيثيين. تأريخ العالم (القاهرة 1967) المجلد الثاني ص 29، الترجمة العربية.

هەروەها بروانە بابەتی (الأخيون في الوثائق الحثية) لە:

د. عبـداللطيف أحمـد على، التأريـخ اليـونـانى (العصـر الهلادى 2)، بيروت 1974. ص 807 ـ 824.

10 ـ د. عبـداللطيف أحمـد على، التأريـخ اليـونانى (العصر الهلادى 1)، بيروت 1976. ص 86 ـ 87.

11 ـ الدكتور أنطون مورتگات، تأريخ الشرق الأدنى القديم. دمشق 1967، ص 176 الترجمة العربية (وەرگێراوی عەرەبی).

12 ـ بروانـە سەرچـاوەی رابـوردوو. ل 216 وبـە شێـوەیێکی فراوانتر بروانە:

Charles Burney: David Marshall Lang., The Peoples Of The Hills. London 1971. P. 47, 88.

دەربارەی هاتنەوەی هیتی یەکان بە ڕێی بەلکان دا سەیرێکی ئینسوکلوپیدیای بەریتانی بکە، (هیتی)، هەروەها ئەم بابەتە لە ئینسوکلوپیدیای مێژوویی سوڤییتی دەبینیت.

13 ـ بروانە ئینسوکلوپیدیای مێژوویی سوڤییتی. بابەتی هیتی یەکان.

14 ـ بۆ ئاگـاداریێکی پتـر دەربـارەی پێشکـەوتنی سیـاسی و ئالوگۆری شارستانیەتی و کولتورو بابەتی ئایینی لە دەولەتی هیتی یەکاندا.

بروانە: د. انطون مورتگات، هەمان سەرچاوە، هەروەها بروانە:

ف. ی. أڤـدييف، تأريـخ الشـرق القديم. موسكو 1970 بەتایبەتی لاپەرەکانی 261 ـ 289 بە زمانی روسی.

15 ـ ئینسوکلوپیدیای مێژوویی سوڤییتی، بابەتی هیتی یەکان.

16 ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

17 ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

18 ـ بازرگانە ئاشوری یەکان لە کۆتایی هەزارەی سێی پ. ز هەنـدێ هەوالـی ئەو هیـتـی یـانـە، کە لە کەپـەدۆکـیـادا نیشتەجێبوون، بە ئێمە گەیاندوە. بۆ ئەمە سەیرێکی ئەڤدییف، هەمـان سەرچـاوەی پێشـو، ل ـ 267 بکـە. لە لایـەکی تـرەوە ئەبایێف دەلێت کەوا: «خێلەکانی هیندو ئاوروپایی لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین دا لە یەکتری جیا بوونەتەوە (بێگومان لە نیـوەی دووهـەمیـدا). یونـان و هیتی و ئەرمـەنـە کۆنـەکان بەرێی بەلکـانـا گەیشتـوونـەتـە ئاسیـای بچـوك. بۆ ئەم دیاردەیە بروانە وتارەکەی ئەڤدییف بە ناونیشانی:

(دەربـارەی مەڵبـەندی یەکەمی کۆچی میللەتانی هیندوئیرانی کۆن) رۆژهەلات و جیهانی کۆن. موسکو، 1972. ل 36.

ئەم کتێبە بە بۆنەی ماتەمی ئەڤدییف لە چاپ دراوە.

19 ـ ف. ی. ئەڤدییف، سەرچاوەی رابووردو. ل 269.

20 ـ ئینسوکلوپیدیای مێژوویی سوڤییتی. بابەتی هیتی یەکان.

21 ـ ئینسوکلوپیدیای بەریتانی.. بابەتی هیتی یەکان.

22 ـ بروانە هەردوو سەرچاوەی پێشوو. موسیلی یەکەم پاشای هیتی یـەکـان لە کاتی گەرانـەوەیـدا لە بابلەوە بۆ ئاسیـای بچـوك پەلاماریکی وولاتی هووریەکانی، دا. بروانە:

چارلس بورنی، داڤید مارشال لانگ. هەمان سەرچاوی رابووردوو.

23 ـ بۆ جیاوازی نێوان ئەرزاوەو ئەرزن بروانە؛

د. جمال رشيد أحمد، دراسات كردية في بلاد سوبارتو. بغـداد 1984. ص 42 هەروەهـا هەوالی ئەم وولاتـە لە دەقـە هیتی یەکان دا ببینە.

ئەرزاوە چەند ناوچەیێکی یەکگرتوو بووەو لە سەرەتای سەدەی چواردەهەمی پێش زایین دا ئەم یەکگرتەیە بوو بە دەولەتێکی بە هێـزو پاشـاکـانیـان لەگـەل فیـرعـەونەکانی میسر نامەیان ئالوگۆر دەکـرد. پاشـان ئەم ناوچـانـە فراوانتـر بوون کە بووە بە هۆی پەلامارداني (شوپیلولیوما)ی هیتی بە سەر وولاتی (ئەرزاوە)و بوو بە ناوچەیێکی هیتی. ئەم وولاتە هاوسێی وولاتی (ئەهیاوا) بووە کە کەوتبـوە خواروی رۆژئـاوای ئاسیـای بچـوك. بروانـە د. عبداللطيف أحمد علي، التأريخ اليوناني (العصر الهلادي 2) بيروت 1974. ص 813، 814.

24 ـ ئینسوکلوپیدیای بەریتانی. بابەتی هیتی.

25 ـ ئینسوکلوپیدیای مێژوویی سوڤییتی. بابەتی هیتی.

26 ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

27 ـ ئینسوکلوپیدیای بەریتانی بابەتی هیتی.

28 ـ بروانە: Georges Roux., Ancient Iraq P. 20g

وەرگێـرانی عەرەبی ئەم کتێبـە بروانـە: جورج رو، العـراق القديم. ص 315.

29 ـ ئینسۆکلوپیدیای بەریتانی. بابەتی هووریەکان.

30 ـ ل 316. جورج رو، هەمان سەرچاوەی رابوردوو لە لایەکی ترەوە، تل العمارنة شوێنێکی مێژوویی کۆنی پایتەختی ئامونحوتبی چوارەم (ئەخناتون)ە کە لە ساڵی شەشەمی حوکمرانی‌یەکەیا دروستی کرد.

ئێمرۆ کەوتۆتە پارێزگای (المنيا ـ ناحیەی ملوی) لەسەر قەراخی رۆژهەڵاتی رووباری نیل. لەم پایتەختەدا هەموو دێکومینتەکان و نامەکانی فیرعەونەکان و ئەوانەی کە بۆیان هاتووە یان ناردوویانن بۆ پادشا بێگانەکان پارێزراون ناوی کۆنی ئەم شارە (ئەخت ئاتون) واتە ئاسۆی ئاتون (خودای هەتاو) بووە. ئەم خودایە لە سەردەمی ئامونحوتبی چوارەم دا (ناوی خۆیشی کردوە بە ئاخن ئاتون) بووە بە خودای مەزنی وولاتی میسر ساڵی (1370 پ.ز)و پەرستنی خوداکانی‌تر بەرهەڵستی کراوە. پاشماوەی ئەم شارە، کە کەتبۆوە خوارووی دێلتای میسرەوە بە 160 میل، یان 300میل لە سەرووی تیبە واتە 300 کیلۆمەتر خوارووی قاهیرەی ئەمرۆ وەساڵی 1888ز دۆزاوەتەوە.

W. Geiger., Ostiranis che Kultur in Altrtum. Erlangen 1882,. P. 29

بروانە دیسان: د. جمال رشيد أحمد، دراسات كردية في بلاد سوبارتو. بغداد 1984. ص 29.

32 ـ بروانە د. جمال رشيد أحمد، هەمان سەرچاوە. ل 13، 56

هەروەها بروانە: E. Herzfeld., The Persian Empire. Wiesbaden 1968,. P. 165

یەکەم جار نێوە هووریەکان بە شێوەیێکی گشتی لە سجلەکانی هەزارەی سێ پ.ز لە وولاتی میزوپوتامیادا بەرچاو دەکەوێت، تیانادا دیارە کە مەبەست بە زمانی دانشتووەکانی رۆژهەڵاتی دیجلەو چیاکانی زاگرۆسە. بروانە ئینسوکلوپیدیای بەریتانی بابەتی هووری.

33 ـ بروانە کتێبەکەی هرتسفیلد، هەمان سەرچاوە. ل 158

34 ـ ئینسوکلوپیدیای بەریتانی، بابەتی هووری.

35 ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو. هەندێ کەس لەو بیروباوەرەدان، کە زمانی ئەرارتو پەیوەندییکی بە هوور یەوە هەیە. بروانە ئینسوکلوپیدای ئەمەریکی. بەندی دووهەم، بابەتی (ئەرمینیا).

جورج رو دەڵێت: هیچ پەیوەندیێك لە نیوان زمانی هووری‌و هیندو ئاوروپایی‌دا نیە هەروەها لەگەڵ زمانە سامیەکانیشدا، بەڵکو یەکێکە لە کۆمەڵە زمانێکی نەزانراو کە بە (زمانە ئاسیەوی‌یەکان) ناسراون و نزیکترین زمان لێ‌یەوە زمانی ئورارتوە کە لە هەزارەی یەکەمی پ. ز دا زمانی رەسمی دەوڵەتی ئورارتو بووە.

جورج رو، هەمان سەرچاو ل 317 لە عەرەبی‌یەکەیدا، ل 211 لە چاپە ئینگلیزیەکەیدا.

36 ـ ئەڤدییف ف. ی سەرچاوەی پێشوو. ل 43 بە روسی.

37 ـ ئینسوکلوپیدیای ئیسلامی، بابەتی ئەرمینیا.

38 ـ ئینسوکلوپیدیای مێژوویی سوڤییتی، بابەتی خالدی.

39 ـ ئینسوکلوپیدیای ئەمەریکی، بەندی دووهەم. ل 266 بابەتی ئەرمینیا.

40 ـ ئینسوکلوپیدیای مێژوویی سوڤییتی، بابەتی خالدی.

41 ـ ئەڤدییف، هەمان سەرچاوە. ل 396.

42 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو. 397.

43 ـ هەمان سەرچاوە.

44 ـ د. جمال رشيد احمد هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل 27

مەبەستی هیرودوت لە وولاتی ماتیێنی بەشێکی زۆری وولاتی کوردەواری ئەمرۆ بووە، و دەڵێت، کە وولاتی (کیسی) واتە کاشیەکان، پاش ئەم وولاتە دێت (مەبەستیشی لورستان و دۆڵەکانی رووباری سیروان و دیالی)یە. بروانە:

هیرودوت، مێژوو، پێنجەمین کتیب، بەشی 49 بە زمانی روسی‌و ئینگلیزی، هەروەها سەیرێکی دیاکونوف، مێژووی میدیا، ل 338 بە روسی بکە.

45 ـ هیرودوت، کتیبی سێهەم، بەشی 89 ـ 94.

46 ـ ئەڤدییف، هەمان سەرچاوە. ل 419.

47 ـ جوزج رۆ، هەمان سەرچاوە. ل 317، 318 لە چاپی عەربی‌و 211، 212 لە چاپی ئینگلیزی.

48 ـ ئەنطون مورتگات هەمان سەرچاوە. ل 204.

# کورد و

# شەڕەکەی نێوان ڕووسیاو تورکیا لە ساڵی ١٨٧٧ - ١٨٧٨ دا


نووسینی خەلیل جاسم

وەرگێرانی: د. کاوس قەفتان


لە سەدەی نۆزدەهەمدا، ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کە لەژێر سایەو دەسەڵاتی خۆیدا گەلێك میللەتانی ئەورووپاو ئاسیای یەك خستبوو، تووشی تەنگەو چەڵەمەیێکی سیاسی و ئابووری قورس و گران بوو. دەمێك بوو هێزو توانای جەنگی ئیمپراتۆرییەتەکە پەکی کەوتبوو. ڕاپەڕینە ڕزگاری خوازەکانی میللەتە زۆر لێکراوەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئیمپراتۆرییەتەکە نیشانەی ئەوە بوون ئیمپراتۆرییەتەکە زۆر نابات بەلادا دێت و دەڕو خێت.

هەوڵ و کۆششی سوڵتان، بۆ ئەوەی لەڕێی ئیسلاحاتەوە، ئامانجە میرییەکان بێتەدی، سەری نەگرت، میللەتەکانی بەڵکان پاش هەموو شەڕو بەیەکاچوونێکی ڕووسیاو تورکیا خەباتیان بەتین تر دەرکردو مافەکانیان هێندەیتر دەچەسپاند.

دەوڵەتە گەورەو مەزنەکانی ئەورووپا، سوودیان لە لاوازی دۆخی ئابووریو جەنگیو سیاسی ئەستامبوڵ دەدیو هێندەیتر دەستیان دەخستە کاروباری ناوەوەی دەوڵەتی عوسمانیو هەوڵیان دەدا بەرژەوەندییە کۆلۆنیالییەکانیان بە چارەنووسی میللەتەکانی دەوڵەتی عوسمانییەوە ببەستن، ئەو میللەتانەی لە پێناوی سەرفرازی خۆیاندا تێئەکۆشان. کێشەی «میراتەکەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی» پەیوەندی بە بەرژەوەندی گەلێك لە دەوڵەتە ئەورووپاییەکانەوە هەبوو.

لە ئەنجامی سەرکەوتنی میسرییەکان لە ساڵانی (20 - 30)ی، سەدەی نۆزدەهەمدا دەسەڵاتی سوڵتان و هەیبەتەکەی بەسەر میللەتانی عەرەب و کوردو ئەرمەندا تەواو کزبوو. هەر بۆ نموونە ئەو دەسەڵاتە لە کوردستاندا سەرزاریو ڕواڵەت بوو. لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بنەماڵە سەردارەکانی ڕەواندوزو بۆتان و بدلیس و هیتر بەڕێوەبەرایەتیو سەردارێتی ڕاستەقینەیان بەدەستەوە بوو. ئارەزووی حەز بە جیابوونەوەی ئەم سەردارانە بە تایبەتی ئەوانەی لە ناوچەکانی سەر سنوور بوون خەوو خۆراکیان لە ئەستامبوڵ بڕیبوو سوپایێکی گەورەی هێزەکانی تورك بە فەرماندەی ڕەشید پاشا، پاراستنی ئاسایش لەم ناوچەدا (نارەحەتانە) پێسپێردرابوو. بەڵام کوردو ئەرمەنەکان بەتوندی بەرهەڵستی هێزەکانی عوسمانییان دەکرد.

ئەو هەستی ناحەزیو تووڕەییەی لەناو کوردەکاندا دوای کردەوە خوێناوییەکانی ڕەشید پاشا دژی تورك تەشەنەی کردوو، دوایی لە ڕۆژانی شەڕەکەی قرمدا لە ڕاپەڕینێکی وەها توندو بێژدا لە کوردستان تەقییەوە، بووە هەڕەشەیێکی ڕاستەقینە بۆ ئەستامبوڵ. ئینگلیزە هاوپەیمانەکانی تورك لە شەڕەکەی قرمدا دەورێکی کەمیان لە کوژاندنەوەی ئەو ڕاپەڕینەدا نەبوو.

ئەم شەڕە هێندەیتر عوسمانیەکانی لاواز کردوو و ناچاری کرد لە دووارۆژدا زیاتر بکەوێتەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتە ئەورووپاییەکانەوە. ئەو دەوڵەتانە دەستیان دەخستە کاروباری ناوەوەی وڵات و دەستیان بە تەواوەتی بەسەر دۆخی ئابووریو دارایی وڵاتەکەدا گرتبوو. وڵاتەکە کەوتبووە گێژاوی

-بـوونتييـه‌وه، خه‌زێنـه‌ش به‌تـاڵ بوو، له ئه‌نجامی کرده‌وه‌ی
حه‌نگی، گه‌لێـك له زه‌وی‌و زاره‌کـان که‌ڵکی چانـدن و کێڵانیان
یـوه نه‌مـابـوو. دۆخی ئابـووری چه‌ند هه‌رێمێکی گرنگه سه‌ره‌و
ـگووم بووبوو، دانیشتووه‌کان سـه‌ری خۆیان هه‌ڵ ده‌گرت و ئه‌و
-وچـانـه‌یـان به‌جێ‌ده‌هێشت. دزی‌و جه‌رده‌یی‌و رووت کردنـه‌وه
بەره‌ی سه‌ندبوو، له دۆخێکی وه‌هادا، سوڵتان له ساڵی 1856دا
فه‌رمانێکی سوڵتانی ده‌رکرد. ئه‌وه‌ی به ناوی (خه‌تی هه‌مه‌یۆنی)
-وبانگی ده‌رکرد.

(خه‌تی هه‌مه‌یۆنی) ئامانجه‌کانی میلله‌تی نه‌هێنایه‌دی. به‌ڵکو
ـه‌پێچـه‌وانـه‌وه وولاتـه‌کـه‌ی هێنـده‌ی‌تـر خسـتـه ژێـر ده‌سـه‌ڵاتی
سـه‌رمـایـه‌دارێتی بێگـانه‌وه. ئه‌مانه هه‌موویان بوونه هۆی ته‌شه‌نه
کردنی نارەزایی دانیشتووان بە تایبه‌تی له‌و شوێنانه‌ی مه‌یانی شه‌ڕ
-وون.

کورده دامـه‌زراوه‌کـان و ئه‌رمـه‌نـه‌کان، دووای ئه‌وه‌ی هیوایان
ـه‌وه بڕی که ده‌رفه‌تێك بدۆزنه‌وه‌و بتوانن به ئاسووده‌یی بژین.
-چار کران که‌ل وپه‌ل و ماڵ و موڵکیان به‌جێ‌هێشت و گه‌لێك له
هه‌ریمه‌کانیان چۆڵ کردو سه‌ری خۆیان هه‌ڵگرت و ئاواره بوون.
ـه ساڵی 1873دا سه‌رهه‌ڵگرتن و وولات به‌جێ‌هێشتن گه‌یشته
ـڕده‌یێکی ئه‌وتۆ هه‌تا گه‌لێك له کاربه‌ده‌ستانی تورکی ترساند.

سامـی پاشـای موشـیـری ئه‌رزروم بێ‌وه‌سـتـان داوای له
قایمقـامی (بـاسینـا) کرد (لـه‌وێ، له هه‌مـوو شوێنێکی‌تـر زیاتر
خه‌ڵکـه‌کـه که‌وتبـوونـه نیشتمـان به‌جێ‌هێشتن) خێـرا سه‌ر له‌و
گونـدانـه بدات و والـه دانیشتووه‌کانیان بکات مه‌زبه‌ته بنووسن و
ئه‌وه‌ی تیـدا ئاشکـرا بکـه‌ن که چاویـان له‌ژێر ده‌سته‌یی سوڵتانه‌و
هه‌رگیز حه‌ز ناکه‌ن ئه‌و «تورکیا جوان و به‌هه‌شته» به‌جێ‌بهێڵن.
ـه‌س زۆری نه‌برد قایمقامه‌که ناچار بوو به برووسکه‌یێك وه‌ڵامی
ـداتـه‌وه‌و دان به‌وه‌دا بنێ که ئه‌رمـه‌نـه‌کـانی باسینا رازی نه‌بوون
مه‌زبـه‌تـه‌کـه بنـووسن. پێویست بوو باج و سه‌رانه‌ی‌تر دابنرێن.
-ڕیاردرا به زۆر کورده نیوه کۆچه‌ره‌کان نیشته‌جێ بکرێن.

ئه‌م پرۆژه نوێیـه‌ی «دامـه‌زرانـدن»ه، دانیشتووه کورده‌کانی،
سنجـاقـه‌کـانی ئه‌رزروم و قارس و بایـه‌زیـدو وان و مووشی به
ته‌واوی وروژانـد. ئه‌و مه‌ترسییـه سه‌ره‌کییـه‌ی کورده‌کـانی له‌م
پرۆژه‌یه ده‌ترساند ئه‌وه‌بوو له‌ته‌ك باج و سه‌رانه‌دان به میری ده‌بوو
سه‌ربازیشی بده‌نێ.

عه‌شره‌ته کورده‌کان هه‌ر ئه‌وه‌یان بۆ مابۆوه، یان ده‌بێ ڕاست
ببنه‌وه یاخوو هیچ نه‌بێ روو بکه‌نه سنووره‌کانی ئێران و رووسیا،
ئه‌مه‌ش (واته رووکردنه رووسیا - وه‌رگێڕ). ئامانج و خواشتێك
بوو له مێژه‌وه له‌سه‌ری سه‌ره‌ك عه‌شره‌ته کورده‌کاندا بوون، چه‌ند
جارێك دیبلوماسییه رووسه‌کانیان لێ ئاگادار کردبوو و له‌ژێره‌وه
په‌نجه‌یان بۆ درێژ کردبوو.

سامی پاشـا که‌وتـه خۆ ئامـاده کردن به‌و نیـازه‌ی به‌یـارمـه‌تی
کاربـه‌ده‌ستـانی عوسمـانی به‌رهـه‌ڵستی کورده‌کان له‌ناو به‌رێت.
ئه‌م خۆ ئامـاده کردنـه‌ی موشیـر هێنـده‌ی‌تـر دانیشتـووه‌کـانی
وروروژانـد. «لێـره، هه‌ڕه‌شـه کۆ ده‌بێتـه‌وه هێـزو ده‌سه‌ڵاته‌که‌ی
عوسمانیه‌کانیش ده‌ره‌قه‌تی نایه‌ت» - ئوبیرمیلله‌ر له مارتی ساڵی
1873دا، بۆ (ن.پ. ئیگنـاتـۆف)ی کۆنسـوڵی رووسیـا له
ئه‌ستـامبـووڵ نووسی. ئه‌م بۆچـوونـه‌ی کۆنسـوڵـه‌کـه‌ی رووسیا
(ئوبیرمیلله‌ر کۆنسوڵی رووسیا بوو له ئه‌رزروم - وه‌رگێڕ) هه‌روا
به‌خۆڕایی نه‌بوو، چونکه عه‌شره‌ته کورده‌کان له‌ژێر باری باجی
قورس و گرانـدا له ناڵـینـدا بوون. له‌دووا چاره‌کـی سه‌ده‌ی
نۆزده‌هـه‌مـدا. خه‌زێنـه‌ی ده‌وڵـه‌ت، ته‌نیـا له کورده‌کانی قارس
هه‌موو ساڵێك (720) هه‌زار پیاسته‌ری کۆ ده‌کرده‌وه.

ئه‌وه‌ی دۆخه‌که‌ی هێنده‌ی‌تر ئاڵۆزتر ده‌کرد ئه‌وه‌بوو له‌م کاته‌دا،
هێزه‌کانی عوسمانی شه‌ڕی خۆیان له‌گه‌ڵ کوردو ئه‌رمه‌نی ناوچه
شاخاوییه‌کانی گاڤارو وان ته‌واو کردبوو و خۆیان بۆ په‌لاماردانی
عه‌شـره‌تـه نیـوه کۆچـه‌ره‌کـانـی باکـوور ئامـاده ده‌کـرد.
ئه‌و هێزه‌ی په‌لاماری بازووری ده‌داو به سه‌رۆکایه‌تی ئیسماعیل
پاشابوو (کوردێکی خه‌ڵکی قارس) بوو، یه‌کێك بوو له‌وانه‌ی تا
ناخی ئێسکی خۆی به سوڵتان فرۆشتبوو و به‌رامبه‌ر ئه‌وه‌که‌ی زۆر
دڵ ره‌قانه‌و به ئه‌وپه‌ڕی بێ به‌زه‌ییه‌وه ده‌جووڵایه‌وه»، کورده‌کانی
ناوچه‌کانی ئێگیلیاو ئه‌خجاکیندو بۆتان و جزیره‌و گه‌لێك ناوچه‌ی‌تر
که‌وتنه به‌رناگری رق و کینه‌ی.

دۆخـه په‌شـۆکـاو و ئاڵـۆزه‌کـه‌ی ناوچـه‌کـانی باکـووری -
رۆژهـه‌ڵاتی ئیمپـراتـۆرییه‌تی عوسمانی، له‌سه‌د پاشای سه‌دری

ئەعـزەمی ناچـارکـرد موشیـر سامی پاشا لە سەرداریتی ئەرزرۆم لابدات و موستەفا فوسفۆر لە جێگای دابنێت. ئەم موشیرە نوێیە دەریخست گەلێـك لە موشیـرەكـەی پێشـوو بێدەسـەلات و ترسنۆك ترە. بە واتەی ئەوانەی لە نزیكەوە ئاگاداری رووداوەكان بوون. ئەو بێدەسـەلاتییـەی فۆسفـۆر، ترسی ئەوەی پەیـداكـرد لابیرێت. دانانی بەریوەبەرو سەرداریکی نوێ نەیتوانی رق و کینەی دانیشتووە کوردەکان بەرامبەر بە زۆرداری عوسمانی بگۆرێت.

هەمـوو ئەو ناوچـانـەی کوردو ئەرمـەنـە دامەزراوەكان تیاباندا دەژیـان لە باکـوورو رۆژهـەلاتی بەشەكانی کیلیکیاو زەیتوونیو ناوچـەكـانی دراوسێیـان لە رق و ناحـەزی دژی دەسـەلاتی عوسمـانییـەکیـان دەگـرتەوە. لە ساڵی 1875دا، ئەرمەنەکانی زەیتوونی راپەرینەکەیان دەست پێکرد. ئەو راپەرینەی شەرەکەی نێـوان رووسیـاو تورکیـا هەڵـوێستـەكـەی دەست نیشـان کرد. عەشـرەتـە کوردەکـانی ئەلبیستـان و ئاچنیو چەنـد ناوچەیەکیتر دەستیان دایە چەك.

ئەوەی بووە مایـەی مەتـرسیو هەرەشـە بۆ ئەستـامبـوڵ، رووداوەكانی دەرسیم بوو. ئەو ناوچە شاخاوییەی دەکەوێتە نێوان رووباری کاراس (کە دەرژێتە فوراتەوە)و فورات چایەوە.

کوردەکـانی دەرسیم لەگـەڵ ئەرمـەنـەکانا تا ساڵانی حەفتای سەدەی نۆزدە هەمیش چالاکـانـە بەرەنگـاریی دام و دەستگـەی عوسمانیان دەكردوو بەتەواوەتی سەربەستی خۆیان پاراستبوو.

لە ساڵانی 50 ـ 60دا کاربەدەستانی عوسمانی وایان دەزانی کە لە رێی بەکارهێنانی چەك و سوپاوەو تۆخ کردنی پەلاماردانی ناوجەرگەی ناوچە شاخاوییەکان دەگەنە ئەنجام و **بەئاسانی** سەر بە ناوچـە سەختـەكـانی دەرسیم شۆڕ دەكـەن، بەڵام کە دییـان ئەوەیان بۆ نایەتە دی، ئەوسا کەوتنە بەکارهێنانی سیاسەتی «تێلاو شیـرینی». (واتـە بە دەستێـك تێـلا بکێشـە بە دوژمنـەکەتداو بە دەستـەکـەی تریش دەمی شیـرین بکـە ـ وەرگێـر). سوودیان لە دوژمنایەتیو ناحەزی سەرۆکە کوردەکان بەرامبەر یەکتری بینیو لە رێی دیاری بەخشین و دەم چەوورکردن و پەیمان و بەڵێن دان توانییـان چەنـد بەگێکی کورد بەلای خۆیـانـدا رابکێشن. ئەم سیـاسـەتی دوو بەرەکی نانـەوە. کە کاربـەدەستـانی عوسمـانی تۆوەکەیان چاند بەری خۆیدا.

نامـەکـەی کۆنسـوڵی رووسیـا لە ئەرزرۆم کە بۆ کۆنسـوڵی رووسیـای لە ئەستـامبـوول نارد، باشتـرین نموونەیە. کونسۆلی ئەرزرۆم لەو نامەیەیدا دەنووسێت: «کە سامی پاشای موشیری ئەرزرۆم توانی کوردەکانی ئەوێ بکات بە دوو دەستەی ناحەز بە یەك و یەكێـك لەو دەستـانـە بكـاُت بە پیـاوی میریو هەمیشە چاویـان لە یارمـەتیو پشتگیـریو دیـاریو چاودێـری میـرییـەوە بێت». ئەو بەگـە کرِاوانـە دەبـوو سەرانـە بە میـری بدەن و سەربازیش بۆ سوپاکەی بنێرن.

دەرسیم ناوچەیێکی شاخاوی سەخت بوو و رێگاوبانی هاتوو چۆکـردنی واتـە هی سوپـایی ـ وەرگێـر تێـدانـەبـوو و سوپاکانی عوسمانی پێیان نەدەکرا بە ئاسانی بگەنە ئەوێ.

لەبەر ئەوە کاربەدەستانی عوسمانی زۆریان لە بەگە کوردەکان دەکـرد رێگـاو بان بکـەنـەوە. رێگـایێـك لە نێـوان دیـاربـەكـرو ئەرزنجـانـدا بکـەنـەوە، بە پلوموورو خۆزات و مالازگیرو پالوودا بڕوات. موشیـر سامی پاشـای زۆرزان، ئەوەی دڵنیـابـوو لەوەی کردنـەوەی ئەو رێگـاوبـابـانـە دەبێتە هۆی داگیرکردنی دەرسیم، یەكێك بوو لەوانەی بە گەرمیو لە دڵەوە هەوڵی دەدا ئەو پرۆژەیە سەربگرێت و بێتەدی.

سامی پاشا بەڵێنی بەو کوردانەی دەرسیم دا کە باجیان لەسەر بوو: «بـەرامبـەر ئەو باجـانـەی لەسـەریـان مابـوو لە رێگـاوبـان دروســت کردنــدا ئیش بکــەن و بەرامــبــەر بەوەش نان بە کرێکارەکانی دەرسیم بدات. (نیاز لە نان تەنیا نانی ووشکە ـ وەرگێـر)، بە فەرمـانی موشیـر بۆ دروست کردنی رێگـاکـە خێـرا هەشتاهەزار گوێنی ئامادەکرا (دەبێ نیازی لە ئاردبێت ـ وەرگێر) بەڵام هەتـا ئەمـەش فریـانی عوسمـانی نەکـەوت. ئەو بەگانەی دەستیـان دەخستـە دەستی ئەستـامبوولەوەو یارمەتیان دەدا ناویان دەزراو دەسـەلاتیـان بەسـەر کوردەکـانـدا نە دەمـا. بگرە گەلێك لەوانەی ئەو رێگاو سیاسەتەیان گرتەبەر وەك میللەت فرۆش سەیر دەکـران بە کوشتـن سزا دەدران. لە ساڵی 1875دا گیـولابی بەگی قایمقـامی دەرسیم لەلایـەن کوردە راپـەریوەکانەوە کوژرا.

«کوردەکانی دەرسیم خۆفرۆشتنی شیخەکەیان زۆر بەلاوە تاڵ و ناخۆش بوو و رازی نەبوون ریگاوبان دروست بکەن».

کونسوڵی رووسیا لە ئەرزرۆم ئەم هەواڵەی بەو جۆرە گەیاند:

ئاڵۆزبوونی پەیوەندی نێوان رووسیاو عوسمانی وەك چۆن کاری دەکردە سەر ئەرمینیا، وەهاش کاریکی زۆری دەکردە سەر دۆخی کوردستان.

لە سالی 1875وە ئەزمەیەکی سیاسی نوێ سەری لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دەرهینا. لە هەریمەکانی رۆژئاوای ئیمپراتۆرییەکەدا میللەتە سلاڤییەکان راست بوونەوە. جا لەبەر ئەوەی بەرژەوەندی رووسیاو نەمساو ـ مەجەرو بەریتانیاو دەولەتانی تر لەو هەریمانەدا تیکەڵ بە یەك دەبوون. دۆخەکە هێندەی تر ئالۆز دەبوو. لە سرب و شاخە رەشەکان. میللەت بەرەوپیری راپەرینەکەی گیرتسیگۆن و بۆسنەوە چوون و پشتگیریان کرد. بولگارەکانیش خێرا پالیان دا تەك راپەریوەکانەوە عوسمانیەکان هەولیان دەدا دەسەلاتیان بەسەر میللەتە سلاڤییەکاندا بهێڵنەوە. هەرچی دەولەتە گەورەکانە ئەوە هەریمەکەیان بۆ ئەوەی زووتر بگاتە گەرووەکانی دەریای رەش و دەست بەسەریانا بگرێت، لەسەر ئەوە لەناو خۆیاندا لە مشتومڕدا بوون. «کێشەی چارەنووس دووارۆژی دەسەلاتی عوسمانی لە ناوچە سلاڤییەکان و یۆنان و ئەلبانیا، هەروەها دەست بەسەرا گرتنی گەرووەکانی دەریای رەش» لەبەر دەمدا بوو.

لەم دۆخەدا، لەم تەنگە و چەلەمەیەدا، ئەستامبول هەولی‌دا راپەرینەکەی رۆژهەلاتی وولات لە بار بەرێت. لەوەش زیاتر هەولی‌دا هەستی عەشرەتە کوردەکان، بەتایبەتی سەرۆکەکانیان بەلای خۆیدا راکێشێت.

بۆ ئەم نیازەش بەلێن و دیاری‌و دەسیسە ئامادەکرا. سامی پاشای موشیری ئەرزرۆمی زۆزان و دونیادیدە، چالاکانە کەوتە ئەوەی لە کوردەکان هێزی «سوارەی» میری بۆ شەرو جەنگی دووارۆژ، بۆ ئەو جەنگەی چاوەروان دەکرا، ئامادە بکات. بەلام دەستکەوتی سامی پاشا لە لیواکانەوە هیچی وەها نەبوو. ئەوەبوو لە 29ی تشرینی یەکەمی سالی 1876دا برووسکەیێکی خێرای لە موتەسەریفی وان و مووشەوە وەرگرت ئەوەی تێدا هەتبوو، کە کوردەکان ئەو ژمارە سەربازانە نادەن کە ئێمە داواکرابوو، بگرە لە کوزیجان بەتوندی بەرهەلستی ئەو داخوازییەیان کرد، ئەوسا سامی پاشا فەرمانی‌دا بە بەکر بەگی خاتوون ئوگلی مووچەخۆر کە لە عەشرەتەکانی زیلانلی‌و کاسکانلی کورد، سەرباز بۆ سوپا بگرێت. ئەو عەشرەتانە بەلێنیان دا نزیکەی (1600) سەرباز کۆبکەنەوە.

بەلام لەوە دەچوو پەلەیان نەبێت. سامی پاشا کە ئارامی لێ‌برابوو لە سەرەتای کانوونی دووەمی سالی 1877دا ئیبراهیم پاشای کردە سەر عەشرەتەکان (ئەمەش یەکێك بوو لەو سەرۆکە کوردانەی خۆی بە ئەستامبوول فرۆشتبوو). بەلام کوردەکان بێ‌ئەوەی ئاور لە هەرەشەو گورەشەی ئیبراهیم پاشا بدەنەوە. رازی نەبوون سەرباز کۆبکەنەوەو بەنیازی گفتوگۆکردن نوێنەری خۆیان ناردە لای رووسەکان.

سامی پاشا بەتایبەتی چاوی برێبووە کوردەکانی دەرسیم، ئەوانەی بۆ کاربەدەستانی عوسمانی پاشکۆیێکی جێی برواو هیوا نەبوون. سامی پاشا حوسەین بەگی قایمقامی کوزیجانی بانگ کردە لای خۆی‌و داوای لێ‌کرد (دە) هەزار کورد کۆبکاتەوە. حوسەین بەگیش بەرامبەر بەمە داوای پارەو پوول و زێرو وولاخ و کەل وپەلیکی زۆری کرد. کوردەکانی ژێر سایەی حوسەین بەگ ئەم رێك کەوتنەیان بە دڵ نەبوو و نارەزایی خۆیان دەربری‌و ئامادەیی خۆیان پیشان دا نە سەربازو نە باج بەمیری نەدەن. «ئەگەر ئەم شەرە بۆ پاراستنی نیشتمان بێت، ئەوە پێویستیمان بە یارمەتی سولتان نییە. بەبێ یارمەتی ئە دەتوانین نیشتمانەکەمان بپارێزین». بانگی ئەمەیان دا.

شێخ سولەیمانی سەرداری دەرسیمی مەرکەزی، سوودی لە دۆخە شێواو ئالۆزەکەی رۆژهەلاتی نزیك دی‌و بریاری‌دا سەر بۆ کاربەدەستانی عوسمانی شۆر نەکات و دان بە دەسەلاتیاندا نەنێت. خاوەنی دووانزە هەزار چەکداری مەشق پێ‌کراو بوو، ئەو هێزە بەسەر پێنج مەلادا دابەش کرابوو. چەند بەگێکی دەسەلات داری کورد لە رێی پەیوەندی پەیداکردن لەگەل سەرکردە جەنگییە رووسەکاندا، هەولیان دا جێ پێی خۆیان

قایم بکەن. ئەوە بوو مەنسوور ئاغای قایمقامی خۆزاتا هەر کە بیستی هێزەکانی رووس لە ناوچەی ئەلیکساندەرە پۆل گرد دەبنەوە، یەکێك لە باوەڕپێکراوەکانی نارد بۆ لایان و پێشنیازی ئەوەی کرد کە ئەگەر رووسەکان روویان کردە ناوچە دراوسێیەکانی دەرسیم، ئەوا ئەم ئامادەیە خزمەتیان بکات.

پەیوەندیو هەستی کوردەکانی دەرسیم بەرامبەر شەڕەکەی رووسیاو عوسمانی، روون و ئاشکرا لەو نامەیەدا خۆی دەردەخات کە کوری یەکێك لە کوردە خاوەن دەسەڵاتەکان واتە مەحموود بەگی کوزان ئۆگلی پاش تەواوبوونی شەڕەکە بە دە ساڵ نووسراوە. لەو نامەیەدا کوزان ئۆگڵی داوا لە چاری رووسیا دەکات دەستی یارمەتی درێژ بکات و داوا لە ئەستامبوول بکات کەس و کارەکەی بەرەڵلا بکەن، ئەوانەی لە ئەنجامی ئەوەی چالاکانە لە رۆژانی شەڕەکەدا یارمەتی رووسیان داو لەلایەن عوسمانیەکانەوە گیران و پەرەوازە کران.

بەریتانیا ئاورێکی تەواوی لە خۆ ئامادە کردنە جەنگییەکەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دەدایەوە. سڵی لەوە دەکردەوە کارەساتەکەی ساڵانی شەڕەکەی قرم دووبارە ببێتەوە، کاتێك کوردەکان سەرۆکایەتی یەزدان شێر راپەرینێکیان دژی عوسمانیەکان بەرپا کرد. بەریتانیا ئامادەبوو هەموو رێی شوێنێك بگرێت و بەکاربهێنێ بەو نیازەی سامانەکانی کوردستان دژی رووسیا بەکاربهێنێ. لەبەر ئەوە بێ‌ووچان زۆری لە کاربەدەستانی عوسمانی دەکرد هەموو سەرۆکە کوردە بە دەسەڵاتەکان لەوێ دوور بخاتەوە.

(واتە لەسەر سنوورەکانی نزیك رووسیاوە - وەرگێر -). لە ساڵی 1873دا. ئوبەر میللەری کۆنسوڵی رووسیا لە ئەرزرۆم بەم بۆنەیەوە دەنووسێت: «لەم کێشەیەی ئێستەی کوردەکاندا. نەك عوسمانیەکان بەڵکو ئینگلیزەکان دەوری سەرەکیان هەیە. «ئینگلیزە هاورێیەکەم». (نیازی لە کۆنسۆڵی ئینگلیزە لە ئەرزرۆم کە بوویوو بە هاورێ - وەرگێر)، فەمانی پێ‌دراوە، هەوڵ بدات بەرهەڵستی کردنی کورد بە جۆرێك لەناو بەرێت راست بوونەوەی بۆ نەبێت. ئەمەی هەتا لەگەڵ خواستی عوسمانیەکان خۆیاندا ناگونجێت و ناکلێت».

کونسوڵی بەریتانیا لە ئەرزرۆم. لەسەر داخوازی ئیلیۆتی کۆنسوڵی بەریتانیا لە ئەستانبوول. گەشتێکی بە هەموو کوردستاندا کرد، بەو نیازەی زانیاری دەربارەی ئەو سەرۆکە کوردە بەدەسەڵاتانە کۆ بکاتەوە کە مایەی مەترسی بوون بۆ عوسمانی.

ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی سەرۆکە کوردەکان لە کوردستان دوور نجنەوە، هەوڵیان دەدا لە رێی دیاریو بەڵێنەوە بەلای خۆیاندا ژ یان بکێشن.

لە هەمان کاتیشدا بە هەموو جۆرێك کۆششیان دەکرد ئەرمەن و میللەتە گاورەکانی‌تر لە خواستی سەرفرازی بوون دوور بخەنەوە.

هەوڵ و تەقەللاکەی ئینگلیز سەری نەگرت، لە ئەستامبوول سەرومر دژی ئەو داخوازییەی بەریتانیا بوون سەرۆکە کوردەکان لە کوردستان دوور بخرێنەوە. بە رای کاربەدەستانی عوسمانی کردەوەیێکی وەها توندوتیژ و کاری‌گەر دەبووە بیانوو هاندەرێك ئەو دۆخەی خۆی لە خۆیدا لە باکووری رۆژهەلات و ناوچەکانی رۆژهەلاتی ئەنادۆڵدا ئاڵۆزو شێواو بوو، هێندەی‌تر بشێوێنێ‌و ئاڵۆزتری بکات.

سیاسەتی رووسیا لە رووی بەراوردکردندا، لە رۆژهەلاتی نزیکدا معتدل بوو. پاش شەڕەکەی قرم رووسیا هێشتا نەهاتبۆوە سەرخۆی، لەبەر ئەوە ئەی دەویست بە ئاشکرا دەستەویەخە لەگەڵ دەوڵەتە ئەورووپاییەکاندا بوەستێ.

یارمەتی‌و پشتگیری رووسیا بۆ بزووتنەوە رزگاری‌خوازەکەی میللەتانی بەلقان ناوەرۆکێکی مەعنەوی‌و سیاسی گەورەی بۆ میللەتانی رۆژهەلاتی نزیك هەبوو، لەتایبەتی بۆ ئەرمەن و کوردەکان کە لە پێناوی سەرمرازی نەتەوییدا تێ‌دەکۆشان.

هەست و پەیوەندی دۆستایەتی‌خوازی سەرۆکە کوردەکان بەرامبەر رووسیا لەو نامەیەدا دەرکەوێت کە موریس میلیکوف لە کانوونی یەکەمی ساڵی 1876دا بۆ جەنەراڵ مایۆر پاڤلۆڤی نووسی. لەو نامەیەدا دەنووسێت: «کوردە ناسراوەکان خزم و باوەڕپێکراوەکانی خۆیان ناردە لای لە ئەلیکساندەرە پۆل و ئاگاداریان کرد لەوەی هەمیشە وەك جاران ئامادەن خزمەتمان

بکەن، بگرە داوایان لیْکرد چ ئامۆژگارییەك هەیە بیانداتیْ».

لە هەمـــان کاتـدا سەرکـردە جەنگییـەکـانی رووس نرخێکی تەواویان بەبەشدار بوونی کوردیان لە شەردا داو نرخی کوردیان بەراسـتی بۆ عوسمـــانیـەکـــان کردوو هەڵســـەنگـــانـــد: «نـــە دانیشتـووەکـانی قەفقـاس و نە داغستـانییـە شاخـاوییـەکان وەك عەشـرەتـە کوردەکـانی ژێـردەستی عوسمـانی بۆ عومسمانیەکان گرنگ نەبوون».

سەرکردە جەنگییە رووسەکان لەو رایەدا بوون کە کوردەکان لەو شەڕەدا (ئـەوەی چاوەڕوانی داگیـرسـانـدنی دەکـرا ـ وەرگێر) دژی کاربـەدەستـانی عوسمانی راست دەبنەوە. ئەم بروایەشیان لەوەوە بۆ هاتبـــوو «چـونکـە کوردەکـان لە مێـژەوە رق لیْ بوونی داگیرکەرەکانیان بۆ مابۆوە».

بەڵام لە رووسیا ئەوەیان باش دەزانی کە حکوومەتی عوسمانی بە هەمـــوو جۆرێـــك هەوڵ دەدات کوردکـــان بەلای خۆیـــدا رابکێشێت، چونکـە یادی راپـەڕینـەکەی یەزدان شێر هێشتا لەبیر نەچووبۆوە. جەنەراڵ ئەدیوتانت ئیگناتۆف ئەمانەی لەیاد نەکرد. بۆیە لە کانوونی دووهەمی 1876دا بەخێرایی ئامۆژگاریی کرد پێـــویستـــە «ســەرکـردایـەتی قەفقـاس بیْ وەستـان هەوڵ بدات کوردەکـــان بکـــەن بە دۆستی خۆیـــان و لەژێـــرەوە پەیـــوەنـدی لەگەڵیاندا بۆ شەڕی دووارۆژ پەیدا بکەن. ئەگینا عوسمانیەکان بەمـەرایی‌و ئینگلیـزەکـانیش بە دەسیســـەو پیـلان گێران وا دەکەن هەموو کوردە شەرکەرەکانمان لیْ راست بکەنەوەو بیانکەنە دوژمنمان».

هەر کە شەڕەکـــەی نێـوان عوسمـانیـەکـان و رووسیـا دەستی پیْکرد، ئاشکرا دیاربوو، کە عوسمانیەکان ئامادەی شەڕ نەبوو. ژمارەی سەربازەکان کزبوو و بەش نەدەکرد. جل و بەرگ و عتاد زۆر ناتەواو بوو. فایق پاشای سەرکردەی هێزە نیزامییەکان لە وان لە دۆخێکی تەواو شرو شلۆق دا بوو. هەر خۆی دەربارەی ئەو دۆخە دەنووسێت و دەڵیْ: «لە وان لە باتی سوپاییکی شەست هەزاری، تەنیـــا (370) سەربـــازی رەش و رووت و پەلـێـکی سووارەی کەم وولاخ و بەتارییەکی شاخاوی هەبوو».

لە ساڵی 1877دا، تا رادەیێـــك دۆخـەکـە گۆرانی بەســەردا هات. رازی بوونی شێـخ عوبـەیـدوولڵای سەرۆکە ناسراوەکەی کورد بەبـــەشـــدار بوون لە شەڕدا گەلێـك لە کوردەکـان بۆ لای عوسمانی راکێشا.

وەك ئیڤانۆڤی کۆنسـوڵی رووسیا لە ئەرزرۆم. لە نامەیەکیا کە دەربـارەی کوردەکـانی بۆتـانـە لەوە دەدویْ، کە نە عوبـەیدوڵلاو نەشێخ حوسەینی باپیری‌و نە باوکی شێخ تاها قەت حەزیان لەوە نەکردووە هەڵوێستێکی ناحەزیان بەرامبەر رووسیا هەبێت. بەڵکو بەپێچەوانەوە هەمیشە دژی عوسمانیەکان بوون و «هەمیشە لەژێر پەردەی پاراستن و پارێـزگـاری یەوە چوون بە دەنـگ ئەو بنـەماڵە سەردارانەی میسوپۆتامیا کە دژی میری راست دەبوونەوەو دەستی یارمەتییان بۆ درێژ دەکردن».

کەواتە ئەم بەشداربوونەی شێخ عوبەیەوللا لەو شەڕەی دژی رووسیا، چۆن روون بکرێتەوە؟

عوسمـانیـەکـان بۆ ئەوەی ریْ لە رووسیا بگرێت دەسەلات و نفـوزی خۆی بەسـەر ناوچـە رۆژهـەلاتییەکانی ئیمپراتۆرییەکەدا بلاوبکاتەوە، هات بانگی جەنگی ئاینی (غەزا)ی، دا.

بێگومان شێخ عوبەیدوڵلا وەك سەرۆکی یەکێك لە مەزهەبە موسڵمـــانـە هەرە گەورەکـان خۆی دوورە پەرێـز لەو بانگـەوازی غەزایە بووەستیْ.

لەبەر ئەوە بە خۆی‌و (300) لە موریدەکانی بەرەو باکوور، لای هێیْ سنوور کەوتەریْ. هەر لەوێش پاش ماوەییکی شەڕ دەستی‌پیْکرد.

گومان نییە ئەم کردەوەیەی لە خواست و ئامانجی سیاسییەوە دوور نەبـــوو، دەیـــویست سوود لە شەڕەکـــەی نێـوان رووسیـاو عوسمـانیـەکـان دەسەلات و نفوزی خۆی بلاوتر بکاتەوەو پەرەی پیْبسێنیْ. هەروەهـــا چاوی لەوەشـــەوە بوو ببێتـــە سەرکـردەنی هێـزەکـانی کورد. بۆ ئەوەی لە دووارۆژدا دژی عوسمـانیـەکـان بەکاریان بهێنیْ.

کاربـــەدەستـــانی عوسمـــانی کە باش ئاگـــاداری ئەوە بوون ئامـادەکـردنی پێـویستی سوپـا چەند قورس و گرانە، هەوڵیان دا سوود لە توانای نارچەکانی سەر سنوور ببینن بۆ ئەوەی نەیەڵن سوپاکانیانت بەبیْ ئازووقە بمێننەوە.

كوردەكانى بايەزيد دەبوو بە دەم كوتييەوە هەموو جۆرە سەرانەيێك بدەن و خواردەمەنى بۆ هێزەكانى عوسمانى ئامادە بكەن. «هەموو بنەماڵەيێكى سنجاقى بايەزيد دەبوو بۆ ئەو هێزانەى بەريوەبوون ـ جەنەرال ليوتينانت تێر ـ گوكاسۆف بۆ لۆريس مێليكۆڤ دەنووسێت ـ دوو بەران و بە باتمان (16ف)، رۆن و دوو جووت گۆرەوى خورى بدەن بەو كوردانەى لەلايەن كاربەدەستانەوە دانرابوون. كوردە دامەزراوەكان ئەگەر پێيان نەكرابايە ئەوانە بدەن ئەوە دەبوو بەپارە بيقەبڵێنن».

لە رۆژانى شەرەكەشدا بێگا رێكى‌تريش پەيدابوو. واتە دابەش كردنى سەربازەكان بەسەر ماڵى جووتيارەكاندا. ئەمەش لەسەر ئارەزووى قائمقام وەستابوو. نارێك وپێكى ئازووقە هاتن بۆ سەربازەكان و هەروەها دوواكەوتنى مانگانەى سەربازو ئەفسەرەكان دەبوونە هۆى پەيدابوونى دزى‌و جەردەيى‌و تالآنى‌كردن.

بە هۆى ئەو پارە خەرج كردنە بێ‌شومارو بێ‌سنوورەى كۆشكى سوڵتانييەوە. خەزينەى دەوڵەت تابووت بوو. لە ئەنجامدا كاربەدەستان ناچار بوون بكەونە قەرزكردن. سەركردايەتى جەنگى ناچار بوو روو بكاتە خەڵك و خواكەى ئەرزرۆم و پارەو پووليان لێ بسێنێ هەتا مووچەى سەربازەكانى بدات.

رووى دەدا كاربەدەستانى عوسمانى بە ئەنقەست و بە ئاشكرا هێزە نيزامييەكانيان بۆ تالآن كردن و رووت كردنەوەى دانيشتووەكان بەكار دەهێناو هەروەها بۆ چاوترساندن و سرادانى ئەوانەى لە روويان‌دا دەوەستان و بەرهەڵستييان دەكردن. بۆ ئەم مەبەستە هەوڵيان دەدا هێزە نانيزاييەكانيش بەكاربهێنن، بەتايبەتى هێزە كوردەكان.

ئەوەبوو موختار پاشا لە برووسكەيەكدا كە بۆ فايق پاشاى فەرماندەى سوپاى ناردبوو بە ئاشكرا پێويستى ئەوەى تياهاتبوو بەڵيشاو سەرباز لە هەريمى يەريڤانەوە بۆ سوپا بنێردرێت «كە لە دۆخێكى تالآن كردندا دەژيان». جگە لەمەش هێزە نانيزامييەكان بۆ هێرشى ناكا بۆ سەر باڵەكانى هێزەكانى پێشەوەى سوپاى رووس بەكار دەهێنران. كوردەكان حەزيان لەوە دەكرد بەشدارى ئەو جۆرە كردەوە جەنگييانە بكەن. لەبەر ئەوە هەر لە سەرەتاى شەرەكەدا نارەزايى خۆيان و مل نەدانيان پيشانى سەرۆكە شێخەكانيان داو هەر ئەوەندەى هەليان بۆ هەڵ بكەوتاية مەيانى شەريان بەجێ دەهێشت.

لە بروسكەكەى فايق پاشادا كە لە 17ى تەمووزى ساڵى 1877دا بۆ موختار پاشاى ناردووە، ئاشكرا ئەو ترسە گەورەيەى تيادەردەخات چۆن كوردەكانى سەر بە شێخ عوبەيدوولّلا بەهۆى كەمى ئازووقەو نەبوونى چادرەوە نيازى بلآوە لێ‌كردنيان هەيەو چەكە كۆنەكانيان فرێ دەدەن و چەكى نوێ‌ترو شتى‌تر كۆ دەكەنەوەو دەيبەن.

زۆرى نەبرد كوردەكان كەوتنە ئەوەى دەستە دەستەو بە كۆمەڵ وازبهێنن. هەر لە 17ى خوزەيراندا. لەلاى بايەزيدەوە (1500)كەس وازيان هێنا... هەزار كوردى ناوچەيێكى‌تريش دايانە پاڵيان. لە رۆژانى ئابلۆوقە دانەكەى قەلآى بايەزيدا، شێخ عوبەيدوولّلا لە پێنج هەزار چەكدارەى لەگەڵيابوو و لە ريزى سوپاى نانيزاميدا بوون تەنيا 1443 كەسيان مايەوە، واتە سێ جار كەمتر. ئەمە شێخ عوبەيدوولّلاى ناچار كرد واز لەو هێزە بهێنێ كە ئابلۆوقەى بايەزيدى دابوو و بەرەو (بارگيرى) بگەرێتەوە.

زووى دەدا كوردەكان راستەوخۆ رازى نەدەبوون لابدەنە لاى عوسمانيەكان زۆر جار داوايان لە رووسەكان دەكرد لە سوپاكانياندا وەريان بگرن. كەپيتان نۆرمانى ئينگليزى، ئەوەى رووداوە جەنگييەكانى جەبهەى قەفقاسى بە چاوى خۆى ديبوو، لەو كارەيدا كە دەربارەى شەرەكەى رووسياو عوسمانيەكان ساڵى 1877 ـ 1878دا نووسيوێتى بە داخەوە لەوە دەدوێ چۆن كوردەكان پاكانەيان بۆ كردەوەو هەڵوێستە سلبييەكانيان لە شەرەكەدا نەدەكرد.

كاربەدەستانى عوسمانى كە لە راستيدا دەسەلآتيان بەسەر هێزەكانى كوردا نەمابوو، لە دووهەم ساڵى شەرەكەدا، توانيان بۆ ماوەيێك چەند هێزێكى نانيزامى دروست بكەن.

سەركەوتنى هێزەكانى رووس لە قارس و بايەزيدو چەند ناوچەيێكى تر كارێكى گەورەى كردە سەر دۆخى سياسى لە

کوردستان و هەستی ناحەزیو دوژمنایەتی دژی عوسمانی لەناو دانیشتووە کوردەکاندا گەرم کرد. ئیڤانۆڤی کونسوڵی رووسیا لە ئەرزرۆم، دوای داگیرکردنی قارس خێرا نووسی: «بەرزام وایە... کوردستان بیر لە راست بوونەوە دەکاتەوەو بگرە خۆی بۆ ئەوە ئامادە دەکات».

رووداوەکانی دەرسیمی شاخاوی نموونەیێکی راستی ئەو بۆچوونەی کونسوڵەکەی رووسیا بوو.

ئەگەر ئەستامبوول لە ماوەی رۆژانی شەرەکەدا توانی بە هەر حاڵێك بێت هێندێك لە کوردەکان بێنێتە ریزی سوپاکانییەوەو چەند عەشرەتێکی کوردی نیوە کۆچەر بە لای خۆیدا رابکێشێت، ئەوانەی لەو شەرەدا تەنیا چاویان لە تاڵانی کردن بوو، بەڵام کوردەکانی دەرسیم کە بەرمیلێکی پڕ لە ئاو دەچوو لەسەر ئاگر دانرابێت. دەکوڵاو دەکوڵاو چاوەڕوانی دەرفەتێك بوو بتەقێتەوە.

بەگە دەسەڵات دارەکەی (کۆزان)، ئەوەی رازی نەبوو داخوازییەکەی ئەستامبووڵ بەجێ بهێنێ، واتە سوپاییکی (25) هەزار کەس کۆبکاتەوەو رێگا بدات هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی بگەنە مەیانی شەڕ، بەپێچەوانەوە بە یارمەتی کوردەکان خێرا رێگاکانی قارس و تۆکاتاو سیواس و ئەرزرۆمی گرت و رێی هاتوچۆکردنی هێزەکانی میری بەربەست کرد.

دۆخەکەی دەرسیم مەترسییەکی وەهای بۆ کاربەدەستان دروست کردبوو، ناچار بوون لەژێر پەردەی (یاسا پاراستنەوە) هێزێکی گەورە بنێرنەسەر دەرسیم، بەڵام ئەو هێزە لەلایەن... دانیشتووانەوە بەرهەڵستییەکی توندکرا.

دەبێ ئەو راستییە دەست نیشان بکرێت چۆن (بێلیۆت)ی، یاریدەدەری کونسوڵی ئینگلیزی لە ئەرابزوون، سەرەرای ئەو دوژمنایەتییەی بەرامبەر کوردەکانی دەرسیم هەیبوو کەچی لە یەکێك لە نامەکانیدا خۆی پێ ناگیرێت و دان بەوەدا دەنێ کە کوردەکان بۆ ئامانجی «سەربەخۆیی» راپەڕین و حەیفە رووداوەکانی دەرسیم بە جەردەیی و تاڵانی کردن لە قەڵەم بدرێن.[29]

لەشکری چووارەم بریتی بوو لەو هێزە سەرەکییەی پەلاماری دەرسیمی دا. چەند هێزێکی ناوچەیی تری عوسمانیش چوونە پاڵی. شەرە گەورەو سەرەکییەکان لە بناری شاخەکانی تووژ یلك و هوت روویان دا. هەموو ئەو دانیشتووانەی لە دەست هێزەکانی عوسمانی هەڵاتبوون لەو شوێنانە گرد بووبوونەوە.[...]

بەرهەڵستی کردنی کوردەکان لەسەر بناخەیێکی رێکخراو دامەزرابوو. دانیشتووانی ئەو گوندانەی دەرسیم کە لە سەرەرێی هێزەکانی عوسمانیدا بوون. بە خۆیان و کەل وپەلیانەوە روویان کردە شاخی تووژ یلك و لەوێش خۆیان بۆ جەنگ ئامادەکرد. کاتێك لەشکری چووارەمی عوسمانی گوندە چۆڵ بووەکانیان سووتاند، بەلای(خۆزاتادا) رووی کردە شاخی تووژ یلك. ئەوسا شەڕدەستی پێ کرد، ئەو شەڕەی سێ رۆژی خایاند. کوردەکان داوای یارمەتییان لە عەشرەتە دراوسێیەکان کرد. بەڵام ئەوانیش لە دۆخێکی شردا بوون. لەم تەنگانەیەدا کوردەکانی خرانیو ئەرمەنییەکانی میراگاچوون بەدەنگ ئابڵوقە دراوەکانەوە. هێزە یەکگرتووەکانی کوردو ئەرمەن عوسمانیەکانیان ناچارکرد دوڵی پاخ بەجێ بهێڵن.

بەڵام هێزەکانی عوسمانی دووای ئەوەی یارمەتییان بۆ هات جارێکی تر کەوتنەوە پەلاماردان. شەڕ داگیرساو لە ئەنجامدا عوسمانییەکان هەڵاتن. دووای ئەم سەرنەکەوتنە کاربەدەستانی عوسمانی بریاریان دا هێزیتر بنێرنە سەر کوردەکانی تووژ یلك. یەکێك لە بەشداربووەکانی شەڕەکە ئەمەی خووارەوەی بۆ (ئەنداریك) گێرایەوە: «دووای سەرکەوتنەکە بە پێنج رۆژ، سوپای عوسمانی گەڕایەوە کەوتە پەلاماردانێکی توندوتیژ. عوسمانییەکان بە تۆپ شاخەکانیان بۆردومان دەکرد. شەڕەکە پانزە رۆژ دەوامی کرد. هەردوولا بەبێ تاقەت چوون شەڕیان دەکرد. عوسمانیەکان کە دیيان بەزەبری ئاگر دەرەقەتمان نایەن، ئەوسا بریاریان دا لە رێی ئاوو خواردەمەنی لێ بڕینەوە وامان لێ بکەن خۆمان بەدەستەوە بدەین».

لە دۆخێکی وەهادا، دوو رایی لەسەر خەباتی دووروودرێژ لە نێوان ئابڵوقەدراوەکاندا سەری دەرهێنا. دەستەیێك رایوابوو تووژ یلك بەجێ بهێڵن و رووبکەنە تیریسیێ و لەوێ قایمکاری خۆیان بکەن. دەستەیێکی تریش لەو رایەدا بوو ئەو پڵانە لەوانەیە

بهێنه مایەی ژێر کەوتن.

له ئەنجامدا دەستەیێك دریان بە دوژمن داو خۆیان گەیاندە خووتی ـ تیرێسی. عوسمانییەکان سوودیان لەم لاواز بوونەی دەرسیم بینی و هێـرشێکی توندیـان بردوو تووژ یکیـان گرت و دڕندانە کەوتنە گیانی دانیشتووەکانی. پاش داگیرکردنی تووژ یك کوردەکـان دەست بەرداری خەبـات کردن نەبـوون و لە ناوچەی لەرزنجان کەوتنە شەڕی پارتیزانی.

سەرکـەوتنـەکـانی هێـزەکـانی رووس لە جەبهـەی قەفقاس، کارێکی گەورەی لەسەر رێڕەوی راپەڕینەکەی کوردەکانی دەرسیم هەبوو.

جارەهای جار سەرۆکە کوردەکان روویان دەکردە رووسەکان بەو نیازەی کردەوەو چالاکی جەنگی هەردوولا یەك بخەن. ومن لە سەرچـاوەی باوڕ پێ کـراوەوە دەمـزانـی ـ بیـلیـێـوت لە نامەیێکی تریدا دەنووسێت ـ کە کوردەکانی دەرسیم پاش ئەوەی لە لەشکـرەکـەی موختـار پاشـا گەڕانـەوە، چاویـان لەوە بوو کە هێـزەکـانی رووس پەلامـاری لەرزنجـان دەدەن، لەبـەر ئەوە راپـەڕینـەکـەیـان تەقـانـدەوە). بەڵام ئەم نیـازو خواستـەی راپـەڕیـوەکـانی واتـە یەکگرتنەوەی هێزی سوپایی ئەوان لەگەڵ هێزەکانی رووسدا لەبەر چەند هۆیێك نەهاتە دی. لە کاتێکدا هێـزەکـانی عوسمـانی پەلامـاری دەرسیمی دەدا، لە هەمـان کاتیشـدا پەلامـاری (خـوتی ـ تیـرێسیٌ) شیـان دەدا. کە بنکەو قەڵایێکی سەختی راپەڕیوی کوردو ئەرمەنەکان بوو.

لە دۆڵی مەنـزوور، راپـەڕیـوەکـان، خراپ عوسمـانیـەکـان شکاندو ناچاریان کردن واز لە هێرش هێنان بهێنن. لە ئەنجامی ئەم شەڕەو شەڕی تـردا، کاربـەدەستـانی عوسمـانی جارێکی تـر ناچـار بوون دەسـت بەرداری ئەو خواسـتـە بن، کە دەرسـیـم بەتەواوەتی داگیربکەن و بیخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە.

دەرسیمییـەکـان لە رێی خەبـات و خۆبەخت کردن و ئازایەتی هەزارەهـا لە رۆڵـەکـانی کوردو ئەرمـەنـەوە، توانی تا رادەیێـك سەربـەخـۆیی خۆی بپـارێـزێت. ئەو شوێنـانـەی عوسمانیەکان داگیریان دەکرد، پاش خۆیان بەوێرانی بە جێیان دەهێشتن.

یەکێك لە رووخسـارەکـانی راپـەڕینـەکـەی دەرسیم ئەوەبـوو سرووشتێکی جەمـاوەری هەبـوو. گەورەو بچـووك، ژن و پیاو، نوێنـەرانی عەشـرەتـەکـان و چینـەکان بەشداریان کرد. ئەفسەرە عوسمـانیـەکـان، ئەوانـەی بەشـداری شەڕەکـانی دەرسیمیـان کردبوو، دانیان بەوەدا ناوە کە ئافرەتانی دەرسیم وەك پیاوەکانی مەردانە لە کۆڕی شەڕدا دەجەنگین.

راپـەڕینـە ئازادیخـوازەکەی دەرسیم کاری کردە سەر خەباتی بەشـەکـانی تری کوردستـان، بەتـایبەتی ناوچە گرنگەکانی وەك هەکاری و بۆتان و جزیرە.

راپـەڕینـەکـەی دەرسیم کە بە شێـوەیێکی عوفوی بەرپابوو لە ئەنجـامی ئەوەی کا بەدەستـانی لە رۆژانی شەڕەکـەی نێـوان رووسیـاو عوسمـانیـدا زۆریـان لە کورد دەکـرد دژی رووسیـا راست بێتـەوە، کۆتـایی بەوە هلت کوردەکـان دەست بەرداری سەربـەخـۆیی خۆیـان نەبوون و دۆخە سەربەخۆییەکە وەك خۆی مایـەوە. ئەمـەش لە دووارۆژدا دەورێـکی باڵای لە مێـژ ووی بزووتنەوەی گەلی کوردی دژی عوسمانی هەبوو.

ئەو گفتوگۆیەی لە نێوان رووسیاو عوسمانیدا لە بەهاری ساڵی 1878دا بۆ ئاشت بوونـەوەو یەك کەوتن دەستی پێ کـرد رێی لەو تەشـەنـە کردن و چوونـە ناوەوە سەرکەوتووەی رووسیای گرت کە خەریـك بوو بە قووڵایی ناوچـەکـانی باکووری رۆژهـەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا رێگا بۆ خۆی بکاتەوە.

هەرچـەنـدە کوردەکـان شوێنێکی گەورەیـان لە سیـاسـەتی عوسمانی بەریتانیاو رووسیاو دەوڵەتانی تردا هەبوو. بەڵام نە لە رۆژانـی شەڕو ناکـۆکـیـدا. نە لە کات و سـاتـی گفتـوگـۆی ئاشتیخـوازەکـەی سان ستیفـانـۆداو نە لە کۆنگـرەکـەی بەرلیندا کێشـەکـەی کود بەرەو پێشـەوە نەبـزاو بە شێوەیێکی جیاو لاوەکی سەیری نەکرا.

* ئەم باسە لە کتێبی راپەڕینی کوردەکان، کە لە نووسینی (جەلیل جاسم)ە وەرگێردراوە.

# لایەرە گرنگە باسی نەکراوەکانی مێژووی کۆیە

حاجی محی الدین ئەسعەد

کۆیـە شارێکی زۆر کۆن و دێرینەو شوێنێکی تایبەتی هەیە لە رووی رۆشـەنبیـری و کۆمـەڵاتی و ئابـووری و بازرگـانی و رامیاری، رەنگـدانـەوەی هەریـەك لەمـانـەی لە هەرە کۆنـەوە پێـوەدیـارە. خۆ ئەگەر بێتو مێژ وو نووسێکی شارەزاو خامەپاك و بێ لایەن وووردبین و نەتـرس، ئەم ئەرکـە پیـرۆزە بگـرێتـە ئەستۆی خۆی و بگەڕێ بەدوا سەرچاوە راست و دورستـەکـانـدا کە بەلای منـەوە زۆر بە ئاسـانی دەکـەوێتـە دەستی، ئەوە بەم کارەی مێـژ ووییکی تێـروتەسەلی ئەم شارە پڕ لە داستان و کارەساتە جەرگبڕانەی دەکەوێتە دەست و دەبێتە مایەی شانازی هەموو کوردێکی دڵسۆزو میللەتی عیراق بەگشتی.

لەم باسـەمـدا تەنیـا لە چەنـد لایـەنێـك دەدوێم بۆ ئەوەی بێتـە سەرچاوەیێك بۆ مێژ وونووسی بەڕێز.

1 ـ لەبـەر ئەوەی شاری کۆیـە مەڵبـەنـدی رۆشـەنبیـری بووەو شوێنی رێـزگـرتنی هەمـوو خوێنـدەوارێکی دڵسـوز بووە. هەمـوو پاشـاکـانی بابـان کە هاتـوونـەتـە سەرتـەختی پاشایەتی زەماوەندی گەورەیـان لەبـاغـەکـانی کۆیـە کردوەو لەگـەڵ هاتنیـان بۆ ئەم شارە بەسـەدان کتێبی چاك و نایـابیـان لەگـەڵ خۆیـان هێنـاوەو بەسـەر خوێنـدەوارەکـانیـاندا دابەش کردوەو لە نامەخانەکانیان داناوە، لەبەر ئەوەی مزگـەوتەکان مەڵبندی خوێندەواری بوون بۆیە عبدالله پاشای بابـان مزگـەوتێکی گەورەی دروست کردووە ئێستـا بە مزگـەوتی «حاجی مەلا ئەسعەد» کە قوتابخانەیێکی گەورە بووەو سەدانی وەك «حـاجی قادر» «حـاجی مەلا عبـدالله» و «شێـخ رەزا» کەیفی جوانـرۆیی لێ دەرچـووەو بوونـەتە مامۆستاو بڵاو بوونەتەوەو بە هەموو شارەکانی کوردستان و عیراق و ئەستەمبوڵ و شام و میصر.

لەبـەر گرنگی ئەم شارە عبـدالله پاشـای بابـان نوێنەری تایبەتی خۆی لەم شارە دانـاوە کە خوالێخـۆشبـوی ئەمـر «عەزیز مەصرەف» جێگای خۆشەویستی هەموو شار بووە هەر خۆشی وەسیەتی کردبوو ئەگـەر وەفـاتی کرد لە کۆیـەی بینێـژ ن هەربۆیە کە وەفات دەکات بە زۆر رێـزو پایـەلێنانەوە لە تەکیەی «کاکەی شێخ صالح» دەی نێژ ن و ئێستا بوتە قوتابخانەی «حاجی قادری کۆیی» هەزار سڵاو لە گیانی پاکی بێت.

2 ـ کۆیـە شارێکی ئارامگەو کاروان سەرا بووە لەهەموو لایەکی کوردستـانـەوە روویـان تێکردوە، بۆیە لە «200» ساڵ پێش ئێستاوە بەشێـك لە عەشیـرەتی «جـەلالی» کە لە ناوچـەی «مـەنمی»یـەوە هاتبـوون روویـان کردوتـە کۆیەو لێ نیشتەجێ بوون و زۆر پیاوی گەورەو ناوداریـان لێ هەڵکـەوتـووە لەوانە خوالێخۆشبو کاك «حەمە مراد»ی ی جەلالی، زۆر رەوشـەنبیـرو نەتـەوەپـەرست بووە، لە بنچینەی یەکەم رێکخستنی نەتەوایەتی بووەو لە یەکەم کۆبوونەوەیان بەشـدار بووە کە ناویـان لە خۆناوە بەڵشەوی کە لەدواییدا بەدرێژ ی لەسەری دەدوێم.

3 ـ دانیشتـوانی کۆیـە بە گەداو ئاغاو رۆشەنبیرو کەسەبەو هەموو چینـەکـانیـانـەوە دژ ی ئیمپـراتۆریەتی عوسمانی وەستاون، بەیانی نەبـووە لەبـەر دەرگـای سەرا چەنـد کەسـانێـك لەسێدارە نەدرابێ و زۆریشیان دەربەدەر بوون و کەوتوونەتە شارەکانی ولاتانی دەوروو پشتیان.

حەمـاغـای کۆیـە بەربـەرەکـانێکی زۆری عوسمانیەکانی کردوە لەشـەرێکـدا بریندار دەبێ و بەدیلی دەگرن و لە ئەنجاما «15» ساڵ بەنـدەکـرێ و بەبێ لێـبـوردن هەر «15» ساڵ تەواو دەکـا هەر لە ئەنجـامی زوڵم و زۆری عوسمانی یەکان و جندرمەکانی ی هەستی نەتەوایەتی لە کۆیە سەر هەڵدەداو لاوەکانی کۆیێ یەکەم رێکخستن دورست دەکەن.

4 ـ دانیشتـوانی شاری کۆیـە لە زۆر کۆنـەوە بیرەوەری ئاهەنگی نەورۆزیـان کردووەو بە جەژنێکی نەتەوایەتیان زانیوە، هیچ رژێمێك نەیتـوانیـوە لێـیـان قەدەغـە بکات ژ ن و منداڵ و لاوو پیر چەند رۆژ پێش جەژنی نەورۆز خۆیـان بۆ ئامـادە کردوە تەنـانـەت مەلاو پیـاوە ئاینی یـەکـانی کۆیـە هانی ژ ن و منـداڵی خۆیـان داوە کە بەرگی

رەنگاورەنگە پیرۆز و بەنرخ اری ئەم ئاهەنگە پیروزە بکەن تەنانەت لە هەمــوو ئاهەنگەکــانی نەورۆز، یەکێ لە مەلاکــانی شار ئاهەنگەکانی بە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز کردەوە، دوایی یەکێك لە پیاوە ناسیاوەکان بۆ دانیشتوانی روون کردبووەوە کە بۆچ ئاگر لەم جەژنە نەتەوایەتیەدا دەکەنەوە و تێی کەباندوون بۆیە بە هەموو خۆشییەکەوە تێکرای دانیشتوانی شار بەشداریان کردووە هەر لە دەرکەی سەرشوورانەوە تاقی سەرکەوتنی رەنگاورەنگ بە کەلای درەخت دروست کراوە تاکــو شوێنی ئاهەنگەکــە لە سەیــرانگــای تاتــوکــان . شەوی نەورۆز پیاو ومندالْ لەوێ شەونخونیان کردووە زەمــاوەنــدیــان کردووە بۆ بەیانی بە هەزاران مەنجەڵە شیوو خواردنی هەمــە چەشنــە گەیــانــدراوەتــە ئەم شوێنــەو بە دەیــان ئەسپ سوار جلیتــانێــان لەدەورەی تاتــووکان کردووە لەگشت لایەکەوە دەهۆڵ و زورنا کوتراوەو لێدراوە، ئێوارە هەمووی بەخۆشیەوە رۆویان کردۆتەوە شارو بەبێ ئەوەی یەکێ کارێکی ناشیــرین بکــات، هەریــەکــە بە جەژنی راستی خۆی زانیــوە . هەمــوو گوێندەکانی کۆیە بەشداریان لە ئاهەنگەکاندا کردوە شانیبەشانی دانیشتوانی شارەکە.

5 ـ شاری کۆیــە بە شاری کۆمــەك کردن و کۆمــەلایــەتی زانراوە ئەمــە لایــەنێکی زۆر زۆر گرنگــە کە تاکو ئێستاش لاوەکانیان رێبینی باب و باپیــرانیــان دەکــەن، ئەگــەر بێتــو کارە خێرخــوایی یــەکــانی خوالێخــۆشبــو کاك «عبــداللەی جەیــد»ی تان بۆ باس بکــەین دەبێتەمایەی سە سورمان و خۆشی هەموو دڵسۆزێك بۆنیشتمان و نەتەوەکەی.

هەموو دانیشتوانی کۆیە لە گەورەو بچووك و لەمەلاو ئاغاو گەدا، گوێرایــەڵی ئەم زاتــە بوون، هیــچ کەسێــك نەیتــوانیــوە تەوەزەلی لەفەرمــانی ئەودا بکــات، چونکی هەمــوویــان زانیــویــانــە گشت کارەکــانی بۆ سوودی دانیشتــوانی شارەکەیە . گەرماو سەرماو ماندوو بوون و نەنــووستنی نەزانیــوە، ئەگــەر کارێــك هاتبێتــە پێش . وەکــو سەربــازێکی نەنــاســراوی شارەکە بووە . جێگای رێزلێنانی جەنابی مەلای گەورەو حەمــاغــاو هەمــوو رەوشــەنبیرێك بووە . لێرە دەرفەت نییــە بە درێــژی باسی بکــەم ئەم بیاوە دەبێ بەتەنیا کتێبێکی لەسەر دابنــدرێ شان بەشــان، مامــۆستایەیێکی لێهاتووی وەرزش بووە، جۆرەها یاری فۆلکلۆری بە دانیشتوانی کۆیە ناساندووەو فێری کردوون .

بەبێ دوودلی فەرمانی بۆ حەماغاو مەلای گەورەی کۆیە دەکردو، ئەم پیــاوە هەرچــەند لە چینی گەداکان بووە، بەلام ئەم کاتە کانی، ئەوە نەبــروە فلان هەژارە یان ئاغــایــە یان مەلایــە هەرکەسێك زیاتر خزمــەتی شاری کردبێ ئەمــە لە رێــزی پێشــەوە بووە، بۆیــەش تاکو ئێستا ئەم پەیوەندییە کۆمەلاتی یە هەر ماوە بۆ وێنە یەکێك کەسێکی لێ دەمــرێ خاوەن مردوو هیــچ مانــدوو نابێ چونکــە خەڵکی شار هەمــوو ئەرکێکی ئەم پرسەیە دەگرنە ئەستۆی خۆیان وشان بەشانی ئەوە ئێستــاش کۆمــەڵێکی هاریکــاری هەیــە لەکۆیە بۆدابین کردنی هەمــوو پێــویستی یــەکــانی ناشتنی مردووێــك جا ئەم مردوە، هەر کەسێــك بێت، هەر لەزەوی یــەوە تاکــو بەردەکــانی بەچاکترین شێوە بەشــداری سێ رۆژەی پرســە دەکــەن کە ئەمــە لەخــۆیدا چاکترین نیشــانەی کۆمەك و هاریکاری کردنە . کە ئەم لایەنە لەشارەکانی تردا لەسەر خاوەن کردوو گەڵێك زۆر دەکەوێت.

سەرەرای هەموو ئەوانە هەر لە پەیدابوونی فەقێیەکانەوە تاکو قوتابیەکانی داخلی یەکان کە لە دەرەوەی کۆیە هاتوون و دەخوێنن جێگــای رێــزگــرتنی هەموو دانیشتوانی شارەکە بوون، لە هەموو کووبوونەوە گشتی یەکان و میمەری مزگەوتەکان هانی خەڵکەکان دراوە بۆ کۆمــەك و یارمــەتی دانیــان و هەمــوو پێــویستی یــەکــانیان جێبەجێ کراوە تاکو ئێســتاش ئەم رەفتارە رێبینی دەکرێو پشت گوێ نەخراوە،

## 6 ـ کۆیــەو بەرپــاکــردنی شۆرشی چەکدارانە دژی ئیستعماری ئینگلیزی داگیرکەر.

هەر لەرۆژی 15/12/1918وە کە ئینــگــلیــزەکــان پێــی نامــوبــارەکیــان هاویشتوتە سەر حەرەمی کۆیە، دانیشتوانی وەك شێر دژ یان وەستاون و پێیان هەڵنەخەڵەتاون، هەندێ لە گەورەو یاوەرە ـ کانیــان بە کۆمــەڵێــك نیشانەوە بەناو شەقامەکانی کۆیەدا دەســورێنــەوە بۆ ئەوەی مەتــرسی بخــەنــە نێــو گیــانی دانیشتوانی شارەکــەوە، بەلام ئەوەی چاوەنــوار دەکــرا لەم شارەدا هاتــە دی، یەکێك لە کەسەبەو دوکاندارەکان لەبەریان هەڵنەستان، حاکمی

سیاسی بەم کارە زۆر دڵتەنگ دەبێ، فەرمان دەدا کە سزا لە هەموویان بسێنن، بانگیان دەکەن و سزا لە هەموویان دەسێنن و بەدڵخۆشیەوە دەگەڕێنەوە شوێنەکانیان ـ هەرچەند هەوڵ دەدەن تاقمێکیان بۆ دورست نابێ کە باوەڕیان پێبکەن.

**7 ـ دروست بوونی ڕێکخستنی شۆڕشگێری نهێنی دژی ئینگلیزەکان.**

لە پێشەوە باسمان کرد کە زۆر لە کۆییەکان لەبەر جەورو ستەمی عوسمانییەکان دەربەدەر بوون و کەوتنە شارەکانی دووروپشتیان و بە وولاتە دراوسێکاندا بڵاو بوونەوەو گەلێکیشیان لەلایەن روسیای قەیسەرەوە بەدیل گیران و حەماغاش لەلایەن عوسمانییەکانەوە «15» ساڵ بەندکرابوو زۆر ستەم و ئەندیشەی لەدەست داگیرکەر دیبوو لەوکاتەی کە شۆڕشی ئازادیخوازانە بەرپابوو هەموو دیلەکان کۆدەکەنەوەو قسەیان بۆ دە کەن و پێیان دەڵێن ئێمە بە یەك گرتن و برایەتیو دلسۆزیو راستگۆیی توانیمان بەسەر قەیسەردا زاڵ بین، ئێمەش وا ئێوە ئازاد دەکەین هەموو میللەتێك وەك ئێمە دەتوانێ ئازادبێ سەرەڕای ئەمە پێش کەوتوو خوازەکان لە هەموو ئۆردوگاکانی عوسمانییەکان و قەیسەرەکان بەیاننامەیان بلاوکردەوە تەنانەت هەندێ لە کوردەکانیان بەپارە بەکرێ گرتبوو بۆ ئەوەی ئەم بەیاننامانە بلاو بکەنەوە، بەیانەکانیش بە رووسیو فارسیو تورکیو کوردیو گەلێك زوبانی دیکە بووە، لە هەمان کاتدا گەلێك لە کوردە کۆییەکان لە سابلاغ دوکانیان داناوەو خەریکی کەسابەت بوون لە ئەنجامی دەربەدەر بوونەکانیان. ئەمانە هەموویان لەگەڵ دیلەکان دەگەڕێنەوە کۆیە پاش ئەوەی مێشکیان ئاو دراوە بە برایەتیو راستگۆییو نەبەر دیو لەخۆبردوویی لەپێناوی ئازاد بووندا.

**لەو دیلانەی کە ئازادکرابوون: ـ**

1 ـ مەلاتەهای نانەوا کە ئێستا لەژیان داماوە.

2 ـ خوالێخۆش بوو، «حسین ئەمین مەلا» لەپاش ئازاد کردنی ئافرەتێکی رووسی مارەدەکاو لەگەڵ خۆی هینابوویەوە کۆیە.

3 ـ ئەحمەداغای باخچەوان و گەلێکی کە، وە لە دوکاندارەکانیش کە لەسابلاغ بوون و گەڕانەوە کۆیە.

1 ـ «حەمەگرانی».

2 ـ «حەسەنەخرە».

3 ـ «خدری رەسولی» ئەمانە هەموویان زۆر زوڵم و زۆریان چەشتبو لەلایەن عوسمانییەکان و قەیسەری رووسیو دەیانزانی داگیرکەر هەردەم دەیەوێ سامانی ولاتەکەیان بباو خاوەنەکەی لەبرسان بکوژێ، ئەمانە کەوتنە جموجۆڵ دژی ئینگلیزەکان لەماوەیێکی کەمدا توانیان لەگەڵ لاوە دلسۆزەکانی کەی کۆیە یەکبگرن و ژمارەیان دەگاتە «27» لاوی دلسۆز بریار دەدەن کۆبوونەوەیێك بکەن.

لە «کەکۆن» کۆ دەبنەوە: کەکۆن شوێنێکی زۆر خۆشبوە لە کۆیە دەکەوێتە رۆژئاوای قشڵەی کۆیەو «حاجی قادری کویی» لەیەکێ لە هەڵبەستەکانیدا باسی خۆشیو جوانی دەکا ئێستاش بووەتە گورستان.

ئەوانەی لە یەکەم کۆبوونەوەدا بەشداربوون ئەمانەن: ـ

1 ـ حاجی میرزا عبدالله چاورەش ناسراوە بە «خادم»

2 ـ «حەمە مرادی جەلالی» لە عەشیرەتی جەلالییەو لەزۆوە هاتوتە کۆیە.

3 ـ عبداللەی مام شێخ.

4 ـ مام رەزای قەلادزێ.

5 ـ مام فەتاحی برای مام رەزا.

6 ـ قاسمی رەسوڵی خدری.

7 ـ عبدالله دورسنێ.

8 ـ عبدالله قەوان.

9 ـ حاجی تایەری حاجی صالحی دارۆغەیی.

10 ـ عبداللەی نازێ.

11 ـ باوەکری مام سلطان.

12 ـ مەغدیدی عەیشانێ.

13 ـ سمايلی رەسولّی خدری.

14 ـ عبداللهی وەستا برایمی.

15 ـ حمدامین حاجی داروغەیی.

16 ـ عومەری حمد مصطفی.

17 ـ کەریمی گۆدەی.

18 ـ سمایلی خەجانیّ.

19 ـ رەشیدە زلە.

20 ـ مەلا ئەلهای نانەوا.

21 ـ سەید حەمە صالحی گۆمەشینی.

22 ـ حسێنی ئەمین مەلا.

23 ـ حسێنی بابەکری مەلازادە.

24 ـ مەلای شێخ عەلی.

25 ـ سمایلی فەقیّ قادری.

26 ـ ئەحمەد اغای باخچەوان.

27 ـ صالحاغای عبداللهغا.

ئەمـانـە هەمـوویـان بریـارو پەیمـان دەدەن کە گەلێـك لە برا زیـاتـربن و هەردەم پشتی یەك بەر نەدەن، ئامـانجی سەرەکیـان رزگار کردنی وولاّت بیّ لە چنگی ئینگلیزی داگیرکەر ئەوەش هەربـەوە دەکـریّ کە یەکگـرتـوو و راستگـۆو ئازاو نەبـەردو گیان بەختکــەر بن لەپێنـاوی نیشتمـانـەکـەیـان. هەروەك دیلەکـان و دەربــەدەرەکــان لە پێش کەوتنخــوازەکـان و بەیـاننـامـەکـانیـان بیـــستـبـــوویـان هەربـــۆیـەش ناویـــان لەخـــۆیـــان نا «پێشکەوتنخواز گەیشتبوون کە بەبرایەتیو راستگۆییو دلّسۆزیو نەبــەردیو گیــان بەخـشیـن، بەســەر دوژمــنــدا زالّ دەبـن و میللەتـەکـەیـان رزگـار دەکەن چیترنا، لە کۆتایی کۆبوونەوەکەیان صالحـاغـا پێشینـازی کردو ووتی لەبـەر ئەوەی «حەماغای کۆیە» پیــاوێکی خێـر خـوازودەولّـەمـەنـدەو وەك دەبینین هەمـوو رۆژ یّ یارمـەتی گشت لێقـەومـاو هەژاران دەدا، بۆیـەوا بەباشی دەزانم ئاگاداری بکەین، بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدا، چونکی کارەکەمان یارمەتی ئەوی پێویستە. هەموویان بە تێکرایی رایەکەیان پەسند کرد. پاش چەنـد رۆژ یـك هەنـدێکیـان چونـە لای «حەماغا»و پێیان ووت، پاش ئەوەی لەنیازیان گەیشتوو پیاوەکانی ناسیو خۆ پێی ووتن هەمووتان ئازاو رەشیدن کۆیەش پیاوی وای پێویستە ئەوە لەپێشەوە هەزار لیرەتان بدەمیّو هەرکاتێکیش چ یارمەتیەکتان پێویست بوو ئاگادارم بکەن هەولّ دەدەم هەموولایەك پشگیرتان لیّبکەن.

پێشکەو وتنخوازەکان کەوتنە جموجۆلّ وردە وردە کەوتنە ناو لاوە خوێنگـەرمـەکـان و پەرەیـان سەنـد تاکو وای لیّ هات ناوی جوولانەوەکە لەناو شاردا بلاّوبۆوە، هەندیّ ناحەزیان لیّپەیدابوو لەوانە «رەسولی جەلیلاغا» چووە لای حەماغاو شکاتی لێکردن «حەماغا» ئەو کاتە قائمقام بوو، بەرەسولاّغای جەلیلاّغای ووت «رەسولّ چیتر دەم لەوانە مەدەو دەیانناسم و کۆیە پیاویوا ئازاو رەشیدی دەویّ» رەسول آغا دەمی بەستراو پاشەوپاش گەڕاوە دواوە.

جوولانەوەکەیان پەرەی سەندو گەیشتنە سنووری سولەیمانی هەمـوو مانـگێ نوێنـەریـان دەچوە سولەیمانیو نوێنەری ئەوانیش دەهـاتـە لایـان، یەکتریان لە هەموو چالاکییەك ئاگادار دەکرد، بەداخەوە تاکو ئێستا لایەنگرەکانی سولەیمنانیمان نەزانیوە داوا لە دلّسـۆزانی سولـەیمـانی خۆشەویست دەکەم بچنە بنج و بناوانی ئەمـەوە لەبـەر ئەوە شتێکی زۆر گرنگـە لە مێـژ ووی سولـەیمانی خۆشـەویـست. ئەمـانـە هەردەم سوور بوون لەسـەر بریـارەکانی خۆیــان و پشگیــری یەکتــریــان گرتــوە، جارێکیـان یەکیّ لە برادەرەکــانیـان بە ناوی «کـەریمی مام عەلی» لەنـاو مەنگـوڕان رووت دەکــریّو دەگــەرێـتــەوە کۆیــە، هەواڵــەکــە بۆ پێشکــەوتنخــوازەکــان دەگێـرتـەوە، ئەوانیش جیّبـەجیّ «20» چەکداری لێهاتوو رێك دەخەن و دەیانێرنە لای ئاغای مەنگوڕان «کـەریمی مام عەلی» یشیـان لەگـەلّ دەچیّ، ئاغەی مەنگوڕان بەگەرمییەوە پێشوازیان لیّدەکات و داوا دەکات نانیان بۆ بێنن ئەوانیش دەلّێن نان ناخۆین تاکو شتومە کەکانی ئەم زەلامەمان نەدەنەوەو تاوانبار سزا نەدەن، ئاغاکەش دەلّیّ نەمان زانیوە سەربە ئیـوەن و زۆریش عوزریـان بۆ دێنێتـەوەو کەل وپـەلـەکـانیان وەکو خۆی بۆ دەگەرێنیتەوە، چەکدارەکانیش ئەمە بەهەل ـ دەزانن داوا لە ئاغـا دەکـەن کە هەرکـاتێـك کاروانی کۆیییان ریّیان کەوتە

لاتان ڕێیان پێ‌مەگرن و ڕێگریش لە کوردان ناوەشێتەوەو بیرو باوەڕی خۆیانیان بۆ باسکردن و گەڕانەوە کۆیە. ئەم ڕووداوە کاك «فتح اللە‌ی فەقێ ڕەسوڵ»ی گێڕایەوە، کە خۆی لەگەڵ چەکدارەکان بووەو ئێستاش لە کۆیەیە، دەگێردرێتەوە...

بەم جۆرە بەخوو و ڕەوشتی چاکیان بوونە جێگای ڕەزامەندی هەموو دانیشتوانی شارەکەو دەروبەری‌و هەمیشە لە کۆیە بەربەرەکانی ئیمپراتوریەتی عوسمانیان کردووەو سەرەڕای هەموو برسێتی‌و درندەیی‌و هەڵواسین وازیان لەچالاکی خۆیان نەهێناوە تاکو عوسمانی‌یەکان کۆیەیان چۆڵکردوە، دوابەدوای ئەوان ئینگلیزەکان لە ڕۆژی 1918/12/15 هاتوونەتە کۆیە وە وا خۆیان نیشان داوە کە هاتوون میللەتان ڕزگار بکەن و خاکەکانیان ئاوەدان بکەنەوە بەڵام دانیشتوانی کۆیەی نەبەرد بەهیچیان هەڵنەخەڵەتاون بەتایبەتی پێشکەوتنخوازەکان هەردەم دژ یان وەستاون، بۆیە چەند هەوڵیان دا نەیانتوانی جێ پێیێك ئەشارامی بۆخۆیان بدۆزنەوە، لەبەر ئەوە حاکمی سیاسی ئینگلیزی بڕیاری‌دا کۆیە چۆڵ بکەن.

داوای لەقائمقامی ئەوکاتە کرد کە «جەمیل آغا» بوو لەگەڵ دەستەو بەرێوە بەرانی سەرا شەوبچنە قشڵەی کۆیە لەوێ لەگەڵیان کۆدەبێتەوە.

ئەم هەواڵە کەوتە بەرگوێی پێشکەوتنخوازەکان لە شەوی کۆبوونەوەکەدا دەورەی قشڵەیان دا. کە زانیان حاکمی سیاسی‌و دەستەو دائرەکەی‌و قائمقام و کاربەدەستانی لە قشڵەن دایاننە بەر تفەنگان، حاکمی سیاسی‌و جەمیل آغا زۆر پەشۆکان لە ئەنجامی تەقەکان ئەسپی حاکمی سیاسی کوژ راو جەمیل آغا بە سووکی بریندار بووە یەك لەخزمانی جەمیل آغا هاوار دەکاتە پێشکەوتنخوازەکان دەڵێ ئاغە کوژ را تەقە ڕاگرن، لەبەر هەندێ ئیعتبارات تەقە ڕادەگرن، حاکمی سیاسی ئەمە بەهەل دەزانێ گورجوگۆڵی کەل و پەلەکانیان کۆدەکەنەوەو پاتارەکان لە بەینی خۆیان بەش دەکەن، بۆ بەیانی حاکمی سیاسی بەهۆی «مەلا حەویزاغای» غەفووی بەرێگای گوندەکانی بەینی کۆیەو هەولێر ڕزگاری دەبی‌و دەگاتە هەولێر. ئەمە شۆڕشێکە دژی ئینگلیزی داگیرکەرو لە هەمان کاتدا زەمینە خوشکردنیش بووە بۆ شورشی «1920»ی عیراق. دانیشتوانی کۆیە بە هەلاتنی ئینگلیزەکان زۆر دلخۆش بوون بەڵام هەندێ لە ئاغەکان چوونە ڕانیە تورکەکان بهێننەوە کۆیە پێشکەوتنخوازەکان و دانیشتوانی کۆیە ئەم کارەیان زۆر پێناخۆش بوو، بەڵام ئاغەکان سوور بوون لەسەر هێنانەوەیان بەتایبەتی عبداللە‌غای حوێزی کە دەیویست بێتە قائمقام، کە تورکەکان هاتنەوە نەیان هێشت کەسێك لە ئاغەکانی کۆیە ببێتە قائمقام ڕەمزی‌بەگ ناوێکی تۆرکەکان بوو بە قائمقام کاروباری دەوڵەتیشی لە بەینی لایەنگرەکانی خۆیان دابەش کرد.

ئینگلیزەکان بەم کارە زۆر پەست بوون و بە سەرشۆڕییەکی گەورەیان دانا بەرامبەر بریطانیای گەورە، بۆیە بەیاننامەیەکیان بە فرۆکە بلاوکردەوە تێ‌یدا ئینذزاری کۆیەو هەموو هەرێمی کۆیەیان کرد وا لەخوارەوە ناوەرۆکی ئینزارەکە دەنووسمەوە «ئەی دانیشتوانی کۆیەو هەرێمی کۆیە ئەوە بزانن و ئاگادارتان دەکەین کە هەندێ لە پیاو خراپان لە سنوورتانن و هاتوونەتە ناوتان و پیلان دژی دەوڵەتی پایە بەرزی بریطانیای گەورە دەگێرن، بۆیە هەرکەسێك سەلامەتی خۆی‌و ماڵ و منداڵی خۆی دەوێ، خۆی لەوانە دووربخاتەوەو گوێ بە فەرمانەکانیان نەدات، ئەگینا تووشی سزایەکی گەورە دەبێت» پاش ئەم ئاگاداری‌یە ڕاستەوخۆ شەش ڕۆژ لەسەر یەك کۆیەیان بۆردومان کرد.

لە ئەنجامی ئەم بۆردومانە درندانەیە چەندان خانوو بەسەر خێزانەکانیان دا تەپی‌و بە دەیان ژن و منداڵ شەهید بوون، لەهەمان کات دا لاوەکانی کۆیەو پێشەوتنخوازەکان لەسەربانە بەرزەکانی کۆیە فرۆکەکانی دەوڵەتی پایەرزی بریطانیایان دایە بەر تەقەی تفەنگان و دڵی خەڵکی دانیشتوانی شارەکەیان دەداوە، هەروەها لە کاتی بۆردومانەکە لاوی بوێژ و بەجەرگ «مەلا عەزیزی شاخەپیسکەیی» کە شاعیرێکی بلیمەت بوو هۆنراوەی شۆڕشگێرانەی دادەنا دژی ئینگلیزەکان هێندێ لەم هەڵبەستانە لەسەر زاری ڕۆڵەکانی کۆیە دەوترینەوە لەبەر ئەوەی ئەدەبی والان بە پێویستم نەزانی لێرە بیان نووسمەوە. ئایە ئەمە شۆڕش هەڵگیرسان نی‌یە دژی داگیرکەری ئینگلیز؟ وە وابزانم گەلێك لە شڵوقان زیاترە..!! ئەوەی شایانی باسە لە

رۆژانی بوردومانەکە نیشانەی هاریکاری و کۆمەك کردنی ناو شارگەیشتبووە ئەو پەری. هەموو شار ببوونە یەك خێزان هەریەکە دایك و خوشك و براو باپیری خۆی رزگار دەکردو بەبێ ئەوەی کەسێك چاوبیرێتە ماڵ و سامانی ئەوی کە - پاش بوردومانەکە تورکەکان رۆیشتن و ئینگلیزەکان هاتنەوە: دەبێ بۆ مێژوو ئەم راستی یە بنووسرێ کە ئینگلیزەکان بۆ جاری دووەم دەگەرێنەوە (جمیل آغا)ی خوالێخوش بوو بە «لاین»و یەکێ لەکاپتانەکانیان دەڵێ: -

«ئێوە کە کۆیەو ناوچەی کۆیەتان چۆل و کردو لەکاتی خۆشی کە تورکەکان رۆیشبوون پەیمانمان لە گەڵیان بەستبوو کە هیچ لایەکتان نەیەنەوەو ئێمە خۆمان کاروباری وڵات هەڵدەسوورێنین». هەربۆیە کە ئینگلیزەکان لە کۆیە هەڵدین و دەرۆن «جمیل آغای» قائمقام لەسەرا دادەنیشێ و «عەولاغا»شی لەلا دەبێ جمیل آغا دەڵێ «با جەنابی مەلا محمد»یش بانگ بکەین واتە جەنابی مەلای گەورەی کۆیە، بەڵام بەداخەوە «عەولاغا» بەرزەپێ بلند دەبێ و دەڵێ «ئەو مەلاو دەست و پێ سپی یە، حەقی بەسەر ئیشی واوە چیە؟» بەڵام جەمیل آغا گوێ ناداتە قسەی «عەولاغا» ئەنجومەنێکی نیشتمانی بۆ بەرێوەبردنی شارەکە دادەنێن و جەنابی مەلای گەورە دەبێتە سەرۆکی ئەنجومەنەکە سەرەرای کاروباری قاضی یەتی. بەڵام «عەولاغا». لەبەر ئەوەی دەیویست ببێتە قائمقام بەوە رازی نەبوو، هەوڵی دا کە تورکەکان بۆ جاری دووەم بهێنێتەوە کە لە دیوی رانیە بوون. کە لە پێشەوە باسمان کرد. وە ئەوەی جێگای پێکەنینە کە ئینگلیزەکان کۆیەیان بوردمان کردو تورکەکان هەڵاتن، «جەمیل آغا» چەند هەوڵی دا، کە عەولاغا رانەکات، بەڵام سوودی نەبوو هەتا تورکیا رانەوەستاو لەوێ خۆی گرتەوە، لەوێش تورکەکان بەچاوی سووکەوە سەیریان دەکردو هەڵس و کەوتیان لەگەڵی زۆر خراپ بوو پاش چەند ساڵێك عەفووی بۆ دەرچوو گەرایەوە کۆیە. لەو لاشەوە ئینگلیزەکان هەموو ماڵ و سامانەکانیانی تاڵان کردبوو واتە لە تورکیش و لەئینگلیزنیش بوو..!!!؟ ئەمەیە سوودی مێژوو بزانن «فەرد» واتە تاکە کەس چ رۆڵێك دەبینێ ئەگەر رێگای جەمیل آغاو جەنابی مەلای گەورەی بداباو باری کۆیە بە جۆرێکی وا هەڵدەسوورا کە سوودی هەموو هەرێمەکەی تێدابێ چوونکی گومان لەوەدا نەبوو ئەنجومەنێك کە سەرۆکەکەی مەلای گەورە بێ و ئەندامەکانی جەمیلاغاو هاورێکانی بێ، بەڵام خۆپەرستی و مەبەستی تایبەتی و لەخۆبایی بوون چی بەخۆی و چی بە میللەت کرد، بوردومانەکەش هەر لە ئەنجامی رەفتاری ناراستی «عەولاغا»و دەستەو دائرەکەی بووە. واتە کە مێژوو دەنووسرێ دەبێ ئەم لایەنانەی کە رێرەوی مێژوو بە هەرلایێك دەگۆرێ پێویستە بخرێتە بەرچاوی میللەت و خوێنەرو مێژوونووسان..

دیسان بۆ مێژوو نیشانی دەدەم کە «جەمیل آغا» هەردەم ویستوویەتی شاری کۆیە یەکگرتووبێ رێگای دوژمنانی نەداوە کە دووبەرەکی بکەوێتە ناو بنەماڵەکانی کۆیە بۆ نموونە لە زاری جەنابی مەلای گەورەی کۆیە دەگێرنەوەو دەفەرموێ «من و(جمیل اغا) بەتەنها لەلای یاریدەدەری حاکمی سیاسی دانیشتبوین، ئینگلیزەکە ووتی.. «من غەفووری‌یەکان هەموو نەفی دەکەم».

جەمیل آغاش لێی بەدەنگ دێ و دەفەرموێ «کەوابێ لەپێشەوە ئێمەش نەفی بکەن، چونکی ئێمەی «حەوێزی»و ئەوانی «غەفووری» بەیەکەوە جوانین و لە شارەکە هەر بەیەکەوە براینەوە.. تەماشاو سەرنجی ئەم ووتە بە نرخەی جەمیل اغای خوالێخۆشبوو بدەن کە پڕیەتی لە برایەتی و دۆستایەتی و یەکیەتی واتە سوودی مێژوونووسین چی یە ئەگەر ئەم هەڵ ویست و ووتانە بەرچاوی خوێنەری بەرێز نەخرێت و هەر لایەنە هەقی تەواوی خۆی نەدرێتێو لەسەری نەرۆن. هەموو دانیشتوانی کۆیە دەبێ ئەم ووتەیە بکەنە پەندێکی گرنگ و لەسەری برۆن. هەزار سڵاو لە گیانی پاکت بێ جەمیل آغا.

بۆیە ئینگلیزەکان زۆر بە درندانە ورق و کینەیێکی وا هاتنەوە رووی راستی خۆیان بۆ ئەوانەش دەرخست کە بەداخەوە پێیان هەڵخەڵەتابوون. دەردێکی وایان دا دانیشتوانی بێ تاوانی شاری کۆیە مەگەر بابە دەواری شەری کردبێ. لە پێشەوە دەستیان کرد بە لەناوبردنی جوولانەوەکەی پێشکەوتنخوازەکان، ئەندامە بە جەرگەکانیان لەناوبردن. لە سەرووی هەموویانەوە دەستیان

دریژکرد بۆ لاوی جوان مەردو نەترس «عبداللهی مام شێخ» بە نوێـژی نیـوەڕۆ لە بەردەم یەك لە گازینـۆکـانی کۆیـە شەهیـدیان کرد، دوایی هەڵیـان کوتـایـە سەرمـاڵی، «حـاجی میرزا عبدالله چاورەش» کە دەم ڕاستی پیشکـەوتنخـوازەکـان بوو خۆو بەخت لەمـاڵ نەبـووو ڕای کرد بۆ قەلادزەو لەوێـشتـەوە ڕۆیـشت بۆ سولـەیمـانی لەوێش هەر وازی لە کوردایـەتی خۆی نەهێنـاو دوکان و ماڵەکەی ببوە شوێن کۆڕی هەموو بوێژ و دڵسۆزێکی کورد.

دوایی جەندرمەکانی ئینگلیزیو پیاوەکانیان لاوی ئاواز نەبرد «حـەمـە مراد»ی جەلالیـان دەست کەوت و شەهیـدیـان کرد، دوابەدوای ئەوە هێرشیان بردە سەرماڵی شەهید «قاسمی ڕەسولی خدری» ئەویشیان شەهید کرد. وورده وورده ئەوەی شەهید کرا ئەوەی دەربـاز بوو، لەوانـەی هەلاتن « حاجی تایـەری حاجی صالحی» داروغەییو «عەدە قەوان» و «عبدالله خرە» بەرەو لای مەنگوران ڕۆیشتن لە ڕێگا لەگەڵ عەشیرەتی «گەورکان» تووشی شەڕێکی قورس هاتن «عبـدالله خرەو» تایـەر کۆیی» چوونـە ناو سەنگـەرێـك سەنگـەرەکـەیـان بە جێ نەهیشت تاکـو لەنـاویدا شەهیـد کران، ئێستـاش بەم سەنگـەرە دەوتـرێ (سـەنگـەری کۆیی‌یـان)، بەم جۆرە زۆربـەیـان لەناو چوون و دەربەدەر بوون بەلام بیـرو ڕایـەکـەیـان تاکـو ئێستـاش هەرمـاوە نەوکـانیان زۆر بەشـانـازیـیـەوە ناویـان دەبـەن و ڕێبینیـان دەکـەن. دوای پێشکـەوتنخـوازەکـان، داگیـر کەری ئینگلیـز بەربـووە گیـانی میللەت و دانانی باج و سەرانە، ڕۆژێك پیاوێکی دیندار دەچێتە لای جەنابی مەلای گەورەو پێی دەڵێ قوربان شەرع ڕێگا دەدا باج و سەرانـە بدەینـە ئینگلیـزی کافـر؟ جەنابی مەلای گەورش هێندیك دادەمینێو بۆی دادەمینێ لەبەر زیرەکیو حسابی ووردی خۆی، دەنا بەلای ئەوەوە وەلامەکەی زۆر ئاسان یووە، بە پیاوەگە دەڵێ بەیانی وەرەوە وەلامەکەت دەدەمەوە، لە هەمان ئێوارە جەنـابی مەلای گەورە بەپیـاسـە دچێتە لای قونگری سەرشاخان شوێنێکـە نزیـك مزگـوتی «حـاجی مەلا ئەسعەد» لەوێ تووشی حاکمی سیـاسی ئینگلیـزی دەبێو بانگی دەکـات و جوابـەزی دەکاتەوەو پێی دەڵێ «قسەیەکم هەیە دەمەوێ پێتی بڵێم بەلام ئەگـەر دەزانی توورە دەبی پێت ناڵێم «ئینگلیـزەکـە دەڵێ فەرموو بڵێ توورە نابـم» جەنـابی مەلای گەورەش دەفـەرمـوێ ئێـوە فەرمانتان داوە باج لە دانیشتوانی کۆیە بسێنن..؟ ئینگلیزەکە کە گوێی لەمە دەبێ هێندەیتر سوور دەبێتەوە توورە دەبێو ڕوو لە مەلای گەورە دەکات و دەڵێ بۆچ پێت ناخۆشە باج و سەرانە وەربگیرێ

بۆ دەوڵـەتی پایـە بەرزی بریطـانی؟ مەلای گەورەش وەلامی دەداتەوە دەڵێ ئەدی ئێوە پێتان خۆشە کورد بێ وولاتتان داگیر بکاو حاکمێك دابنێن باج و سەرانە لە میللەتی ئینگلیز وەربگرن؟ ئینگلیزەکە لە وەلاما دەڵێ نەخێر، جەنابی مەلای گەورەش دێتە وەلام و پێی دەڵێ ئێمـەش.. نەخێـر. بەرەو مزگـەوتـەکـەی دەگەڕێتەوە. بۆ بەیانی خاوەنی پرسیار دێتەوە لای جەانبی مەلا بۆ وەلامـەکەی، ئەویش لە وەلامـا پێـی دەڵی بە شەرع دورست نی‌یە سەرانە بەرێتە ئینگلیزو ئارەزووی خۆشتە.

بەم جۆرە ئینگلیـزەکـان بەربـوونـەتە گیانی دانیشتوانی کۆیەو هەموو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست.

سەرچاوەکان: -

1 - كاك «مـەلا تەهـای نانـەوا» کە خۆی لەنـێـو زۆربـەی ڕووداوەکاندا ژیاوەو ئێستاش لە ژیاندا ماوە.

2 - كاك «عبدالرحمن اسماعيل ڕەسول» بەمامە «ڕووتە» ناسراو.

3 - دەست نووسـەکـانی نەجیبـە خانی کچی جەنـابی مەلای گەورەی کۆیە

4 - چەند لاپەڕێك لە مێژووی گەلی کورد بەشی یەکەم د. کەمال مەزهەر.

5 - دور الشعب الكردي في ثورة العشرين د. كمال مظهر.

6 - هەردوو دیوانەکەی حاجی میرزا عبداللهی خادم.

7 - مێژووی شاری کۆیە بەرگی دووەم ماموستا طاهر احمد حوێزی.

8 - مامۆستای بەڕێز عبدالمجید نورالدین.

# بەراوورکردنێکی نێوان

زاری
کرمانجی خواروو
و

زاری
گەرمەسێر

ـــ «عبدالحسين بني‌ويس» ـــ

لە ژمارە (105)ی ئەم گۆڤارە «گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ» بەشی یەکەمی ئەم توێژینەوەیە بڵاوکرایەوە، وا لێرەدا بەشی دووەمی توێژینەوەکە پێشکەش دەکەم:

1 ـ بە پێویستم زانی ئیتر لەمەودوا لەباتی زاراوەی «زاری خانەقی و مەندەلی» زاراوەی «زاری گەرمەسێر» بەکاربێنم نەك بە هۆی ئەوەی کە زاراوەیەك بەم ناوو نیشانە هەیە یاخود بەمەوێ زاراوەی نوێ دروست بکەم، بەڵکو هەر تەنها بۆ کورت کردنەوەو ئاسان کردنی کارەکەی خۆم.

2 ـ دووبارە دەگەڕێمەوە بۆ سەر باسی گۆڕان و قرتاندنی دەنگەکان. هێندێکی کە لە دەنگەکان لە شێوەی گەرمەسێر دەگۆڕین یاخود دەقرتێن و گۆناکرین وەکو:

أ ـ گۆڕانی دەنگی «د»: هەر چەندە ئەم گۆڕانە لە شێوەی سۆرانی، بەتایبەتی لە شێوەی سلیمانی‌دا هەیە [بۆ نموونە «دال» لە شێوەی سلیمانی دەگۆڕێ و دەبێ بە «نگ» (چەند = چەنگ)] بەڵام لە شێوەی گەرمەسێر زۆرترەو دەبێ بە «یٚ»، ئەم نموونانە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: «فەرهاد = فەرهایٚ کادان = کایان، مەیدان = مەیان».

ب ـ دەنگی «ت» ئەگەر لەپاش دەنگی «س» بێ قەت گۆ ناکرێ وەکو:

«مەست = مەس. خەست = خەس. ماست = ماس. شەست = شەس».

حـ ـ هێندێ جار دەنگی «گ» گۆناکرێ و دەقرتێ وەکو: «سەنگین = سەین خەمگین = خەمین. ڕەنگین = ڕەین» لێرەدا دەبێ ئەوە ڕچاوە بکرێ کە دەنگی «ی» لەپاش دەنگی «گ»ە بۆیە گۆناکرێ، ئەگەر هیچی لەپاشدا نەیەت گۆدەکرێ وەکو:

ڕەنگ، سەنگ، و هەروەکو خۆی دەمێنێتەوەو گۆدەکرێ.

د ـ هێندێ جار دەنگی «وو» دەگۆڕێ و دەبێ بە «ی» وەکو: «قوتوو = قوتی، شووشە = شیشە».

هـ ـ دەنگی «ت» لە کەسی دووەمی تاك و کۆ دەگۆڕێ و دەبێ بە «د» بۆ نموونە:

«خۆت = خۆد.ماڵت = ماڵد، کارتان = کاردان. خۆشیتان = خۆشیدان».

و ـ هێندێ جار دەنگی «هـ» دەگۆڕێ و دەبێ بە «خ» بۆ نموونە: -

«هەویر = خەویر. هەڕی = خەڕی».

ز ـ هێندێ دەنگی «خ» دەگۆڕێ و دەبێ بە «ق» بۆ نموونە: -

«دووزەخ = دووزەق. یاخە = یەقە. خورشید = قورشید. شوخی = شوقی».

ح ـ هێندێ جار دەنگی «آ» دەگۆڕێ و دەبێ بە «ە» بۆ نموونە: -

«سارد = سەرد. چاو = چەو. یاخە = یەقە».

3 ـ پاشگری «او» لەگەڵ ڕیشەی فرماندا لە سۆرانیدا «أسم المفعول ناوی بەرکار» پێك دێنن، بەڵام لە شێوەی گەرمەسێر پاشگرەکە ئەمەیە «یاگ» و لەگەڵ ڕیشەی فرماندا دەبێ بە «أسم

المفعول = ناوی بەرکار» بۆ نموونە :

«رماو = رمیاگ. خوراو = خوریاگ. سوتاو = سوزیاگ».

4 ـ «ئـەو» پێشگـرێکـە لە شێـوەی گەرمـەسێردا لەگەڵ فرماندا دێت و دەیکـا بە فرمـانی فرێـری «Phrasal Verb» بۆ نمـوونە : ـ

«ئەو خوازْ هاتن» هاتنە خوارەوە.

ئەو بان چگن = چوونە سەرەوە. ئەو کار کەفتن = کەوتنەکار

5 ـ وەکـو لە بەشی یەکـەمی توێژینەوەکە روونمان کردەوە کە پاشگـری «یـل» ئامـرازی کۆکـردنەوەیە لە شێوەی گەرمەسێر، بەڵام ئەوە ناگـەیەنێ کە پاشگـری «آنە کە لە سۆرانیدا باوە لەم شێـوەیـەدا قەت بەکـار ناهێنرێ، نەخێر بەڵکو پێچەوانەوە زۆر بەکـار دەهێنـرێ و ئەم نمـوونـانـەی خوارەوە ئەوەمـان بۆ روون دەکەنەوە : ـ

أ ـ پەنـدێکی پێشینـان دەڵێ : «ماران پیوەدای لەبەن سیەو چەرمی رخی چوود».

ب ـ بەیتێکی فۆلکلۆری دەڵێ : «تاکەی بنیشم لە سای دیواران

زەنجیر لە گەردەن چوور گونا کاران»

حـ ـ بەیتێکی فۆلکلوری کە دەڵێ : «ئەوسا بزان نەماگە دەنگی دلێران

رێوی رابودگە لە جاگەی شێران»

6 ـ ئاوڵکـار: دیسـان لێـرەدا باسی ئەو ئاوڵکـارانـە دەکەین کە جیـاوازیـان لەگەڵ شێوەی کرمانجی خواروو هەیە، یان هەر لە شێوەی کرمانجی خوارووودا بەدی ناکرێ :

| سۆرانی | گەرمەسێر |
|---|---|
| سەرێ | بان |
| جێگە | جی |
| پێش | نوا |
| لەوێ | لەورە |

أ ـ هێنـدێ ئاوڵکـاری کات لە شێـوەی گەرمـەسێـر هەیەلە شێوەکانی تردا، بەردی ناکرێن وەکو: ,

1 ـ گوڵ سوو واتـا (شـەفـەق). (وەل گوڵ سووا چی). واتـا (لەگەڵ شەفەقدا رۆیشت).

2 ـ خۆر بان سویەر. واتا «ئەو کاتە لەپاش بەرز بوونەوەی خۆر لە ئاسماندا هەتا پێش نیوەرۆ». «خۆربان سویەر بوی و هێمان نەرەسی یە» واتا «خۆربان سویەربوو و هێشتا نەگەیشتووە».

3 ـ شام کەنیزان. واتا «ئەو کاتە لەپاش شێو هەتا پێش نیوەشەو».

«لە شام کەنیزان لە ماڵ دەرچی» واتا «لە شامی کەنیزان لە ماڵ دەرچوو».

4 ـ بانـا شەو «شـەوی ئاینـدە» «بانا شەو دەس کەیمە کار» واتا «شەوی ئاینە دەست بەکار دەکەین».

5 ـ فەرد بانا شەو. واتا «شەوی پاش شەوی ئایندە»

«فەرد بانا شەو نامەێگ نویسم» واتا «فەرد بانا شەو نامەیەك دەنووسم».

6 ـ دکوت شەوار. واتا «نیوەشەو».

«دکوت شەوار شام کرد» واتا «نیوەشەو شێوی خوارد»

7 ـ پگـا. واتـا «بـەوەختـەوە». «وە پگـا کەفتـە رێ» واتـا «بەوەختەوە کەوتە رێ»

ب ـ ئاوڵکـاری جێگـا : لێـرەدا تەنیـا باسی ئەو ئاوەلکـارانـە دەکەین کە لەگەڵ شێوەی سۆرانیدا جیاوازییان هەیە :

نموونەیەك لە رستەدا

«لەبان زەوی نیشتی یە» واتا «لەسەر زەوی دانیشتووە»

«لەی جی یە وازی کەن» واتا «لەم جێگایە یاری دەکەن»

«منا لەیل هاتن و دلێر لە نواوە بوی» واتا «مناڵان هاتن ودلێر لەپێشەوە بوو».

نوا بۆ کاتیش بەکار دەهێنرێ وەکو:

«لەنوایا قسەی خوەی کرد» واتا «لەپێشا قسەی خۆی کرد»

«لەورە سیەماڵ ئەڵدان» واتا «لەوێ رەش ماڵیان هەڵدا».

| | | |
|---|---|---|
| بەر | وەر | «لەوەر ماڵمان بەزم و شاییە» واتا «لەبەر ماڵمان بەزم و شاییە». |
| پاش | پشت | «باخەگە کەفێدە پشت ئاوای» واتا «باخەکە دەکەوێتە پاشەوەی ئاوایی». |

حـ ـ ئاوەڵکاری کات:

| سۆرانی | گەرمەسێر | نموونەیەك لە ڕستەدا |
|---|---|---|
| هێشتا | هێمان | «هێمان مەردمەگە نەڕەسینە واتا «هێشتا خەڵکەکە نەگەیشتوون». |
| پیرێ | پێرەکە | «پێرەکە هاتم» واتا «پێرێ هاتم». |
| پار | پارەکە | «پارەکە کەنم کاڵیم»واتا «پار گەنم چاند» |
| پێرار | پێرارەکە | «پیرارەکە بارکرد» واتا «پێرار باری کرد» |
| سبەینێ | سوو | «سوو سەفەر کەم»واتا«سبەینێ سەفەر دەکەم» |

د ـ ئاوەڵکاری چۆن و چەند:

| سۆرانی | گەرمەسێر | نموونەیەك لە ڕستەدا |
|---|---|---|
| وەکو | چوی | |
| | | واتا (پیری وەکو تای شەوانە ئازارم دەدا، ڕەنگ زەردو هەمیشە نەخۆشم». |

(پیری جوی شەو تەو مەیەی ئازارم
ڕەنگ زەرد وزایف دایم بیمارم)

(نمونەیەك لەڕستەدا)

| سۆرانی | گەرمەسێر | |
|---|---|---|
| | | چوی خەڵقم کردی سبحان عەظیم هەوا سەردو گەرم دنیا دێگە لیم واتا «چۆن خەڵقت کردن خودای مەزن، بای ساردو گەرمی دنیام لێ دەدا». |

| | | |
|---|---|---|
| وا، وەها | چونیە | «چونیە چەرمگە ئویشی وەفرە واتا «وەها سپی‌یە دەڵێی بەفرە». |
| دیسان | لەنوو | کویەنە زامانم زەرەی وەسووە وەختی کولێگەو چما لەنووە واتا «زاهانی تۆزێ بە ئێشە کاتێ دەکولێتەوە دیسان ئاگری تێ‌بەربێ |
| گەلێك | قەیرێگ | «قەیرێگ قسە هەس» واتا«گەلێك قسە هەیە» |
| با | بیلا | بیلا پیم بای هەرچگ رەزای بوود هەرچی پیمان بای کوللی وەرەزای توو واتا «با لێمان بقەومێ گەر بەرەزای خوا بێ، هەر چیمان لێ بقەومێ هەمووی بە رەزامەندی خودایە». |
| وەك | منێ | ئەو قەرە شرینە منێ‌وە گورجی فەرەنگ» واتا «ئەوەندە شیرین وجوانە وەك گورجی فرەنگە». |

7 ـ فرمانی رابردوو: لە بەشی یەکەمی ئەم تۆژینەوەیەدا باسی فرمانی رانەبردوومان کرد لێردا باسی فرمانی رابردوو و جۆرەکانی دەکەین و لەگەڵ شێوەی سۆرانیدا بەراوردیان دەکەین: ـ

أ ـ رابردووی سادە: ئەم جورە لە رابردوو هەر وەکو سۆرانی وایەو هیچ جۆرە جیاوازێکیان لە نێواندا نی‌یە هەر ئەوە نەبێ هێندێ راناو دەگۆرێ وەکو:

| سۆرانی | گەرمەسێر |
|---|---|
| من کەوتم | من کەفتم |
| تۆ کەوتی | ت کەفتی |
| ئەو کەوت | ئەو کەفت |

| سۆرانی | گەرمەسێر |
|---|---|
| ئێمە کەوتین | ئێمە کەفتیم |
| ئێوە کەوتن | ئێوە کەفتین |
| ئەوان کەوتن | ئەوان کەفتن |

ب ـ رابردووی نیزیك: ئەم کاتە تۆزێ جیاوازیی لەگەڵ ئەوەی سۆرانیدا هەیە:

| سۆرانی | گەرمەسێر |
|---|---|
| من کەوتوونم | من کەفتمە |
| تۆ کەوتووی | ت کەفتیدە |
| ئەو کەوتووە | ئەو کەفتیە |

| سۆرانی | گەرمەسێر |
|---|---|
| ئێمە کەوتووین | ئێمە کەفتیمە |
| ئێوە کەوتوون | ئێوە کەفتینە |
| ئەوان کەوتوون | ئەوان کەفتنە |

ح ـ رابردووی دوور: ئەم کاتەش تۆرێك جیاوازیی هەیە بە بوونەی پاشگری (بوو) کە لەگەڵ

ریشەی فرماندا ئەم جۆرە ڕابردووە پێك دێنێ واتا (ریشەی فرمان + بوو = ڕابردووی دوور) پاشگـــری (بـــوو) لە شێـــوەی گەرمـەسێـر بە (بــوی)یـــان (بـــی) گۆ دەکــرێ بۆیــە بە (خواردبیم، کردبیم) بەڵام چەند هۆزێك وەکو ئەرکەوازیو قەرەوڵس دەڵێن «خواردویم، کردویم».

| سۆرانی | گەرمەسێر |
| --- | --- |
| من کەوتبووم | من کەفتبیم (کەفتویم) |
| تۆ کەوتبووی | ت کەفتبید (کەفتوید) |
| ئەو کەوتبوو | ئەو کەفتبی (کەفتوی) |
| ئێمە کەوتبووین | ئێمە کەفتبیمن (کەفتویمن) |
| ئەوان کەوتبوون | ئەوان کەفتبین (کەفتوین) |

د ـ ڕابردووی بەردەوامی (هـەمیشـەیی): ئەم کاتـە لە شێـــوەی گەرمـــەسێـــر بەدی ناکـرێ. بەڵام پێشگـــری (پـەســـا) یان (وەپـــەسا) لەگـەڵ ڕابردووی سادەیا ئەم کاتەمان بۆ پێك دێنی واتا:

(پەسا + ڕابردووی = ڕابردووی هەمیشەیی).

| سۆرانی | گەرمەسێر |
| --- | --- |
| من دەکەوتم | من پەسا کەفتم |
| تۆ دەکەوتی | ت پەسا کەفتی |
| ئەو دەکەوت | ئەو پەسا کەفت |

| سۆرانی | گەرمەسێر |
| --- | --- |
| ئێمە دەکوتین | ئێمە پەسا کەفتیام |
| ئێوە دەکەوتن | ئێوە پەسا کەفتین |
| ئەوان دەکەوتن | ئەوان پەسا کەفتن |

ئامراز: ئامرازی ڕێزمان لە شێوەی گەرمەسێر زۆرە، بەڵام لێرەدا تەنها هەر باسی ئەوانە دەکەین کە جیاوازیان لەگەڵ شێوەی سۆرانیدا هەیە وەکو:

| سۆرانی | گەرمەسێر | نموونەیەك لەرستەدا |
| --- | --- | --- |
| ئێستا | ئێرنگە | واران ئویشی کەی کەم، ئیرنگە کەم واتا «باران دەڵێ هەر ئێستا دەبارم» «پەندی پێشینانە». |
| بۆیە | ئەرایە | ئەرایە بویل دام تا کوڕم لەماڵەیل نەخەفێ واتا «بۆیە پارەم دا هەتا کوڕم لە ماڵان نەخەوێ» «پەندی پێشینانە» |
| بۆ ئەوەی | ئەرایەگە | ئەرایەگە بتەو بوو بسمارێتر دە لێ واتا «بۆ ئەوەی پتەوتر بێ ، بسمارێکی کەی لێ دە. |
| بەڵکو | (شایەد، بەشکو) | نزا کەم شایەد نزام وەلای خودا برەسێ واتا «نزا دەکەم بەڵکو بگاتە لای خوا». |
| ئەگینا | ونە | ئەرات نەویاتا ونە من ئەی‌کارە نەکردم واتا «بۆ تۆ نەبوایە ئەگینا من ئەم کارەم نەدەکرد. |

# پیشەسازیی سابونی کوردەواری

ئامادەکردنی: ڕووناك محمود بۆمبا

پیشەسازی بە شێوەیێکی سەرەتایی و ساکار بۆ هێنانە دی ئەو شتانەی کە پێویستی ی ئادەمیزاد بون، لە کۆنەوە هەربووە، کشتوکاڵ و بەردتیژکردن لەلایەن ئادەمزادی کۆنەوە بۆ کاتی خۆی.

ڕاستە کە شۆڕشی پیشەسازی لە ئەوروپا، بزوتنەوەیێکی تازە بوو، وە داهێنانی ئامێرو هێزی بزوێنەر لە بەرهەمەکانی ئەم شۆڕشەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیشەسازی نەتەوەیی هەر لە ناوەندا بووە. جا ئێمە لەم مەودایەدا لە داهێنانی هێزی هەڵم و دۆزینەوەی هەندێك بیردۆزی فیزیاو داهێنانی کیمیا نادوێین، چونکە ئەمە پەیوەندی بە پیشەسازی گشتییەوە، هەیە، بەڵام من لێرەدا لە پیشەسازی نێو کوردەواری دەدوێم:

نەتەوەی کورد لە دێرکاتەوە پشتی بە شان و باهو و دەست ڕەنگینی خۆی بەستوە لە بەدەست هێنانی پێویستیەکانی ژیان، وەکو خواردەمەنی و جل و بەرگ و کاڵەوپێتاوو کەل وپەلی ماڵ و کەل وپەلی جەنگ و پێویستی دروست کردنی خانووبەرەو ڕایەخ و چەند لایەنێکی تری ژیان...

بۆ ئەم کارانە سوودی لە کەرەسەی خاوی خاکی کوردەواری وەرگرتووە وەکو ئاژەڵ و باڵدار بەخێوکردن سەرچاوەی سەرەکی شیرو بەرهەمەکانی و هێلکەو گۆشتیان بووە... جگە لەمە خوری و مووەکەی سوودی لێ بینراوە لە دروست کردنی بەرماڵی کوردی و جاجم و پۆیەشمین و مافورو تائێستاش ڕەواجیان هەیەو ناوبانگی دەرکردووە. ئەمە کاری جۆلاکانە...

لە موو خەراری شاش بۆ تووتن و خەراری سفت بۆ دەغڵ و دان بەرهەمی موتاپچیەکان بووە، کە هەندێ جار (مووتاوی)یان پێدەڵێن لە سولەیمانی و کۆیەو کەرکوك و هەمەدان و سنە باو بووە...

کەرەسەکە ژنان لە ماڵەوە بە تەشی دەیان ڕست و لە کارگەکاندا (موتابخانەکاندا) دەیان چنی... لەم دوو کەرەسەیە جل وبەرگی پیاوانە دروست دەکرا وەکو ڕانك و چۆغەو پەستەك و گۆرەویپوزەوانە... هتد

لە ناوچەی گۆران بەتایبەتی لقی هەورامان لە تەختەی دارگوێزو داربەروو قۆچی ئاژەڵ دەرگەو پەنجەرەو بێشکەو صندوق و شەش تەرخان و شەترەنج و نەردو قوتووی جگەرەو سەبیل و دەسکی چەقۆو کێردو قەڵەمیرو خەنجەری کوردی نایاب و ... هتد

دروست کراوە... پاشان چەخماخسازی لە کوردستاندا پێشکەوتوو بووە... (بەتایبەتی وەستاکانی سولەیمانی لە دەوروبەری فەرمانڕەوایی بابانەکاندا)...

کورد ووتەنی (تیغ هاوڕێ پیاوە) کەل و پەلی جەنگیان دروست کردووە وەکو شیرو تیرو تفەنگ... بەڵام بەناوبانگترین کارگە لە کوردستاندا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (پاشای کۆرە) دامەرزا لە ڕەواندز... هەر بەچەکی سووك نەوەستا بەڵکو چەکی قورس وەکو (تۆپ) یان دروست دەکردو وەستا ڕەجەبی ئیمارەتی سۆران لەم بوارەدا نێودارە. جگە لە قوری سوورەوەکراو

گۆزەو دیزەو تەنوور و قاپ و سوێنەو کوپەو کورە هتد...
دروست کراوە.

لە کانەکان مس و زیو و زەرد مەنجەڵ و قاپ و کەوچك و سینیو دەست شۆرو سەماوەرو پەرداخ و جام و... هتد کە بە نەخشیو نیگار وەیان نەخشاند، دروست دەکران...

لەم پیشەسازییانە، (سابون)ە لە هەموو شارەکانی کوردستان لە سەدەی هەژدەو نۆزدەدا سابوون لە شارو دێ، بەرهەمێکی ناوچەیی بووەو لە ماڵاندا دروست دەکراو کارگەی تایبەتیشی هەبووە... ئەو بنەماڵانەی کارخانەی سابوونیان هەبووە بە سابوونچی ناسرابوون.

هەر لەگەڵ ئاوەدان کردنەوەی شاری سولەیمانی پاشاکانی بابان بایەخێکی زۆریان بە دروست کردنی سابوون داوە، ئەوەبوو سابوونچیەکان هەموویان لە گەرەکێك کۆبوونەوەو ناوی گەرەکەکەیان نا (سابونکەران) ئەم ناوە تائێستاش ماوەتەوە.

وە نەبێت بەرهەمی سابوونی ئەم ماڵانە هەر بەشی شاری سولەیمانی ناوچەی سولەیمانیو کردبێت، بەڵکو بۆ گەلێك شوێنی کوردستان و دەرەوەی دەنێردرا، بازرگانەکان بەرهەمی ئەم ماڵانەیان دەکریو لە خانەکاندا کۆیان دەکردەوەو جا بە کاروان دەنێردرا بۆ بەغداو مووسڵ و حەڵەب و دیاربەکرو تەورێز... هتد

هەر ئەو کاروانانە لەو سەر لە گەرانەوەیاندا کووتاڵی بازرگانیو عەتر و شەکرو چایان باردەکردو دەهاتنە سلێمانی.

لە گەرەکی سابونکەران لە سولەیمانی ئەم ماڵانە بەناوبانگ بوون لە سابوون دروست کردندا کە پێیان دەوترا سابوونچی:

1 ـ ماڵی سەعیدی خەجەخان
2 ـ ماڵی تایەری خاڵە.
3 ـ ماڵی ئەحمەدی عزیز ئاغا.
4 ـ ماڵی حاجی کەریمی حەتەم
5 ـ ماڵی حەمەی رەسول،
6 ـ ماڵی حسێنی سەعەی میرزا
7 ـ ماڵی میرزا صاڵحی حەسەنی سابوونچی... هتد

ئەم کۆمەڵە ماڵە لە گەرەکی گوێژە ناونران سابونکەران وە ئەو راستە شەقامەی بەم ماڵانەدا تێ دەپەڕی ناونرا شەقامی سابوونکەران (تائێستا هەر بەم ناوە وەیە)

ئەو سابوونەی دروستیان دەکرد ناوی (بەزی) بوو لەم بەزییە گەلێ جۆریتری لێ دەردەهات لەم جۆرانە:

1 ـ قاڵب / بەکار دەهات بۆ خۆشتن
2 ـ لاپاروو ئەم دوو جۆرە بۆ جل شتن
3 ـ وورده بەکار هاتووە.
4 ـ سەرکەف / بۆ دەم و چاوشتن بوو (بە تایبەتی ئافرەت بە گشتی بەکاریان دەهێنا) تا ئەم ساڵانەی دوای ژنان بە کۆڵاناندا، دەگەڕان و دەیان فرۆشت و ژنان دەیان کڕی.

## ئامێری کارگەکە لە چی دروست کرابوو؟

ئامێری کارگەکە لە چەند بەشێك پێك هاتووە کە هەر پارچەی ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە:

1 ـ **تیان** / مەنجەڵێکی گەورەیە لە مس دروست کراوە لە شێوەی لولەك بەرزی (16) پێ بوو تیرەکەی (6 ـ 8) پێ بوو ئەم مەنجەلە کەرەسەی خاوی تێدادەکولێنرا (وێنەی 1)

**ماڵۆك** / ئەمە حەوزێکی بەخشت دروستکراوە بە چیمەنتۆ سواغ دراوە درێژایی (16) پێ بوو پانی (8) پێو قووڵایی (2) پێ بوو. کە کەرەسە خاوەکە لەناو مەنجەڵەکەدا باش دەکوڵا پلوسکێکی پێوەبوو لە خوارەوەی کە دەڕژایە ناو حەوزەکە (ماڵۆك) بۆتە شلەی سابوون لەم کاتەدا.

**کوورە** / ئەم کوورەیە بە خشت دروست دەکراو سواغ دەدرا بە چیمەنتۆو شێوەکەی بەرزی 6 پێبوو پانی بە ئەندازەی تیرەی مەنجەڵەکە (تیان) مەنجەلە مسەکەی لەسەر دادەنراو ئاگریان دەدا...

**مۆڵك**: حەوزێکە بە خشت دروست دەکراو، بە چیمەنتۆ سواغ دەدراو پانی 6پێبوو و درێژییەکەی 12 پێبوو لە شێوەی لاکێشەدا بوو، نیوەی حەوزەکە بە خشت پڕ کراوەتەوەو لەسەر قەراغی نیوەبەرزەکە بۆ سەر نیوە بەتاڵەکە، دوو مەرکانەی گەورە دانرابوو هەریەکەیان لە دامێنەوە پلوسکێکی پێوەبوو بۆ ناو نیوە بەتاڵی حەوزەکە (لەناو مەرکانەکاندا تیزاو هەبووەو لە پلوسکەکانەوە بەریان دەدایە ناو حەوزەکە) سەری دوو

مەرکـانـەکـەیـان بە دوو پارچـە لەوحی کون کون کراو نابۆوە (لە کونی هێلکە تۆزێك گەورەتر بوو) لە سەروو ئەم لەوحانەوە دوو مەرکانەی تریان دانابوو کە ژێری هەردوو مەرکانەکە کون کون کرابوون. بە دوو مەرکانەکەی سەرەوەیان دەووت (چۆرك) پاشان چوار دەوری مەرکـانـەی سەرو خواربـە چیمـەنتـۆ سواغ درابوو. سەیری وێنەی ژمارە (4) بکە.

(5) سێ بەرمیلی گەورەیان بەکار دەهێنا، ئەم بەرمیلانە ژمارەی دیاری کراوی خۆیان هەبووە 1 ـ 2 ـ 3 تیژاویان لە حەوزی ژێر قولکەکە هەڵدەهینجاو. دەیان کردە ناو ئەم بەرمیلانەوە، وە ژمـارەی دیـاریکـراو بۆ ئەوە بوو، تا بیـان زانیـایـە کامیـانیەکەم تیـژاوی تێـدایـەو کامیـان دووەم تیـژاوی تێـدایـەو کامیـان پاشە تیژاوی تێدایە.

چونکە بە پێی چۆنیەتی ژمارەکان تیژاوگرتوەکەیان دەکردە ناو مەنجەڵە گەورەکەوە، لە کاتی پێویستیدا

## کەرەسەی خاو بۆ دروست کردنی

ئەو کەرەسـە خاوانــەی بەکــار دەهێنــرا لە دروست کردنی سابـوونـدا (قلّێ، قسـل، پیـو، بەزی حەیـوان) بە گوێرەی ئەم پێوانە ئەم کەرەسانە بەکار دەهات

1 ـ سێ تەنـەکـە قسـل و (3) تەنـەکـە قلّێ تێکـەڵ بە یەك دەکران بۆ ئەوەی تیژاوەکەی لێ دەربیەنن.

2 ـ سێ تەنەکە پیو و (1) یەك تەنەکە چەوری (بەز) دەیان کردە ناو مەنـجـەڵـە گەورەکـەوە دەیـان کوڵانــد. . . . ئــەم سابـوون چیـانـە هەمیشە پەیوەندیان لەگەڵ قەصابەکاندا هەبووە لەبەر ئەوەی مامەلەی کرینی چەوریان لەگەڵدا بکەن. تەنانەت جگــەر فرۆش و کەبـابچیـەکـان و چێشتخـانـەکـان بەزەکـەیـان دەتوانەوەو لە تەنەکەدا بەم ماڵانەیان دەفرۆشت.

## ڕێگای دروست کردن

### یەکەم هەنگاو:

سێ تەنەکە قسڵیان دەرشتە سەر زەوىو ئاو پرژێنیان دەکرد (وەکو چۆن نانی کوردی تەڕ دەکەین) قسڵەکە دەست دەکات بە کزەکز کاتێك دەستیان هەڵ دەگرت لە ئاوپرژێنی وورده وورده لە کزەکز دەکەوت تا سارد دەبووەوە ماوەی سەعاتێك دەیان هێشتەوە

ـ پاشـان سێ تەنـەکـە (قلّی)یـان دەکـرد بەسـەر قسڵەکەدا، بە خاکەناز ئەم دیو و ئەو دیوی قسڵ و قلّیکەیان دەکرد تا بە باشی تێکـەڵ دەبـوون. . . دوویـارە بڵاویـان دەکـردەوە دەیـان کرد بە شێـوەی حەوزێـك و دوو سەتـڵ ئاویان تێدەکرد. . . دوای ئەوە وەك گومـەز قوچکـەیـان دەکرد ماوەی سەعاتێك دەیان هێشتەوە، پاشان بە خاکەناز دووبارە ئەم دیو و ئەو دیویان دەکرد تا تەواو ووشـك دەبـووەوە. . . ئینجـا دوویـارە دەستیـان دەکردەوە بە ئاو پرژانــدنیو تێکــەڵیـان دەکـردەوە بۆ ئەوەی تەواو قلّیو قسڵەکـە یەك بگـرن، دواجـار کۆیـان دەکـردەوە بە شێـوەی گومـەز دەیان هێشتەوە تا بەیانی. . .

بەیـانی دەمـەو مەلابـانـگ دان دەهـاتن بڵاویـان دەکردەوە بۆ ئەوەی لێــان روون بێتــەواو خۆی گرتـووە یان نەء. پاشــان بە خاکەناز وورده وورده دەیان کردە ناو (چۆرکەکەوە) مەرکانە بن کون کونەکە بە شێوەیێك کە نەپەستێورێ. . . دوای ئەوە دەیان هێنا بە ئاوگردان وورده وورده ئاویان دەکرد بەسەریا ئاوەکە دەبوو بە تیژاو لەناو چۆرکەکەدا بەرەبەرە دەهاتە خوارێ بۆ ناو قولکەکەو لەنـاو قولکـەکـەوە بەهۆی پولوسکەکەیەوە دەچووە ناو حەوزەکەی بەردەمی قولکـەکـە ـ پاشـان دەهـاتن تیـژاوەکـەیان لە حەوزەکە هەڵ دەهێنجاو دەیان کردە ناو بەرمیلی ژمارە (1) پاشان هەمان سات ئاویـان دەکـردەوە ناو چۆرکـەکـە تا دەبـوو بە تیژاو دەچووە حەوزەکــەوە دەیــان هێنــایــە بەرمیلی ژمــارە (2)و لێیـان پڕ دەکــرد. . . وە بە هەمــان ڕێگـا تیـژاوی تریـان لێدەگـرت وە بەرمیلی ژمـارە (3) یان لێپـڕدەکـرد بە تیـژاوی بەرمیلی ژمـارە (3)یان دەگوت «پاش ئاو».

## هەنگاوی دووەم:

(پـاش ئاو) تیــژاوی بەرمیلی ژمــارە (3) یان بە ئەسکـوێ دەکردە ناو مەنجەلە گەورەکەوە کزەکزی دەکردو مێرولەی دەکرد پاشــان ئاگــریــان دەدا تاوتـاو (چـونکـە کوورەی لەژێـردا بوو مەنجەلەکە) تا دەهاتە کوڵ ئینجا دەیان هێنا سێ تەنەکە پیو و تەنـەکـەیێـك بەزیان تێدەکرد. . . ئاگری تریان دەدا تا دەکەوتە قوڵپــدان بەرە بەرە تیــژاوی بەرمیلی یەکــەمیــان تێدەکــرد تا بەرمیلەکە تەواو دەبوو. . . پاشان کە دییان کەرەسە خاوەکان لە

مەنجەڵەکەدا حەل بوو وە کەمن کرد دوو ئاو گردان لە ئاوی بەرمیلی یەکەمیان گل دەدایەوەو لەم کاتی کەف کردنەدا تیزاوەکەیان کە بە ئەندازەی دوو ئاوگردان بوو دەکردە سەر تێکەڵاوەکە پاشان خەفەیان دەکرد تا ئاگری ناو کوورەکە دەبوو بە پشکۆ دەیان هێشتەوە تا بەیانی...

## هەنگاوی سێیەم:

بەیانی پێش مەلا بانگدان (2) بار داریتریان دەخستە ژێریو ئاگریان دەدا... سەیریان دەکرد گەر کەفی بکردایە (11) کیلو خوێیان تێدەکرد. پاشان تەواو کەرەسە خاوەکان تێکەڵ دەبوو وە شێوەی سابوونی وەردەگرت. پاشان بە دەم کولاندنەوە وردە وردە تیزاوی بەرمیلی دووەمیان تێدەکرد تا بەرمیلەکە تەواو دەبوو، پاش دوو سەعات لەسەر ئاگرەکە دەمایەوە پاشان بە ئەسکوێی کاشیکی بچووك لە گڵ دروست کراو (سیرامێك). وورد وورد لە مەنجەڵەکە دەریان دەهێنا بە ئەسکوێ گڵەکە فویان لێدەکرد تا سارد دەبووە وە ئەگەر بیان دیایە بە ئەندازەی موستیلەیەکی دروومان ئاوی دەرخستایە هەندێ خوێ تریان دەکردەوە ناو مەنجەڵەکە جارێکیتر داریتریان دەخستەوە ژێر تا بەتەواوەتی دەکولا تا کەرەسە خاوەکان یەك بگرن دەیان هێشتەوە تا دوای بانگی چێشتەنگاو... پاشان سەریان لە مەنجەڵەکە دەدایەوە ئەگەر کەفی تەواوی بکردایە..

دەستیان دەکرد بە کەف گرتن و دەیان خستە ناو کاشی گڵی پچووك پچووکەوە شەو و رۆژێك دەیان هێشتەوە تا تەواو سارد دەبووەوە ئینجا لە کاشیەکان دەریان دەهێنا دایان دەنا تا وشك دەبوووەوە پیان دەووت (سەرکەف)... شێوەی گومەزی کاشیەکانی وەردەگرت...

لە دەمەوئێوارەدا جورنەی مەنجەڵەکەیان بەردەدایەوە ناو ماڵوکەکە تا پڕ دەبوو بە پێی قولایی دە (10) گرێ. دەیان هێشتەوە لەناو ماڵوکەکەدا تا بەیانی بۆ ئەوەی ساردبێتەوە...

بەیانی هەڵ دەسان بە کێردێك بە شێوەی لاکێشە شوشەیەکیان لێدەبری سەیریان دەکرد ئەگەر دەمی کێردەکە ئاوی پێوەبووایە دەستیان لێ هەڵ دەگرت بۆ ئەوەی باشتر ووشك بێتەوە... چونکە ئەگەر تەربوایە نەیان دەبڕی لەبەر ئەوەی قاڵبەکان کە دەبڕن خوارو خێچ و قوپاو دەرنەچێت.

ئەو پارچە پارچە بە شێوەی لاکێشە کە دەیان بڕی پێیان دەووت «شووشە»

لە دوایدا گەر بیان زانیایە تەواو بۆتەوە دەستیان دەکرد بە بڕینی بە شێوەی لاکێشە...

پاشان یەك یەك دەریان دەهێناو لەبەر دەمی ماڵوکەکەوە ریزیان دەکرد... ئینجا دەهاتن وردە خۆڵی قسڵ و قڵیبەکە کە دەمایەوە بە تەنکی دەیان کرد بە ناو ماڵوکەکەدا ئامادەیان دەکرد بۆ جاری دووەهەم کە سابوونیتریان دەکولاند. بڕوانە وێنەی ژمارە (5) چۆنیەتی بڕین.

پاشان کچ و کوڕو ژن و پیاوی دراوسێکان دەهاتن بە هەرموەزی دەستیان دەکرد بە گواستنەوەی قاڵبە بڕراوەکان کە پێیان دەووت (شوشە) بە دەم گۆرانی فۆلکلۆرییو گاڵتەو گەپ و دەنگەدەنگە و یارییو مەزاقەوە بۆ سەربان ژن و پیاو پێکەوە بە دڵێکی پاك و خاوێنەوە بەدەم بەستەی خۆش خۆشەوە دەیان دایە دەست یەك تا دەیان گەیاندە سەربان... تا دوو شەوو دوو رۆژ لە سەربان دەمایەوە تا ووشك دەبووەوە ئنجا بە شێوەی قاڵب دەیان بڕی و ئەمسەرو ئەو سەری جەمسەرەکانی بە جیا دایان دەنا پێیان دەووت (لاپارو)... بەهەمان هەرموەزو کەیف و بەزم لەسەربان دادەگیرایە خوارەوە بڕوانە وێنە ژمارە (6). پاشان لە حەوشەی ئەو ماڵە رایەخیان دادەخست و سەماوەریان دەم دەکردو دەست دەکرا بە نان و قاوەڵتی سازدان لە گوشت و گون و گورچیلە برژاندن و کولێر بە چزڵێکیان دروست دەکرد [لە (دووگە) دروست دەکرێت] پاشان نۆشیان دەکرد.

تێبینی: / ئەو چەوریەی قەسابەکان دەیانارد بەزەکەیان لێ جیا دەکردەوە بۆ سابونەکەو گوان و گوشتەکەیان جیادەکردەوە بۆ برژاندن وە دووگەکەیان هەڵ دەکروزان بۆ کولێرە بە چزڵێك.

لەپاش حەوانەوە سابوونەکەیان دەخستەسەر (مێرتەبەق) دەیان بردە دوکان بۆ فرۆشتن یان دەیان گێرا بە کۆڵانەکاندا...

لەپاش گەڕان و لێکۆڵینەوە لەسەر پیشەسازی سابوون لە گەڕەکی سابوونکەران لە سولەیمانی وە بە یارمەتی کاك (علی صالح) کە فەرمانبەرە لە (ئالات و عودەد) لە سولەیمانیو کچەکەی (ڤینوس علی صالح) کە قوتابی خۆمە لە پۆلی شەشی زانیاری توانیمان ئەم باسە لەسەر پیشەسازی سابوون کۆبکەینەوە هیواداریـن جیێ رەزامەنـدی گشت لایەك بێت و هەر بە سەلیقەیەك لە ناوچەی خۆی پیشەسازی سابوون بەشێوەیەکیتر کرابێت یا جۆرێکیتریان هەیە لە سابوون ئەو ئەرکە بخاتە ئەستۆی خۆیو دوابەدوای ئەم باسە زیاتر روونی بکاتەوە.. بۆ ئەم گۆڤارە ئازیزەی بنێرێت... وە ئەگەر ئامێرێك یان کەل ویەلێکی کارگەی سابوونیان لاماوە با بینێرن بۆ موزەخانەی فۆلکلۆری لە سولەیمانی یان شارەکانیتری کوردستان با بە گشت لایەك یارمەتی مانەوەی بدرێت.

شوراتەکان لەو پارتانەی کە زۆرانبازیان لەسەر خەلافەت دەکرد هەڵوێستێکی تەنیاو چاکیان هەبوو، هەر ئەوان بوون خەلافەتیان وەك ناموس یان ماف نە دەهاتە بەرچاو، لەبەر ئەوە نەیاندەپرسی کێ لەم مافە یاخود ئەو ناموسە دەپرسێتەوەو خەلافەت پێش ئەوە کەوتوە کە ببێتە شتێکی رەوا. هەروەها پێش ئەوەش ببێتە ئیمتیازێك، بە دووای ئەوەدا دەگەران کەی خەلیفە لە رێگەی موسوڵماناندا هەڵەدەکات و تاوان دەکات بۆ ئەوەی لای ببەن و بیکوژن ئەگەر شایەنی کوشتن بوو، بەدوای ئەوەدا نەدەگەران کێ بەدوای خەلافەتدا دەگەرێ چونکە هەموو موسوڵمانێك لەبەر ئەوەی کە بێ یارمەتی دەتوانێ ئەو کارە بە هەموو گرانیەیەکی‌یەوە بەڕێوەبەرێ مافی ئەو شوێنەی هەیە.

لەبەر ئەوە دەبینین شیعری سیاسی شورات هەر پارتێکی کە شان بەشانی ببینرێ ئەو لە خۆیدا جیاوازە، بەرهەڵستکاری لای یەك پارچەیە چونکە بەرهەڵستکاران بە لایانەوە خەلافەت لەسەر ئەو بنەرەتە تێگەیشتبوون کە بنەرەتی تێگەیشتنەکەی سەبارەت خەلافەت بە تەواوی دەگۆڕێو شیعری سیاسی شوراتیش ئەوە ناگەیەنێ کە جیاوازی بکات لە نێوان زەیدیو ئەمەوی یاخود شیعە سەبارەت بە تێگەیشتنی خەلافەت یاخود لە راستی بانگەوازەکەیان بکات، چونکە هەموو ئەمانە بەلایەوە هەڵەن لە نوێنەرایەتی کردنی ئەو واتەیەدا هەموویان کافرن و جیاوازی لە نێوان یەکێکیان و یەکێکی‌کەیاندا نیە.[63]

بەڵام شیعری شورات نایەت باسی خەلافەت بکات، ناشیەوێ کە دەقێکی سەرنجی خۆی دەربارەی دەربڕێ. ئەمەش ئێمە لە رێگەی توێشاهتنیەوە لەو باسەدا تێ دەگەین و لە چوارچێوەی وێنەکردنی ئەو رووداوانەوە تێ دەگەین و شی کردنەوەی ئەمەش کەمە، شوراتەکان خەلافەتیان بەو گەورەیی‌یەوە نەدیوە کە پارتەکانی کە شەریان لەسەر دەکرد بگرە ئەوەی کە لە شیعرەکانیاندا باسیان کردووە پێش هەموو شتێ ئاین خۆی بووە، ئەم ئاینە خایاندیو سوور بوون لەسەر پاراستنی تا کۆتایی، هەندێ جار لە ناخۆشیشدا کە جیاوازی بنەرەتیان بوو لەگەڵ علی کوری ئەبی طالبدا، باوەڕیان ئەوەبوو کە علی بەپێی ئاین رەفتاری نەکردووە یاخود کفری کردووەو دوژمنەکەی ون کردووە بە کافریان دانا، دوایی بۆ خۆیان یەکێتی‌یەکیان داناو ئەوەی دەرەوەی ئەم یەکێتی‌یە بوایە بە کافریان دادەناو ئەوجا لە کاروباری خەلافەتدا ئیشی بکردایە یاخود ئیشی نەکردایە.

ئەوەی کە لە شیعری شوراتدا بە گرنگی‌یەوە تێبینی بکرێ کە وێنەی پارتێکی سیاسی دەکێشێ کە شتێك جیا ناکاتەوە لە سەرنجی ئەو پارتە کە بەرامبەر خەلافەت دەیدەن و بریاری ئەوە نادات چۆن ئەو سەرنجە خۆی لە سەرنجی هەموو پارتەکانی‌کە - نایابتر بوو، بگرە ئەوە بیرو باوەڕێك بوو لە بیروباوەڕەکانیان بریاری لەسەر دەدا، هەروەها ئەمە لای عمران هەبوو، ئێمە لەو شتانەی کە دەمانەوێ دەستمان بکەوێ ئەوەی دەستمان کەوتووە لە مێژوودا بنەرەتی تواناداری شیعرەکەیە، چونکە شیعری خارجی وێنەی هەستی شوراتەکان بەو بیرو باوەڕانە بە هەستداری‌یەکی بە هێزەوە دەکێشێ، ئەویش شیعرەکە باسی هەست و گوزەرانیان دەکات... لەسەر شەهیدەکانیان دەروات و باسیان دەکەن، سەرنجیانە بەرامبەر سزای دوارۆژ و ئەم سزایە ئەنجامی چی دێتە پێشێ، شیعرێك وێنەی نەتەوەیێك دەکێشێ کە ئەم جیهانەیان بەو جیهانەی کە گۆڕیوەتەوەو دڵنیاش لەوەی کە ئەم کارەیان بردۆتەوە، شیعری شورات درێژ بووەوەی ئەو گیانە موسوڵمانێتی‌یەیە کە پێش موسوڵمانی گیانێك بوو باوەڕی تەواو بوو بەو بیروباوەڕەی کە یادی شەهیدەکان دەکاتەوەو هەواڵەکانیان هەمیشە دەگێڕێتەوە بۆ کاری ئەوە دنیایان.

لەم کۆڵینەوەیەماندا لە وێژەی شوراتەکاندا دەرمان خست کە ئەم وێژەیە راسترین نموونەی بەشی کۆمەلایەتی حزبەکەیەو ئەمەش هەر وەك ئەو وێنە کێشانەیەتی کە بۆ یەکێ لە لایەنگیرەکانی دەیکێشی لە تەنیشت گشت باوەڕهێنەکانەوە ئەگەر نموونە بەرزە ئایندارییەکەیان لەم باوەڕەدا هەواڵی گێڕانەوەی زۆری تێدا بوایە شیعری شاعیرەکانیان لە نێوان ئەو هەواڵانەدا شان بەشانی هەموو ئەو شوراتانە وردترین و راسترین وێنەکێشانە چونکە ئەو شوراتانە بەشێکن لە گشت باوەڕهێنەرانی باوەڕەکە.

پێش ئەوەی باسەکە تەواو بێ دەبێ پەنجە بۆ لایەنێ ... وێژەکەیان رابکێشین کە بریتین لەو نامانەی کە لەگەڵ دوژمن یاخود لەگەڵ فەرما... نکاری خۆیاندا ئاڵوگۆڕیان دەکرد، لەگەڵ هەندێ پارچە شیعردا کە ئەو شوراتانە نووسیویانە لەوەو پێش ناگەنە ئەوانەی کە ناومان بردن بۆ ئەوەی بیروباوەڕەکانی ئەوباوەڕەو لایەنگیرەکانی بزانین.

لەو دەمانەدا کە جەنگ رادەگیرا شتی خۆشی وێژەی رووی دەدا، لە ساڵی 68 کۆچیدا کە شوراتەکان لەگەڵ مەهلەبدا بۆ ماوەیەك جەنگیان راگرت دوو سەربازی مەهلەب لەسەر ئەوە کەوتنە ناکۆکی‌یەوە ئایا جەریر یاخود فەرەزدەق شاعیرترە، کەنەگەیشتنە ئەنجامێك چوونە لای مەهلەب و لێیان پرسی ئەویش پێی وتن من هیچ ناڵێم بەڵام ئەوەی سەرنجم رادەکێشن دوو کەسن هەردووکیانیان هێناو رایان گرتن، عبیدەی کوڕی هلالی کە لە سوویاگەی قەتەری بوو، رمەکەی بەدوای خۆیەوە رادەکێشا وای دەزانی بۆ شەڕی بەرامبەری بانگیان کردووە، دوو سەربازەکە پێیان وت: فەرەزدەق شاعیرترە یاخود جەریر، وتی خوا بەڵا لە ئێوەو لەوانیش بدات. وتیان: حەزدەکەی پێمان بڵێی بۆ ئەوەی جێت بێڵین، وتی کی دەڵێ: (64)

**وطوى القياد مع الطراد بطونها**
**طى التجار بحضرموت برودا**

وتیان ـ جەریر ـ وتوویەتی ـ وتی دە ئەویان شاعیرترە.

کاتێ شوراتەکان بە کوشتنی مەصعەب کوڕی زوبێریان زانی مەهلەب و لایەنگیرانی پێیان نەزانیبوو شوراتەکان پێیان وتن، دەربارەی مەصعەب دەڵێن چی، وتیان ئیمامێکی رێ نمایی‌کارە، شوراتەکان وتیان دەربارەی عبدالملك دەڵێن چی، وتیان خراپەی زۆر کرد... دوای دوو رۆژ کە مەهلەب بە کوشتنی مەصعەبی زانی‌و خەڵکی عیراق دەنگیان بۆ عبدالملك داوە.

کە هەردوو سوویاکە لە جەنگ وەستان شوراتەکان پرسیان، دەربارەی مەصعەب چی دەڵێن، دەستەکەی مەهلەب وتیان پێتان ناڵێین، شوراتەکان وتیان دەربارەی عبدالملك چی دەڵێن؟ دەستەکەی مەهلەب وتیان ئیمامێکی رێنمایی‌کارە.. شوراتەکان وتیان ئەی دوژمنانی خودا دوێنێ خراپە کارو خراپ بوو ئەمرۆ ئیمامێکی رێنومایی‌کارە، ئەی کویلەکانی ئەم دنیایە بەڵای خودا لێتان بدا.

ئەبو فەرەج لە نووسراوی (الأغانی)دا دەگێڕێتەوە شوراتەکان لە جەنگی مەهلەب و قەتەریدا سەردەکەون و لەناو خۆیاندا سەبارەت کاری ئاین و شتی کە بەهێمنی‌و بێ‌دەنگی بێ‌ئەوەی دەنگ لە راستی یەك بەرزکەنەوە دەیانپرسی.

هەروەها دەڵێ: عبیدەی کوڕی هلالی شورات ئەگەر خەڵکی شەڕیان بکردایە بانگی دەکردن ئەی دەستەی مەهلەب (باهەندێکیتان بێن بۆ لام) لە سوویاگە کە دوو لاو دەهاتنە دەرێ پێی دەوتن کامیتان پێ خۆشە قورئانتان بۆ بخوێنم یان شیعرتان بۆ بخوێنمەوە، ئەوانیش پێیان وت قورئان وەکو تۆ (دەزانین) بەڵام شیعرمان بۆ بخوێنەرەو، ئەویش دەڵێ ئەی پیسینە.. بە خودا زانیم شیعر پێش قورئان هەڵدەبژێرن و ئەم جا کەوتە شیعر خوێندنەوە تا تاقەتیان چوو.

کاتێ باوکی حوثرە (ئەمە یەکەم کەس بوو کە دوای کوشتنی علی هات بۆ ئەوەی کوڕەکەی والیێبکات واز لە شورات بهێنێ، حوثرە پێی وت (بابە) بە خودا من ئەم قسانەی کە دەیکەیت هەمووی لە مستۆی رمدا رەنگیان داوەتەوەو ئەمە لەو دەمەدا بوو کە باوکی دەیویست کە کوڕەکەی حوثرە بهێنێ بۆ لای حویرەی کوڕی‌و دڵی پێ نەرم کات. (65)

مرداس تێکۆشەرێکی ناسراوو بەناوبانگ بوو بە جۆرێ خواپەرست و ئاین پەروەر بوو شیعەو موعتەزەلەکان بە یەکێ لە خۆیانی دادەنێن و رێزی لێ دەگرن.

مستورد زانراوو پارێزراوە، لەوانەش دەڵێ: (ئەگەر زەوی بە هەموو شتێکەوە هی من بوایە، داوام دەکرد کە هەڵەیێکم لێی دەست کەوتایە کە نەم کردووە). (66)

مستورد ساڵی 43 کۆچی لە کوفە هاتۆتە دەرێ‌و نامەیێك بۆ سەماکی کوڕی عبیدی عەبسی کارگێڕی مغەیرە دەنووسێ کە لە مەدائن دەبێ‌و دەڵێ:

(لە عبداللەی مستوردەوە میری باوەڕ هێنەرانەوە بۆ سەماکی کوڕی عبید ـ لە ئەحکام و وەستاندنی سنوورو بەرامبەر کۆمەڵەکەمان ستەم و خراپەمان کردوو. ئێمە بانگت دەکەین بە پێی قورئان و رێڕەوی پێغەمبەرەکە (د. خ)و ئیمامەتی ئەبو بەکرو عمر (خ. ل. ر)و شوێن نەکەوتنی عثمان و علی بێت کەوا لە ئاین لایانداو نەیانهێشت بە پێ قورئان ناو بڕی بکرێ، ئەگەر پەسەندی بکەیت ئەوا هەستت بە باشی کردووەو ئەگەر پەسەندیشی نەکەیت پاکانە بۆ تۆیەو رێگەی جەنگ کردنت لەگەڵدا دەگرین و بۆ قازانج نەفرەتت لێ دەکەین چونکە خودا ناپاکەکانی خۆش ناوێ. (67)

شەبیب نامەیێکی بۆ کوڕی ئەشعەث نارد داوای لێ دەکات کە جەژن نزیك بۆتەوە ڕۆژانی جەژن هەردوولا جەنگ بووەستێنن، ئەگەر دیتان بەڵێنمان بدەنی تا ئەم چەند ڕۆژە تێ دەپەڕێ ئەوا باشە) کوڕی ئەشعەث ئەم پێش نیارەی بە باش زانی.

شۆزەبی شورات نامەیێکی نارد بۆ عمری کوڕی عبدالعزیز وەڵامی نامەکەی ئەو داوای لێ دەکات کە عمر ڕێگەی بداتێ بچێ چاوی پێ بکەوێ موجادەلەی لەگەڵ بکات، ئەویش ئینسافی نواندو دوو پیاوی نارد بۆلات بۆ لێکۆڵینەوەو سەرنجەکانت.

عبداللّٰهی کوڕی یەحیا لە یەمەن چەند نامەیێك بۆ دەستە ئیباحیە دەنووسێ‌و بەتایبەتی دانیشتوانی بصرە بۆ یاخیْ بوون هان دەدات. دەستەکەی لە بصرەوە ئەم وڵامەیان دایەوە ـ

(ئەگەر توانیت ڕۆژێك دانیشی بیکە چوونکە دەست پێ‌کردن بەکاری چاك باشترە)، نازانیت کەی کاتی گیان کێشانت دێ، خودا خودا پەرستی چاکی دەبێ، بۆ سەرخستنی ئاینەکەی ئەگەر ویستی دەیان نێری‌و نەشی ویست ئەوا شەهادەتی دەداتێ.

نافعی کوڕی ئەزرەق بۆ شوراتەکانی بصرە نامەیێکی ناردو داوای جیهاد کردنیان لێ دەکات لە یەکێ لە نامەکانی واهاتووە: خودا ئاینەکەی بۆخاوێن کردنەوە، بە موسوڵمانێتی نەبێ نامرن و بە خودا ئێوە دەزانن کە شەریعەت یەکێکەو ئاین لە جەرگەی کافراندا پایەیێکی گەورەی هەیە، شەوو ڕۆژ ستەم دەبینن و خودا داوای جیهادتان لێ دەکات.

وتی هەرچی کافرە شەڕی لەگەڵ بکەن و چۆنی دەتوانن بارگران و بارسووك وەرنە مەیدان.

بگرە پاکانەی لاوازو نەخۆشەکان ئەوانەی هیچیان نیە خەرجی بکەن و ئەوانەشی کە دانیشتنی بۆ زانیاری‌یەکەیەتی‌و دوایی چاکەی لەگەڵداکردن لەگەڵ ئەو مجاهدانەدا وتی: (ئەوانەی کە باوەڕهێنەرو گۆشەگیرن ناگەنە ڕیزی ئەوانەی کە خاوەن زیانن و ئەوانەشی کە لە ڕێگەی خواپەرستیدا تێ دەکۆشن) هیچ لە دنیا دڵ نیا نەبن و کاری بۆ نەکەن چونکە دنیا مەڵبەندی سەرخۆشان و بێ‌هۆشانەو نابێ پێ‌ی لەخشتە بچین.

چێژەکەی وەك نەفەسی جگەرەوایەو نامێنی‌و خۆشیشی دەروانێ و حفت بالسهوان افترارا واظهرت صبره وأضمرت عبره؟[68]

کاتێ کە نەجدەی کوڕی عامر بینی کە نافع غەعدەی بەکافر داناوە نامەیێکی بۆ نووسی.[69]

(بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان ـ دوای ـ پەیوەندی من بەتۆوە وەك باوکێکی بە بەزەیی‌و برایەیێکی بەربەروایە، خودا لەسەرزەنشتی خەڵکی بە دوورت کات و یارمەتی ستەمکار نەبینی، کە خۆت بۆ پەرستنی خودای خۆت کردە شورات بۆ ئەوەی بچیتە بەهەشتەکەیەوەو بەڕاستی ئەهریمەنت دەکات بە کوڵکەوەو کەس لە تۆو لەلایەن گیرانت زیاتر بارێکی گران نابن بەسەر ئەهریمەنەوەو ئەوەی کە هەتەو بابیت دەکات ئەگەر وازی‌لێ‌بێنیت و لەوانە خۆش بوویت کە خودا لە قورئاندا بەخشیونی ئەوانەی کە موسوڵمان و دانیشتوون و چاریان ناچارە خودای مەزن وای‌فەرمووەو قسەکەشی ڕاستەو بەڵێنەکەشی ڕاستەو هیچ پێچ وپەنای تێدانیەو ڕوون و ئاشکرایە چونکە (ئەوانەی لاوازن و ئەوانەشی کە نەخۆش ئەوانەی کە هیچیان نیە خەرجی بکەن ئەگەر گوێیان لەئامۆژگاری خوداو پێغەمبەر گرت سەرزەنشت ناکرێن). ئەوجا کوشتنی منداڵت مفت کرد پێغەمبەر (د. خ) کوشتنیانی نەویستووەو فەرموویەتی (ولاتزر وازرةٌ وزر اخری) لە ڕاکەتا بینیم کە ئەمانەت نادەیتەوە بەو کەسەی لەگەڵتا نەبێ‌و خودا فرمانت پێ‌دەدات کە ئەمانەت بگەڕێنیتەوە بۆ خاوەنەکانی‌و تەماشای خۆت بکە).

ئەوەی کە قەتەری کوڕی فجائە بۆ حەجاجی کوڕی یوسفی دەنووسێ دەڵێ:

سڵاو لە ڕێ‌نومایی کردنی بێ هی ئەو گەورانەی ئاینی خودا دەپارێزن لە زەبروزەنگی دەترسن، سووپاس بۆ خودا کە ئاینەکەی خۆی بۆ پیاوخراپان ئاشکراکردوو لە خراپە ڕزگاری کردن و ڕێی نەدا کە مافی بخوێت. لە ساڵی 76ی کۆچیدا صالحی کوڕی مسرح لە موسڵ و جزیرە یاخی بوو (خۆی لە منویەکانە)و هانی لایەنگیرەکانی خۆی داو ئەوەی خوارەوە نامەی شبیب ی کوڕی یەزیدە بۆ صالحی دەنووسێ کە لایەنی بگرێ.

(دوایی تۆ پیری موسوڵمانانی‌و ناتوانین هیچ کەسێکی کە بە هاوشانی تۆ دابنێین، بانگت کردم و منیش بە پیر بانگەکەتەوە هاتم، ئەگەر دەتەوێ ئەمەش دوابخەیت ئەوا ئاگادارم دەکەیت و پیاوان دێن و دەچن، کە من دژی ستەمکاران جیهاد

دەکەم شانازی ناکەم، ئای کە شتێکی چاکەو ئای کە چاکەیێکی بە چێــژە، خودا وای لێ کردین لەگــەڵ ئێــوەدا ئەوانــە بین کە دەیانەوی بە پەلە بگەنە دیوانی خوداو بە هەشتەکەی. (71)

شبیب ئەم وڵامەی صالح وەردەگرێتەوە.

ئەو ئامـادە بوونـەی کە هەمـە تەنیـا چاوەروان کردنی تۆ نەبێ هیچ شتێکی‌تر نیە رێگەم لێ بگرێ فەرموو وەرە لامان، ئەو کاتە بمانبە بۆ لای ئەو کەسەی کە بێ ئەو هیچ کارێ ناکرێ‌و خوات لەگەڵ بێ ()

ئەو نامـانــەی کە پەنجـەمـان بۆ کێشـان نەمـانتـوانی زۆری نامەکانی شوراتمان دەست کەوێ رۆژگارو کارەساتی جۆربەجۆر شاردوونیەتیەوە.

ئەم نامـانـەش رەوان بێـژ ی‌و ناسکی‌و واتـە بەرزی‌و روونـاکی مەبەست وردو گونجاو ئەمانە گشتی بیری ئەو سەردارانەمان بۆ روون دەکەنەوە کە سەرکردەی شوراتەکان بوون و ئەو فرمانانەی کە بە لایـەنگیـرانی خۆیـان و ئەو بەڵگـەو گفت و گۆیـانـەی کە لەگەڵ دوژمنەکانیاندا کردوویانە.

وێـژەی شوراتـەکـان باشتـرین شتـە کە دەربـری باوەری ئەو خەڵکە بێ جا ئایا ئەمەش بە شیعر بێ یاخود بە نامەی ئاڵ وگۆر کراو ئەم وێژەیەی شوراتەکان بە وێژەی مردوو ناوبراوە ئەمەش وەك سەر زەنشت کردنیان بە مردن لە رێی باوەرو بیرو راکەیاندا.

پێش ئەوەی لە وێژەی شوراتەکاندا بگەینە کۆتایی دەمانەوێ پەنجــە بۆ هەنـدێ لەو نامـانــە بکێشین کە لە نێـوان سەردارانی شورات و خەلیفەکانی سەرەتای دەوڵەتی عەباسی رابکێشین بۆ ئەوەی سەبــارەت سەرنـجـی سیــاســی‌و ئاینیــان شتی بزانین و لەوانەش دەرکەوتووترین نامە ئەو نامەیەی ئەبو حەمزەی شوراتە کە بۆ هارون الرشیدو نامەی عبدالسلامی شوراتە کە بۆ مەهدی خەلیفەی عەباسیان نووسیووە.

سەردەمی رشیـد لەو سەردەمـانـەیـە کە بزوتنەوەی شوراتەکان پەرەی سەندبوو شۆرشەکانیان زۆر بوو گەلێ لای جۆربەجۆری خەلافــەتی عەبـاسی گرتبـۆوە، مەحصـەمی شورات لە موســڵ ساڵی 171 کۆچی‌و فضـلی شوراتی لە ــــــــــ ساڵی 176 کۆچی‌و وەلیدی کوری طەریفی شاری لە سجستان ساڵی 179 کۆچی‌و خراشــەی‌شیبـانی لە جزیـرەی سەر فورات ساڵی 180 کۆچی‌و عبدالسلامی شوراتی لە ئامەد ساڵی 187 کۆچی شورشیان بەرپاکردوو خەلیفە هارون رشید بە هۆی زۆر بوونی شوراتــەکــان و یاخی بوونی شوراتــەکـانی موسڵەوە ناچـار بوو شوراکەی موسڵ سـاڵی 180 کۆچی بروخێنێ.

## بزوتنەوەی حەمزەی کوری عبداللەی کوری ئەزرەقی شاری

دۆکتور فاروق عمر فەوزی نموونەی هەندێ نامەی ئاڵوگۆری نێـوان هارون الـرشیـدو حەمـزەی کوری عبـدالله کوری ئەزرەق هێنـاوەتـەوە کە حەمـزە به دەرکەوتووترین ئەو سەرداره شوراتانە ژمێرراوە کە لە ودەمەدا دەوریان بووە ئەو نامانەش رەنگدانەوەی بۆچوونەکانی خەلافەتی عەباسی‌و پەسێنکاری شوراتەکانمان لەو ماوەیەدا لە روانیاندا بۆ قازانجی موسوڵمانەکان و قایل بوونیان و کێ لایەنگیرو شوین کەوتووی میرەکانی موسوڵمانانن دەقەکانی نووسیون؛

بزوتنـەوەی حەمـزەی کوری عبـداللەی شاری یەکێك بووە لە بزوتنــەوەکــانی شورات کە لەسـجستــان ساڵی 179 کۆچی سەری‌هــەڵــداو ساڵی 181 کۆچی ئاشکــرای کرد کە میــری باوەرهێنەرانەو دەوڵەتی عەباسی نەیتوانی کە بەتەواوی کۆتایی بە بزوتنـەوەکـە بێنێ بەڵام لە جیـاتی دەوڵـەتی عەبـاسی طاهـری‌و صەفاری‌یەکان، کە بەرچەڵەك لە هەندێ بەشی ئێراندا کاریان بەرێــوە دەبـردو بەڵێنیـان بە دەوڵـەتی عەبـاسی‌دا کە بزوتنـەوەی یاخی‌بوون و سەرپێچی‌یەکە نەهێڵن و ئاسایش و ئارام بەرپا بکەن. (72)

مێژووی سیستان کە بەزمانی فارسی نووسراوە بە یەکەم سەر چاوەدا دەنــرێ بۆ گێـرانـەوەی بزوتنـەوەکـەی حەمـزەی شاری، ئەمــەش بۆ مێــژووی ناوخــۆ شتێکی باوە، مێــژوونـووسـانی سیستیســان تۆزێـك سۆزیـان بەلای بزوتنـەوەکـەوە هەیـەو دژ ی دەوڵــەتی مەڵبــەنــدی عەبــاسی راست دەڵێن و نووسینــەکــە کەرەسەیەکی بە کەڵکی تێدایە سەبارەت بە رۆیشتنی بزوتنەوەکەو زۆری بزوتنـەوەکـانی شوراتی ئەو سەردەمـەو لەمـەشدا پشت بە سەردارەکــەیــان دەبــەستێ هەرکــە سەردارێکیــان دەکـوژ رێ لایــەنگیــرەکـان بڵاو دەبنـەوەو سەردارێکی نوێ، دێ‌و کۆیـان

دەکاتەوەو بۆ ڕاپەڕینێکی نوێ قسە دەکەن بە یەك. بزوتنەوەی حەمزەی شاری لە سجستان بێجگە لە شوراتەکان زۆر بێزاری دژی سیاسەتی عەباسی کە ئەمانەش بزوتنەوەی ئاینیو سیاسی پێش دەوڵەتی عەباسین و لە ئێراندا شیعاری جۆربەجۆریان هەڵگرت و تیایاندا خاوەن باوەڕو ناوچەگەریتیو ناوخۆیی هەبوو بۆ ڕاکێشانی گەورەترین ژمارەی لایەنگیر، بە واتەیەکی کە بزوتنەوەکە سەرباری ئەوەی شێوازێکی شوراتی هەبوو، دەربڕی هەست و خواست و قازانجی خەڵکی سیستان بوو لەو دەمەدا کەوا هارون الرشید ویستی بزوتنەوەکە ئاشکرا بوو حەمزەی شاری خۆی کردبە میری باوەڕهێنەران هارون الرشید نامەیەك بۆ حەمزە دنووسیو پێی دەڵێ کە تۆبە بکات و بگەڕێتەوە لایو دەڵێ:

(بەناوی خوای گەورەو میهرەبان ـ لە هارون الرشیدی میری باوەڕهێنەرانەوە بۆ حەمزەی کوڕی عبدالله ـ سڵاوتان لێ بێ، من سووپاسی ئەو خودایە دەکەم کە لەو زیاتر هیچ هودایێکی کە نیەو کە سڵاوی بۆ محمدی کویلەو پێغەمبەری (د. خ) خۆی نارد. (73)

بەڵام دوایی خودای گەورەو پیرۆز محمدی بە پێغەمبەری (د. خ) خۆی نارد بۆ هەموو کەسێ وەك مژدەدەرو ڕێگەی داوە بەناوی خۆیەوە خەڵك بانگ بکات و ڕێگەیێکی ڕووناکە مژدەی بەهەشت دەدات بۆ ئەوەی گوێ ڕایە لی دەبێو ئەوەشی لیێ یاخی بێ لە ئاگردا دەیسووتێنێو قورئانی پیرۆزی بۆ ناردوتە

خوارێ کە لە بەردەست و لەدوایی ئەو هیچ شتێکی کە نەهاتۆتە خوارێ کە وەك ئەو حەکیم و سووپاسکاربێو مفت و نامفتیو فەرزو سنوورو شەریعەتی ئاینی خۆی تێدا نیشان داوە. نامەکانی خودا بە محمد (د.خ) گەیی و ئامۆژگاری خەڵکەکەی کردو یاسا ڕێنمایی کارەکانی ڕوون کردەوە کە لە نوێژ کردن و دابەستنیو لە حەج و ئەو فەرزانەو سنوورانەی داینا و جیاوازی لە نێوانیاندا نیەو خودا لەسەر خەڵکەکەی پێویست کردووە کە گورایەڵی پێغەمبەرەکەی (د.خ) بین و مل کەچ بوونیش بۆی بە مل کەچ بوونی خۆی داناوەو ئەوەی مل کەچی ئەو بێ مل کەچی خودایەو ئەویشی لەو یاخی بێ لە خودا یاخیە کە خودا بەگشتی ئەوەو بەرهەڵستکاری خەڵکەکەی پێ گەیی، خودا

پێغەمبەرەکەی (د.خ) گرت و هەرچی هەیە بۆی هەڵبژاردو قورئانی خواو ڕێبازەکەی کە قایل بوونی خوداکەیو لە سنگی ئەنەوەکەدا جێ کردەوەو سەرکەوتن و دەرباز بوون بۆ ئەو کەسەیە ڕێزی گرت و دەستی پێوەگرت و ناخۆشیو ناهەمواریش بۆ ئەوەیە کە لێی لادەدات و کار بە شتی کە دەکات.

میری باوەڕهێنەران بۆ قورئانی خوداو ڕێبازی پێغەمبەرەکەی بانگت دەکات و هانت دەدات بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بیت و لە یاخی بوون لیێ دوورت دەخاتەوەو میری باوەڕهێنەران ئەوەی کە لە نێوان تۆو کارگێرەکانی لە خۆراسان و سجستان و فارس و کرمان زانی ناکۆکیو خوێن ڕشتن بووە چاکەی تۆو لایەنگیرەکانت و یەکخستنی قسەتان و دوورخستنەوەی خراپەتان و خۆشیو ئارام و دلنیایی ئێوەو تێکەڵاو بوونتانی ویست لەگەڵ برا موسوڵمانەکانتانداو باج و زەوی خێرو ماف داوێو خوێن ڕشتن و دەست بۆ درێژ کردنتان لەوەو پێش کە ڕوویداوە لێیان و تاوانەکانی ئەو خوێنی بێوە ژنانەو شتیکەتان لەم جەنگەتاندا بەخشیوەو لە نێوان ئێوەو نێوان کار گێڕەکانیدا هەرچی خراپەو خراپە بووەو بۆ دڵباشیو لەبەر ئارەزووی ئەو بە تایبەتی بۆ چاککردنت و مانەوەوت و تێکەڵ کردنت بە مل کەچ بووانی خوداو ئەو چاکەیەی کە بۆ تۆ پێویستەو پەیوەندی پێوە کردنتەوە باشە.

لە وڵاتەکەت نزیك بەوەو بە هۆی تۆوە وازی هێناو پێش ئەم نامەیە نەنامەی بۆ ناردویت ونەکەسیشی ناردۆتە لات میری باوەڕهێنەران خوێن و ماڵت و قژت و پێستی مسوگەر کردووەو هەر تاوانێك و هەر خوێنێ، تۆ کردبێت یان ڕژابێت یاخود لایەنگیرەکانت یاخود کارێ کردبێت یان ماڵێ کەم بوو بێت یان زۆر لەم جەنگەدا بردبێت لەوانە هەمووی خۆش بوو هەموویانی بەرەورووی ئەو خودایە کردۆتەوە کە شەریکی نیەو جا ئەگەر وەك ئەمانەتێ پەسەندی بکەیت و وەك گوێڕایەڵێکی مل کەچی شوێن کەوتوی خودا واز لە تاوانەکانت بێنیو بێتەوە ناو موسوڵمانەکان و دەستی لێ بەرنەدەیت و دڵسۆزی پەیمانەکەی بیت و ئەو دەمە نەگەڕێتەوەو لەو هیوایە پەشیمان نەبیتەوە.

من ئەمانەم کرد ئەگەر وەك ئەمانەتێك پەسەندیان بکەیت و پێشکەشم کردیو ئەگەر ئەوەی خودا ناوی پەتە ئەستۆت و پەیمانی نەشکێنیو لایەنگیری میری باوەڕهێنەران و باووباپیرانی

بیت و لەو پەیمانە توندتر کە خودا داوی‌یە بەسەر ئەو کەسانەدا لێی نزیکن و بەسەر پێغەمبەرو رابەردامن پەیمان و دۆستایەتی‌و وەفای خۆم بۆ خۆت و لایەنگیرەکانت هەیەو خوێن و ماڵ و هەرچی ئەوەی کردووتانە لەو جەنگەدا کە لە نێوان ئێوەو کارگێری میری باوەڕهێنەردا رووی داو؟ وەفاتان وەدی بهێنن، مەگۆڕرێن و بێ گوێی مەکەن و تێك مەچن.

گوێی لە ئامۆژگاری میری باوەڕهێنەران بگرەو بزانە چۆن تەماشای تۆو لایەنگیرەکانت دەکات و بزانە ئەمە چ ناخۆشی‌یێکی دوورو نزیکی دەبێ لەگەڵ نوێنەرەکەیدا وەرە بۆ لای‌و وەفای ئەو بۆ خۆت و لایەنگیرەکانت و چاکەی ئەو بۆ تۆو بەخشندەیی مسوگەربکە.

ئەگەر تۆ ئەم ئەمانەتە پەسەند نەکەیت و تێ نەگەیت و نەیزانی لەگەڵ رابەرەکەیدا ئەمانەتەکەی بۆ نێرەوە بەری، بدەی پشت بەخودا هیچ شتێکی تۆ لە دڵیا نامێنێ.

خودا ئاگای لە دڵی میری باوەڕهێنەرانە کە پاکانەی کردوو بەرهەڵستکاری خۆشی بەرامبەرت دەربڕیوەو خودا خۆی ئاگاداری هەموو شتێکەو ئیتر بە خودات دەسپێرم.

ئیسماعیلی کوڕی صبیح کارگێری میری باوەڕهێنەران رۆژی هەینی لە هەشتی سەفەری ساڵی 193 کۆچیدا نووسیویتی‌و شوکر بۆ خوداو بۆ پێغەمبەرەکەی‌و هەموو کەس وکاری شۆڕشگێری شۆڕاتەکان وەڵامی نامەیێك دەداتەوە ئەمە دەقەکەیەتی؛ بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان ـ لە عبدالله حەمزەی میری باوەڕهێنەرانەوە. . سڵاو لەوانەی کارگێری خودان. دوایی خودای گەورە ئادەمی (سڵاوی خودای لێ بێ) خاوێن کردەوەو بەخشندەیی لەگەڵدا کردو وەچەی پێ پەیداکردو• ئەمانەتی خۆی پێ‌بەخشی‌و لەسەری پێویست کرد کە گەورەی ماڵەکەی بناسێ‌و مل کەچی بێت و لەو پێغەمبەران و رابەرانی خۆی دروست کردو نووسراوی خۆی بۆ ناردنە خواری‌و ئاینی بۆ جێبەجێ کردن و رابەرەکانی یەك بەدوای یەکدا لەسەر یەك بەرنامەو شەریعەتی جۆراوجۆر ناویان بە دوای یەکدا دەهات و باوەڕی بەسەرەتاو کۆتاییان دەکردو تا سەدەکانی کۆن بە نەتەوەو کەسانی جۆربەجۆرەوە تێپەڕین و لەسەر مل کەچی خودای خۆمان و باوەڕ بە رابەرەکانی بەرێوە دەرۆشتین و خودا محمدی پاش ماوەیێك پێغەمبەران ناردوو نزیك ئەو سەعاتەی کە خودا بەزەیی جولاو دوا پێغەمبەر بوو کە ناردی بۆیان و بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بکەن و قورئانی لە هەموو نووسراوێك ئەوەشی کە نووسراونەوتەوە بە هێزتر بۆ ناردەخواری پێغەمبەری خودا بە پێی قورئانی خودا بەڕێوە دەچوو بۆ لێدانی دوژمن و خەڵك بانگ کردن بۆ ئاینەکەیی‌و ئامۆژگاری کردنی نەتەوەکەی بە پێی فەرماندەی خودا بەڕێوە دەچوو تاوەکو خودا. . ئاینەکەی بۆ تەواو کردو گەیانیە بەڵگەو بانگەوازەکەی بۆ دەرخست و بەڵام بۆ ئەو لەسەر زەوی ئەوەی کە بە بەخشندەیی‌و چاکی بۆ زانی بۆ هەڵبژاردو خودا گرتی‌و پێغەمبەرێتی پێ تەواو کردو وەحی پێ‌بەخشی‌و بۆ نەتەوەکەی قورئانی خوداو ئامۆژگاری‌یەکانی دانا لەوانەش چی موفتەو چی موفت نیەو چی دەبێ بکرێ‌و کام رێگە بگیرێ ئەوەی کە حیکمەتەو ئەوەی لە یەك دەچێ‌و نموونەکانی‌و خۆشی ئەوانەی کە گوێڕایەلی دەکەن و سزای ئەوانەش کە لێی یاخی دەبن و ئەوانەی کارگێری پێغەمبەری خودا بوون دەستیان پێوە گرت و بە پێی ئەو بەڕێوە دەچوون و خودا لایەنی گرتن و سەری خستن و ئەوانەی پێشاندان کە لە رووی پەسەندی‌و تواناو دەرخستنەوە بەسەر دوژمنەکانیاندا حەزی لێ دەکەن و تائیستاش موسوڵمانان و ئەوانەی لەگەڵیاندان تا سەردەمی خەلافەتی ئەبو بەکرو عمر خودا خۆشی پێ بەخشین و دەرگای بە زەیی خۆی بۆ کردنەوە لە خەلافەتی عثماندا ئەوخۆشیەی دنیا تووشی ناهەمواری هات و ئەوانەی گۆشە گیر بوون گۆشەگیریان کردوو کاریان تێ کردوو کارگێریان کردوو لە قورئانی خوداو رێبازی پێغەمبەرەکەی لایانداو دوای ئەم دەستە دەستە بوونە خەڵکەکە ناکۆکیان پەیدا کردوو دوای ئەو یەکی‌تیەی هەیانبو پارچە پارچە بوو خودا رێی راستی نیشانی ئەوانەدا کە باوەڕیان پێی هەبوو ناکۆك بوون لەسەر ئەوەی کە رەوایەو ئەوانەی شایانی گومڕایی بوو هەر لەسەر گومڕایی خۆیان مانەوەو قورئانی خودایان لە دەست داو بە رێبازی پێغەمبەردا (د.خ) نەچوون و رێ نیشانی ئەوانەش دا کەوا شوێن راستی خوداو ئاینەکەی‌و قورئانەکەی کەوتوون و رێگەی ئەوانەیان گرتووە کە خودا خستوویەتە دڵیانەوەو پشوویان لە سەری هەبووە تا نارەوایی ئەو نەتەوەیەی نەهێشتووەو مافی خۆی داوەتێ بێ پارچە پارچەیی‌و خراپی هەندێکی چە شتووە کە ئێستاش جیاوازە مەگەر یەکێ بەزەیی پێتابێتەوەو تائیستا موسوڵمانان و ئەوانەی

لەگــەڵیــانــدان تا کاتی خۆی دێ کەم وکـورتیــان هەیــەو کە ئەم
کاتەش کاتی نەتەوەیە کە لەسەر گومرای کۆدە بێتەوەو بە جورێك
کە دەڵێ سەعــاتــە بەبــەلێنیان و سەعاتیش ادهیٰ وأمرَّ. پشت بە
خودا کە لە نەزانین و گومرایی بە دوورمان کات و لە خراپە بێ
بەشمان بکات و.[24]

نامەکەتم پێ گەیشت و بانگم دەکەیت کە بە پێی قورئان و ڕێبازی پێغەمبەر (د.خ) بڕوێن و باسی ئەوەت کردوە کە لە کورو خوراسان و جێگەی کە جەنگم لەگەڵ کاربەدەستەکەت کردووەو وتــووتــە لەوەو لە شتی کە لێت خۆش دەبم و لەو ئەمــانــەت و خەڵاتــەی کە ئەگــەر نامــەکــەتمــان و ئەمــانــەتەکەتمان وەرگرت و چووینە ژێر ڕکێفی تۆوەو ئەو شتانەی کە نووسیبووت تێیان گەیشتم.

بەڵام قورئانی خودا پێشەنگی منەو پێی قایلم و بەو نەبێ کار ناکەم و لەویش زیاتر ناوبژی کارم نیە. سوپاس بۆ خودا کە لەگەڵیدام و فێری ئاینەکەی کردم و ئەوەی پیشان دام و وای لێ کردم کە قورئــانــەکــەی بکــەم بە ناوبــژی کــارو پێویستی خۆم لە مل کەچ بوونی بە جێ بهێنم و جیهــادی لەســەر بکــەم و دژی ئەوانــە بن کە پێچــەوانــەی ئەوە کاریــان کردووەو بێ قورئان و بە نووسینی کە ڕەفتــاریــان بووەو خوداش یارمــەتی‌دەرو سەرکــەوتوو خەرەو خودا نەبێ هیچ هێزێکی کە نیە.

تۆ پێت ناخــۆش نەبــوە کە کارگێــرەکــەت جەنگی لەگــەڵــدا کردووم و ئەوەش ناکۆکی کردنێکی تۆ بووەو لە خاکی تۆدا بووەو منــیش لە دنــیــادا ئارەزووم لەوە نیــە کە من بۆی دەبم و داوای ئەوەشم نەکردووە تێیدا باس بکرێم و بەکەسیشیانم نەوتووە کە دەبێ خراپی ڕێگەکەیان بۆ گشت دەرخەن و کەچین و وازیان لێ هێنان و لەوەش زیاتر کە خودا بۆ کۆیلەی خۆی داناوە نەخوێنیان زیــاد ڕشتــووەو نەمــاڵیــان بردووەو نەداوێن پیسیشیان کردووە. وا دەزانم کە مەســەلــەی خۆراســان و ئەوەی سجستــان و فارس و کرمان بە سەریاندا هاتووە پێت گەیشتووە ناشیەوی کە بە درێژی بۆ باسی ئەو شوێنانەت بۆ بکەم.

بەڵام خەڵاتــەکــەت بۆمــن و چاو لێ بوونــم لەلای تۆوەو ئەوشتــانــەی کە داوات کردوون وەك یەکێ وایــە کە دڵی بەدنیــا خۆش بێ‌و ئارەزووی بکــات و چێــژی خۆشی ژیــان و لەزەتی بێ‌وایە. هەروەك بێ ئەوەی بیر لە مردن کرا بێتەوە بە خێرایی ئەمــانــەت پێشکــەش کرد بەڵام من پشت بە رونــاکی خودا دەبەستم کە بەخت و چارەنووسمی تێدا بخات و ئەوانەی خراپە کارن و ئاینی خۆیان بە دنیا فرۆشتووە دنیا بۆ ئەو دەمێنێتەوە ئەو بۆ دنیــا نامێنێتــەوە کە ڕۆیشتیش لە ئاگــر زیــاتــرو لە خراپــە زیاتری تووش نایەت.

بەڵام زەوی‌و زارو خێروبێر بۆ من موسوڵمانەکان بەخشندەیی‌و رزق و برایەتی خۆیان دوای هەردوو و خەلیفەی یەکەم و دووەمی ڕاشــدیــن لەدەست داو ئەم شتــانــەش لە شوێنی ڕەوای خۆی وەرنــەدەگــیــراو بەوانــەش دەدرا کە شایــەنی نەبــوون و خودا حسابکاری کۆیلەکانێتی.

بەڵام ئەوەی ئەمانەت پێشکەشت کردووە بانگت کردووە بۆ ئەوەی مل کەچی تۆ بێ‌و ئەمە بۆ یەکێکە بێ‌وەی بژی‌و میرەکان لە ڕۆژی ترســەگــەورەکــەوە ڕۆژێــك کە دەرونێکی ئاینــداری کە بڕوات پێــی نەهــێــنــاوە لەوەپێش کەڵکی نەبێ چۆن ئەوە لەلای کەسێکەوە بە دەست دەخرێ کە مردن و ژیان و نەشازی نەبێ‌و تەمــاشــای کاتی هاتنی مردنت کە لە بەردەمیا چۆن دەکــەوێ‌و ناچــار دەبێ بچیت و لێت بەرپــرســیــار دەبێ‌و ئەویش کە پاش ماوەیێك دەتباتە ڕۆژی حساب.

بینیت دنیای چی بەوانە کرد کە بەسەریا دەرۆیشتن و ئەوانەی کە بۆی هاتن و خۆشیــان دەویست و چۆن هێشتینیــەوە گرتنی‌و دانی بە مردن و هیچیــان لە پاش بەجێ نەمــاو دوایی پاکــانــەیان لێیان بۆ کردو ڕەفتارەکەیان مایەوەو هەردەش بێ کە لە ئەستۆیاندا بێ‌و تووشی پەشیمــانی هاتن و گەیشتنــە ئەوەی کە لەوانــەیــان بپــرســرێتــەوە کە زۆرە کاریــان لە دنیــادا کردووەو کاتێ سەرەی مردنیان هات ڕۆژی بێ دەسەڵاتی‌و مردنی دەڵێ: ئەی ڕێبازەکە چەند لە لاکانتەوە زیاد ڕۆیشتم.[25]

لایەنی خودام گرتووەو بەڵێنم داوەتی کە بە پێی فەرماندەی ئەو بڕۆم و بانگەواز بۆ گوێڕایەڵی کردنی لە ناو دوژمنەکانیدا تا دوا هەنــاســەم من وەکــو کویــلەیــەك بە وەفــام و بەڵێنی خۆم دەبەمەسەر. لە خودای گەورە داوا دەکەم کە بەڵێنم بباتە سەرو دژی بەڵێنەکەی ئێوەبن.

داوا لە خودا دەکەین کە بە پێی ئەوە لەگەڵماندا بجووڵێتەوە کەوا بە گوێرەی قورئان کردوومانەو خودا پەرستیمان ئەگەر وەك ئەوانــە بێ کە ئاینیــان لە دەرونیــانــدا نیە یاخود خۆی بپرسێتەوەو

داوای چاکـەو خواردن لە خودا دەکـەین و کە نەخـۆی نەهیـچ کەسێ لە پشت ئەوەوە لە رێ لامان نەدات و ئەوەشی لە خۆمان گەورەییمان بکات ئەوە ئایندارو جێ بەخشینە.

بە خودا قایلین و بەئـاینی موسـوڵمـان قایلین و باوەرمـان بە محمـد وەك پێغـەمبـەری خوداو بە قورئـان وەك پێشـرەو هەیـە تەنـانـەت ئەگـەر ئاسمـان و زەوی بانـگ بکـەن ئێمە هەرگیز لە دەوڵەتێ داوا ناکەین کە وتمان ئەگەر ئەمە رێگەی گرتم و بۆ ئەمە داوا لە خودا دەکەم بۆ خۆم و ئەوەی لەگەڵم دایە.

(پـە نابـە خودای گەورەی هەمـوو جیهانەکانی من موشریکی نەبێ هیچ نێم و کە هیچە تەقەللاو هێزێکی کە لە خودا خۆیەوە نەبێ نابێ و حوکم کردن هەر بۆ خودایەو ئەوە کە حەق بدات و باشترین هەقدەریشە ئەگەر مردن بڵێ گەورەم هەرخودایەو هیچ خودایەکی کە نیەو پشتم هەر بەو ستووەو ئەو گەورەی عەرشی مەزنەو سلاو لە محمدی پێغەمبەرو (د.خ) هەموو ئەوانەی رابەرن.

## سەرنجێکی شیکاری: -

دوای ئەمە دەبێ چاوێ بەو دوو نامەیەدا بگێرین کە دوکتور فاروق عمر فەوزی کە ویستیوویەتی قوڵ بێتەوەو راستی ئەو دوو نامەیەی بۆ دەرکەوێ کە هی کێن، بەکارهێنانی نامە بەرنامەیێکی شیکاری مێژوویی یەو یارمەتی ئەم کارەی دەدا. بێ گومان راستی ناوەرۆکـەکـەی دەرخستـووە پرسیـاری مافی خۆی کردووەو ئەو هۆیانەشی کە هەموویان وایان لە خەلافەت کردووە کە ئەمجارە بۆ دوان لەگەڵ شوراتەکاندا کە لە دەسەلاتی یاخی بوون و دوای ئەوەش کە کەرەسەی جەنگ و زیانێکی زۆر گەورەی لە کوژراوو ماڵ و دارایی یـەوە بەرکـەوتـووە هۆی دبلۆمـاسی بەکـاردەهێنێ بۆ پاراستنی یەکێتی موسوڵمانان و پاراستنی لە رۆمان و خەڵکی کە دەڵێ:

سەرنجی شیکاری و رەخنە، رەنگە پێش هەموو شتێ، دەبێ ئەوە بڵێین کە بەشەکانی رۆژهەلات لەسەرەتای درووست بوونی دەوڵەتی عەباسیەوە جێگای ئالۆزی و نارەحەتی بوون، بزوتنەوەی فارسی شوراتی تێـدا دەرکـەوت و دوایی ئەوە بووە بزوتنـەوەی ناوچەیی و شەری جیا بوونەوەی لە خەلافەتی عەباسی دەکرد.

ئەم بزوتنەوانە، دەربری بێزاری خەڵك بوون بەرامبەر والی عەبـاسی و دەربـری خواستی خۆیـان بوون ئەمـە بێجگە کە ئەوە یەکەم جێگەی هەناسەدان بوو کە خەڵکی ئەم ناوچانە هەناسەی ئەوەی تێـدا بدەن کە دووپـاتی ئەوە بۆ خەلافـەت بکـاتـەوە پەیوەندیداری نەریت و باوەرو کەلەپوری کۆن.

ئەوەی زانراوە سجستان، ئەو ناوچەیەیە کە حەمزە شاری شۆرشی تێـدابـەرپـا کرد، لەو ناوچـە ناسراوانەیە کە خەڵکەکەی دەست بەنـەریت و باوەری کۆنیـانـەوە دەگرن، ئاگری زەردەشتی کلپەدار لەم ناوچەیەو لە سەردەمی عەباسی یەکاندا بڵێسەدار بوو.

## رەخنەی شوراتەکان: -

تائـیـسـتـا لە رووی رەخنـەی شوراتـەوە ئەو سەرچـاوە جۆربـەجـۆرانـەمـان نین کە ئەم نامـانـەمان بۆساغ بکاتەوە تەنیا نووسینە مێژوویی یەکەی سیستان نەبێ کە ئەویش سەرچاوەیێکی مێژوویی یەو نیشانەیێکی بە هێزمان سەبارەت راستی ئەو نامانە لە رووی مێژوویی یەوە ناداتێ. ناتوانین بە راوورد لە نێوان ئەو سەرچاوە پێشکەش کراوانەو هی کەدا کە دوایی هاتوون و باسی ئەو نامانە دەکەن یان پەنجەیان بۆ رادەکێشن بکەین.(76)

ئێمە کەوتینە ئەو هەڵوێستەوە کە نەتوانین بڵێین ئەوبیرەی کە دەڵێ ئەم نامـانـە رەنگـە لەلایەن گێرەوەکاندا ئەوانەی لایەنگیری شوراتـەکـان یاخـود عەبـاسیـەکانەوە بوون دەست کاری کرابی و نووسـرابنـەوە، راستـە یاخـود درۆیـە، هەروەهـا ئێمـە ناتـوانین ئەوەشمـان دەست کەوێ کە رەگـەزی خەیاڵ و رەگەزی گیرانەوە یاخـو دریـژە لەم نامـانـەدا چەنـدە بەتـایبـەتی کە ئێمـە بزانین کەهـەردوو فایـل و گێـرەرەوەکـان لە شێکـاری یـەکانیاندا جڵەوی پێنوسەکانیان لە بواری دەمەتەقێ و چاوپێ کەوتن و پرسیارو وەڵام و گفتوگۆو شی کردنەوەدا بەرداوە.

رەنگە ئەوانەی گێراوە کارەکان لە چوونە لای ئەبی موسلیمی خوراسانی بۆ لای مەنصور دواون بەتایبەتی ئەو نامانەیان باس نەکـردووە کە لە نێـوان منصـور ومحمـد نەفس زەکیـەدا هەبـووە ئەمەش باشترین نیشانەیە بیڵێین.

بەلام ئێمە هەست دەکەین و دەڵێین دۆخی ئەو ئالۆزیەی کە

خەلافـەت لە سەردەمـی رەشـیـدا بە هۆی سنـەمكـاری والی‌یەكانەوە لە ناوچەكانی رۆژهەلاتدا كە بوونە هۆی پەشێوی دروست كردن تیێ كەوت و ئەو پەنجانەش كە ئەم نامانە بۆ ئەو رووداوانە رای‌دەكێشن نیشانەی راستی ئەو نامانەمان دەدەنێ.

**رەخنەی ناوخۆ: -**

هارون الرشید لە نامەكەیدا بانگی حەمزەی شوراتی دەكات بۆ ئەوەی بە پێی قورئان و رێبازی پێغەمبەر (د.خ) رەفتار بكات و بەمـەش پەنجـەیێكی لادان لە دەستـەی موسـولْمانان رادەكێشێ دوای ئەوەی كە پەنجـە بۆ جەنگـەكـانی حەمـزەی شوراتی دژی خەلیفە لە سجستان و شوێنی كە رادەكێشێ، بەڵێنی دەداتێ كە هیچی بەسـەر نەیـەت و لایـەنگیـرەكـانیشی زەوی‌و باجیـان بە گوێرەی بیروباوەری رەواو دادوەری بداتێ، لێرەدا رێی ئەوەمان دەبێ بڵێین خەلیفـە هۆی بێـزاری‌یـەكـە دەزانێ‌و بەڵێنی نەمـانی دەدات، خەلیفە دەگەرێتەوەو بەچی لە ئایندا گەورەیە سویندی بۆ دەخوات و بەهێزترین بەڵێن و وادەی دەداتێ كە بە هیچ جۆرێ هیچ لە حەمزەو لایەنگیرەكانی نەكات.[77]

هەروەهـا پەنـجـەش بۆ رای شوراتـەكـان لە خەلافـەتی موسـوڵمـانـانـدا رادەكێشێ كە بریتی‌یە لەوەی علی یان عثمان و صەحـابـەكـانی پێغـەمبەرو (د.خ) حاكمەكانیان و ئەوانەی پێیان قایـل بوون بیـر بخـاتـەوە كە دەڵێ: (تـا ئیستاش موسوڵمانان و ئەوانەی لەگەڵیاندان لە خۆش بەخشی خودادا زۆرترن و دەرگای بەزەیی خستنە سەرپشتی بۆیان خەلافەتی ئەبی بەكرو عمربوو لە خەلافەتی عثمان چوونە دەرێ تا خۆشی خەلافەتەكە نەما...).

بەڵام بەشی دووەمی نامەكە وەڵامی حەمزەی شوراتە كە هی هارون الـرشیـد دەداتـەوەو خاڵ بەخـاڵ هەمـوو بێـرێـك لەگەڵیا دەدوێ‌و بەڵگـەیـەكی نەهێشتـەوە لێی‌نەدوێ‌و وەڵامی نەداتەوە كە خلیفە هێنا بوویەوە.

یەكەم ئەو ناوی خۆی‌دەنی (میری باوەرهێنەران) هەروەك لە سەرەتـای نامـەكـە داهـاتـووە واتە دان بە هارون الرشید دانە بە خەلـیفـەو نە بە ئیمـام نانێ. ئەم سەرەتـایـەش بایـەخێكی پرووپاگەندەیی گەورەی بۆ كارگەرێتی بیری شورات و هەروەها نەبوونی رێكەوتن و پەسەند نەكردنی رێكەوتن نەلایەن حەمزەوە دژی خەلیفە دەردەخات كە پەسەند كردن ئەو ئارامگەیی‌یە كە خەلیفـە دابـوویـەو حەمـزەی شورات چۆن ئەو مەرج و رێـدانـە پەسەنددەكات كە خەلیفە لە نامەكەیدا داوێتی‌و دەشزانی كە چی بەسەر یەحیای كوری عبداللهی كوری حەسەنی عاوی هات كە ئارامگری رەشیدی پەسەند كردو باوەری پێ كردو رەشید گرتی‌و بەندی كردو كوشتی.

حەمزە بەڵگەی شەركردنەی بەشەر كردن لەگەڵ كارگێرەكانی خەلـیفــە لە خۆراســان و سجستــان و خراپی رەفتــاری‌یــان و داوێن پیسییـان دەهێنێتـەوە كە ئەمـانـە بوونـەتە هۆی ئالۆزبوونی دۆخ و هەڵســانی خەڵكـەكـە لەو ناوچە رۆژهەلاتیانەدا بەم جۆرە حەمزەی شورات بەڵگە بۆ شۆرشەكەی دەهێنێتەوە كە ئەنجامی خراپی رژێمەكە بەرپابوو.

(كەواتە ئەوانەی دەجەنگن ئەوانەی ستەمیان بەرامبەر كراوەو خودا رابەری سەركەوتنیانە) ئەم شیعارە درەوشەدارە بەشی زۆری شۆراتەكان لە مێژووی موسوڵمانانی سیاسیدا بڵندیان كرد.

هەروەهـا دووپـاتی ئەوە دەكـاتـەوە شۆرشـەكـەی رووداوێكە دەربری ئەو نارەزایی بەشی زۆری ئەو خەڵكە یەكە خەلافەتی عەبـاسی دەستی بریـون و كە هەمـوومـافیكیان پێ شێل كردووەو ئەمـەش شیعـارێكی كەی درەوشـەدارمان بیر دەخاتەوە كە ئەوەیە (دەمـانـەوێ كە لایـەنی ئەوانـە بگـرین لەسـەر زەوی ستـەمیان لێ‌كراوەو بیان كەین بە ئیمام وبیانكەنیە جێ گرەوە».[78]

حەمــزەی شوراتـی لە چاكـیــدا زۆر تێــدە پەرێ كاتـێ كە سەركـردایـەتی كردنی بزوتنـەوەكەی وادادەنێ كە ناكۆكی‌یێك نیە لەگـەڵ هارون الـرشیـدو لەسـەر مولكـەكەی‌و لەسەر دنیاش نیەو داوای خێــرو بەزەیشی لێ ناكــات، چونكـە چنـۆكی دنیـایی‌و خواستی سیاسی بەلای حەمزەی شوراتەوە شتێكی ئەوتۆنین كە بایـەخـداربن بەڵام بۆچی لەسـەرەتـای نامەكەیدا ناوی خۆی نا (میری باوەرهێنەران).

حەمـزەی شورات دەگـەرێتـەوەو خۆشـەویستی‌و دەڵێ، ئەگەر رشید بزانی هەروەك چۆن ئەبی مسلمی خوراسانی‌و عبداللهی كوری علی‌و بحیس كوری عبدالله پێش من پەسندیان كردمنیش پەسـەنـدی دەكـەم بەهـەڵـە داچووە. رەنگە رەشید وای هەست كردبێ كە حەمزەی شورات ئەم بانگەوازە پەسەند ناكات لەبەر

ئەوە زۆر دڵخۆشی دایەوە. کاتێ کە باسی زەوی وزارو یارمەتی خەلیفە دەکات کە پێی بەخشێ وەك گاڵتە پێکردنێك وایە بەخەلیفەکە دەڵێ: (دوای ئەوە موسوڵمانەکانی دوای هەردوو خەلیفە کە ئەبوبەکرو عثمان نەبەخششیان ماو نەرزق و نەخێریان ما وای لێ هات ئەم شتانە لە جێی خۆیدا وەرنەگیرێن و بە کەسانێکیش بدرێن کە شایەنی ئەوە نین و خودا خۆی حساب کارە.

حەمزەی شورات کۆتایی نامەکەی بە ئامۆژگاری رەشیدو رێنیشاندانی دەهێنێ ولەسەر هەڵویستی خۆی بەرامبەر بە عەباسیەکان و دژیان جیهاد کردن سووردەبێ و شیعاری ئەمری شورات بەرز دەکاتەوە (حوکم بۆ جیاکردنەوەی حەق هەر بۆ خودایەو ئەویش باشترین جیاکەرەوەیە) ئەمەش دووپات کردنەوەی هەڵویستی ئەو شوراتانەیە کە نایانەوێ دان بە هیچ ئەمارەتێکدا بنێن چونکە لە رەفتارو چاککردنی دوخەکاندا سەرنەکوتوویون.

**سەرچاوەکان**


1 ـ نوری حمودی القیسی ـ کعب بن معدان الأشقری حیاته وما تبقی من شعره ـ گۆڤاری ـ الورد ـ ژمارە (2) ساڵی 1976 ل 85.

2 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە.

3 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل 87 ـ 88.

4 ـ محمد رضا حسن الدجیلی ـ فرقة الأزارقة ـ بغداد وزارة التربیة ساڵی 1973.

5 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل 84 ـ 86.

6 ـ سهیر القلماوی ـ شعر الخوارج في العهد الأموی ـ قاهرە ـ چاپخانەی لیژنەی نووسین و بڵاوکردنەوەو وەرگێران ـ 1945.

7 ـ احسان عباس ـ شعر الخوارج ـ چاپی سێیەم ـ بیروت ـ دار الثقافة ـ 1974.

8 ـ الکامل للمبرد ـ بەرگی ژمارە (7) ل ـ 119 ـ القاهرة ـ مطبعة السعادة ـ 1923.

9 ـ الجاحظ ـ البیان والتبین ـ فرج حسن السعدون ـ القاهرة ـ چاپخانەی الأستقامة ـ 1947 ـ بەرگی یەکەم.

10 ـ احسان عباس ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 12 ـ 12 ـ 13 ـ 14.

11 ـ احسان عباس ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 15 ـ 24 ـ 26.

12 ـ احسان عباس ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 25 ـ 26 ـ 27.

13 ـ احسان عباس ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 8 ـ 48.

14 ـ سهیر القلماوی ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 47 ـ 48.

15 ـ السیره النبویة لأبن هشام ـ طبع علی صبیح ـ بەرگی (1) ـ ل ـ 196.

16 ـ سهیر القلماوی ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 49 ـ 50.

17 ـ سهیر القلماوی ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 51.

18 ـ هانی علوی ـ من قضایا التراث الأسلامی.

19 ـ الأصفهانی ـ ابو الفرج ـ الأغانی بەرگی (2) ل 67 چاپخانەی دار الکتب المصریة ـ 1938.

20 ـ ابن الحدید ـ شرح نهج البلاغة ـ بەرگی (1) ل ـ 455 ـ 463.

21 ـ هادی العلوی (من قضایا التراث الأسلامی ـ مناقشات مع مستشرق معاصر) مجلة العلوم ـ ژمارە ـ 2 ـ 1968.

22 ـ هادی العلوی ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 51.

23 ـ احسان عباس ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ (9).

24 ـ الکامل للمبرد ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 591 ـ

25 ـ حسین أمین ـ دراسة تأریخیة للخلیج العربی ـ المجلة التأریخیة ـ ژمارە «4» 1975 ـ ل ـ 10 ـ 7 ـ 17.

26 ـ مروج الذهب ـ بەرگی «2» ـ ل ـ 138 «چاپخانەی . البهیة».

27 ـ سهیر القلماوی ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 59 ـ 60.

28 ـ سهیر القلماوی ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 60 ـ 61.

29 ـ مروج الذهب ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 128.

30 ـ سهیر القلماوی ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 68 ـ 69.

31 ـ سهیر القلماوی ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 69 ـ 70.

32 ـ حسین امین ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 11 ـ

33 ـ سهیر القلماوی ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 70 ـ

34 ـ الکامل للمبرد ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ 214 ـ

35 ـ سهير القلماوى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 71 ـ 62 ـ 63 ـ

36 ـ سهير القلماوى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 62 ـ 63 ـ 64 ـ

37 ـ الكامل للمبرد ـ هەر ئەو سەرچاوەیە.

38 ـ سهير القلماوى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 78 ـ

39 ـ الأغانى ـ للأصفهانى ـ بەرگى (16) ـ ل ـ 1151 ـ چاپخانەی ـ بولاق ـ

40 ـ سهير القلماوى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 81 ـ 82 ـ

41 ـ الأغانى هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 1155 ـ

42 ـ الأغانى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 1157 ـ

43 ـ سهير القلماوى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 88 ـ 89 ـ 90 ـ 91.

44 ـ الجاحظ ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ بەرگی دووەم ـ ل ـ 15 ـ

45 ـ سهير القلماوى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 12 ـ 13 ـ

46 ـ الشعـــر والشعـــراء ـ ل 1369 ـ بيـروت ـ دار الثقـافـة ـ 1966 ـ

47 ـ الشعر الشعر والشعراء ـ ل ـ 371 ـ 374 ـ

48 ـ الأغانى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ بەرگى ـ 10 ـ ل ـ 156 ـ 160 ـ

49 ـ مقدمة ديوان الطرماح «نشر كرنكو».

50 ـ الجاحظ ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ بەرگی «10» ـ ل ـ 54 ـ

51 ـ سهير القلماوى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 95 ـ 96 ـ 97 ـ

52 ـ ديوان الطرماح ـ ل ـ 157 ـ

53 ـ ديوان الطرماح ـ ل ـ 140 ـ

54 ـ الشعر والشعراء ـ ابن قتيبة ـ ل ـ 374 ـ

55 ـ سهير القلماوى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 110 ـ 111 ـ

56 ـ سهير القلماوى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 112 ـ 113 ـ

57 ـ الديوان ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 104

58 ـ سهير القلماوى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 114 ـ 115 ـ 117 ـ

59 ـ سهير القلماوى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 126 ـ 150 ـ 152 ـ

60 ـ عمر ابو نصر ـ الخوارج فى الأسلام ـ ل ـ 82 ـ

61 ـ عمر ابو نصر ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 132 ـ

62 ـ غانم جواد رضا ـ الرسائل الفنية في العصر الأسلامى الى نهاية العصر الأموى ـ بغداد رسالة ماجستير سالى 1974 ـ ل ـ 266 ـ 267 ـ بەرگى «2».

63 ـ غانم جواد رضا ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 139 ـ 140 ـ 286 ـ 587.

64 ـ غانم جواد رضا ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ 269

65 ـ غانم جواد رضا ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ بەرگى «4» ـ ل ـ 227 ـ

66 ـ فاروق عمر فوزى ـ ل ـ 261 ـ 263 ـ الرسائل المتبادلة بين الخليفـة هارون الـرشيـد والشـائـر حمـزه بن عبـدالله الخارجى ـ المجلة التأريخية ـ ژماره ـ 3 ـ 1974 ـ

67 ـ فاروق عمر فوزى ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 263 ـ 264 ـ

68 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 264 ـ 265 ـ

69 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 265 ـ 266 ـ

70 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 266 ـ 267 ـ

71 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 267 ـ 268 ـ

72 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 268 ـ 269 ـ

73 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 269 ـ 270 ـ

74 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 271 ـ 272 ـ

75 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 271 ـ 272 ـ 273

76 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ 272 ـ 273 ـ 274

77 ـ هەر ئەو سەرچاوەیە ـ ل ـ 272

78 ـ هەر ئەو سەرچـــاوەیـە ـ المجلدات التأريخيـة ژمـاره «3» 1974 ـ ل ـ 224 ـ 26 ـ 274 ـ



# باباتاهیری هەمەدانی

د. محمد نوری عارف
کولیجی ئەدەبیات زانکۆی سەلاحەدین

دیوانی بابا تاهیری هەمەدانی، کە بە عوریان ناسراو چاپی یەکــەمی لە سالی 1902 لە لەنــدەن چاپ کرابـوو، لەلایـەن (عـەلی ڕاستگـۆ)وە ئامـادەکـراو بۆ جاری دووەم بەسـەرمـایەی ئینتیشـاراتی ئەسکـەنـدەری، لە قەوارەیـەکی 12سم × 17سم چاپ کرایەوەو پێشەکییەکی سی (30) لاپەڕەیی بۆ نووسرایەوە کە لە کۆمـەڵـە بیـروڕاو بۆچـوونێـك پێکهـاتـووە لەلایەن چەند زانایەکی ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاواییەوە، ئەوەی کە عەلی ڕاستگۆ لەو بارەیـەوە دەستی پێ گـەیشتـووە، کۆیکـردوتـەوەو لەپێشەکی چاپی دووەم دا هەمــووی خستــوتـەڕوو، بەشێکی لەوقسـانـە پێکهـاتـووەکـە لە سەر زمـانی خەڵکی هەمەدان و ناوچەکەدایەو هەر لە کۆنـەوە دەمـاودەم هاتـووەو گەلێ لە بارەی بابـاوە وتراوەو سەدەها ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە تا گەیشتووە بە ئێمە، گومان لەوەدا نییە گەلێ گۆڕانی بەسەردا هاتووەو هەندێکیشی شێـوەیـەکی ئەفسـانـەیی گرتـوتـەخۆیو ئەمە شتێکی ئاساییەو ئەوەی دەمــاودەم بیـگێـڕنــەوەو لە سەردەمی خۆیدا بە وردی نەنووسرێتەوە، کەم و زۆر ئەو جۆرە گۆڕانەی بەسەردا دێت، هەرچــۆنی بێت ئێمــە دەتــوانین تا ڕادەیـەك هەنـدێ شتمـان دەستگیربێ لەم دەنگ و باسانە، چونکە ئەو قسانە هەمووی لە خۆیەوە نەوتراوە، بەڵکو گەلێ ڕەگ و ڕیشەی دوورو قووڵیان هەیــە کە لەوانـەیـە هەنـدێ شتی گرنگمـان بۆ دەربخـاو گەلێ لایـەنی تاریـك و لێڵمـان بۆ ڕوون بکـاتـەوە. بەشێکیتـری لە هەندێ سەرچاوەی نووسراوەوە وەرگیراوە، هەرچەندە جیاوازی لە نێـوانیـان دا هەیـە بەڵام کەم و زۆر نزیکمـان دەکـاتـەوە لە ڕاستیو شتێکمان دەستگیر دەکات.

پێشــەکی ناوبــراوم خوێنــدەوەو دوای ئەوە دەستم کرد بە وەرگێــڕانی بۆ سەر زمــانیکــوردی، کە لە چەنــد بەشێــك پێــك هاتـووەو هەر بەشـەی هینی یەکێکـەو لە کوتـاییدا ناوی نووســەرەکــەی نووســراوە. ئەو چوارینـانـەی کە لە پێشـەکی ناوبراودا هاتوون خستوومنەتە سەر ڕێنووسی ئەمڕۆی کوردیو ئەو وشــانـەی کە لای‌خـۆمـان بەکـارنـاهێـنرین، لە پەراوێـزدا واتاکانیانم نووسیوەو دوای ئەوە بەکورتی لێکم داونەتەوە، تەنها چوارینەی (موآن بحرم کە در ظرف آمدستم. .)م وەکو خۆی نووسیوەتەوە، چونکە (میرزا مهدی خان کوکب) لەسەر هەمان ڕێنـووسی کۆنی خۆی، بە حسـابی ئەبجـەدیو بە شێـوەیـەکی تایبەتی بە خۆی، ساڵی لەدایك بوونی بابای دۆزیوەتەوە، کە لە پەراوێزدا منیش بیروڕای خۆمم لەو بارەیەوە دەربڕیوە. ئەو کەسـە ناسـراوانـەی کە هەنـدێ سەرچـاوە بەهـاوچەرخی بابای دانـاون و ساڵی لەدایـك بوون و مردنیـان، یا سەردەمـەکـەیانی دیــاری نەکــردووە، لە پەراوێــزدا بە کورتــی ساڵ یا سەردەمــەکـانیـانم پیشـان داوە، وەیـا هەرشتێ کە پێـویستی بە

ڕوونکردنەوە بووبێ بەگوێرەی بۆچوونی خۆم و بەپێی ئەو سەرچـاوانـەی کە دەسـتـم پێـیـان گەیشتـووە لە پەراوێـزدا پیشانم داون، بەڵام هەنـدێ لەو ناوانـەی کە هاتـوون، وەکـو ناوی کەسـان و شوێن و ناوی هەنـدێ سەرچـاوە کە کوردی نین، بە هەمان ڕێنووس نووسیومن و وەکو خۆی خستوومنەتە ڕوو.

لەم کارەدا پێویستم بە هەندێ سەرچاوە بوو، بەڵام دەستم نەکـەوت و هەنـدێ سەرچـاوەیش کە لە پێشـەکی ناوبـراودا هاتوون ژمارەی لاپەڕەکانیان پیشان نەدراوەو منیش دەستم پێیان نەگەیشت تا ئەو هەندە کەم وکوورییانە ساغ بکەمەوە.

ئەم کارە کە بنـچـیـنـەکـەی پێشـەکی ناوبـراوە، من وەرم گێـراوەتـەسـەر کوردیو پەراوێـزم بۆ دانـاوە. لە ئەنجام دا ئەوەی کە لە بارەی بابـا تاهـیـرەوە بۆم دەرکـەوتـووە خستوومەتەڕوو. وا لێرەدا پێشکەشتانی دەکەم: -

● * ●

## بە ناوی یەزدانی پاك
## ژیانی بابا تاهیری عوریان

شاعیـر نزیکـەی هەشت سەد (800) ساڵـە جوانیو تەڕوپاراوەیی هۆنراوەکانی خۆی پاراستووەو لە پشتی پەردەی ئەم ڕۆژگـارە دوورو درێـژەوە دڵی زانـایـان و سەرجـەمی مەردمی بەرەو خۆی ڕاکێشـاوە، بەداخـەوە مێـژووی ژیانی بەتـەواوی ڕۆشن نیـیـە، چونکـە بابـا تاهـیـر پەیـوندییەکی ئەوتـۆی بە جیـهـانـەوە نەبـووەو ڕەنـدێکی بار سووك و بێ جێگابووە، وەکو خۆی ئەڵێ:

موئـان ڕیـنـدەم کە نامـەم بی قەلـەنـدەر
نەخـون دیـرەم نەمـون دیـرەم نە لەشـکـەر
چو روزئـایـە دبگـەردەم گیـردی گیـتـی
چوشـەو ئایـەد بەخـشـتی وانـە هەم سەر [1]

مێـژوویش گوێ ناداتـە ئەو کەسـانـەی کە بێ شـوێن و لانـەن و پشتی خۆیشی لەباری یادکـردنەوەی ئەوەوە سووك کردووە. لەوانـەیە کە بیشڵێین بۆیـە مێـژوو بابـا تاهـیـری خستـوتـە پشت گوێ چونکـە نە قەسیـدەیـەکی پیاهەڵدانی لەنـاو شاعیـرەکـان دا هۆنـدوتـەوە، نە دیـوانێکی گەورەی دڵـداری دانـاوە، نەبـەشـان و باهـووی پاشایەکی گەورەدا هەڵی داوە. ئیتر مێژوو چ بایەخێك دەدا بە کەسێکیوا. ئایا ئەم شاعـیــرە ڕووتـەڵـە بێ شـوێـن و ڕێـیـە چ جۆرە کارتێکردنێکی لە هۆنراوەکانیدا پەنهان کردووە، کە لەگەڵ ئەو هەمـوو گرنگی پێ نـەدانەیدا هێشتا هۆنراوەکانی لەبیرو هۆشی مەردم دا نەقشی بەسـتـووە، ئەوانـەیشی کە لەگـەڵ ئەودا هاوزمـان و هاونیـشـتـمـان نین چێـژێکی زۆر لە هۆنـراوەکـانی دەبینن و وەریـان گێـراوە بۆسـەر زمانەکانیان. سۆزی دەروونی ئەم شاعیرە بە جۆرێ کاری کردۆتە دڵی هەنـدێ کەس و بە شێـوەیـەك سەرمەستی قسەکانی بوون، کە هیچ شتێ بێجگە لە هەمان هۆنراوە ناتوانی خوماریان بشکێنێو ئەم جۆرە کەسانە ماوەیەك جۆش و خرۆش و تینی خۆشـەویستی لە دەروونیـان دا پەیـدابووە کە نەیانتوانیوە ئەو بەسـەر هاتـە بە هۆی وشـەوە دەربـڕن و هێـزی قسـەکـردن بەرامبـەر بە هەستـەکـانیان کاڵ و کرچ و ناچیزە، بابا تاهیر بەسـەرهـات و هەسـتـەکانی ئەو کەسانە بە زمانێکی تایبەتی بەخـۆی دەردەبـڕێو سازی ئەو بە تاری دڵـی ئەوانـە کۆك دەکـرێ، هەرکـاتێ بابـا تاهـیـر ئاوازێك لێ بدا، تاری دڵی ئەوانە دەکـەوێتـە لەرزەو هەرکـاتێ بابـا تاهیـر ئاوازێ بخوێنێ، لە تینی ئارەزوو و شادی دەیانخاتە ناڵەو هەروەها دڵیشیان دەکەوێتە سەماو خۆشی، خۆ ئەگەر بابا تاهیر بڵێ:

نەوای ناڵـە غەصـی ئەنـدووتـە ذوونـوو
عیـاری قەلـب و خالـیص بووتـە ذوو نوو
بووره سووتـە دلـوون گیـردی هەم ئایـیـم
کە قەدری سووتـە دل دلـسـووتـە ذوو نوو [2]

ئەمـان شادو دڵخـۆش دەبن، چونکـە هاودەمێکیـان بۆ خۆیـان دۆزیـوەتـەوەو ئارەزوویـەکی زۆریـان هەیـە کە ئەم دڵسـووتـاوە بتـوانی ئەو داخـوازییانەی کە لە دەروونیان دایە

ناتەوانن لە دەربڕینیان دا پێیان بڵێ، ئەوانە لە حاڵەتێك دا بوون یان هێشتا لە هەمان حاڵەتدان کە بەردەوامن لەسەر گریـان و پێکـەنین، دەردیـان هەیـەو دەرمـانیـان ناوێ‌و دەسووتێن و بەڵام خۆشنوودن، بابا تاهیر حاڵەتی ئەوانە بەم جۆرە باس دەکات:

**دلـەم ئەز سووزی عیـشـق گیـژوویـژە**
**موژە بەرهـەم زەنـەم سەیـلابـە ریـژە**
**دلـی عاشـق میـثـالـی چووبـی تەڕ بی**
**سەری سووژە سەری خوونـابـە ریـژە**[3]

ئەو کەسە گومبـووانـە خۆیـان دەدۆزنـەوەو وەکو بێ لانەو بێ پـەنـایـەك کە غەزنـەیـەك بدۆزێتـەوە، یان تینـوویەك کە کانی‌یـەك ببینێ ئیتـر بابـا تاهیر بەرەڵاناکەن و هەرکاتێ بابا تاهیر بەم شێوەیە خۆی بەوان دەناسێنێ:

**من ئان بەحـرەم کە دەرظـەرف ئامـەدەستـەم**
**من ئان نوقطـە کە بەرحـەرف ئامـەدەسـتـەم**
**بە هەر ئەلـفـی قەددی بەرئـایـەدا**
**ئەلـف قەددەم کە دەرئـەلـف ئامـەدەسـتـەم**

ئەم خۆپیشـانـدان و خۆیـەلارستی‌یـە لای ئەوان سەیـر نی‌یەو دەزانن کە ئەو، هەموو حاڵەتەکانی دەروونیانی لەیەك چوارینەدا خستۆتە ڕوو و وەکو نوقتە کە شێوەکانی تیپ لە شێـوەی نهـێنی‌و داپـۆشـراوی دەهێنێتـە دەرەوە، تەنگـو چەڵـەمـەکـانیـانی جێبـەجێ کردووە، ئەگـەر چی بەم موعجیـزەیـە خۆی گەیـانـدۆتـە پایـەی گەورەکـانی ئاینی زەردەشتی، کە گوایـا لە سەرەتـای هەر هەزارساڵێ یەکێ لەوانە خۆی دەردەخات، ئەوا ڕێگای زیادە ڕەوی نەگرتۆتە بەر، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین، مەبـەستی ئەم هەزار ساڵـە لای بابا تاهیر چ کاتێ بووەو ساڵ بەگوێرەی بیری ئەو چ ماوەیـەك بووە لە زەمـان، ئەم جۆرە کەسـانـە هۆگـری ئەم شاعیرە ڕووتەڵە دەبن و کاتێ کە دەبیستن دەڵێ:

**موو کە سەر دەربـیـابـوونـەم شەوو رووز**
**سریـشـك ئەز دیـدە باروو نەم شەوو رووز**
**نەتـەو دیـرەم نە جایـەم میـکـە ڕەد دەرد**
**هەمی ذوونـەم کەنـالـوونـەم شەوو رووز**[4]

هەمـان هەسـت لە خۆیـان دا دەبینن، وردە وردە، بە ڕادەیەك شارەزای بابا تاهیرو هۆنراوەو زاراوەکانی دەبن کە هیچ قسەیەك وەکو قسەکانی بابا تاهیر کاریان تێناکات.

هۆنـراوەکـانی بابـاتـاهیـر وەکـو زمـانی ئاسایی ئەمرۆی ناوچـەکـەی خۆی نی‌یـە، لە چاپە جیاجیاکانی‌دا، ئەوەندە گۆڕانی بەسـەردا هاتـووە، کە بەدەست هێنانی ئەصڵەکەی گەلێ سەختە. ماوەیەکە، کە بۆ دۆزینەوەی ئەم ڕاستی‌یەو بەدەسـت هێنـانی نوسخـەیـەکی نزیـك لە ڕاستی‌یـەوە خەریکم، تا لە ئەنجام دا کتێبێکم پەیداکـرد کە ئێـدوەرد هێـرن ئالـن = Edward Heron Allen لەم بارەیـەوە دایـنـاوەو کردوویەتی بە چوار بەشەوە:

**بەشی یەکەم:** پێشەکی‌یەکی تەواوە کە دانەری کتێبە کە بە یارمـەتی چەنـد ڕۆژهـەڵات ناسێکـەوە نووسیویەتی‌و لە هەر لایـەك شتێکی بەدەست هێنـابێ لە بارەی بابـا تاهیـرەوە لە پێشەکی‌یەکەی‌دا خستوویەتی‌یە پێش چاو.

**بەشی دووەم:** وەرگێـڕانی هۆنـراوەکـانی بابا تاهیرە کە خاتو ئێـلیـزەبێـت کیـوتـیس برێنتن = Elizabeth Cutis bernton بە هۆنراوە کردوویەتی بە ئینگلیزی.

**بەشی سێیەم:** هۆنراوەکانی بابا تاهیرە کە دانەری کتێبەکە شەش نوسخەی بەدەست هێناوەو یەکێکیان کە لەلای ئەو لە هەمـوویـان باشتـر بووە کردوویـەتی بە بنچینەی کتێبەکەی‌و لەگـەڵ نوسخـەکـانی‌تـردا بەراوردی کردووەو جیـاوازی هەر شەش نوسخـەکـەی لەژێر هەر چوارینەیەك دا نووسیوە هەر وشـەیـەك کە لەگـەڵ زمـانی فارسی ئەمرۆدا بەرامبەر نەبووە وەکو: (سوجم = سووجەم) کە ئەمڕۆ (سوزم = سووزەم)ەو (دیرم = دیرەم) کە (دارم = دارەم)ە بە کورتی لێوەی دوواوە.

**بەشی چوارەم**: هۆنراوەکانی بابا تاهیرە کە (ئێدوەرد هێرن ئالن) بە پەخشانی ئینگلیزیو شەبەوشە وەریگێراوە، ئەم کتێبە لە ساڵی 1902ز لە لەندەن چاپ کراوە. دانەری ناوبراو هەر شتێکی کە لە بارەی بابا تاهیرەوە دەست کەوتووە، کەڵکی لێوەرگرتووە. بەڵام لە بارەی (تاریخ گزیدە حمداللە مستوفی) کە بابای بە یەکێ لە عاریف و مەشایخەکان داناوە هیچ نەدواوە.

ئێدوەرد هێرن ئالن دەڵێ: هەرچەندە چوارینەکانی بابا تاهیر لەسەر زمانی خەڵکی ناوچەکەیەو گەلێ جار چاپ کراوە، بەڵام لە پێشەکی هیچ یەکێ لەو چاپانەدا شتێکیوا لە بارەی مێژووی ژیانی شاعیرەوە دەستگیر نابێ، تەنها (رضا قلی خان هدایت) لە (تذکرە مجمع الفصحاء) کە دە (10) چوارینەی بابای پیشان داوە، لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ: تاهیری عوریانی هەمەدانی ناوی پیرۆزی بابا تاهیرە، لە زاناو حەکیم و عاریفەکانی سەردەمی خۆی بووەو خاوەنی کەرامات و پایەی بڵندبوو، هەندێ کەس ئەویان بە هاو چەرخی سوڵتانەکانی سەلجووقی داوەتە قەڵەم، ڕاست نییەو بەڵکو ئەو لە مەشایخە کۆنەکانەو هاوچەرخی (دەیالیمە)یەو لە ساڵی (410)ی کوچی لەپێش (عنصری = عونسری)و (فردوسی = فیردەوسی)[5] هاوشانەکانی سەردەمی ئەوان کۆچی دوایی کردووەو چوارینەی جوان و ناوەرۆکی بڵندی بە زمانی کۆن هەیەو چەند نامەیەك لەو پیاوە گەورەیە ماوەتەوەو زانانیان لێکدانەوەیان لەسەر نووسیوەو هەندێ لە چوارینەکانی لەم کتێبەدا نووسراوە. «جلد اول ـ مجمع الفصحاء».

هەروەها (رضا قلی خان) لە کتێبی (ریاض العارفین)دا دەڵێ:

بابا تاهیر لە ساڵی (410)ی کوچیدا مردووەو بەم پێیە ناتوانرێ کە بابا بە هاوچەرخی (عین القضاة همدانی)[6] یا (خواجە نصیر طوسی)[7] دابنرێ. (رضا قلی خان) لە (ریاض العارفین)دا بیست و چوار (24) چوارینەی بابا تاهیری نووسیوە، بەڵام ناڵێ کە سەرچاوەکانی چین، خۆ ئەگەر ساڵی (410)ی کۆچی لە بارەی شاعیرە هەمەدانییەوە ڕاست بێ ئەوا هاوچەرخی فیردەوسییەو لەپێش عومەری خەییام دا[8] بووە. ئێدوەرد براون کە لە ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا گەلێ یارمەتی بەکەڵکی داوم و لەم بارەیەوە دەڵێ: باسی بابا تاهیرم لە کتێبێکی کۆن دا دیوە کە جێگای بڕوایەو ناوی (راحة الصدور وآیة السرور ـ تألیف نجم الدین ابوبکر راوندی)یەو بۆ (سلجوق شاە ابو الفتح کیخسرو)ی نووسیوە لە ساڵی (599 یا 600)ی کۆچیداو ئەو نوسخەیەی ئێدوەرد براون بینیویتی لە ساڵی (635)ی کۆچیدا نووسراوە، لەبەر ئەوەی ئەو کتێبە جێگای باوەڕە، ئێدوەرد براون ئەوەی نەقڵ کردووەو منیش لێرەدا باسی دەکەم: ئەم کتێبە لە ساڵی 1921زدا لە کەمبریج چاپ کراوەو منیش ئەو قسانەی کە باس کرا لەو چاپەوەوەرم گرتووە کە ئەمەیە: ـ

بیستم کاتێ کە سوڵتان (طغرل = توغرول) بەگ هاتە هەمەدانەوە، سێ کەس لە وەلییەکان کە (باباتاهیرو باباجەعفەرو شیخ حمشاد کوهکی) بوون، لای دەروازەی هەمەدان پێیدەڵێن (خضر) ڕاوەستابوون و سوڵتان کە چاوی بەمانە کەوت سوارەکانی لەشکرەکەی ڕاگرت و دابەزیو لەگەڵ (ابو نصر اسکندری)ی وەزیر هاتەلایان و دەستیانی ماچ کرد، بابا تاهیر کە لە ڕواڵەت دا لە دڵدارێکی سەر لێشێواو دەچوو، پێیوت:

ئەی تورك، چی دەکەی لەگەڵ خەڵکی خودادا؟ سوڵتان وتی:

ئەوەی کە تۆ دەفەرمووی، بابا وتی: ئەوە بکە کە خوا دەفەرموێ، ئایەتی (ان اللە یامر بالعدل والاحسان). سوڵتان گریاو وتی: وا دەکەم. بابا دەستیگرت و وتی: ئایا ئەمەت لە من قبووڵ کرد؟ سوڵتان وتی: بەڵێ. سەرەمەسینەیەکی شکاو، کە ساڵەها بابا دەستنوێژی پێگرتبوو، لە پەنجەیا بوو، دەریهێناو کردییە پەنجەی سوڵتان و وتی: بەم شێوەیە مەملەکەتی جیهانم کردە دەستت و تۆیش دادپەروەر بە، ئیتر دوای ئەوە سوڵتان

هەمیشە ئەمەی لە دوعا خوێندن دا پێ‌بوو، کاتێ کە جەنگی بکردایە ئەمەی دەکردە پەنجەی. ئیدوەرد براون دەڵێ:

من واگومان دەکەم، ئەمە بەڵگەیەکی بەجێ‌یە کە ئێمەی بێ‌نیاز کردووە لە کتێبەکەی (رضا قلی خان) ئەم بەڵگەیە بیروڕای جیاوازی سەردەمی ژیانی بابا تاهیری ساغ کردۆتەوە.

هۆنراوەکانی بابا تاهیر کە لە ساڵی 1267 کۆچی‌دا چاپ کراوە هەروەها، لە 1308 کۆچی لە (بومبەی)و 1274و 1301 کۆچی لە تاران دا، لەگەڵ موناجاتنامەکەی (خواجە عبداللە انصاری) لە (بومبەی) هیچ پێشەکی‌یەکیان بۆ نەنووسراوە بیست و پێنج (25)چوارینەی بابا تاهیری نووسیوەو دەڵێ: عوریان، ناوی بابا تاهیرەو، دیوانەیەکە لە هەمەدان و ژیرێکە لە هەمەدان. لە هەندێ کتێب دا ناوبراوەو رەوشتیشی لەناو صوفی‌یەکان دا ناوبانگی دەرکردووەو دڵدارێکی شەیدایەو جۆش و سۆز لە هۆنراوەکانی‌دا ئاشکرایەو هۆنراوەکانێ بە زمانی راجی بووە. [راجی: واتە رازی کە تیپی «ز» بووە بە «ج» بابا تاهیر لە باتی سووزەم دەڵێ سووجەم، زمانی راجی یا رازی زمانێکە بە قسەی کتێبی (ریاض العارفین) لەو سەردەمەدا خەڵکی «رەی»و «دینەوەر» قسەیان پێ‌کردووە. راج یا راز واتە رەی یەکێ لە شاعیرەکانی‌تر کە ناوی (خواجە کمال الدین بندار رازی)یە هاوچەرخی (مجد الدولە دیلمی)یەو لەپێش سەردەمی بابا تاهیردا بووەو هەندێ هۆنراوەی هەیە کە زمانەکەی وەکو زمانی بابا تاهیرە. دانەری کتێبی (مجمع الفصحاء ـ جلد اول)، دەڵێ: بەندار هۆنراوەی ناوبراوی بە زمانی رازی وتووەو زمانی بابا تاهیر جیاوازە لەگەڵ زمانی رازی. «وحید»].

«کاپتن چارلز کێمبوڵد Captain Charles Kembald »ی ئینگلیزی ئەو دەنگ و باسەی کە دەم بەدەم و وەچە لە دوای وەچە لە بارەی بابا تاهیرەوە گێراویانەتەوە، نووسیوێتیەوە کە ئەمەیە:

بابا تاهیر نەخوێندەوارێکی دارفرۆش بووەو خووی بەوەوە گرتووە کە هەموو رۆژێ بڕوات بۆ قوتابخانەو گوێ بداتە ئەوە دەرسانەی کە قوتابیان دەیخوێنن، بەڵام قوتابیان گاڵتەیان پێ‌دەکرد، رۆژێ زۆری لە خۆی کردو وتی: من سەرم لەوە سوڕماوە کە چۆن ئەو دەرسەی کە ئەم قوتابیانە دەیخوێنن فێری دەبن و دوای رۆژێ لەو بابەتەوە قسە دەکەن. ئەو کەسەی کە باباتاهیر ئەم پرسیارەی لێ‌کردبوو وەڵامی دایەوەو وتی: ئەم کارە زۆر سەخت نی‌یەو ئەو هەموو قوتابیانەی کە دەیانبینی هەموو رۆژێ دێنە کۆڕی دەرسەوە، لە نیوەی شەودا یەکەیەکە خۆیان ڕووت دەکەنەوەو خۆیان دەخەنە ناو حەوزی قوتابخانەوەو یەکجار کە سەردەکەن بەناو ئاودا ئەو هەموو دەرسانەی کە بە ڕۆژ خوێندوویانە فێری دەبن. بابا تاهیر، باوەڕی بەم قسەیە کرد، کاتێ کە شەو داهات بەگوێرەی قسەی ئەو کەسە رەفتاری‌کردو ئەمەیش لە یەکێ لە شەوەکانی ساردی زستان دا بوو، بابا تاهیر کاتێ ئەم کارەی ئەنجام دا گڕی ئاگرێ لە ئاسمان دەرکەوت و دوای ئەوە خۆی‌کرد بەدەمی بابادا، کە ڕۆژ بووەوە، چوو بۆ قوتابخانەو کەوتە باسی بابەتەکانی فەلسەفەو هەموویانی بەزاند، قوتابیانیش بەهۆی ئەم دیاردەیەوە پرسیاریان لێ‌دەکرد، بابا تاهیر وتی: ئەو کارەی کە ئێوە دەیکەن بۆ فێربوونی دەرس، منیش ئەوەم کردووەو، دوای ئەوە مەسەلەی شەوی بۆ گێرانەوە کە لە باتی رۆیشتن بۆ قوتابخانە، چل جار سەری کردووە بەناو ئاوداو ئنجا وتی: «امسیت کردیاً واصبحت عربیاً» ئیتر لەپاش ئەوە جۆرە تین و جۆشێ کەوتە گیانییەوە، بەجۆرێ کە کەس نەی دەتوانی لەنزیکی‌یەوە خۆی‌ڕابگرێ‌و دوای ئەوە، نەدەرۆیشت بۆ قوتابخانەو ڕۆژگاری لە چیاو دارستانەکان دەبردەسەر.

میستەر بلۆشێت لە پاریس، دکتور رس لە لەندن، میستەر براون لە کەمبریج و میستەر ئەلیس لە بریتش میزیوم، ئەم زەحمەتەیان فەرموو، کە سەرچاوەی ژیانی ئەم شاعیرەم پیشان بدەن و لەگەڵ ئەوەش دا میستەر

بلوشێت «Mr Blochet» ناکاداری کردم لە نوسخەی ژمارە ؛ 195 کە لە نامەخانەی میللی پاریس دایەو ناوی «کلمات القصار»ە، زاراوەی سوفی‌یانەیەو لە پێشەکی‌یەکەی‌دا بابا تاهیری داناوە بەدانەری کتێبەکەو کومان لەوە دەکری کە یەکێ بێت لەو نامانەی کە «رضا قلیخان» لە «مجمع الفصحاء» دەستی بۆ راکێشاوە.

## . محمود عرفان

### بابا تاهیر

گۆری بابا تاهیر دەکەوێتە رۆژئاوای قەراغی شاری هەمەدان، لە گەرەکێك کە بە «بن بازار» ناسراوەو کەوتۆتە سەرگردێك، کە نزیکەی پێنج (5) گەز بەرزە، لە ناوچەی ئیمام زادە (حارث بن علی)، ئەم گردە دیمەنێکی زۆر دڵرفێنی هەیە، لەلایەکەوە لووتکەو زنجیرە شاخەکانی ئەڵوەند بەرامبەرێتی‌و لەلایەکی‌ترەوە ئەو زەوییانەی کە لە هاوین دا دەکرێن بە کشتوەکاڵ و سەوزەوات، بەرامبەر بە ئارامگاکەی، خانوویەکی بچووکی چەند ژووری هەیە، بەدرێژایی‌و پانی (15) گەزێك و بەرزی چوارگەزو نیو (4,5)و لە تەنیشت گۆرەکەی باباوە، گۆری دایەنەکەی‌و گۆری (حاجی میرزا علیقلی کوثری)ە، کە لە سوفی‌یە بەناوبانگەکانی هەمەدانەو کوری (حاج ملارضا)یە کە خاوەنی تەفسیری (در النظیم ومفتاح النبوة)یە. ئەو بەشەی کە ئارامگای بابا تاهیری تێدایە، لە چەند ژوورێك پێك هاتووەو بە زۆری بووە بە شوێنی چەرس و[9] بەنگ، ئەو ناوەیان پیس کردووەو دانیشتوانی ئەو ناوچەیان بێزارو وەرس کردووە، گۆرەکەی بابا هەموو رۆژانی هەفتەو بەتایبەتی شەوانی هەینی بووە بە زیارەتگای مەردمی سوفی مەشرەبی شارەکە.[10]

ئەو قسە بەناوبانگانەی کە لە هەمەدان و لە بارەی باباوە دەیگێرنەوە: -

1 - دەگێرنەوە کە بابا لەسەرەتاوە چۆتە قوتابخانەی گەورەی هەمەدان و قوتابیانی دیوە کە بەیەکەوە سەرگەرمی قسەو باسی زانستی بوون و ئەویش لەو بارەیەوە ئارەزوویەکی پەیداکردووەو خۆی خەریك کردووە بە خوێندن ماندووی دەکاو بە شێوەیەکی سادەو دڵێکی پاکەوە لە یەکێ لە قوتابییەکانی دەپرسێ: تۆ چیت کردووە کەوا فێری ئەم هەموو زانیاری‌و هونەرانەبووی؟ ئەویش بەگاڵتەوە دەست بۆ حەوزی قوتابخانەکە رادەکێشی‌و دەڵێ: ئێمە لەناو ئەم حەوزەدا خۆمان شتووەو ئەم زانستەمان پێ‌بەخشراوە. لەو کاتەدا هەمەدان زۆر ساردبوو، حەوزی قوتابخانەکە بە ئەستووری چەند گرێیەك بەستبووی، بابا لەپاش بیستنی ئەم قسەیە بریاری‌دا کە بە هەر کۆشتێکی سەخت بێ، دەبێ بێ بە حەوزەکەدا خۆی بشوات.

دوو سەعاتێکی مابوو بۆ بەیانی، قوتابیەکان هێشتا لە خەودا بوون ئەم لە خەو هەڵساو سەهۆڵەکانی شکاندو خۆی کرد بەقووتابی‌و هاتە دەرەوە، زۆری سەرمابوو، هەر چۆنێ بوو خۆی گەیاندە ژوورەوەو دەرگاکەی لەسەر خۆی داخست و کە رۆژ بووەوە بابایان بینی بەدەم پێکەنینەوە دەیوت: (أمسيت كرديا واصبحت عربيا).[11]

2 - سەرمای هەمەدان بەو شێوەی کە شاعیرێکی عەرەب دەڵێ: (همدان متلفة النفوس ببردها). بەراستی بەو جۆرەیە، دەگێرنەوە، بابا لەو سەردەمەدا لە چیای ئەڵوەند نیشتەجێ‌بوو بوو، گرو جۆش و کوڵی دەروونی‌و تینی خۆشەویستی‌ی راستی بە جۆری گەرمی کردبوو، کە بە هەر چوار دەوریا بە ئەندازەی گەزێ بەفری توندابووەوەو ئاوەکە چووبووە ناو زەوی‌و گژوگیای بەهاریی بە هەر چوار دەوریا رووابوو.

3 - بابا خوشکەزایەکی ئەستێرەناسی هەبوو، کاتێ کە دەیویست جێگای یەکێ لە ئەستێرەکان بدۆزێتەوە، سەیری هەر کتێبێکی دەکرد شتێکی دەستگیر نەدەبوو لەو بارەیەوە، لەبەر خۆیەوە وتی: بابرۆم ئەم تەنگەو چەڵەمەیە لە خاڵم بپرسم، بۆ ئەم مەبەستە سەرکەوتەسەر یاڵەکانی ئەڵوەند، تا گەیشتە ئەو شوێنەی کە بابای لێ‌بوو، ئەوەیش لە کاتێك دا بوو کە بابا لەنزیك لووتکەی شاخەکە، لەسەر زەوییەکە

لێی کەوتبوو، لە حاڵەتی رازو نیازو سۆرو گودازدا بوو، خوشکەزاکەی بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر خۆی پلێ گەیاندو کاتێ لە دوورەوە بابای بینی کە لەسەر دەم لێ کەوتووە، شتێکی بە خەیاڵ دا هات، ئەویش ئەمەیە، کە شەریعەتی ئیسلام نوستن لەسەردەمی بە شتێکی خراپ داناوە، ئایا بۆچی خاڵی من یەکێ لەو شتانەی کە شەرع بە خراپی داناوە دەیکات. بابا خێرا هەستی بەبیرکردنەوەکەی ئەو کردو هاواری لێ هەڵساو وتی: ئەمە لە کاتی نوستن دا خراپەو من نەنووستووم، دوای ئەوە بە پەنجە گەورەی پێی، لەسەر زەوی شتێکی دروست کردو وتی: ئەمە مەبەستەکەی تۆیەو وەریبگرەو برۆ. ئەو بەبێ ئەوەی مەبەستەکەی خۆی دەربخات تەنگ و چەڵمەکەی خۆی بە حەلکراوی دەست کەوت و گەڕایەوە.

4 ـ وادەگێڕنەوە کاتێ کە (عین القضاة)ی بە ناوبانگی هەمەدانییان تاوانبار کرد بە کفر، سزادرا بە سەربڕین و لاشەکەیان فڕێدایە مەیدانی هەمەدان، کە ئێستا بە مەیدانی زوغال ناسراوە واتا مەیدانی خەڵووز، لە کاتێك دا کە تەماشاکەران، دەورەی لاشەکەیان دابوو، بابا لەوێوە تێپەڕیو کاتێ کە ئەمەی بینی هاتەپێشەوەو نووکە پێیەکی لە قازیداو وتی: پیاوانی خوا بەم جۆرە نانوون. (عین القضاة) یەکسەر لە شوێنی خۆی راپەڕیو سەرەبڕاوەکەی خۆی خستەبن دەستیو هەڵات و کۆمەڵی تەماشاکەران لەدواوە سەیریان دەکرد، تا قازی گەیشتە گۆڕستانی گشتی کە بە (ئەهلی قوور) بەناوبانگەو لەوێ خۆی کرد بە چاڵێکی قوڵ داو لەچاو ون بوو، ئێستاش ئەو چاڵە لە هەمەدان دا بە (چال عین القضاة) ناسراوە.

5 ـ حاجی عبدولوەهاب شوشتەری، کە یەکێ بوو لە شێخ و سۆفییەکانی ئەهلی زیکر، کۆتایی تەمەنی لە هەمەدان دا بردبووەسەر، بۆمی گێڕایەوەو وتی: لە کۆڕێك دا بابا ئامۆژگاری دەکردو ئایەتی (وعیدو تخویف)ی دەخوێند. لە کۆتایی کۆڕەکە دانیشتوان بینیان شێی تەرییەك لە گۆشەیەکی کۆڕەکە پەیدابووە، هۆی ئەمەیان لە بابا پرسیو بابایش وتی: یەکێ لە پەرییەکان لە کۆڕەکەدا بووە، بە هۆی بیستنی ئەم قسانە لە شەرم دا بوو بە ئاوو چوو بە ناخی زەویدا، ئەم شێو تەرییە نیشانەی تواندنەوەی ئەوە.

**نووسینەکانی بابا تاهیر:**

من تەنها (کلمات قصار)ی ئەوم دیوە کە (حاجی ملاسلطان علی گنابادی) بە فارسیو عەرەبی لێکدانەوەی لەسەری نووسیوە، لە هۆنراوەکانی بابا تا ئێستا نوسخەیەکی تەواوی بێ هەڵەم دەست نەکەوتووەو ئەوەیشی کەوا لەبەر دەست دا بە جێگای باوەڕ نییە، لەراستیدا زۆربەی ئەو چوارینانەی کە لە دیوانە چاپکراوەکانی بابادا بەناوی ئەوەوە هاتوون هینی ئەو نین. من ئەوەم لەبیرە، کە چەند چوارینەیەکی کوردی لە یەکێ لە دەستنووسەکان دا، بەناوی باباوە نووسرابوو (شاطر بیگ محمد) شاعیری بەناوبانگی هەمەدانی دەیوت هینی منەو بەناوی باباوە نووسراوە.

هەمەدان. نووسینی هەمەدانی.

★ ★ ★

بابا تاهیری عوریان هەمەدانی بووەو ڕێگای دەروێشیو ژیانی سادەی گرتۆتەبەر شێوەی سۆفییەکانە. ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی کە گوشەگیر بێت و بە پەنهانی بژیو لە بارەی ژیانییەوە شتێکمان بۆ بەجێ نەهێڵێ، تەنها ئەوە نەبێ کە لە هەندێ کتێبی سۆفییانەدا، باسێك لە بارەی پلەی مەعنەویو ڕێوشوێنی دەروێشیو خواپەرستیو بێ نیازی ئەوەوە هاتووە، ئەوە لە بارەی بەسەرهات و ژیانییەوە ئاشکرایە، گوایا بە یەك گەیشتنێکە لەگەڵ توغرول دا، کە یەکەمین پاشای سەلجووقیبووە، لە دەوروبەری ساڵی (447) کۆچی لە هەمەدان دا، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە سەردەمی ناوبانگ پەیداکردنی بابا لە ناوەراستی سەدەی پێنجەم دا بووەو لەوە دەچێ کە لە کۆتایی سەدەی چوارەم دا

لەدایك بوویێ.

بابا تاهیر یەکێکە لە شاعیرە دڵدارە ئازار چەشتووەکان، ئەو هۆنراوانەی کە وتوویەتی، بەڵگەی سۆزی دەروونی ئەوە، هەروەها چەند نامیلکەیەکی بە عەرەبی و فارسی داناوە کە ئەمانەن:

(کلمات قصار) بە عەرەبی، کە بیروباوەڕی سۆفییانەیە لە بارەی زانست و زانیاری و خواپەرستی خۆشەویستی. ئەمانەی بە ڕستەی کورت کورت و کاریگەر پیشان داوە، بەشی زۆری ناوبانگی بابا تاهیر بە هۆی چوارینە شیرین و کاریگەرە سۆفی گەرییەکانیتی، یەکێ لە تایبەتییەکانی ئەم چوارینانە ئەوەیە، کە لەگەڵ کێشی ئاسایی چوارینەدا کەمێ جیاوازی هەیەو هەروەها بە زمانی داینـاوە کە لە شێوەی لوری دەچێ، لەم بارەیەوە لە کتێبە کۆنەکان دا لەژێر ناوی (فەهلەویات)دا[12] هاتووە. هەموو چوارینە سادەو کاریگەرەکانی شاعیر باسی یەکێتی جیهان و دووره‌پەرێزی ئادەمیزادو پەرێشانی و تەنهایی و کەم مایەیی و بێدەسەڵاتی خۆی دەکات. گلەیی دەکات بە هۆی دوورکەوتنەوەی لە خۆشەویست و جیلوەی داوە بە هەست ئارەزووی مەعنەوی خۆی.

بابا تاهیر لە هەمەدان دا ئەم جیهانەی بەجێهشتووەو لەهەمان شاریش دا نێژراوە.

تاریخ ادبیات - دکتر شفق ل 108 - 109

هیدایەت (هدایت) دەڵێ: تاهیری عوریانی هەمەدانی ناوی پیرۆزی بابا تاهیرەو لە زاناو حەکیم دا سۆفییەکانی سەردەمی خۆی بووەو خاوەنی کەرانات و پایەی بەرزبووە، هەندێ کەس ئەویان بە هاوچەرخی پاشاکانی سەلجوقی داناوە بە هەڵەدا چوون.

ئەو لە مەشایخە کۆنەکانەو هاوچەرخی دیلەمییەکان بووە. لەساڵی (410)ی کۆچی دا لەپێش (عنصری)و (فردوسی)و دۆستەکانی ئەوان دا کۆچی کردووە، چوارینەی جوان و ناوەرۆکی بەرزی هەیە بە زمانی کۆن. دەڵێن بەرهەمی نووسراوی لەپاش بەجێماوەو زانایان لێکدانەوەیان لەسەر نووسیوە.

مجمع الفصحاء - ج 1، ص 326

ئێدوەر براون لە بەرگی دووەمی مێژووی ئەدەبیاتەکەی ل 360 - 361دا، ئەم داستانەی خستۆتە ڕوو، خوالێخۆشبوو ڕەشید یاسمی،[13] لە پێشەکی چاپی دووەمی دیوانی بابا تاهیری (وحید)دا نووسیوێتی، لەپاش نەقڵ کردنی ئەوەی کە لە (راحة الصدور)ەوە وەرگیراوە، بەم شێوەیە دەڵێ: ئەم گەشتی توغرول لە (طغرل) لە دەوروبەری ساڵانی (447 - 450) کۆچی دا ڕوویداوە، هەرچەندە وشەی پیر لە (راحة الصدور)دا دوور نییە کە دەست نیشان بێ بۆ پایەی ئیرشادی بابا تاهیر، نەوەك زۆری تەمەن. بەڵام بە هۆی جۆری گفتوگۆکەی لەگەڵ توغرول داو ئەو بایەخەی کە لە دوو هاوڕێکەی زیاتر پێیدراوە لەلایەن پاشاوە، دەتوانین بڵێین تەمەنی لە پەنجا ساڵ بەرەو ژوورتر بووە، بەم پێیە لەدایك بوونی دەکەوێتە کۆتایی سەدەی چوارەمی هیجری، لێکۆڵینەوەی خوارەوە دان بەم بۆچوونەدا دەنێ و لە نێوان هەندی میللەتان دا، باوەڕوایە، کە هەر هەزار ساڵێ گەورەیەك دەردەکەوێ.

مەسیحییەکان لەوانیان وەرگرتووە.[14] هەروەها لە ئێرانی دوای ئیسلامیشی دا ژمارەی هەزار بایەخێکی تایبەتی پێدراوەو لە مەسەل و هاتووە کە لەپاش هەزار، ژمارەیەك نییەو (نصر خسرو)[15] دەڵێ: ئەوەی ژمارەیە هەمووی لەژێر هەزاردایە (آنجه شمار است جمله زیر هزار است».

خاقانی شیروانی[16] لە بارەی پەیدابوونی گەورەیەك لە سەرەتای هەر هەزار ساڵێك دەفەرموێ:

گویند کە هر هر سال از عالم
آید بوجود اهل وفائی محرم
آمد زین پیش و مانزادە ز عدم
آید پس از این و مافرو رفتە بغم[17]

بابا تاهیر لە دوو بەیتی ی «الف قدم کە در الف آمدستم - ئەلف قەددەم کە در ئەلف ئامە دەستەم» خۆی

ڕاپیشـــان داوە کە یەکێکـــە لە گەورەکـــان. ئەڵبـەتـە بۆ ئەم حســـابــە نابێ وابـزانـرێ کە هەزار ساڵ تەرخـان کراوە بۆ مێـــژووی ساڵـی کۆچـی، چونـکــە خاقــانـی لە سەدەی شەشـەم دا ئەم تێپـەڕبـوونـەی دیـاری کردووەو کاتێ واز لە مێژووی ساڵی کۆچی بهێنین مێژووی زایینی سەرنجمان ڕادەکێشیو بە لێ وردبـــوونـــەوەیــەکی سەرپێیی بۆمـــان دەردەکەوێ کە یەکەمی دیسامبەری ساڵی هەزار (1000)ی زایـیـنی ڕێکـەوتی سەرەتـای موحـــەڕەمی (391) کۆچی قەمەری دەکات.

بە گوێـرەی ئەمـە لەدایـك بوونی بابـا تاهیر، لە هزاری زایـیـنـیو (1000ز) لە ساڵـی (390 یا 191) کۆچـیدا بووە، لەم مێـــژ ووەوە تا تێپـــەڕبــوونی توغـــرول بە شاری هەمــەدان دا «1055 ـ 1058ز»، «55، یا 58» ساڵ دەکات و «میرزا مهدی خان کوکب» کە ژیانی بابا تاهیری لە گۆڤاری ئاسیای بنگالە، لە ساڵی (1904ز)دا نووسیوە یەکێ لە دوو بەیتە پڕ پێچ و پەناکەی بە حسابی ئەبجەدی حەل کردووەو ساڵی لە دایك بوونی بابای دەرهێناوە.

مو آن بحـــرم که ظرف آمـــدســـتـم
موآن نقطــه که در حرف آمـــدســـتـم
بەهــر الــفــی قدی بر آیــو
الــف قدم که در الــف آمـــدســـتـم

«الف قد»و «طاهر» و«دریا» هەر یەکێ لەمانە بە حسابی ئەبجـەد دەکـاتـە (215)، ئێستا ئەگەر میقداری «الف قد» کە دەکاتە (215)، لەگەڵ میقداری «الف» دەکاتە (111) کۆبکەینەوە، ژمارەی (326) دێتە ئەنجام، کە بە تەواوی ڕێـك دەکـەوێ لەگـەڵ ئەنجـامی کۆبـوونـەوەی میقـداری تیپەکانی وشەی (هزار = هەزار)، ئەگەر هەزار بەم جۆرە بنووسرەێ:

(ها. زا، الف را). واتای دوو بەیتیەکە بەم جۆرەیە:

لەپاش هەزار ساڵ گەورەیەك دەردەکەوێو من ئەو (الف قد)ەم، واتە (طاهر)ێکم کە لە (الف)هاتوومەتە جیهانەوە، واتە لە ساڵی (الف قد)، (الف) کە ساڵی (326) دەکات.[18]

وتارەکەی (مینورسکی) لە بارەی بابا تاهیرەوە وەرگێرانی لەلایـەن دوکتـور کاسمی لە گۆڤـاری (ارمغان، سال نهم، شماره دهم).

پێشـەکی دیـوانی بابـا تاهیـر، ڕاستکـردنـەوەی، وحیـد دستگردی، چاپ سوم، 1331 شەمسی، ل 14، 15.

لە بارەی هۆنـــراوەی ناوبـــراو سەرنجی تیـوریـیـەکـەی (مجتبی مینـوی) بدە، ل 73، ستـوونی سێـیـەم، ل 74 ستوونی یەکەم هەمان بەرگ.

ئەو کەرامـەتـانـەی کە لە بارەی باباو دەیگێڕنەوە، لەسەر دەمـی گەلـێ کەســـە، بەڵام دەبـێ ئەمـــەیش بڵـێـین کە: مەبــەسـتـی خۆخـسـتـنــە ناو ئاوی بەســتـــووی حەوز بۆ دەست هێنـانی زانست لە «امسیت کردیـاً واصبحت عربیاً» وەرگیـراوەو ئەم ڕستـەیـە لە پلێشەکی «مەسنەوی ڕۆمی»[19] ناسراو بە حسام الدین[20] کە مەولەوی[21] کتێبەکەی خۆی بەداخـــوازی ئەو نووسیـوەتـەوە، نووسـراوەو دراوەتـە پاڵی. هەروەهـا لە «نفحـات الانس جامی»دا[22] هەمـان ڕستەیاز داناوە بە هینی «ابو عبدالله بابویی» دیسان بەسەرهاتی وێنە کێشـانی ئەستێـرە بە پەنجـەی پێ لەســەر بەفر بۆ خوشکەز ئەستێـــرە ناســەکـــەی خۆی، دراوەتـــەپـاڵ «بــابـا افضـل کاشانی».[23]

پێشەکی «دیوانی بابا طاهر، مصحح وحید دستگردی، بقلم رشید یاسمی، چاپ سوم، تهران 1331 شمسی.

★ ★ ★

دانەری (نزهە القلوب)[24] دەڵێ: هەمەدان لە ناوچەی چوارەمە، زیارەتگای پیرۆزی لێیە، وەکو: گۆڕی، «حافظ ابـو العـلای همـدانی»و «بـابـا طاهـر دیـوانه»و «شێخ عین القضات»و... هتد.

نزهە القلوب ـ چاپ لیدن. ج/2، ص 71.

★ ★ ★

هەنـدێ کەس بابـا تاهیـریـان بە شیعـەی (اثناعشری)

داناوە، بەهۆی ئەم دووبەیتەوە کە دەڵێن هینی ئەوە:

ئەزان رووزی کەمارا ئافەریدی
بەغەیر ئەز مەعسیەت چیزی نەدیدی
خوداوەندا بە حەقی هەشت و چارت
زمو بگوزەر شوتر دیدی نەدیدی(25)

مەبەست لە هەشت و چار دوانگزە ئیمامە.

ئێدوەرد براون دەڵێ: لەو شاعیرانەی کە بەشێکی زۆری هۆنراوەکانیان بە شێوەی تایبەتی خۆیان داناوە، بابا تاهیری عوریانە، چوارینەکانی بابا تایر لەگەڵێ لە ناوچەکانی ئێران دا لەسەر زمانی خەلکەو دەتوانین بابا تاهیر بخەینە ریزی «رابرت بێرنز ـ Robert - Burns ـ 1759 ـ 1796ز» کە یەکێکە لە شاعیرە بەناوبانگەکانی سکوتلندە، بێگومان بەشی زۆری خۆشەویستی بابا تاهیر بە هۆی بیری سادەو دروستیو رەوانی قسەو ئاوازی وشەکانیو سادەیی کێش، کە هەمووی لەسەربەحرەو پێی دەڵێن (بەحری هەزەجی موسەددەسی مەحذووف).

تريخ ادبيات برون، ج1، ترجمة علي پاشا صالح ص 131 ـ 132.

★ ★ ★

«مجتبی مینوی» لە گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیاتی ساڵی چوارەم، ژمارە دوودا دەڵێ: دوو بەیتی بەحری هەزەجی موسەددەسی مەحذووف کە بە فەهلەویات بەناوبانگە، لە فارسیدا شوێنێکی تایبەتیو پلەیەکی باڵای هەیە، لەگەڵ ئەوەی کە گەلێ لە شاعیرەکانی وەکو: (پنداری رازی، محمد مغربی، صفي الدين اردبيلي، محمد صوفي مازندراني)و زۆر کەسی تر کە ناویان نازانم، ئەم جۆرە دووربەیتی یانەیان وتووە. لەم مەیدانەدا، ناوی بابا تاهیری عوریان لە هەموو شاعیرەکان زیاتروا لەسەر زمان، بە جۆرێ بەشی زۆری دوو بەیتییەکانیان بە هینی بابا تاهیر داناوەو بۆ ئەوەی کە دیاری بکرێن کامەیان هینی بابا تاهیرەو کامەیان هینی شاعیرەکانیترە، بەو ئەندازەیە سەختە کە چوارینەکانی خەییام لەگەڵ ئەو چوارینانەی کە هینی شاعیرەکانیترەو دراوەتەپاڵ ئەو جیابکرێنەوە. شتێکیتر کە بۆتە کۆسپ بۆ دیاری کردنی خاوەنی ئەم دوو بەیتییانە ئەوەیە کە بەشی زۆری نووسەری دەستنووسە فارسییەکان بە پێی زەوقی خۆیان و نەپاراستنی بەرهەمی خامەی کۆنەکان و دەستکاری کردنیان بەگوێرەی زمانەکەی خۆیان، هەموو وشەیەکی سەختیان گۆریوەو دوو بەیتییەکانیان لە زمانی ئەدەبی نزیکتر کردۆتەوە، بە جۆری کە نازانرێ لە بنەرەتا بە شێوە زمانی کام ناوچە بووەو ناتوانرێ کە بەگوێرەی ئەوانە تایبەتییەکانی شێوە زمانی ئەو ناوچەیە بنووسرێتەوە.

تەواوترین نموونەی ئەم دوو بەیتییانە کە لە شوێنێك دا کۆکرابێتەوەو بە هینی بابا تاهیر دانرابێ، ئەو چاپەیە کە خوا لێخۆش بوو (وحيد دستگردي) دوو جاری چاپ کردووە لە تاران. دوور نییە کە بڵێین ئەمە کتێبێکەو شایانی خوێندنەوەیە، بەڵام لە بارەی ناسینی هۆنراوەکانی بابا تاهیرو کردنی بە هۆیەك بۆ لێکۆڵینەوەی شێوە زمانی ناوخۆی هەمەدان بەتەواوی کارێکی بێ کەڵکە.

دۆزینەوەی دەستنووسە کۆنە باشە دەستکاری نەکراوەکان یا کەم دەستکاریکراوەکانی ئەم دوو بەیتییانەو چاپ کردنیان بە هەمان شێوەی خۆی، دوو کەڵکی هەیە بۆ ناسینی شێوەی زمانەکەیو دیسان شێوەی شاعیرەکە دیاری دەکات.

ناموێ لێرەدا باسی ژیانی بابا تاهیر بکەم، چونکە لەم بارەیەوە شتێکی تازەم بەدەستەوە نییە کە بیڵێم و ئەوەی کە لە کتێبە چاپ کراوەکان دا لەم بارەیەوە نووسراوە وەرگیراوە لە: (راحة الصدور ـ چاپ اوقاف گيب 1921 ميلادي ص 98 ـ 99).

دەگێڕنەوە کە سوڵتان توغرول چووە بۆ هەمەدان بۆ دیدەنی بابا تاهیر، ئەویش سەری لوولەی مەسینەکەی شکاندووەو وەکو ئەنگوستیلە کردوویەتییە پەنجەی توغرول و وایش زانراوە کە یەکێ لە هاروچەرخەکانی ئێمە واتی بۆچووە کە بابا تاهیر لەو ساڵەدا بەلایەنی کەمەوە

پەنجا شەست ساڵ بووە، لە دەوروبەری ساڵی (390)ی کۆچی‌دا لەدایك بووە.

«ئـەلف قەددەم کە دەر ئەلف ئامـە دەسـتـەم» مەبـەستی ئەوە بووە کە لە ساڵی (1000ز)دا هاتۆتە جیهانەوە، بەم پێ‌یە بابا تاهیر ئاگاداربووە لە مێژووی میللەتان، هەروەها ساڵـی لەدایـك بوونی خۆی بە باشی زانیـوەو دیســان لە

شیعـرو تنیش دا باڵابـووەو حسـابەکەیشی زۆرورده، یا واز لەمــە بهێنین و مەبــەستی من لێـرەدا نەقڵی دوو پارچــەی هەشـت دوو بەیـتـی‌یـەکــە دەڵـێن هینی بابـا تاهیــرە لە دەستنوسیکی دەتوانم بڵێم کۆنەوە وەرگیراوەو ئیتر بێ‌ئەوەی کە خۆم دەستکری‌یەکم کردبێ. ئەم دەستنووسە کۆمەڵێکە لەژێـر ژمـارەی (2546)دا لە موزەی قونیـە، واتـە لەسـەر گۆری (مــەولانــا جلال الـدینی بەلخی ناسـراو بەمـەلای رۆم)، کە ساڵی (838)ی لەسەرەو بەیتەکان لێرەدا سەرو بۆرو ژێری لەسەرەو منیش لەبەر ئەوەی کە لە چاپێکی‌تردا گۆرانی تێـدا روونـەدا، بە جۆرێ نووسیـومـە کە بیکەن بە کەلیشە، توانیومە ئەمە بە جۆرێ نەقڵ بکەم کە بە تەواوی وەکو دەستنووسە کۆنەکە نووسیومەتەوە.

کۆتایی وتاری مینەوی

ئێمـە لێـرەدا تەنهـا یەك دوو بەیتی لە دوو بەیتی‌یـەکانی مینەوی بۆ نموونە پیشان ئەدەین، کە نەقڵی کردووە:

**من ئان پیــرەم کە خوا نەنــدەم قەلــەنــدەر**
**نە خانــەم بی نەمــانــەم بی نەلــەنــگــەر**
**رو هەمــمــە رو وەرانــەم گیــردی گیــتــی**
**شەو دەر ئایــەی‌و ئەو سەنـگـی نەهــەم سەر**[26]

★ ★ ★

**ئەمیش هینی ئەوە:**

**چ خوش بی میــهــرەبــوونی ئەز دوو سەربی**
**کە یەك سەر میــهــرەبــوونــی دەردی سەربــی**
**ئەگــەر مەجنــوون دلی شووریــدەیی داشت**
**دلــی لەیــلی ئەز ئوو شووریــدە تەربــی**[27]

**وشــوم واشــوم ئەزئیــن عالــەم بدەر شەم**
**وشــوم ئەزچیــن و ماچیـن دیــر تــر شەم**
**وشــوم ئەز حاجـیــانــی حەج بپــرســەم**
**کە ئەی دیــری بەســە یا دیــرتــەر شەم**[28]

**تاریخ ادبیات برون ج1، ترجمة صالح ص 131و 132.**

**دلــی دیــرەم خەریــداری مەحــەبــبــەت**
**کە زو گەر مەســت بازاری مەحــەبــبــەت**
**لیــبــاســی بافــتــەم بەر قامــەتــی دل**
**ز پوودی میـحـنــەت و تاری مەحــەبیــەت**[29]

**تاریخ ادبیات دکتر شفق چاپخانەی پیردر ص 109 - 110.**

★ ★ ★

لە بارەی شێـوە زمـانی دوو بەیتی‌یـەکـانی بابـا تاهیـرەوە دوکتـۆر ئیبـراهـامیـان مامـوسـتـای کۆنی زمانی پەهلەڤی لە کۆلـیـجـی ئادابـی دانـشـگــای تاران، باسێکی بە زمــانی فەرەنسی لە پاریس چاپ کردووەو دوکتــۆر پەروێــز ناتــل خانلەری چەند وتارێکی لەم بارەیەوە لە گۆڤاری پەیام دا بڵاوکردۆتەوە.

★ ★ ★

**بەرهەمەکانی تری بابا تاهیر:**

1 - لێکدانەوە عەرەبی‌یەکەی (عین القضاة همدانی ابو المعالی عبدالله بن محمد میانجی) کە لە ساڵی (525) کۆچی‌دا مردووەو یەکێکــە لە سۆفی‌یـە گەورەکـانی سەدەی شەشەم و هەروەها دانەری (زبدة الحقائق)ە.

مزدیسنا. دکتر معین ص 509

2 - لێکدانەوەیەکی‌تری عەرەبی کۆن، کە خاوەنەکەی نەناسراوە.

3 - دوو لێکــدانــەوە یەکی بە عەرەبی‌و ئەوی‌تـریـان بە فارسی‌یـە، نووسینی حاجی مەلا سوڵتـان عەلی گنـابادی، کە لێکــدانــەوە فارسی‌یـەکـەی لە ساڵی 1326 شەمسی‌دا

چاپ کراوە.

خوالێخـۆش بوو، ڕەشیـد یاسمی لە پێشـەکی چاپی سێـیەمی دیـوانی بابـا تاهیردا دەڵێ: لە نامەخانەی میللی پاریس دا یەك دەستنووسی عەرەبی هەیە لەژێر ناونیشانی (الفتوحات الربانی فی اشارات الهمدانی)، [30] کە جامی بێگ عەزیـزی لە ساڵی 889 کۆچی‌دا بەتکـای «ابـو البقا احمـد» لێکی داوەتـەوە، ئەو باسـەی کە خوالێخـۆش بوو، حاجی مەلا سوڵتان علی گنابادی بە فارسی لێکیداوەتەوەو چاپکـراوەو دانـەیـەکی لای‌دانـەرەو لەگەڵ وتارێك دا کە لە کۆتایی ئەم کۆمەڵەدا چاپ کراوە، هەندێ جیاوازی هەیە.

دیوان بابا طاهر، چاپ سوم، ص 19

★ ★ ★

لیرەدا هەڵبژاردەیە لە (کلمات قصار)ی بابا طاهر پیشان دەدەین.

**(1) العلم دلیل المعرفة تدل علیها فاذا جاء المعرفة سقط روية العلم وبقی حرکات العلم بالمعرفة.**

**(2) روية العلم عجز المریدن.**

**(3) العلم دلیل والحکمة توسل.**

**(4) العلم حبس الظاهر، والمشاهدة حبس الباطن.**

**(5) العلم موکل بالکلام والوجد موکل الخرس.**

لە بارەی کەرامـاتـی بابـا تاهیـرەوە، هەریـەکێ لە ئێران ناسەکانی وەکو:

ژۆکـوفسـکـی، کلێـمن هاونـەر، ئێـدوەردبـراون، هێـرن ئاڵن و لچنسکی، بەشێ لە بەسـەرهـاتی تاهیـریـان وەرگێـراوەتـە سەر زمانی: ئەڵمانی، فەرەنسی، ئینگلنری. هەروەهـا ئازادهـەمـەدانی ئەو بەسـەرهـاتانەی کە لە شاری هەمـەدان دا، لە بارەی بابـا تاهیـرەوە دەیـگـێـڕنـەوە، کۆی‌کردۆتەوەو لە پێشەکی چاپی دووەمی دیوانی بابا تاهیردا بڵاوی کردۆتەوە.

**وەرگێڕانەکانی بابا تاهیر بە زمانە بێگانەکان:**

1 - (کلێمنی هاوەر Clemet Hwart)ی فەرەنسی کۆمەڵێ لە دوو بەیتی‌یەکانی بابا تاهیری لە ساڵی (1785ز)دا، لە گۆڤـاری ئاسیـایی ژورنـاڵ ئاسیـاتیـك (Jurnal Asiatique) چاپ کردووە. کە دەکاتە پەنجاونۆ (59) دوویەیتی لەگەڵ وەرگێڕانە فەرەنسی‌یەکەی‌دا.

تاریخ ادبیات برون. ج1، ترجمة علی پاشا صالح ص 131

و مقاله مینوی، مجلة دانشکدة ادبیات ـ تهران، سال 4، شماره (2).

2 - ئێـدوەرد هێـرن ئاڵن، ڕۆژهـەڵات ناسی ئینگلیزی ئەژاد، وەرگێڕانی دیوانەکەی بە زمانی فارسی‌و ئینگلیزی چاپ کردووە.

3 - وەرگێڕانی دیوانی بابا تاهیر بە هۆنراوە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی لەلایەن خاتو (ئەلیزابت کورتیس برنتس)ەوە.

پێشـەکی: دیـوان بابـا طاهـر، چاپ موم، ص 71، شدالازار ص 515و 65.

سبك شناسی ج1، ص 22و71، شدالازار ص 515 وەرگیراوە لە (لغت نامة دهخدا، باب «ب»).

★ ★ ★

**پەراوێزەکان**

---

1 - مو: من.

ئان: ئەو.

ریند: ڕەند، ئادەمیزادی بێباك، ئەو کەسەی کە گوێ ناداتە بەندوباوی ئەم جیهانە.

نام: ناو.

قەلەندەر: دەروێش، ئەو کەسەی کە ئەم جیهانەی خستۆتە پشت گوێ.

خون ومون: هەر دووکی بەسەریەکەوە بە واتای ماڵ، وەیا ژن و ماڵ و منداڵ دێت.

دیرەم: هەمە.

ئایە: دێت.

بگەردەم: دەگەرێم.

گیردی: بەدەوری.

گیتی: جیهان.

وانەهەم: دادەنیم.

واتە: من ئەو رەنـدە بێبـاکـە دەروێشـەم کە وازم لەم جیهانە هێناوەو، نەماڵ و ژ ن و منالم هەیە نە لەشکرم هەیە (لە هەندێ چاپ دا لەباتی لەشکەر، لەنگەر هاتووە، بە واتای ئارام گرتن، کاتێ کە رۆژ دەبێتـەوە، بەدەوری ئەم جیهـانـەدا دەگـەرێم و کاتێکیش کە شەو دادێت سەر دەخەمە سەر خستێ.

(2) نەوا: دەنگ، ئاواز.

ئەندوتە: کۆبووەوە.

ذوونو: دەزانێ.

عیار: ئەندازەیەکە بۆ کێشانی رادەی پاکی و بێگەری زێرو زیو.

قەلب: قەڵب، مەبەست زێرو زیوی ناپاکە:

بوتە: بۆتە، ئەو ئامرازەیە کە زێرو زیوی تیا دەتوێننەوە.

بوورە: وەرە.

سوتە دلبون: دڵ سووتاوان.

گیردی هەم ئاییم: بەیەکەوە کۆ ببینەوە.

واتـە دەنگی نالـە ئەو غەمـە دەینـاسێ کە پەنگی خواردۆتەوەو ئەنـدازەی ناپـاکی و پاکی (زێـروزیـو) بۆتە دەری دەخات. وەرن ئەی دڵ سووتاوەکان، با بەیەکەوە کۆببینەوە، چونکە دڵ سووتاو قەدری دڵ سووتاو دەزانێ.

(3) سووز: سۆز.

مژ ە: برژانگ.

بەرهەم زەنەم: بیخەمە سەریەك.

سەیلاب: لافاو.

چووب: دار.

بی: بوو.

سووژە: دەسووتێ.

خونابە: خوێناوە.

واتە: دڵم بەهۆی سۆزی دڵدارییەوە گێژو وێژە، کاتێ کە برژانگەکانم دەخەمە سەریەك، لافاوی فرمێسك دەرژێ بەسەر رووم دا، دڵی دڵدار وەکو داری تەڕ وایە، سەرێکی دەسووتێ و سەرەکەیتری خوێناوی لێدەرژێ.

(4) بیابوون: بیابان، دەشت ودەر.

سریشك: فرمێسك.

بارونەم: دەبارێنم.

تەو: تا، گەرم بوونی پلەی گەرمی لەش لە ئەندازەی خۆی زیاتر.

جایەم: جێگلیەکەم.

میکەرە: دەکات.

هەمی‌ذوونەم: دەزانم.

نالوونەم: لە ناڵەدام.

واتـە: من شەوو رۆژ لە بیـابـان و دەرو دەشتم و سەری‌خـۆم هەڵگرتووەو، شەوو رۆژ فرمێسك لە چاوەکانم دەبارێ، نە تام هەیەو نە شوێنێکم ئازاری هەیە، ئەوە دەزانم کە شەوو رۆژ دەناڵێنم.

(5) عونصــوری: عنصـری: شاعیـری گەورەی سەرەتـای تای سەدەی پێنجەمی کۆچی. لە دەستگای غەزنەوییەکان دا کاری کردووە، تا دەوروبەری (432 کۆچی = 1040ز) ژیاوە.

گنج سخن، جلد اول، دکتر صفا ص 114

فیردەوسی = فردوسی: ابو القاسم منصور بن حسن، فیردەوسی طووسی، شاعیری گەورەی ئێران و خاوەنی شاهنامە. لە نێوان ساڵانی (940ز ـ 1020ز)دا ژیاوە.

(6) عین القضاة همدانی: ضیاءالدین عین القضاة همدانی: یەکێکـە لە خواپـەرست و صوفی‌یـە بەنـاوبـانگـەکـانی سەرەتای شەشەمی کۆچی و لە زاناکانی فیقهی شافیعی مەذهەب بووە. لە بەشی زۆری کەشکـۆڵـە موعتـەبـەرەکـانی وەکـو: تتمتە الصوان الحکمـة وطبقـات الشـافعیـة الکبـری‌و. (عبـدا) بووەو ناوی باوکی محـــەمـەد. کونیـەی (ابـو المعـالی)و هەنـدێ بە (ابـو الفضـــل)نـــاویـــان بردووە. بەشی زۆری ئەوانــەی کە ژیـان و بەسەرهاتی کەسانیان نووسیوە، ناویان بە (عین القضاة)بردووە، وە بەشـێکی کەمیش بە (ضیـــاء الـــدین) ناویـــان بردووە. عین القـضـــاة لە ساڵی (492 کۆچی = 1098ز)دا، لە هەمـــەدان لەدایـــك بووەو لە شەوی چوارشـــەممـــەی حەوتی 7 جومـــادی الآخـــرة، ساڵـــی (525 کۆچـی = 1131ز)، لە هەمـــەدان دا کۆچی دوایی کردووە.

(شـــرح احـوال و وآثـار دوبیتی‌هـای بابـا طاهـر عریـان ـ بە

کوشش دکتر جواد مقصود ص 187 ـ 188). هەروەها لە (ل 224) هەمـان سەرچـاوەدا دەڵـێ: عیـن الـقـضــاة لە ساڵی (1131ز)دا بە فەرمانی سوڵتان مەحموود کوژ را.

(7) حواجـە نصیـرطـوسی: لەو زانـا گەورانـەی کە ناو دەبرا بە (علامة) لە شاری (طوس)، ساڵی (1201ز) لەدایك بووەو، لە ساڵی (1274ز) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

(تراث العرب العلمي ـ تاليف قدري حافظ، ص 407).

(8) عومـەری خەییـام: فەیلەسـووف و ریـاضیو ئەستێرەناس و دوکتــۆرو شاعیــرو نووســەری بەنــاوبــانگ. لە (نیشـاپـور) لەدایك بووەو، لە ساڵی (1123ز) لەوێ مردووە.

گنج سخن، جلداول، د. صفا، ص 227.

(9) چەرس: مادەیــەکی گێــژکــەرو زەهــراوییـە، لە گیـای (شاهدانه) دەگیریو لەگەڵ تووتن دا تێکەڵاو دەکرێو بە هۆی سەبیل و نێرگەلەوە دەکێشرێ.

(10) گۆڕستــانــە کۆنــەکـەی بابـا تاهیـر لە بورجێکی هەشت گۆشەیی پێك هاتبوو، کە لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا لەسەر گۆڕەکــەی دروست کرابــوو، پروفیســۆر مینــۆرسکی لە بارەی ئارانگای ناوبراوەوە دەڵێ: بینای گۆڕستانی بابا تاهیر زۆر سادەو بێئارایشتەو ناتوانین کەڵکی مێژوویی لێوە وەرگرین و لە کتێبی (نزهه القلوب، مستوفی)دا کورتەیەك لەم بارەیەوە نووسراوە:

بەڵام ئەو بینـاتـازەیـەی کە لەســەر مەرقـەدی پاکی بابـا تاهیر دروست کراوە، لە ساڵی (1967ز) دەستی پێکراوەو لە ساڵی (1970) تەوابووە، لەسەر ئەو گردەیە کە دەڕوانی بەسەر بەشی زۆری شاری هەمەدان دا، لەو شوێنە کۆنەی کە ئارامگای بابا تاهیری تێدایە. بیناکە (8965) میتر چوارگۆشەییەو بورجەکەی هەشت گۆشـەییـە، لەسەر تەرزی میعماری سەدەی حەوتەم و هەشتــەم دروست کراوەو جۆرە تێکـەڵاویـەکی تایبـەتیشی هەیـە لەسەر شێوەی نوێ. بورجی ئارامگاکە لەسەر بنکێکی هەشت گۆشـەیی دامـەزراوەو بەرزاییەکەی لەسەر گردەکەوە (20/35) میترەو لە ڕێکی شەقامیشەوە (25/35) میتر بەرزە بەکورتی لە (شرح احوال بابا طاهر ـ د. جواد مقصود 61، 62، 69، 72، 73) وەرگیراوە.

(11) ئەم قســەیــە لە سەردەمی زۆربـەی خەڵکـە خەمـەدانـەو دەم بەدەم گێـڕاویـانـەتـەوە، بە قسـەی بابـا دادەنرێو لە هەندێ شوێنی تـریش دا دراوەتـەپـاڵ کەسانی تر، کە لێرەدا جێگای باس نییەو مەبەستیش لە «امسیت کردیاً واصبحت عربیاً» ئەوەیە کە کوردبـووەو لە زمـانی کوردی زیـاتـری نەزانیوەو دوای ئەوە فێری عەرەبی بووەو بێگومان لەو سەردەمەدا بە زۆری خوێندنی هەموو زانستــەکــان بە زمــانی عەرەبی بووە لەنــاو هەمــوو میللەتــە موسوڵمانەکان دا. هەرچەندە قسەی ناوبراو لایەنێکی ئەفسانەیی گرتووەو ئادەمیزاد بە خۆخستنە ناو ئاوی ساردەوە نابێ بە زاناو بەو هۆیـەوە فێـری عەرەبی نابێ، بەڵام دەتـوانین بڵێین ئەم قسـەیـە سەری گلۆڵــەیــەکمــان دەدا بەدەستــەوەو لە خۆیــەوە نەوتـراوەو نەدراوەتەپاڵ بابا، ئەو وشەی (کورد)ەیش بەبێ هۆ نەهاتووەو لە شاری هەمەدانیش دا هەروا نەبووە بە قسەی سەر زمانی خەڵکی بێگــومـان ئەمـە پێـویستی بە لێکـۆڵینـەوەی زانستی هەیـەو لەو بارەیشەوە گەلێ قسەو بیرو ڕای جیاجیا دەربراوە، بەڵام ئەگەر بەڵگەی بەهێزەوە ئەوەمان بۆ ساغ بێتەوە، کە ئەمە قسەی بابا بووە، ئەوە ئەوە بابا بەدەمی خۆی پێمان ڕادەگەیەنێ کە کورد بووە. هەرچـەنـدە تا ئیستـا زۆربـەی زۆری ئەو زانایانەی کە لە بارەی باباوە لێکۆڵینەوەیان هەیە، دانیان بەوەدا ناوە کە بابا (لور) بووە. بەڵام بەدرێـژایی ئەو هەمـوو ماوەیـە گەلێ وشـەی فارسی چۆتە چوارینەکانییەوەو ئەوەی کە ئەو وتوویەتی گەلێ جیاوازی هەیـە لەگـەڵ ئەو چوارینـانـەی کە ئەمڕۆ لەژێر ناوی دیوانی بابا تاهیردا چاپ کراوەو لەو بارەیەوە لە شوێنی خۆیدا قسەکراوە.

(12) فەهلەویات: دوو بەیتیشی پێ دەڵێن کە لە دوو بەیت یا چوار نیوە بەیت پێك هاتووە، وەکو چوارینە نیوە بەیتی یەکەم و دووەم و چوارەمی سەروادارەو بەڵام کێشـەکـەی جیـاوازە لەگـەڵ کێشی چوارینـەی ئاسـاییداو لەسـەر وەزنی (لاحـول ولا قوة الا بالله)نییە. دوو بەیتییەکانی بابا تاهیر لەسەر (بەحری هەزەجی موسەددەسی مەحذووفە)ە.

(13) ڕەشیــد یاسمی کرمـاشـانی، ناوی (غـلام رضـا محمـد ولیخــان گورانی)یــە، (1896ز ـ 1951ز)، شارەزاییـەکی باشی هەبــووە لە زمــان و ئەدەبی فارسیو فەرنسیو ئینگلیـزیو عەرەبی پەهلەفی. لە سڵی 1933 بووە بە مامۆستای مێژوو لە زانستگای تاران دا، گەلێ بەرهەم و وەرگێڕانی هەیەو دیوانەکەی لە ساڵی 1336 کۆچی خورشیدی لە تاران دا چاپ کراوە.

گنج سخن ـ جلد سوم، تاليف د. صفا ص 309.

هەروەها کتێبی (کردو پیوستگی نژادیو تاریخ او) یەکێکە لە بەرهەمەکانی، کە لە بارەی «کوردو پەیوەندیی نەژادییو مێژووی ئەو»ەوەیە.

(14) بیروباوەر لە بارەی پەیدابوونی گەورەیەك، لە سەرەتای هەر هەزار ساڵی لە ئاینی زەردەشتیدا هەیە، وەکو باس کرا، بەڵام تا ئیستا هیچ زانایەکی شارەزا لەم بارەیەوە نەیتوانیوە کۆتایی هەریەکێ لەو هەزار ساڵە دیاری بکات چونکە بەڵگەیەکی زانستیمان بەدەستەوە نییە دەربارەی دیاری کردنی ساڵی دەست پێکردن، تا بتوانین کۆتایی ئەو هەزارانە دیاری بکەین.

(15) ناصر خسرو (1003 ـ 1088ز) شاعیری بەناوبانگ و خەڵکی «قبادیان بلخ»ە، یەکێ بووە لە رابەرەکانی مەزهەبی ئیسماعیلی، بەرهەمی هۆنراوەی ئەمانەن: دیوانەکەی، سعادتنامە، روشنایی نامە، ئەوەیشی کە بە پەخشان دایناون ئەمانەن: زاد المسافرین، جامع الحکمتین، وجەدین، سفرنامە.

گنج سخن، جلداول، د. صفا. ص 179.

(16) خاقانی شیروانی: ناوی (افضل الدین بدیل بن علی)یە ئەم شاعیرە گەورەیە لە ساڵی (1198ز) لە تەبریز کۆچی دوایی کردووە.

(17) واتە: هەر هەزار ساڵ یەکێکی وەفادارو خوێییەك دێتە جیهانەوە، لەمەوپێش هات و هێشتا ئێمە لەدایك نەبووبووین. دوای ئەوە دێت و ئێمە نوقمی غەمین واتە نەماوین.

(18) ئاشکرایە کە چوارینەکانی بابا تاهیر ئەوەندە سادەو رەوان و ئاسانە ئەگەر یەکێ شارەزاییەکی هەبێ لە شێوەی لوریدا بە ئاسانی لە زۆربەی زۆری تێدەگات، خۆ ئەگەر کوردێکی ئەدەب دۆست دیوانی بابا بخوێنێتەوەو شێوەی لوریش نەزانی دەتوانم بڵێم یارمەتی فەرهەنگۆکی ئەو وشانەی کە تایبەتین بە چوارینەکانی بابا دەتوانێ بە باشی لە بەشی یەکجار زۆری تێبگات، بابا یەك ئەمە شێوەی چوارینەکانی بێت ئیتر چۆن ساڵی لەدایك بوونی خۆی بەم شێوە پر پێچ و پەنایە پیشان دەدات، وەکو لێرەدا دەبینین کە میرزا مەهدیخان بە شێوەیەکی زۆر سەیر ساڵی لەدایك بوونی بابا تاهیری بە حسابی ئەبجەدی لەو چوارینەدا دەرهێناوە، ئەویش دوای گەلێ دەستکاریو یاریپێکردن و گۆرین و هێنان و بردنی بێجێ کە گەلێ دوورە لە راستییەوە، وەکو هێنانی وشەی (طاهر) کە لە چوارینەکەدا نییە، کردنی وشەی (بحر) بە (دریا)و کردنی وشەی (الف) بە هزار، کردنی وشەی (هزار) کە لە چوارینەکەدا نییە بە (هازا، الف را). وە (الف قد)، (طاهر)، (دریا) هەریەکێ لەمانە دەکاتە (215)و (الف) دەکاتە (111)و هەردووکیانی کۆکردۆتەوە کە دەکاتە (326)، دوای ئەوە (هازا) کە دەکاتە (14)و (الف را) کە دەکاتە (312) کۆیکردوونەتەوە کە ئەمیش دەکاتە (326) ئنجا دەڵێ ئەم هەر دوو (326)ە رێك دەکەون لەگەعل یەکتریداو بەم جۆرە (326)ی کردووە بە ساڵی لەدایك بوونی بابا.

(19) مەسنەوی رۆمی: (جلال الدین الرومی) لە ساڵی (657) کۆچیدا دەستیکرد بە دانانی (مەسنەوی = مثنوی) بە هۆنراوەو لە نێوان ساڵانی (657 ـ 660) کۆچیدا، بەشی یەکەمی تەواوکرد، لەپاش دوو ساڵ دووبارە لە ساڵی (662)دا دەستیپێکردەوەو بەردەوام وام بوو لەسەری تا بەشی شەشەمی تەواوکرد، بەو شێوەی کە ئیستا هەیە. مەسنەوی گەلێ جار چاپ کراوەو گەلێ لێکدانەوەی رۆژهەڵاتیو رۆژئاوایی هەیە، ژمارەی بەیتەکانی مەسنەوی لە چاپی نیکلسۆن دا گەیشتۆتە (25/632) بەیت.

ژمارەی بەیتەکانی مەسنەوی بە زۆرتریا کەمتر لەو ژمارەیە دراوەتە قەڵەم. وەکو کتێبی (تذکرة الشعراء ـ دوالتشاه) باسی دەکات کە گوایا گەیشتۆتە (48/000) بەیت. شاعیر کاتێ دەستیکردووە بە دانانی مەسنەوی تەمەنی لە پەنجا (50) ساڵ تێپەری کردبوو.

(جلال الدین الرومی ـ الدکتور محمد عبدالسلام کفافی الطبعة الأولی 1971، دار النهضة، بیروت ص 50 ـ ص 51).

(20)حسام الدین: بەحسام الدین چلبی ناسراو، داوای لە مامۆستاکەی (جلال الدین) کردووە کە بەرهەمێك بە هۆنراو دابنێ وەکو (حدیقة الحقیقة)ی سنائی یا (منطق الطیر) عەطار، تاوەکو سەرچاوەیەك بێ بۆ پەیرەوەکانی.

(هەمان سەرچاوە، ل 49 ـ ل50).

(جلال الدین) لە هۆنراوەکانیدا هەندێ جار ناوی (صلاح الدین زرکوب)ی هێناوە، یا لە کۆتاییدا ناوی (حسام الدین

چلبی) هێنــاوه، بەڵام لە بەشی زۆری دیـوانـەکـەیدا کۆتـایی هۆنـراوەکـانی هاتـووه بە ناوی (شمس تبـریـزی)یـەوەو هەنـدێ جاریش کۆتاییان هاتووە بە وشەی (خاموش) ئەمەیان لەوە دەچێ کە مەبەستی خۆیبێ.

(هەمان سەرچاوە، ل 41).

(21) مەولەوی = جلال الدین الرومی. ڕۆژ 6 ‌ىربیع الأول ساڵی 604 کۆچی (سێپتامبەری 1207ز) لە شاری (بەلخ)دا هاتـۆتـە جیهـانـەوە، هەنـدێ جاریش بە (جـلال الـدین محمد البلخی) ناودەبرێ، بەڵام زیاتر بە (ڕۆمی) ناسراوه، کە دراوەتە پاڵ (ئــەرز ڕۆم) ئەو شوێنــەی کە زۆربــەی ژیــانی تێـدا بردۆتـەسـەر. ڕۆژی 5 جمـادی الثـانیة، ساڵی 672 کۆچی لە تەمەنی (68) ساڵیدا ئەم جیهانەی بەجێهێشت.

(هەمان سەرچاوە، ل 21، 22، 34)

شاعیــری ناویــراو کاری کردۆتــەســەر گەلێ لە شاعیــره کۆنـەکـانمـان، بەتـایبـەتی شاعیره صوفییەکانمان. زۆر جار لە بەرهـــەمنـەکـانیـان دا ناوی خۆی یا (مـەسنـەوی = مثنـوی)یـە بەناوبانگەکەیان هێناوه.

(22) نفـحــات الانس جامــی: یەکــێــکــە لە بەرهـــەمــە بەنــاوبــانگـەکـانی جامی کە ساڵی 883 کۆچی (= 478ز) بە پەخشـان نووسیـویەتی لە بارەی شێخـە صوفییـەکـانەوه. جامی ناوی (نــورالـدین عبـدالـرحمن بن احمـد جامی)یـە لە ساڵی (1414ز) لە خرجـــردجـام (خـراسـان) لەدایـك بووەو لە ساڵی (1492ز)دا کۆچی دوایی کردووەو بەنــاوبــانگتــرین شاعیـری کۆتایی دەورەی تەیمووریەکان بووه.

(گنج سخن، جلد دوم، دکتر صفا، ص 288)

(23)بـابـا افضـل کاشـانی: ئەگـەر مەبەست (افضل کاشی = افضـل کاشـانی) بێت، ئەوا هاوچـەرخی شێخی سەعـدی بووه وەکو لە کتێبی (از سعدی تاجامی ـ براون، ص 198)دا هاتووه.

سەعدی لە ساڵانی 585 کۆچی ـ 606 کۆچی، یا سەرەتای سەدەی حەوتـــەمی کۆچی لەدایـك بووەو لەنێـوان ساڵانی 691 کۆچی ـ 694 کۆچی، مردووه.

(ادبیات دکتر شفق، ص 263).

(24) نزهة القلوب: ئەم کتێبە لە بارەی جوغرافیایەو دانەرەکەی (حمدالله مستوفی)یە، لە ساڵی 740 کۆچیدا دایناوەو لە ساڵی 750 کۆچیدا مردووه.

(هەمان سەرچاوە، ل 354).

(25) ئەزان: ڕووزی: لەو ڕۆژە.

مارا: ئێمە لە حاڵەتی مەفعوولیدا.

ئافەریدی: دروستت کردووه.

چیزی: شتێ.

نەدیدی: نەت بینیوه.

خوداوەندا: ئەی خوایە.

بە حەقی هەشت و چارت: لەبـەر خاتـری هەشت وچـوارت لێـرەدا (هـەشت و چوار) کە دەکـاتـە وانگـزە مەبـەست دوانگـزە ئیمامە. واتە مەزهەبی شیعەی اثناعشری.

(ئەو موسوڵمانەی کە باوەڕیان بە دوانگزە ئیمامە پێیان دەوترێ شیعەی دوانگزە ئیمامی. ناوی دوانگزە ئیمامەکان.

ئەمانەن: (المرتضی، الجتبی، الشهید، السجاد، الباقر، الصـادق، الکـاظم، الـرضی، التقی، النقی، الـزکی، حجـة القائم المنتظر)].

(الملل والنحل، تالیف الشهر ستانی، المجلد الأول تحقیق محمد سید کیلانی ـ دار المعرفة ـ بیروت ص 173).

ز: لە.

مو: من.

بگوزەر: تێپەرە، لێرەدا واتە چاوبپۆشە، ببووره.

شوتر: وشتر، حوشتر.

دیدی نەدیدی: بینیوتە نەت بینیوه.

شوتــر دیــدی نەدیـدی: ئەمـە پەنـدێکی پێشینـانـەو کە دەڵێ: حوشتـرت بینیـوه نەت بینیـوه، . مەبـەست ئەوەیـە: ئەوەی دیوتە وابزانە نەت بینیوەو چاوی لێبپۆشە.

واتــە: لەو ڕۆژەوەکــە ئێمـەت دروست کردووه، بێجگـە لە گوناهەو نافەرمانی شتێکیترت لە ئێمە نەدیوه. ئەی خوایە لەبەر خاتری دوانگزە ئیمامت لێمان ببوورەو چاو لە گوناهمان بپۆشە.

(26) سەرنج: لە ژمارە (1)ی ئەم پەراوێزەدا، ئەم چوارینەیە بە جۆرێکیتر هاتووەو هەندێ جیاوازی لە نێوان هەردووکیان دا هەیە.

خانە: ماڵ.

مانه = مان: ماڵ، کەلوپەلی ناوماڵ.
رو: ڕۆژ.
همه: هەموو.
وەرانەم: دەگەڕێم.
شەو دەر ئایە: شەو دادێت، شەو دەبێتەوە.
سەنگ: بەرد.
نەهەم: دای‌دەنێم.

واتە: من ئەو پیرەم کە قەلەندەرم پێ‌دەڵێن، نەماڵ و حاڵم هەیە نە ئارام گرتنم هەیە، هەموو ڕۆژێ بە دەوری ئەم جیهانەدا دەسووڕێمەوەو کاتێ کە شەو دادێت سەر دەخەمەسەر بەردێ.

(27) میهرەبوونی = میهرەبانی = میرەبانی: دڵ نەرمی‌و خۆشەویستی.
بی: بوو.
شووریدە: شێواو، پەرێشان.
داشت: هەبوو، هەیبوو.
ئەز ئوو: لەئەو، لەو.

واتە: چەند خۆشە کە خۆەویستی لە هەر دوو سەرەوەبێ، ئەگەر خۆشەویستی لەیەك سەرەوەبێ دەردی سەری‌یە، ئەگەر مەجنوون دڵێکی پەرێشانی هەبوو، دڵی لەیلێ لەهی ئەو پەرێشانتر بووز.

(28) وشوم: ببم، برۆم.
واشوم = ببم، بکرێمەوە، لێلاەدا واتە وابکەم.
بدەرشەم: دەرچم، برۆمە دەرەوە.
ماچین: مەبەست وڵاتی (چینی گەورە)یە، لە کۆن دا تەنها بە شارەکانی دەوروپشتی (کاشغەر)و (خوتەن)یان دەوت چین.
کاشغەر: ناوی شارێکە لە تورکستان.
خوتەن: ناوی کۆنی بەشێکە لە تورکستانی چین.
دیرتەر شەم: دوورتر برۆم.
ئەی: ئەم.

واتە: برۆم کارێکی وابکەم کە لەم جیهانە برۆمەدەرەوە، برۆم لە وڵاتی چین و ماچین دورتر بکەومەوە، برۆم لە حاجی‌یەکانی حەج (بپرسم، کە ئەم دووری‌یە بەسە یا دوورتر برۆم.

(29) دیرەم: هەمە.
خەریدار: کریار.
کەزو: کە لە ئەو.

بافتەدام: چنیومە.
پوود: ئەو دەزووەی کە لەسەر باری پانایی بۆ چنینی هەر جۆرە پارچەو چنراوێك بەکاردەهێنرێ. واتە پۆ.
تار: ئەو دەزووەی کە لەسەر باری درێژایی بۆ چنین بەکاردەهێنرێ. واتە تان.

هەموو چنراوێك لە تارو پوود. یا، تان و پۆ پێك هاتووە.

واتە: دڵێکم هەیە کریاری خۆشەویستی‌یە، بە هۆی ئەوەوەیە کە بازاری خۆشەویستی گەرمە، جل و بەگێکم چنیوەو دروست کردووە بۆ دڵ، کە ڕایەڵی پۆیەکەی غەم و خەفەتەو تانەکەیشی خۆشەویستی‌یە.

(30) دەستنووسی عەرەبی کە لەژێر ژمارەی (1903) لە کتێبخانەی میللی پاریس دایە، نامەیەکە پێك لە هەشت بەش هاتووە وەکو (کلمات قصار)ە لەگەڵ لێکدانەوەیەك دا، لەژێر ناونیشانی (الفتوحات الربانی في اشارات الهمدانی). لەوە دەچێ کە دەستنووسی ناوبراو (جانی بیك عزیزی) نووسەری هەمان لێکدانەوە نووسیبێتی. لێکدەرەوەی ناوبراو لە شەووالی 889 کۆچی‌دا دەستی کردووە بە کتێبەکەو لە شەعبانی 890 کۆچی (= 1485) زایینی‌دا تەواوی کردووە.

(شرح احوال بابا طاهر - د. جوان مقصود، ص 240 - 241)

بەڵام لەلاپەرە (233)ی هەمان سەرچاوەدا. کۆمەڵە دەستنووسی عەرەبی ژمارە (1903)ی کتێبخانەی میللی پاریس، لە چوار کتێب پێك هاتووە. دووەمیان کتێبی: (الفتوحات الربانیة في مزج الاشارات الهمدانیة - تالیف محمد بن ابراهیم، خطیب وزیری، برگ 74 - م تا روی برگ 100 - م) ئەمە لێکدانەوەیەکی عیرفانی‌یە لەسەر (کلمات قصار بابا طاهر همدانی) کە بەپێی تکای (شیخ ابو البقاء احمدی) لە شەووالی (889) کۆچی‌دا دەستی پێ‌کردووەو لە چوارەمی شەعبانی (890)ی کۆچی‌دا تەواو بووە.

دیسان لە لاپەرە (58) هەمان سەرچاوە، لەژێر ناونیشانی بەرهەمەکانی بابا تاهیردا دەڵێ: کومەڵە (کلمات قصار)ی بابا بە شێوەیەکی ئاسان و ڕەوان، بە زمانی عەرەبی دانراوە، مەبەست لە هەر یەکێ لەم وتە کورتانە قۆناغێکە لە قۆناغەکانی خواپەرستی، وەیا پلەیەك لە پلەکانی صوفیگەری. ژمارەی ئەم

(كلمات قصار)ە كە بە هەڵە دراوەتەپاڵ (عين القضاة)و تا ئیستا لێکدەرەوەکەی نەناسراوە لە (421) وتە پێك هاتووە وە لە کتێبی (الفتوحات الربانية في مزج الاشارات الهمدانية) (322) وتە لە (كلمات قصار بە شێوەیەکی تێکەڵ ایان دراوەتەوە.

## ئەنجامی ئەم کارە

ئەوەی کە لەم کارە هاتوتە ئەنجام لە بارەی سەردەم و ژیان و پلەو پایەو زمان و چوارینەکانی بابا تاهیرو بایەخ پێدان لە لایەن هەندێ لە ڕۆژڵات ناسەکانەوە، لێرەدا پیشانی دەدەم.

**سەردەمی:**

تا ئیستا بەڵگەیەکی بە هێزمان بەدەستەوە نی‌یە تا بزانین بابا تاهیر، چ ساڵێ لەدایك بووەو کەی مردووە.

لە سەرەتـای پێشـەکی‌یـەکەدا دەڵێ: شاعیر نزیکەی هەشتەد (800) ساڵــە، جوانـی‌و تەڕو پاراوەیـی هۆنــراوەکـانـی خۆی پاراستووە، واتە لەو کاتەوە کە بابا ئەو هۆنراوانەی داناوە تا دەگاتە ئەمڕۆ نزیکەی (800) ساڵێکی ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە.

(رضـا قلی خان هدايت) لە (تــذكـرة مجمـع الفصحـا)دا دەڵێ: هەنــدێ کەس ئەویــان بە هاوچــەرخی سوڵتـانـەکـانی سەلجووقی داوەتە قەڵەم ڕاست نی‌یەو بەڵکو لە ساڵی (410) کۆچـی‌دا لەپێش (عـنـصـری = عونـســوری)و (فــردوسی = فیردەوسی)دا کۆچی دوایی کردووە. ئەوەی ئاشکرایە عونسوری تا دەوربەری 432 کۆچی = 1040 ز ژیاوەو فیردەوسی لە نێوان ساڵانی ۉ 90ز ـ 1020ز، ژیــاوە. هەروەهـا (رضـا قلی خان) کتێبی (ريـاض العـارفين)دا دەڵێ: بابـا تاهیر لە ساڵی (410) کۆچی‌دا مردووەوە بەم پێیــە ناتـوانـرێ کە بابـا بە هاوچـەرخی (عین القضاة همدانی) یا (خواجه نصير طوسی) دابنرێ ئێمە دەزانین کە (عين القضاة) لە ساڵی 492 کۆچی = 1098ز لە هەمــەدان دا لەدایـك بووەو لە شەوی چوار شەممـەی حەوتی 7 جومادی الآخرە، ساڵی 525 کۆچی = 1131ز لە هەمەدان دا کوژراوە. دیســان لەلایـەکی‌تـریشـەوە بابـا بە خاوچەرخی (عين القضــاة) دانــراوە، بەڵام (خــواجـە نصيـر طوسی) لە شاری (طــوس) لە ساڵی 1201ز لەدایــك بووەو لە ساڵی 1274ز لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

ئەگــەر بابــا لە ساڵــی (410)ی کۆچــی‌دا مردبــێ ئەوا هاوچــەرخی فیـردەوسی‌یـەو لەپێش عومـەری خەییـام دا بووە کە خەیام لە ساڵی 1123ز لە (نیشابور) مردووە.

ئێدەورد براون، کتێبی (راحة الصدور وآية السرور ـ تاليف نجم الدين ابو بكر راوندى) داناوە بە سەرچاوەیەك کە دەڵێ: جێگای بڕوایەو لە بارەی باباوە نووسیوێتی‌و ئەم کتێبە لە ساڵی 599 یا 600 کۆچی‌دا نووســراوەو باسی بەیـەك گەیشتنی بابـاو (طغرل = توغرول) دەکا، لە دەورو بەری ساڵانی 447 ـ 450 کۆچی‌دا، کە یەکــەمین پاشــای سەلجــووقی بووە، ئەمـە ئەوە دەگـەیـەنێ، کە سەردەمی ناوبـانـگ پەیـداکـردنی بابـا سەدەی پێنــجــەمـی کۆچـی بووەو لەوە دەچـێ کە لە کۆتــایـی سەدەی چوارەم دا لەدایك بووبێ. وە بە گوێرەی ئەوەی کە بابات تاهیر لە دوو بەیتی‌یەك دا دەڵێ:

(الف قدم كە در الف آمدستم = ئەلف قەددەم کە دەر ئەلف ئامە دەستەم) لەوە دەچێ لە ساڵی 1000 ز کە دەکاتە 390 یا 391 کۆچی لەدایك بووبێ‌و هەروەها توغرولی سەلجووقی لە ساڵانی 1055ز ـ 1058ز هاتووە بۆ هەمەدان و بەم پێ‌یە دەبێ ئەو کاتە بابا تەمەنی (55 ـ 58) ساڵ بووبێ.

بەڵام وەکــو (میـرزا مهـدی خان کوکب) هەمـان دوو بەیتی بابـای بە شێـوەیـەکی سەیـر، بە حســابی ئەبجەدی حەلکردووەو دەڵـێ بابــا لە ساڵـی 326 کۆچـی‌دا لەدایــك بووە، وەکــو لە پەراوێزی ژمارە (18)دا پیشانم داوە، ئەمە دوورە لە ڕاستی‌یەوە.

**ژیانی: -**

لە بارەی ژیـانی بابـاوە شتێکی ئەوتـۆمـان بە دەستەوە نی‌یە، چونکـە بابـا ژیـاون خۆشی ئەم جیهـانەی ئەوەندە بەلاوە گرنگ نەبووە، ڕەندێکی بێ‌شوێن و لانە بووە، بە شان و باهووی هیچ پاشــاو گەورەیــەك دا هەڵـی نــەداوەو لەنــاو کۆڕی شاعیــرانی بەناوبانگی سەردەمی خۆی‌دا، خۆی نەبردۆتە پێشەوەو هەڵپەی بەدەست هێنـانی پلەو پایـەی بەرزی نەکـردووەو، خواپەرستێکی گۆشەگیر بووە، وەکو دەگێڕنەوە، بۆ ئەم مەبەستە زۆر جار خۆی لە ئاوەدانی دوور خستــۆتـەوەو، وێـڵ و شەیـدای دەشت و دەرو شاخ و دۆڵەکانی دەوروپشتی هەمەدان بووەو، تا ئەم جیهانەی

بەجێ هێشت ژیـانی بە هەژاری و بێ سـامـانی و ڕووتـەڵـەیی ڕ
بردەسـەر، هەر لەبـەر ئەوە بوو، کە ناوی نرا بابـا تاهـیـری
عوریـان، چونکـە نەیـویست بچووکترین دەستکەوت و بەشێکی
هەبێ لەم گێتی یـەدا، بێگـومـان هەمیشـە مێژ ویش پەردەی داوە
بەسەر گەلێ لە لایەنەکانی پیاوێکی وا مەزن و گەورەدا.

**پلەو پایەی: -**

بابـا صۆفی یـەکی گۆشـەگیـرو خواپەرستێکی گەورە بووە، بە گوێرەی ئەوەی کە لە چوارینەیەك دا دەڵێ: (خوداوەندا بە حەقی هەشـت و چارت) لەوە دەچـێ کە لەسـەر مەزهـەبی دوانگـزە ئیمـامی بووبێ، هەروەهـا زانـایـەکی بەنـاوبـانگ و شاعیرێکی هەست ناسك و مەزن بووە.

بەڵام پلەو پایەی بابا لە ڕادەك دا بووە کە پاشایەکی خاوەن دەستەڵاتی وەکو توغرولی سەلجوقی، کاتێ کە لە دەوروبەری ساڵانی 447 - 450 کۆچی دا هاتـۆتـە هەمـەدانـەوە، زیـارەتی بابای کردووەو دەستی ماچ کردووەو داوای ئەوەی لێ کردووە کە ڕێگای ڕاستی پیشان بداو ئامۆژگاری بکا، سەر ئەنجام بە بابای وتـووە، ئەوەی کە تۆ دەخـرمـووی من وادەکـەم. ئەم پیاوە مەزنە دوای مردنیشی گۆڕەکە بووە بە زیارەتگاو هەزاران کەس لە زۆر لاوە بە پەرۆشەوە خۆیان گەیاندۆتێ و هەر لە سەدەی شەشەمی کۆچی یـەوە بورجێکی هەشت گۆشـەیی لەسـەر ئارامگـاکـەی دروسـت کراوەو هەروەهـا لە ماوەی ساڵانـی (1967 - 1970)یش دا بینـایـەکی گەورە لەسـەر گۆڕی پاکی دروست کراوەو لەو کاتەوە کە ئەم جیهانەی بەجێ هێشتووە تا ئیستا کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵك دێن بۆ زیارەتی.

ئەو دەنـگە و باسـەی کە لە بارەی بابـاوە وا لەسـەز دەمی خەڵکی هەمەدان و ناوچەکەی و دەماودەم بە ئێمە گەیشتووە، وەکو مەسـەلـەی خوشکـەزا ئەستێـرەنـاسەکەی و چوونی بۆ لای بابا بۆ ئەوەی کە شوێنی یەکێ لە ئەستێرەکانی بۆ بدۆزێتەوە پێش ئەوەی کە ئەو قسە بکات و مەبەستەکەی بە بابا بڵێ، بابا هەستی بەمە کردووەو پێی وتـووە ئەمـە مەبـەسـتـەکـەی تۆیـە، وەری بگـرەو برۆ..، هەروەها بەسەرهاتەکەی (عین القضاة) دوای ئەوەی کە سەربڕاو بابا بەلای دا تێ پەڕی و نووکە پێ یەکی لە قازی داو وتی:

پیـاوانـی خوا بەم جۆرە نانـوون، دەڵـێـن (عین القضـاة) ڕاپـەڕیـوەو سەرەبـڕاوەکـەی خۆی خستـۆتـە بن دەستی و هەڵ هاتووە.. ئێمە هیچ بەڵگەیەکی زانستیمان بەدەستەوە نی یە کە ڕاستی ئەم جۆرە ڕووداوانـە لە بارەی بابـاوە ساغ بکـاتـەوەو پێمان بسەلمێنێ، بەڵام ئەمە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە گەورەیی بابـا لە ڕادەیـەك دا بووە شتی وای لێ دەگێـڕنـەوە کە لە وزەی ئادەمیزاد بەدەرە. ئەمە شتێکی زۆر ئاسایی یە کە زۆر جار لەناو میللەتـان دا لەپاش تێپەڕبـوونی ڕۆژگـاری دوورو درێـژ کارو کردەوەی وا گەورە پیاوانی خۆیـان دەگێـڕنـەوە کە لە توانـای هیچ کەسێك دا نی یە.

**زمانی بابا: -**

لە بارەی شێـوەی زمـانی چوارینـەکـانی باباوە گەلێ بیرو ڕای جیـاجیـا وتـراوە. (رضـا قلی خان هدایت) لە (تـذکـرة مجمع الفصحاء)دا دەڵێ: بابا چوارینەی بە زمانی کۆن هەیە. ئیتر بێ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە زمانی کۆن چی یە؟ هەروەها (آتشکدە آذر) دەڵێ: هۆنراوەکانی بابا بە زمانی (ڕاجی) بووەو ڕاجی واتە (ڕازی) و لە سەردەمـەدا خەڵکی (ڕەی) و (دینـەوەر) قسـەیـان پێ کردووە. لە سەرێکی ترەوە وەکو (وحید) پیشانی داوە، دەڵێ زمانی بابا تاهیر جیاوازە لەگەڵ زمانی ڕازیدا:

هەروەهـا دەڵێن لە دەستنـووسێك دا چەنـد چوارینـەیـەکی کوردی بە ناوی باباوە نووسراوەو (شاطر بیك محمد) شاعیری بە ناوبـانگی هەمـەدان دەڵێ ئەمـە هینی منـەو بە ناوی بابـاوە نووسراوە. دیارە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە باباو شاطر بێك بە یەك زمـان چوارینـەیـان نووسیـوە بۆیـە ئە تێکـەڵاوبوونە ڕووی داوەو ئەویش کوردی یە.

یان دەڵێن بابـا بە شێـوەیـەك هۆنـراوەی دانـاوە کە لە لوڕی دەچێ، ئەی باشە ئەو شێوەیە چی یە؟ بەڵام لە ڕاستی دا زۆربەی زۆری ئەو زانـایـانـەی کە لە بارەی شێـوەی چوارینـەکـانی باباوە شتێکیان نووسیبێ داینان بەوەدا ناوە کە بابا لوڕ بووەو بە شێوەی لوڕ چوارینـەکـانی دانـاوە، ئەمـە ئاشکـرایـە لای هەمـوو ئەو کەسانەی کە شارەزایی یەکیان هەبێ لە هۆنراوەکانی بابا دا.

یەکێ لەو سەرچاوە گرنگانەی کە لە بارەی مێژووی کوردەوە نووسراوە شەرفنامەکەی ئەمیر شەرەف خانی بەلیسی یە، کە لە ساڵی (1005) کۆچی دا تەواوی کردووە، لە بارەی زمانی کوردییەوە دەڵێ بەش بووە بەم چواربە شەوە:

کرمانج، لوڕ، کەڵهوڕ، گۆران. (شرفنامه ـ تالیف الأمیر شرف خان البدلیسی ـ الناشره فرج الله ذکی الکردی ببوسته الأزهر بمصر ص 23).

وەکو دەگێڕنەوە دەڵێن شەوێکی ساردی زستان بابا خۆی دەخاتە حەوزی ئەو قوتابخانەی کە قوتابی بووە تیایاو کە دێتە دەرەوە دەڵێ: (امسیت کردیاً واصبحت عربیاً). مەبەستی ئەوەیە کە کورد بووەو بێجگە لە کوردی هیچ زمانێکی تری نەزانیوە بەڵام بە هۆی ئەو خۆخستنە حەوزەوە فێری زمانی عەرەبی بووەو بووە بە زانا لەو زمانەدا، هەرچەندە ئەمە دوورە لە ڕاستی یەوەو هیچ کەسێ بەو جۆرە نابێ بەزانا، بەڵام ئەم قسەیە لەخۆیەوە نەکراوەو بەبێ هۆ ناوی کوردیش نەنراوە لە بابا.

**چوارینەکانی: ـ**

بێگومان چوارینەکانی بابا لەو ماوە دوورو درێژەدا وەکو ئەو زمانە نی یە کە ئەو قسەی پێ کردووەو هەروەها وەکو زمانی ئاسایی ئەمرۆی ناوچەکەی خۆی نی یە، ئەوەیشی کە بۆتە هۆی ئەمە ئەوەیە کە بەشی زۆری نووسەری دەستنووسەکان بەگوێرەی زەوقی خۆیان دەستکارییان کردووەو ئەو بەرهەمە کۆنەی بابایان نەپاراستووەو ئەو وشانەی کە لایان سەخت بووە یا واتاکانیان نەزانیوە، وشەی فارسییان خستۆتە شوێنی، ئەمەیش بۆتە هۆی ئەوەی لەو هەموو دیوانە چاپکراوانەی بابا، ئێمە ناتوانین یەکێکی وایان بەدەست بهێنین کە وەکو دیوانە بنەڕەتی یە پاکەکەی خۆی بێت.

هەرچەندە زۆر تێکەوبووە بە فارسی بەڵام هەر شێوە لوڕی یەکەی خۆی گوم نەکردووەو وەکو دەبینین لە کۆتایی زۆربەی دیوانەکەیدا فەرهەنگۆکی بۆ دروست کراوەو واتای گەلێ وشەو زاراوەی لوڕی تێدا لێکدراوەتەوە، دەبێ ئەوە بزانین، ئێمە ناتوانین بە هۆی ئەو دیوانە چاپکراوانەوە تایبەتی یەکانی شێوەی لوڕی سەردەمی بابا یا ئەمرۆی ناوچەکە بەئاسانی بنووسینەوەو لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر بکەین، مەگەر لە پاشەڕۆژدا چەند دەستنووسێکی باوەڕپێکراوی چوارینەکانی بابامان دەست بکەوێ، تا بتوانین بەیەکەوە بەراوردیان بکەین و تا ڕادەیەکی زۆر بتوانین بگەینە مەبەست و بە دڵنیایی‌وە گەلێ لە چوارینەکانی ساغ بکەینەوەو دیراسەی لەسەر بکەین، ئەو دەستنووسە کۆنەی کە تا ئیستا من ئاگام لێ‌یێ دەستنووسی ژمارە (2546)ی مووزەی قونیەیە، واتە ئەوەی وا لەسەر گۆڕی مەولانا جلال الدینی بەلخی ناسراو بە مەولانای ڕومی کە مێژووی (842)ی کۆچی لەسەرە.

(شرح احوال وآثار بابا طاهر ـ بکوشش دکتر جواد مقصود ص 28)

**بەرهەمی‌تری بابا: ـ**

کۆمەڵە (کلمات قصار)ە کە بە شێوەیەکی ئاسان و ڕەوان، بە زمانی عەرەبی داینـاوە، مەبەست لە هەر یەکێ لەم وتەکورتانە قۆناغێکە لە قۆناغەکانی خواپەرستی، وەیا پلەیەکە لە پلەکانی صوفیگەری. ژمارەی ئەم وتەکورتانە (کلمات قصار) کە بە هەڵە دراوەتە پاڵ (عین القضاة)و تا ئیستا لێکدەرەوەکەی ناسراوە لە (421)وتە پێک هاتووە. وە لە کتێبی (الفتوحات الربانیة في مزج الاشارات الهمدانیة) (322)وتە لە (کلمات قصار) بە شێوەیەکی تێکەڵ لێکدراوەتەوە.

**بابا تاهیرو ڕۆژهەڵاتناسەکان: ـ**

گەلێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکانی وەکو: ژوکۆفسکی کلێمن هاوەر، ئێدوەردبراون، هێرن ئالن، ولچنسکی، لە بارەی بابا تاهیرەوە شتیان نووسیوە بە زمانی ئەڵمانی، فەرنسی، ئینگلیزی.

کلێمن هاوەری فەرەنسی کۆمەڵێ لە دوو بەیتی یەکانی بابا تاهیری چاپ کردووە.

ئێدوەرد هێرن ئالنی ئینگلیزی دیوانەکەی وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی‌و چاپی کردووە.

ئەلیزابت کورتیس برنتس دیوانی بابا تاهیری بە هۆنراوە وەرگیرا بۆسەر ئینگلیزی.

# بۆكەك ژبەهدینان

کۆمکرنا
ئەحمەد شوشی



مللەتێ کورد وەکو هەمی مللەتێن جیهانێ رەوشت و تیتالێن خوێین تایبەتی هەبە کو هندەك ژێ نێزیکی رەوشت و تیتالێن مللەتێن دەورو بەرێن وی بن ئو دبیت ژی جوداهیەکا مەزن لناڤبەرا واندا هەبیت. . تشتەکێ خویایە کو مللەتێ مە گەلەکێ دلتەرە ئەڤ دلتەریە ژی ژ نشکەکێڤە نەهاتیە بەڵکو جوانیو خوشیا ڤی وەلاتی بویە ئەگەرا پەیدابونا پەیدابیت. .

ئێك ژوان رەوشت و تیتالێن داوەتانە کو گەلەك ژمێژە لناڤ مە پەیدابوی، داوەت لهەمی دەڤەرێت کوردستانێ تێنە کرن،و لهەر دەڤەرەکێ برەنگەکێ تایبەتی تێنە گێران. .

ئەڤ بابەتە دەریایەکا پان و بەرینە ئەز نوکە نەشێم خو باڤێژمێ، بەلکو من لبەرە خو بەردمە بەر رەخەکێ گەرەکا وێ داکو بشێم لگوڕ شیانا خو وان رەوشت و تیتالێن داوەتێن دەڤەرا ئاکرێ دیارکم. .

**بێگـومـان بابـەتێ ڤەگـوهـازتنـا بوکـا تایـەکـە ژ تایێن فلکـلورێ کوردی بێ کەڤـن، ئەڤ کارە دبیتـە ئەگـەرا خویـابـونـا وێنـەیێن دلسـوزیێو وەفـایێ ژیـانا کومەلاتیێ‌یا کوردا، دەمێ بەرچـاڤ دبن دنـاڤ وان رەوشت و تیتـال و سترانێن ب بوك وزاڤا تێنە گوتن. .**

**جوانیێو بەدەویا بوك و زاڤاو خەملاندن و رێخستنا واناو ئەو دەوارێن ب کار دئینن دڤان تیتالادا ب رێیا پەسن کرنا روێین ژیانێو ڤەگوهازتنا بوکا سالوخ ددەت. . ڤێجا ئەڤە چەند سترانن یێن وان شاهیێو داوەتاو سەرو بەرێت ژن ئینـانێ من ژ پیـرو کالاو خوجهێت گونـدا وەرگـرتن و هەر وەکی من بهیستیێو نڤیسین پێشکێش دکم داژ وەنـدابونێ قورتال ببیت. .**

**ئێدی هیڤیدارم کو ببتە ئەگەرا ل دوڤ چون و کومکرنا ڤی سامانی**

ل دەڤەرا ئاکرێ بڤی رەنگێ خارێ بوکا ڤەدگوهێزن: ـ

1 ـ شەڤا دەست رێژان (خەنایێ) ئەوژی دو پشکەو ل دوجها.

أ ـ ل مالا بابێ بوکێ.

ب ـ ل مالا زاڤای.

2 ـ پەری ڤەدان ل مالا زاڤای.

3 ـ ڤەگوهازتنا بوکێ، ئەوژی دو پشکە: ـ

أ ـ ل مالا بابێ بوکێ.

ب ـ ل مالا زاڤای، چەوا خو ئامادەدکەن دا ب چنە دوڤ بوکێ.

4 ـ ڤەگوهازتنا بوکێ بو مالا زاڤایی.

5 ـ ب رێڤە.

6 ـ ب چی رەنگێ سەرێ زاڤایێ دشون و چەوا؟!

7 ـ سەر سوبەهیك (سەرێ بوك و زاڤای).

نهو ئەم دێ ڤان خالا ئێك ئێك شروڤەکەین: ـ

1 ـ شەڤا دەست رێژان (خەنایێ) ل مالا بابێ بوکێ سەر سپیێو پیـجکـێ سەی دێ چنـە مالا بوکـێ بەری روژەکێ یان دو روژا، سەر سپی دێ تورکێت خەنایێ گوز کەتـە ئامـانـەکی (لـەگـەن)و هنـدەك ئاڤێ کەتـە ناڤ و هەڤیرکەت، کچکێت گوندی دێ لێ خربن دەستا قوتن و بسترن و نارینکـا بێـژن و لێـك ڤەگێـرن و بلەیـزن و تلیلیا ڤەدن، سەر سپی پشـتـی کەزیـێت بوکێ ژ ڤەهـانـدنێ ڤەدکەت دێ سەرێ بوکێ خەناکەت ل گەل دەست و پێت وێ، پاشی هەر کچکـەکێ هنـدەك خەنـایێ دانتـە سەر دەستیێو ئەوا مای دێ بەلاڤـەکـەن ل سەر دەرو جیـرانـاو گوندیێ‌یا هەر مال وترارەکی بو هنێرن:

(1) پیجکێ سەی: مروڤەکە ل گەل سەر سپی دچیت بەرگێ و بوخچکـا دهـەلگـریت و هاریکـاریا وێ دکەت. .

وسترانـا بێـژن و لەیزن و دو ڤەگێرن و دەواتێ کەن، پاشی هوگرو هەڤالێن زاڤای دێ بنە خەلەك ل رەخ و چانا، دێ لەگەنا خەنایێ ئینن و چەند (شەمالك ودگەل تاکێت گولا یان ریحانا یان نێرگزا) دناڤدا دچکلینن، دوڤرا گەنجەکێ بخەنجەر خەنجەرا ددەستادا ل پێش هلگرێ لەگەنا خەنایێ تێت و دلەییزیت وخوشك وبرایێن زاڤایی دگەل هەڤالا دێ دگـەل هێن و خرڤـە بن هنـداڤ سەرێ زاڤـای تلیلیا ڤەدەن ولـەیـزن، ڤێجـا لەگـەنـا خەنایێ ب گەر وگوری ب هەردو دەستـا بلنـدکـەن سەر سەرێ خو وب لەگـەنـاخەنـایێ ڤـە دلـەیـزن و ئەڤ سترانـا هەنێ یادبێـژنێ (سـەرێ زاڤـای) دبێژ ن و لێك دڤەگێرن، دێ خەنایێ دەستێت زاڤایی دەن و هەڤالێت زاڤای دەستێت خو خەناکەن ل دور زاڤای وەربێن لەییـزن و سترانـا (گوپالە) دێ بێژ ن، هەتا درەنگی شەڤێ دێ خارنێ رێـزکـەن هەمی دێ پاشیڤێ خون و هنـدەك هەڤـالێت زاڤـایی ل مالا زاڤـای دنڤن دگەل خزم و کەس و کارا هەتا سپێدێو ئەوێن دی دێ ڤەرەڤن. . پاشی سپێدێ دو هەڤالێت زاڤای یێن دایێو بابێت وان ساخ سەرێ خو دشـون پێشی زاڤـای، دوڤـدا برا زاڤـا دێ سەرێ زاڤـایێ شوت و پاشی سەرێ خوژی شوت و جلکێن تازە کەن بەر

زاڤايي و گولاڤێ لێ رەشينن : -

هاى سەرى زاڤانە
هاى سەرێ زاڤانە
دسەرى شاش و كتانە
دسەرى شاش و كتانە
خلمەت هاتن بەلگێت گولانە
هاى تەكر كەس نەكر
هاى تەكر كەس نەكر
تەيا خو بدلێ خو كر
تەيا خو بدلێ خو كر
تە پسيارا جيرانا نەكر
گەلى براو خوشكا
گەلى براو خوشكا
خەنى بكەنە قوديشكا
پاڤێنێ بارو پشكا دەستا دانن هەتا ئەنيشكا
هاى هەرە سەر بانى
بابێ زاڤايى هەرە سەر بانى
ڤەكوژە وى بەرانى
ڤەكوژە وى بەرانى
ئەڤروكەيە رۆژا ڤى دانى
هاى هەرە قشلێ
بابێ زاڤايى هەرە قشلێ
بيرە مراسەلێ
بيرە مراسەلێ
ئەڤروكەيە رۆژا حەشرێ
هاى ئەڤ جارە راستە
هاى ئەڤ جارە راستە
كەسك و سورى ڤەگوهاستە
كەسك و سورى ڤەگوهاستە
ياتە دڤێتن مە بوتە خاستە
هاى نەبێژە كورتە

هاى نەبێژە كورتە
سيسنوكا خوناڤ گرتە
سيسنوكا خوناڤ گرتە
ياتە دڤێتن مە ژ كومێ گرتە
هاى نەبێژە درێژە
هاى نەبێژە درێژە
سيسنوكا خوناڤ رێژە
سيسنوكا خوناڤ رێژە
مە بوتە ئينا ياتە دڤێت ژ مێژە
هاى لاوێ دەڤەرێ
هاى لاوێ دەڤەرێ
تول قەسرێ وەرە دەرێ
تول قەسرێ وەرە دەرێ
شاباشە ل گوشێت خەنجەرێ
هاى لاوێ دەولەتێ
هاى لاوێ دەولەتێ
كوستيل هێلا ل مەهەتێ
كوستيل هێلا ل مەهەتێ
دەستێت شلك ناگرن شەربەتێ
هاى مە ژنوى زاڤاكر
هاى مە ژنوى زاڤاكر
كوستيلا زێرێ جێكر
كوستيلا زێرێ جێكر
كوستيل زێرە ل تليێ دو تاكر
دەست باڤێژە خەنجەرێ
دەست باڤێژە خەنجەرێ
ژ كاڤلانى بينە دەرێ
هەڤالا كومكە سەرێ
دا رەقسن بگوشا خەنجەرێ
هاى ميرێ هەرنێ
هاى ميرێ هەرنێ
سێ سالا لبەر خاندنێ

سێ سالا لبەر خاندنێ
سالا چارێ بو تینن ژنێ

های چوخێ تە رەشە
های چوخێ تە رەشە
حەمامێ وەرە خوشە
حەمامێ وەرە خوشە
مە بوتە ئینا ئەو گولا گەشە

های چوخێ تە سپییە
های چوخێ تە سپییە
حەمامێ وەرە زویە
حەمامێ وەرە زویە (٩)
مە بوتە ئینا ئەو جنسرییە

های زاڤایێ ماما
های زاڤایێ ماما
کوستیل هێلا ل حەماما
کوستیل هێلا ل حەماما
دەستێت نازك ناگرن شەماما

های زاڤایێ خالا
های زاڤایێ خالا
خارزا راکرن خالا
خارزا راکرن خالا
دەستێت نازك ناگرن خلخالا

های زاڤایێ بەگا
های زاڤایێ بەگا
چوخێ تە ژ هرییا شەکا
چوخێ تە ژ هرییا شەکا
دەستێت شلك ناکەن حەنەکا

های میر هاتە چەما
های میر هاتە چەما
بدلێ خو نەگرە خەما
بدلێ خو نەگرە خەما
تو زاڤایێ بدلێ مە هەما

های میر گازی تەکر
های میر گازی تەکر
هەتا تە کارێ خوە کر
هەتا تە کارێ خوە کر
دەلالە جانێ ل بسکا زێدە کر

های گرکێ ب کەزانە
های گرکێ ب کەزانە
زاڤاکێ چ نەزانە
زاڤاکێ چ نەزانە
بشکوژ ڤەکرن بدانە

های گرکێ ب بێموکە
های گرکێ ب بێموکە
زاڤاکێ چ خشکوکە
زاڤاکێ چ خشکوکە
بشکوژ ڤەکرن ب نەینوکە

های دێ چمە ئاکرێ
های دێ چمە ئاکرێ
دێ کرم ڤێ پوشیێ
دێ کرم ڤێ پوشیێ
شاباشە ل سەرێ بوکێ

های دێ هەرن بینن
های دێ هەرن بینن
سەرێ هەسپی ب گورچینن
سەرێ هەسپی ب گورچینن
دەلالە جانێ ل بابێ بستینن

های بوخچکێ چێکە
های بوخچکێ چێکە
سێ سەد خەلاتا تێکە
سێ سەد خەلاتا تێکە
بو دەلالە جانێ ڤرێکە

های مالا تە ئاڤا
های مالا تە ئاڤا

مه گورین زێرین داڤا
ته دامه چوتێ چاڤا
کومه (. . . .)[5] پی کره زاڤا
های مالا ته سوکه
های مالا ته سوکا
ته دامه یابچوکه
ته دامه یابچوکه
یێد خانیدا زاڤاو بوکه
های لاتا ب نێرگزه
های لاتا ب نێرگزه
مه چنین گورزه گورزه
مه چنین گورزه گورزه
هیزارا بوکێ گوت ڤەناوزە[6]
های لاتا ب بەیبینه
های لاتا ب بەیبینه
مه چنین چین ب چینه
مه چنین چین ب چینه
هیزارا بوکێ گوت کەلا بدونه[7]
هات تاڤا تەرگێ
هات تاڤا تەرگێ
دارێته سەر ئەردێ
دارێته سەر ئەردێ
لاو مێهڤانه ل بەژنا جانێ
هات تاڤا بارانێ
هات تاڤا بارانێ
دارێته کوردستانێ
دارێته کوردستانێ
لاو مێهڤانه ل بەژنا جوانێ

## «سترانا گوپاله»

ئێك ژ هەڤالێن زاڤایی یان (برا، پسمام، کورخال) دێ گوپالەکی بدەستی خو گریت ب هەردو دەستا بلند کەت سەر سەرێ خو ولەیزیت بگوپالێ ڤە وئەوێن دێ دەستا قوتن، کچ و ژن تلیلیا ڤەدەن و خرڤە بن ل رەخ و چانا مینا خەلەکێ ئەو دێ لەیزیت دنیڤا واندا: -

گوپاله گوپاله کەکو
گوپاله گوپاله
گوپاله گوپاله برا
گوپالێ زێردایی
دەستێ کی وکێ نایی کەکو
دەستێ کی وکێ نایی
دەستێ زاڤایی نایی برا
دەستێ زاڤایی نایی
مەر پێ ڤەگێرایی کەکو
مەر پێ ڤەگێرایی
دەست نەکه عەبایی برا
دەست نەکه عەبایی
خەنا یا شێلایی کەکو
خەنا یا شێلایی
بو دەستێت زاڤایی برا
بو دەستێت زاڤایی
ب خودێ تو زاڤایی کەکو
ب خودێ تو زاڤایی
ئەڤرو تو زاڤایی برا
ئەڤرو تو زاڤایی
دەست نەکه خورچیکێ کەکو
دەست نەکه خورچیکێ[8]
رونه لبەر قودیکێ برا
رونه لبەر قودیکێ
خەنا یا ل سێنیکێ کەکو
خەنا یا ل سێنیکێ
بو نیشانێ بوکێ برا
بو نیشانێ بوکێ

ئەو بۆ سەرێ بوکێ کەکو
ئەو بۆ سەرێ بوکێ
ئەو بۆ دەستێ بوکێ برا
ئەو بۆ دەستێ بوکێ
گۆپالە گۆپالە کەکو
گۆپالە گۆپالە
گۆپالە گۆپالە برا
گۆپالێ زێردایی

## «پەری ڤەدان»

دۆ کەسێت دای بابێ وان ساخ پەرێ دروست دکەن، ل ئودا زاڤایی ئالێ پاش خانی دێ هند جهی هێلن کو تێرا جهێ رائێخستنا نڤینێت بوك وزاڤا بمینیت. ماڤورەك و نالیکەکا هریێ و دۆ بالیفکا دانن سەر نڤیناو چارچەڤەکێ بسەر نالیکێ رائێخن دێ ئینن دۆ سنگا ژ داری یان دۆ (بزمارا) ل هەردۆ دیوارێت مەزلێ ڤوتن ئەو دیوارێت بەرامبەری ئێك، سەرێت وەریسەکی ب هەردۆ سنگاڤە هشك گرێدەن مینا رستەکێ دەمێ جلکا پێڤە دهەلاویسن، پاشی دێ ئینن (مێزەرەکێ، جاجمەکی، بەرکەکێ)یا مەزن و پان بسەر وێ رستێ ڤە هەلاویسن وەسا کو شۆر ببتە خارێ بۆ ئەردێ تەمەت (دۆسێ) تپلا ل ئەردی درێژ بیت، پاشی (ڤانوسەکێ، فەنەرەکێ، چرایەکی) ل سەر سنگەکی هنداف نڤینیت (بوك وزاڤا) هەلاویسن دا ب شەڤ رونـاهیێ بدەتە ژۆرڤە. ڤێجا هەتا ئەڤان تشتا دروست دکەن ئەڤان سترانا دبەررا دبێژن دگەل دەست ڤوتانێ و تلیلیاو هندەك بلەوندیو دەرسوکا. . دلەیزن. .

أ - ئەو پەرییا وەکو داڤە
مە تێرا دیتن چاڤە
تە پیرۆز بیت ئەڤ لاڤە
ئەو پەرییا وەکو مۆیە
مە تێرا دیتن رویە
تە پیرۆز بیت ئەڤ شۆیە

ب - دوڤ ڤێ چەندێ سترانەکێ ب خانی دبێژن:
خانی خۆش خانی
مە ب کسل و کێچکێ هونی
مە نارینك تێدا گوتی
خانی هونیو ڤەهوسی
بوك هات و راتەحسی
دەڤێ بەربوکا قەرسی
خانی ل بابان دۆرە
ئەڤ شەڤە بنڤە تیرە
سوبەهی وەغەر خێرە
خانی ل بابان کۆردا
رێك تێنێ ژیهەل و ژۆردا
بوکا مە یا دخەملا سۆردا
خانی ل سەرێ کولانێ
دەواتی دا رژیانێ
هەر وەکو تاڤا بارانێ
خانی ل بابان خانە
یێ ب کوچك و یێ ب ئەیوانە
ئەڤ شەڤە بوك میهڤانە

---

جـ - ئەڤێ سترانێ ژی دوڤرا دبێژن: -
ئەو کییە تێتو ل ئودێ
های ئودا خالیو مالی
ئەو کییە تێتول ئودێ برا
ئودا خالیو مالی
شەعرا خو بادایی
های ریمان دانە لایی
پرچا خو بادایی برا
ریحان دانە لایی

خوزمەی ل وێ ڕۆژێ
های م لێ چیخ ڤەدایی
خوزمەی ل وێ ڕۆژێ برا
م لێ چیخ ڤەدایی
ئودا یەك بچوكە
های ئودا یەك بچوكە
ئودا یەك بچوكە برا
ئودا یەك بچوكە
شەعرا خو پێچایی
های ریحان بەلالیكە
پرچا خو پێچایی برا
ریحان بەلالیكە
خوزمەی ل وێ ڕۆژێ
های بوتە بینن بوكە
خوزمەی ل وێ ڕۆژێ برا
بوتە بینن بوكە
ئودایەك مەزنە
های ئودایەك مەزنە
ئودایەك مەزنە برا
ئودایەك مەزنە
شەعرا خو پێچایی
های ریحان دانا ل بنە
پرچا خو پێچایی برا
ریحان دانا ل بنە
خوزمەی ل وێ ڕۆژێ
های بوتە بینن ژنە
خوزمەی ل وێ ڕۆژێ برا
بوتە بینن ژنە

**«ڤە گوهازتن»**

1 ـ ل مالا بابێ بوكێ:

سپێدێ زوی دێ ئاڤێ د دیزەكێدا گەرمكەن، سەر سپی دێ سەرێ بوكێ شوت ژ خەنایێ، پاشی دێ جلكێن بوكانیێ كەتە بەرو هندەك هشكە پارا دێ كەتە دناڤ لەوەندیێت بوكێ و هندەك كەتە پێلاڤێ وێ وسەرێ بوكێ شەكەت و چاڤا كلدەت و زێرا پێڤە كەت و هیزارێ بسەری دادەت و دانتە سەر جهێ وێ..

ڤێجا هەڤالێت بوكێ و كەس و كارو بەر بوك دێ دو قولی رونن بەرامبەرێ ئێك ستراناو نارینكا بێژن ولێك ڤەگێرن و هندەك بدەرسوكێت سوورو زەر (ڕەنگ ڕەنگ) دلەیزن یان ب لەوندی‌یاو تلیلیا ڤەدەن، هەتا ل مالا زاڤایی بەربوك تێنە بوكێدا ڤەگوهێزن.. ئەگەر مالا دووربیت دێ خارنەكێ بەرهەڤكەن بو بەربوكا دەمێ تێنە دوڤرا وڤێ سترانێ ژێرا دبێژن.. ئەڤ سترانە ب دو قولی تێتە گوتن هندەك دبێژن و هندەك لێ ڤەدگێرن...

ئەم نادەین و ئەم نادەین
كەزی شورا خو نادەین
ئەنی زێرا خو نادەین
هەتا نەهێت كەمەرە
كەمەرا وێ حازرە
دگەل دا جل و بەرە
كراس و فیستان زەرە
دێ بدەنەڤە بویكامە
ئەم نادەین و ئەم نادەین
كەزی زێرا خوە نادەین
چاڤ بەلەكا خوە نادەین
هەتا نەهێت گوهارە
گوهارێ وێ حازرە
ل دوهیو هەتا پێرە
ڕێكا مە چەندا دورە
دێ بدەنەڤە بوكا مە
ئەم نادەین و ئەم نادەین

چاڤ بەلـەكـا خوە نادەيـن
گەردەن كێـلا خوە نادەيـن
هەتـا نەهـێـت خزێـمـە
خزێـمـا وێ حازرە
ل دوهـیو هەتـا پێـرە
رێـكـا مە گەلـەك دوٚرە
دێ بدەنـەڤـە بوٚكـامـە
ئەم نادەيـن و ئەم نادەيـن
كەزی زەرا خوە نادەيـن
چاڤ ب كلا خوە نادەيـن
هەتـا نەهـێـن خەلاتـە
خەلاتـێ وێ حازرە
ل دوهـیو هەتـا پێـرە
خەلاتـێ بوٚكـێ فەرە
دێ بدەنـەڤـە بوٚكـامـە
ئەم نادەيـن و ئەم نادەيـن
ئەنـی دەقـا خوە نادەيـن
دەڤ بچـويـكـا خوە نادەيـن
تا نەدەن پشـتـە دەرێ
ئەم دێ دەيـن پشـتـە دەرێ
بدەنـە مە كراس زەرێ
بدەنـە مە گەش ڤەنـەرێ
دێ بدەنـەڤـە بوٚكـا مە

---

**د ـ ل مالا زاڤایی: ـ**

كەس و كارێت زاڤـایو بەربـوٚك دێ خوٚ بەرهـەڤ كەن وخـو خەمـلینن گولاڤێ ل خو رەشینن ئانكـو (خـو بێهن خوشـكـەن) هەر ئێـك ئێـك يان دوٚ دوٚ، دێ ل دەواركێ سواربن. هەسپەكێ كەحێل يان جانی ماهینەكی دێ ئینن خەملینن و زینـەكێ سپـەهی ل پشتێ كەن و (مێـزەرەكێ نالیكەكێ، لهێڤەكێ) دێ هاڤێنە سەر زینیدا جهێ بوٚكێ خوش بیت دەمێ ل هەسپی سواردكـەن، ڤێجـا دێ برێكـەڤن بوٚ مالا بابێ بوٚكێ دگـەل سترانـاو نارینكا برێڤە دبێژن و دەستا دقوتن هەتا دچن و تێنەڤە وقەستا مالا بابێ بوٚكێ كەن. . . ل ڤێرە زاڤاو برا زاڤاو چەند هەڤالێن زاڤایێ دێ مینن دگەل زاڤایی ل مال هەتا بەربوٚك تێنە ڤە وبوٚكێ دگەل خوە تینن. .

بەربـوٚك دێ ب ژوٚر كەڤـن ل مالا بابێ بوٚكێ دگـەل تلیلیـاو دەست قوتـانیو سترانـا دبێـژن و لێـك ڤەدگێرن و دلـەیـزن بدەرسـوكـاو لەونـدیـاو ئەڤ سترانـا هەنێ ژێرا دبێژن: ـ

ئەم هاتـیـنـە تە دەلالـێ
ئەم هاتـیـنـە تە هەڤـالـێ
دێ كەیـن كارێ تە دەلالـێ
دێ كەیـن كارێ تە هەڤـالـێ
گریـا بێ فایـدە دەلالـێ
گریـا بێ فایـدە هەڤـالـێ
ئەم هاتـیـن تە كاركـەیـن دەلالـێ
ئەم هاتـیـن تە كاركـەیـن هەڤـالـێ
تیـتـێ ل ئەنـیـێ راسـت كەین دەلالـێ
تیـتـێ ل ئەیـنـێ راست كەین هەڤـالـێ
تە ژ بابـێ خلاس كەیـن دەلالـێ
تە ژ بابـێ خلاس كەیـن هەڤـالـێ

---

ئەم هاتـیـن تە بیـنـیـن دەلالـێ
ئەم هاتـیـن تە بیـنـیـن هەڤـالـێ
ئەم دێ تە خەمـلـیـنـیـن دەلالـێ
ئەم دێ تە خەمـلـیـنـیـن هەڤـالـێ
تە ژ بابـێ بسـتـیـنـیـن دەلالـێ
تە ژ بابـێ بسـتـیـنـیـن هەڤـالـێ

---

ئەم هاتـیـن تە ب خازیـن دەلالـێ

ئەم هاتین تە ب خازین هەڤالێ
ب ستران و ئاوازین دەلالێ
ب ستران و ئاوازین هەڤالێ
ژ مال بابێ ڤەگوهێزین دەلالێ
ژ مال بابێ ڤەگوهێزین هەڤالێ

---

بابان و باپیرە دەلالێ
بابان وباپیرە هەڤالێ
ڤەکەن کەزیێت هورە دەلالێ
ڤەکەن کەزیێت هورە هەڤالێ
دایکێدا دەستورە دەلالێ
دایکێدا دەستورە هەڤالێ

---

ئەم هاتین پاییزە دەلالێ
ئەم هاتین پاییزە هەڤالێ
گەنم و جەهـ فریزە دەلالێ
گەنم و جەهـ فریزە هەڤالێ
دایکا بوکێ زیزە دەلالێ
دایکا بوکێ زیزە هەڤالێ

---

ئەم هاتین بوهارە دەلالێ
ئەم هاتین بوهارە هەڤالێ
گەنم و جەهـ سیارە دەلالێ
گەنم و جەهـ سیارە هەڤالێ
دایکا بوکێ ژارە دەلالێ [11]
دایکا بوکێ ژارە هەڤالێ

---

نەگری نەلورینە دەلالێ
نەگری نەلورینە هەڤالێ
روندکا نەبارینە دەلالێ
روندکا نەبارینە هەڤالێ
کچ مالێ خەلکینە دەلالێ
کچ مالێ خەلکینە هەڤالێ

---

فایدێ بابا نینە دەلالێ
فایدێ بابا نینە هەڤالێ
دایك پالێت پێشینە دەلالێ
دایك پالێت پێشینە هەڤالێ
کوڕ فایدێ بابێنە دەلالێ
کوڕ فایدێ بابێنە هەڤالێ

---

رێکا مێسل تاتە دەلالێ
رێکا مێسل تاتە هەڤالێ
زاڤا ڤێهەل هاتە دەلالێ
زاڤا ڤێهەل هاتە هەڤالێ
ئینان شەش خەلاتە دەلالێ
ئینان شەش خەلاتە هەڤالێ

---

رێکا مێسل دەرزی دەلالێ
رێکا مێسل دەرزی هەڤالێ
زاڤا ڤێهەل بەزی دەلالێ
زاڤا ڤێهەل بەزی هەڤالێ
ئینان داڤ و دەزی دەلالێ [12]
ئینان داڤ و دەزی هەڤالێ

هندەك بەربوك لبەر دەری دمینن ل ژڤانا دەرکەڤتنا بوکێ بو دەرڤە ژ مالا بابێ ڤێ سترانا هەنێ دبێژن و لێك ڤەدگێرن و دەستا دقوتن و تلیلیاو ڤەددن..

دەرینن... دەرینن
کچکوکێ ل مال دەرینن
سورمەی ل چاڤا چاڤا
وەرینن... وەرینن

---

مە درەنگە.. مە درەنگە

بابێ بوکێ مە درەنگە
شیڤ و تیشتا دەرەنگە
بابێ بوکێ مە درەنگە
بەفرێ گرتن ناستەنگە
بابێ بوکێ مە درەنگە

---

مە زیە.. مە زیە
بابێ بوکێ مە زیە
شیڤ و تیشتا کەلیە
بابێ بوکێ مە زیە
بەفرێ گرتن گەلیە
بابێ بوکێ مە زیە

---

ب لەزینە.. ب لەزینە
دایکا بوکێ ب لەزینە
بوکا مە زوی دەرینە
دایکا بوکێ ب لەزینە
بەر بوکێت مە برسینە
دایکا بوکێ ب لەزینە
ب هەژینن... ب هەژینن
سەرێ هەسپی ب هەژینن
زینی ل پشتێ ب شدینن
سەرێ هەسپی ب هەژینن
گورچینن... ب گورچینن
سەرێ هەسپی ب گورچینن

---

برایێ زاڤایی یان کورەکێ ب دایباب دێ هێت کەمەرکێ هاڤێتە پشتا بوکێ دو جارا دێ گرێدەت و ڤەکەت هەر وەسا بوك دێ رابت رونت، جارا سێ دێ کەمەرا وێ بدرستی گرێدەت. پشتی دەستوریێ ژ دایبابێت بوکێ وەردگرن دێ (دو مێر یان دو ژن)یان ژنەك و مێرەك بێت ناڤ سالاڤە چوین، هەر ئێك چنگلەکێ بوکێ گرت و دێ بێژن ناڤێ خودێ لێ بینن:

«یا ئەللا ب ئزنا تە.. رابە ل ماڵ بابێ دایکوکێ».

دو جارا بوك دێ رابیت رونت، جارا سێ دێ رابیتەڤەو دێ برێ ئێخنن بو دەرڤەی خانی وئەڤ سترانا هەنێ بەربوك ژێرا دبێژن: -

دێ راکەن چەندا بلندە
بەژنا تە شەماڵ و ڤندە
پاشی تە خرابە ئەڤ گوندە
لێ بخوینیت تەیری کوندە
دێ راکەن چەندا نازدارە
بەژنا تە شتلە سپیندارە
پاشی تە ئەڤ گوندە ژارە
ب هەرڤن خانی و دیوارە
دێ راکەن چەندا دەلالە
بوکا مە جان و روی بخالە
چاڤ رەشە چاڤ خەزالە
بەژنا تە چەندا شەپالە
دێ راکەن چیا شوخ و شەنگە
بوکا مە جان و چەلەنگە
بەربی ل دەری بونە پەنگە
بوکێ راکەن ل مە درەنگە
نارینێ دابو ب چەمادا
روندکەکێ دابو ب رویادا
ژ غەریبیا باب و برادا
بەربوکا هاوری لێ بادا
نارینێ سەرێ خو بادا
دەلالێ سەرێ خو بادا
روندکەکێ دابو ب چاڤادا
ژ غەریبیا دایك و بابادا
نارینێ کەس وناکەت

**سەرێ خو دگریێ راناكەت**
**مال بابێ دل مایێ ناكەت**
**دایبابا غەریب ناكەت**

---

ل ڤێرە دبێژن دەمێ بوك رابوڤە دایكا بوكێ دێ ل كچا خو زڤریت دلەدلی دەت ئو سەرێ وێ ماچ كەت و روندكێت وێ زوهاكەت. ڤێجا (دایك وبوك) دێ چنە سەرو ستویێ ئێك و خاترا خو ژێ خازیت و ئەڤ پارچە سترانە ژ زار دەڤێ دایكا بوكێ تێتە گوتن:

**نارینێ دایكوكا منێ**
**هەلنەگرە تو خەما منێ**
**شولەكە هەتا مرنێ**
**ب سەرێ تە نەهاتیە ب تنێ**

★ ★ ★

**پشتە دەر: -**

ئێكە ژ تیتالێت كوردی، ئێك ژ مروڤێن بوكێ بڤی كاری رادبیت دەمێ بوكێ رادكەن بو دەرڤە دبەن دێ دەرگەهێ مالێ گریت و ڤەناكەت هەتا پشتە دەرا ب دلێ وێ نەدەنێ. ڤێجا بابێ زاڤایی دێ چەند (دینارا)یان هشكە دراڤێ وی دەمی دەتە خودانا پشتە دەرێدا دەری ڤەكەت هەتا بوكێ ل مال بابێ بەنە دەرڤە..

پاشی دێ بوكێ ل هەسپی سواركەن مروڤەك سەرێ هەسپی (هەڤساری) كێشیت و ئێك دی چنگلێ وێ گریت دا نەكەڤیت كو ئەگەر هەسپ ژ بەر دەنگێ تەقێنا تڤەنگا دەنگێ نارینكێ و تلیلیارا خو بهاڤێت یان چلڤەك ڤێ بكەڤیت. . هندەك بەر بوك ڤێ بەرگوتنكێ دبێژن: -

**«های مە برو های مە بر مە حیلا خو ل هنگو كر»**

هندەك جارا ژێ بەربوكەكا بچوك ل بەرا بوكێ سوار دبیت. و هێدی هێدی برێڤە تێن دگەل رێڤە چونا هەسپیو ئەڤ سترانا هەنێ تێتە گوتن: -

**بینە دەر ل خانی دەلالێ**
**بینە دەر ل خانی هەڤالێ**
**دا سیاركەن ل جانی دەلالێ**
**دا سیاركەن ل جانی هەڤالێ**
**دێ بەین بو خودانی دەلالێ**
**دێ بەین بو خودانی هەڤالێ**

---

**هەسپێ بوكێ بوزە دەلالێ**
**هەسپێ بوكێ بوزە هەڤالێ**
**نالا گرتن توزە دەلالێ**
**نالا گرتن توزە هەڤالێ**
**زاڤا دل ئالوزە دەلالێ**
**زاڤا دل ئالوزە هەڤالێ**

---

**هەسپێ بوكێ شیێیە دەلالێ**
**هەسپێ بوكێ شیێیە هەڤالێ**
**نالا گرتن پێیە دەلالێ**
**نالا گرتن پێیە هەڤالێ**
**زاڤا چاڤ ل رێیە دەلالێ**
**زاڤا چاڤ ل رێیە هەڤالێ**

---

**هەسپێ بوكێ سپییە دەلالێ**
**هەسپێ بوكێ سپییە هەڤالێ**
**توزێ گرتن پێیە دەلالێ**
**توزێ گرتن پێیە هەڤالێ**
**لێ كومبین بەربییە دەلالێ**
**لێ كومبین بەربییە هەڤالێ**

---

**هەسپێ ل رەندەكێ دەلالێ**

هەسپێ ل رەندەکێ هەڤالێ
یێت کولیت خەندەکێ دەلالێ
یێت کولیت خەندەکێ هەڤالێ
هیڤیا چاڤ بەلەکێ دەلالێ
هیڤیا چاڤ بەلەکێ هەڤالێ

---

هەسپێ ل کولانێ دەلالێ
هەسپێ ل کولانێ هەڤالێ
رابیە جدیدانێ دەلالێ
رابیە جدیدانێ هەڤالێ
هیڤیا چاڤ جوانێ دەلالێ
هیڤیا چاڤ جوانێ هەڤالێ

---

هەسپێ دکەت پێکولێ دەلالێ
هەسپێ دکەت پێکولێ هەڤالێ
تۆزێ دابیە سولێ دەلالێ
تۆزێ دابیە سولێ هەڤالێ
ژ بەر دەنگێ دهولێ دەلالێ
ژ بەر دەنگێ دهولێ هەڤالێ

---

ڤێجا بریڤە (هەر ژ مالا بابێ بوکێ وهەتا مالا بابێ زاڤای) دەهواتی دێ لەیزن و تڤەنگا هاڤێژن و سترانا ونارینکا بێژن (هندەك دبێژن و هندەك ڤەدگێرن). وهەر ئێك یێ ل دەوارێ خو سوارە وئەڤ سترانە بریڤە تێتە گوتن: -

های نارێ نارێ نارێ
نارینێ های نارێ
های نارێ نارێ نارێ
بوکێ های ژارێ

---

گەلیێ قەوانێ تەنگە
نارینێ های نارێ
قوتکێ بوکێ هەڤت رەنگە
بوکێ های ژارێ
بوکێ های ژارێ
شەش خانا لێ کرە دەنگە
نارینێ های نارێ
بوکێ سیار کەن ل مە درەنگە
بوکێ های ژارێ

---

گەلیێ قەوانێ کۆرە
نارینێ های نارێ
قوتکێ بوکێ مەخمورە
بوکێ های ژارێ
شەش خانا لۆرە لۆرە
نارینێ های نارێ
بوکێ سیار کەن رێ دورە
بویکێ های ژارێ

---

گەلیێ قەوانێ پانە
نارینێ های نارێ
قوتکێ بوکێ کتانە
بوکێ های ژارێ
شەش خانا لێ کرە هانە
نارینێ های نارێ
بوکا مە چەندا جانە
بوکێ های ژارێ

---

دەمێ نێزیك گوندی دبن ئەڤ سترانا هەنێ دبێژن: -

هاتینەڤە وهاتینەڤە
کارێ مە بکەن هاتینەڤە

شیڤا تێبكەن سار بینەڤە
هاتینە ڤەو هاتینەڤە

---

هاتینەڤەو هیشتا زویە
هاتینەڤەو هاتینەڤە
بەفرێ ل مە گرتن كێریە
هاتینەڤەو هاتینەڤە
مە سلاڤا ل سینگێ سپییە
هاتینەڤە و هاتینەڤە

---

هاتینە ڤە كو نیڤ رۆژە
هاتینەڤە و هاتینەڤە
بەفرێ ل مە گرتن بەرۆژە
هاتینەڤە و هاتینەڤە
مە سلاڤا ل سینگێ بشكوژە
هاتینەڤە و هاتینەڤە

---

هاتینە ڤە كو ئێڤارە
هاتینەڤە و هاتینەڤە
بەفرێ ل مە گرتن نزارە
هاتینەڤە و هاتینەڤە
مە سلاڤە ل گوهـ بگوهارە
هاتینەڤە و هاتینە ڤە

---

لەزێ بكەن بۆكێ سارە
هاتینەڤە و هاتینەڤە
سەر پشتا هەسپێ سیارە
هاتینەڤە و هاتینەڤە
زاڤای پیرۆزبیت ئەڤ یارە
هاتینەڤە و هاتینەڤە

دەمێ بۆكێ تیننە بەر دەرێ خانی هندەك جارا ئەڤ تیتاله هندی بێژی كەڤنە ل گۆندا ب تایبەتی ل دەڤەرێ تێتە كرن.. دەمێ بۆك یا سوار بەر دەرێ مالا زاڤایی پەیا نابیت سەر پشتا هەسپی، ڤێجا مرۆڤەك ژ مالا زاڤایی دێ بێژیتی (پەیابە)و خەلاتەكێ كەتە دیاری بو بۆكێ مینا (كەواله(كەوالەكێ، ئامیرەكێ ناڤ مالێ) یێ بەرگەفتیو پر شۆل، بۆك پەیانا بیت دێ بێژیت (پێ گوچكێ) بدەنە من.. ئەگەرا ڤێ چەندێ ئەوە دا خێرا وێ ژی بكەڤت ناڤ مالێ ئانكو خێرا وێ ژی تێدا هەبیت...

پاشی بۆك دێ پەیابیت دو ژنك یان دو مێرك دێ چنگلێت وێ گرن و برێڤە بەن، بەربۆك پێش و پاش بۆكێ دلەییزن و ستران و نارینكا دبێژن وتلیلیا ڤەدەن، دەیكا زاڤای دێ ئێت هوسكیەكێو ناڤ دەوكەكێ ددەستادا لبەرێ بۆكێ دێ لەییزیت (هندەك جارا كورتانەكێ لپشتێ دكەن) دەهەواتیەك دێ چیتە پێش وێو هوسكیك و ناڤدەوكێ شكێنیت وكورتانی دەتە بەر خەنجەرا ل گەل لەییزینێ، دوی دەمێدا زاڤاو برا زاڤاو هندەك هەڤال و هوگر یێ ل سەر سیڤاندێ، دەمێ بۆك تێتە نێزیك دەرێ خانی زاڤا دێ دو سێ جارەكا پێ خو یێ راستێ سەر سیڤاندەی دەت (ئانكو پێخو ل ئاخێ دەت)و هندەك ئاخێ بسەرێ بۆكێ داكەت...

(ئەگەرا ڤێ چەندێ داكو ترس و سەهما زاڤای بسەرێ بۆكێ دا بچیت) دایكا زاڤای دێ زڤریت بلەز كلوزكەكێ تژی مێویژ و كاكل باهیڤ و شەكرۆك و چەند دندكێت گەنمیو هندە هویردە یێ [illegible] دێ لبەر پێت بۆكێ شكێنیت دێ بژكیت و بچوك دێ پێوەرهێن ڤێدەن..

(هندەك جارا زاڤا دێ كلوزكێ بەرپێت بۆكێ دادەت) ئەگەرا ڤێ چەندێ ئەوەدا پێ بۆكێ یێ بخێربیت ل وێ مالێو خودێ ئەرزانیێ بدەت، بەربۆك دێ ڤێ پارچە سترانێ بێژن دگەل دەست قوتانێو تلیلیاو لەیزتنێ: -

پا كانێ دایكا زاڤایێ
ستو شكەستیا گەردەن خەلیایێ

کا تەختێ تە بۆ دانایێ
بۆکا ل دەرێ راوەستایێ

---

پا کانێ دایکا زاڤایێ
بۆك هات و راوەستایێ
کا پەریا تە بۆ ڤەدایێ
یا مایە ل هیڤیا زاڤایێ

★ ★ ★

دێ بۆکێ بەنە ژۆرڤە سەر جهێ وێ دانن زارۆکەکێ ب دایباب (کور) ژیێ وی دو سێ سالەك داننە دکوشێ دا، ئەگەرا ڤێ چەندێ ئەوە کو نەخشەل وێ رۆژێ تو ژی کورەکی دانیە دکوشا خودا. ژنکەك دێ لەوەندیێت بۆکێ ڤەکەت.

(هندەك جارا پێلاڤا دێ ئێخیت) هندە پارە سەر سپیێ دەمێ کارکری یێت کرینە دناڤدا دێ بخوبەت، ئەڤێ پارچە سترانێ بەربۆك دبێژن هەر وەکو یێ دگەل سەر سپیێ دئاخڤن: -

سەر سپیێ تو خودێ دحەبینی
بۆکا مە باش تو ب خەملینی
سۆرمەیێ ل چاڤا ب وەرینی
گۆلاڤا ل بۆکێ ب رەشینی
سەر چاڤکێ سەر نەهەلینی
چاڤێت حەسیدا ب رژینی

بێهنەکێ دێ دەهواتی بێهنا خو ڤەدەن و خارنەکێ خون، پاشی ژنەك یان (مرۆڤەکێ) شەهرەزا دگوتنا نارینك و سترانادا دێ نارینکێ بۆ بۆکێ بێژیت هندەك دێ لێ ڤەگێرن و بەربۆك دێ رابنە چەپا . . .

نارینکێ های نارێ های نارێ
دەلالێ نارێ های نارێ
کولیلکا ل تاخێ زێباری
کولیلکا ل تاخێ زێباری
دێ بلندکە لفکا هێزاری
بەژنا تە دارێ دینداری
نارینکێ های سۆرو شینێ
دەلالێ های سۆرو شینێ

## «سەر شویا زاڤای»

ئێڤاریڤە دێ کارێ سەر شۆشتنا زاڤای کەن ل پێش دا دێ کەپرەکێ ل هنداڤ سەر شویێ چێکەن وئاڤێ دیزەکێ دا گەرم کەن بئاگرێ دارا . . ڤێجا دگەل چێکرنا کەپرێ ڤێ سترانێ دبێژن دگەل دەست قوتانێ و تلیلیا: -

کەپرەکێ چێکەن ل دانگی مالا
هەلاشێ کەپرێ بەلگێت هەلالا
کورك زاڤایە ل ناڤ هەڤالا
کەپرەکێ چێکەن هنداڤی جویێ
هەلاشێ کەپرێ بەلگێت نیمویێ
کورك زاڤایە بەنە سەر شویێ

پاش دێ برێ کەڤن قەستا مال کەن، هەڤال وهوگرێن زاڤای و مرۆڤێت ژ بنە مالا وی پێش و پاش و رەخێت زاڤای دێ هێن و لەییزن هەتا دبەنە مالێ. ژ رێڤە دایکا زاڤای دێ چیتە سەری و پاشی خوشك و دوتمام و مەت و خالەت وکەس وکارێت وی دێ هێنە بەراهیێ و چنە سەری و ل پێشییێ لەییزن و گولاڤا لێ رەشینن.

ڤێجا دەهواتی دێ چنە دەواتێ و شاهیێ بگێرن . . هەتا نڤێژا (مەغرەب هەمی پێکڤە دێ چن شیڤێ خون و دەست هاڤێژنە ستران و لەییزینا هەتا درەنگی شەڤ . . ئەوێت بیانی دێ ڤەرەڤن و برازاڤا[15] دێ مینتە ل گەلێ زاڤای هەر رۆژا ڤەگوهازتنا بۆکێ و هەتا هەڤتیێ یا وی دبۆریت . . .

# گەشتی رەفیق حیلمی وقەڵەم

نووسینی: پرۆفیسۆر
دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ

**ئەو لێکۆڵینەوا نەی لەم راپۆرتەدا بڵاوکراونەتەوە لەو کۆرە فراوانەدا پێشکێش کران، کە دەزگەی رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لە (5و6)ی ئەیلولی 1985دا لە سلێمانی‌دا رێکی‌خستبوو بە بۆنەی تێپەربوونی (25) ساڵ بەسەر دواماڵ ئاوایی مامۆستا رەفیق حلمی نەمردا.**



**لە یەکێك لە یادکردنەوەکانیدا نووسیبووم:**

**«دایك دانیشی و کوری وای بێ. (دایکیش نسشتمانە) بۆ وەسفێك گەرام کە پربەپری ئەو بێت، لەو ووتە کلاسیکی‌یە زۆر بەکار هاتووەم باشتر نەدۆزی‌یەوە.**

**بەڵێ ،دایك دانیشێ و کوری وای‌بێ، پیاوێك کە بە دەگمەن پیاوی وادەبەخشرێ».**

**پاش ئەوە هەر لەوێدا نووسراوە:**

**.. بە مامۆستاو سیاسی دەستی پێکردو هەر دوو ئەرك، یا هەر دوو کاری دەست رەنگینانە تێکەڵ کرد. لەمەیدا لە زۆر کەسی هاو رۆژ و هاو تەمەنی خۆی دەچوو، بەڵام کەسیان هێندەی ئەو دەست رەنگین نەبون، هێندەی ئەو دیارو بە دیمەن نەبوون.**

**ـ پاش ئەمە باس لە مامۆستایی و دەرس ووتنەوەو سوود نووسین و کتێب بۆ قوتابیان دانان و تێکەڵ کردنی ئەم ئەرکانە کراوە.**

**باس لە خەباتی سیاسی رەفیق حیلمی کراوە، کە لە رۆژانی شێخ مەحموودی حەفیدا جێگەی خۆی هەبوە، رابەرو رۆژنامەنووس و سکرتێری تایبەتی‌ی شێخی حوکمران و نوێنەری تایبەتی‌ی ئەو ویزەوتنەوەی نەتەوەکەی بوو، لە هەموو ئەمانەشدا نموونەی دڵسۆزی خوێن گەرمی‌ی لاوە بیررووناکە خوێن گەرمەکانی سەردەمی خۆی‌بوو.**

**ـ پاش ئەمەش باس لە رەفیق حیلمی‌ی رێکخەرو تێکۆشەرو سەرۆکی باڵای حیزبی هیوا کراوە.**

**ـ دووایی باسێکی بە ئینساف لە دوو ساڵی پر لە شکۆی**

ژیان و چالاکیی پیرانەو دڵسوزانەی کۆتایی ژیانی ڕەفیق حیلمی کراوە. کە ساڵانی پاش تەمموزی پێ دەڵێین و ڕەفیق حیلمی لەو دوو ساڵەدا ئەستێرەیەکی دیاری کورد بوو بە ئاسمانی عیراقەوە. کە دەیویست ئەو شۆڕشی چواردەی تەمووزە وابروات کە مافی کورد بچەسپێ و ئاسوودەیی بە خەڵکی عیراق ببەخشێ و زۆر دڵسۆزانە لەو مەیدانەدا هەوڵی خۆیی دا.[1]

ئەمانە هەموو لەلایەك. بەڵام لای من لە هەموو ئەمانە گەورەتر ڕەفیق حیلمیی ئینسان بوو، ڕەفیق حیلمیی مامۆستای کۆڕی ژیان و تێکۆشان بوو. دەمویست دەرفەتی ئەمرۆم بۆ ئەوە بێت کە کۆمەڵێك یادگار لەو بارەیەوە بگێڕمەوە، بەڵام ڕێکخەرانی ئەم کۆڕانە ئەرکێکی تریان پێ سپاردم، لەبەر ئەوە دیمەوە سەر ئەو باسەو قسەش هەڵدەگرم بۆ هەوڵ و کۆششا مەردانە بۆ قەومەکەی تێکۆشاو تا مەرگ نە کۆڵی داو نە قەڵەمی دانا.

سەرناوی ئەم باسەم وا بۆ دانراوە کە باس لە لایەنی نووسینی ئەدەبی و ڕەخنەیی ڕەفیق حیلمی بکەم. هەرچەندە ئەو لایەنەش گەورەیەو بۆ ئەوەی فراوانتر سەیری ئەم لایەنانەی ڕەفیق حیلمی بکەین، با باسەکە ناو بنێین (ڕەفیق حیلمی و قەڵەم) و ئەوسا لەسەر ئەو کەرتەی باسەکەمان بوەستین.

مامۆستا خۆی لە چەند شوێندا چیرۆکی خۆی و قەڵەمەکان، بۆ دەگێڕێتەوە. ئەوەتا لە سەرەتای دیوانی «پاش تەمووزەدا دەنووسێ.

لە تەمەنی پانزە ساڵیدا، کە هێشتا لە قوتابخانەی ناوەندی دەمخوێند، دەسم دابووە شیعر ووتن. بەڵام ئەوساکە خوێندن لە وڵاتەکەمانا، وە لە هەموو عیراقدا بە (تورکی) بوو، بۆیە منیش بە تورکی شیعرم دەهۆنییەوە.

چونکە دەبێ ڕاست بڕۆین، کە هێشتا بیری نیشتمان و میللەت لەوێ بمێنێ، تەنانەت باسی هەرچی شتێك کە ببێتە هۆی ڕووناکی مێشکمان لەم لایەنەوە، ڕێی بە بیری ئێمەدا هاتنی نەزانی بوو نەی دۆزی بوّوە.

ئنجا دیارە کە ئەو شیعرانەی دەوری منالیم بریتی بوو لە لاسایی کردنەوەیێکی ئەو شاعیرە تورکانە کە لەو سەردەمەدا ناوێکیان هەبوو، وە لە گۆڤارو نامیلکەکانی ئەو ڕۆژانەدا بەرچاومان دەکەوت و دەمانخوێندەوە. نەك من، وە ئەوانەی کە ئەو ڕۆژە لە تەمەنی منا بوون. تەنانەت شاعیری بەرزو ناوداری کورد، عورفی بەگی (دیاربەکر)ی[1] کە یەکێ بوو لە نیشتمانپەروەرەکانی کورد، وە خلووصیی بتلیسی، (مەودەعی عەمووەمی)، یەکێ لە کوردە ناودارەکانی بتلیس، هەر بە تورکی دەیاننووسی و شیعری دادەنا.[2]

پاش ئەمە ڕەفیق حیلمی دێتە سەر باسی ڕۆژنامەو گۆڤارە تورکییەکانی ئەو سەردەمەی کەرکووك باسی (حوادث) دەکات و کە دێتە سەر باسی (تجدد) دەڵێ:

«ڕۆژانی دوایی شەڕی یەکەمی گیتی بوو، بە هۆی کۆشش و تەقەلای خوالێخۆش بوو عورفی بەگەوە، هەر لە کەرکووك گۆڤاری (تجدد)ی نیومانگیش هاتەدەرچوون، لەو گۆڤارەدا کە دیسانەوە بە تورکی دەردەچوو، وە زۆر کەم دەوام بوو، عورفی بەگ بیری کوردایەتیی دەردەخست، منیش چەند شیعرێکم تیابلاوکردەوە.

پاشان ڕەفیق حیلمی لاپەڕەیێکی تر لە چیرۆکی خۆی و نیشتمانپەروەری و خۆی و قەڵەم دەگێڕێتەوەو دەنووسێ:

«... بەڵام کە لە ئەستەموڵ بووم، بە هۆی (نجم الدین حسینی)ی برای مامۆستا (ئەثیری)ی کەرکووك و بوێژی نیشتمانپەروەری کورد، لە قوتابییە کوردەکانی خوێن گەرم و کورددۆست نزیك کەوتبوومەوە، وە چووبوومە ڕیزی ئەوانەوە. کە لە کۆمەڵەی قوتابیانی (هێڤی) یا ئیشیان دەکرد. لەوێدا بۆم دەرکەوت کە ئێمە بە تەواوی لە کاروان دوواکەوتووین، وە پێویستی سەرفشانمان نەهاتووە بە بیرا لێرەدا ماوەی باس لەوە زیاتر نییە، تەنیا ئەوەندە دەڵێم: کە لەو ڕۆژە بە دوواوە، تێ توانیم و بۆم کرا، وەکو کوردێکی ڕاست و خۆناس و بە شەرەف جووڵامەوە. بەڵام تا ماوەیێکی ترو لەبەر ئەوە کە شارەزا بە نووسینی کوردی نەبووین، وەیا پێی ڕانەهاتبووین، جگە لەمانەش بە تایبەتی، لەبەر ئەوە کە لەو دەمەدا، هۆی

بلاوکـردنـەوەی نووسـینی کوردی نەبـوو، وەیـا بە دەگمـەن هەڵدەکەوت. چ من و چ خوێنەرە کوردەکانی تری ئەو ڕۆژە هەر بە تورکـی لەسـەر نووسـین و شیعـر ووتنـەوە ڕۆیشتین، بەڵێ شیعرەکان بە تورکی بوون، بەڵام من بەش بە حاڵی خۆم قسە دەکەم، ئەو شیعرانەی کە بە تورکی دام دەنا هەمووی بۆ کورد بوو، وەیا فەریادی کوردستانی تیادەبیسترا[3].

مامۆستا لە چەند شوێنێ‌تردا دێتەوە سەر باسی ئەم لاپەڕەیەی ژیانی‌و باس لەو بەرهەمە تورکی‌یانەی خۆی دەکات و بە زادەی ڕەسـەن و شـەرعـیـی خۆی‌و گەلـی کوردیـان دەزانـێ، با بە زمانی‌تریش نووسرابن.

ئەم لاپەڕەیەی ژیانی ڕەفیق حیلمی‌و ئەم چیرۆکەی نێوان ئەو و قەڵەم، هەر چیرۆکی ئەو نی‌یە ئەوەتا دەفەرموێ:

«چ من و چ خوێنەرە کوردەکانی‌تری ئەم ڕۆژە هەر بە تورکی لەسەر نووسین و شیعر ووتنەوە ڕۆیشتین».

بەڵێ: بۆ زۆر لە بیرڕووناك و خوێندەوارەکانی سەردەمی ئەو ئەمە وابوو.

. . . موڵکی بابان کەوتبووە چنگی ڕۆم. نالی بە ئاوارەیی سەری نایـەوە، سالـم هەر بە دەردی میـحـنـەتـی شارو غەریبی‌مـرد». لە شوێن مەشخـەڵی شیعـری بابـان و دەرسی کوردیی شێخی نۆدێ. حاجی قادر ووتـەنی هەر کاك ئەحمـەد مابوو بە کوردی دەرسی شەرعی دەووتەوە.[4]

لە نەمانی میرنشینی بابانەوە تا حوکمرانی‌ی شێخ مەحموودی حەفیـد نەخشـەی ووشـەی کوردی بەو چەشنە بوو. کە هەر تروسکـەیێـك لە مزگـەوتـا مابـوو. مەحـوی‌و شێخ ڕەزاو خاکی‌و موخلیس و هەندێکی‌تر دەیانویست مەشخەڵەکەی نالی‌و سالم و کوردی نەکـوژێـتـەوە. بەڵام لە لایـێـکی ترەوە «ڕوشـدیـەی عەسکـەری» لاوانی لە مزگـەوت دادەبـڕی‌و بەرەو ئەستـەمـوڵی دەبردن و دەیویست هێزی مێشك و بازوویان بۆ خزمەتی سوپای عوسمـانی بەکـاربێنێ. ئەوە بوو لەوێ دەبـوون بە ئەفـسـەر کە دەستیـان دەدایـە قەڵـەم بە تورکی دەینـانـووسی، ئەگـەر بۆ کوردیـشیـان بنـووسـیـایـە ئەوا ڕەفیق حیلمی لە هەمـوان ڕاستگۆیانەتر ووتی:

«بەڵێ شیعرەکان بە تورکی بوون، بەڵام من بەش بە حاڵی خۆم قسە دەکەم، ئەو شیعرانەی کە بە تورکی دام دەنا هەمووی بۆ کورد بوو، وەیا فەریادی کوردستانی تیادەبیسترا لێرە لای مەلا شاعیـرو خوێنـدەوارەکـانمـان هاوکێشێك لە نێوان بە کوردی‌و بە زمانی‌تر نووسین هەبوو، بەڵام زۆر بە قورسی بە لای کوردیدا دادەشکـا: بەڵام لە ئەستـەمـوڵ لەگـەڵ هەڵهـاتنی گزنگی ڕۆژنامەی «کوردستان» دەرچوونی کۆمەڵی گۆڤاری وەك» ڕۆژی کورد» و «ژین»دا دیسان هاوکێشێك لە نێوان بە تورکی‌و کوردی نووسیندا هەبوو و زۆرتر فەریادی کوردستانە کە بە تورکی دەبیسترا.

ئەم هاوکێشـە لە بەرهـەمی زۆربـەی شاعیـرو نووسەرانی ئەو سەردەمەدا دەبینرێ‌و لای هەر یەکەیان بە جۆریکە.[5]

ڕۆژگار زۆرنا خاێنێ، جەنگی یەکەمی جیهان بەرپا بوو، ئەو دەوڵەتە مەزنەی پێی‌دەووترا «پیاوی نەخۆش، یا زەلامی نەخۆش» وەك لاك لەبەر دەستی دوژمنانیا کەوت و ئەو خاکەی لە خەڵکی داگیـرکـردبـوو سەرلـەنـوێ لە نێـوان ئەواندا دابەش کرا. خاکی کوردیش بەشی ئەوە بوو کە دەیزانین.

بەڵام لە نێـوان دابـەشکـردنـەوەو جەنگـدا چەنـد ساڵێکی هەژاندن و ڕاپەڕین هەیە. کە لە مێژووی کورددا ڕەفیق حیلمی خۆی لە «یـادداشت»ە بە نرخـەکـانیـدا سەرنـاوی «کـوردستانی عیراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود»ی بۆ هەڵبژاردووە.

تاك تاك و پۆل پۆل ئەو خوێنـدەوارانـە لە ئەستـەمـوڵـەوە دەهاتنەوەو هەر یەکە بە چەشنێك قۆڵی لێ‌هەڵدەکرد.

ئەگەر ژیان و چالاکیی ئەو سەردەمەی ڕەفیق حیلمی شتێکی گەورەو دیار بێ‌و سەرەتای دانەمرکاندنەوەی تا مردنی بێ. ئەوا ڕووکردنە قەڵەم و مەیدانی بیر ڕووناکیشی هەر شتێکی دیارەو لەو سەردەمەوە، قەڵەمی لە مەرەکەبی کوردی نووسین هەڵکێشاو تا مردن قەڵەمی دانەنا.

لە سەرەتـاوە وەك زۆربـەی خاوەن قەڵـەمـەکانی وولاتی ئێمە خۆی لەگەڵ شیعردا تاقی‌کردەوە.

خۆی لەم بارەیەوە بۆی گێراینەوەو نووسی:

«خۆم کە مەیلی شیعر دانانم هەبوو، دیارە وەکو لاوەکانی ئەو

دەورە منیش لاسـایی شاعیرەکانی پێشووم دەکردەوە. لەبەر ئەوەش کە خوێندنم بە تورکی بوو لە پێشەوە بەم زمانـە دەمنووسی و شیعرم دادەنا. دووایی کە دەسم کرد بەنووسین و شیعر دانان بە کوردی، مامۆستا (زێوەر) وەیا (شێخ مستەفای شێخ سەلام) کە ئێستە لە سلیمانی گۆشەنشینی مزگەوتەکەی خۆیەتی[6] هەر کەم و کورتی‌یێکی هەبووایە بۆیان ڕاست دەکردمەوە. جارێکیان غەزەلێکی غەرامی کوردیم ناردبووە خزمەت مامۆستا (زێوەر). بەڕاستی خۆم سەرم سوڕ دەمێنێ کە چۆن لە رووم هاتووەو ئەو شیعرانەم ناردووە بۆ مامۆستایێکی خۆم. جێیّ ئەوە نی‌یە کە ئێستە غەزەلەکە هەمووی لێرەدا بنووسم. بەڵام تەنیا بەیتێکی دەخەمە بەر چاوتان. لەمەش مەبەسم ئەوەیە کە بەرامبەر ئەم کردەوە منالانـەیەی خۆم (سروشتی ئەدەبی‌ی مامۆستا زێوەرو ئوسلووبی ڕێ‌پیشاندانی بە قوتابیانی خۆی لە خوێنەرە بەڕێزەکان بگەیێنم.

ئەمە ئەو (بەیت)ەیە کە لە غەزەلەکەی خۆم وەرگرتووە.

**بۆ سوراحی گەردنی رۆحم بە (عەین)ی بوو بە ئاو**

**ئێستەکەش ناچم بە دڵیا داوەمە ئازاری(. . . .)[7]**

ئینجا مامۆستا (زێوەر) بەچەند شعرێك وەرامم دەداتەوە کەلەسەر (وەزن) و(قافیە)ی غەزەلەکەی خۆمەو ئەم دوو (بەیت)ەی خوارەوە لەو شیعرانەی مامۆستاوە

ـ بە ووشەیێکی ڕاستتر ـ لەو دەرسە بەلیغەیەتی کە تا ئیمرۆ و بەڵکو دەتوانم بڵێم کە تا بمێنم لە بیرم ناچێتەوە!. .

**ئەی رەفیقی موحتەرەم ئەی شاعیری شیرین مەقال!**

**هاتە بەرمەددی نەزەر فیکرت وەکو ئاوی زولاڵ**

**من ئومێدی گەورە گەورەم پێتە بۆ ئەم میللەتە**

**حەیفە سەرفی فکری خۆت کەی تۆ لە زوڵف و خەت و خاڵ**

وا دەزانـم کە پێی ناوی بڵێم ئیتر لەو ڕۆژەوە بیرم لەوە نەکردۆتەوە کە شیعری غەرامی دابنێم. وە یەك دوو جار کە بە بۆنەیێکی ناچاری لەم بابەتەوە شتێکم ووتبێ هەوڵی ئەوەم داوە کە شیعر بێ نەك غەرامیاتی منالانەو شەیدایانە»[8]

بەڵێ ئەو رەفیق حیلمی‌یەی بەم هەموو تەوازوعەوە لاپەڕەیێکی تری چیرۆکی خۆیو قەڵەمی بۆ گێراینەوە.

دەستی دایە کاری گەورە گەورە بۆ ئەم میللەتە، چووە مەیدانی گەورە گەورەوەو گەلێك کاری گەورەی کرد، بەڵام کە ڕۆژگار بۆ کەسێك یا بۆ میللەتێکی ناهێنێ ئەوا ئەو کارە گەورانەش کە بەریان نەگرتووە وەك خۆیان گەورە نانوێنن:

**ما كل مايتمنى المرء يدركه**

**تجري الرياح بما لاتشتهي السُفُنُ**

مەیدانی شیعری چۆڵ نەکرد، بەڵام لەو مەیدانەدا نەبوو بەو کەسەی کە خۆی یا ئێمە دەمانەوێ (ئەمەش جارێکی‌تر باس دەکەینەوە)

لەگەڵ قەڵەمدا سەرەتا ڕێبازەکەی (زیوەر)ی مامۆستای گرت. مامۆستایی‌و دەرس ووتنەوەو بەهرەی نووسینی تێکەڵ کرد. بەمەش یەکەم بەشی هەوڵی دابەشکردنی مەیدانی نووسینی خۆیی داینێ:

1 ـ رەفیق حیلمی‌و کتێبی قوتابخانە:

مامۆستا لەو ڕابەرانەیە کە لە سەرەتای کوردی خوێندنی قوتابخانەوە هەوڵی ئەوەیان دا منداڵی کورد بێ کتێب نەبێ. ئیتر چ بە دانان و چ بە وەرگێڕان، زۆرتر بە ئەرکی خۆیان کتێبی قوتابخانەیان بۆ قوتابیان ئامادە دەکرد.

بەشداریی رەفیق حیلمی لەم مەیدانەدا وەرگێڕانی کتێبێکی جوغرافیاو دانانی کتێبی «علمی ژمارە»یە.

ئەمە بێجگە لەوەی کە کۆششێکی ڕابەرانەیە بە دوو ووشە لاوەستانی دەوێت ـ ئەویش ئەوەیە کە بڵێین:

کە زیوەرو رەفیق حیلمی‌و عەبدولواحید نووری لەم مەیدانەدا ڕابەربن. خۆزگە لە تەجروبەی دانان و وەرگێڕانی کتێبی قوتابخانەدا هەر لەوێوە دەستمان پێدەکرت. بێگومان ئەم تەجروبەیەمان تا ئێستا گەلێك کەم وکووڕیی پێوەدیارەو گەلێك کەلێنی تێدایە. بەڵام دیسان خۆزگە لە ڕووی ساکاریو دارشتنی کوردیو هەندێ ئیستیلاحەوە ئەوانەی کتێبی قوتابخانە دادەنێن یا وەریدەگێڕن چاوێکیان بەو سەرچاوانەدا دەخشاندەوە.

دەبێ چ زیانێکی تێدابێ کە لەم کتێبەی رەفیق حیلمی‌یەوە

که ساڵی 1936 چاپکراوه.[9] داگیرۆ له جێی (محیط)و کاربرایەتی لە جێی (شرکت)و «سود یا سوو» له جێی «فائض» سوودی تێکەڵ له جێی «فائضی مرکب»و «دەسمایه» له جێی «رأسمال» و «کاربرا» له جێی «شریك» و «وریایی» له جێی «ملاحظه» و «وێنه» لەجێی «مثال» و تێکۆشین «له جێی» «تمرین»یا «راهێنان»و گەلێك ئیستیلاحیتر بەکاربهێنینەوە.

2 - رەفیق حیلمیو سروود:

هەروەك مامۆستایی زێوەری کرد بە رابەری دانانی سروودی کوردی، هەروەها مامۆستایی رەفیق حیلمیشی برده مەیدانی سروود دانانەوه ئەگەر تەجروبەی سروود دانان و ئاواز بۆ دانانی تەواو لەژێر کاری خوێندنەوەی «شەرقی»ی بەیانیانی «روشدیەی عەسکەری»دا سەری هەڵدابێ، ئەوا رەفیق حیلمی لە زۆر رووەوە بەتایبەتی لە رووی تورکی زانین و تازەگەرییەوە زۆر لێهاتوو بوو بۆ ئەوەی کۆمەڵی سروودی رەنگین لەناو کوری خوێن گەرمیی سەردەمی خۆیدا بە منداڵی کوردو بە لاوانی کورد ببەخشێت.

هەر لە رۆژانی شێخی نەمردا شیعری ئەو بوو منداڵانی فێر دەکرد کە بڵێن:

کوردین ئێمە زۆر بێپەروایین

بە شەرەگوللە ئاشناین[10] خۆی لە یادداشتا باسی سەردانی سمکۆی قارەمانی شوکاك دەگێڕێتەوە لە سلیمانیو لە شێخ مەحموودی سەرداری کوردو کە دێتە سەر باسی سروودی نیشتمانی دەنووسێ:

«... رۆژئاوا بوو بوو، کە لە «مصطفیٰ پاشا» کاغەزێکم وەرگرت. داوای ئەوەی لێدەکردم کە هەر بەو شەوە «گۆرانی»یێکی جوانی میللی رێك بخەم و فێری قوتابیەکانی بکەم بۆ ئەوە کە لە بەرەو پیریی (سمکۆ)دا بخوێنرێتەوە. دەزبەجێ چوومە (مەکتەبی ئەعدادی). شەو بوو بوو بە رۆژ. لەبەر ئەمە بەئاسانی قوتابیەکان کۆکرانەوە. تا ئەوان کۆبوونەوە منیش (گۆرانی)یێکم ئامادە کرد. تا نیوەشەو لەگەڵ دەستەی قوتابیی گۆرانی خەریکبووم و هەموو شتێ جێبەجێ کرا. قوتابیەکان لە خۆشییا، نەیانئەزانی چی بکەن؟ پێیان عەرزی نە دەگرت. بە تەما نەبوون ئەو شەوە سەرخەوێ بشکێنن. بۆ ئەوە چوونە ماڵەوە کە بۆ سبەینێ خۆیان کۆبکەنەوە. ئەو سبەینێیە کە[11] جەژنی کورد بوو و دەچوون بە پیر پاڵەوانی کوردستانەوە..

3 - بەرهەمە سیاسییەکانی رەفیق حیلمیو لایەنی ئەدەبی:

کە جیهانی تێکۆشان و سیاسەت ماوەیێکی درێژ رەفیق حیلمیی لە کۆڕی ئەدەبیات دوورخستەوە، هەمیشە لەو کۆڕەشدا ئەوەی لەبیر نەدەچۆوە کە ئەو خاوەن قەڵەمەو پێوەندیی بە تین و نەبراوی لەگەڵ خامەیێکی بە پیتدا هەیە.

کۆمەڵی نامیلکەو بەرهەمی سیاسی بە کوردیو عەرەبیو تورکی نووسی. بەئاشکرا بیری سیاسیو کۆمەڵایەتیی خۆیی تێدا دەردەبرین. بەڵام لە هەموو ئەو بەرهەمانەدا پێوەندیی رەفیق حیلمی لەگەڵ بنجە ئەدەبییەکەی خۆیدا نەبڕراوە. زۆربەی ئەو بەرهەمانە بەرهەمی رابەرو خاوەن بیریکی سیاسین، بەڵام بە شێوەو بە قەڵەمی نووسەرێکی لێهاتوو نووسراون.

با هەر بۆ نموونەی ئەم مەبەستەش لەگەڵ رەفیق حیلمیدا بکەوینەوە بیستنی باسی پێش وازییەکەی «سمکۆ» کە نووسیبووی:

بەیانیی ئەو شەوە، پێش هەتاو کەوتن ئەهالی شاری سلیمانی ووردو درشت، بە پیاو و ژنەوە رژابوونە کۆڵانەکان. قوتابیانی مەکتەبەکان، لەو کۆڵانەدا کە دەچوو بۆ ماڵی «شیخ مستەفا» (کۆڵانەکەی ماڵی شێخ قادری حەفید)، لەگەڵ عەسکەرو پۆلیس بەرامبەر بە یەك ریزیان بەستبوو،[12] ..........)

ئەم شریتی سینەمایەی رەفیق حیلمی بە قەڵەمی مێژوو نووسێکی ئەدیب بۆی نەخشە کێشاین گەلێك لاوەستان و گەلێك لێکۆڵینەوەی زۆر لایەنی هەڵدەگرێ. کە باسیشمان لێرەدا هەر لە سووچی نووسەریو چیرۆکی «رەفیق حیلمیو قەڵەمەوەیە» دەبێ هەر ئەوەندە بڵێین، کە مامۆستا چ لە یادداشتداو چ لەو نووسینە مێژووییانەدا کە خۆی بە یەکێ لەو سێ زمانە نووسیوێتیو چ ئەوانەی وەریگێڕاون لە تورکیو فەرەنسییەوە، لە هەموو ئەمانەدا بەسەر وشەدا زاڵە بە سفت و - ساکاری مانای

قووڵ و بیری وورد دەردەبڕێ. سیفەتی نووسەرێکی لێهاتوو لە هەموو بەرهەمەکانیدا دەدرەوشێتەوە.

**4 - ڕەفیق حیلمیو شیعر:**

وەك وتمـــان، ڕەفیق حیلمی وەك هەمـــوو دڵســـۆزانی بیـرو قەڵـەمی هاوچـەرخ و هاوتـەمـەنی خۆی بە شیعر دەستی پێکرد. ئەگــەر لە کۆڕەکـــانیتـری خەبـات و ژیـان و چالاکیی خۆیـدا لووتکەیێکی گرتبێو وەك سەرئامەدو کەڵە پیاو دیاربێ. ئەوا ئەم دیمەنە بە شیعرەکانییەوە دیار نییە. بەڵێ - وەك خۆی دەڵێ شیعـرەکـانی پەڕاگـەنـدە بوون و هەمـوویـان کۆنەکرانەوەو چاپ نەکـران تا بریـارێکی ڕێـك و تەواویـان بەسەردا بدرێت. بەڵام ئەوەش ئاشکرایە کەوا شیعرەکانی وەك بەرهەمەکانیتری ڕیزی پێشـــەوەی شیعـری کوردییـان نەگـرتـووە، ئەگینـا وا مات و لە بیرەوەچوو نەدەبوون. بە هەموو باریکیشدا هەر بەرهەمی ئەون و شایانی بایەخ پێدانن. ڕەنگە ئەگەر ناوی پیاوێکی مەزنی وەك ڕەفیق حیلمییان پێوە نەبووایە، بایەخی زیاتریان بدرایەتی، یا ئەگـەر بەرهـەمی کەسێکیوا بوونـایـە کە سەرمـایەی لە مەیدانی کۆششاو نووسینا هەر ئەوە بووایە، ئەوا ئەو شیعرانە بەس بوون بۆ ئەوەی خاوەنەکەیان ببەنە مەجلیسی شاعیرانەوەو ناویلە لاپەڕەی مێژووی ئەدەبا تۆمار بکەن.

ڕەفیق حیلمی سەرەتا وەك ئەو ڕیزە شاعیرە ڕۆمانتیکە دەستی پێکردووە، کە بە هێزی ڕەخنەو توانج ویستوویانە پاڵ بە نەتەوەوە بنێن بەرەو سەرکەوتن و پێشکەوتن ووتوویەتی:

**هیمەتی ئەربابی عیرفان بێستوون ئیمما ئەکا**
**ئەو کەسەی دڵسوزی میللەت بێ وەتەن ئاوا ئەکا**
**نووری عیلم و مەعریفەت وا شەرق و غەربی گرتەوە**
**قەومی ئێمە تازە تەعلیمی خەت و ئیملا ئەکا**(13)

تاقە کۆمەڵە شیعرێکی کۆکراوەی ڕەفیق حیلمی ئەو پارچانەیە کە لە نامیلکـەی «پـاش تەمـووز»دا کۆکـراونـەتەوە. ئەم کۆمەڵە شیعـرە، لە ڕەگـەزو پێکهێنـەرەکـانی شیعـر، زۆرتر بیرو کێش و قافیـەیـان پێـوە دیارەو پێویستیان بە وێنەو سۆزی شاعیرانەیە.

هەر وەك ڕەفیق حیلمی ویستبێتی ڕاست و ڕەوان لە ڕێگەی بەرز کردنـەوەی چەنـد دروشمێکـەوە بیـرو هەڵویستی سیاسیی پاش تەمـووز، خۆیمـان تێبگـەیـنێ. بە ڕاستی ئەو شیعـرانــە مانەفێستۆی بیری ئەو سەردەمەی ڕەفیق حیلمین.

ئەو کەڵە پیاوەی ماوەی چل ساڵێك خۆی بە ناحەزو دوژمنی پاشایەتی دەزانی گەیشتە لووتکەی خەباتی نەتەوەیی کورد. کە لە پڕێکا ڕوخاندنی ئەو ڕژیمە دەبینێو هیوای گەیشتنە ئامانجی لە سایــەی شۆڕشی چواردەی تەمـووزدا دەگـەشێتـەوە. لە ڕێی هەژانـدنـە کۆنـەکەی جیهانی شیعرەوە دەست دەداتەوە کەرەسەو قەڵــەم و هەڵــویستی خۆی لە کۆڕی پاراستنی جمهـوریـەت و هەموو ئاواتەکانی گەلدا دەردەخا:

**مژدە: مژدەی چی؟ مژدەی ڕزگاری**
**ڕزگاری کێ؟ گەل! لە کێ؟ زۆرداری**
**لە چنگە زۆرداریو جەوری کاربەدەست**
**کاربەدەستانی بێگانە پەرەست**
**بەڵام وا شوکور حوکمی کۆنی پیس**
**لە چواردەی تەمووز درایە بەر لیس**
**(قەسری ڕەحاب)یش ڕووخا ئازانە**
**خرایە ژێر پێ تەرمی شاهانە**(14)

شاعیــر بە چاوی خۆی ڕوخـانی زەبـرو زەنـگ و دەســەڵاتی چەند ساڵە دەبینیو هاوار دەکا:

**زۆر کەس ئەیانووت (نووری) هەیەو بەس**
**بلیمەتێکە بێ وێنەو مانەند**
**کەچی زۆر سەیرە تا ئیمڕۆ هیچ کەس**
**وەکو بەویان کرد نەکراوە بە پەند**
**نە کۆشکی ئاسن، نە (حیلف)ی بەغدا**
**نە تۆپ و چەکی پۆڵای ئەمریکا**
**بە کەڵکی نەهات ئەو ساتەی کەوا**

(سندان)ی خوایی لەبن دەسی دا[15]

ە قەسیدەی «بۆ گیانی پاکی شێخ مەحموودی نەمر»دا کە
ێشکەش کراوە «بۆ کاکە کامەرانی شاعیر»، سۆزی شاعیرانە
ەرزەبێتەوەو رەفیق حیلمی چەند نیشانێك بەتیری قەسیدەیێك
ەپێکێ.

1 ـ سۆزی دڵی بەرامبەر بە مەرگی شێخ مەحموودی نەمر
ەردەبرێ.

2 ـ بیرو باوەری بەتینی بەرامبەر بە سەرکەوتنی گەل
ەردەخا.

3 ـ رەفیق حیلمیی رێبەرو نووسەر و رەخنەگری کۆن بیری
خۆی بەرامبەر بە کامەرانی شاعیر لاوی ئەوسا بەرامبەر بەو شینە
بە سۆزەی دەردەبرێ کە بۆ شێخی نەمری کردووە:

کە وا بوو ئەم شینەت لەچی
نەکەی تۆ، بە هەڵە نەچی
شێخ مەحموود ئەو بێتوو بمرێ
توڵەی کوردان چۆن ئەسەنرێ
کامەرانی ژیرو ووریا
بوێژی بێترس و ریا
پێنووسی وا بەدەستەوە
مردوو زیندوو ئەکاتەوە[16]

رەفیق حیلمی دەیەوێ بە هۆنراوەوە بچێتە مەیدانی فەلسەفەو
بە قەسیدەی (عەقل تیاکولە) وەڵامی پرسیارە ئەزەلییە کەی
هەمـوو فەیلەسـووفـان بداتەوە دەربارەی (کەون) بەڵام دوواییش
هەر لە نێوان دوو هێڵە سەرەکییەکەی بیری فەلسەفیدا
دەوەستێ و وەڵام ناداتەوە.

من ئەوەم لاسەیرە کە عەقلەکەین بە حەکەم
بۆ شتێ کەتێینەگەین، نە زۆرو نەکەم
عەقڵی من، کە ئەڵێم جوزئێکم لەم (کەون)ە
چۆن لە (کلّ) تێئەگا؟ کە (کول) بێ بەم لەونە؟[17]

لە کۆمەڵەی «پاش تەمووز»دا رەفیق حیلمی پارچەی (چۆن
ئەڵێی کوردم)ی بڵاوکردۆتەوە. لە پەراوێزدا نووسیوویەتی:

(ئەم شیعرانە کە لە 6ی تەمووزی 1958 واتا چەن رۆژێك
لەپێش شۆرشدا دانراوە. بەڵگەییێك بۆ ئەوە کە کورد، لەگەڵ برا
عەرەبە کانیانا بەرامبەر بە ئیستیعمارو نۆکەرەکانی پیکەو تیکوشانو
بەربەرەکانی حوکمی بوگەنی پێشوویان دەکرد)[18]

ئەم پەراوێزەو قەسیدەکە خۆشی چەند بەندمان لە بیری
کوردایەتی و نیشتمانپەروەری و پێشکەوتنخوازیی رەفیق حیلمی
پێدەبەخشن. ئەوەمان تێدەگەیێنن کە ئەو مەردەی ساڵەهای
ساڵ لە گەڵێك مەیداندا رابەری لاوان و خوێندەواران و بەشێکی
گەورەی بزووتنەوەی نیشتمانپەروەریی و نەتەوەیی کوردبوو. زۆر بە
بیریکی فراوانەوە تەماشای شوێن و جێگەی کوردی کردووە لەناو
کاروانی گەلاندا،

بێچووە شێری کوردا! بەسیەتی نووستن
راپەرەو بگرمێنە، با هەموو هەستن
رۆژ لە ئاسۆوە دەرکەوت شەوەزەنگە
بێشەی بەجێهێشت، کەوتینە درەنگە[19]

یەك بە دووای یەکدا وێنەی دووارۆژ لەبیری رەفیق حیلمیدا
دێتە ناودێری ئەم قەسیدەیەوە، کە بە ناچاری دەست لە هەندێ
دێر هەڵئەگرین، با بە مەبەسی کورتکردنەوەش بێت ئەوا هەر بە
ناچاریش دیینەوە سەر دێرەکانی خۆی:

بەخور دێتە خوار، تاڤگەی ئاوی زیو ئەرژێتەوە ناو دۆڵی
کپ وشیو
خاکی پیرۆزی کوردستانی جوان
ئەبووژێتەوە بە (دیجلە)و (سیروان)
بە فراوی کانگەی کێوان ئەنوشێ
بەرەیحانەو «گوڵ» رووی خۆی ئەپۆشێ
گوڵاڵە سوورەی قەد بەرزو پژاو
کرنووش ئەباتە بەر خوێنی رژاو
دوور نییە رۆژێ کە کوردو عەرەب

**بۆ جمهووریەت لەپ بدەن لە لەپ**

**درەختی شاهی ببڕێتەوە**

**ناوی ئیستیعمار بسڕێتەوە**

**دوو گەلی برا، ئالآی ڕزگاری**

**هەڵکەن، برووخێ حوکمی زۆرداری**

**ئەمە ئامانجی منە تا ماوم**

**دوژمن خۆی ناوی (کورد)ی لێناوم**[12]

بەڵێ: ڕەفیق حیلمیی کورد هەر لەو ڕۆژانـەدا لاوانـە قۆڵی لێ‌هـەڵکـردو زۆر هوشیـارانـەش دەیـزانی کەپێکـەوە خەبـات و برایـەتی بریتی‌یـە لە چوون یەکی‌و هاوسـانی لە ئەرك و لە مافی گشتیدا یا بڵێین لە (حقوق و واجبیات،)دا. کە بڵاوکردنەوەی ئەم کۆمەڵە شیعرەی بە بەشێك لە خزمەتی نیشتمانی دەزانی زۆر باش بیرو بناغەی خزمەتی نیشتمان لە هۆنراوەی (داری ناکۆکی لەبندا هەڵکەنن)دا دەردەخات.

**کاری کوردان چۆن ئەچێتە سەر هەتاکو سەرنەبێ؟**

**دوومەلی ناکۆکی کاری خۆی ئەکا تا دەرنەبێ**

**ئەو کەسەی یەکخستنی گەل بێ بناغەی باوەڕی**

**دیارە ئەیزانێ کە ئاغا نابێ تا نۆکەر نەبێ**

**ئیمرۆ ڕۆژی هەوڵ و تێکۆشانە نابێ بسرەوین**

**سەختە ڕزگاری لە دوژمن، لاوی گەل پەروەر نەبێ**[22]

کە ڕۆژگـار ڕۆژ ی ئەو سەردەمـە نەحسـەی پاشـایەتی بوو کە ڕەفیق حیلمی لە ناخی دڵەوە دوژمنی بوو ڕێگەی خەباتی باش دەست نیشان دەکردو دەیووت:

**کەڵکی ڕاستی ناگرێ تەنیا ووشەو شیعرو ئەدەب**

**تا چەکی (ئیمانی میللی)و دەستی سەر خەنجەر نەبێ**

پاشـان بە تەجـروبـەی پیـرو خوێن گەرمیی لاوانـەوە ڕوو دەکاتەوە لاوان و دەفەرموێ:

**لاوەکانی خۆشەویستی قەومی کورد! سا ڕاپەڕن**

**کاتی تێکۆشان و هەوڵە با ئەمیش تێپەڕ نەبێ**

**(داری ناکۆکی لەبندا هەڵکەنن) تووری بدەن**

**ئێوە ئاوی ئەو درەختانە بدەن بێ‌بەر نەبێ**[23]

پاش چەند دێڕی‌تر ئەنجامی تەجروبەو ئامۆژگاریی خۆی بە لاوان دەبەخشێ‌و دەفەرموێ:

**تاکو لەتوانی خەریکی چاکە بەو کرداری باش**

**لاوی چەرخی بیستەمی تۆ، کردەوەت بێ‌فەڕ نەبێ**

**بێ‌هەوا، کەم دوو، لەسەرخۆ، ژیرو هێمن، گەل پەرست**

**ڕابەرت ویژدانی پاکت، دەنگی زیوو زەڕ نەبێ**[24]

ڕەفیق حیلمی بە دوو قەسیدەی‌تر دەربارەی شۆڕشی چواردەی تەمووز نەخشەی تەواوی بیری سیاسیی ئەو سەردەمەی خۆی‌و هاوبیـرەکـانیمـان دەداتی‌و ئەوسـا بە وەرگێـرانی پارچـە هۆنراوەی شاڕ ن لە فەرەنسی‌یـەوە بۆ کوردی کۆتـایی بەو کۆمـەڵـە شیعـرە دێنی‌و ئیمـەش دەخـاتـە سەر باسێکی‌تـری بەری تەڕو پاراوی قەڵەمە ڕنگینەکەی خۆی.

**5 ـ ڕەفیق حیلمی‌و وەرگێڕان:**

---

زۆر ووتـراوە.. وەرگـێـڕان هونـەرە.. زۆریش باس لە مەرجەکانی وەرگێڕانی باش کراوە.

چ لە ڕووی زانستی زمان و تێگەیشتنی ئەو کەرەسەیەوە کە وەردەگـێـڕرێ‌و توانـای سەر لەنـوێ بە پێـەوی دارشتنـەوەی کەرەسـەکـە. ئەگـەر بە ئینسـافەوە تەماشای وەرگێڕانەکانی ڕەفیق حیلمی بکەین، ئەوا بە نموونەی باشی وەرگێڕانیان دادەنێین و دەیـانکـەین بە کەرەسـەی لێکـۆڵینـەوەی وەرگێـڕانی باش. هیچ باوەڕیش ناکـەم کە محـەمـەد ئەمین زەکی بەگ لەو نامـەیەدا کە دەربارەی وەرگێڕانی «دراسه في الشعر الكردي» لە فەرەنسی‌یەوە بۆ عەرەبی بۆ ڕەفیق حیلمی‌ی نوسیـوە چووبێتـە ژێـر باری موجامەلەوە، ئەوسا ئەو بایەخە گەورەیەی بەتواناو بەهرەی وەرگیر دابێ. چونکـە زۆر مەوزووعیـانـە لە کتێبـەکـە دوواوەو هەنـدێ ڕەخنـەی لە نووسـەرەکـانی گرتـووە کە لوسی پول مارگـرێت و

گامەران عالی بەدرخانی، یا هەر لە ڕاستیدا ئەوی دووەمیانە ماموّستا: خولاسەی مەسەلەی کورد»ی لە فەرەنسی‌یەوە کردووە بە کوردی، هەروەك نامیلکەی کوّمەڵایەتیی لە تورکی‌یەوە کردووە بە کوردی‌و پاش چەندین ساڵ بەدەستکاری‌یەوە بە ناوی «مقالات»ەوە نامیلکەی «کورد مسئلەسی صفحاتندن»ی خوّیی لە تورکی‌یەوە کرد بە عەرەبی‌و وەك ووتمان کتێبی ناوبراویشی لە فەرەنسی‌یەوە کرد بە عەرەبی. هەروەك ڕوّمانێکی لە تورکی‌یەوە بەناوی (ڕوّستەم)ەوە کردووە بە کوردی‌و لە گوّڤاری. . «گەلاوێژ»یشدا بەرهەمی بە پیتی وەرگێرانی ماموّستا دیارە.

ئەم ناو و چالاکی‌یانە هەر لە بەردەمی تواناو لێهاتوویی وەرگێراندا دامانناین، بەڵکو هاوکێش یا (موعادەلە)یەکی تازەمان دەربارەی بوّچوونی ڕەفیق حیلمی‌و ڕێبازی ڕاستی ئەو لە بەکارهێنانی تواناو زانیندا پێ‌دەبەخش.

ئەویش ئەوەیە که بوّ گەلێکی وەك ئێمە که زمان زان و خاوەن تواناو تاقەت و بەهرەی وەرگێرانمان زوّر نی‌یە، دەبێ یا کورد یا زمانی کوردی هەمیشە بەشێك بن لە هاو کێشی وەرگێران. واتە یا وەرگێرانەکە لە زمانی‌ترەوە بێ بوّ کوردی، یا لە کوردی‌یەوە بێ بوّ زمانی‌ترو بە مەبەسی کورد بە خەڵك ناسین بێت. یا ئەگەر وەرگێرانەکە لە نێوان دوو زمانی ناکوردیشدا بێت، ئەوەش هەر بوّ کورد پێ‌ناسین و خزمەتی کورد بێت. چونکە گەلانی‌تر کادرو پسپوّری خوّیان هەیەو ئەو سوودە لە خاوەن بەهرەیێکی کورد نابینن، که کورد خوّی لێی‌دەبینێ‌و هەموو شتێك که لەم سنوورە دەرچوو، بەلای منەوەو هیوام وایە بە هەڵەش نەچووبووم ڕەنج بە خەساردانە. ئەمە ڕێبازی هوشیارانە لە وەرگێرانداو ڕەفیق حیلمیش لەم مەیدانەدا ڕابەرو پێشرەوە.

**6 ـ ڕەفیق حیلمی ڕەخنەگر:**

ڕەفیق حیلمی یەکەم ڕەخنەگری دیارو بەدیمەن و شوێن پەنجە ئاشکرای کوردە. تا ئەم ساڵانەی دوایی گومان لەوەدا نەبووە. ئەگەر ئێستا هەندێ دەنگ بە پیچەوانەی ئەم ڕاستی‌یەوە بەرزبێتەوە. ئەوەش وەك تاقمەرایەکی‌تر دەربارەی ئەدەبیاتی کوردی هەر لە نەشارەزایی‌و نابینایی بەرامبەر بە ڕاستی‌و قووڵ نەبوونەوەو بێ ئاگایی‌یەوە هاتووە. دیارە ڕێبازی سەرسەختانەی نیشتمانپەروەریی ڕەفیق حیلمیش بوّتە هوّی ئەوەی بێ‌سوود هەوڵی لە پایە کەم کردنەوەی بدرێت.

دوو بەرگی شیعرو ئەدەبیاتی کوردیی ڕەفیق حیلمی نیشانەی کوّششی مەردانەی قەڵەمی ئەون لەم مەیدانەشدا.

بەرگی یەکەمی که ساڵی 1941 چاپکراوە لە لاپەرەی یەکەمیدا که لە ژێر ناوی (دیاری)دایە مەبەس و ناوەڕوّکی کتێبەکەو باری ئیلتیزامی نووسەری لە مەیدانی هەموو بەرهەمەکانیدا ڕوون دەکاتەوەو دەنووسێ:

«. . . ئەم چەن لاپەرەیە که ئاوێنەیەکە سوورەت و سیرەتی هەندێ لە شاعیر. ناودارەکانی کوردستانی عیراق بە وێنەی دەسکە گوڵێکی ڕەنگاوڕەنگ و بوّن خوّش دەرئەخا که هەر گوڵێکی لە باخێك هەڵبژێرراوە پێشکەشی لاوانی کوردو بەتایبەتی پێشکەشی ئەو قوتابی‌یە خوّشەوستانە ئەکەم که لە قوتابخانە بەرزەکاندا ئەخوێنن و لەوێدا لە شیعرو ئەدەبیاتی کورد شتێکیان بەرچاو ناکەوێت. ئەگەر بەم (سیپارە) بچووکە توانی‌بێتم که گیانی (روحی) ئەدەبیی ئەوان بجووڵێنمەوە (تەقەلا)یەك که بوّ پێکهێنان و دەرهێنانی بەرگی دووەم ئەیدەم لەلام سووك ئەبێ‌و گیانی نیشتمانپەروەریم، تازە ئەبێتەوە. . »(25)

هەر بەم گیانەوە ڕەفیق حیلمی هەنگاوێکی گەورە پێش ئەو کتێبانە دەکەوێت که پێش خوّی ئەمین فەیزی‌و عەلی کەمال باپیرو مەلاعەبدولکەریمی هەکزی، بەرهەم و ژیان و سیرەتی هەندێ شاعیریان تێدا توّمارکردووە.

ڕەفیق حیلمی لەپاڵ کورتەی ژیانی ئەو شاعیرانەدا که باسی کردوون و وێنەو نموونەی شیعریانی توّمار کردووە حەمدی، ئەحمەد موختار جاف، ئەمین فەیزی، ئەمین زەکی، ئەثیری، ئاهی، بێکەس، پیرەمێرد، حاجی قادری کوّیی، حەریق، مەلا حەمدوون، خاکی، خەستە کوّمەڵێ بڕیاری ڕەخنەگرانەشی بەسەر بەرهەمەکانیاندا داوەو بوّ هەندێکیان چوّتە کوڕی پراکتیکی ڕەخنەیی یا (ڕەخنەی تەتبیقی)یەوە. بوّ ئەو ڕوّژە ئەمە سەرەتایەکی گەورەو یەکەم هەنگاو بوو که تا ئەو سەردەمە کەسی‌تر هەنگاوی

وای نەنابو.

زۆر لە جێدایە کە هەندێ تێبینیی ڕەخنەگرێکی لاو دەربارەی ئەم بەرگە دووبارە بکەینەوە کە لای وایە:

(ئەم ڕایە یا ئەو هەڵوێستە گشتییە لە ئەنجامی «ئینتیباعاتی» شەخسیی خۆی بەرامبەر بە شیعرەکان خۆی سەری هەڵداوە) کە لێرەدا ناتوانم لەسەر ئەم ڕایەبم، چونکە بڕیارەکانی ڕەفیق حیلمی با کورت بن بەڵام هەر خولاسەی ئینتیباعاتێکی سەرپێی نین، بەڵکو خولاسەی تێگەیشتنی شیعر بەگشتیو بەرهەمی ئەو شاعیرانەن. بەڵام ڕاکانیتری ئەو نووسەرە لاوە ڕاستن کە لای وایە:

(ڕایەکانی ـ واتە ڕاکانی ڕەفیق حیلمی ـ بە شێوەیێکی گشتی لە تێگەیشتنی زیرەکانەو سەرنجی لێزانانە بە دەرنین) یا ئەوەی ڕەفیق حیلمی لەو سەردەمەدا (بایەخی گەورەی بە شیعری نیشتمانیو بایەخی بەجیاکردنەوەی لاسایی داوە لە تازەکردنەوەو هاوسەردەمێتی)

بە کورتی ئەو هەنگاوە بەنرخەی ڕەفیق حیلمی کە لاراوەستانێکی گەورەتری دەوێ، هەنگاوی گەورەتری لەلایەن خۆیەوە بەدووادا هات کە ئەویش یەکەم کتێبی دیاری مەیدانی ڕەخنەی ئەدەبیی کوردییە ـ بەرگی دووەمی شیعرو ئەدەبیاتی کوردییە کە ساڵی 1956 لە بەغدا چاپکراوە.

کە لەگەڵ گەشتی «ڕەفیق حیلمی»و قەڵەمدا گەیشتمە لای ئەم کتێبە سەرچاوەو بناغەیە. بە هەندێ چاپکراوو ڕەشنووسی ڕابوردووی خۆما چوومەوە، کە هەر لە 1956ەوە بەهۆی چوونەوە سەر ئەو سەرچاوەیەوە ڕەش کراونەتەوە.

بەڵێ، لە بەرهەمێکی چاپکراود نزیکەی سێ لاپەرە دەربارەی بیست ساڵێك لەمەوبەر گەیشتونە لای خوێندەواران[26] بەڵام تێبینیو ڕەشنوسەکان زۆر لەوە زیاتر بوون. وا لێرەدا کورتەی ئەو ڕایانە ڕادەگەێنم کە لام وایە باش بۆیان چووم.

«ئەم کتێبە بەشی دووەمە لە «شیعرو ئەدەبیاتی کوردی»، کە بەشی یەکەمی ساڵی 1941 چاپکراوەو نووسەر هەندێکی لە ساڵی 1943دا لە گۆڤاری . گەلاوێژ»دا بلاوکردۆتەوەو لە ساڵی 1956دا باسی چەند شاعیرێکیتری خستۆتە سەرو کۆی کردۆتەوە.

لەم بەشەی کتێبەکەیدا باس لە ژیان و شیعری «دڵدار، ڕەمزی مەلامارف، زێوەر، سالم، سەلام، عەلی کەمال باپیر، گۆران، شێخ نوري شێخ سالح دەکات. دەتوانرێ ئەم کتێبە ناوبنرێ یەکەم کتێب لە ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا، چونکە خاوەنەکەی تا ڕادەیێکی گەورە لە سنووری ڕەخنەی ئەدەبی نەچۆتە دەرەوەو باسەکانی هەر لە چوارچێوەی ئەم بەشەی عیلمی ئەدەبدایەو ئەگەر کەمێکیش چووبێتە دەرەوە، ئەوە لادانەکەی هەر بەدەوروپشتی ڕەخنەی ئەدەبیدا بووەو بە لای مەیدانێکی تردا نەچووە.

لادانەکانی نووسەر لە پێڕەوی ڕەخنەی ئەدەبی، بەلای بابەتیتری ئەدەبیاتناسیدا بۆمان دەردەخەن کە نووسەر تا ڕادەیێکی باش ئاگاداری زانستی ئەدەبیاتناسییەوە لەم بارەیەوە تا سنووری بیری ڕیالیزمی سۆشیالیستی هاتووە، بەڵام لە سنوور نەهاتووە بەم دیودا.

ڕەفیق حیلمی لەم کتێبەدا تەواو نوێنەری دەستەی بیرڕووناك (ئەنتلیگێنسیا یا مثقف)ی کوردی پاش جەنگی یەکەمی جیهانە، کە بیرو باوەڕی قەومی لە تورکیاوە کاری کردە سەرهۆش و گۆشیان و دروشمی میللیان بۆ گەلی کورد بەو پێیە هەڵبڕی و لە ڕووی خوێندەواریو ئەدەبیاتیشەوە سەریان کردە سەر خوێندەواریو کلتووری بۆرژوازیی شۆڕشگێری ئەو دەورە، بۆ ئەوەی گەلێك شتی تازەی لێوەفێر بن، بەڵام ڕەسم و عادەتی تایبەتی کۆمەڵایەتیی کورد لە هەندێ جێگەدا ڕای دەگرتن و دەیخستنە سەرسامییەوە.

تا دەوری جەنگی دووەم زۆر لە کورانی ئەم دەستە بیرڕووناکە کوردە ئەدەبەکەیان وەك بیرو باوەڕی سیاسیی خۆیان هەر سەرسامی بوو لە نێوان قوتابخانەی کلاسیکیی کوردیو ئیسلامیو ڕاپەڕینی ڕۆمانتیکیی شاعیرانی تورك یاخود ئەوروپا کە لە گەلێك ڕێگەوە بەرەو مێشکیان ڕێگەی گرتبووەبەر. تا لە دەوری ئەم جەنگەدا بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازو خەباتی گەلان دژی فاشیزم تینی بەرەو کوردستان دەهات و بەشێك لە بیرڕووناکانی کورد ئەو بیروڕایە دەگرنە باوەش و لەناو گەلی

کورددا بڵاوی دەکەنەوە. ئەمە لە نووسینەکانی (ع.و. نووری)و (مەحموود ئەحمەد)دا دیارە. هەندێکیش بیروباوەڕەکەیان دەبەنەوە بۆ ئەو زەوی‌یەی لێی‌هەڵقوڵیوە، بۆ ناو زەحمەتکێشانی کورد.

ڕەفیق حیلمی لەم کتێبەیدا، لە پاڵ هەموو دڵسۆزی‌یەکی خۆیدا بۆ گەل، وێنەی سەرسامیی بیرڕووناکانە. وێنەی ئەو سەرسامی‌یەیە کە لە باسی کەوندا دەربڕی.

زۆر جار بیروڕای ئەم قوتابخانەی ئەدەبی یا ئەو کە بیرو ڕایی دیبوە دێنێتەوە، یا خۆی دەیەوێ ڕێگەییکی تازە بە دی بکات کە بە ڕێگەی ڕاستی دەزانێ.

لە هەندێ شوێندا دێت وەك ڕەخنەگرێکی کلاسیکی باس لە شاعیرەکان دەکات. بە تایبەتی وەك ئەو ڕەخنەگرانەی تەرازووی بەلاغەت دەگرن بەدەستەوەو حەرف بە حەرف شیعری پێ لە محەك دەدەن.

ئەوەتا ئەمیش دەڵێ:

«لێرەدا (جناسێکی تام)ی زۆر جوان و لە بەیتی دووەمی دووای مەتلەعەکەیشا (تەشبیەو ئیستیعارەییکی شاعیرانە هەیە»[27] یا (ئەشێ کە بە سەهلی مومتەنیع» دابنێین)[28]. یاخود «شیعرەکانی سوارو بە زەمزەمەیە»[29] یا «چاوتان لەم جیناسە بێ»[30]

لە هەندێ شوێندا لەسەر ئەم پێڕەوە سنووری فراوانی کتێبی لە بیر دەچێتەوەو خۆی دەخاتە ناو لێکۆڵینەوەییکی درێژی ووردە ڕوخسارەوە هەروەك تەنیا بۆ باسی تاقە قەسیدەیێك هاتبێ و[31] لە هەندێ شوێنیشدا بەپێی ئەو پێڕەوە کلاسیکی‌یە بریاری ئایدیالیستی بەسەر گەنجی شیعردا دەدا وەك «شاعیرێکی خوایی یە»[32] یاخود «شاعیرێکی فیتری‌و خوادادە».[33] هەندێ جاریش بەلای شاعیردا تێدەپەڕی‌و ڕووکەش دەردەخاو خۆی لە قووڵایی شیعر بە دوور دەگرێ.

وەك ئەوەی کە باسی منداڵیی دڵدار دەکات دەڵێت:

«منداڵێك کە هەموو ژیانی خۆی بە خوێندنەوە ڕابواردبێ‌و هێشتا لە خوێندنی پێویستی (ڕەسمی) ڕزگاری نەبووبێ، ناتوانێ بێ بە شاعیرێکی (کەسبی)و بگاتە پلەی ئەوانە کە شیعریان کردووە بە (سەنعەت)».[34] بەڵام هەر لەم باسەدا خۆی هەست بە بریارەکەی خۆی دەکات و بە سەرسامی‌یەوە بەرامبەر بە مەفکوورەی «سەنعەتی شیعر» کردنی بە تەرازوو بۆ پێوانەی شاعیرێتی دەوەستی‌و خۆی ڕێگەییکی‌تر دەدۆزێتەوەو دەڵێ:

«ئەوەیش لەلایێ بوەستێ کە لەلایەن بیری قووڵ و خەیاڵی ووردەوە ئێستەیش دڵدار گەلێ لە ژوور ئەو شاعیرانەوەیە کە هەندێ ووشەی ڕەق و تەعبیری ساردی وا دەهۆننەوەو دەیکەن بە (نەظم) کە بە دیمەن و بیستن شیرین و ڕەنگین، بەڵام لە ماناو حەقیقەتا پووچ و بێ‌کەڵکن».[35]

ئایا ئەمانە ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە ڕەفیق حیلمی بە تەواوی لە سەر بیرو ڕای ڕەخنەگرە کلاسیکی‌یەکانە لە ڕەخنەی ئەدەبیدا؟. خۆی وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوە کەوا تەنیا شیعری کلاسیکی بە تەرازووی کلاسیکی‌یەکان دەپێوێت، وەك لە باسی عەلی کەمال باپیردا دەڵێ:

«لەبەر ئەوە وەکو لە پێشەوە ووتبوومان ئێمەش ئەو جۆرە شیعرانە بە تەرازووی خۆی دەکێشین و بەپێی ئەو سەنگ و تەرازووە کە تایبەتیی شیعری «کلاسیکی» بەنرخی لەسەردا دەنێین»[36]

دەگونجێ نووسەرێك خۆی بە دوور بزانێ لە ڕێ‌و شوێنی کلاسیکی‌یەوەو ئەو ڕێگەیە بە کونەییکی زەمان ڕۆیشتوو دابنێ، بەڵام بەرامبەر بە بەرهەمێکی کلاسیکی بەرگی ڕەخنەگرێکی لە خۆیان لەبەر کات و بە زمانی خۆیان حسابیان لەگەڵ بکات؟

یا ئایدیۆلۆژیەتی خۆی بۆ چەند تاوێك لە پەنا بەردیکدا دابنێ تا لەم حسابە دەبێتەوە.

ئەو سەرسامی‌یەی باسمان کرد وا لە ڕەفیق حیلمی دەکات نەختێ لەگەڵ بارگەی کلاسیکیەتدا بڕوات و لەپڕ بە ڕوویدا هەڵچێت، نەك تەنیا هەڵچوونی ڕۆمانتیزمەکان بەسەر ناوەڕۆك و ڕوخساریدا لەگەڵ سوود بینین لە هەندێ دیمەنێ بە سوودی، بەڵکو تەواو دەچێتە سەر ڕێگەی (فوتوریزم) ەکان و دەیەوی ئەدەبی کلاسیکی لە بنەڕەتا فڕێ بداو دەڵێ:

«من بەش بە حاڵی خۆم لەو باوەڕەدام کە شیعری کۆن بە

چاك و خراپـی‌یـەوە ئەبـێ وورده وورده بكـشـێتــە دوواوەو (ئەنتیكەخانە)كانی ئەدەبی پێ‌برازێنرێتەوە)[37] یاخود دەڵێ:

«دەبێ ئیتر ئەو شیعرانەی چەرخەكانی پێشوو وەكو (عەنتیكە) بخرێنە (مۆزەخانە)كانی ئەدەبەوە بۆ ئەو شاعیرو گەرۆكانە كە لە عەنتیكەو شتی كۆن ئەگەڕێن».[38]

كەواتە شیعری كلاسیكی لای رەفیق حیلمی دەبێ تەنها بۆ سەیــركـردن بهێڵرێتــەوە، نەك بۆ سوود بینین، نەك بۆ رِوانـدنی نەمامی نوێی ئەدەب لەسەر ئەو بنجانەی گیانیان تیاماوە.

بەلاَم ئایـا نووسـەر هەر لەسـەر ئەم بیرە فۆتوریزمە دەمێنێت؟ دیــارە نەء. ئەوەتــا لە شوێـنـێكی‌تــردا شۆرشی خۆی بەســەر ناوەرۆك و روخســاری شیعــری كلاسیكیـدا بە شێـوەیێكی‌تـر، دەردەخات وەك لە باسی (رەمزی)دا رەخنە لە شاعیر دەگرێت كە بە شێـوەیـێـكـی كۆن باس لە مەزووعـێـكـی تازە دەكــات كە نیشتمانپەروەری‌یەو دەڵێ:

«ئەم چەشنە شیعرانە ئیتر باویان نەماوەو نابێ ئێمە بگەرِێنەوە سەری‌و بیكەینەوەبە باو... بەڵكو ئەبێ ئیتر ئوسلوبێكی تازەی بۆ دابـنێین و بە شێــوەیێكی وا لە نیشتمــان بدوێین كە لەگــەڵ پێویستی ئەم چەرخەی كە دێ‌و شان بەشانی شارستانێتی بروا».[39]

دیارە لێرەدا رِێگەی رەخنەگرێكی رِیالیزمی تازە دەگرێت، كە گۆرِینـی روخســاری تەنیــا بۆ گۆرِینـی ناوەرۆك بوێت و ئەو ناوەرۆكەشی زۆر لامەبەسەو دەیەوێ ئەدەبیش تەنیا پەیام بێت بۆ ئەو مەبەسە «یا دەبێ شیعری نیشتمانی بناغەی نیشتمان بەهێز بكا چونكە لای‌وایە كە» ئەبێ ووشەی «نیشتمان» هانمان بدات بۆ خۆبــەخـت كردن لە رِێی ئەو بەختیــاری‌یــە كە تەنیــا لە نیشتمانێكی سەربەخۆ چنگ ئەكەوی».[41]

لێــرەدا رەفـیـق حیلمی بیــرێكی رِێــك و رەوان دەربــارەی ناوەرۆك و روخســار دەردەبــرِێت و لە هەنــدێـك شوێنی‌تــردا دەری‌دەخــات كە بە باشی لە مەســەلـەی یەكێتی‌ی روخســارو ناوەرۆك گەیشتووەو بە هێزی‌و لاوازیان دەبەستێ بە یەكەوە ،وەك ئەوەی كە باسی ئەو شاعیــرانـە دەكـات كە هەر بۆ چاولێكــەری هەندێ باسی كلاسیكی لە شیعریانا دەبینرێ دەڵێ:

«چـونكـە شیعـری ئەمـانـەو شاعیـرەكانی هاوچەرخیان ئەگەر نەڵێین هەمــووی، بەشی هەرەزۆربــەیــان هەر باسی عەشق و غەرام و مەسـتـی‌و شەرابــە، ویـا بە باسی چاوو برۆو خەت و خاڵ و ئەگـریجـە رەش كراوەتـەوە. لەبـەر ئەمە ئاسۆی تەفكیری شاعیرەكانی، زۆر سنووردارو ماوەی قافیەبازی‌یان یەجگار تەنگ بووەو بەهۆی ئەم قافیە تەنگی‌و سنوورداری‌یەوە ماوەی شیعریان كورت بووەو هەندێ جار لە پێنج بەیت تێپەری نەكردووە»[42]

لە «شیعرو ئەدەبیاتی كوردی»دا گەلێك بریاری عیلمی‌و رێك دەبینین دەربــارەی هەنـدێ شاعیــر. نووسەر جێگەی راستەقینەی گەلێكیانی دۆزیوەتەوە. وەك دەبینین دەربارەی دڵدار دەڵێ:

«دڵــدار بە تایبــەتی لە پەنــدو مەوعیــزەی میللیـدا دەسێكی درێژی هەیەو بە گەلێ ووتاری بەهادارو شیعری جوان رێگەی ژیان و سەركەوتنی پیشانی لاوانی دووارۆژ داوە»[43]

هەروەها زۆر بەرێكی جێگەی (رەمزی) وەك حەڵقەیێك و لە نێـوان شیعـری كلاسیكی‌ی كوردی‌و رۆمـانتیزمی رێگەی ریالیزم گرتـــوودا نەخـشـــە دەكـێشێت. یاخـــود وەك خۆی دای‌دەنێ بە شاگـردێكی (بێخـود)ی كلاسیكی‌و (پیـرەمێری شاعیری رِێگەی تازەگــرو شیعــرەكــانی رەمــزی خۆشی بەلای نووســەرەوە لەو نێوانەدایەو دەربارەیان دەڵێ:

گاهێ موزوعێكی كۆنی وەكو ستایش وەیاشین (مەرثیە)ی لە قاڵبێكی تازەدا، گاهێكیش مەوزووعێكی تازەی وەكو شیعرێكی نیشتمانی‌و كۆمەلآیەتی‌و یا وەسفی (تەبیعەت)ی لە قاڵبێكی كۆنا كردووە بە شیعر)[44]

دەبینین لە شیعرەكانی رەمزی نموونەی وا دەهێنێتە پێش چاو بۆ لێكۆڵینەوە كە رێبازی ئایدیۆلۆژی رەمزیی پێ‌پیشان بدات. وەك پارچــەی (ســەرزەنش) كە شاعیــر رەخنــە لە گەلی كورد دەگـرێت لەســەر دوواكـەوتنیان لە كاروانی گەلانی سەركەوتوو. رەفیق حیلمی لێــرەدا بە سەیــركــەر بەرامبــەر بەم رەخنــەیــە ناوەستـێـت، بەڵـكــو ئەمـجــارە وەك یەكـێ لە رەخنــەگــرە دیموكراتی‌یەكان دێتە پێشەوەو بیری خۆی بەرامبەر بە ریالیزمی رەخنەیی دەردەبری‌و دەڵێ:

«چونكە تەنیا ئەوە بەس نی‌یە كە گلەیی لە قەوم بكەین و یا

تیی بگەیەنین کە ئەو ڕێگەیە لە سەری ئەڕوا ڕێیەکی چەوتەو ڕێی پێشکەوتن نی یە. بەڵکو ئەبێ بیخەینە سەر ڕێگەی ڕاست و ئەو ڕێگە ڕاستەشی بۆ ڕوون بکەینوەو لەپێشەوە بڕوین تاوەکو مان نەگرێو لە دووامانەوە بڕوا»[45].

ئەمە تێگەیشتنێکی باشی پەیامی ئەدەبەو ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە شوێنی تری کتێبەکەدا دەبینین کە نووسەر ئەدەب خۆی بە پەیام دەزانێت لە ڕێگەی ژیانداو دێتە سەربیرو ڕای (ئەدیبە لاوەکانمان)[46] کە وەك خۆی دەڵێ:

«ئەیانەوێ لە شیعردا (بروسکە)یەك هەبێ کە لە خەو خەبەرمان کاتەوە. (بریسکە)یەك هەبێ ڕێی ژیانمان بۆ ڕووناك کاتەوە. سیحرێکی تیابێ خوێنمان بخاتەگەڕ.

واتە ئەیانەوێ شیعر، پاڵ پێوەنەرێکی بەهێز بێ، بە کورتی ،ئەیانەوێ شیعر هۆی ووریاکردنەوەو ڕاپەڕاندن بێ. بەکورتی ئەیانەوێ شیعر پاڵ پیوە نەرێکی بەهێز بێ بۆ پێشەوە، بۆ سەرکەوتن لە ژیانا. لەسەری نەڕوین، بە واتەی ئەوان بێ، پێویستە سەنعەتی ئەدەب، جێگەی ئایەت و حەدیسی ئەم چەرخەمان بۆ بگرێتەوەو ئەدیب ئەبێ واجیباتی ڕەسووڵ بگرێتە ئەستۆی»[47]

لە کاتێکدا کە بەم جۆرە ئەم بیرە ڕێك وپێکەی لاوان بەسند دەکا. ئەوە جیاناکاتەوە کە هەر ئەدیبە نوێنەری چین و دەستەیەکەو بیروڕاکەی تەنیا بیروڕای خۆی نی یە.

قەسیدەیێکی پڕ لە ڕەخنەی ڕەمزی دەهێنێ ناوی دەنێ (شەکوای حالی ڕەمزی خۆی).[48] ئەمە لە کاتێکدا کە ماوەیێکی زۆر فراوان هەبوو لە باسی ئەو قەسیدەیەدا بۆ دەرخستنی گەلێك ڕاستیی کۆمەلایەتیو باری ئایدیۆلۆژیو تەرزی ژیانی تاقمە فەرمانبەرێکی واق وورماوی ئەو سەردەمە.

خاوەنی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی) جێگەی هەندێ شاعیری تریش بە باشی دەست نیشان دەکا. وەك (سالم) کە شیعرەکانی دەکا بە گێڕانەوەی دەورێکی مێژووی کوردو وەك دەرخستنی جێگەی عەلی کەمال باپیر (کەمالی) لە ڕیزی شاعیرانی کلاسیکیدا.

ڕەنگە بە قووڵی جێگەی زێوەری بە شاعیرێکی ڕەخنەگری ریالیست دەست نیشان نەکردبێ یا ڕوڵی زێوەری لە هۆشیار کردنەوەی نیشتمانیدا باش دەرنەخستبێ. بەڵام لە باسی (سەلام)دا بە تەواوی ئەم ڕۆڵەی دەرخستووەو بە ساکاری ئەوەشی پیشانداوە کە خۆی لە جەوهەری ئەدەبیاتی ریالیزم گەیشتووە: ئەوەتا دەڵێ:

«سەلام، وەکو لەپێشەوە ووتبوومان، لە شیعردا (ئوسلوبێکی) تایبەتیی خۆی هەیە. لاسایی شاعیرەکانی پێش خۆی نەکردوتەوە. ووشەی بێگانەی (فارسی، عەرەبی) کەم بەکارهێناوە. لە (خەیال) زیاتر شوێن ئەو شتانە کەوتووە کە هەیەو هەستی پێدەکرێو بە بەرچاویا تێدەپەڕێ، وەیا (ڕوو)دەدا. واتە لەو شاعیرانەوە نزیکترە کە پێیان دەڵێن (واقیعی))[49]

ڕەفیق حیلمی کە دێتە سەرباسی شیعری نوێی گۆران و باسی گۆران و بەرهەمی. بەتەواوی چەند پلەیێك لە شیعری گۆران نەخشە دەکێشیو ئەوە دەردەخات کە گۆران هەر لە سەرەتای شاعیرێتیەوە لە باسی دڵداریو عەشقدا لە ڕێگەی کلاسیکی یەکان لایداوەو ڕێگەی دڵداریو جوانی یەکی حیسی ی گرتووە. هەروەها بە درێژی دێتە سەر باسی وەسفی تەبیعەت لە شیعری گۆراندا یاخود وەسفی هەندێ ڕووی ژیانی کۆمەلایەتی کە ئەمیش هەر لادانە لە ڕێگەی کلاسیکیەکان، چونکە وەك ڕەفیق حیلمی خۆی دەڵێ:

«لاپەڕەیێك لە ژیانی کۆمەلایەتی ی کورد دەگێڕێتەوە کە هەموومان دیومانە وەیا بیستوومانە، هەندێکمان خۆی تیابووە. دەزانێ کە ئەوی بۆمان دەگێڕێتەوەو ڕاستەو تەواوە. واتە لەوحەیێکە لە ژیانی (واقیعی)ی کورد. لە کانی خەیال و (موبالەغە) هەڵنەقوڵاوە)[50]

نووسەر لەمەوە دەگاتە سەر بڕیارێك دەربارەی گۆران و ئەمجارە دەریدەخات کە ئیتر ئەو سەرسامی یەی لە نێوان چەند پیرەوێکی ئایدیۆلۆژیو ئەدەبیدا نەماوەو پاڵ پشتیی خۆی بۆ ریالیزم دەخاتە ڕوو (دیارە بێ جیاکردنەوەی جۆری ڕیالیزمی) و شیعرێکی گۆران لەم بوارەدا پەسند دەکات و دەڵێت:

«ئەوەندە جوان و شیرین و لە چەشکەی شیعرو ئەدەب

بەشـداره. چونکـه (واقیعی)یـەو بەهـای جوانی (مـانـا)کەی له (موبالەغه)و (خەیاڵ) وەرنەگرتووه»[51].

هەر بەم پێیە بڕیار بەسەر گۆراندا دەدات که دەڵێ:

«گۆران شاعیرێکی (فەننان)و (واقیعی RealisTe) ە بێ ئەوەی باکمان بێ له ڕەغنەیی یاخو له واتەکەی خۆمان بە گومان بین، ئەڵێین (گۆران)، بەڕاستی بوێژێکی واقیعیو فەننانه . بوێژێکه که ماوەی شیعـرەکـانی له کانگـای ژیـانـەوه واتـه لەژیانی کۆمەڵایەتی کورد هەڵێنجاوەو کردوویه بە (بۆدەقە)ی ئەدەب»[52]

ئەمه بڕیارە که نووسەر لێی بێگومان نی‌یەو گۆرانی پێکراوە به شاعیرێکی ریالیست، تەنیا لەسەر شیعری دڵداریو وەسفەکانی سروشت دامەزرێنراوە، که ناتوانرێ کتومت ناوی ریالیستی پێ له گۆران بنرێ، چونکه هەر لەم سەردەمەی شیعرەکانی گۆرندا گەلێك دەورو خول خواردن بە دەوری شیعرو وێنەی ڕۆمانتیزمیدا دەبینرێ. بەڵام ڕەفیق حیلمی گۆران تەنیا لەم پلەیەی ریالیزمیدا ناهێڵێتەوە. بەڵکو بەرەو ڕیالیزمی ڕەخنەگری لەگەڵیدا دەچێت و پارچە شیعری» بۆ گەورەییکی شیعر دۆست، دەهێنێتە بەر چاوو بەم ووتانه لێ‌ی دەدوێت که دەڵێت:

«ئـەم نامـەیـە، سکـاڵایـەکی زۆرە له جەوری زەمـانـەو لەو بەرهەڵسته چەشن چەشنانه که له ڕێی شاعیرێکی ڕاست بێژ و بێ‌ڕیـا وەیـا مەئمـوورێکی بچـووك و بەسـەزمـانا وەستاوەو دەمی ئەبەستێتەوەو زمانی لاڵ ئەکا»[53]

ڕەفیق حیلمی له کاتی نووسیی ئەم کتێبەدا زۆر باش دەرکی ئەوەی کردووه که گۆران لەم سنـوورەی ریـالیـزمـدا نەوەستـاوەو بەڵکـو له هەمـوو تەپ وتـۆزێـکـی ڕۆمـانـتـیـزمیو شێـوه دوواکـەوتـووەکـانی ریـالیـزم ڕزگـاری بووەو هەر وەك خۆی تێکـۆشـەرێکی ناودارو نەبـەز بوو له پێنـاوی ئاشتیو ئازادیـدا. شیعـرەکـانیشی نمـوونـەی ڕیـالیـزمی سۆشیـالیـستی بوون زۆر هوشیارانه بووه رابەری ئەو ڕێبازە ئەدەبی‌یە له شیعری کوردیدا.

بەڵام دیـاره که دەرچـوونـی ئەم کتـێبـە له دەوری رژێمی پاشـایـەتیی دیکتـاتۆری و کۆنەپەرستی عیراقداو لەژێر (ڕەقابە)ی ئەو سەردەمـەدا ئەوەشـی بەسـەر زمـانـی ڕەفیق حیلمی‌یـەوه وەستاندووەو وای‌لێکردووه که تەنیا بە ئیشارە بنووسێ:

«بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم تاسەو سکاڵایەو هەڵڕژاندنی هەموو ئەو شتانه که دەس و زمانی (گۆران)ی بەستووەو ڕێی ڕووناکیی له مێشکی گرتـووه وەیـا ووشـەی له گەروویـا خنکـانـدووه، له ئەنجـامـا خۆی پێ‌نـەگیـراوەو مەغـزی بیـرو ئەنـدێشەی. خۆی ڕژاندوەته پەیامی کوردەوه»[54]

دیـارە مەبـەسی له (پـەیـامی کورد)یش ئەو نامـه یا داستـانه شیعرەیه که ساڵی 1953 گۆران بۆ مەهرەجانی لاوان و قوتابیاتی سێ‌یەمی جیهانی نووسی که له بوخارست گیراو لەوێدا وێنەی بیرو ڕێبازی ریالیستی‌ی خۆی و ئازاری هەموو گەل خۆی دەنوێنێ.

ئەگـەر ئەو هۆیـانـه نەبـووایـە که ڕەفیق حیلمی خۆی باسی کرد. یا ترسی دەست پەسـەرا گرتنی کتێبـەکـه نەبـووایـە. وەك نووسـەر خۆی له باسی پارچـەییکی ڕەخنـەیی سەلامـدا دەڵێ، گەلێـك ڕوویـتـری گۆران و ئەوانی‌تـریشی دەخسته ڕوو یا وەك خۆی دەڵێت:

«دڵ ئەیویـست هەمووی بنووسین تاوەکو بزانن که (سەلام، چەن بە ووردی سەرنجی داوەتـه چۆنی‌یـەتی کۆمـەلایـەتی‌و ئەو (دوومـەڵ)انـەی که له (کـون و قوژ بـن)ی تاریـکـی ناو دڵی ئەوانـەدایـە که چارە ڕەشی، له هەمـوو خۆشی‌و تام و لەزەتێکی ژیان (بێ‌بەری)کردوون، وە چۆن هەستی بەوەش کردووه. که (ڕەخنـەی گاڵتـەوگـەپاوی ئینتیقادی فکاهی) له خواپێداوەکان و توانـج تێ‌گـرتنیـان، ئەبێ بە (داروو)ی شیفـا بۆ بەدبەختەکان و سیاچارەکان، بە تایبەتی ئەگەر بێتو ئەو خواپێداوانه له (پۆل)ی بە (فیز)و (لووت بەرز)و (خوانەناس)ەکان بن. وەیا بە هەر «هۆ» یی‌کـەوه دەبـێ ببـێ، کەم و زۆر له هەژاریو لێ‌قەوماویی«سیاچارە کانا دەسیکیان هەبێ..»[55]

بەم جۆرە جێگەی گۆرانی تا ئەو دەمه ڕوون کردۆتەوەو زۆر بە ڕێکی بۆ ڕۆڵی شێخ نووری شێخ ساڵحیش له ڕێرەوی شیعری تارەی کوردیدا چووەو سیفەتەکانی له بارەی روخسارەوە تەواو خستۆتەڕوو.

که ئەوە دەگـەیـنـێ که شێـخ نووری شاعیـرێکی گەورەی ڕۆمانتیزمی کوردەو سەرەتای ڕۆمانتیکه کوردەکانه بە تایبەتی له

رووی ڕوخســـارەوە، بەڵام لە باسی ئەویش و گۆرانیشـــدا دوو پارچـــەی کردووە بە نمـــوونــە کە پڕن لە داخ و ئاخ و ئۆف و ئەفســووسی پلەی دووەمی ڕۆمـانتیـزم و شوبهاندوونی بە «توفیق فیکــرەت»ی شاعیــری ڕۆمـانتیکی شۆڕشگێــری تورك، کە لە رووی ڕوخســارەوە نەبێت ئەم شیعـرانـە پێـوەندییان بەو چەشنە ڕۆمانتیزمەوە نی‌یە.

لە دوواییـــدا بۆمـــان دەردەکـەوێ کە بەرگی دووەمی شیعـرو ئەدەبیـاتی کوردی هەنـدێ باسی لەساڵی 1943ەوە نووســراوەو دوواییەکەی لە 1956دا تەواوبووە. لەبەر ئەوە ئەو سەرسامیەی نووسـەر دەردەبـڕێ کە باسمـان کرد. بەڵام ئەوەش دیـارە کە لە باسـەکـانی دوواییـدا ووردەووردە لەو سەرسامی‌یە ڕزگاری بووەو ئەگەر چەرخ بیکردایەو رەفیق حیلمی لەناکاو و ناوەخت کۆچی دوایی نەکردایە، بێگومان بەرگی سێ‌یەم نموونەیێکی ریالیزمی‌و بیری دیموکراتی دەبوو. هەروەك ڕەفیق حیلمی‌ی ڕابەری میللی‌و تێکـۆشـەری کۆنی کورد ڕێگـەی ڕاستـەقینـەی خۆی لە ڕیـزی خەباتی گەلدا گرتبوو. هەروەها لە بارەی ڕەخنەی ئەدەبیشەوە ئەو جێگـەیـەی بۆ خۆی دادەنـاو گەلـێـك سوود لە نووسیـنـە ڕەخنەیی‌یەکانیشی زیاتر دەبینرا، وەك لە نووسینە سیاسی‌یەکانی ئەم دوواییەی‌و تێکوشانی پیرۆزی خۆیدا بینرا.

**کۆتایی:**

هەر لە باسی رەفیق حیلمی‌و قەڵـەمـدا گەلێـك پەردەی‌تـر مابوو. کۆمەڵە ووتارەکانی گۆڤاری «شەفەق»یم وا لەبەردەستداو ئەویش لاوەستانی دەویست. ووتـارەکـانی گۆڤـاری (التقدم)بە عەرەبی کە مامۆستا کاکەی، فەللاح لە ڕۆژنامەی «ژین» خۆیدا ساڵی 1970 کردوویە بە کوردی، لێ‌ووردبونەوەو لێ‌وەرگرتنی دەوێ.

بەڵام باسەکەمان تا ئێرە زۆری خایاندو وا بزانم دەرفەتی ئەو لاوەستاندنانە نەماوە. هەر وەك دەربارەی مامۆستا خۆیشی زۆر باس و پەردەی ترم هەبوو و زۆر یادگاری بەنرخ و پڕ چێژ هەبوو. کە ئەوانیش دەرفەتی‌تریان دەویست.

**پەراوێز:**

(1) بڕوانە ڕۆژنامە «بیری نوێ». بەغدا. ژمارە 279 1978/2/18.

(2) رەفیق حیلمی. پاش تەمووز. لەبەغدا، 1960. ل 9، 10

(3) هەر ئەوێ، ل 10، 11.

(4) بڕوانـە: دیـوانی حاجی قادری کویی. گردو کۆو پەخشکار گیوی موکریانی. هەولێر، 1969 ل118، 119

(5) لە ووتـارێکـدا کە دەربـارەی «مـەحـوی» خەریکی نووسینم بە درێژی دێمەوە سەر ئەم باسە. بەڵام بۆ نموونە دەڵێم هەمـوو نووسینـەکـانی ئەمین زەکی لە ئەستەموول بە تورکی بووە، هەروەهـا ئەمین فەیـزی هەر «ئـەنجـومـەنی ئەدیبـان» ەکـەی کۆکـراوەیـە لە کوردی‌یـەوە پیرەمێرد شیعرو ووتـاری بەتـورکی‌بـووە، هەندێ وەرگێرانی شیعری مەولانا خالیـدو ئەبـولخـەیرسەعیدی بوو ئەوانیش کە هاتەوە بڵاوی کردنەوە. نموونەی‌تریش زۆرن.

(6) شێخ مستەفا ئێستا کۆچی دوایی کردووە.

(7) ڕەنگە ئەم نوقتانەی لە جێی ناوی «حەلاو» دانابێ.

(8) رەفـیق حیلمی. شیعــرو ئەدەبیــاتی کوردی. ب 2. بەغدا، 1956 ـ ل 45، 46

(9) رەفیق حیلمی. علمی ژمارە .ب2. بەغدا، 1936

(10) هەنــدێ سروودی لەو کتێبی گۆرانی‌یـانــەدایـە کە (کــوردی‌و مەریــوانی) چاپیــان کردووە. بەداخـەوە کاتی ئامادەکردنی ئەم باسە ئەو کتێبەم دەست نەکەوت.

(11) رەفیق حیلمی. یادداشت. ب6. بەغدا، 1958. ل 579

(12) هەر ئەوێ ،ل 580 ـ 582.

(13) علی کمــال باپیــر آغــا. گلدەستــەی شوعــەرای

هاوعەسرم. سلێمانی، 1939. ل 55، 56.

(14) ڕەفیق حیلمی. پاش تەمووز. بەغدا، 1960، ل 21، 22

(15) هەر ئەوێ، ل23

(16) هەو ئەوێ، ل 26، 27.

(17) هەر ئەوێ. ل 32.

(18) هەر ئەوێ. ل 36.

(19) هەر ئەوێ. ل 33.

(20) ......................

(21) هەر ئەوێ. ل 36، 37.

(22) هەر ئەوێ. ل 38.

(23) هەر ئەوێ. ل 39.

(24) هەر ئەوێ. ل 40.

(25) رفیق حیلمی. شعــروادبیــاتی کوردی. بەغــدا، 1941. (لاپەرەیەکی بێ ژمارە. بەناوی «دیاری»یەوە)

(26) الــدکتــور عزالــدین رسـول. الـواقعیـة في الأدب الکردي. بیروت 1966،ص 24 ـ 27.

(27) رفـیق حیلمی. شیعــرو ئەدەبیــاتی کوردی. ب2. بەغدا، 1956. ل 13.

(28) هەر ئەوی، ل 21.

(29) هەر ئەوێ، ل 37.

(30) هەر ئەوێ، ل 69.

(31) هەر ئەوێ، ل 77 ـ 79. 94 ـ 103

(32) هەر ئەوێ، ل 9.

(33) هەر ئەوێ، ل 10

(34) هەر ئەوێ. ل 9.

(35) هەر ئەوێ، ل 10

(36) هەر ئەوێ. ل 134.

(37) هەر ئەوێ. ل 142.

(38) هەر ئەوێ. ل 154.

(39) هەر ئەوێ. ل 32.

(40) هەر ئەوێ. ل 33.

(41) هەر ئەوێ. ل 34.

(42) هەر ئەوێ. ل 126، 127.

(43) هەر ئەوێ. ل 18.

(44) هەر ئەوێ. ل 25.

(45) هەر ئەوێ. ل 30

(46) .(47) هەر ئەوێ. ل 205

(48) هەر ئەوێ.

(49) هەر ئەوێ. ل 91.

(50) هەر ئەوێ. ل 17.

(51) هەر ئەوێ. ل 159.

(52) هەر ئەوێ. ل 172.

(53) هەر ئەوێ. ل 198.

(54) هەر ئەوێ.

(55) هەر ئەوێ. ل 107، 108.

(56) دیوانی گوران. ب 1. بەغدا، 1980.ل 337، 338.

# یادداشته‌كانی ڕه‌فیق حیلمی

■ شاكر فتاح ■



ره فیق حیلمی له گه ڵ شیخ محمودی نه مردا

یادداشته‌كانی مامۆستا (ڕه‌فیق حیلمی) ئه‌وه‌نده‌ی ده‌ستم كه‌وتوون، بریتین له شه‌ش به‌رگ، كه كۆمه‌ڵه‌ی لاپه‌ڕه‌كانیان ده‌گاته (637) لاپه‌ڕه. له‌سه‌ر قاقه‌زی ڕۆژنامه چاپ كراون، كه له به‌ژن و بالآدا به ناوونجی داده‌نرێن. له به‌غداد، له چاپخانه‌ی (مه‌عاریف)دا چاپ كراون له 1956/7/25دا ده‌ست به چاپكردنیان كراوه، له 1958/4/15دا له چاپ كردنیان بۆته‌وه. چاپ كردنه‌كانیان جوانه. نووسراوه‌كانیش پڕن له وێنه‌ی ئه‌و كه‌سانه‌و ئه‌و شوێنانه‌ی په‌یوه‌ندی‌یان به شۆڕشه‌كانی (شێخ مه‌حموود)ی گه‌وره‌وه هه‌یه. مامۆستا ڕه‌فیق حیلمی ڕه‌نجێكی زۆری له داڕشتنی ئه‌م یادداشتانه‌یدا داوه. هه‌وڵێكی زۆریشی‌داوه كه نووسراوه‌كانی به كوردی‌یه‌كی په‌تی بنووسرێن و له شێوه‌یه‌كی وایشدا بنووسرێن، كه سووك و ئاسان و ڕه‌وان بن بۆ خوێندنه‌وه، هه‌موو خوێنه‌رێكیش خۆشی له خوێندنه‌وه‌یان بچێژ ێ‌و، كه‌ڵك و سوودێكی ته‌واویش له‌بابه‌ت

مێژوو، بەسەرهاتی میللەتەکەمان و (جیهان)ەوەی دەست بکەوێ. لەڕاستیدا یادداشتەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی بە سەرچاوەیەکی گرنگ و بەنرخ و ناوازەو نایاب دادەنرێن، بۆ مێژووی (کورد) و (کوردستان)، بە تایبەتی بۆ مێژووی شۆڕشەکانی (شێخ مەحموودی گەورە).

چونکە خودا لێخۆش بوو، هەموو کەل و قوژبنێکی ئەو شۆڕشانەو ئەو کارەساتانەیش کە پەیوەندییان بەو شۆڕشانەوە هەیەو قەوماون لە جیهاندا، بە تەواوی ڕۆشنیان دەکاتەوە. لەبەر ئەوە پیاو کە یادداشتەکانی مامۆستای بەڕێز (ڕەفیق حیلمی)، دەخوێنێتەوە، هەست بە زاخاوێکی مێشك و ئارامێکی دڵ و ئاسایشێکی دەروون دەکات، نایەوێ وازیان لێ بهێنێ تا تەواویان دەکات. هۆی ئەمەیش ئەوەیە کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی خەباتی کردووەو چۆتە بنج وبناوانی هەموو شتێکەوە کە پەیوەندییان بە شۆڕشەکانەوە هەیە، تا ڕاستییشی بۆ دەرنەکەوتبێ وازی نەهێناوە. ئەو ڕاستییانەیش کە دەستی کەوتوون، لە شێوەیەکی تەڕوتازەو ناوازەدا، بە سەربەستییەکی بێئەندازەوە دەری بڕیون، کە دڵی ڕاستیپەرستان خۆش دەکەن و سەریشیان دەهێننە سەرسوڕمان. مامۆستا ڕەفیق زۆر هەوڵیداوە کە بێلایەن کارەساتەکان پیشان بدات، کەسایەتییەکان دەربخات. تەنانەت لە گەلێ جێگادا پێ لە هەڵەکانی خۆیشی دەنێ‌و، سەرزەنشتی خۆیشی دەکات و. پەشیمانی لە کردەوەکانی خۆیشی ئاشکرا دەکات. ئەمەیش سەبارەت بەوەیە کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی هەروەك زانا بوو، دانایش بوو، بوێژ و وێژەوان و ڕاستی ـ پەروەر بوو. حەزی دەکرد بەم یادداشتانەی ڕاستیی شۆڕشەکانی کوردەواریو، بە جۆرێکی تایبەتی شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی گەورە لە کوردستانی عیراقدا پیشانی ڕۆشنبیرانی کوردو، هەموو جیهان بدات. تا لە مەندە زۆرتر درۆو چاوڕاوی دژمنانمان، کە لە بابەت شۆڕشەکانی کوردەوە کردوویانە، ڕاستیی لە کاربەدەستان و ڕۆشنبیرانی جیهان نەشارنەوە. مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە یادداشتەکانیدا ناپارێزێ لە کەس، لە هیچ فەرمانڕەواییو نەتەوەو کاربەدەستێکیش سڵ ناکات. قسەی ڕاستی خۆی هەر دەکات. لە جێگای خۆیدا چاك بێ دەیلێ، خراپیش بێ هەر دەیلێ. تەنانەت بەرامبەر خۆیشیو دوژمنەکانیشی چیی چاك هەبێو، چیی خراپ هەبێ، بێپەروا، بە سەربەستییەکی بێئەندازەوە دەیلێ. تەنانەت ئەگەر یەکێك هەڵەیەکی ئەوی دەرخستبێ، بێجگە لەوەی هەڵەکەی خۆی ڕاست دەکاتەوە، سوپاسی ئەو کەسەیش دەکات و، هەڵەکەی خۆیشی بۆ هەمووان ئاشکرادەکات. لەڕاستییشدا مامۆستا لەڕووی پەرچڤەی هەندێك ووشەو واژەی بێگانانەوە، هەروەها لەڕووی (ڕێنووس)یشەوە، لەڕووی هەندێك ڕووداویشەوە، لە چەند جێگایەکی کەمدا بە هەڵەدا چووە.

بەڵام ئەو خۆی تکا لە خوێنەران دەکات کە لە هەڵەکانی ئاگاداری بکەن، تا هەڵەکانی خۆی ڕاست بکاتەوە. بەڵام ئەو هەڵانەی کە مامۆستا کردوونی ئەوەندە کەمن، لە نرخی یادداشتەکانی کەم ناکەنەوە. چونکە یادداشتەکانی پڕن لە ڕاستییو ڕاستییش دڵی هەموو تێگەیشتوویەك و پێگەیشتوویەك کێش دەکات.

## لەسەر شۆڕشەکانی کورد دەکاتەوە

(ناحەزان)و (دوژمنانی کورد)و (فەرمانڕەواییە داگیرکەرەکان) وای بۆ دەست دەدان کە هەموو شۆڕشەکانی کورد بەدناوبکەن بەوەوە کە بە فیتی دەوڵەتە بێگانەکان هەڵگیرسێنراون. کە پێشەواکانی شۆڕشگێڕەکانیشمان. چاوبرسێتیو سایەو پایەو مایە کێشی کردوون بۆ هەڵگیرساندنی ئەو شۆڕشانەمان، نەك دڵسۆزی بۆ (کورد)و (کوردستان).

بەڵام مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لەسەر شۆڕشەکانی کورد دەکاتەوە. لە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان و ئاشکرادا، بە بەڵگەو بڕوانامەی مێژوویییەوە، دەریدەخات، کە شۆڕشەکانی کورد هەموویان لەبەر زۆر وستەمی فەرمانڕەواییە داگیرکەرەکانی (ئێران)و (تورکەکانی عوسمانی)و (ئینگلیزەکان) بەرپابوون.

هەروەها شۆڕشگێڕانی کوردیش، نموونەی هەموو (نەتەوەی

کورد) بوون. بۆ ئەوە شۆڕشەکانیان بەرپاکردووە، کە لە زۆروستەمی ئەو داگیرکەرانە ڕزگاربکەن. بۆ نموونە: شۆڕشەکانی (شێخ مەحمودی مەزن) چ بەرامبەر بە تورکەکانی عوسمانی، چ بەرامبەر بە ئینگلیزەکان، بە فیتی کەس و هیچ دەوڵەتێك هەڵنەگیرساون.

تەنیا بۆ دەستکەوتنی بەختەوەری گەلەکەمان و ڕزگار کردنی کوردەواری لەدەست زۆرداری‌و هەژاری نەخۆشی‌و نەخوێندەواری بەرپابوون. ئەمە ڕاستە (شێخ مەحمودی گەورە) خۆی نزیك خستۆتەوە لە کاربەدەستانی تورکی عوسمانی‌و ئینگلیزەکان بەلام بۆ ئەوە خۆی لێ نزیك خستوونەتەوە تا لە ڕێگایەکی کورت و ڕاست و نزیکەوەو، لەشێوەیەکی شیرین و بێ وەی‌دا، ئاواتەکانی کوردەواری بهێنێتەدی. بەلام کە (شێخ) ئەوەی بۆ دەرکەوتووە، کاربەدەستانی ئەو دەوڵەتانە، پەیمانی خۆیان ڕانەگرن و، (مافی کورد) دەخەنەلاوەو، پێ شێلی دەکەن، لێیان ڕاست بۆتەوەو، چووە بە گژیاندا تا ناچاریان بکات دەدان بە مافی نەتەوایەتی‌ی کوردو کوردستاندا بنێن.

(شێخ مەحمود) پیاوێکی لێهاتوو، ئازاو بەجەرگ بووە، لە کانگای دڵیەوە حەزی بە سەربەرزی‌ی کوردو ئاوەدانی‌ی کوردستان کردووە. بێجگەلەوە هەموو گیان و سامانی خۆی لە پێناوی ئازادی‌و سەربەخۆیی‌ی‌دا بەخت کردووە.

ئنجا مامۆستا ڕەفیق حیلمی، بۆ بەلگە قسەکانی شێخ مەحمود دەگێڕێتەوە، کە بەو پەڕی سەربەستی‌و ئازایەتی‌یەوە، لەبەردەم دادگەی سەربازی‌ی ئینگلیزەکاندا لە بەغدادا کردوێتی‌و، هورووژمی بردۆتە سەر خۆیان و دەوڵەتەکەیان، کە ناهێڵن مافی کورد، بە پێی ئامۆژگاری‌یەکانی (وودرۆ ویلسن)و (14) بەندەکەی‌و، پەیماننامەی (سیڤەر) سەربگرێ. هەروەها ئەو قسانەی (شێخی مەزن) بە بەلگە دەهێنێتەوە، کە لەپاش گەڕانەوەی لە هیندستان، لەبەردەم خونکاری عیراق (فەیسەڵی یەکەم)و (باڵوێزی بەریتانیا)دا، بە هەموو سەربەستی‌یەکی خۆیەوە لە بەغدادا کردوێتی، لەبابەت گەلەکەیەوە. شێخ مەحمودیش ئەو شێخ مەحموودە بوو، کە لەپاش هاتنەوەی بۆ سلێمانی‌و کردنی بە فەرمانداری سلێمانی لەلایەن فەرمانڕەوایی‌ی بەریتانیاو فەرمانڕەوایی‌ی عیراقەوە، کە زانی نە لە لایەن تورکە کەمالی‌یەکان و، نە لە لایەن فەرمانڕەوایی‌ی بەریتانیاو، نە لە لایەن فەرمانڕەوایی‌ی عیراقەوە، هیچی ڕاستەقینە بۆ کوردی ناکەن و، دەیانەوێ بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان، خۆی‌و نەتەوەکەی بچەوسێننەوە، بێ ئەمەی پرسێك بە هیچ لایەکیان بکات و، نرخێك بە چاووڕاوەکانیان و، درۆ و فیشاڵەکانیان بدات، (خونکارێتی)ی خۆی ئاشکراکردو، ناوی خۆی نا (خونکاری کوردستان).

ئا بەم ڕەنگە مامۆستا ڕەفیق حیلمی ڕاستی‌ی شۆڕشەکانی (کورد)و (شۆڕشەکانی شێخ مەحمود)و کەسایەتی شێخ مەحمود دەردەخات. بەلام مامۆستا ڕەفیق حیلمی کەم وکووڕی‌ی فەرمانڕەوایی‌یەکەی شێخ مەحمودو هەڵەکانی شێخ مەحمودیش ناشارێتەوە. بە ئاشکرا دەریان دەخات. بە کورتی‌وا پێشان دەدات: کە شێخ مەحمود لەسەر بنچینەیەکی زانست فەرمانڕەوایی‌یەکەی خۆی نەبردووە بە ڕێوە.

کاروباری گرنگی بە پیاوی زاناوکارامەو کارگوزار نەسپاردووە. جڵەویشی بەرداوە بۆ کەس و کارو دەس وپێوەندی نەزان و تێنەگەیشتوو و هەل پەرست و لەخۆبایی بوو:

لەڕاستی‌یشدا شێخ مەحمود لە کاروباری زرنگ‌کاریدا شارەزا نەبوو. لەناو ئەو هەموو گەروگێچەڵ و تەنگ وچەڵەمەو، گیروگرفتەیشدا کە داگیرکەران بەرپایان کردبوو، شڵەژابوو، سەری‌سوڕمابوو، نەیدەزانی چی بکات لەبەرئەوە ئەو کەم وکووڕی‌و هەڵانە بووبوونە شتێکی سووروشتی، دەبوو ڕوویدەن. ئەمە لە لایەکەوەو، لە لایەکی‌تریشەوە چاوبرسێتی‌ی دەوڵەتە سوێندخوارەکان کە بریتی بوون لە (بەریتانیا)و (فەرەنسە)و (ئیتالیا)، کە چاویان بڕیبووە خاکی عوسمانی ئەوسا ئەمانە هەموویان بوون بە هۆی ئەوەی (مافی نەتەوایەتی‌ی کورد) بخرێتە ژێرپێوە.

## یادداشتەکان پڕن لە زانستی گشت لایی

بە بۆنەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی مەزنەوە، مامۆستا ڕەفیق حیلمی گەلێك ڕەووشت و خووی بڵندی کوردەواریمان پیشان دەدات. بۆ وێنە کوردەکان بە دەوڵەمەندو هەژارەوە، بە گەورەو بچووکەوەو، بە دەسەڵاتدارو بێدەسەڵاتەوە، بە خوێندەوارو نەخوێندەوارەوە چۆن لە ڕۆژی 1922/9/30دا چوون بە پیر شێخ مەحمودەوە، (خۆش هاتی)و (پیرۆزبایی)یان لێ‌کردووە. هەروەها چۆن هەموو دەم لاوە خوێندەوارەکان و ڕۆشنبیرەکانی ئەو سەردەمە [کە خۆیشی یەکێك بووە لە وان) لەشێوەی پێکەوەنانی کۆمەڵانی نهێنیی و ئاشکرادا ڕەنجیان داوەو، تێکۆشاون لەپێناو دەستکەوتنی مافە نەتەوەیی‌یەکانی کوردو سەربەخۆیی کوردستاندا. بەم بۆنەیەوە مامۆستا ڕەفیق حیلمی ناوی یەك دوویەك لەو کۆمەڵانەمان بۆ دەهێنێ وەك (جەمعی‌یەتی کوردستان)و (کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان) کە خۆیشی ئەندامێکی کارگوزار بووە لەناویاندا.

مامۆستا ڕەفیق حیلمی بەوەیش ناوەستێ: مێژووی شەڕی (چالدێران) دەگێڕێتەوە، کە بە سایەی لەشکرەکانی میرنوشینی‌یەکانی کوردستانەوە، تورکەکانی عوسمانی لە شەڕەکەدا لەشکری (ئیسماعیل شاهی سەفەوی)ی ئێرانیان شکاندووە. کەچی لەپاش ئەوە خونکارەکانی تورکی عوسمانی لەباتی چاکەدانەوەی میرەکانی کوردستان، چاویان بڕیوەتە میرنوشینی‌یەکانیان و پیلانیان داناوە بۆ تێکدانیان، تا بەرە بەرە یەکە یەکە لەناویان بردوون و داگیریان کردوون.

بەکورتی یادداشتەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەسەرێکەوە دۆستایەتی و مەردایەتی و ئازایەتی‌ی کوردەواریمان پیشان دەدەن، کە چۆن بە ڕاستی و دووروستی‌یەوە پەیمانی خۆیان لەگەڵ بێگانەکاندا ڕاگرتووە، لەسەرێکی تریشەوە سپڵەیی و ناپاکی و نامەردیی هەندێ لەو بێگانانەمان پیشان دەدەن، کە چۆن (دڵپاکی)و (خۆش باوەڕی)ی نەتەوەی کوردیان بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان بەکار هێناوە. کەچی لەپاشدا لەباتی چاکە، خراپەیان لەگەڵدا کردوون.

بێجگە لەمانە یادداشتەکان لە شۆڕشەکانی برا عەرەبەکانمان دەدوێن، چ لە عیراق و چ لە جێگاکانی تردا، بە تایبەتی لە ساڵی 1920دا کە کوردەکان و عەرەبەکان لە عیراقدا، پێکەوە تیایاندا بەشداربوون.

ئەوەندەی پەیوەندی‌یشی بە کێشەی کوردەوە هەیە، لە کەسایەتی‌یە گەورەکانی جیهان دەدوێن، وەك (لینین)و (لوید جۆرج)و (مستەفا کەمال)و (عیسمەت ئینونو)و (چەرچل)و (میس بێل)و (مارك سایکس)و (وودرۆ وێلسن)و (کلیمەنسۆ)و (وەنزیلۆس)...

هەرچی فەرمانداراەکانی ئینگلیز بوون، لە کوردستاندا، مامۆستا ڕەفیق ناوی هەموویان بە خراپە دەهێنێ لە هەڵسووڕاندنی کاروباری کوردستاندا، وەك (مێجەر سۆن)و (کاپتان بۆند)و (کاپتان بیل)و ئەو فەرماندارانەی لە چەمچەماڵ و ئاکرێ و زیبارو ئامێدیدا کوژران، لە ئەنجامی کردەوەو ڕەووشتە خراپەکانیاندا. تەنیا لە ڕەووشت و کرداری (مێجەر نۆئیل)و نیازی دڵی بەرامبەر بە کوردەوە دڵنیایەو بە چاکی‌یەوە ناوی‌دەبات.

یادداشتەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی گەلێك بە کەڵکن بۆ ئێمەی کوردەواری. چونکە بێجگە لەوەی دۆست و دوژمنیان بۆ لە یەك جیاکردوونەتەوە، ئەو پەندەیشمان دەدەنێ: کە دەبێ هەرچی‌یەك دەکەین لە پێناوی (ڕاستی و دارپەروەری)دا بیکەین، کە ئەمەش ڕێگەی مرۆڤایەتی‌یە.

# تۆژینەوەیێك دەربارەی نووسینە تورکی یەکان ی رەفیق حیلمی "١٨٩٨ - ١٩٦٠"

● مصطفیٰ نەریمان ●



مامـۆسـتـای خوالـی خوش بوو رەفـیـق حـیـلمی کوردی‌و عەرەبی‌و تورکی‌و فارسی‌و فەرەنسی بە خوێنـدن و نوسینـەوە بە باشی دەزانی‌و لە هەر پێنج زمانەکەدا بڵاوکراوەشی هەیە.

سەرەتـای نووسـینی رەفیق حیلمی لە تورکی‌یـەوە دەست پێ‌دەکات لەم لایەنەوە خۆی دەڵێت (لە تەمەنی پانزدە ساڵیدا کە هێشتـا لە قوتـابخـانـەی ناوەنـدی ئەم خوێنـد دەستم دابـوە شیعروتن، بەڵام ئەوسا کە خوێندن لە وڵاتەکەماناو لە هەموو عیـراقـدا بە تورکی بوو منیش بە تورکی شیعـرم ئەهـۆنیـەوە، چونکـە ئەبێ راست بڕۆین کە هێشتـا بیـری نیشتمان و میلەت لەوێ بمێنێ تەنـانـەت باسی هەرچی شتێـك کە بەسیاسـەتەوە پەیـوەستی هەبێ وە شتێ کە بێتـەهـۆی روناکی مێشکمان لەم لایـەنـەوە رێـێ بەبـیـری ئێـمـەدا هاتـنی نەزانـی بوو وە نەی‌دوزیـیۆوە، ئنجـا دیـارە کە ئەو شیعـرانـەی دەوری منـاڵیم بریتی بوو، لە لاسایی کردنەوەیەکی ئەو شاعیرە تورکانە کە لەو سەردەمـەدا ناوێکیـان هەبـوو و لە گۆڤـار ونـامیلکـەکـانی ئەو رۆژانەدا بەرچاومان ئەکەوت و ئەمان خوێندەوە، نەك من وەیا ئەوانـەی کە ئەو رۆژە لە تەمـەنی منـا بوون تەنـانـەت شاعیری بەرزو ناوداری کورد ـ عورفـی بەگـی دیـاربـەکـری کە لەو ساڵانـەدا لە کەرکـوك مودیـری تەحـریـرات بوو دوایی هاتـە سلێـمـانـی هەر بە مدیـری‌و لەوێ ناسـیم ـ کە یەکێ بوو لە نیشتمانپەروەرەکانی بتلیس هەر بە تورکی ئەیانوسی‌و شیعریان دائەنا، شیعرەکانی ئەو دەورەم ئەنارد بۆ رۆژنامەی ـ حوداث ـ کە لە کەرکوك بە زمانی تورکی دەرئەچوو).

نووسینە تورکی‌یەکانی رەفیق حیلمی بە زمانی تورکی دەکەینە دوو بەشی سەرەکی‌یەوە (یەکەمیان) ئەو بەشەیە کە لە رۆژنامەو گۆڤـارەکـانـدا بڵاوی کردوەتـەوە (دوومیـان) ئەو بەشـەیـە کە بە کتێب و نامیلکـە بڵاوی‌کـردوەتـەوە ئەو بەشـەی کە لە رۆژنـامـەو گۆڤارەکاندا بڵاوی‌کردوەتەوە بریتی‌یە لەو نووسینانەی کە لە دوو رۆژنـامـەی تورکی (حـوادث)و (نجمـە)و دوو رۆژنامەی کوردی (رۆژی کوردستان)و (بانگی کوردستان)دا بڵاوی‌کردبوونەوە.

ئنجا با بیەنیە سەر هەر چوار رۆنامەکەو بڵاوکراوەکانی مامۆستا رەفیق حیلمی:

یەکەم ـ (حوادث):

---

حوادث یەکەم رۆژنامەیە کە لە کەرکوك بڵاوکراوەتەوە، ساڵی 1327ی رۆمی بەرامبـەر 11ی شوبـاتی 1911ی زایین یەکـەم ژمارەی لە کەرکوك چاپکرا، خاوەن ئیمتیاز (قدسی‌زادە محمد زەکی)و نووسـەری ئەدەبی (قـدسی‌زادە ئەحـمـەد مەدەنی)بـوو، رۆژنامەکە بە چوار لاپەرە، هەفتەی جارێك یاخود بە دوو هەفتە جارێـك دەردەچـوو بابـەتـەکـانی رامیـاری، کۆمەڵایەتی‌و یاسا، کشتوکاڵ، هونەرو ئەدەبی بوو، ئەم رۆژنامەیە تا عوسمانی‌یەکان

لە كەركوكدا بوون دەردەچوو و هەموو ژمارەكانی گەیشتە (138) ژمارە كە لەم لاو لەولا لای چەند كەسێك لە كەركوك هەیە.

لەو ژمارانەی بەرچاوم كەوتوون لە نۆ ژمارەدا مامۆستا رەفیق حیلمی نووسینی تیـادا بڵاوكـردوەتـەوە، لەو سەردەمـەدا رەفیق حیلمی قوتابی بوو لە ئەعدادی مولكی سلێمانی واتە ناوەندیی و ئیعدادیی و بەناو (كركوكلی) رەفیق حیلمی) واتە (رەفیق حیلمی كەركوكی) ئەم نووسینانەی بڵاوكردوەتەوە:

1 ـ چوارخشتـەكی لەسـەر پارچـە شیعرێكی (زین العابدین أفندی قابلی‌زادە) كە ناونیشانی (غروبە) بووە، لە ژمارە (69)ی ساڵی 1912دا بڵاوكراوەتەوە.

2 ـ چوارخشتـەكی لەسـەر پارچـە شیعـرێكی (قـودسی) كە ناونیشانی (پەند پدەر) بووە، لە ژمارە (71)ی ساڵی 1912دا بڵاوكراوەتەوە.

3 ـ پێنـج خشتـەكی‌یـەك بە ناونیشـانی (بی‌هـودە ئەیلەمـە ـ بێ‌كەڵكی مەكە) لە ژمارە (73)ی ساڵی 1912دا بڵاوكراوەتەوە.

4 ـ پارچە شیعرێك بە ناونیشانی (مەنسی برمەوجود ـ واتە ـ كەسێكی وون بوو) لە ژمارە (74)ی ساڵی 1912دا بڵاوكراوەتەوە.

5 ـ پارچـە شیعـرێـك بە ناونیشـانی (زەوالی‌قوش ـ باڵندەی بەسزمان) لە ژمارە (77)ی ساڵی 1913دا بڵاوكراوەتەوە.

6 ـ پارچە شیعرێك بەناو (برنظیرە = بۆ بێ‌وێنەیەك) لە ژمارە (80) ساڵی 1913دا بڵاوكراوەتەوە.

7 ـ پارچە شیعرێك بەناو (بكای عشق ـ چرۆی دڵداری) لە ژمارە (81)ی ساڵی 1913دا بڵاوكراوەتەوە.

8 ـ پارچـە شیعـرێـك بە ناونیشـان (غـزل غرام) لە ژمـارە (89)ی ساڵی 1913دا بڵاوكراوەتەوە.

9 ـ پەخشانێك بە ناونیشان (مەحزون ئولورم ـ دڵ تەنگ ئەبم) لە ژمارە (97)ی ساڵی 1914دا بڵاوكراوەتەوە.

لێرەدا یەك دوو كۆپلە لە شیعـرەكـانی رەفیق حیلمی ئەخـوێنم و لێكی ئەدەمەوە:

(بی‌هودە ئەیلەمە ـ بێ‌كەڵكی مەكە یان بەفیرۆی مەدە)

كوگل یاندم یتر ئارتق خەیاڵم تارمار ئیمە
بەكا ئەغیاری گولدیرمە بۆ كوگل ئاهـ و زار ئێتمە
بیراق آللە ئیچون ئۆڵسون بۆ روحی داغدار ئێتمە
جیهانی خون چەشملە حەزەن برلالەزار ئێتمە
ولو دولوسەدە بر كوگل آنی سن ئاشكار ئێتمە

واتە (دڵم سوتا بەسە ئیتر بیرو خەیاڵم پرش و بڵاومەكە، وا مەكە غەوارە پێمان بكەنێت دڵم پر لە گریەو زار مەكە، توبی خوا لێم گەرێ ئەم روحی رەوانەم پر لە ئاخ و داخ مەكە، ئەم جیهـانـەش تۆ بە فرمێسكی خوێنـاوی چاوەكـانت رەنگـاورەنگ مەكە، با ئەو دڵەش پر بێت لە ئاخ تۆ قەت نەكەی بیدركێنیت)

لەدوا چوارینی هەمان چواریندا دەڵێت:

دلابودر حد ئەفغانك صوكی قەهرو نەدامتدر
مراق ایتمك، غموم ئولمق شئامتدر شئامتدر
گوزمدن دوگدیگم خوناب زەوالمچون عەلامتدر
ئێدەرسەم عەشقمی ئیعلان هەمان قوپمش قیامتدر
(رەفیق) بر گول ایچون دەكمز اوزن هەر خارە یار ئێمتە

واتە (ئەی دڵ بزانە سەرەنجامی خەم خواردن هەریەشیمار یە
دۆش داماو و پەستی بەدبەختی یەو بەدبەختی‌یە،
ئەو خوێناوەی لە چاوم دەبارێت، نیشانەی لەناوچوونە،
ئەگەر بێتو عەشقم دەرببرم قەیامەت هەڵ ئەسێت،
(رەفیق) ئەوە نایـەنێت تۆ بۆ گوڵێـك خۆت بكـەیتـە رەفیقی هەر كەچ رەفتارێك)

لەو پەخشـانـەش كە بەنـاونیشـان (دڵ تەنـگ ئەبم) بە مەعناكەیدا دەڵێت:

(كـە نەوجـەوانێـك دەبینم لە تەمـەنی چواردە ساڵیـدایـە وەك پشكۆ تازە دەمی‌كردوەتەوە بە زوڵم و ستەوكاری زوو لەچاو وون دەبـێـت من بەمـە زۆر دڵ تەنـگ دەبـم كە دەبـیـسم كچێكی نەونـەمـامـی زۆر جوان

بەهەزار نازونیاز لە كۆشی دایكیدا گەورەبووە بدرێتە زاڵمێكی درندە بەمە زۆر دڵ تەنگ دەبم، هتد...)

سەراپـا نووسیـنـەكـانی ئەو سەردەمـەی رەفیق حیلمی لە رۆژنـامـەی حەوادثـدا وەك خۆی ووتـەنی (شیعـری دەوری

مناڵی‌بوو) بریتی بوو له سۆزی دڵی لاوێکی تازه هەڵ چوو به تورکی‌یـەکی ڕەوان و به تەعبیـرێکی ئەدەبی سادەو جوان گریی دڵی خۆی لەو ڕۆژنـامـەیـەدا کردبـووەوە، ئەم نووسینـانـه یەکـەم هەنگـاوی مامـۆستـابـوو و لەوەوپـاش دەرگـایێکی بەرینی له ڕۆژنامەی (نەجمە)دا بۆ خرایە سەر گازی پشت.

**دووەم: ڕۆژنامەی (نجمە):**

هەرکه سوپای ئینگلیز گەیشتنه کەرکوك و لەو شارەدا ڕەگیان داکـوتـا، ڕۆژنـامـەی (حـوداث)یـان داخست و له جیـاتی ئەو ڕۆژنامەی (نجمە)یان دەرکرد، یەکەم ژمارەی (نجمە) له ساڵی 1918 دەرچوو تا ساڵی 1924 (شکری عبدالأحد) بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکه بوو لەو ساڵەوە تا ساڵی 1926 (وەجدی ئەفەندی) بوو به بەڕێـوەبـەری، (نجمـە) ڕۆژنـامـەیـەیێکی رامیـاری، کۆمەلایەتی، ئەدەبی)بوو، هەفتەی جارێك دەردەچوو.

مامـۆستـا ڕەفیق حیلمی له بەرگی دووەمی یادداشتـەکـەیـدا دەربارەی پەیوەندی خۆی بەم ڕۆژنامەیەوە دەڵێت:

(ڕۆژنـامـەکـەیـان ئُستـەژێـر چاورێری شکری عبدالأحدی مدیـری مەکتـەبـەکـەمـان، شکی تیـانیه شوکری جێی متمانەی حکومەت بوو، له ئەمری ئەوان نەدەچووەدەر من هەرچۆنێ بوو خۆم تێوەداو بۆ جاری یەکەم شیعری تورکیم تیابلاوکردەوە، زۆر له هاورێکانم پێیان خۆش بوو. تەنانەت ماجد له سلێمانی‌یەوە نامـەیـێـکی ستـایشی بۆ نووسیم منیش لەسـەری ڕۆیشتم و جاربـەجـار شیعـر یا وتـارێکم تیـابـلاوەدەکـردەوە، ڕۆژنامه کەوتە ڕەواج، شوکری دوارۆژی نەهاتبوە بەرچاو، ستایشەکانی خەڵقی بەلاوە خۆش بوو تا ئەو ڕۆژە له نەجمـەدا سەرووتـار نەدەنـوسـرا بەلام من نەم هێـشـت که هیـچ ژمـارەیـێـکی بێ سەرووتـار دەرچێت، باس و هەواڵی ئەو دەمـە هەرهی شەڕەکـەی تورك و یۆنان بوو. کەرکوك سرەوتی نەبوو، لەوێ نیشتمانپەروەر ئەوە بوو که باسی سەرکـەتنی لەشکـری مستـەفا کەمال بکات، ئەوانەی ڕقیـان له ئینگلیـز بوو لەشکستی لەشکـری یۆنـان دەدوان و بەمە دەردی دڵیـان سارێـژ دەکـرد، بـەڕاستی دۆستـەکانی ئینگلیز زۆر کەم بوون و ئەمـانـەش لەنـاو خەڵقا بەچاوێکی سووك تەماشایان دەکرا. . ناوی من بەهۆی (نجمە)وە له هەموو باکووردا دەنگی دابـووەوەو له دیـواخـانـەکـانـا باس باسی ڕۆژنـامەی نجمەو وتارە بەتینەکانی ڕەفیق حلمی بوو، شوکری مودیر ڕۆژێکیان بانگی کردمـه ماڵی خۆیـان ئەو شەوە تا درەنـگ بەخـواردنـەوەو قسـەی خۆش رامـان بوارد ئینجـا باسی ڕۆژنـامەکەی نەجمەی کردەوە، بەقســەی ئەو حاکمی سیـاسی زۆری گلەیی له ڕەوشتی تازەی نەجـمــه بوو دەیــویــســت منــی لێ دوور بخــرێــمــەوە.

لەلایــەکی‌تــریشــەوە ووتی لەبـەر ئەوە که تورکی باش دەزانی‌و دەنووسی ئەگەر بێتو بەڵێنی ئەوە بدەی که بەپێچەوانەی مەرام و سیـاسـەتی ئینگلیـزەکـان نەجووڵێیتەوە به جۆرێکی بۆت دادەنێن نەجمه بیەی بەرێوە دەیانەوێ هەرتۆ بەسەر ڕۆژنامەکەوەبی‌و جگه لەمـەش مەواجبێکی قەڵـەویشت بۆ دەبـڕنـەوە. من له وەلامی شوکـریـدا ووتم: ئەگـەر وا نەکـەم چی دەبێ؟ ووتی: لەپێش هەمـوو شتێکـا تۆ دەردەکـەن و دوای ئەوە لەبـەر ئەم هەڵـەیـە که کردوومەو ڕێی تۆم داوە به نووسین ڕۆژنامەکەشم لێ‌دەسێننەوە. ووتم: هەر ئەمەندە؟ ووتی: من دەڵێم ئەمەندە بەلام دوور نیە که لەمە زیاتریش بکەن. ووتم: وەکو چی؟ ووتی وەکو ئەوە له مەکتـەب دەرت دەکـەن و له عیـراقیشت بکـەنە دەرەوەو ڕەوانەی هنـدستـانت بکـەن. ووتم: گەشتێکی هنـدستـان بەخۆڕایی. شوکری تێ‌گەیشت که وشەکانی کەڵك ناگرێ‌و له دڵی منا جێ نابێتەوە، لەبەر ئەوە بڕی‌یەوە. بۆ دووسبەی بەنامەیێکی ڕەسمی میللەر مفتشی ئیداری ڕێی نووسینیان له من گرت. دوای چەند ڕۆژێکیش به تەلگـراف ئەمـری گۆرانم وەرگـرت کرابـووم به مامۆستای قوتابخانەی نموونەی سەعادەت له سلێمانی له ڕۆژی 20ی ئابی ساڵی 1921دا)

بەپێی ئەوەی دەستم کەوتـوون ڕەفیق حیلمی لەم ژمـارانـەی ڕۆژنامەی (نجمە)دا ئەم نووسینانەی بلاوکردووەتەوە:

1 ـ له ژمارە (489)ی ڕۆژی 18ی نیسانی ساڵی 1921دا سەر ووتارێك به ناونیشانی (شۆرشی کۆمەلایەتی چۆن دەکرێ؟)

2 ـ له ژمارە (490)ی ڕۆژی 20ی نیسانی ساڵی 1921دا پارچه شیعرێك به ناونیشانی (تۆ)وە.

3 ـ لە ژمارە (491)ی رۆژی 22ی نیسانی ساڵی 1921دا سەرووتارێك بە ناونیشانی (عراق و معارف).

4 ـ لە ژمارە (492)ی رۆژی 25ی نیسانی ساڵی 1921دا سەرووتارێك بە ناونیشانی (یۆنان بەپێی تێ‌روانی سەرەك وەزیرانی تورك)

5 ـ لە ژمارە (493)ی رۆژی 27ی نیسانی ساڵی 1921دا پارچە شیعرێكی شانزدە دێڕی بە ناونیشانی (شەوو خەیاڵی تۆ)وە.

6 ـ لە ژمارە (494)ی رۆژی 29ی نیسانی ساڵی 1921دا نووسینێك بە ناونیشانی (بەرەو مرۆڤایەتی)یەوە.

7 ـ لە ژمارە (495)ی رۆژی 2ی مایسی ساڵی 1921دا سەرووتارێك بە ناونیشانی (نیشتمان)ەوە.

8 ـ لە ژمارە )496)ی رۆژی 9ی مایسی ساڵی 1921دا پارچە شیعرێك بە ناونیشانی (گفتوگۆیێكی فەلسەفی لە مانگی رەمەزاندا).

9 ـ لە ژمارە (499)ی رۆژی 11ی مایسی ساڵی 1921دا سەرووتارێك بە ناونیشانی (راپەرین پاش مردن)

10 ـ لە ژمارە (500)ی رۆژی 13ی مایسی 1921دا سەرووتارێك بە ناونیشانی (لە ئەنادۆل سەرلەنوێ شەڕ دەستی پێ‌كردەوە).

11 ـ لە ژمارە (501)ی رۆژی 16ی مایسی 1921دا سەرووتارێك بە ناو نیشانی (مەلیكێك) بۆ عیراق).

ئەگەر بچینە ناوەخنی نووسینە توركی‌یەكانی مامۆستا لە رۆژنامەی (نجمە)دا دەبینین هەندێ بابەتی دڵداری لە شیعرەكانیدا هەیەو هاتووە جۆرە فەلسەفەیێك و هەندێ هێمای تەسەوفی تیادا بەكارهێناوە ، بەڵام لە نووسینە كۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و رامیاری‌یەكانیدا زۆر بە ئاشكرا دژی داگیركەر وەستاوەو داوای دامەزراندنی كۆمەڵێكی شارستانی كردووە لە نووسینێكیدا داوای ئەوە دەكات شركەیێكی گشتی بۆ سوودی گەل پێك بێت دەڵێت (بۆ چوونە پێشەوەو سەركەوتن پێویستمان بە شۆرشێكی ئابووری هەیە. ئەم شۆرشە دەبێت شان بەشان شۆرشی كۆمەڵایەتی بروات و هەردووك پێكەوە بینە بەردی بناغە، ئەم چەرخەی ئێمەی تیادەژین سەردەمی دامەزراندنی شركەتی گشتی‌یە چونكە بەهۆی ئەو هاریكاری كردنەوە كاری گەورە گەورەمان بۆ دێتەكایەوە، وەك راكێشانی خەتی شەندەفەر بۆ شارەكانمان، هێنانی ئوتومۆبیل لە دەرەوە، دامەزراندنی خەتی ترامواى ،دانانی هێزی كارەبا ـ ئەلكتریك ـ وە دەست خستنی كەل وپەل و شتومەك) لە ووتاری (عراق و معارف)یشدا دەڵێت (بە هەموو دڵنیایی‌یەكەوە دەڵێم ئەگەر ئێمە بەم جۆرە بوەستین و لە جێیٚ خۆماندا بمێنینەوە ئەوا پێشكەوتنمان مەحاڵە،

ئەمرۆ زانست و زانیاری باڵی كێشاوەتەسەر جیهان، ئێمەش وا لە تاریكستانی نەزانیندا دەژین) لەلایەكی‌تری ئەم وتارەیدا دەڵێت (لە قوتابخانەیێكی بچوك لە شاری عەمارەدا لە كاتی دابەشكردنی پاداشت بەسەر قوتابیەكاندا، دانیشتوانی شار، باوكان پێنج هەزار روپیەیان لەناو خۆیاندا بۆ قوتابی‌یە هەژارەكانی ئەو قوتابخانەیە كۆكردەوە هەروەها لە شاری بەسرەش بۆ نوێ‌كردنەوەی بینای قوتابخانەیێك لە ماوەی یەك سەعاتدا دە هەزار روپیە كۆكرایەوە، ئەمانە نموونەیێكی دڵ رفێنن و دەبێت لە هەموو گۆشەیێكی عیراقدا خۆی بنوێنێت) لەو سەردەمەدا دەنگ وباسی ئەوە بڵاوبووەوە كە یەكێك لە كورەكانی مەلیك حسێن دەكرێتە مەلیكی عیراق، مامۆستا رەفیق حلمی بەرامبەر ئەم دەنگوباسە لە مایسی 1921دا سەرووتارێكی نووسی‌و بیروراى خۆی بەم جۆرە دەربڕی كە دەڵێت (یەكێك لەو شتانەی كارێكی گرنگ دەكەنە سەر هەر میللەتێك داناتی مەلیكە، مەلیك ئاوێنەی میللەتە بەڵكو بارۆمەتری میللەتە، ئەگەر ئەو ئاوێنەیە پەڵەدار بێت میللەتەكەی پەڵەدار دەنوێنێت، بوونی حوكمدار حەدێكی جیاوازكەرەوەیە لە نێوان میللەت و مەملەكەت، وەك لە رۆژنامەی (العراق)ی هاورێدا خوێندمانەوە.

عیراق هی دانیشتوانی عیراقە ئێمە ئەمە بە هەموو مانا گشتی‌یەكەیەوە لامان پەسەندە، هێشتا ئێمە نە لەگەڵ ئەوانەین سەر بە مەلیك حسێن و نەش لەگەڵ ئەوانەن دژی وەستاون، عیراق بۆ عیراقی‌یەكانە، ئەوی مەرجی تەواوی تیادانەبێت ئێمە بە مەلیكی عیراقی قبوڵ ناكەین. هەروەها وەك بیستومانە لەم رۆژانەدا هەڵبژاردنی نوێنەران دەست پێ‌دەكات، دەبێت لە كاتی هەڵبژاردندا دانیشتوان لەژێر هیچ تەئسیرێكدا نەبن، بە

هەمــوو ئازادی‌یــەك نوێنــەری خۆیــان هەڵ بژێــرن. دانــان و هەڵبژاردنی مەلیکیش دەبێ بخرێتە دوای هەڵبژاردنی نوێنەرانی میللەت و بدرێتە دەست ئەو نوێنەرانەوە)

سێیەم: لە ڕۆژنامەی (بانگ کردستان)و (ڕۆژی کوردستان)دا:

ئەوەبوو مامۆستا ڕەفیق حلمی لەسەر نووسینە

شورشگێــرەکــانی لە ڕۆژنــامــەی (نجمــه)ی سەر بە ئینگلیــز دوورخــرایــەوەو نەقڵی سلیمــانیش کرا، ساڵێکی بەســەرنــەچــوو سەردەمی حوکمــرانی شێــخ مەحمــود دەستی‌پێ‌کــردو ئەم دوو ڕۆژنامەیە هاتنە کایەوە:

1 ـ ڕۆژنامەی (بانگ کردستان) لە ساڵانی 1922و 1923 چوارده ژمــارەی لێ‌دەرچــوو لە ساڵی 1926یشــدا سێ ژمــارە. خاوەن ئمتیــازو بەرێــوەبــەرو سەرنــووســەر (مصطفیٰ پاشــای یاموڵکی) بوو، محرر کوردی (علی کمال و م ـ نوری) و محرر تورکی (ڕەفیق حیلمی)بوو

2 ـ ڕۆژنــامــەی (ڕۆژی کوردستــان) لە ساڵانــی 1922و 1923 لە حوکمرانی شێخ مەحموددا شانزده ژمارەی لێ‌دەرچوو خاوەن ئیمتیازو بەرێوەبەر (م ـ نوری)و نووسەر (علی کمال)بوو.

ئەم دوو ڕۆژنامەیە بە کوردی و تورکی بوون جاربەجار چەند دێرێك یا پارچە شیعرێك فارسیشی تێدابوو.

مامۆستا ڕەفیق حلمی نووسەری بەشە تورکی‌یەکەی هەر دوو ڕۆژنــامــەکــە بوو، بەنــاوی خۆیــەوە لە بانگی کوردستــانــدا ئەم نووسینانەی بڵاو کردوەتەوە:

1 ـ هۆی دواکەوتنی کوردستان ،نووسینێك لە ژمارە (1)دا رێــکــەوتــی 2ی ئابــی ساڵــی 1922 ـ لە هەمــان ژمــارەدا نووسینێکی‌تــر بە ناونیشــانی (بــۆ ئەو کوردە روونــاکبیــرانــەی لە دەرەوەی کوردستاندا دەژین)

2 ـ لە ژمارە دوودا، دوو نووسین ،(یەکەمیان) بە ناونیشانی (صنایع و معارف) تێدا گرنگی زانست و پیشەسازی دەردەبرێت (دووەمیان) پارچە شیعرێك بە ناونیشانی (ئەخلاقی)یەوە باسی خوورەوشتی پاك دەکات.

3 ـ لە ژمــارە چواردا نووسینێــك بە ناونیشــانی (معــارفــز برقومك حق حیاتی یوقدر ـ واتە قەومی نەخوێندەوار مافی ژیانی نیە).

لە ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستانیشدا ئەم نووسینانەی هەیە

1 ـ پارچــە شیعــرێــك بە ناونیشــانی (بــوزلی داغلردن) واتــە (لەچیا زۆر ساردەکانەوە)و لە ژێریدا نوسراوە (شاعر وطن پرور رفیق حلمی أفنــدی طرفنــدن گونــدرلمشــدر، واتــە، لەلایــەن شاعیری نیشتمانپەروەر ڕەفیق حلمی ئەفەندی‌یەوە بۆمان هاتووە.

2 ـ لە ژمــارە سێ، هەمــان ڕۆژنــامــەدا پارچــە شیعــرێــك بەناونیشانی (وطن امدادینە ـ واتە ـ بگەنە فریای نیشتمانەوە)

نووسینــە تورکی‌یــەکــانی ڕەفیق حلمی لە فەرمــانڕەوایی شێخ مەحمووددا مۆرکی کوردایەتی پێوە ئاشکراو دیارە، بانگەوازێکە بۆ یەك گرتن و وەرگرتنی خوورەوشتی چاك و ڕووکــردنــە فێربوون و پیشــەســازی‌و خوێنــەواری، لە ژمــارەیێکی بانگی کوردستــانــدا دەڵێت (یــەکــەم هۆی دواکــەوتنمــان نەخــوێنــدەواری‌یــە ئیستــا وادەبینین نەتــەوە تازە پێشکــەوتــووەکان شان بەشان نەتەوە خاوەن مێــژ ووەکــان بەرەو پێشـــەوە هەنــگــاو دەنێن، کەچی کوردی بەدبــەخت هێشتــا لەنــاو گۆمی ئەفســانــەدا دەژی ،ئەم ڕاستی‌یە هەرچەندە قورس و گرانە بەڵام دەبێت دانی‌پیابنێین کەوا میللەتی ئێمە هێشتا نەگەیشتوەتە حەدی بلوغ، میللەتێك کە بیەوێ بگاتە ئەو حەدە دەبێت بیــروڕای نوێ وەربگــرێت ئەمــەش بە هۆی خوێنــدن و خوێنــەواری‌یــەوە دەست دەکەوێ بۆ ئەوەی مێشکمان ڕووناك بێتەوە دەبێ زانستی نوێ وەربگرین، ڕادەی زانیاری هەر میللەتێــك بە ژمــارەو چەشنی قوتــابخانەکانی دەپێورێت، بەردی بنــاغــەی کۆمــەڵمــان ئەوەیــە دەبێ بە چرای زانستی شەوەزەنگی نەزانین لەنــاوبــەرین ،هــەوڵ بدەین لە خۆپــەرستی خۆمــان دووربخەینەوە بە دڵسۆزی‌یەوە کوردایەتی بکەین، با بۆ نیشتمانە خۆشــەویستــەکــەمــان بکۆشین) لە پارچــە شیعــرەکــەی ڕۆژی کوردستــانیشــدا دەڵێت (لــە چیــا زۆر ساردەکــانەوە ئاڤگەکان بە ئاوی زیوین داوێنی چیاکان ئاوپەرژێن دەکەن، ئەی کوردستان من مەفتــونــی تۆم، تۆ زۆر جوانیــت، تۆ دڵ کەشیــت، لە تۆ پیــرۆزتــر هیــچ شوێنێــك شك نابــەم، تۆ دنیــاو بەهــەشتی منی لەناوتۆدا چاوم هەڵیناوە، تۆ مەڵبەندمی، گوڵکوکەشم هەر لەناو جەرگی تۆدا دەبێت).

ئەگــەر بێتــو ئێمــە هەمــوو نووسینــە تورکی‌یــەکــانی مامۆستای

خوالیٚ خوشبـوو لەم چوار رۆژنـامـەیەدا بخەینەروو شی بکەینەوە مەگـەر تۆو لۆی کتێبێـك بیگـرێتـەخـۆی، ئەگینـا لە کۆرو دانیشتنێکی وەك ئەمـڕۆدا مەگـەر گولـدەستێـك هەڵبـژاردەتـان پێشکەش بکەین و بەس لێرەدا دەبیٚ ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە یەکـەم پارچـە شیعـری کوردی خۆی لە ژمـارە دووی بانگی کوردستان بە ناونیشانی (بۆ کوردان) بلاوکردوەتەوە کە تیادا دەڵێت:

همـت ئەربـاب غیـرەت بێستـون ئیمحـا دەکـا
ئەو کەسـەی صاحب حمیـەت بیٚ وەتـەن ئیحیـا دەکا
یەعنـی ئەولاد وطنـی موحتـاج عیلم و صنعتـە
گر وطنپـەور بیٚ شخص مەکتـەبیٚ ئینشـا دەکـا
نورعـلم و معـرفـت وا شەرق وغـەربـی گرتـەوە
قەوم ئێـمـە تازە تەعـلیـم خط و إمـلا دەکـا

بەشی دووەم:

نامیلکەو کتێبە تورکییەکانی رەفیق حیلمی:

دکتۆر (شکری محمد سەگبان) یەکێك بووە لە رۆشنبیرەکانی کوردی تورکیا ،لە ئەوروپا خوێندن تەواو دەکات و بە پزیشکی دەگـەرێتـەوە وولات و لە ئەستـەموڵ دادەنیشێت، رۆژنـامـەی (کـوردستـان) کە لە سالانـی 1917و 1918 محمـد میهـری دەری دەکـرد بەم چەشنـە بەتورکی ئەم دەنگوباسەی بلاو کردوەتەوە (دکتۆر محمد شکری بك ـ ئەم دکتـۆرە زانـاو بەرێـزەمـان رۆژی هەینی لیٚدەرچێت هەمـوو رۆژێـك لە بەیـانییـەوە تا ئێـواریٚ بەرامبـەر قوتابخانەی غلطـە سرای لە ئوتیلی سعیـد پاشـا پێشـوازی نەخـۆشـەکـان دەکـات و بە شێـوەیـەکی نویٚ چارەسـەری نەخـۆشییـەکـانیـان دەکات) ئەم روناکبیرە لە کۆمەڵ و رێکخراوە کوردییەکانی ئەو سەردەمـەدا دەبێتـە ئەنـدام و داوای مافی کورد دەکـات، پاش نوشـوستی هێنـانی بزوتنـەوەی کوردایـەتی لە تورکیـادا، مستەفا کەمال فەرمانی گرتنی دەردەکات ئەمیش لەگەڵ خلوصی بەگ و زین العابدین ئەفەندیو بە دەیان لە نیشتمانپەروەرانی کورد روو دەکـەنـە خاکی عیـراق و دەبنـە پەنـاهـەندە ئەمە لەدوا ساڵەکانی بیست، لە بەغداد پەیوەندی لەگەڵ محمد ئەمین زەکیو توفیق وەهبیو رەفیق حیلمیـدا دەبـەستێت، شکـری محمـد سەگبـان چەند کتێبێکی چاپ کردبوو لەوانە یەکێکیان لە ساڵی 1923 لە بیـروت بە ناونیشـانی (کـوردلـر تورکلردن ئەئیستیـورلـر؟ واتـە کوردەکـان لە تورکـەکـان چییـان دەوێت) لەم کتێبە بەرپەرچی نائبی دیـاربـەکـر فەیض بەگی داوەتـەوە کە کوردبـووەو تورکچێتی کردووە، شکـری سەگبـان لە عیـراقـدا زۆر رێـزیگیـراوە ،لـە سەرەتای سییەکاندا دەچێتە پاریس وادیارە لەویٚ کاربەدەستانی تورك پێوەندی پێوە دەکەن و کاریتیٚ دەکەن ئەویش بیروباوەری پێشوی گۆڕیو دەچێتە ریزی کوردە تورکیزمەکان و بۆ رەزامەندی کاربەدەستانی تورك لە پاریس کتێبێك بە فەرەنسی بە ناونیشانی (گیروگرفتی کورد ـ المسأله الکردیه لە ساڵی 1933 لە چاپ دەداو بلاودەکاتەوە، ژمارەیێك لەم کتێبە دەکەوێتە دەست مامۆستا رەفیق حلمی مامـۆستـاش لە ساڵی 1935دا نامیلکـەیێـك بە تورکی بە ناونیشـانی (کـورد مسألـەسی صفحـاتنـدن ـ چەنـد لاپەرەیێك لە گیروگرفتی کرد) لە چاپ دەداو بلاودەکاتەوە لەم کتێبەیدا بیرورا هەڵەکانی شکری سەگبان بەرپەرچ دەداتەوە کە تیادا ئەوەی دەربریبوو کە کورد نە لە رەگەزی ئارییەو نەسامی بەڵکو دەچێتەوە سەر رەگەزی طورانیو داوای کردبوو کوردو تورك یەك بگرن و پێکەوە بژین هەروەها کوردی لە ماد جیاکردوەتەوە، رەفیق حیلمی ئەوەی دەربـڕیبـوو کە شوکـری سەگبـان دوو شەخسیـەتی جیـاوازی هەیـە لە شەخسیـەکی ژمـارە یەکـەمـدا کوردپەروەر بووە کەچی لە شەخسیەتی ژمارە دووەدا چوەتە کۆشی تورکیزمەکان و پشتی لە کوردایەتی کردووە.

لە ساڵی 1954دا مامـۆستـا رەفیـق حیـلمی ئەم کتێبـە تورکییـەی لە شێـوەی ریـزە مەقـالاتێکـدا کردە عەرەبیو لە رۆژنـامـەی (الایـام)ی بەغـدادی بلاوی کردەوە لە ساڵـی 1956یشدا ئەم مەقالانەی لە کتێبکی سەربەخۆدا لە چاپداو بلاوکردەوە.

وەك لە رۆژنامەی (ژیان)ی ساڵانی سیدا چاوم پیٚکەوتوە رەفیق حلمی رۆمانی (رۆستەم)ی لە تورکییەوە کردوەتە کوردی بەڵام هەرچەندە کۆشام و گەرام سەرو سۆراخێکی ئەو رۆمانەم دەست نەکـەوت وا بەدەستمـەوەیـە لە رۆژانی داهـاتـوودا کارە تورکییـەکـانی مامـۆستـای خوالیٚخۆشبوو کۆبکەمەوەو زیاتریان لەسەر بنووسم.

# رەفیق حیلمی و سەرەتای رەخنەی زانستی لە ئەدەبی کوردیدا

● ئومێد ئاشنا ●

«ئەی رەفیقی موحتەرەم ئەی شاعیری شیرین مەقال
هاتەبەر مەدی نەزەر فکرت وەکو ئاوی زولاڵ
من ئومێدی گەورە گەورەم پێتە بۆ ئەم میللەتە
حەیفـە سەرفی فکـری خۆت کەی تۆ لە زولف و خەتوخاڵ»

- زێوەر -

دەتـوانیـن بە بەڵگـەوە بی‌سـەلمێنین، کە رەخنـەی هاوچـەرخ و زانـسـتـی لە ئەدەبـی کوردی‌دا لە رەفیـق حیلمی‌یـەوە دەستی‌پێ‌کـرد. بڵاوبـونەوەی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی بەرگی یەکـەم ساڵی (1941) بزوتنـەوەو گۆڕینی تەواوی خستـەنـاو جیهـانـە کپ و کۆنـەکـەی رەخنەوە. بە جۆرێـك ئەو پێـوانـەو بۆچوون و کەرەسە رەخنەگریانەی لەو کتێبـەدا هاتبـوە ناوەوە نەك بۆ ئەو سەردەمـە، کە چل وچوار ساڵ لەمـەوپێش دەکـات، بەڵکـە هەنـدێکیـان ئێستـاش بەکـاردێن و رەخنـەگر دەبێت لە نزیکـەوە شارەزایان بێت.

باری رەخنـەی ئەدەبـی کوردی پێش دەرچـونی شیعـرو ئەدەبیـات نووسین و بۆچـوونی ئەو تونێ تێـدا نەبـوو کە شیعری شاعیرە کوردەکان لێك بداتەوەو هەڵیان بسەنگێنێ‌و نرخی فیکـری‌و هونـەری خۆیـان بداتێ. ئەو هەوڵانەی کە هەبوون بە لای ئێمەوە لەلایەن چوار کەسەوە خرابونەروو

هەوڵی یەکـەم زنجیـرە نووسینـەکـەی شێـخ نوری شێخ ساڵح لە (ژیان)دا ساڵی ـ 1926 لە ژمارە (20) بەناوی (ئـەدەبیـاتی کوردی) ـ ئەم زنجیـرە نووسینـەی شێخ نوری تایبەت نەبوو بە هەڵسەنگاندن و نرخاندن و رەخنەلێ گرتنی بەرهـەمی شاعیـرێـك یاخـود رێبـازێکی ئەدەبی یاخـود قونـاغێکی ئەدەبی کوردی بەڵکـە بریتی‌بوو لە باس کردن و نمونە بۆهێنانەوە بە شیعر بۆ یاساگشتیەکانی شیعر لە رووی شێـوەو ناوەرۆکـەوە. ئەم بەرهـەمـەی شێخ نوری ئەگەرچی زۆر لەوەی رەفیق حیلمی کۆنترە لە رووی مێژووەوە نرخی تایبەتی خۆی هەیە بەڵام لە رووی کارتێ‌کردن و تایبەتیەتی شیعـری کوردی‌و لێکـدانـەوەی بەرهەمی شاعیرە کوردەکان وەك شتێکی تیوری‌و گشتی مایەوە.

شێخ نوری لەو زنجیرە نووسینەدا دیارە پشتی بە چەند سەرچـاوەو کتێب بەستبـوو چونکی نووسینـەکە خۆی باسی زانست و یاسـا گشتیــەکـانی شیعـرو ئەدەب دەکـەن، ئەو سەرچـاوانـەش کوردی نەبـوون، بەڵام بەداخـەوە نووسـەر ناوی سەرچاوەکانی نەبردوە.

هەوڵی دووەم لەلایـەن ـ رەشیــد نەجیب ـ ەوە بوو. ئەمیش بە زنجیـرە وتـارێـك کە نزیـك بوو لە مەبەستەکانی زنجیـرە وتـارەکـەی شێـخ نووری لە رۆژنـامـەی ژیان ـ دا ساڵی ـ 1928 ـ دەستی‌کرد بە بڵاوکردنەوەیان.

هەوڵی سێ‌یــەم لەلایـەن پیـرەمێـرد ـ ەوەبـوو، ئەمیش هەروەك ئەوەی کە لاسایی شێخ نووری‌و رەشیدنەجیب ـ ی کردبێتــەوە لە رۆژنـامـەی ژیـان دا ساڵی ـ 1932 ـ بە زنـجـیــرە چەنـد نووسـیـنێکی دەربــارەی یاسـا گشتی‌و بنـەرەتیـەکـانی شیعـرو ئەدەب بڵاوکردەوەو تایبەت نەبوو بە رەخنەو هەڵسەنگاندنی شاعیرانی کورد.

هەوڵی چوارەم لەلایەن عەلی باپیر ئاغا ـ ی شاعیرەوەبوو لە کتێبی ـ گوڵ دەستــەی شوعـەرای هاوعـەسرم ـ دا ئەم کتێبە لە دوو لایەنەوە تەماشا دەکرێت:

لایەنی یەکەم ئەوەیە وەك ئەو زنجیرە نووسینانەی باسمان کرد دەربــارەی شیعـرو ئەدەب ئەم زانستی نەبـوو وە هیـچ سەرچـاوەییکی بۆ بەکـار نەهێنـابـوو تەنهـا بیـرو لێکدانەوەو چێژی شیعرو شاعیریەتی خۆی نەبێ.

لایــەنی دوەم کە رێگــای سەرکـەوتنی بۆ خۆش کردوەو جێگەی سەرنج دانە ئەوەیە کتێبەکە تایبەتە بە شیعری چەند شاعیرێکی ناسراو و ناوداری کوردی ئەو رۆژگارە، بە چەند رستـەییکی کورت وەك پێشـەکیـەك باسی ساڵی لەدایـك بوون و پلەی خوێنـدن و جۆری وەزیفـەی شاعیـرەکـان دەکــات و بە دوو سێ رستــە رادەی شاعیـریـەتیـان

هەڵ دەسەنگێنێت ئەوەندەی کە خۆی لە شیعرو ئەدەب و بەرهەمی ئەو شاعیرانە گەیشتبێ ئنجا یەك دوو شیعری شاعیر بۆ نمونەی شاعیریەتیان دەنووسێت.

ئەم کتێبەی عەلی باپیرئاغا ساڵی (1939) بڵاوبووەوە وەك مێژوو دوو ساڵ پێش بڵاوبوونەوەی کتێبی شیعرو ئەدەبیاتی ڕەفیق حیلمی بوو. ئەگەر بێت و بەراورد بکەین لە نێوان کتێبی ـ گوڵ دەستەی ـ عەلی باپیرئاغاو شیعرو ئەدەبیاتی ڕەفیق حیلمی لە هەموو ڕوویەکەوە ئەوا نیسبەت لە نێوانیان دا نیە چونکە ـ گوڵ دەستە ـ دانانرێت بە لێکۆڵینەوەو ڕەخنە سەبارەت بە شیعری ئەو شاعیرانەی باس کراوە بەڵکە تەنها چەند بیروڕاییکی تاکەکەسی ڕاگوزاریە.

ئەگەر چی هەر لە ساڵی ـ 1926 ـ وە کە ڕۆژنامەی ـ ژیان ـ دەرچووە هەتا ساڵی ـ 1941 ـ کە شیعرو ئەدەبیاتی کوردی بڵاوبووەوە ناوبەناو پیرەمێرد لەو ڕۆژنامەیەدا باسی شاعیرێك یاخود نووسەرێکی دەکرد وەك نالی و حەمدی و مەحوی و شێخ ڕەزاو گۆران. بەڵام ئەم لێ دوان و لەسەر نووسینانەی پیرەمێرد «جگە لە نووسینەکەی لەسەر گۆران و حەمدی» ئیتر هەموویان بەبۆنەی لە چاپ دانی دیوانەکانیانەوە بووە.

ئەو نووسینانەی پیرەمێرد ناچێتە ڕیزی ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی بەرهەمی شاعیرەکانەوەو زیاتر باس کردنی شاعیرەکەیە نەك شیعرەکانی.

ئنجا لەم کپی و مەنگی و دەگمەنی ڕەخنەیەدا ساڵی (1941) کتێبی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی کەوتە بەرچاوی ئەدیبان و خوێنەرانی ئەدەبی کوردی، بووە جێی ڕەزامەندی و بایەخ و لەلایەکی تریشەوە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە بووە سەرچاوە بۆ هەر نووسەرێك ویستبێتی سەبارەت بە شیعرو ئەدەبی کوردی بنووسێت. لەدوای ئەمەش پاش تێپەڕینی پانزە ساڵ بەسەر دەرچونی بەرگی یەکەمی شیعرو ئەدەبیاتی کوردیدا واتە ساڵی 1956 ڕەفیق حیلمی بەرگی دووەمی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی بڵاوکردەوە.

ئەمجارەیان وەکو ڕەخنەگرێکی پێگەیشتو و دەوڵەمەند بە ڕۆشن بیری ڕەخنەیی و کەرەسە زیندووەکانی ڕەخنە هاتە پێشەوە. بەم کارە نەمرو گەورەیە ڕەفیق حیلمی بوە سەرەتای ڕەخنەی زانستی لە ئەدەبی کوردیدا بەمە ماڵی ئەدەبی کوردی ئاوەدان کردەوەو مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی ئاوەدان کردەوەو مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی بۆ دەست نیشان کردین ئێستا دەتوانین بڵێین مێژووی ڕەخنە لە ئەدەبی کوردیدا مێژوویەکی دوورو کۆن نیە بەلای منەوە وەك بە بەڵگەوە لەم نووسینەدا. دەی سەلمێنین لە بڵاوبوونەوەی بەرگی یەکەمی شیعرو ئەدەبیاتی ڕەفیق حیلمی یەوە دەستی پێ کرد وەك لە سەرەتادا ووتمان دەکاتە چل و چوار ساڵ لەمەوپێش.

بەرگی دووەمی ئەم کتێبە گەلێ جیاوازی هەبوو بە بەراورد لەگەڵ بەرگی یەکەمدا. لە بەرگی دووەمدا هەڵسەنگاندنە ڕەخنەییەکانی نووسەر زانستی ترو مەوزوعی تر دەردەکەون. هەر سێ لێکۆڵینەوەکەی دەربارەی شێخ نوری و گۆران و دڵدار سەلماندی کە ڕەخنەی ئەدەبی کوردی شان بەشانی نوێ بوونەوەو داهێنانەکانی جیهانی نوێی شیعری کوردی لە ڕێگادان. لە ڕێگەی شیعرەکانی دڵدارو شێخ نوری و گۆران ـ ەوە قۆناغی وریابونەوە ـ ڕاپەڕین ـ النهضە ـ و نوێبونەوە ـ التجدید ـ ی لە ئەدەبی کوردیدا دەست نیشان کرد. نووسەر بەمەوە نەوەستاو ساڵی (1958) لە گۆڤاری ـ پێشکەوتن و ـ شەفەق ـ دا دەستی دایەوە نووسین سەبارەت بە مێژووی ڕەخنە بە گشتی و ڕەخنەی ئەدەبی کوردی بە تایبەتی بە زنجیرە ئەم هەوڵە نەمرەی پەرەپێ دا. لێکۆڵینەوە پڕ بایەخ و زانستیەکەی بەناوی ـ ئینقلاب لە شیعری کوردی ـ دا ـ کە ساڵی 1958 لە گۆڤاری ـ پێشکەوتن ـ دا بڵاوی کردەوە بووە ڕابەرێکی زانستی بۆ هەموو ئەوانەی دەیان ویست لە مەسەلەی نوێبونەوەی شیعری کوردی بگەن.

بەرگی یەکەمی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی باسی چواردە

شاعیر دەکات، نووسەر ئوسلوبێکی تایبەتی خۆی گرتووەو کردویەتیە بەرنامەیێکی ڕەخنەیی و لە بەرگی دووەمیشدا هەمان بەرنامەی بەکارهێناوە ئەویش باس کردنی کەسێتی شاعیرەکەیە لە سەرەتاداو جا لێکۆڵینەوەو ڕەخنە سەبارەت بە شیعرەکان. نووسەر لە پێشەکی کتێبەکەیدا مەبەستی خۆی لەو نووسینانە ئاشکرا دەکات و دەڵێت [ئەم چەند لاپەڕەیە کە ئاوێنەیەکە - صورەت وسیرەتی - هەندێ لە شاعیرە ناودارەکانی کوردستانی عیراق بە وێنەی دەسکەگوڵێکی ڕەنگاوڕەنگ و بۆن خۆش دەرئەخا کە هەر گوڵێکی لە باخێك هەڵ بژێررابێ پێشکەش لاوانی کوردو بە تایبەتی پێشکەشی ئەو قوتابیە خۆشەویستانە ئەکەم کە لە قوتابخانە بەرزەکان دا ئەخوێنن و لەوێدا لە شیعرو ئەدەبیاتی کورد شتێکیان بەرچاو ناکەوێت. ئەگەر بەم - سیپارە - بچوکە توانیبێتم کە گیانی - ڕۆحی - ئەدەبی ئەوان بجولێنمەوە، هەر تەقەلایەك کە بۆ پێك هێنان و وەدرهێنانی بەرگی دووەم ئەیدەم لەلام سوك ئەبیٰ و گیانی نیشتمان پەروەریم تازە ئەبێتەوە][2]

لێرەدا نووسەر چوار مەبەست دەست نیشان دەکات:-

1 - مەبەستی ئەوەبووە شیعرو ئەدەبی کوردی وەك هەر یەك لەو بابەتانەی لە زانکۆکاندا قوتابیانی کورد بە دەرس دەیخوێنن ئەم بەرهەمەی ئەویش بتوانێ وەك یەکێك لەو دەرسانە لە زانکۆدا بخوێنرێ بەمەبەش دیارە قوتابی کورد لە مێژ وی زمان و ئەدەبی میللەتەکەی شارەزا دەبێ کە زمان و ئەدەبیش یەکێکە لە خاسیەتە بنەڕەتیەکانی بوونی هەر میللەتێك.

2 - نوسەر ویستویەتی بەو کارە گیانی ئەدەبی لەو خوینەرو قوتابیانەدا. دورست بکاو گەشەی پی بدات چونکە. دیارە کە گیانی ئەدەبی لە هیچ روژگاریکدا لە گیانی نەتەوەو خوشی و نەخوشیەکانی لە ئازارو ئاواتەکانی جوی نەبوتەوە...

3 - ئەم کارە لای ئەو دەبێتە نوێبوونەوەو بەگوڕبونەوەی ئەو گیانی نیشتمان پەروەریەی کە هەر لە سەرەتای تەمەنەوە نووسەر خولیای بووە لە ناخیدا ژیاوە

4 - ئەو کتێبە سەرەتاو ڕێخۆش بونێك بووە لای نووسەر بۆ نووسینی بەرگی دووەم. ئەوەبوو ساڵی - 1956 - بەرگی دووەمی چاپ کرد.

ئەگەر مەرگ مۆڵەتی بدایە نیازی وابوو بەرگی سێیەمیش لەم کتێبە بە نرخە بنوسێت و بلاوی بکاتەوە. نوسەر دەڵێت «هەوڵ ئەدەین کە ناوبەناو چەند بویژێك لەناو ئەمانەی کە باسیان کراوە بە تایبەتی لەوانەی دیوانێکی لە چاپ دراویان نیەو یا شتێکیان دەربارە نەنو سراوەتەوە هەڵبژێرین و نامیلکەی سێهەمی لێ ڕێك بخەین»[3]

ئەمە دەربارەی پێشەکی بەرگی یەکەم و لە پێشەکی بەرگی دووەمیشدا گەلێ زانیاری بەسوودی بۆ تۆمار کردوین و ڕایێکی گرنگ دەربارەی دەوری ئەدەب لە گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵدا دیاری دەکات و دەڵێت:

«بوێژەکان و ئەدیبەکانی کورد بەرامبەر بە قەومی خۆیان پێویستیەکی گەورەیان لەسەرە ،مێژوو لە دوا ڕۆژ لەناو وێژەو وتارەکانی ئەوانا بۆ هۆی دواکەوتن و، پێشکەوتنی کورد ئەگەرێ»[4] ڕەفیق حیلمی ویستویەتی بڵێ - ئەدەب ئاوێنەی میللەتە - شاهێدی ڕاست گۆی ئەو سەردەمەیە کە تیایدا لە دایك دەبێ. لەلایەکی کەی پێشەکیەکەدا چەند زانیاریەکی نوێمان پێشکەش دەکات ئەویش ناوهێنانی چەند شاعیرێکی هاوچەرخە کە ڕۆڵێکی دیاریان لە ئەدەبی کوردیدا بینیوەو هەندێکیشیان دەستیان لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا هەبووەو نووسەر باسی ئەوە دەکات کە ئەمانە لە شاعیرە بەرزەکانن و بەلام پێویستی بە کەسانی دڵسۆزو شارەزا هەیە کە بەرهەمیان بدۆزێتەوەو بیان خاتەروو چونکە تا ئەو کاتەی نووسەر ئەمەی نووسیوە بەرهەمیان زۆر کەم بگرە نادیار بووەو بەداخەوە هەتا ئێستاش چ وەك کتێب و یاخود لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردیەکان دا هیچ شتێك دەربارەی ئەم شاعیرانە نەنووسراوەو شیعریان لە کونجی تاریکی لەبیرچونەوەو ون بوندا ماونەتەوە، نووسەر دەڵێت: «ڕەشید قادر ئاغا - برا بچوکی محمود ئەفەندی قادر ئاغای

ڕەئیسی پێشوی بەلەدیەی سلێمانی بوە بەلاوی و لە کاتی شەڕی گەورەی یەکەما ئەمری خوای کرد». [٥] ڕەفیق حیلمی ناوی ئەم شاعیرانەی لە ڕیزی نالی و مەحوی و هجری و شێخ ڕەزاو مەولەوی دا نووسیوە هەروەها ناوی ئەم شاعیرانەشی نووسیوە کە بەداخەوە بیرچونەتەوەو شیعریان دیار نیەو نووسەر لە ڕیزی شاعیرە ـ تازەوتجدد پەروەرە کاندا ناویان دەبات. ئەمەش ناوی ئەو شاعیرانەیەو تکایە هەر ڕۆشن بیرێك شیعری ئەمانەی لەلا هەیە لە بلاوکردنەوەیان دریغی نەکات چونکە سامانێکی گرنگی ئەدەبیمانە:ـ

1 مستەفای شێخ سەلام

2 ـ سەعیدفەوزی

3 ـ ئەورەحمان بەگی نفوس

4 ـ بێ باك

5 ـ شارەزووری. تەنانەت نووسەر سەبارەت بەم شاعیرانە پێ دادەگرێت و دەڵێت و «هەموو شاعیرن، هەندێکیان لەوانەن کە ئەشێ بەتایبەتی نامێلکەیەکیان دەربارە بنووسرێتەوە». [6] ئەمجا کە تەماشای سەرانسەری نووسین و ڕەخنەو لێکۆڵینەوەکانی نووسەر دەکەین لە ڕادەی ڕۆشن بیری ڕەخنەیی و توانای سەلماندنی زانستی بە بەڵگەو چۆنیەتی بڕیارەکانی تێ دەگەین ئەوی ئاشکرایە هەر ڕەخنەگرێك بەرنامەی ڕەخنەیی خۆی هەیەو کەرەسەی ڕەخنە گریەکەی ڕادەی ڕۆشن بیریەتی ڕەخنەگر کاتی باسی شیعر دەکات لە دوو لایەنەوە لێکی دەداتەوە یەکەمیان لایەنی ستاتیکی شیعرەکەو کاری هونەرکاری و سەلیقەی شاعیر، لایەنی دوەم بابەتی شیعرەکەو جۆری بیرکردنەوەی شاعیرەکەیە.

سەبارەت بەلایەنی یەکەم با تەماشای ئەم واتاو شانە بکەین کە ڕەخنەگر بەکاری دەهێناو هەریەکە لە جێگای خۆیدا دادەنا وەك ئەم وشەو واتایانە «وەسف، شعوری قەومی، فەلسەفەی ژیان، کلاسیك، ڕۆمانتیك، واقیعی، سنعەت، مەقسود، الضروره المقبولە، نعت، سەلیقەی ئەدەبی، شیعری چیرۆك، تەفکیری عەسر، نظم، نثر، تجدد پەروەر، زەهراوی شارستانیەت، بۆدەقەی ئەدەبی، صورت و سیرت، تعلیل، تشبیەو إستعارە، جناسی تام، صدرو عجز، الأصوات المتألفە، الأصوات المتنافرە».

دەربارەی لایەنی دوەمیش هەمیشە هەوڵی داوە ڕادەی بیروباوەڕی نەتەوایەتی خۆیواتەی ـ فکری قەومی ـ لە شیعری شاعیرەکاندا بدۆزێتەوەو دەست نیشانی بکات. بۆ نمونە دەربارەی (ئەسیری) شاعیر دەڵێت:ـ «تا ئێستە ئێمە توشی شیعرێکی غرامی نەبوین و لەمەش وا دەرئەکەوێت عەشقی وڵات ئەوی کردوە بە شاعر ئەگینا لەبەر ئەوە نیە کە شاعیر بێ و ویستبێتی پەیرەوی شاعیرانی عەسری بکاو شیعری نیشتمانیش بڵێ» [٦] هەروەها سەبارەت بە ـ بێخود ـ دەڵێت:ـ

«بەڵام ئێمە بێخودمان بۆ ئەم نوعە شیعرو سەناعەتانە ناوێ و نامانەوێ کە ئیتر وەسفی زولف و پرچمان بۆ بکا وەیا مەرسیە بۆ مردوو بنوسێتەوە حەتا نایشمانەوێ هەر بە مەدحی پێغەمبەرەوە خەریك بێ و بۆ ئاخیرەتی هەوڵ بدا بەڵکو هیوامان وا پێیەتی کە ماوەی عومری خۆی سەرفی دیوانێکی عەسری و تازە بابەت بکا بۆ شیعری بەرزو ڕەنگینی نیشتمان پەروەرانە». [٤]

ڕەفیق حیلمی لەو ڕۆژگارەدا پەیوەندی دیالیکتیکی نێوان شێوەو ناوەڕۆك دەدۆزێتەوە. شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی دەکات بە نمونەی پێکەوەبەستنی تەکنیکی هونەری لە شێوەدا بیری بەرز لە ناوەڕۆکدا. لە ئەنجامدا دەیسەلمێنێت کە بابەت و ناوەڕۆك چەندە گرنگ و لە بیرێکی بەرزەوە هەڵ قوڵا بێ ئەگەر تەکنیکێکی نوێ و لەباری لەپێناودا ساز نەکرێت ئەوا نابێتە شیعرو شیعریش بێت لاواز دەردەچێت. نوسەر دەڵێت «ئەگەر لەبەر ئەهمیەتی گیان ـ روح مادەی ئیهمال نەکردایەو بە تەنگ ڕازاندنەوەی ئەو شیعرانەوە ببوایە زۆر بە ئاسانی ئەمەی بۆ دەچوە سەرو ئەیتوانی بیانخاتە وێنەیەکی جوانترو بەرزتری

ئەدەبــی یــەوە. بەڵام وەك وتــمــان حاجی مەبــەسـتــی شیعـرداڕشتن نەبـوەو فکـر داڕشتن بوە[٤] نووسـەر سەرەتای بەرگی یەکەمی کتێبەکەی بە ـ حەمدی بەگی ساحێب قران دەست پێدەکـات ،وەك ڕەخنـەگـرێکی وریـا شیعـرەکانی حەمدی دەکات بە سێ بەشەوە، وەسف و شعوری قەومیو فەلسەفەی ژیان. نووسەر باسی وردی بیرو جوانی ـ تشبیه ـ دەکـات لە شیعـرەکـانی حەمـدیدا، کە ئەمـە سەرەتـای بەهرەو هەڵچونی دەسەڵاتی ڕەخنەگرانەی ئەو بون بە هۆی ئەوەی کە زمـانی تورکیو فارسی باش زانیـوە. لە هەمـان کاتدا هەندێ جار ڕەخنەیێکی بەراوردکاری دروست کردوە لە نێـوان شیعــری شاعیـرانی کوردو فارس یاخـود کوردو تورك. بەڵام لەم بیـروڕایـەدا ڕەخنـەگر نیشانی نەپێکاوە کە وەهــا دەزانـێت حەمــدیو ئەحمــەد موختـــار بێئــاگـــاو نەشــارەزابـوون لە ئەدەبی نەتـەوەکـانی دەوروپشتیـان وەك عەرەب و تورك وە نەیان توانیوە سوود لە شیعری شاعیرانی ئەم نەتەوانە وەرگرن. بەڵێ ڕاستە تواناو بەهرەی زاتی هەر شاعیـرێ هۆی یەکـەمـە بۆ ڕادەی شاعیـریـەتی بەڵام زۆر شاعیرمان هەن ئەگەر کاریگەری ئەدەبی گەلانیتر نەبوایەو زمـانیـان نەزانیـایە ئەو شاعیرەیان لێدەرنەدەچوو. حەمدیو ئەحمــەد موختـــاریش بێبــەش نین لە کاریگـــەری نەك شاعیــرانی تورك و هیدی بەڵکـــە کاریگـەری شاعیـرانی کلاسیکی کوردی پێش خۆشیان لە سەرەو لە شیعرەکانیاندا بە ئاشکرادیارە.

ڕەفیق حیلمی ڕەخنـەگـر پاش ئەوەی زۆربـەی شیعـری کلاسیکی کوردی دەخوێنێتەوە لە دیاردەیێکی بایەخدارو تا ئەو کاتە شاراوە دەدوێ ئەویش ئەوەیە کە زۆر لە شاعیرە کلاسیکیە کوردەکان وەك لە ئوسلوبدا لاساییان کردۆتەوە لە مەسەلەیێکی گرنگی ناوەرۆکیشدا هەر لاساییان کردۆتەوە ،ئەویش مەسەلەی دڵداری کردن و عاشق بوونە کە زۆریان عاشق نەبـوون و نافـرەتێکی تایبـەتی لە ژیـانیـاندا نەبووەو عەشقەکەیان هەر خەیاڵی بووە نووسەر دەڵێت:ـ

«من لام وایـە ئەغلەبـەی شاعیـرە کۆنـەکانمان هەروەکو شیعــرەکــانیـان لاسـایی کردنـەوە بووە لە عەشقیشـدا هەر مقلدبوون و ڕەنگە بەشی زۆریان مەعشوقەیان نەبووبێو بە خەیاڵ بووبن بە عاشق»

نووســەر لێـرەدا شتێکی لەمـە گرنگتری بیرچووە ئەویش ناوهــێــنــانــی وشــەکــانـی مەیو شەرابــە لە شیـعــرە کلاسیکیـەکـانـدا. دەرکی بەوە نەکردوە کە زۆربەی شاعیرە کوردەکـانـی پێشـــو مەیو ساقیو جامی بادەو شەرابیـــان باس کردوە. ئەگەر چی هەندێکیان وەك مەحویو مەولەوی کە سۆفی بوون ساقیــان بە شێخ دانـاوەو جامی مەیش بە بادەی ئەو عەشقە واتە وەرگرتنی وەعزو تەریقەت، بەڵام بە گشتی مەیخۆر نەبـوون و هەندێکیشیان ڕەنگە نەشەرابیان دیبێو نە شێوەی ساقی. نووسەر سەبارەت بە شیعرەکانی پیـرەمێـرد گەلێ بیـروڕای زانستیو ڕەخنـەگـرانـەی نووسیوە بەڵام لەتەك ئەمەشدا کەوتۆتە دوو هەڵەی دیارەوە. یەکەم، بەڕای ئەو پیـرەمێـرد لاسـایی هیـچ شاعیرێکی نەکردۆتەوە. دووەم ویستـــویـەتی ببێ بەڕێبـەری شاعیـرەکـانی سەردەمی خۆی. نووسـەر دەڵێت «پیـرەمێـرد هەروەکـو لە شیعـرەکانیا لاسایی کەسی نەکردۆتەمە بەڵکو ویستویەتی کە خۆی ببێ بە ئیمامی شاعیرە
کوردەکانی ئەم عەسرە، لەلایەکیتریشەوە لە شیعرا کوردی پەتی تاقیکـــردۆتـەوەو بۆی دەرخستـوین کە زمـانـەکـەمـان زمـانێکی دەوڵـەمـەنـدو شیرینە».[١٥] بۆ وەڵام دانەوەی ڕای یەکــەمی دەڵێین، ئەگـــەر بێت و ئەو شیعـــرانـە لە دیـوانی پیـرەمێـرد دەربهێنین کە تیـایـدا لاسایی نالیو مەولاناخالدو مەولەویو
بێسارانیو وەلی دێوانەو شامەزهەر گەلێکیتریشی کردۆتەوە ئەوا ژمارەیێکی کەم لەو شیعرانە دەمێنێتە کە لاسایی کەسی تێدا نەکردبێتەوە. دەربارەی کاریگەری نالیو مەولەوی پیرەمێرد خۆی دەڵێت «هەتا مەولەویم نەناسیبو نالی لەلام پێغەمبەری شیعری کوردی بوو»[١٦] تەنانەت زۆر بەیتی شیعری مەولەویو بێسارانی لە شیعرەکانیدا بە ئاسانی دەناسرێتەوە. لە ماوەی ئەو بیست و پێنج ساڵەی لە توراکیا

بووە نەك لاسایی شاعیرە تورکەکانی کردۆتەوە بەڵکە بە تورکیو بە فارسی گەلێ شیعری لە گۆڤاری - ژین - و - ڕۆژنامەی - کورد - و - إقدام - و - شەفەق سورخ - و - فەرهەنگ - دا بڵاوکردۆتەوە. سەبارەت بەلاسایی کردنەوەی مەولەوی دەبێ ئەوە لە بیرنەکەین کە پیرەمێرد ئەوەندی شێوەی کێشی شیعری مەولەوی - کێشێ خۆماڵی - لەلا شیرین بوە ئەوەندە چێژی لە حاڵەتی ڕۆحی شیعرەکانی مەولەوی وەرگرتوە. بۆ وەڵام دانەوەی ڕای دووەمیش دەڵێین، پیرەمێرد هەرگیز بیری لەوە نەکردۆتەوە کە ئاڵای پێشرەوی شیعری نوێ هەڵبگرێ بەڵکە زۆر جار لە ڕۆژنامەی - ژین - دا کە شیعری خۆی بڵاودەکردەوە دەینوسی ئەمە - منظومە - ی حاجی توفیق - ە نەیدەگوت - شیعر - وە دەینوسی - کاتێ شاعیر بووم ، یاخو دەینوسی شاعیرێك وەختی خۆی ئەمەی نووسیوە. لەلایەکیتریشەوە وەك خۆی زۆر جار نووسیویە هەمیشە (گۆران)ی لە خۆی بە شاعیرتر زانیوە ئەمەش لە ڕووی - تواضع - ەوە نەبوە بەڵکە ڕاستیەکەی هەر وابووەو ئەو دەورەی گۆران لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا لە هەمو ڕویەکەوە بینیویەتی پیرەمێرد نەیبینیوە. پیرەمێرد زیاتر گرنگی بە وشەو واتای کوردی پەتی داوە نەك شێوەی داڕشتنی نوێ. زۆر جار بە پێچەوانەوە گەڕاوەتەوە بۆ دواوەو ڕیچکەو ئوسلوبی نالیو بێسارانیو مەولەویو وەلی دێوانەی گرتۆتە بەر. هەتا ئێستا باشترین و کورت ترین بیروڕا بەلایمنەوە بۆ هەڵسەنگاندنی دەوری پیرەمێرد بیروڕای - گۆران - ە. دەڵێت «ئەو ئەی هێنا وشە کوردیە نەبیستراوەکانی بڵاو ئەکردەوە - ئەوانەی بەکارهێنانیان زۆر فراوان نیە. وشە کوردیەکان وەك و ناوی گژو گیاو گوڵ و شتیتر. بێگومان ئەم کردەوەیەش تەئسیری هەر هەبو، بێ‌کەلك نەبوو. تەئسیرەکەشی لەلایەنێ إحساساتی نەتەوایەتیەوە بوو نەك لەلایەن هونەرەوە، کە خەڵکی هان ئەدا کوردی پەتی بنوسن ئەگینا زۆر جار وشەی فارسیو عەرەبی ڕەقی بەکار ئەهێناو لێیان نەئەسڵەمیەوە».[12] ڕەفیق حیلمی ڕەخنەگر لەیەك کاتدا دوو شاعیری بە پێشرەوی نوێکردنەوەی شیعری کوردی داناوە. واتە پیرەمێردو گۆران سەبارەت بە پیرەمێرد ڕونمان کردەوە کە پێشرەوی شیعری نوێی‌کوردی نەبووە سەبارەت بە گۆران دەنووسێت «گۆران لە دنیای شیعرا ئینقلابێکی گێڕاو بەڕاستی بناغەیەکی تازەی بۆ شیعری کوردی دانا. بوو بە سەرکردەی هەرە ناوداری بوێژانی دەوری وریابوونەوە».[13]

بەڵام ڕەفیق حیلمی لێرەدا دەوری خۆی وەك شاعیرێك و دەوری شێخ نوری لەبیر چووە کە خۆیو شێخ نوری بەردی بناغەی شیعری نوێیان دانا. با گوێ لە گۆران بگرین چۆن باسی ڕەفیق حیلمی و شێخ نوری دەکات «لەم بابەتەوە ڕەنگبێ ڕەفیق حیلمی پێش - نوری - کەوتبێ ،بە کوردیو تورکی شیعری بڵاوکردۆتەوە تەنانەت شاعیرێکیتر - عبدالرحمن بەگی نفوس - لە سەرەتای ژیانی شاعیریەتیدا زۆر بەگوڕ دەستیدایە تازەکردنەوەی هەڵبەست وە لە نوری کۆنترە بەڵام ئەو شیعرەکانی بڵاو نەئەکردەوە ئەگەرچی عبدالرحمن لەدوایی ژیانیا لە هەڵبەستەکانیا تطورێکی نەکردو وەستا»[14] واتە عبدالرحمن بەگی نفوس و ڕەفیق حیلمیو شێخ نوری هەرسێکیان لە شیعر نووسیندا لەپێش گۆران - ەوە دەستیان پێ‌کردەوە شێخ نوری بەلای گۆرانەوە - سەرۆك - بووە ،هەتا خولیای گەرمی شاعیریی هەبوو هەر بە سەرۆك دانراوە بەڵام کە شێخ نوری ساردبووەوەو گۆران ئاڵاکەی گرت بەدەستەوەو گەیاندیە ئامانج. کەواتە هەتا ئەو کاتەی کە شێخ نوری بەگوڕ بووە خۆی دەوری سەرۆکی هەبووەو جێ‌دەستی خۆی دیاری کردوە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کاتێ ئەو لەو گەرمیو گوڕیە دەکەوێ ئیتر لەو قۆناغە مێژوویەدا کە دەوری تێدابینیوەو بەدان پیانانی گۆران کە سەرۆك بووە ئێمە دەوری سەرۆکی شعری کوردی لێ‌وەرگرینەوە. نوری شێخ ساڵح بەلای ڕەفیق حیلمییەوە شاعیرێکی - مخضرم - بووە. واتە لە دەوری کۆن و نوێدا شاعیربووەو شیعری هەبووە. وە بە تەنیا خۆی دەورێکی تایبەتی بینیوە. ئەمجا

واتای «دەورێکی تایبەتی دەنوێنێ» لە واتاکەی گۆران نزیك دەبێتەوە کە بە سەرۆك دابنرێت بەڵام ڕەخنەگر هێشتا نیشانی نەپێکاوە.

ڕەفیق حیلمی بۆ بەڵگەی بیروراکانی خۆی سەبارەت بەوەی کە شێخ نوری نەیتوانی سەرکردەیی شیعری نوێی کوردی بگرێتە دەست، سێ بەڵگە دێنێتەوەو منیش لای خۆمەوە بە بەڵگە ئەو سێ بیرورایە ڕەت دەکەمەوە، ئەگەرچی ڕەنگە هەندێ کەس بەم بیرورایانەی من قایل نەبن.

ڕەفیق حیلمی سێ بەڵگە دێنێتەوە کە شێخ نوری نەیتوانیوە دەوری سەرکردەیی لە شیعری نوێی کوردیدا ببینێ:

1 ـ «نوری لەگەڵ ئەوەشا کە ئەڵقەی بەیەکەوە نووسانی دەورەکانی کلاسیکیو وریابونەوەیە ـ نهضه ـ ڕەنساس لە ڕاستیا خۆی دەورێکی تایبەتی ئەنوێنێ، دەستە قوتابیەکی ئەو تۆی شوێن نەکەوت و یا پێی نەگەیاند کە دەورێکی وابنوێنن بشێت بخرێتە مێژوی ئەدەبی کوردەوە». (15)

2 ـ نوریو دەوری نوری یەکێکە واتە هەر خۆی بوو.

3 ـ ئەمەش وا ئەگەیەنێت تەرانەکانی نوری کە شوێن ـ توفیق فکرت ـ ی بۆیژی ناوداری تورك کەوتبوو وە لاسایی ئەوی ئەکردەوە لەگەڵ چەشتنی ـ زەوق ی ـ کوردا ڕێنەئەکەوت لەبەر ئەوە موریدانی نەبوو. ئینقلابێکی پێنەکراو بیرچووەوە». (16)

لە وەڵام دا بەرامبەر ئەم سێ خاڵە دەڵێین:ـ

1 ـ ڕاستە شێخ نوری شاعیرێکی ـ مخضرم ـ بووە لە دەوری کۆن و نوێدا شیعری هەبووە بەڵام بەهۆی ئەوەی ژمارەیێکی زۆری لە ڕۆژنامەی ئەو سەردەمەدا بڵاودەکردەوە موریدو قوتابیو شوێن پێهەڵگری زۆر بوو. گەلێ شاعیری شوێن کەوت و لاساییان دەکردەوە.

2 ـ نوری دەوری نوری تەنیا شێخ نوری نەبوو بەڵکە ڕەفیق حیلمیو عبدالرحمن بەگی نفوس و ڕەشید نەجیب و گۆران بوو. بەڵام لەو کاتەدا شێخ نوری بەهۆی بڵاوبونەوەی شیعرەکانیو ڕادەی ڕۆشن بیریی هاوچەرخانەو کارتێکردنی ئەدەبی تورکی وەك سەرۆکی ئەم ڕاپەڕین و نوێبونەوەیە دەرکەوت.

3 ـ بەپێچەوانەی ڕەخنەکەی ڕەفیق حیلمییەوە من دەڵێم شیعرەکانی شێخ نوری بۆیە برەوی پەیداکرد و پەرەی سەند چونکە لەگەڵ زەوقی کوردا ڕێدەکەوت و برگەی کێشی خۆماڵی بەکاردەهێناو بۆ کوردی پەتیش خۆی دەدا لە بێژنگ. بۆیە شێخ نوری توانی لە قۆناغێکی تایبەتیو لە ساڵانی بیستدا ئینقلابی شیعری بکات و هەرگیز لەبیر نەچێتەوە. وەك بینیمان گۆران پلەی ڕابەرو سەرکردەی ئینقلابەکەی داوەتێ. ڕەفیق حیلمی هەر لە بارەی گۆران ـ ەوە دەڵێت «گۆران بەم ئینقلابە قوتابخانەی شاعیرە کۆنەکانی بەتەواوی ڕوخاندووەو دنیای شیعری کلاسیکی بە جارێ سەرەوژێر کردوە» (17) لێرەدا نووسەر ویستویەتی بڵێ گۆران شۆڕشێکی نوێخوازی بەرپاکردو لە دەستوری کلاسیکیەکان یاخی بوو لە باسی ڕۆمانتیکیەتی گۆراندا ڕەفیق حیلمی زۆر بە شارەزایی دەنووسێت «ئەو زیاد لە شاعیرەکانی تر مەفتونی تەبیعەتە وە بە نیگایەکی قوڵتر تێی ئەفکرێ . بەڵام لەلایەکی تریشەوە هەست بەوە ئەکا کە جوانی ئافرەت کانگای هەموو جوانیەکانی تەبیعەتە وە بە ئیلهامی جوانیی ئافرەت هەست بەوە ئەکرێ کە لە تەبیعەتا جوانی هەیە. لە ئافرەتیشا گۆران بۆ ئەو جوانیانە ئەگەرێ کە بە دەست ناگیرێ وە (بوون)یان لە کانگەی دڵ و گیانا هەست ئەکرێ» (18) ڕەخنەگر مۆسیقای شیعرەکانی گۆران بە مۆسیقاییێکی ڕۆژئاوایی دەزانێت دەڵێت «بەکێك لە مۆسیقای خۆرهەڵاتیەکانی کۆن بەو لاوە مۆسیقای نەبیستبێت و گوێچکەی هەر بەم جۆرە مۆسیقایە ڕاهاتبێت و گۆش کرابێ ڕەنگە لەم مۆسیقا تازەیە کە لە شیعرە تازەکانی گۆراندا هەیە تامێکی ئەوتۆ وەرنەگرێ». (19)

ڕەفیق حیلمی زیرەکانە ئەوە دەدۆزێتەوە کە گۆران هونەرمەندێکی ڕیالیزمەو دەڵێت: «گۆران بەڕاستی

بوێـژێکی واقیعیو فەننـانـە بوێـژێکە مادەی شیعرەکانی لە کانگای ژیان واتە لە ژیانی کۆمەڵایەتی کورد هەڵێنجـاوە». [20] نووسـەر لە نووسینـەکـەیـدا سەبـارەت بە گۆران باسی ئاوازو نەرمیی مۆسیقای وشە دەکات کە ئەمە بەلای منـەوە بە تاقی کردنـەوەو هەوڵی یەکـەم دەزانـرێ لە دنیـای ڕەخنـەی کوردیدا هەر لەو شیعـرانـەدا دەنگـە پێـك هاتـووەکـان ـ الأصـوات الـمتآلفـە ـ وە دەنگـە پێك نەهاتووەکان ـ الأصوات المتنافرە ـ جوێ دەکاتەوە.

ڕەفیق حیلمی ڕخنەگر یەکەمین نووسەری کوردە لەدوای پیـرەمێـردی نەمـرەوە کە ئەدەبی بەراوردکـاری ـ الأدب المقارن ـ ی وەك تیورو پراکتیك ئەنجام دەدات. ئەویش کاتـێ شیـعـری موستـەزادی جلوەی شانـۆی گۆران و موستـەزادی ـ بهـاردە ـ ی ـ توفیق فکـرەت ـ ی شاعیـری تورك بەراورد دەکـات و ئەدەبـێکی بەراوردکـاری دروست دەکـات. نووسـەر سەبـارەت بە هەردی وەهـای نووسیوە کە لە شیعرەکانیان پەیرەوی گۆران دەکـات، ڕەخنـەگـر سەبـارەت بە بێکـەس چەنـد بیروایەکی تۆمارکردەوە

و دەڵێت «لە شیعردا ڕێگەیەکی عەسری گرتوە یەعنی لە ئینقلابی شیعری کوردیدا هەنگاوێکی زلی هەڵێناوە.».

بەڵام ئەگـەر ئێمـە شیعـر هەڵسـەنگێنین وەك شیعـرو هونـەرەکـانی شیعـر بێکـەس بەوە دەنـاسین کە شاعیرێکی شۆرشگێری نەتەوەکەی بووەو شیعر لای ئەو بۆ هەژاندنی کۆمـەڵانی خەڵـك و خۆپێشـانـدان و نوانـدنی هەڵـوێستی نارەزایی دژی داگیـرکـەرو زۆردار گرنگی بەجـوانکـاریو ڕازانـدنـەوەی شیعـرەکـانی نەداوەو لە بەکـارهێنـانی وشەی عەرەبیشـدا سڵی نەکـردۆتـەوە. بە کورتی شیعـر لای ئەو مەبـەستێکی تایبـەتی خۆی هەبـوەو ئەو زیـاتـر بیرو باوەڕی شورش گێرییو بەرەنگاربوونەوەی مەبەست بووە لەبەر ئەوەی شیـعـر خۆش ئاوازتـرەو زۆرتـر خەڵکی دەتـوانن تێیبگـەن و لەبەری بکەن و بیڵێنەوە ئەم لە ڕێگـەی شیعـرەوە بیـروراکـانی دەربریوە وەك حاجی قادری کۆیی «مـەبـەستی شیعـر دارشتن نەبـوە بەڵکە فکـر دارشتن بووە ـ» [44].

ڕەخنـەگـر دەربـارەی ـ ڕەمـزی مەلا مارف ـ ی شاعیـر دەڵێت «نـە پشتی کردۆتـە تازەو نەڕوی لە کۆن وەرگێـراوە ڕەمزی گاهێ لە قاڵبێکی تازەدا مەوزوعێکی کۆن و گاهێ لە قاڵبێکی کۆنا مەوزوعێکی تازە ئەهۆنێتەوە». [44]

ڕخنـەگـر لە بەرگی یەکـەمی شیعـرو ئەدەبیـاتـدا زیـاتـر ئوسلوبی ڕەخنـەی شەکـردنـەوە ـ تحلیـل ـ ی بەکارهێناوەو شیعـرەکـانی لە ڕوی مانـاو ڕازانـدنـەوەی وشـەو واتـاوە لێك داتەوە ،بەڵام لە بەرگی دوەودا کە چوارده ساڵ دوای ئەمـە لە چاپ دراوە ڕەخنـەگـر ئوسلوبێکی زیـاتـر ڕوون و زانستی ڕەخنـەیی بەکـارهێناوە. شێوەی ڕەخنەی مەوزوعییو واقیعیو هونـەری زاڵـە بەسـەر شێـوەی ڕەخنەی ـ تحلیل ـ یدا. نووسـەر بەم کتێبـە توانی ببێتـە یەکـەمین ڕەخنەگر لە ئەدەبی کوردیدا کە بەرێو شوێنی زانستانەوە مامەڵە لەگەڵ شیعری شاعیرە کوردەکان بکات.

ویستـویـەتی دەسـەڵات بەرزی ڕادەی داهێنـان و بیری نەتەوایەتیو هەستی ئیستاتیکی شاعیرەکان ڕوون بکاتەوەو بیسەلمێنێ.

لەتـەك ئەمـانـەشـدا ئەوەی جێی سەرنجی ئێمەیە ئەوەیە ڕخنـەگـر بەرنـامـەیێکی ڕێـك و ڕەوانی سەبـارەت بە ڕێك خستنی ناوی شاعیرەکان ڕەچاو نەکردوە. بۆ نمونە لە بەرگی یەکەمدا ناوی چوارده شاعیری نووسیوە یەك لەدوای یەك لێکـۆڵینـەوەی ئەدەبی لەسـەر نووسیـون. لە کاتێکـدا پیرەمێردو حاجی قادرو خاکی شاعیر بەریزی یەکەوە باس دەکات کە سەردەمی ژیانیان دەیەها ساڵ و بگرە نزیکەی سەد ساڵ زیاتریش لە یەکەوە دوورن. سەردەمی حەمدیو حەمـدیو پیـرەمێـردو بێکـەس یەك سەردەمـەو زۆر دورە لە سەردەمی ژیانی حاجی قادرو ئاهیو خاکیو خەستە. لە بەرگـی دوەمـیـشــدا دیـســان سالم و گۆران پێکــەوە باس دەکات، دیارە سەردەمی ژیانیان چەندە دورە لەیەکەوە.

هەروەهـا لە بەرگی یەکـەمی شیعـرو ئەدەبیـاتـدا باسی

ئەمین زەکی بەگ دەکات وەك شاعیرێك کە هەموو دەزانین ئەمین زەکی بەگ شاعیر نەبووە و مێژوونووس بووە.

رەفیق حیلمی لە بارەی شیعری کۆنی - رەمزی - یەوە دەڵێت:

«ئەم چەشنە شیعرانە ئیتر باویان نەماوەو نابێ ئێمە بگەرێنەوە سەری و بیکەینەوە بەباو. بەڵکو ئەبێ ئیتر ئوسلوبێکی تازەی بۆ دابنێین و بە شێوەیەکی وا لە نیشتمان بدوێین کە لەگەڵ پێویستی ئەم چەرخە رێك بکەوێ».[24]

ئەم بیرکردنەوە هاوچەرخ و مرۆڤانەیەی رەفیق حیلمی بانگ کردنێکی ئاشکرایە بۆ هونەر و ئەدەبی مولتەزیم، مولتەزیم بە مەسەلەی میللەتەوە. نووسەر کاتێ داوای ئەو جۆرە هونەر و ئەدەبە مولتەزیمەی کرد خۆی یەکێك بوو لە ئەدیبە مولتەزیمەکان. ئەگەر بەوردی تەماشای ژیانی بکەین بۆمان دەردەکەوێت سەرانسەر خۆشەویستی میللەت و خەباتی بێوچان بووە بۆ پێشکەوتنی میللەتەکەی هەر لەوکاتەوە کە بە تورکی شیعری بۆ کورد ووتوە و دوایی شیعری کوردی ووتوە کە رۆژنامەی - ئومێدی ئیستیقلال - دەردەچوو وە ئەم ماوەیەك سەرنوسەری بووە خزمەتی ئەدەب و مێژووی کوردی کردوە. خۆی دەنووسێت «ئەو شیعرانەی کە بە تورکی دام ئەنا هەمووی بۆ کوردبوو فەریادی کوردستانی تیائەبیسترا»[25] رەفیق حیلمی لە هەموو کارە ئەدەبی و مێژووییەکانیدا ویستویەتی پەیامێکی گەورەو پیرۆز بگەیەنێ بە میللەتەکەی. ویستویەتی هۆیەکانی ناکۆکی و دواکەوتن و پشێوی میللەتەکەی لە رووی ئەدەب و مێژووەوە رەنگ پێبداتەوەو وەك بەردی بناغەی رەخنەی زانستی کوردی دانا هەموو هەوڵێکیشی تەرخان کرد بۆ رەنگ رشتنی ئەدەبی دوارۆژ، ئەدەبی مولتەزیم بە مەسەلەکانی میللەتەوە.

سەرچاوەکان:-


1 - ئینقلاب لە شیعری کوردیا - رەفیق حیلمی. گۆڤاری - پێشکەوتن - ژمارەی یەکەم ساڵی یەکەم شوباتی 1958

2 - شیعر و ئەدەبیاتی کوردی رەفیق حیلمی. بەرگی یەکەم 1941

3 - شیعرو ئەدەبیات بەرگی دووەم ل6

4 - هەمان سەرچاوە. پێشەکیی‌یەکەی

5 - هەمان سەرچاوە. پێشەکیی‌یەکەی

6 - هەمان سەرچاوە

7 - شیعرو ئەدەبیات. بەرگی یەکەم. باسی نەسیری شاعیر.

8 - شیعرو ئەدەبیات بەشی یەکەم باسی بێخودی شاعیر

9 - هەمان سەرچاوە باسی حاجی قادری کۆیی

10 - شیعرو ئەدەبیات بەرگی یەکەم باسی پیرەمێرد

11 - رۆژنامەی ژین ژمارە (789) ساڵی 1946

12 - دانیشتنێك لەگەڵ گۆران. گۆڤاری بەیان ژمارە (2) ساڵی 1970

13 - ئینقلاب لە شیعری کوردیا پێشکەوتن ژمارە یەك ساڵی 1958

14 - دانیشتنێك لەگەڵ گۆران - بەیان ژمارە - 2 - 1970

15 - ئینقلاب لە شیعری کوردیدا. پێشکەوتن ژمارە یەك 1958

16 - هەمان سەرچاوە.

17 - هەمان سەرچاوە

18 - شیعرو ئەدەبیات. بەرگی دووەم 1956

19 - هەمان سەرچاوە

20 - هەمان سەرچاوە

21 - گۆڤاری شەفەق ژمارە (5 - 6) ساڵی 1958

22 - شیعرو ئەدەبیات بەرگی یەکەم ل12

23 - شیعرو ئەدەبیات بەرگی دووەم 1956

24 - هەمان سەرچاوە. باسی رەمزی مەلامارف

25 - پاش تەموز - رەفیق حیلمی - 1958 - پێشەکی -

# به بۆنەی یادی ٢٥ ساڵەی کۆچی دوایی رفیق حلمی باوکمان

● ناهدە رفیق حلمی ●





ره فیف حیلمی

ئەی بە رێـزان.. ئەی خوشـك و برایـانـی خوشـەویست.. بە ناوی خۆم و گشت بنەمـاڵـەی رفیق حلمی باوکمـانـەوە زۆر زۆر سلاوی گەرم بۆ لێتـان، سوپاسی بێ سنوور بێ بۆتان. بۆ گشت ئەو بەرێزانەی کە ئەم هەستە بەرزەیـان نوانـدووەو ئەم کۆبونەوە بە نرخەیان پێك هێناوە. ماوەشیان داوە کەوا ئەم یادە گشتیە پیرۆزە بکرێتە.

سوپـاسی زۆریش بۆ گشت ئەوانـەی بەشـداریـان کردوە. بە ووتـاری بە نرخ - بە بیـرو باوەڕی دڵسۆزانە... هەروەها بۆ ئێوەی بەرێز کە ئەرکی هاتنتان کێشاوە.

ئەی خوشك و برایانی بەرێز ئێوە لە ئێمە باشتر دەزانن کە رفیق حلمی هەر باوکی ئێمە نەبوو. رفیق حلمی باوکی گشت هاوولاتیە نیشتمان پەروەرەکان بوو. باوکی هەموو خێـزانـە گەورەکـەی نیشتمـان بوو. رفیق حلمی باوکی هەموو گەنج و لاوێك بوو، کە تازە پێی نابووە پلەی



خێزانی رە فیف حیلمی

ژیانەوە. . .

رفیق حلمیش بە هەموو تین و توانایەوە پاڵی پێوە دەنا تا پلەبەپلە سەری بخات و بگات بە ئامانجی خوی. رفیق حلمی باوکی هەموو هەژارو داماوو لێقەوماوو ناچارێك بوو کە لەناو گێژەڵوکەی بەسەرهات و کۆسپ و کارەساتی سەخت و توندو گرنگدا خولیدەخوارد. رفیق حلمی بە هەموو هێزی خۆیەوە پاڵ پشتیان بوو، وهەوڵ و تەقەلای دەدا لە گۆمی قوڵی زەمانە دەریان بهێنێ، تا بکەونەوە سەرپێ بۆ تەواوکردنی رێگای راست و رەوان.

رفیق حلمی تا ما هەموو گیانی تەرخان کردبوو بۆ گەیشتنی نیشتمانەکەمان بەرنیری نیشتمانە پێشکەوتوکان.

ئەی خوشك و برایانی بەرێز. . . راستە ئەو رفیق حلمیە 25 ساڵە کۆچی دوایی کردوەو بە جێی هێشتوین بێ پشتیوان. . . بەڵام بە سایەی یەزدانی پاکەوە. . . بە هۆی ئەو رێبەرە پیرۆزە بە نرخەی بۆی داناوین و بەم جۆرە یادکردنەوەیانەی دڵسوزان و پێزانان لە هەموو کارو شوێن و کاتێکدا.

هەرگیز هەستمان بە وون بوونی نەکردوە لەناوماندا و هەمیشە نەك هەر بەکردنەوەکانی بە نووسینەوەکانی بە یادداشتەکانی. . بە گیانی پاکی خۆی، بگرە بەم جۆرە یادکردنەوەیانە. رفیق حلمی هەر لەگەڵمان بووەو دەبێ. . . هەر ماوەو دەمێنێ.

ئەوانەی لە ئێمە زیاتر باوکێتی کردون و لە ئێمە باشتر ئاگاداری بەسەرهاتی ژیانی بوون، هەرگیز درێغیان نەکردوە لە یادکردنەوەی. . بە هەموو جۆرێك. دەزانن بەو جۆرە رفیق حلمی لە دووریش هەر چاوی لێمانە چی ئێوەی خێزانە گەورەکەی نیشتمانیو چی ئێمەی خێزانە پچوکەکەی.

o •

هەر بژین هەموو ئەوانەی مافی کردەوەی رفیق حیلمیان وا بە پاکی ـ وا بە چاکیو بە دڵسۆزی داوتەوە. بژین هەموو ئەوانەی هەوڵ دەدەن وەك ئەو بۆ گەیشتن گەلەکەمان بە رێزی گەلانی پێگەیشتوو سەربەرزو ئازا. . بژین هەموو ئەوانەی رەنج دەدەن وەك ئەو بۆ فراوان کردنی زانیاریو هونەر. بژین هەموو ئێوەی بەرێز کەوا بەم جۆرە بێوێنەیە یادی ئەو نیشتمان پەروەرە. . ئەو کۆڵ نەدەرە. . ئەو خۆبەخت کەرە دەکەنەوە پاش 25 ساڵ تێپەربوونی بەسەر کۆچی دواییدا. . وا بەم جۆرە بە نرخە زیندووی دەکەنەوە. . .

## ژیانی تایبەتی رفیق حلمی باوکمان

لەسەر داواکردنی دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی پێك هێنەری ئەم کۆبونەوەیە. بە پێی تواناو، بە یارمەتی کەس و کارو پشکنینی بەجێ ناوی خوالێخوشبو رفیق حلمی (باوکمان). [1] هەوڵ دەدەم روناکێك. بخەمە سەر ئەو رووە لە ژیانی تایبەتیدا کە هێشتا کەم کەس دیوێتی یان باسی بیستوە.

بەڵام بە پێویستی دەزانم جارێ بڵێم: ـ

یەك: رفیق حلمی باوكمـان هیـچ ژیـانی تایبەتی نەبوو نەخـۆی نەخێـزان و منـداڵی.. چونكـە، هەمیشـە ژیـانی بەسـترابـوو بە چاك وچـۆنی گەلـەكـەیـەوەو وڵاتـەكـەیـەوەو نیشتمـانـەكـەیو بە ئاوات و ئامـانجی پێشكەوتنیان و بەبیرو باوەڕی خۆیەوە.

دوو: رفیق حلمی خۆی بە هیچ جۆرێك بە درێژایی ژیـانـی باسـی كەس و كاریو ژیـانـی تایبـەتـی.. خوێنـدنی.. هۆزی.. بنچینـەی نەدەكـرد نە لە دەرەوە نە لای ئێمـە.. نەبـەزارو نەبـەنـووسینـەوەو هەتـا وێنەی هیچ كەسی خۆیمان نیەو نەدیوە.

سێ: زۆربـەی كەس و كاری هی باوكـیـشـتمـان و دایكیشمان پێش بوونی ئێمە كۆچی دواییان كردوە. لەبەر ئەوە، هەتـا ئێمـەیش بە تەواوی باسی ژیـانی تایبـەتی منـداڵیو گەنجێتیو خوێنـدنی.. ئیش و كاری نازانین و ئەوی لەم لایەنەوە دەینووسمەوە هیچی بەدەم خۆیەوە نیە.

جا رفیـق حلمی بۆچ وا بێدەنـگ ماوە سەبـارەت بە ژیانی تایبەتی خۆیو كەس و كاری؟

ئایـا كەسی نەبـوو؟ یان باش نەبـوون؟ ئایـات هەستی نەبـووە بەرامبـەریـان؟ یاخـود دووربـوو لێیـان و نەیـدیون؟ لێی نەپرسیونەتەوە؟ یان ئەوان نەیان ویستوە؟

بۆ روون كردنـەوەی وەڵامـی ئەم پرسیـارانـە دەبێ لە بنچینـەو هۆزی بكـۆڵینـەوەو هێنـدێك باسی كەس و كاریو ژیانی هیچ نەبێ ئەوانەی نزیك بوون لێی جا ببورن ئەگەر بەو هۆیەوە تۆزێك درێژەم دا بە ووتارەكەم.

یام بەلای ئەو باسـانـەدا چووم كە رەنگـە بە پێـویستی نەزانن ئەگەر ئەم روون كردنەوەیە نەبێ.

**هۆزو بنچینەی: -**

رفیق حلمی خوشیو خێـزانـەكـەشی لە دایكیشـەوەو لە باوكیشەوە لە بنچینەوە.. هۆزی همزە ئاغای مصرەفنَ كە كوردبوون و دانیشتوی كوردستان، وەك دەڵێن شارەزووی.

رفیق حلمی كوڕی صالح ئەفندی ئامان كوڕی عبداللە ئەفندی كوڕی حاجی غفور، لە ساڵی 1898 لە كركوك لەدایك بووە. باوكی صالح ئەفندی كوڕی پیرۆزخان كچی قادر ئاغا كوڕی حەمە ئاغای برای هەمزە ئاغای مصرەفن. دایكی حەلاوەخـان كچی مارف ئاغـا كوڕی عزیـز ئاغـا كوڕی بابكر ئاغا برای هەمزە ئاغای مصرەفە.

خێزانەكەی جمیلە مصطفی عبداللە كوڕی عزیز ئاغای كوڕی همزە ئاغای مصرەفە.

دایكی جمیلە عصمت حاجی بابكر ئاغا كوڕی محمد ئاغا كوڕی هەمزە ئاغای مصرەفە.

واتـە رفیق حلمیو خێـزانـەكـەی لە دایكیشـەوەو لە باوكیشەوە خزمی یەك بوون و كوردن و دانیشتوی كوردستان بوون.

هەمـزە ئاغـای مصـرەف 3 براو[3] خوشكێك و 11 كوڕو 11 كچی هەبوە ئەمانە بە هەموو شارەكانی عراقدا، وەك سلیمانی، كركوك، بەغدا، حلە، هتد... بڵاوبونەتەوە. هێندێكیشیان بە دەرەوەی عراقدا... بەرەی ئەوانە تێكەڵ بە گەلـێ هۆزیتـری كوردو عەرەب و تورك بوون وەك سامرائی، حلاوی، مێسی، راوی، عانی، ئاوچی هتد.

**رفیق حلمیو كەس وكاری: -**

رفیـق حلمـی دوو مام و دوو پووری هەبـووە: تۆفیق و شوكـت.. جمـیلەو مریم.. ئەمـانـە هەمـوو بە ئامـان ناوبـانگیـان دەركـردوە. ئامـان ناوی نەنگیـان بووەو لەبـەر ئازایی و گورجی ناویـان داوە بە پەرەكـەیو ئیستـاش بەرەی ئەمانە بە ئامان دەناسرێن لە كركوك وەك یونس توفیق ئامان هتد..

رفیق حلمی باوكمان خۆی 3 براو دوو خوشكی هەبوو: جمیل و شفیقیان هەر لە زووەوە كۆچی دواییان كرد بوو.. ابراهیمیان پاش ماوەیەك دوای ئەوان. دوو خوشكەكەی لە دوای كۆچی دوایی خۆی. سەرگـوشتـەی ژیـانی ئەمانە بە

# دره‌ختی لقوزی لهمزه ئاغای مصرف و بنچینه‌ی



پەرتووکیش ناگێڕێتەوە.

لێرە هەر ئەوەندە باسیان دەکەین کە پێوەندی بەسەر ژیانی تایبەتی رفیق حلمی برایانەوە هەیە.

عصمتی خوشکی بەدرێژایی ژیانی لەگەڵ رفیق حلمی برای‌و ئێمە بوو. پێی‌دەوت (کاکە) چونکە برای گەورەی بوو.

ئێمەو هەموو کەس وکارمان پوورەمان دەوت (بجی)... لەبەر خۆشەویستی چونکە هەموو ژیانی تەرخان کردبوو بۆ ئێمە. (بجی) هەتا کۆچی دوایی‌کرد هەر چاوەڕوانی گەڕانەوەی شفیقی برای دەکرد لە تورکیاوە، بڕوای نەدەکرد نەمابێ. بجی زۆر ئازاو گورج و گۆڵ بوو.

بهیە دووەمین خوشکی رفیق حلمی‌یە، بەزانیاری‌و بیرتیژی ناوبانگی دەرکردبوو، بەسەعات پرسیاریان لێ‌دەکرد سەبارەت بە زانیاری گشتی جغرافی.. مێژوویی.،. دینی.. بێ‌ووچان وەڵامی دەدایەوە.. هەمووی بە گوێ‌گرتن فێربوو بوو.

رفیق حلمی لەناو ئەو هەموو کەس و کارەی هەیبوو تەنها ناوبەناو ناوی باجی رەحمەمان لێ‌دەبیست.. بۆچ؟

باجی رەحمە خوشکی دایکی بوو لەگەڵیان ژیابوو بە دەرمانسازی چاك ناوبانگی دەرکردبوو. باوکمان خۆی لە وانەی بەکارهێنابوو و سوودی لێ‌وەرگرتبوو، بۆیە هەر جارێ کە دەهاتەوە لە جیاتی چیتیان هەیەو چۆن! بە دایکمانی دەوت: ئا توخوا فلان دەرمانی باجی رەحمە بگرەوە بۆ فلانی داماو». دایکمان ئەوانە لە باجی رەحمەوە فێربوبوو لە نووسینەوەکانیشیدا.

تەنها رەچەتەی ئەو دەرمانانەی لە دەفتەرێکی پچوکدا نووسیوەتەوە لەم لاو لەولاشدا جارجار هەر ناوی باوکی محمد صالح ئەفندی (سەرشەقام)و محمد شفیقی برای نووسیوە. بەڵام چەند رەسمێکی بەدەست کردوە هی سەماوەو قۆری‌و مەکینەی خەیاتی‌و فیرو چرا. ئەمە هەموو یادداشتەکانی بو سەبارەت بە ژیانی گەنجێتی‌و منداڵی.

بەڵام وەك کەس وکار دەیانگێڕایەوە باوکی باوکمان یوزباشی بووە. زۆر دەستی ڕۆیشتووەو مووچەی باشی بووە. بەردەستی زۆرو، ئێجگار خێزانەکەی‌و منداڵەکانی خۆش ویستووە. هەتا بەناوی خۆیانەوە بانگی نەکردوون..

بە رفیق حلمی وتووە (کاکەلاو) (کوری لاو). بە عصمتی کچی وتووە (کیچان). هەرچەند لە جەنگە بەسەربەرزی گەڕاوەتەوە، زۆر دیاری جوان و چاکی بۆ هێناون. باوکمان رفیق حلمی، بەردەستی تایبەتی خۆی هەبووە.. هەر لە منداڵیەوە لەبەر خۆشەویستی‌و لەبەر ئازایی‌و گورجی‌و توندی خۆی کەس قسەو دڵی نەشکاندوە.

بە منداڵی لە سلیمانی خۆی‌و کەسەکانی لە حەوشی گەورە لە هەرە گەورە حەوشەکانی ناوەڕاستی سلیمانی ژیاوە. چوار دەوری حەوشەکە دیوەخان و حەرەم و ژووری میوان بووە، ناوەڕاستی حەوشەکە دارێکی گەورە ناوی دارەرەشەکە بووە. لەژێر سێبەریدا سەماوەرو قۆری هەمیشە گیزەی هاتووەو بەردەستێك هەر چای لێناوەو گێڕاویە.

رفیق حلمی چونکە باوکی‌و دایکی زوو کۆچی دوایی دەکەن، هەر بە گەنجی‌و زووبەزوو باری قورسی ژیان دەکەوێتە سەرشانی‌و دەکەوێتە ناو گێژەڵوکەی ژیانی گشتیەوەو خولیای زانیاری پێشکەوتن و سەربەزی خۆی‌و گەل و نیشتمانی دەداتە مێشکی‌و کار دەکاتە سەر هەموو کردەوەو ئیش و کارو ژیانی.

**خوێندنی: -**

رفیق حلمی لە کرکوك وەك وتمان لەدایك دەبێ.. بەڵام لەبەر گوێزانەوەی باوکی لەگەڵ سوپا لەم لا بۆ ئەو لا... قوتابخانەی سەرەتایی لە کفری لە مێژووی 325ی روومی تەواو دەکات. کە باوکی دەگوێزرێتەوە سنوور، خێزانەکەی‌و ماڵ و منداڵی دەنێرێتە سلیمانی.. لەوێ رفیق حلمی بە تاقی‌کردنەوە یەکسەر دەخرێتە پۆلی دووهەمی قوتابخانەی رشدیەی عەسکەریە کە دوایی پێی‌دەڵێن

To director of edjucation Bagdad:

Sir!

I beg you very much to be so kind to look the falowing fewlines for favorable consideration. When I was in Bagdad you gave me a promise to transfer me when you will have a vaccancy. There fore I beg you in haste to transfer me as a head master of a school that you have intented to found in the new year (begining of the new year) - Because under Turkish government also I was a head master of a secondry school, I learn in the university of Constantinople and have certificard for the same. I know to read Turkish, persian, Arabic, french and a little English -

Then, waiting for a favorable [illegible]

[illegible]

اعــدادی عەسکــەری. پاش تەواوکـردنی پۆلی سێـیەمی اعــدادی عەسکــەری لە سلێمــانی رفیق حلمی دەڕوا بۆ بەغدا ـ لەوێ پۆلی چوارو پێنجی ئەو اعدادیەیە تەواو دەكاو دەکرێ بە قوتابی ناردە بۆ تەواوکردنی ارکانی حەرب لە تورکیا.

رفیق حلمی لەبەر ئەوەی لە بیرکارێدا (ئەندازیاری) زۆر باش دەبێ دەیـەوێت ئەنـدازیـاری (هـەنـدسەی عالی) لە تورکیـا تەواو بکـا. لەبـەر ئەوە دەگـەڕێتـەوە سلێمـانیو اعــدادی ملكی تەواو دەکـات. ئەو جا دەڕوات بۆ تورکیـا لەوێ داخلی زانکـۆ (جـامعـة استـانـە) دەبێو شهـادەی هەنـدسـەی عالی لێوەردەگـرێ. ئەمـە لە نامەیکدا روون دەکاتەوە کە بە ئینگلیزی نووسیوێتی بە دەست خەتێ خۆی بۆ بەڕێــوەبــەرانــی ئیش و کاری سلێــمــانــی کە داوای دامـەزرانـدنی دەکـا بە بەڕێـوەبـەری قوتـابخـانەی اعدادی (ئامادەیی)و بە ئینگلیزی دەڵێ: ـ

ich habe schwarzes haar.

[illegible]

was für haar hat ali?

[illegible]

er hat schwarzes haar.

[illegible]

Die augen sind in dem Kopf.

[illegible]

Du hast blaue augen.

[illegible]

ali hat grüne augen.

[illegible]

wo sind die augen?

[illegible]

wie viele augen haben wir?

[illegible]

welches auge ist dein?

[illegible]

ایخ هابه شڤارتسه هار

واس فور (هەر ... ) هات علی

ئەر هات شڤارتسه هار.

دی آوگەن زیند این دەم کاوف (کاوپف)

دو هاست بلاوه آوگن

علی هات گراوه آوگەن.

وو زیند دی آوگەن؟

وی فیله آوگەن هابن ویر (ڤیر)؟

ویلخس آوگه ایست دین؟

I «Llearnt in The University of Qonstantciople and have Qertificat For The Aame»...

مانای لە زانکوی استانە خوێندوومەو شهادەی ئەوێشم هەیەو تەواوی کردوە بە: -

ئەم زمانانەش دەزانم.

IKnow Kurdish Turkish, Persian Arabic - French and a little English».

واتە: کوردی - تورکی - عربی - فارسی - فرتری‌و هێندێك ئینگلیزی دەزانم. لە نامەیێکی‌تردا (هێندێك) دەباو دەڵێ‌و «ئینگلیزی بە خوێندنەوەو نووسینەوە» and» English To Read and Write

بەڵام وەك لە دەفتەری قوتابخانەو زانکۆیدا دەردەکەوێ رفیق حلمی ئەڵمانیشی خوێندوە وەك ئەو زمانانەی ترو تەرجمە (گۆرینیشی) پێ‌کردوە بۆ تورکی‌و فەرەنسی‌و بە پێچەوانەیش (بەعکسەوە).

لێرەدا ناتوانین چاو بپۆشین لە جوانی ڕێنووس و دەستنووسی رفیق حلمی‌و ڕێك وپێکی‌و ڕەوانی لە هەموو ئەو زمانانەدا.

جا رفیق حلمی چۆن ئەم هەموو زمانانە واباش فێربووە.؟ بێ‌گومان هەر لە قوتابخانە نەبوو.. زیاتر بە هۆی تێکەڵ بوونی یەوە بووە لەگەڵ ئەو هاوزمانیانەو بەکارهێنانیان بووە لە گفتوگۆداو بە هۆی شەوو ڕۆژ خوێندنەوەو نووسینەوەو لێ‌کۆڵینەوەی خۆی بوو.

بەڵام چۆن رفیق صالح بوو بە رفیق حلمی؟ لە تورکیا مامۆستاتێکی کە ناوی عبداللە حلمی پاشا دەبێ‌و بنچینەی کوردە.. لەبەر زیرەکی‌و ئازایی‌و خوشەویستی لەقەبەکەی خۆی «حلمی» دەداتێ وەك خەڵات.

واتە بەم لەقەبەو باسانەداو بەو نومرانە کە ڕیزی کردون لە دەفتەری قوتابخانەی سەرەتاییداو لەژێریا نووسراوە رفیق برنجی.. رفیق برنجی.. (واتە یەکەم) دەردەکەوێ کە رفیق حلمی بە ڕاستی زیرەك بوو لە خوێندا هەر لە منداڵیەوە.

**ئیش و کاری: -**

رفیق حلمی وەك دەردەکەوێ هەر لە گەنجێتیەوە بە ئیش وکاری میریەوە خەریك دەبێ، زیاتر ئەوی پێوەندی هەبووە بە بەڕیوەبەرایێتی پەروەردەوە (مهیرتیی معارف و تربیە) وەك: مامۆستا - بەڕێوەبەری قوتاپخانەو هی بەڕێوەبەرایتی پەروەردەو زانیاری... پشکنەر.. پشکنەری تایبەتی‌و جارێك مدیری ادارەی ئەمانەی عاصمەو پاش تموز ملحقی ثقافی لە تورکیا پێش کۆچی دوایی پشکنەری تایبەتی.

بەڵام وەك لە یەکێك لە یادداشتەکانیا خوێندمەوە، یەك جار لەبەر بێ ئیش وکاری‌و ناچاری یەکێك لە خزمەکانی دوکانی بۆ دادەنێ لە قەیسەری سلیمانی: هەر زوو دای‌دەخا چونکە نەدەزانێ نەدەتوانێ بیبا بەڕێوە.

ئیش وکاری میری زۆر زۆر رفیق حلمی خستبووە گێژەڵوکەوە، چونکە هەمیشە نەدەگەیشت کەل وپەلی بکاتەوە لە پر، دیسان دەگوێزرایەوە لە شمال بۆ جنوب لە شەرق بۆ غەرب لە کاری بەرز بۆ نزم لە نزم بۆ بەرزو ئەمە دەبوو بە هۆی جیابونەوەی لە ماڵ و منداڵی جاربەجارو بە هۆی مووچە بەشکردنی.

**رفیق حلمی ماڵ و منداڵی: -**

بە لێکدانەوە.. پێش کۆچی دایك و باوکی‌و لە نزیك تەمەنی 20 ساڵیدا رفیق حلمی ژن دێنی، وەك ووتمان خێزانەکەی (واتە دایکمان) خزمی نزیکی خۆی بوو، هەر لە منداڵیەوە کەس و کاریان هاتوچۆی یەکتریان کردوە، وەك دەیانگێڕایەوە رفیق حلمی لەو کاتەوە چاوی لێی‌بووە. لەبەر ئەوە هەر کە داخوازی دەکەن گورج دەچێتە سەریان و بە زۆر پەشیمانیان دەکاتەوەو خۆی دەیهێنێ. تا دووایی ژیانی

هەر دایکیمان خێزانی بوو.[٤]

رفـیـق حلمـی 10 منـداڵـی دەبێ 4 کورو 6 کچ. کورێـك و دوو کچی هەر لە منـداڵـیـەوە کۆچی دوایی دەکـەن.. وەك دەیگێیـرنـەوە تا ساڵێکیش بەیانی زوو پێش ئیش وکار بەدەسکە گوڵەوە چۆتە سەر قەبرەیان لە گردی سەیوان.

واتـە رفـیـق حلمـی نەك هەر وەك باوکـێـکـی ناســراو سەرپەرشتی ژیانی منداڵی کردوە.. رفیق حلمی بۆ ئێمە هەر باوك نەبوو... رفیق حلمی هەموو ژیانمان بوو هەر لە منداڵیمانەوە تا دوا پلەی ژیانمان. رفیق حلمی مامۆستاو پەروەردکەرمان بوو، پزیشکی دەردو غەم و ناچاریمان بوو، پشتیوانی بەرزی ئیش و کارمان بوو. هۆی سەربەرزیمان بوو، لەناو خزم و کەس و کارو هاورێو ناسراوو نەناسراودا.

رفــیـق حلمـی باوکـمــان لە دووری لێـمــان بە هۆی گواستنەوەی زوو زوویەوەو. لە نزیکی هەرگیز نەدەسرەوی لە هەوڵ و تەقەلا بۆ پێگەیاندنمان بە چاکترین و جوانترین جۆر، بۆ گەیشتنمان بە پلەی بەرزی زانیاری... تا بگەین بە ئامــانجی خۆیو خۆمـان و گەلـەکـەمـان. ئەوی ئەو بۆ ئێمــەی کردووەو لەبـەر ئێمـە چاوی لێپـۆشیـوە لە سەختی ژیانیدا.. کەم باوك هەیە بتواڵێ بیکا.

ئەمــە لە چەنـد نامـەیێکی کە ناردویـە بۆ هاورێکـانی دەردەکەوێ کاتی هەوڵدانی بۆ جێبەجێکردنی ئیش وکارمان.

**ژیانی رۆژ بەرۆژیو رەوشتی رفیق حلمی: -**

چ رەوشت و ڕاسپاردەنێکی گەیاند بوو بە گەلەکەی چ بەزار چ بەنــووسیـنــەوە هەر ئەوانــەش بوو لە ئێمــەیشی دەویست و خۆشی باشتــرین وێنــە بوو بۆ بەجێهێنـانیـان و لەسەر رویشتنیان، لە هەموو ژیانیداو هەموو ئیش و کاریدا.

ئەوانەی لە ئێمە روون بوو: -

یەك: پەیــرەو (نظــام) رفیق حلمی ئێجکــار بە نظـام دەژیــا... لە هەمــوو ئیش و کارێکــدا... دەیویست ئێمەیش لەو رەوشتە لانەدەین.. بەڵام ئەوی بەو دەکرا بە هەمـوو کەسێـك ناکـرێ.. بۆیـە جاربەجار لەبەر خۆمانەوە بەدزیــەوە (چــونــکــە کەس نەیدەوێــرا بەســەر زاری) دەمان بۆڵاند.. جەندرمەییە.. نظامی عەسکەریە..

«رۆژنامەکە وەك خۆی قەد بکەرەوە... پەرتووکەکە بە هەڵـەوگێـراوی بەجێـمـەهێڵە.. سینیـەکە خوار دامەنێ.. لەبـەر باکـە دامـەنیشـە نەخـۆش دەکـەوی.. کەل وپەلتان کۆبکـەنـەوەو رێکیـان بخـەن.. نانـەکە بە پەلە مەخۆن.. میوانەکان بەرێزانە بەرێ بخەن هتد...».

واتـە رفیق حلمی باوکمـان هیـچ شتێـك نەبوو بیریلێ نەکاتەوەو نظامی لێنەوێ.. خۆی هەتا جلە چڵکنەکانی جوان قەد دەکـرد ئەمجـا دایدەنـان بۆ شۆشتن.. هەمـوو شت و کەل وپـەلــی خۆی رۆژ بە رۆژ بەدەســتــی خۆی رێك دەخیت.. هەروەها رفیق حلمی ئێجگار بە نظام بوو سەبارەت بە کاتی هەستانی بەیانی زوو لە خەو.. جۆرو چەنـدوچـۆنی خواردنی.. کاتی چونـە دەرێو هاتنەوەی.. کاتی نوستن و خوێندنی.. هتد..

**دوو: پاکیو خاوێنی: -**

هەر وەك پەیــرەوی (نظــام) پاك و خاوێــنــی.. لەوەدا نەبوو.. نەك هەر پاکی کەل وپەل و جل وبەرگ و ماڵ.. پاکی خواردن و قاپ و قاچاغ و هەموو پێویستی ژیان.

بگرە زیاتریش پاکی دەست (دەست پاکی) پاکی دڵ و ویــژدانی پاك پاکی کــردەوەو گفت وگــۆ. پاکی رەوشت و کاروئیش - پاکی پەیرەو - پەیرەو پاکی.. لە هەموو شتێك و هەموو کاروئیشێکدا هەموو شوێنێك و بیرو باوەرێکدا.. لە هەموو کردەو هەستێکدا.

سێ: خزمەت (ڕاژە): -

ڕاژەی بێ ووچـان. . بێ حـەسـانـەوە ڕاژەی بەدڵ. . بەپاکی - بێ چاوەڕوانی خەڵات و پاداشت ڕاژەی هەموو کەسێـك - هەمـوو پاك و دڵسۆزێـك . . هەمـوو ناچـارو لێ قـەومـاوێـك. . . هەمـوو کەس و کارێـك. . . هەمـوو ئەوانەی پێویستیان هەبوو بە ڕاژە لە ئیش و کاردا چ بەپارە چ بەئیش. ئەمجـا ڕاژە لە ئیش وکـاری میـریـدا ئەوە هەر باس ناکرێ. قوتابخانە نەبوو سەری پیانەکردبێ. . هەوڵی پێشکەوتنی نەدابێ.

بێ جیـاوازی. . بێ ڕەخنـە لێ گـرتن. خۆم بروا ناکەم ڕۆژ بووبـێ دواکـەوتـبێ لە دەوام. . ڕۆژ بوو بێ ووچـانی دابێ و حەسابێتەوە چ بێ ئینرك و چ بە ئیزك.

هۆشێنەرەکانی و دەفتەری ڕاسپاردەکانی هەمووی ڕۆژ بە ڕۆژ (1) نووسیـویـە چۆنـە کوێ! کام قوتـابخـانە، لە کام شار، کام وانەو مامۆستا. . . گشت ڕاسپاردەکانی لە هەموو وانەیێکدا لەسەر ڕێگای نوێی دەرس گوتنەوە ڕۆیشتوە.

(1) وێنـەی ڕاژەی لە ئیش و کاری میـریـدا بروسکـەکەی و وەزیـری زانیـاری‌یـە کە لە پرسەکەیدا ناردی بۆ خێزانەکەی ڕفیق حلمی و لە چەند ڕۆژنامەیێکییشدا بڵاو کرایەوە.

«اعـزي اسـرة المعـارف بفقد عضوٍ فعالٍ من اعضائها كان في طليعة المربين والاساتذة ومثلاً للتربية والخلق. . ليكن عزاؤهم وسلواهم الغـرس الـذي غرسـه المـرحـوم والذكر الحسن الذي تركه في الاوساط الخاصة والعامة».

**وزير المعارف**

**8 آب 1960**

زانیاری: -

---

زانـیـاری لای ڕفیـق حلمـی باوکـمـان لە نان و ئاو پێویستربوو لە ژیانیدا. «زانیاری» بە هەموو تین و توانایەوە - وەك دەزانن - ڕفیق حلمی هاواری دەکرد بە زار. . بە ووتار. . [1] بە شیعر. . بە نوسینەوە. . «زانیاری» چەکی میللیە بۆ گەیشتنی بەڕیزی وڵاتە پێگەیشتۆکان. . «زانیاری» چرای ڕوون کەرەوەی هەموو ڕێگاییێکی ژیانە. . لەبەر ئەوە خۆی پێش هەموان بەدرێژایی ژیانی هەموو کات و گیانی تەرخـان کردبـوو، لە ماڵـەوە لە دەرەوە بە شەو بە ڕۆژ بۆ فراوان کردنـەوەی زانیـاری خۆی لەپێشـدا تاکـو ئامـادەبێ و بتـوانێ و بزانێ چۆن زانیـاری ئێمـەو خێـزانـە گەورەکـەی نیشتمانی فراوان بکاو لەبەر ئەوە بەبوون و بەنەبوون. پێش نان خواردن هەموو هەوڵ و تەقەلاییێکی دەدا کە هەموومان خوێنـدنی بەرز تەواو بکـەین. . هەروەهـا کام هاووڵاتی دەستی پیـاگـەیشتبێ و نەك هەر خوێنـدن و تەواو کردنی لە زانـکـۆو بەس، زیـاتـر دوای ئەوە خوێـنـدنـەوە. . نووسینـەوە. . . بە شەوو بە ڕۆژ و. . بێ ووچـان. . لەگـەڵ هەمـوو مووچـەیـێـکـی نان خواردن (پـێش و پاش). . دەرمانیشی یان (هەر پێش یان هەر پاش نان دەخورێ). . پێش نووسـتـن. . تا نیـوەشـەو تا بەرەبـەیـان. . خۆی دەینـووسیـەوە بێ ووچـان. . بە ڕۆژ هەمیشـە ڕوویمـان نەدەدی. . لەبـەر پەرتـووك و ڕۆژنـامـەو گۆڤـارێ کە بە دەستیەوە بوو، هەتا بە پاڵکەوتنیشەوە.

ڕفیق حلمی باوکمـان نانی بەجیـا دەخـوارد. . . بەڵام خوێنـدنـەوەی زۆر کات ئێمـەش بەشـدار دەکـرد تیـا. . بەتـایبـەتی ئەگـەر شتێکی بدیـایە سوودی بوایە بۆ ئێمەیش ئەوسـا دەنگی لێ هـەڵ دەبـڕی و زۆر (بـە لەزەت) بەتـام دەیـخـوێـنـدەوە بۆمـان. . خۆ ئەگـەر شتـی حمـاسی بخـوێنـدایـەتـەوە. . گوێمان لێ دەبوو لە دوور لەبەرخۆیەوە دەکەوتە گۆرانی و وتنی حماسی. . وەك: ئەی کوردینە ئەی مەردینە. . هتد. .

وابزانم ئەوە هۆنراوەی خۆی بوو ئەو کاتە دەمانزانی دڵی خۆشـە. . ئەمجـا رامـان دەکـرد. . بجی گیـان بیگـەرێ پێی بڵێ بچین بۆ سینما. . بۆ سەیران. . هتد. . هەر ئەو دەیـوێـرا داوای شتی وەهـای لێ بکـا. . چونگـە ئەگـەر شتێکمـان بویستـایـەو بەدڵی نەبـوایـەو هاواری بکـردایـەو تونـدبـوایـە لە ترسـا رامـان دەکـرد. . جێ نەبـوو خۆمـانی

لێبشارینەوە (بۆێك (بحی)مان کردبوو بە رابەر).

رفیق حلمی خۆی چۆن بوو. . . دەیــویست ئێمــەیش هەمیشـــە درێغی نەکـەین لە خوێنـدنـەوە. . نووسینـەوە. . لێکـۆڵینـەوە. . لەبـەر ئەوە هەمـوو سەری ساڵی تازەیێـك هۆشـینــەرێکی نوێی دەدامێ. . ئەیـوت ها چیت دی: چیت بیست!

چی فێر بوی. . نیووسەوە. . رۆژێك دێ چی سوودی گشتی تیــابــوو بلاوی بکـەرەوە. . جار بەجـاریش چەنـد پەرەیێك لە یادداشتەکانم وەرگێرە سەر ئەو زمانانەی دەیزانیو بەکاریان بهێنە با ژەنگ هەڵ نەهێنن.

لە رەوشتەکانیتری رفیق حلمی پێش ئێمە بە گەلەکەی سپاردبـوو بەم هۆنـراوەیـەی لە دیوانەکەیداو گەلێ رۆژنامەو گۆڤاردا لە زووەوە بلاوی کردبووەوە.

بێهەوا کەم دوزو لەسەرخۆ ژیرو هێمن گەل پەرست».

رابــەرت ویــژدانی پاکت دەنگی زیــوو زێــر نەبێ. .

هتد. . هەروەها وتویە:

«تـاکـو دەتوانی خەریکی چاکەبەو کردگاری باش لاوی چەرخی بیستەمی تۆ کردەوەت بێفەر نەبێ».

**لەرەوشتە گشتیەکانی: ـ**

---

وسەبارەت بە ژیانی گشتیو کۆمەلاتیو رابواردنی:

یەك زۆر ژیانی کۆمەلاتێ دەویست. . ئێجگار حەزی لە میوان و میوانداری دەکرد. . بە دەستی بوایە هەموو رۆژ دعــوەتی کەس و کارو هاورێی بکــردایــە. . زۆر جار کە دەیکرد بە یەك دوو کەس و یەك دوو چێشت دەستی پێ دەکــرد بەلام دەبــو بە 20 ـ 30 کەس و 10 ـ 15 جۆر خواردن. . زۆر بە رێــزانــە چاك وچــۆنی لە وردو درشت دەکردو دەیویست ئێمەیش وابکەین.

هەتـا لە نامـەکـانیـدا یەك یەك سلاوی دەنارد بۆ هەموو کەس و کارو بەردەستەکانیشمان.

دوو:

هەمیشە ماڵێ کردبووەوە بۆ هەرچ کەسێك پێویستی ببوایە بە جێگاو رێگا بۆ ماوەی کەم و زۆر. . قوتابێ زۆر کە لە داخلی جێگـایـان نەدەبـووەوە. . ئەمـە دەزانن و لەیادیانە. . هەر وەها خزم و کەس و کارو ناسیاو نەناسیاو. . کە دەهاتن بۆ ئیشیوکار.

**سێ:** زۆر خزم و کەســی خۆی خۆش دەویــســت. . ئاگــای لێیــانبــوو. . چاکیو چۆنییـان. . پێـویستیـان. . زووزوو سەری لێدەدان و چی پێویست ببوایە بەپێی توانای بۆی دەکردن.

**چوار:** زۆر زۆر هاورێــی کۆو تازەی دەویـسـت و لێـی دەپرسینەوە. . گەلێ ئێواران کە دەچوە دەرێ ئەگەر.

کۆبـونـەوەو ئیش و کارو سەردانی چاپخـانـەو شتیتـری نەبـوایـە دەچـوە دوکـانی (بشیـر مشیـر)ی خەیـات بەرامبەر مزگـەوتی حیـدەرخـانـە دادەنیشت لەوێ هاورێو ناسیاوی دەدیو دەنگ و باسیان و حال و خواڵیانی دەپرسی. . جگە لەوە جارجــار دەچــوو بۆ (یــانــە. . نادی. . سینمــا. . (مسرح) شانۆ. . هتد. . .)یان بە تەنها یان لەگەڵ ئێمە، یا هەر لەمـاڵـەوە دەمـایەوە. . بە دەستی خۆ باخچەکەی ئاوەرشێن دەکردو لە دەوری کۆدەبوینەوە. . هەروەها خزم و کەس. . رایدەبـوارد لەگـەڵمـان بە سەرگـورشتـەو مگتـە (نـوکتە. . گالتـەوگـەپ)و دەنـگ وبـاسی گێتی. . یاخود بەخوێندنەوە دیسان. . لێرەدا دەبێ بڵێم کە رفیق حلمی (باوکمان) لە هیچ کاتێکدا ماوەی نەدەدا کەسمان لە پێرەوی پەروەردچیی بچێنە ـ دەر بە هیـچ جۆرێـك، وەك هەستـان و دانیشتن و جۆلانـەوەی نارێـك و هەرچـەنـد دەهاتەوە ماڵێ یان ناومان گشت گەورەو پچــوك لەبــەری هەڵئەستـاین هەروەهـا کە دەچــوە دەرێ. . هەتــا دراوسێکـانمـان کە ئێـواران لەبـەر دەرگـاکـانیان دادەنیشتن لەبەری هەڵئەستان کە تێدەپەریو ئەویش سلاوی گەرمـی لێدەکــردن و هەوالی دەپــرسین و منداڵی خۆش دەویست و جارجار دیاریشی دەدابێ.

ئیـستــا وابــزانم پێــویست نیــە من وەلامی پرسیــارە سەرەتاییکانم بدەمەوە. . وابزانم باش تێگەیشتن بۆ رفیق

حلمی هیـچ باسی کەس و کارو ژیـانی تایبـەتی نە بەزار نەبەنووسینەوە نەکردوە. . بە کورتی بیری خۆم دەڵێم: -

1 - چونکـە وەك دەرکـەوت هەمیشـە هەر خەریکی ئیش وکاری میریو گوێنـرانـەوە بوو. . هەمیشە خەریکی جێبـەجێکـردنی ئیش و کاری ئەم و ئەو بوو. . هەمیشـە خەریـکـی هەوڵـدان بۆ فراوان کردنـی زانیـاری. . . بۆ گەیاندنی منداڵیو خیزانە گەورەکەی نیشتمانی بە ئامانجی خۆی. . هەمـیـشـە خۆی خەریـکـی خوێنـدنـەوەو نووسینـەوەبـوو. . هیـچ ووچـانی نەداوەو ماوەی نەبـوو کە باسی کەس و کارو ژیانی خۆی بکا.

2 - هێنـدە کۆسپ و بەسـەرهـات و رووداوی گرنـك و تونـدو سەختی دیبـوو ئیتر هۆشی نەمابـوو بیـر لە رابوردوو بکاتەوەو ئاخ و داخی بێسوود بەدوا رۆیشتودا هەڵ بکێشێ - لەجیـانی ئەوە هەمـوو گیـانی تەرخان کردبوو بۆ پاراستنی ئەوانەی ماون لە هەموو کۆسپ و ناساغیو ناچارێك. . بۆ پێگـەیـانـدنیـان بەجوانترین و چاکترین جۆرو گەیاندنیان بە ئامانجی خۆیو خۆیان و وڵاتەکەیان.

3 - لە نووسینـەوەکـانیـدا هەر ئەوەی بە چاك زانیـوە کە سوودی گشتی بۆ هەمـوو خێـزانـە گەورەکـەی نیشتمـانی، گەرەك بێت.

**کۆچی دوایی رفیق حلمی: -**

ماوەیـێـك بوو هەستی بەسـەر یەشـە دەکـرد. . . پاشـان هێنـدێـك پشت یەشـەو قاچی بە قورسی هەڵئـەگرت کاتی رۆیشتن. . بەتەمابوو ئەو هاوینە بچێ بۆ بیارەو تەوێڵە، ئایا بۆ گەشت و لە گەرمـا دوورکـەوتنـەوە؟ یاخـود بۆ یادداشت نووسینەوە. .؟ بەڵام چاوەڕوان بوو من برۆم بۆ هۆڵندە بۆ خوێندن و دیارە خۆشی هەستی کردبوو تەندروستی ئەوەندە باش نیە. . بۆ ئیزن وەرگرتن بردم بۆ لای لیژنەی پزیشکان چونکـە نەی دەویـسـت بێ ئیـزن بەو هاوینـەش بروا. هەرچەند سەرەك پشکنەر (مفتش عام) وتی با ووچان بدا ئیستـا ئیشی نیـە. . لیـژنـەی پزیشکـان وتی هیچی نیە. . بەڵام ئەوەندەی بێنەچوو ئێوارەیێك لەو ئێواران و لە ماڵەوە لە ناومـانـاو لە باخچـەکـە نانی دەخـوارد. . کاتی نووستن هات لەپر هەستمان کردنە نیشانەی شەلەلی لایەکی کاتی هەستانی لە باخچەکە بۆ چوونە سەربان بۆ نوستن. . چەند رۆژ چەند پزیشك هەوڵیان دا بزانن بەتەواوی چێتنی؟ ئایا تختری خوێن یان نزیفی دەماغ نەیانزانی.

چەنـد دەرزیو دەرمـان و محـاولاتم بۆ جێبەجێکردنی گوزەرنـامـەی تا بیبـەم بۆ دەرەوەی عیـراق بۆ عیـلاج لەسەر داواکـردنی هێنـدێـك لە پزیشکـەکـان بەڵام ئەوەنـدەم ماوە نەبـوو. . زۆری نەخـایـانـد لە هەفتـەیـەك کەمتـر لە نەخۆشخـانەی سەلام کۆچی دواییکرد. . لە کات ژمێری پێنجی پاش نیوەڕۆی 4/آب/1960دا.

هەر دەست بەجێ هەموو ئەندامانی یەکێتی نووسەران و ادیبانی عیراق و نقابەی مامۆستایان گەیشتنە ماڵی جگە لە سەدەها خزم و کەس و ناسیاو هەتا دوور لە شار تەرمەکەیان بەرێخـسـت. ،. وەك بیـسـتـمـان هەر کە ئەو خەبـەرە جەرگە برەیـان بیـسـتـبـو. . بە ئیـسـتگـە (اذاعـە) بڵاویـان کردبـۆوە. . بۆیـك لە رێگا وچان بەو وچان ئەمان دی لە شارانیتریشەوە بەرەوپیری تەرمەکەی دەهاتن بۆ بە خواسپاردنی دوایی ئەو مامۆستا دلسۆزەیان.

لە کۆتـاییـدا هێنـدێـك لەو هۆنـراوانە دەخوێنمەوە کە بە زمانی عربی رەوشتی رفیق حلمی روون دەکاتەوە هەروەها بیروو باوەڕ خۆشەویستی برادەرە دلسۆزە عەرەبەکانی: -

لە هۆنراوەیێکی بەرێز عبدالسلام حلمی

رۆژنامەی خەبات عدد (ژمارە) 282 8آب/1960 ص 2 وص 5

**الى روح فقيد الأدب**

قد كان حُراً أبي النفس ذا خُلُقٍ
مُؤرجٍ للعُلى يسمو به سببُ
وفضلُهُ في حول الفكر يَعرفُه
في كلِ نادٍ هنا الاكرادُ والعربُ
- - - -
كم كافحَ الجهلَ في صبرٍ ومَعرفَةٍ
وصارَعُ الجورَ لم يَقعُدْ به رُهُبُ
يحية من رياضِ الطيب عاطرَةٌ
اليه تُرسِلُها الاقلامُ والكتبُ
وذكرُهُ بيتا باقٍ بنَفْحتِهِ
مافاحَ في طيبةِ العِرفانُ والأدبُ.

# گەشتی ژیانم

(مسعود محمد)

## ئالقەی چوارەم

قۆناغی نێوان ساوایيم و سەرەتای چوونە مەکتەبم کەوا سێ ساڵێکی خایاندووە لە هەر دوو سەریشیەوە پەراوێزی هاوبەشی لەگەڵ قۆناغی پێشتر و دواتریەوە هەیە زرە ڕەنگێکی پێوەیە وەکوو تاریـــك ولـێـلی دوای بەیـــانی کەوا نە شەوی تەواوە و نە ڕۆژی تەواو. هەنـدێ پارچـە لە ڕووپێـوی ئەو ماوەیـەی تەمـەنم لەبـەر هەستم دەخزێ و دەیەوێ خشکە بکات بۆ تەمەنێکی دیکەم، بەتـایبـەتی تەمـەنی خوێنـدم چونکـە بیرەوەری ئەو دەمانەم وەها ڕوون و ڕێــك نیـیــە ڕووداوەکــانــی جۆش خواردوو بکـــات و بەیەکەوەیان بهۆنێتەوە، هەموو جارانیش شایەدم بۆ پەیدا نابێ لە خۆم باشتـر ئەو سەردەمـانـەی بەبیـربێنـەوە چونکە زوربەی هەرە زۆریـان ،ئـەگـەر نەڵێم سەرلـەبەریان، ئیـستاکە لەگەڵ فرشتەی دوای بەسەرچوونی ژیانیان خەریکی وتووێژ ن، مەبەسیشم لەو شایـەدانـە ئەو کەســانـەن کە وەك خۆم لە ڕووداوەکەدا پشکێکی هەبووبێ دەنا پشت بەو کەسە نابەستریێ لە دوورەوەی ڕووداوەکە ژیـــابێ. بە نمـوونـەی ڕوون کردنـەوەی مەبـەست دەڵێم کە لە بەشی سێیـــەمی ئەم گەشتـــەدا باسی سەفـەری باوکم بۆ جەلی نووسی دواتر لەگەڵ خزمانم کەوتمەوە سەر باس کردنی، نە کاك مەجیدی ئامۆزام کە بە 7 ساڵ لە من گەورەترە و نە نەجیبەی خوشکم کە بە دوو ساڵ گەورەترە هیچ کامێکیان ئەو سەفەرەیان بەبیردا نەهاتەوە تا ئەوەی خەریك بووم لە خۆم بکەومە گومانەوە. باش بوو وەك بلاچەی ئەستێو بەرد کە لە شەودا چەخماخەی بگــەشێتـــەوە، نەجیبـــەی خوشکم بەبیـری هاتـەوە کە چۆن لە گەڕانەوەی باوکمدا بۆ چناڕۆك یەکێك لە ڕیزی ئەو سوارانەی بە دوایـــەوە بوون، مەلا عیـــزەتی مامـە مەلا حەبیب، کە نزیـك ماڵان بوونەتەوە هەر لەسەر پشتی وڵاغەوە منداڵێکی خۆی بەرز کردۆتەوە بۆ کۆشی خۆی و هەتا ماڵەوە کە مەوداکەی لە 100

مەتـر تێبـەڕ ناكـات بەيـەكەوە سەرەژ وور هەڵكشاون. تومەز كاك مەجيد و نەجيبەی خوشكم لەو سەفەرە بەشدار نەبوون لەگەڵ ئەم تەگەرەيەشدا دەبێ بڵێم ڕووداوی ژيانی منداڵێكی 4 ـ 5 ساڵی ئەگـەر لەبيـر كردنـەوەدا نەختێـك پێش و پاشيش بكـەوێ زەرەر بە هيچ كێشانە و پێوانەو مێژووی كۆمەڵايەتيمان ناگەيەنێ: تەنهــا زەرەرێــك هەبێ لەوەدايــە كە خۆم لە وردە حيســابی هەڵسەنگاندنی تين وتاوی ڕووداوی قۆناغە سەرەتاييەكانی ژيانم نەختێـك دڵشكستــە دەبم چونكــە دڵم ئارامتــر دەبێ ئەگــەر ڕێچكـەيـان بەرێكی بێتـە ناو نووسينـەوە. بە خێر ئەگەر تۆيش، ئەی خوێنەری نووسەر، كەوتيتە سەر باری يادنووسی وەكوو من ئەم د. لشكاويەت دێتە بەر.

لە ساڵــی 1924 باوكـم ناچــار بوو لە ڕووی تەكـلـيـفــەوە ئەندامەتی (مەجليسی تەئسيسی) قبوڵ بكات. هەرچی خاوەن ڕەئی و قسـە ڕۆيشتـوو هەبـوو لە براگـەورە و پياوماقووڵ و ريش سپی شار وەهــايـان پەســەنـد كرد باوكم نوێنـەری شار و وڵاتی كۆيێ بێ. من لەو دەمەدا منداڵێكی پێنج ساڵی بووم، هۆشم بەو جۆرە كێشانەو پێوانەيە نەدەشكاو هيچيشم لێ بەبير نايەتەوە ئەوەندە نەبێ كە دەمزانی، بە هەستی ساوايیم، هاتوباتێك لە بەيندا هەيە و قەڵەبالغی لە ماڵماندا پترە لە عادەتی، تەنانەت ئەگــەر يەكێكی قســەزان بەبيـرم بەهێنێتـەوە ناتـوانم بڵێم ڕۆژی بەرێ كردنی باوكم بەرەو هەولێر و لەويێوەش بۆ بەغدا چۆن بووە.

دوای بەسەرچوونی ئەو كژەی كۆبوونەوەكانی مەجليس هاتو باتی گەڕانـەوەی باوكم بۆ كۆيێ جمـوجـوڵی پوورەهــەنگـانـەی خستە ناو شارەوە، بە تايبەتی ماڵی خۆمان.

خەبەرێك بڵاوكرايەوە، گۆيا باوكيشم لە هەرای بەغدا دژی پەيمانی نێوان عيراق و ئينگليز كوژ راوە. ديارە خەبەری ئەوتۆيی لە دوو ڕووەوە پەرە دەستێنێ: ڕووی يەكــەم ئەوەيــە بە عادەت هەمــوو خەبــەرێكی گرنــگ خۆش بێ يا ناخــۆش بێ بە سەر زارانـــەوە خول دەخـوات و دەئـاوسێ، هەتـا خەبـەريش ڕوو لە ناخــۆشـی بێ پتــری بەســەرەوە دەنــدرێ چونكــە كۆمــەڵی زوڵم لێكـراو و كەنـەفتی وەكـوو هی خۆمـان تەجـرەبەی لەگەڵ ناخۆشی‌دا پتـربـووە بۆيـەكـا پتـر بەتـەمـای ناخۆشييە تا خۆشی ڕووی دووەم ئەوەيـە، هەمـوو ئەو كەسـانـەی لە ناحەزی و حەسادەتدا ناراحــەت دەبـن بە خۆشیی و شۆرەتی شەخسی حەســوودی پێبراو، جۆرە تەسكينييەك لەوەدا شك دەبن كە باسی ناخۆش وەپـاڵ شەخســەكـە بدەن. بەڵام ئێمـە (مـەبـەستم ئەوانـەن كە بەرپـرس و ئاگـاداری كاروبـاری ماڵـەوە بوون) دەمانزانی باوكم سەلامــەتـــە و چ ڕۆژێكيش بەرەو وڵات دەبێتــەوە. چ لە ڕێی حكومەتەوە بێت و چ لە ڕێی مەلائەفەندی هەولێرەوە بێ ڕۆژانە ئەحواڵی باوكم بەو خەڵقە دەگەييشت، چ جايی ئەوەی ناوناوە راسپــاردە و ديــاری و كاغــەزی دەگــەيشت. بە هەمــە حاڵ گەڕانـەوەی باوكم لەو سەردەمـەدا ڕووداوێكی زێـدە بەرچاوبوو: هەركـە زانـدرا گەييشتـە لای مەلا ئەفەندی لە هەولێر، كەسانی نزيكی وەكـــوو مام و هەنـدێـك لە خزم و دۆستی خۆمـاڵی بەرەو پيريەوە چوون دوای ئەوانيش كە زاندرا هاتۆتە هەڵەجە لای شێخ مارفـی شێــخ كەريمی بەرزنجی كە خاڵــە گەورەی مامم بوو، ئەهلی شار و بەشێكی ئەهلی دەشت لەوانەی حاڵ و بارێكيان هەبوو بەرەو هەڵەجە جمين. لە ئەشراف و توجار و گەورە پياوی شار كەس نەما ڕوەو هەڵەجە مل نەنێ ،تەنها جەميل ئاغا نەبێ كە قايمقــام بوو ڕێی نەبـوو [گلەييشی لێ‌نـەدەكـرا] شار بەجێ بهێڵێ .ئەويش لە ڕۆژی گەڕانەوەی بە خۆی و دەستەی دايەرەی حكومەتەوە چەند سەعاتێك بەسواری بەرەو پيريەوە ڕۆيی، كە گەيشتنـە شاريش تەرتيبـات وەهـا كرابـوو كە يەكەم دابەزينی لە ديوەخانەی جەميل ئاغا بێ.

من لەو تەمـەنـەدا هەستی هاتـوبـات و تێـك هاويشتنی خەڵق و قەڵەبالغی لە رادەبەدەر و ئەو جۆرە شتە بەرچاوانەم دەكرد. بەر لە گەيشتنی باوكم و ئەو قەڵـەبـالغيـە نەبيستراو و نەديتراوە خەڵقی شار بە گەورە و گچكـە و ژ ن و پيـاوەوە تێكـرايـان لە چاوەنـۆڕی هاتـــــەوەی باوكــم ڕژانــە مەزرای لای گردی مام جەرديس و باسكی عارەبيــان كە دەكـەوێتـە سەر ئەو ڕێگـايـەی لە جنـوبی شارەوە بە دەركی گەروو سۆركدا دێتە ناو شار. ئەو ڕێگايە بۆ ماڵی جەميل ئاغاو گەڕەكی ئێمەش نزيكترە تا ڕێگايەكی ديكە.

من لەگەڵ كافيەی مەلايان و چەند كەسێكی ديكە لە ژن و

پیاوی ماڵی خۆمان وەکو خەڵقی دیکە هاتینە سەیری ئەو هەرایە و پتر لەوان بێئۆقرە بووین بۆ دەمی دەرکەوتنی باوکم لە دوای سەفەرێکی شەش مانگی. لە گەڕەگی خۆمان شایی و زەماوند دەگێڕا و ئەهلی ماڵەوە خەریکی کار دروستایی میوان و پێداویستی ڕۆژێکی وەها دەگمەن بوون. تەمەنم ئەوسا 5 ـ 6 ساڵی بوو، بە بەر هۆش و گوشی ئەو دەمەوەم نەبوو لە هەموو سەروبەرێکی هەرای وەها گەورە بگەم ڕەنگە لە هیچ ڕێکەوتێکدا وەها نەلوابێ کە ئەو عالەمەی شار بەشداری هاتوباتی ڕووداوێك ببن ـ کە سەرەتای سواران لە کلکەی گردی کەکۆن دەرکەوتن جموجوولێکی تازە کەوتە ناو خەڵقەکەوە. بابی لەشکرێکی مام ناوەنجی سوار بە پیر باوکمەوە چووبوون.

من چاوم بڕیبووە دەمی دەرکەوتنی (ئەسپە شێ) کە پێشتر گوتبووم بە دیاری لە خاڵوانمەوە بۆم هاتبوو، چونکە ئەو ئەسپە بۆ سواریی باوکم سازدرا بوو. کە نزیك بوونەوە لێمان من بەردەوام تەماشای باوکم دەکرد، ئەو هەموو عالەمەی کە لە دواوەی‌و لە دەوروپشتییەوە و لە پێشیەوە بەرەو ناو شار دەجمین، لەو دەمەدا، سەرنجی ڕانەدەکێشام، کافیەی مەلایان و ئەوانەی لەگەڵی بوون دەشگریان و شادیشیان دەکرد. لە نزیکمانەوە و لە پشتمانەوە ئافرەتێکی بێ ئەژمار بە ڕاوەستاوی و بە دانیشتنەوە سەرگەرمی تەماشاکردن و بزرکاندن و پێکەنین و هەڵهەلەو ئەو تەرزە شتانە بوون. بەڵام زۆر بە سەیری چەند ئافرەتێکی کە لێمانەوە نزیك ڕاوەستابوون و ئێمەشیان نەدەناسی کە دیتیان بەسەر پشتی ئەو ئەسپەوە پیاوێك لە هەیئەتی (مەلای گەورە) وا دێت و پێشیەوە دیارە کە ئەو هەرایە بۆ گەڕانەوەی ئەو لە کاردایە گوتیان: توخوا تەماشای، ئەو قەپێلکەیان هێنایە بە شکڵی مەلای گەورە هەتا واتێ‌بگەین نەکوژ رایە. تومەز خەبەری نەمانی باوکم چووبووە دڵی گەلێك کەسەوە بابی ئەوەی ئەو هەموو حەشاماتەی بەپیریەوە چونە هەولێر و بۆ گەڕانەوەی چەندین سەعاتە بە ئینتیزارەوەن نەتوانێ بەدرۆی بخاتەوە. لەو دەمەدا من ئاگام لەو تەرزە قسانە نەبوو، ئەوانەی لەگەڵمدا بوون بۆ ئەهلی ماڵەوەیان دەگێڕایەوە..

لە چەندوچۆنیی ژیان و بەسەربردنی ئەو ڕۆژانەم تەنها هاتنەوەکەی باوکمم لەبیر ماوە: لە خۆمەوە ناتوانم بڵێم فلانە ڕووداو یاخود فلانە باری ڕەفتارم هی ئەو ڕۆژگارەیە. دوور نییە ڕووداوی شاردنەوەی حەفت ڕوپیەی جەژنانەم لە مەخزەنی کێلوونی ژوورێکی ماڵەوەمان، کە لە ئاڵقەی سێیەمی ئەم گەشتە باس کراوە هی، ئەو سەردەمە بێت. بەڵام هاتوباتی دروست کردنی ئەو بەشەی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد کە ناوینرا (مدرسە) هی لەبیرکردن نییە، مەسەلەکەش حیکایەتۆکێکی بەدواوەیە:

جارێك لەو جارانەی کە باوکم لە دەمی نیابەتیدا دیدەنی مەلیك فەیسەڵی یەکەم دەکات وتووێژیان دەکێشێتەوە بۆ باسی ئایین و زانستەکانی ئیسلامی و زمانی عەرەبی‌و ئەو جۆرە بابەتانە. مەلیك فەیسەڵ لە قسەکانیدا دەردەبڕێ کە حەز دەکا لە ئایین و لە زماندا پتر قووڵ بێتەوە تا ئەوەی بەم ڕستەیەی عەرەبی مەبەستی خۆی دەردەبڕێ: اريد أن استكمل معلوماتي في الدين وفي العربية عند سماحتك. ئیتر هەر لەو دیتنەدا بڕیار دەدرێ کە لە هاوینی داهاتوودا سێ مانگ بێتە کۆیێ بۆ ئەم مەبەستە. دیارە دەبێ جێگە و ڕێگەیەك ڕێك بخرێ لە دەرس و تەحسیلی مەلیك بوەشێتەوە. مەلیك فەیسەڵ چەند هەزار ڕوپیەیەکی نارد (دوو ڕوپیە دەکاتە 150 فلس) ئەو شوێنەی پێ دروست بکرێ. هاتوباتی دروست کردنی مەدرەسە لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد چونکە بۆ موناسەبەیەکی وەها گرنگ بوو گەلێك لە بارستی خۆی پتر دەنگی دەدایەوە و خەڵقی تێدەوروکان. خۆشبەختانە سەرچاوەیەکی نووسراوی گومان لێ‌نەکراو هەیە یاریدەی ڕوون کردنەوەی ئەم لایەنە دەدات:

ساڵی 1953 کە نائیب بووم، نامەیەکم وەرگرت لە مەلا ئەحمەدی ئیمامی مزگەوتی (زیوە و مزورکا) لە ئامێدی گەلێك بیرەوەری ئەو ڕۆژگارانەی تێدا بوو کە لای باوکمی خویندووە و ئیجازەی لێ‌وەرگرتووە. لێرەدا چەند دێرێکی ئەو نامەیە دەخوازمەوە کە پێوەندییان بە دروست کردنی ئەو مەدرەسەیەو هێندی سەروبەری ناواخنی نووسینەکەمەوە هەیە.

لە بەرەو کۆتایی ڕووپەڕەی دووەمی کاغەزەکەی ئەمانە

دەنووسێ، بە عەرەبی نەك کوردی کە دواتر عوزر دەهێنێتەوە بۆ لەبیرکردنی نووسینی کوردی بە لەهجەی سۆرانی و گۆرانی رێنووسی تازەی کوردی کە ئەو زەفەری پێ نابات. مامۆستا دەفەرموێ: ایها الاستاذ السید کاکە مسعود أنا سکنت في حجرة مسجد جدکم الحاج محمد أسعد أفندي لمدة اربع سنین تقریباً وفیها أخذت العلم من العالم الکبیر والعلامة النحریر والدکم المرحوم طیب الله ثراه وجعل الجنة مثواه ومأواه وحین الختام أخذت منه الاجازة العلمیة وذلك بتأریخ 1346هـ [1927م] حینما کان المرحوم قاضیاً وجمیل آغا قائمقاماً وقد أخذت الاجازة في المدرسة الجدیدة التي شیدها له الملك فیصل الأول بحفلة عدیمة النظیر دامت ثلاثة أیام بلیالیها حضرها رؤساء الدوائر وحضرها جمیع صفوف المدرسة الرسمیة بزیهم الرسمي وبأناشیدهم وکنت انت ایها الاستاذ السید في دور الطفولیة ولا ادري هل کنت في الصف الأول أو الثاني والشقیقة السیدة نجیبة خاتون متقدمة علیك ومن العجب أن عبدالمقتدر کان یحبني حباً جماً وماسبني قط خلال تلك المدة الطویلة وکان یسب کل من شاء حقیراً أو عظیماً وفي تلك المدة تصادف انه جاء عندي وخدمني الشخص الذي سوّد الله وجهه وجعل جسمه مطابقاً لاسمه المدعو حمه رش فاراد ان یسرق من بیتکم شیئاً مکافأة لکم علی احسانکم ففضحه الله علی رؤوس الاشهاد فالقی القبض علیه الاستاذ الوالد في نصف اللیل تقریباً...

لێرەدا مامۆستا یادی عبدالمقتدر وبەدوا ئەودا حەمەدی ڕەش دەکاتەوە کە لە ئاڵقەی پێشووتر ناوی خۆی و باسی دزینەکانی هاتنە ناو ئەم نووسینەوە، نەختێکیش ئاهەنگی دروست کردنی ئەو مەدرەسەیە ڕوون دەکاتەوە کە ئەگەر ویستبای دەیتوانی پتری لەسەر بروات چونکە تەنها ئاهەنگی دەست بەدروست کردنی سێ ڕۆژ ی خایاندووە، پێشتریش هەرگیز رووی نەداوە لە کۆیێ خانووێك بە ناوی سەرۆکی دەوڵەتەوە بۆ تاکێکی ئەو شارە بە ئاهەنگی ڕەسمییەوە بنیات بنرێ. من لەبەر ساواییم کە جارێ نە چووبوومە مەکتەب، هێندەی مامۆستای نامەنووس ووردییاتی ئەو هاتو باتەم بەبیردا نایەت بەلاّم لە تێکڕای قەڵەباڵغی و تێك هاویشتنی خەڵق و سەرەتاتکە کردنیان لە عەمەلەو وەستای بەننا و ئەو جۆرە دیمەنانەوە دیمەنێکی گشتی دەوامەداری بیندرێژ ی پرجمـوجووڵ و چالاکی یاد دەکەمەوە کە لە کۆتایی‌دا سەری گەیاند بە ڕاپەڵ کردنی ڕستەیەکی درێژ ی جل لەسەر هەڵخستن لەلایەن وەستای بەنناوە کە خوالێخۆشبووی وەستا شاکر بوو، ئیتر هەرچی خاوەن ناو و جێگە و ڕێگە و هێز و پێزێکی شار هەبوو تۆپە قوماشی دەهێناو وەکوو جلکی شووراو بەو ڕستەی دا دەکرد و دەبوو بە خەلاّتی وەستا. بریق و باقی ئەو تۆپە قوماشانەی هەمە جۆری هەمە ڕەنگە تا ئێستاکەش لە مێشکمدا دەتریسکێتەوە وابزانم بە ناوی منیشەوە تۆپە قوماشێکیان کرد بە شاباشی وەستا.

مامۆستا لە نامەکەی‌دا دەڵێ لە 1927 اجازەی وەرگرت و ئاهەنگەکەشی لەو مەدرەسەیە بووە. ئەوسا من لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی دەرچووبووم بۆ پۆلی دووەم. هەرچی دروست کردنی مەدرەسەکە بوو لە 1925 دەستی پێ‌کرد و تەواویش بوو کە جارێ من نە چووبوومە مەکتەب. بە هەمە حاڵ مەلیك فەیسەل نەیتوانی بێت بۆ کۆیێ. وابزانم گیروگرفتی (استفتای ولایەتی موصل) دەرفەتی نەدا: نامەیێکی عوزر خوازیو کۆمەڵێك کتێبی بە دیاری هەنارد بۆ باوکم بەلاّم ئەوەندی من هەستم بەشتان کردبێ بۆم ڕوون دەکاتەوە کە باوکم ئەو وەعدە بە خیلافەی مەلیکی لە بیر نەکرد، دواتریش کەڵەکە کردنی تەجرەبەی تاڵ لە دەمی مەلیکایەتی ئەودا وەعدە بە خیلافەکەی زیندووتر دەکردەوە تاکوو لە دەرفەتێکدا بایی ئەوەی مومکین بێ مرۆڤیکی ڕێز لەخۆ ناو تۆڵە لە مەلیکێك بستێنێتەوە باوکم، بە زیادەوە، تۆڵەی لە مەلیك فەیسەڵ ستاندەوە. بەخێر لە شوێنی خۆی‌دا ئەم لایەنە ڕوون دەکرێتەوە و هەڵوێستێکی پرجورئەتی باوکمی تێدا مەفهووم دەبێ.

لە نامەی مامۆستادا باسی جنێودانی عبدالمقتدری تێدایە: قسەی مامۆستا ڕاستە بەلاّم دەبێ ڕاستییەکی دیکەی وەپاڵ بدرێ تاکوو ئەو (جنیوفرۆشی)یە جێگەی ڕەوای خۆی پێ‌بدرێ: عبدالمقتدر بە دەردی شەپرەی ساوایان ئەو هۆشەی نەمابوو بە نیازی سووك کردن جنێوبدات. بۆ بێ‌تالعی خۆی و ئەو کەسەی

ڕێکــەوت دەیکــرد بە نیشــانــەی تیــری قسـەکـانی، هەنــدێ شوێنــەواری کۆنــە زەکـاوەتی‌ی بەر لە دەردەکـەی پێـوە مابوو: تا بڵێـی ڕقـی لە درۆ بوو، تا بڵێـی کاری بێ‌جێێ بەلاوە ناشیــرن بوو. درۆی لە هەر کەسێـك بدیتـایـە یەکـەنـدەردوو بەو زمـانـە شکستــەی شەپـرەولێ‌دراوی خۆیـەوە لە دەستی دەنـا، دەیگـوت (بەسەری جەنابی بابم وادەکەی لەبەر درۆیەکی) واتە (بەسەری جەنـابی بابم درۆ دەکـەیت) ئیتـر کابرای وەها سەرشکێن دەکرد ئەگەر شەرمی بەخۆی بوایە جارێکی‌دیکە لای ئەو درۆی نەدەکردەوە.

زۆر کەســی حەز لە گەپ کردوو بە ئانقــەســت زرە درۆی ناقۆڵایان لەلا دەکرد هەربۆ ئەوەی جنێوی شەق وپەقی حاڵەتی ڕق هەڵستانی لێ‌ببیەن، ماڵم هەقە ئەویش درێغی لێ‌نەدەکردن ئیتـر بەو زمـانـە شێـواوەی شەپـرەداریـەوە تەعبیـری وەها سەیری دەردەپـەڕانـد کە لایـەنی جنێـوەکـەی لە بیران دەبردەوە و کابرای جنێوپێ‌دراو لە هەموو کەس پتر بە خۆی و قسەکان پێ‌دەکەنی. ڕاستییــەکــەی گەلێــك جاران لایـەنی غەدر لێ کراو لەو تەرزە وەزعەدا عبدالمقتدر خۆی دەبوو چونکە وەها سەغڵەت دەبوو بە کاری نالەبار و بە درۆ و فیشاڵ دەهاتە فێ‌گرتن. گوێی لێ‌بایە یەکێك بەزار جرت دەکێشێ هەر بە جارێ شێت دەبوو.

یەکێك لەو تەڵانەی کە هەموو جارێ پێوەی دەبوو ئەوە بوو کەوا بە عادەتی خۆی ئەگەر وشەیەکی تاکت بۆ درکاندبایە دەهات لە ئەلفەوە هەتا یێ هاوکێشی ئەو وشەیەی دەگوتەوە، بە نموونە: ئەگـەر بتگـوتبـایـە: هۆ کاك مقتدر ئەرم. ئیتر وشەی دەژماردن، ئەرم، بەرم تەرم... تادەگــەیشتــە دەنگی (ك) وشــەکــە دەبــووە (کـەرم) ئنجـا دەیـزانی تەپکـەی بۆ نراوەتەوەو شریتەی وشەکانی دەبریەوە و ڕووی لە کابرا دەکرد: هەی صەگی منافق... بەڵام بە خۆیشی پێ‌دەکەنی. بەدوا ئەوەدا ئەگەر یەکێکی دیکە گوتبای (ئەگم) کاکە مقتدر پێدا دەچوو تا (صەگم)... خولاسە هەرگیز تەنبێ خواردوو نەدەبوو چونکە هەم هۆشکول بوو هەم ئەسیری عادەتی خۆی بوو.

عادەتێکی هەبــوو هەرگیــز تەرکی نەدەکــرد: ئەگــەر ناوی یەکێکیان بردبایە لە بەیت و مەتەڵ و بەستەدا هەبوایە دەبوو ئەو شتە فۆلکلۆرییە بخوێنێتەوە و ناوەکەی تێدا دووپات بکاتەوە. لە (پێ‌بــازۆك) فەلاحێکی بەرچــاو کە برای مام فەتــاحی وەکیلی باوکم بوو ناوی (سلێمان) بوو. چەند جاری هاتبایە لامان لە کۆیە و کاك مقتدر بی‌دیتایە بەر لەوەی ماندوونە بوونی لێ بکا گوتــەیـەکی فۆلکلۆری‌ی دەخـوێنـدەوە کە دەڵێ: ئەلـوور بلوور تەکـامێ، زەرتــك شوورتــك شەمــامێ، ئاڵنجی باڵنجی سلێمــان فنجی.. پەنجەی بۆ مام سلێمان ڕادەکێشاو لە تریقەی پێکەنینی دەدا ئنجــا مانــدوو نەبـوونی لێ‌دەکـرد یان لەبیـری دەچـۆوە. جارێکیان چووە لای موستەعیدەکانی باوکم لە مزگەوتی گەورە. میوانێکیان هەبوو مەلا خدر ناوێکی زۆر موحتەرەم و ئیجازە وەرگرتووبوو.

بەعــادەتــی هەمیـشــەیـی بەخێــرهــاتنێکی گەرم وگــوڕو بەسەروسەدایان لە کاك مقتدرکرد و مەلاخدریان پێ ناساند کە مەلایەکی وەهاو وەهایە. ئەویش هەرکە ناوی (خدر)ی بیست دەماری فۆلکلۆر دۆستییەکەی بەخەبەر هات و دەستە ساغەکەی چەپەی بڵندکرد بەرەو مەلاخدر و گوتی: چەندم گوت خدری بەسێ، بەشەش خانان دامەڕسێ، ئی‌کەرێت بەڕێێ...!!

وەها دەبوو لە خۆوە قسەیەکی ڕێکی پێکەوە دەنا و دەیکرد بە بابەتێکی فۆلکلۆری وەك ئەوەی کە جارێکیان ئافرەتێکی دیت و بیستی ناوی (ســارێ)یــە، ئیتـر دەست بەجێ و بێ‌وەستــان، بە لەهجـەی ئاخـاوتنی کۆیێ گوتی: سارێ، وەرە مارێ، پێکـەوە بنووین هەتا بەهارێ..

کاك مقتدر لە دوو جۆرە گرەو هەرگیز نەیدەدۆڕاند: یەکێکیان چەڵــەمـەشکێنـە ئەوی دیکـەشیــان شەرە شیعـرێ: لە بابـەتی چەڵـەمـەشکێنـە بۆ خۆم دیتم جارێکیــان دوای نانی نیوەڕۆ کاکە مقتدر بەسەر دەستشۆرەوە دەستی دەشوشت ئاوی لە دەمدا بوو، کابــرای مەسینــە بەدەست کە چەڵــەمـەی لەگـەڵ کاك مقتــدر شکاندبوو، دەرفەتی دیت و صابوونی خستە دەست ساغەکەی کاك مقتــدرەوە، بەڵام بەر لەوەی بتـوانێ بڵێ: بردمـانــەوە ،یان دۆڕانــدت کاك مقتــدر بە زاری پڕئـاوەوە گوتی لەبیــرمە هەرچەند قسـەکەشی لەگەڵ ئاوەکە بە بڵمەبڵم لەزارەوە دەرهات.

بۆ شەرە شیعــری چەنــد قصیــدەی لەبــەربــوون بە پیتی

(ث، ض، ظ . . ) کۆتایی‌یان دەهات یان دەستیان پێ‌دەکرد.

دەردی شەپرە دووچاری مرۆیەکی زیرەکی هەستیار بووبوو. لەوەوە ئاکامێکی لەنگەر نەبەستوو پەیدا بووبوو، بەشێکی شەپرەو بەشێکیشی لێ‌هاتوویی بەر لە شەپرە بوو.

جارێکیان چوو بۆ لای فەقێکانی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد، دیتی پیاوێکی مام حاجی لە ئەهلی گەرەك کەوا شەوانە لە مەجلیسی باوکم پەیدابوو خەریکە لەو حەوزەی دەزنوێژی لێ‌دەشوورێ تارەت دەکات: یەکسەر چووە لای قایمقام، جەمیل ئاغا، و ناچاری‌کرد ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ مام حاجییان خستە بەندیخانەوە، دواتریش بەخاتر خوایی لێی خۆش بوو.

کاك مقتدر لەگەڵ ئەو دەردە کوشندەیەوە چهرەیەکی بەزچاوی کۆیە بوو: تێکرا ،لایەنی چاك و خراپی بخرابایەوە سەریەکدی، شەپرەدارێکی ئیسك سووکی قسەخۆشی خۆشەویست بوو.

لەگەڵ دەستەو دایەرەی مەکتەب پێوەندییەکی بەتین و بەردەوامی هەبوو، خۆیشی بەر لەوەی دەردەکەی دووچار بێ قوتابی و هاوڕێی دەرس و دەوری مەلا فەتاحی مەلا عیزەت و مەلا نافیعی مەلا سبووح و کاك مجیدی ئامۆزام بوو ناویشی بە زیرەکی دەرکردبوو. لە بیرمە کە قوتابی بووم، ئەو ڕۆژەی کاك مقتدر هاتبایە مەکتەب مدیر و مامۆستاکان و قوتابیەکانی پۆلی پێنج و شەش لەگەڵی‌دا خەریك دەبوون و دڵیان ڕادەگرت و ئەنواعی گەپ و سوحبەتی خۆشکەڵەیان بۆ دەهێنایە کایەوە.

بەهاران قوتابیەکان کە حەزیان لە سەیران دەبوو مدیریشیان پێ ئیقناع نەدەکرا خێرا هانایان بۆ کاك مقتدر دەبرد و لای باوکم تکای بۆ دەکردن ئەویش پسوولەی بۆ مدیر دەنووسی، مدیریش، خوالێ‌خۆش بووی مەلا عەبدوررەحمان شەرەف، قسەی باوکمی نەدەشکاند و دەی‌کردە سەیران . . ئیتر هوتافی (بژی کاکە مقتدر) لە قوتابیانەوە بەرز دەبۆوە.

کاك مقتدر بە گەلێك باردا بۆ کەسانی دەوروبەری خۆی مایەی خۆش وەختی‌و نوکتەبازی و فەرامۆشی بوو: لە هەر جێگایەك دیارکەوتبایە یەکەم ئاکامی دەرکەوتنی لای خەڵقەکە پێوەگەشەناوە دەبوو، تالایی‌ی دەردەکەی، بەزۆری، بۆ خزمی نزیکی خۆی بوو. لەگەڵ خزمانیش ئاغلەب هەر بەپێکەنین و گەپ و گەشایی دەی‌بردەسەر.

دوو سێ ساڵی کۆتایی عومری حەزی دەکرد ژنی بۆ بهێنن و بە هۆشە کولەکەی خۆی پشتگیری لەو حەزەی دەکرد. بە نموونە: دەیگوت، بەسەری جەنابی بابم فلانەکەس وا دەکا لەبەر دوو ژنان ئەمن سمێڵیشم گەورەترە لە سمێڵی ئەو وا ناکەم لەبەر ژنەکی.

گەلێك جار خەڵقەکە ئەم لایەنەیان دەکردە هۆی تەردەماغی و قۆشمەیی و نوکتەی جۆراجۆریان لێ‌پەیدا دەکرد: یەکێك لە خەڵقی گەرەك ژنێکی پیرو یەکێکی جحێڵی هەبوو، خۆیشی حەزی لە نوکتەبوو، دەیگوت کاك مقتدر ئەگەر حەزت لە ژنە (داکی گەورەت ـ مەبەستی ژنە پیرەکەی بوو) لێ‌پیرۆزبی، ئەویش بە دڵسافییەوە دەی‌گوت: ناپیاو، توسەری جەنابی بابم وەها بکە لەبەر ژنە جوانەکەت لۆ خاتری من.

کاك مقتدر هەر لە نیازی ژن هێنانەوە دەیگوت: لە سەربانان قیرەقیر شایی کاکە مقتدیر. گورج خاڵی، مەلا عیزەت لێی دەقۆستەوە: لە کۆلانان تەپوتۆز شایی خاڵی ردێن بۆز.

ڕۆژێکیان بە هەڵەداوان هات بۆ لای باوکم و بەگەرمی داوای لێ‌کرد ژنێکی بۆ بهێنێ. باوکم پێی‌گوت: ڕۆڵە من ژنم هێنا تۆی لێ بوویت، تۆ ژن بهێنیت دەبێ چی لێ پەیدابێ . .

لە چارەسەرکردنی دەردەکەی ئەوەی مومکین بوو هەوڵی بۆ درا. جارێکیان هەناردرا بۆ خەستەخانەی کەرکوك کە ئەوسا جارێ ئۆتۆمۆبیل پەیدانەبووبوو، دکتۆری ئینگلیز لەو خەستەخانەیە سەرپەرشتییان دەکرد . . جارێکی دواتر هەناردرا بەغدا، خاڵی مەلا عیزەت و چەند کەسێکی دیکەی لەگەڵدا بوون . لە فحصی ڕۆنتکین دەرکەوت ئیسکێکی جامی سەری سەرەژێر ڕۆ چووبوە ناو مێشکی . دکتۆرەکان بە مەلا عیزەتیان گوتبوو دەتوانین عەمەلیەتی بۆ بکەین بەڵام لایەنی تێدا چوونی یەکجار بەهێزترە لە ڕزگار بوونی مەلاعیزەتیش دڵی نەهاتبوو بیداتە دەم چەفوکارییەکی کە سەدی نەوەدی بکێشێتەوە بۆ مردن. دواتر کە هاتنەوە بۆ کۆیێ، باوکم بە مەلا عیزەتی گوت

خۆزی عەمەلیەتەکەت بۆ دەکرد. گوتی قوربان وەڵڵاهی وەك ئەوەم دەهاتە پێش چاو کە بەرخ تەسلیمی قەساب بکەم، دڵم بروایی نەدا.

ڕووداوێك لە کاك موقتەدیر دەگێڕمەوە، بەر لە مردنی بە چەند ڕۆژێك خۆم چاوم لێی بوو کە ڕووی دەدا مەبەسیشم نییە خوێنەر بهێنمە سەر باوەڕکردن بە تەعلیلی غەیبی، حەز دەکا دیاردەکە بداتەوە بە (نفس، عقلی باطن.. هتد) یا هەر شتێکی بە باوەڕی خۆی جێی متمانە بێ بەڵام لێم بسەلمێنێ کە چی دەیگێڕمەوە یەك زەڕرە گومان لە ڕاست بوونی ناکرێ:

چەند ڕۆژێك بوو کاك موقتەدیر هەر باسی بەهەشت و مردنی دەکرد. هەتاکوو جارێکیان ڕووی لە باوکم ناو گوتی بابە بەسەری جەنابی بابم بەهەشت زۆر خۆشە هەر دەبی وابکەین لەبەر بەهەشتەکی [واتە: دەبێ بچینە بەهەشت] باوکیشم مەیلەو بە زەردەخەنەوە پێی گوتەوە ڕۆڵەکەم خواحەز بکا دەچینە بەهەشت ئەمما جارێ زۆر زووە سەبری لێبگرە. کاك موقتەدیر هەر لەسەر قسەی خۆی سوور بوو، تەنانەت پێوەی دیار بوو وەزعی ئاسایی و عادەتی خۆی پێوە نەماوە و فکری [ئەگەر بتوانین بڵێین فکری هەبوە] لە تەشویشدایە. ڕۆژێکیان چێشتەنگاو بوو من لەگەڵ کاك مقتدر لە کەلەگی کۆشکی ماڵەوەمان کە بەسەر حەوشەی حەرەمی دادەنواری ڕاوەستابووم دیتم لە نکاو کاك مقتدر ڕوەو قیبلە چاوی ئەبڵەق بوون و ڕووی بزرکا بەڵام بزرکانی گەشایی و هاواری کرد: وەڵڵاهی دیتم، بەسەری جەنابی بابم دیتم، وەی چەند خۆشە بەهەشت... هەر ئەمەی گوت و گوڕی بەست بەرەو حەوشە لە پێپلکانەوە سەرەژێر ڕۆیی بە خێراییەکی ئەوتۆ هەرگیزاو هەرگیز دەیەکی ئەوەش لەو ڕەچاونەدەکرا لە حەوشەش بە گورگەلۆقە [کە لە هەموو ساڵانی نەخۆشیەکەیدا سێبەرێکی ئەوەشی لێ نەدیترابوو] بەرەو هەیوانی ئەو بەری حەوشەکەوە ڕۆیی کە باوکم و دایکم لێی دانیشتبوون و بەدرێژایی کاتیش بە دەنگی بەرزەوە دەیگوت و دەیگوتەوە، بەهەشت خۆشە، وەی چەند خۆشە، بەسەری جەنابی بابم دیتم.. دەچمە بەهەشت.. تا گەییشتە لای باوکم، ئیتر ئەوەی دەگوت و دەسوورا و دەگەڕا وەك سەرخۆش باوکیشم خەریك بوو هێووری بکاتەوە. ڕاستییەکەی جۆرە حەپەسانێکی بەسەر هەموو ماڵەکەدا هێنا. خۆم لەو تەمەنەی یازدە ساڵیمدا نەمەزانی فکرم بۆ کوێ بەم مەگەر ئەوەی کە بڵێم شتێکە و هێزێکی وەك جەزبە گرتن وورووژاندی، یان بەڕاستی شتێکی هاتە بەر چاو لەو بەهەشتە بکات کە خۆی باوەڕی پێی هەبوو. بە هەمەحاڵ دیمەنەکە یەکجار بەولای عادەتییەوە بوو بە خەیاڵی کەسیشدا نەدەهات موقتەدیر ئەو هێزەی ماوە یان قاچە سەکەتەکەی دەتوانێ هەنگاوی ئەوتۆیی پێ هەڵبهێنێ. ئەو ڕۆژە هەر خەریکی (بەهەشت و بەهەشت خۆشەو دەچمە بەهەشت) بوو. وابزانم هەر ئێوارەی هەمان ڕۆژ یان ڕۆژی سبەینێ فێیەکی وەهای گرت خستییە ناو جێگەوە و لێی بەهۆش نەهاتەوە لە چەند ڕۆژێکدا کە کەوتە ناو جێگە ورده ورده ژمارەی فێیەکانی زیادی کرد تاکوو وەهای لێهات لە دەقیقەیەك دوو دەقیقەدا جارێکی دەگرتەوە بەڵام بێهەڵپەو زیرە و لنگە فرتکێ: هەر ئەوەندە بوو دەلەرزی و ڕووی دەبزرکا.

باوکم بەخەتی خۆی لە مەرگی موقتەدیردا ئەمەی بە عەرەبی نووسیوە: انا لله وانا اليه راجعون ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم توفى ابني وقرة عيني المعصوم المبتلى بالفالج والصرع الشديد وقد ذقت مرارة الموت كل يوم مرات عديدة حين ارى نوبات صرعه قد عجز الاطباء عن مداواته منذ سنين وهو عبدالمقتدر ولم ير من عمره لذة وقد جاوز العشرين في ليلة الخميس بعد الساعة الثامنة منها غرة شهر شعبان المعظم سنة 1348هـ.ق 1307هـ.ش 1930م.

ئەم (الساعة الثامنة) بە هی پاش ڕۆژاوایە نەك پاش نیوەڕۆ.

مامۆستای نامەنووس کە یادی کاك مقتدری تێداکردبوو دەڵێ لە ساڵی 1927ز. ئیجازەی لە باوکم وەرگرتوە و ئاهەنگەکەشی لە (مدرسة)ی ناوبراودا بووە: ڕاستییەکەی من ئەو ئاهەنگەم بەبیردا نایەتەوە، یاخود دەبی بڵێم لەو ئاهەنگانەی کە لەو مەدرەسەیە بەرپا بوون نازانم کامیان هی مامۆستا بووە، بەڵام ئاهەنگێکی زووترم دێتەوە یاد کە جارێ نەچووبوومە مەکتەب قەڵەباڵغیەکی زۆری لەو مەدرەسەیەدا کۆدەکردەوە: باوکم کچی خۆی (عفت) کە خوشکە گەورەی عبدالمقتدر بوو دا بە شێخ

تلیانـەیەکم دانا. دەڵێ: تاقەتیت کر.. لەوە بەولاوە چی‌دیکەم بەبیر نەماوە و نازانم کەڵەباب و مێروو چۆناوچۆنی لەو شەرعە بوونەوە.

دەیانگێرایەوە کە عومەر تازە لەبەر خوێندنی مەکتەب داندرا بوو، شەوێ موتـاڵای دەرسـەکانی دەکـردو درێـژەی دەدایێ، دایکی بە لەهجەی خۆی پێی دەگوت: رۆڵە حومەرە خەتەکی وێرا بینە و یەکی وێرا بینە و چرایەکە وەکوژێنە دایك لە خەیاڵی نەوتی چراکە بوو بەخەسار نەچێ، چاکیشی بۆ چووبوو چونکە عومـەر لەوانـە نەبـوو بە خوێنـدنـەوە دابین بێ. مەخلوقێکی بزۆزی ناراحـەت بوو هەر چەنـد لە دوو خاڵـەوە زۆر بی‌عـەیب بوو: هەتا بلێی دەسخاوێن بوو، قەت بەدزیەوە دەنکە ترێیەکی نەخستۆتە زاریەوە.

هەتا بشلێی لە ئەمروگوێ‌دا بوو، لە رووی لە خۆگەورەتران هەڵ نەدەگەرایەوە.

کەتـنـێـکـی کرد.... هەڵات بۆ پژدەر، دوو سێ ساڵان لە سندۆڵان لای شێخ حەسەن و شێخ حوسێن مایەوە. دوای ئەوەی کەتنـەکـەی لێ بەسـەر چوو هاتـەوە، عومـەر بەشێـوەی پژدەر دەئـاخـاوت، ئەو لە هجـەیـە لەگـەڵیدا ژ بیا تا مردن بەڵام وردە وردەیـەکیش بەلای ئاخـاوتنی کۆیـەدا دەهـاتـەوە. پووربـەگی بریـاری دا ژن بۆ کوری بهێنێ: کچێکی رووسـووری، هەتـا بڵێی بە حەیـا و بێ‌دەنـگ و بێ سرکـە و کورکـەی بۆ هێنـا. شەوێکیان دەوری نوێژی عیشا کۆمەڵە ژنێکی گەرەکی خۆمان و لەشکرێکیش لە منداڵی ئەو ناوە، منیان لەگەڵدا، چووین و لە گەرەکی قەلاتەوە بووکمان گوێستەوە بۆ عومەر. ئێستاش نازانم وەها رێك کەوت یان کێ وەهای رێك بەخست هەرکە بووك پێی لە دەرەوەی ماڵەوەی ناو کەوتە نێوان ئافرەتانی گەرەکەی خۆمان ئەو هەموو منداڵە بە چەپڵە رێزان تێیان هەڵکرد، ئەمجا چۆن تێ هەڵکردنێك (هە تلیلینجان هەتلیلینجان، زاوا کەچەڵ بووك باینـجـان..) یەك بین و یەك نەوا ئەم چەپڵەکـوتـانـە و دور قەڵێشییـەی بەخێـر هێنـانی بووك بەردەوام بوو هەتـا بووکمـان بەستایە ماڵە کاوڵەکەی مێردە نا موبارەکەکەی. دەسا نە ئەو دەمە و نە بەهیـچ وەختێـك و نە ئێستـاکـەش زانیم مانـای چی: هەتلیلینجان! ئەرێ ئێوە کەسێتان دەیزانێ؟

داستـانی عومـەر کۆتـایی بۆ نییـە، لە کورتی دەی‌بـرمـەوە و دەڵێم: عومەر مرۆیەکی دەسخاوێنی، تەنبەڵی، درۆزنی، بەوەفا و مردەی ولاغـە بەرزە بوو. لە نمـوونـەی شەیـدا بوونـی بۆ سواری ولاغە بەرزە لە نێو چەندین نموونەدا ئەمەیان بۆ خوێنەر دەگێرمەوە: جارێکیان، سەرەتای هاوین بوو مامم عومەری ناردە پێبازۆك بۆ لای مام سلێمانی وەکیلی خۆی کە هەندێك دەغڵی بۆ بفرۆشێ و پارەکەی بۆ بنێرێ بە عومەردا. کوری گۆنگەران کاکـە عومـەر یەکسـەر چووە لای کوێخـا محەمـدی کوێخـای پێبـازۆك و سەلامی مامـی پێ‌راگـەیـانـد و گوتبـووی کاکم (مـەبـەستی مامـە) منی ناردووە بۆ لای تۆ ئەسپـە بۆرەی بۆ بنێـری، سەفـەری پژدەری هاتـۆتـە پێش لە خزمـەت کاکیـدا و زۆریش بە پەلەیە ئەگەر ئەمرۆکەی ولاغ نەگەیەنمێ بەجێ دەمێنێ.

کوێخـا محەمـدیش پیـاوێکی بەرێ‌وجێ و ئەوسـا خاوەن ئەسپ و ماینی نایـاب بوو، گوتبـووی عومـەر، دەبـوو بۆ جاری وەهـا ئەمنیش بە پیـاو بخوێنێنەوە و لێم بگێرنەوە ئەمما ئەوە ئەسپە بۆرە و حەز دەکەی بی‌تۆێنە.. عومەر لە وێوە بە سواری یەکسەر هاتەوە بۆ کۆیێ و لە هەمووی بەغار ئەسپەکەی هێنا لە دەشتی (شەوگێر) هاتوچۆ بە ئەسپەکە دەکات و بە ناو کێڵە قەبرانیدا تاو دەدات، کێـلێـك بەینی هەردوو دەستـانی شەق کردبـوو. کە گەیـیشتـەوە بەر دەرگـەی ماڵی مامم ئەسپ لە خوێنـدا سوور بووبوو. مامم بەرێکەوت ئەسپەکەو عومەری دیت بەر لەوەی لە دەرگـەی دەرەوە بە ژوور کەوێ ،زانی کاکـە عومـەر فەتحێکی کردووە نەیهێشت بێتە ژوورەوە هەر لە بەر دەرگە لێی پرسی چی

رووی داوە ئەویش بەراشکـاوی لە ئەنبـاری درۆیـان لا گۆلمێـك قسـەی لووس و لێکی هەڵـرشت و گوتی: چوومە لای سلێمـان هەر خۆیشی تێ‌نـەگـەیـانـدم ئەمنیش دەمـزانی پارەت لزوومە چوومە لای کوێخا محمد و وەزعم تێ‌گەیاند گوتی لەو دەمەدا چ پارەم نییە کە وەهاش پەك لەسەر پارە کەوتبێ ئەسپە بۆرە قوربانی کاکە شێخ بێ (مەبەست مامم شێخ نوورەددینە) با بی‌فرۆشێ، منیش لەسەر تەکلیفی خۆی بۆم هێنای.

سەیـر ئەوەیـە، سەد کەتنی ئەوتـۆیی دەکـرد و لەبـەر چاوان نەدەکەوت: ڕاستییەکەی بەدڵ دڵسۆز و جانفیدا بوو بۆ ماڵی ئێمە و ماڵی مامم.. دواتر بوو بە پۆستەچی لە نێوان کۆیە و ڕانیە، مانگی ولاغێکی سەکـەت دەکـرد، هەنـدەی ولاغ بە پارەی پووربەگی کری ئیفلاسی پێکرد ـ ناوناوە منداڵێکی دەفرۆشت. هەتا مردن نەیحەساندەوە نەحەسایەوە.

یەکێـك لەو چیهـرە پاك و خۆشـەویستـانـەی کە لەگـەڵ یادکردنەوەی کزەم لە جەرگەوە دێت بۆ خۆی و مەرگی ناکامی، حەمـەدی نەجیـم ئاغـای غەفـووری بوو، کەوا بێ ئەوەی (خوانەخواستە) ناوی خزمەتکاری لێ‌بێ بە جان و دڵ خزمەتی باوکم و مەجلیسی باوکمی دەکرد. لە ماڵەوە وەکوو کوڕی باوکم حیسـاب دەکـرا چ تەقیـە و پەردە لە بەینـدا نەمابوو، ئەویش بە جۆرێـك چالاك بوو لە جێبـەجێ کردنی هەرچی پێـویستی خزمـەتی دیـوەخـانـەو مێـوان بێ دەتگوت خۆراکی گیانی خۆی جێبەجێ دەکات. بەر لەو کوڕێکی حاجی تەهای جیرانمان، کە ناوی ئەحمەد بووە و من بەبیرمدا نایەت و ڕەنگە پێش ئەوەی من پێ لەم دنیایە بنێم ئەو ماڵاوایی لێکردبێ، ئەویش بۆ باوکم لەخـۆ بووردوو بووە بە جۆرێـك کە چەنـدێکی باسی دەهـات باوکم خەفەتێکی نوێی بۆ دەخوارد. حەمەدی نەجیم ئاغا زۆر بەشلکی و حجێڵی جوانـەمـەرگ بوو. هەر لە هەوەڵـەوە ڕەنگی زەردباوی نەساغیەکی نادیاری لە ڕوودا ئاشکرا بوو بەڵام کە من دەمدیت بەو جلکە شیکە خاوێنەی لەبەری دەکرد و بەو ڕەوتی قەشەنگی جحێڵانەی و بەو هەموو نەزاکەت و نەجابەتەی کە بە خزمەتی باوکمەوە خەریك دەبوو نموونەی مرۆیەکی فریشتە ئاکار بوو.. سەد هەزار ڕەحمەت لە گیانی پاکی.

لە ناوتـوێـژی قسـانـدا دەمـەوێ بە خوێنـەر ڕابگەیەنم، ئەو کەسـەی بۆی ڕێـك بکـەوێ بە هۆی پێـوەندی هەمەچەشنەی بە خەڵقـەوە ژیـانێکی بەسـەر و سەدا وهـاتـوبـات و ڕەنگاوڕەنگ و تێکـەوڵێکـە و بێنـە وبـەرە ڕابـبـوێـرێ لە زۆر ڕووەوە جۆری بەسـەربـردن و مامڵەت کردنی لەگـەڵ بوونـەوەردا جودا دەبێ لە کەسێکی بە باریکە ڕێگەی گوزەرانی خێزانییەوە لە چارچێوەی فەرمانی دەستووره کورتە بەرو تەنگەبەر و تەسك پێوی (لە ماڵەوە بۆ بازار و لەوێـوە بۆ مزگـەوت و لە مزگـەوتـەوە بۆ بازار و ماڵـەوە) مەیدانی کۆمەلایەتی تێپەڕێنێ: مرۆی عادەتی کە باوکی دەمرێ خێـرا لە دابـەش کردنی میـراتـەکـەی دەبێتـەوەو دارێك بە نێوان خۆی و براکەی‌دا دەهێنێ و قۆزاغەی دووره پارێزی بە دەوری خۆیەوە دەتەنێ و دەبێتە خاوەن چاکەو خراپەی خۆی تا ئەوەی ئەگەر هێلکەی مریشکی جیرانی بە هەڵە بکەوێتە ماڵەکەیەوە لە حیسابدا بەدەر دەداتەوە، هێلکە مریشکی ئەویش کە کەوتە ژێر مریشکی جیرانیەوە کەڵێن دەکەوێتە لێکدانەوەیەوە. من هەرچەند لەوەتەی هۆشم بە سەختی و زەحمەتیی گوزەران شکاوە حەزم کردووە خاوەن کیسـە وخـەرمـان و مشتـاغی خۆم بم، هەمیشـە ئەسیـری وەزعێـك بووم کە مڵکی میـراتـم لە حاجی مەلا ئەسعـەدی باوکی باپیـرمـەوە بە شەراکـەتی هەمـوو جەلیزادان لە دەسـت و پێـم ئالاوە، هەر وەهـاش باوکم ئەو زەحمـەتییـەی هەڵگـرتـووە. لە مڵك بگـەڕێ و بادەوە سەر وەزعی مزگـەوت و فەقێ و فەرمانی بەربار بوونی ئەرکی ئەو شتەی بە زاراوە پێی دەڵێن (براگەورەیی!!).. لزوم نابینم بەدووا خورد کردنەوەی ئەو هەمـوو لایـەنـانـەی کە موعـادەلە نادروست و لەنگەر بەزیوەکەی (ئـەرکی زۆر و داهـاتی‌کـەم) بە مل بنـەمـاڵـەیەکی وەکوو ماڵی مەلای گەورەی‌دا دەهێنێ بۆ ئەوەی لە خوێنەری ڕوون بکەمەوە کە باری وەهـا نالـەبـار لە ناوجغـزی کەسب و گوزەرانێکـدا کە سنووری پشکی خاوەنەکەی لە مڵك و ماڵدا تێکەڵ بە حیسابێك بووە چ سەروبەری دیارنەبێ، گرفت و بەرهەڵست و دوشمنایەتی جیـرانی بەهێـز و خاوەن عەشیـرەت و چەکی زۆر و بە نفـوز لە حکومەتیش بە درێژایی ڕۆژگار بینە قاقەی حەسانەوە و هەناسە هەڵێنانی خۆشیی لێ‌گرتبێ:

اذا قمت من باغ عثرت بمعتدی ـ احمد شوقي

له زالمێك هەڵدەستمەوە، له دەسدرێژكەرێك هەڵ دەئەنگووم ئا لەو بارەدا كە دوشمنایەتی كردن لەسەر ساڵانەی داهاتێك كە بەشی مەسرەفی نیو مانگت نەكا ناچار بیت شەوانە پاسی ماڵەكەت بەو هێندە تفەنگە و بەو هێندە زەلامی پاس كردووی نەخەوتو بكەیت. . . ئا لەو گۆنگەرە مزرەدا دەستەیەك لە ژن و پیاو كە زاراوەی بێ ئینساف ناوی خزمەتكاریان لێ دەنێ بۆت جانفیدا بن و لە ناگزووری نە سڵەمێنەوەو ئەركی قورست بۆ هەڵبگرن و بەخەشت نەگرن بە زەلیل گیری سەرت پێ دانەوێنن بۆ هیچ دڵخواز، یان پێداویستی خۆیان، بەڵكو لە خۆشی و ترشی رازی بن بەوەی هەمیشە دووای تێربوونی مێوان و ئەم و ئەو دەست بۆ پاروو درێژ بكەن، تۆ بڵێ مرۆیەكی یەك تۆسكاڵ ویژدانی هەبێ و هەستی مەردایەتی لە خۆیدا شك ببات بە چ چاوێك سەیری ئەو لە خۆ بووردووانە بكات؟ ئەمانە (دەست و پێ و خزمەتكار)ن یان گرێی بربڕەی خانەوادەن؟ من هەرووك دەمدیت ماڵەكەمان لە سەردەمی باوكمەوە درێژەی دەكێشا بۆ گەلێك ماڵی دەر و جیران و كەس و ناسیاو تا ئەوەی نیوەرۆیەكیان دیتم مەتبەخچی سێزدە, منداڵ بە دوورەیەوە قاپ

بەپ و پاروو لە زارن، لەوانەشی تەنها یەكێكیان منداڵی ماڵی خۆمان بوو، هەروەهاش خزمایەتی نەسەبی و جەلیزادەییم بە درێژایی هەموو رۆژگارم لە خزمانەوە پەریوەتەوە بۆ دەیان و پتر لە دەیان ژن و پیاوی دڵسۆزی بێ عەیبی بێ تەماعی خۆ لە بیركردوو كە وا گەلێك بەولای خزمایەتییەوە مەیدانی یەك دڵی و یەك هێوایی و یەك بەرژەوەندییان بریوە لەگەڵماندا كەسێكی ژیانی سادەی یەك رێگەی یەك ئاهەنگی بێ لك و پۆپ و بێ رەگە و رێشەی بڵاو رابوێرێ، بە عادەت، عەیارەیەكی تەسك

پێوی كەم قووڵایی بەكاردێنێ لە هەڵسەنگاندنی چاكە و خراپەو رەوایی و نارەوایی‌ی دیاردە كۆمەڵایەتیەكان، ئنجا دەشێ بەو پەری راشكاوییەوە بریار بدا دژ ی پەیدابوونی پێوەندی نێوان خەڵق كە گەورە و چووكەیی و خوارۆژووری تێدابێ، كەچی ئاگای لە خۆی نییە لە دەمی داخوازی بەرژەوەندا رازییە نازی

كادری حیزبی و پۆلیسی سەرجادان و معاونی پۆلیس و قائممقم و حاكم و كوێخای گەرەك و دەیان كەسی‌دیكە رابگرێ هەتا دەتوانێ دوكانێكی بچووكی نازانم چۆناوچۆنی بكاتەوە و دوو سۆبەی نەوت و سێ تەلەفزیۆنی تێدا بفرۆشێ. . ئاخۆ ئەو كەسە دەبێ چ بڵێ ئەگەر لە نزیكەوە ببینێ بابایەكی خۆم ئاسایی كە نە ئاغاو نە زۆردار و نە مڵكداری گەورە بووم لە موراجەعەی لادێییەكی مەیلەو بێگانە بەخۆم، بایی قازانجی ئەو دوو سۆبەیە و ئەو سێ تەلەفزیۆنەم بە ئەركەوە بە قوربانی ئەو موراجەعەیە كردووە؟ من نالێم خەڵق هەمووی یەك ئاكار و یەك رەووشتە: من ئەوەندە دەڵێم، نابێ وەها بەسەهوودا چووبین كە لەسەری زمانەوە هەموو پێوەندییەكی كۆمەڵایەتی تاوانبار بكەین هەر چونكە لەگەڵ پێوانەی قەناعەتمان یان فەلسەفەمان یان بەرنامەی حیزبمان رێك ناكەوێ، ئنجا پاشدانیش بەپێوەندی‌ی وەها لەنگەر بەزیوی چەوتوچوێر رازی بین كەوا لەچاو پێوەندییە كۆنەكان دەبێ بڵێین سەد رەحمەت لە كفن دزی پێشوو!! بۆیەیە من كە دێم یادی ئەو مرۆیە لە خۆ بووردووانە دەكەمەوە و حەسرەتیان بۆ هەڵدەكێشم سۆزێك دەمبزێوێ چ فەرقی نەبێ لەگەڵ ئەو هەستەی كە نەدیتن و نەبیستنی خوشكێكم لە ماوەی چواردە ساڵدا زامدارم دەكات.

ئافرەتێكی لەوانەی زۆر پێش چوونە مەكتەبم بە ماڵی ئێمە و ماڵی مامم ئۆگری گرتبوو ناوی زێنەبی شەدەلار بوو. ئەو ئافرەتە كە من گەییشتمە تەمەنێك دەركی شتان بكەم دەتگوت لە هێوێنی دڵ فەراحی و بێ غەمی و (دنیاگمرە و ربیع و موت مامش) خولقا بوو. هەر مەجلسێكی ئافرەتان ئەو زێنەبەی لێ‌بایە پەستی و مۆنی پێوە نەدەما. لە ماڵی ئێمە شووی‌كرد بە پیاوێكی خۆمان كە لە پلەی خزمایەتی دادەندرا. زۆر بەداخەوە، بەسەر یەكەم منداڵیدا جوانە مەرگ بوو، هەر لە ماڵی ئێمە. . دكتۆر صلاح [سووریەیی] زۆر دۆستی باوكم بوو چی لە توانای بوو بۆ رزگاركردنی ئەو ئافرەتە بە خەرجی‌دا، تەنانەت، بە دەستی خۆی، بەعەملیەتی جراحی، منداڵەكەی بە مردوویی بوواند

کەچی بێ سوود بوو. ئەگەر بڵێم لەو ماوەیەدا کە ژان زۆری یێکرد تا ئەو دەمەی دڵی ڕاوەستا، دکتۆر صلاح بە شکڵی دایم ـە سەراسۆیی‌ی بوو ڕاستییەکی بێ‌فێڵم گوتووە. ئەگەر لەماڵی خۆی بایە هەرگیز ئەو هەموو پێوە خەریك بوونەی بەخۆیەوە ـەدەدیت. . لە بیرمە ئافرەتان وەکوو پوورە هەنگە تیێ ئاڵابوون و کە مردیش چۆن شینێکیان بۆ گێڕا.

لزوم نابینم چی‌دیکە بە سەربەخۆیی باسی تاك تاكی ئەو کۆمەڵە ژن و پیاوە. بکەم: چەندی بەدەم گەشتی ژیانمەوە هەڵکەوت داخوازی لێ‌کردم بە پێی پێویست بۆ تاك تاکیان دەچمەوە.

دیمەنێکی ناپەسەندی ئەو دەمانەی کە جارێ نەگەیشتبوومە تەمەنی خوێندن، دواتریش بۆ ماوەیەکی بەمەودا بەردەوام بوو مەشقەڵی ئاگری خەرمانان بوو کە لە زۆر شەوانی هاویندا دەشتی کۆیەی دەکردە چراخان:

دوشمنایەتیە کۆنینەکەی نێوان حەوێزی و غەفووریان لەو ساڵانەدا مەلا حەوێزاغای حەسەناغای غەفووری‌و جەلالاغای حاجی ئەسعەداغای حەوێزی بۆخۆی تەرخان و خەریك کردبوو. بۆ منی منداڵ کاری بەدی نادیاری خراپەی یەکدی کردنیان لەوانە نەبوون هەستیان پێ‌بکەم: ئەوەی سەرنجی چاوی نیوە بیناشی ڕادەکێشا (ئاگربازی) یەکەی خەرمان سووتاندنی شەوگار بوو کە وا جگە لە بڵێسە سوورە گەشە دووکەڵاوییەکانی، هەرچی ئادگاری دڕندەیی و بێ‌ڕەحمی و بێ هۆشیش هەیە پێوەی دیار بوو. هەموو شەوێك بەو کارە نافرەجایەیانەوە زەرەرێکی قورسیان لە خۆیان و پتریش، لەو سەپانە هەناسەساردانە دەدا کە ڕەنجی کژێکی کەسابەتی سەرلەبەریان دەچووە هیچە چونکە سەپان لە سەرەتای درووێنەوە خۆی و گوزەرانی لە قەبەڵ ئەو دەغڵە دەکات و هیچ

داهاتێکی‌دیکە شك نابات بەتەمای بێت تا خەرمان هەڵدەگێرێن و کێشەی کایەکەشی تەواو دەبێت کەوا بەزۆری هەتا مانگی ئەیلوول دەخایێنێ، لەوە بەولاوە سەپانەکە دەکەوێتە پەلەکوتکەی کەسابەتێکی دیکە، ڕەنگە دەستیشی نەکەوێ. وەك لە بیرمە ئەو دوشمنایەتییەی نێوان حەوێزاغا و جەلالاغا تەشەنەی نەکرد بۆ هەردوو بنەماڵەکە، بەڵکوو تەنها ئەو دوو کەڵەشێرەی لە یەکدی گیڤ دەکردەوە: هەرچی جەمیلاغای سەرۆکی حەوێزییان و براگەورەی جەلالاغا بوو نە تەبیاتی لە هەرا و بگرەبەردە بوو نە وەزعی تایبەتی خۆیشی کە قائمقام بوو لێی دەسەلماند خەریکی شەڕەگەڕەکێ بێ، کاکە زیادی حەماغاش لە تەمەنێکدا نەبوو ڕابسێتە کاری وەها بەدئاکار دواتریش کە چەپ وڕاستی خۆی ناسی ڕێگەی ئەوتۆیی نەگرتەبەر بەپێچەوانەوە بەلای بزووتنەوەی کوردایەتی و نیشتمانیدا بۆوە هەتا بوو بە یەکێکی ناودار لە کوردایەتی و لە ئاشتی‌خوازی [چەند جار نامەی بۆ هاتووە لە سەرۆکی بزووتنەوەی ئاشتی‌خوازی جیهانی، نامەکان من دەمخوێندنەوە بۆی. . ]

لەمەش بترازێ کاکە زیاد خوارزای جەمیلاغا بوو، مەلا ئەحمەداغای سمایلاغاش کە ئامۆزای حەماغا بوو هەر زاوای جەمیلاغا بوو: لەوەوە دەماری ئەو پێوەندییە کاری دەکردەسەر

ڕەفتاری هەر دوو لایان بەرانبەر بەیەکتر. بەرەی ماڵی سلێمانـاغاش [کە غەفووری بوون] بە براگەورەیی مەلا ئەحمەداغای سلێماناغا پتر ئاغای سەر بەرماڵ بوون تا ئەوەی وەکوو دۆن کیشۆت لەگەڵ (ئاشی با، یان ئاشی ئاگر) شەڕە شەپلتە بکەن. سەرت نەیەشێنم جووتە کەڵەشێری سەروپۆپنە بەخوێنی پەڕو باڵ فش هەڵماو لەو ناوەدا دوو ئاکتەری سەرشانۆی ئەو ئاگربازییە بوون بە خۆیان و دەستوپاوەندی خۆیانەوە. ڕاستییەکەی ناتوانم لێرەدا وەڵامی پرسیارێك بدەمەوە لە خۆمی بکەم و بڵێم: لەو دەمانەدا کە جەمیلاغا جارێ قائمقام بوو بۆچی بێ‌تەرەفانە ڕاوەستا؟ نەیاریدەی برای خۆی‌دا

نە بەرهەڵستیشی لیٚ کرد؟ توومەز کاری دنیا کە ئادەمی بوونەوەرە هەرە چالاك و ووریاو ژیر و بەسەهوودا چوویەتی هەموو جاران بە بارێکدا ناخولێتەوە کە موعادەلەی (2 + 2 = 4) رای دەنوێنیٚ . . لەبیرمە، دوای چەندین کژی خەرمانانی ئەو شەرە دندووکێیە، شەوێکیان هێشتا نوێژی عیشا نەبووبوو لەپر

ئاسمانی لای خوارووی کۆیێ وەکوو خوێن سوور هەڵگەڕا: کە ڕاست بووینەوە بۆ سەیرکردنی چۆنایەتی و چەندایەتی هۆی ئەو ئاگر لە ئاسمان گەڕانە دیتمان بڵێسەی ئاگری خەرمان زمانە دەکێشیٚ بە جۆرێك مرۆ لە دوورەوە ترسی لیٚ دەکردەوە. لە دوورایی کیلۆمەترێك مەودا لە ماڵی ئێمەوە خەرمانێکی هەرەگەورەی/ مەلا حەوێزاغا کە هەموو داهاتی زەویەکانی نزیك کۆیەی لیٚ کۆکرابۆوە ئاگردراوە. ئەو شەوە بۆ ماوەیەکی درێژ شەوقی ئاگرەکە هەموو وڵاتی ڕووناك کردبوو تەنانەت چاو دەیدیت کە بەری شێخ بزێنیایەتیش پێی گەشاوەتەوە!! ڕیزە چیای هەیبەسولتان و باواجی هەر پێی دەویست قوتابی لیٚ بێت و دەوری دەرسەکانی لیٚ بکاتەوە چونکە حەوجە بەچرانەبوو.

بە ڕاستی، ماڵیان ئاوابیٚ، ئەو شەوە جووتە قارەمانی کۆیێ وڵاتیان لیٚ ڕوون کردبووینەوە بەڵام کە خەرمان دامرکایەوە تاریکایی داهاتەوە چونکە ئەوسا زۆری مابوو کۆیێ کارەبای لیٚ پەیدا بیٚ. زۆر بە سەیری، ئەنجام وەهابوو هەر دوو ئاغا هەریەکەیان لە ڕووداوێك پێیەکی زەدە بێت و بشەلێت: هەر دەتگوت برای جمرانە بوون کە وێکرا نەساغ دەبن و دوو چاری هەمان نەخۆشی دەبن. خوا بیانبەخشێت و خزمانیشیان من ببەخشن لە گێڕانەوەی بەسەر هاتی وەهاتاڵ، بەڵام لە شیرن کردنەوەی ئەو تاڵاییـیە دەڵێم، سپاس بۆ خوا، شوێنی ئەو خەرمانە ئیستاکە بەر ئاوەدانیی شار کەوتووەو خانووی ڕێك وپێکی لیٚ دروست کراوە.

تێبینی: لە ئاڵقەیەکی پێشووتر ناوی کەسێك هاتبوو کە لە کۆیێ مەشوور بوو بە (مچە ژنانی). من لە بیرکردنەوەمدا وەهام هاتەوە بەر یاد کە لە سلێمانی بە (مچەی حەبە تۆزیٚ) ناوی ڕۆییشتووە کەچی دواتر باشتر یادم کردەوە و بۆم ڕوون بۆوە کە ناوەکەی لە سلێمانی (مچە حەبیٚ) بووە لەوەشدا پرسم بەکەس نەکردووە شاڵڵا دوو چاری هەڵەیەکی تازەبابەت نەبووبێتم.

# هەندێ لە بیرەوەری ناصیح حەیدەری و زانیاری یەکانی

کەریم مستەفا شارەزا

مرۆڤ هەیە بەهرەو توانستی زانیاری تەنیا لە جۆرە بابەتێك سەرهەڵدەدەن و بەدەگمەنیش وا رێك دەکەوێ یەکێك زانیاری یەکی ئینسایکلۆپیدیایی لە بابەتی هەمەجۆردا بێ، جا لێرەدا لێکۆڵینەوە لە بەهرەی نموونەی یەکەم کارێکی ئاسانەو کەچی لێدوان لە بەهرەکانی؛ نموونەی دووەم کارێکی گەلێ گرانەو ئەو کەسەی بە تەواوی نەچێتە بنج و بناوانی هەموو بەهرەکانی ناتوانێ لەسەر ئەو جۆرە کەسانە بنووسێ و مافی رەوای خۆیان پێ بدات.

مامۆستا ناصیح حەیدەری لە جۆری نموونەی دووەمەو بەهرەو توانستی زانیاری یەکانی لە بوارو مەیدانی گەلێ هونەرو زانیاری هەمەجۆردا خۆیان دەنوێنن.

کاتێ لە روانگەی ئەدەبەوە سەیری دەکەین، دەبینین شاعیرێکی کلاسیکی ی لێ هاتووە، کاتێکیش لە روانگەی مێژووەوە لێی وورد دەبینەوە دەبینین تۆمارێکی گەورەو فراوانی رووداوە مێژوویی یەکانی سەردەمی حوکمڕانی ی عوسمانلی یەکان و بزووتنەوەکەی شێخ مەحموودی حەفیدو رووداوە مێژوویی یەکانی سەرەتای دروست بوونی حکومەتی عیراقی سەردەمی مەلیك فەیسەلی یەکەم (1921 ـ 1933)و مەلیك غازی (1933 ـ 1939)و ئینقیلابەکەی بەکر صدقی (1936 ـ 1937)و شۆڕشەکەی مایسی 1941ی گەلی عیراق لە دژی ئینگلیزە داگیرکەرەکانە. لە بارەی تێکڕای مێژووی کوردیشەوە ئاگاداری گەلێ هەواڵ و سەرچاوەی باوەڕپێکراوی مێژوویی نەتەوەکەیەتی و هەر پرسیارێکی لەو بارەیەوە لێ بکرێت وەرام لە مستەو بە ووردی و بە دوورو درێژی رووداوێکی سەرنج راکێش باس دەکات.

ئەگەر لە بارەی ڕەچەڵەکناسی‌یەوە لێی بدوێین، دەبینین زۆربەی بنەماڵە ناودارەکانی کوردستان دەناسیّ و بەتان و پۆیاندا دەچێتە خوارەوەو لەم بارەیەوە پسپۆڕێکی شارەزایە.

ئەگەر لە بارەی زمان و ئەدەبیشەوە باسی لێوەبکەین، دەبینین لە زمانەکانی کوردیو عارەبیو تورکیو فارسی‌دا دەست ڕۆیشتووەو دەتوانێ شیعرو پەخشانیان پێ‌بنووسیّ و بە سەدان شیعری کوردیو عارەبیو تورکیو فارسی لەبەرەو هەر ساتێکی داوای لێ‌بکەی بەڕەوانی چەند نموونەیێکی بەهێزو پتەوت بۆ دەهێنێتەوە.

لە بارەی ئایینیشەوە، لە دابودەستووری رایەڵی صۆفیەتیو ڕێبازی نەقشبەندی‌دا ئاگاداری‌یێکی باشی هەیەو گەلێ لایەنی نەزانراوی ژیانی زانستیو ئەدەبی‌ی مەولانا خالیدی نەقشبەندی (1777 ـ 1826) دەزانیّ و هەموو دەم سەری ڕێزو وەفاداری بۆ یادی پیرۆزی مەولانای پیری تەریقەت و زاناو ئەدیبی گەورەی کورد دادەنوێنێ.

هەرچەندە ئەمرۆ تەمەن درێژی کاری‌کردۆتە سەر ڕەنگ و ڕووو سیمای مامۆستا ناصیح بەڵام بە هیچ جۆرێك کاری لە بیرو زەینی نە کردووەو هەچەندە چاوو دەنگی کزبوون بەڵام مێشك و هۆشی هەر تیژو بەکارن و کارەساتی زەمانەو جگەرسووتانی بە کۆچی‌دوایی کورە گەورەی لە ئاوارەییدا هیچیان لە مێشك ڕوونیو بیری تیژی کەم نەکردۆتەوە.

### مامۆستا ناصیح حەیدەری لە نزیکەوە:ـ

---

ئەگەر بمانەوێ لە نزیکەوە مامۆستا ناصیح بناسین، وا چاکە هەر ڕوو لە خۆی بکەین تاکوو کورتەیەکمان لە مێژووی ژیانیو کاروانی ڕۆشنبیریی خۆی پێشکەش بکات.

مامۆستا حەیدەری دەڵێ: «ناوی تەوام ناصیحی کوری عەبدولڵای کوری صیبغەتولڵای بچووکی کوری صیبغەتولڵای گەورەی حەیدەری ماوەرانی‌یە لە ساڵی 1898دا لە قەڵای هەولێر لەدایك بووم لە تەمەنی شەش ساڵی قوتابخانەی میریم خوێندووەو لە ساڵی 1916دا لەبەر گەرمەی شەڕی یەکەمی جیهان دەستم لە خوێندن هەڵگرتووەو دووبارە ڕووم کردۆتەوە مەدرەسەی ئایینی. کە ئینگلیزەکان عیراقیان داگیرکردو لە پاییزی 1918دا گەیشتنە هەولێر من دەستم لە خوێندن هەڵگرتبوو و بوو بووم بە خوێندەوارێکی باش و هەر کتێبێکی عارەبیو تورکیو فارسیو دیوانی شیعری کەڵە شاعیرەکانی کوردم کەوتبێتە دەست بە ووردی هەموویانم خوێندۆتەوەو شارەزایی‌یەکی تەواوم لێ پەیداکردوون. لە ڕێگەی (30) سی ساڵ فەرمانبەری‌یەتی میریشم لە دادگاکانی هەولێرو سلێمانیو کەرکووکدا گەلێ زانیاری‌ی هەمەجۆرو شارەزایی بەنرخم لە هەموو بوارەکانی ژیاندا پەیداکردووەو لە ساڵی 1955 وە بە خانەنشینی لە هەولێر دەژیم و تەمەنم 87 ساڵە.

### ڕەچەڵەکی بنەماڵەی حەیدەرییان:

---

مامۆستا ناصیح حەیدەری دەڵێ: «ڕەچەڵەکی بنەماڵەی ئێمە لە حەیدەری یەکەمی باپیرە گەورەمانەوە دەست پێ‌دەکات کە لە سەردەمی حوکمڕانی‌ی سولتان سولەیمانی قانوونی عوسمانلی‌یەوە (1520 ـ 1566) هاتووە بۆ هەریرو لێی نیشتەجێ‌بووەو خەریکی دەرس گوتنەوە بووە.

حەیدەری یەکەم بە پێشەواییکی ئایینیو زاناییکی‌گەورە لە کوردستانی عیراق و ئێراندا ناوبانگی دەرکردووەو مامۆستای تایبەتی سولەیمان بەگی میری سۆران و خانزاد خانی خوشکی بووەو چەند ساڵێك دوای ساڵی هەزاری کۆچی لە هەریر کۆچی‌دوایی کردووەو ئەحمەد کوری کە ناودار بووە بە (ئەحمەد بەینە ئەلحەیدەرین)[1] لەجێی دانیشتووە و دوای ئەویش حەیدەری دووەم هاتووەو ئەمجا ئیبراهیم حەیدەری کوری جێی گرتۆتەوە تا ئەو ئیبراهیمە زاناپانی حەیدەری‌یەکان لە هەریر بوون.

### بنەماڵەی حەیدەرییان لە ماوەران:

---

ماموستا ناصیح دەڵێ: «لە سەردەمی ئیبراهیم حەیدەری‌ی کوڕی حەیدەری دووەم، بنەماڵەی حەیدەرییان هاتوون بۆ گوندی «ماوەران»ی سەر بە شەقڵاوەو ئەو گوندەیان ئاوەدان کردۆتەوەو کردوویانە بە ناوچەیێکی ئایین و زانست فێربوون و فەقێ و مەلای زیرەك و ناودار لە هەموو لایەکی کوردستانەوە ڕوویان تێکردووە، وورده وورده ئەو گەورە بووە تاکوو بووە بە گوندێکی فراوانی بەهات و بات و مەدرەسەو مزگەوتی گەورەی لێ بنیات نراوە گەلێ زانای ناوداری وەکوو مەلا عەبدوڵلای بێتووشی (1746 - 1807) ڕوویان کردووەتێ و لە کانیاوی ساردو سازگاری زانستی عەقلی و نەقلی ئەو مێرەدێیە سوودمەندبوون و لەدوای ماوەیێکی دیکەش شاعیرو زانای کوردی وەکوو نالی (1800 - 1856) ڕوویان لە ماوەران کردووە بۆ تەواوکردنی خوێندنی مەلایەتی.

بنەماڵەی حەیدەری‌یەکانی ماوەران لە بەغدا:-

---

لەبەر شەڕو شۆڕی ناوخۆیی نێوانی میرەکانی کوردستان لە سەدەی هەژدەهەمدا هەندێ لە زانا گەورەکانی بنەماڵەی حەیدەری‌یان ماوەران جێ‌دێلن و ڕوودەکەنە شاری بەغداو پلەو پایەیێکی گەورەیان دەبێ لە زانستە ئایینی‌یەکان و ناوبانگیان لە هەموو لایێکی وولاتە ئیسلامی‌یەکان دا بلاوەدەبێتەوە. ماموستا ناصیح دەڵێ: «یەکەمین زانا لە بنەماڵەی ئێمە چووبێتە بەغداو لێی نیشتەجێبووبێ، صیبغەتوڵلای گەورەی کوڕی ئیبراهیم حەیدەری کوڕی حەیدەری دووەم بووە، ، کە لە نێوانی ساڵەکانی (1114 - 1200)ی کۆچی‌ی بەرامبەر بە (1702 - 1785)ی زایینی‌دا ژیاوە.[٦]

لە شاری بەغدا دووبارە مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی و مەلا مەحموودی بێتووشی برای، صیبغەتوڵلای ماموستایان دەدۆزنەوەو خوێندنی لەلا تەواودەکەن و لەگەڵ مەلا جەرجیسی ئەربیلی‌دا کە (لە ساڵی 1792دا کۆچی‌دوایی کردووە) ئیجازەی عیلمی لە سەر دەستی وەردەگرن.

ئەوەی لە هەندێ سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە زانیبێتمان، مەلا عەبدوڵلای بێتووشی قەسیدەیێکی بەرزی بە زمانی عارەبی لە ستایشی صیبغەتوڵلای ماموستای داناوە، وا دیارە کاتی دانانی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خوێندنی بێتووشی لە گوندی‌ماوەران و سەرەتای ئەو قەصیدەیەش بەم جۆرە دەست پێ‌دەکات:-

کلُّ حُرٍّ في فضلِهِ عَبدُ رقٍ
لموالي تديروا ماورانا،

لەدوایی‌دا بەم جۆرە کۆتایی بە قەسیدەکە دێنێ و دەڵێ:-

كَمْ شفَوا بالعلوم منّا صدوراً
كانَ فيها من جهلنا ماورانا
سُئِلوا هل وراءكُمْ مِنْ مرامٍ
لمريدٍ؟ فقيلَ لا ماورانا!![٨]

وەنەبێ مەلاعەبدوڵلای بێتووشی هەر لەستایشی صیبغەتوڵلای حەیدەری شیعری دانابێ بەڵکوو لە ستایشی عوبەیدیللای کوڕیشی قەصیدەیەکی بەرزی داناوە چونکە ئەمەی دواییش دەرسی پێ‌گوتووەو زانایێکی گەورەو بلیمەت بووە، بێتووشی لە ستاییشەکەیدا دەڵێ:-

إنْ فاخَرَتْ دجلةُ في فيضها
عِلم عُبيدالله قُلْ أقصري
فَعِلْمُهُ لَيسَ له مَعْبَرٌ،
وكم رأينا لكِ من مَعْبَرِ
زَهتْ به بغدادُ زَهوَ الرُّبا
بالنبت غِبَّ العارضِ الممطرِ[٩].

ماموستا ناصیح دەڵێ: «عوبەیدوڵلای حەیدەری سێ کوڕی دەبێ عەبدوسسەلام و ئەحمەدو ئەسعەد صەدرەدین و ئەو ئەسعەدەش دەبێتە باپیری «ئیبراهیم فەسیحی حەیدەری»ی خاوەنی کتێبی (عنوان المجد)

هەندێ زانای تری بنەماڵەی حەیدەری‌یان:

---

ماموستا ناصیح حەیدەری دەڵێ: «لە بنە ماڵەی ئێمە چوار زانای گەورەمان بووە بە ناوی صیبغەتوڵلای

حەیدەری، یەکەمیان صیبغەتوڵڵای هەرەگەورەو دووەمیشیان صیبغــەتــوڵــڵای باوکی ئیبـراهیم فەسیح حەیـدەری ئەم دووەیــان لە بەغـدا ژیـاون. سێـیـەمیـان صیبغـەتـوڵـڵای گەورەی کوڕی ئیبــراهیم حەیــدەری کوڕی عاصیم کە لە ساڵی 1272ی کۆچی‌ی بەرانبەر بە 1855ی زایینی کۆچی دوایی کردووەو لە گونـدی‌مـاوەران دانیشتـووە و مامـۆستـای «نــالـی»ی شاعیــری مەزنـی کورد بووە. چوارەمیشیــان صیبغەتوڵڵای کوڕی بووە چونکە پاش باوکی لەدایك بووە بۆیـە بە ناوی ئەویـان کردوتـەوەو بۆ جیـاکـردنـەوەیان پێیان گوتــووە صیبغـەتـوڵـڵای بچـووك و بە تورکی ناوبـانگی بە «کچـك افنـدی» ڕۆیشتـووە. ئەم صیبغـەتـوڵـڵا گچکەیە باپیـری منـە، واتـا: باوکی عەبـدوڵـڵا حەیدەری باوکمە. جگــەلـــەوانــە ئیبـــراهیم حەیـدەری کوڕی عاصم کوڕی ئیبـراهیم کوڕی صیبغـەتوڵڵای گەورەی حەیدەری‌ی باوکی باپــیــرم، زانــایــێــکــی زۆر گەورە بووە و کراوە بە دوا شەیخولئیسلامی دەوڵەتی عوسمانلی‌و دوای تێکچوونی ئەو دەوڵـەتـە گەڕاوەتـەوە عیـراق و لە بەغـدا دانیشتووە و نرخ و پایەیێکی گەورەی لەلای حکومەتو میللەتیش بووە.»

**ناصیح حەیدەری‌و هەندێ لایەنی نەزانراوی ژیانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی:ـ**

مامۆستـا ناصیح دەڵێ: «مەولانا خالیدی نەقشبەندی (1777 ـ 1826) سێ جار هاتــوّتــە مەڵبـەنـدی هەولێـر (ســۆران). جاری یەکـەم هەروەکـوو لە گەڵی سەرچـاوەدا هاتـووە، چووە بۆ ناوچـەی باڵـەکـەتی‌و لە لای مامـۆستـای گەورە مەلا محـەمـەدی کوڕی عەبـدوڵـڵای ناودار بە (ئیبن ئادەم) خوێنـــدوویـەتی. جاری دووەمیش هەر بۆ خوێنـدن هاتـووە بۆ گونـدی «گـەڕاو»و، جاری سێـیـەمیش هاتووەتە شاری هەولێــر دوای گەڕانـــەوەی لە هینـدستـان و هێنـانی ڕێبـازی نەقشبـەنـدی بۆ کوردستـان و بڵاوکردنەوەی‌و لەژێر چاودێری مەولانادا مزگەوتی خانەقای هەولێر بەردی بناغەی دانراوە.»

**ناصیـح حەیـدەری‌و چەنـد لایـەنێکی نەزانـراوی ژیـان و شیعری نالی:ـ**

مامۆستا ناصیح دەڵێ: «نالی شاعیری مەزنی کوردیش سێ جار هاتووەتە مەڵبەندی هەولێر، یەکەم جار سەردانی شاری کۆیـەی کردووەو بە نیـازی خوێنـدن، ویستـوویەتی ماوەیەکی لێ‌بمێنێتەوە بەڵام زۆر نەماوەتەوەو جێی هێشتووە. جاری دووەمــیـش هاتــوّتــە گونــدی ماوەران و لەلای صبغـەتـوڵـڵای گەورە واتا: باپیری باوکم خوێندوویەتی‌و بۆ ماوەیـەك زانیـاری‌یـەکی باشی لێ‌وەرگـرتووە، لە دواییدا بۆ ماوەیـەك صیبغـەتـوڵـڵای مامـۆستای دەچێتە بەغداو (نالی) دەکـات بە چاودێـری‌کەری فەقێ‌و موستەعیدەکانی ماوەران تاکوو سەرپەرشتی کاروباری ژیان و ڕاتبەیان بکات، دوای ماوەیـەك مامـۆستـای لە بەغـداوە نامەیێکی بۆ دەنووسێ‌و لە ژیــان و گوزەرانیــان دەپـرسێ (نـالی)یش لە وەرامـدا هیـچ گلەیـــی لە نان و گوزەرانــی نابـێ، تەنـیــا گلەیـی لە کەم عیلمی‌ی مامۆستاکەیان دەبێ‌و، حەزدەکات مامۆستای زاناو پڕ عیلم دەرسیــان پێ‌بڵێ‌و هەر بەسـەرپێـوە ئەم دێـرە شیعرە دادەنێ‌و دەیخاتە ناو وەرامی نامەکەی‌و بۆ مامۆستای ڕەوان دەکات و تاکە دێرە شیعرەکەی نالیش ئەمەیە:ـ

**لەبێ دەرسی هەموومان دادمانە**

**ستوونی مەدرەسە ئوستادمانە»**

ئەم دێـرە شیعـرە لە پتـەویی هۆنینەوەی‌دا ڕێی تێ‌دەچێ شیعری نالی بێ بام لە دیوانەکانیشیدا نەنووسرابێ. دوای ئەمـە مامـۆستـا ناصیح دەڵێ: «نالی جاری سێ‌یەم هاتۆتە شاری هەولێـر، لەو کاتـەی کە مزگـەوتـەکـەی «خانەقا» تەواو دروسـت کراوە، ئەو لە ئاهــەنـگـی تەواوبـــوونی ئەم مزگـــەوتـــەدا بەشـداری کردووە. چاوی بە دەستـەیێـك لە مریــدانــی نەقشی دەف ژەن کەوتـــووە، دەفیـــان لەســـەر ئاوازێکی خۆش لێ‌داوە، وەك زانیـــومـــە ئەو دەف لێ‌دانـەو ئاهـەنگـەئـایینی‌یـە بوونـەتـە سەرچاوەی ئیلهامی ئەم پارچە غەزەلەی نالی کە دەڵێ:ـ

**«حلقەدرگوش»ی کەفی ڕەنگینی تۆیە ئەم دەفە**
**با نەناڵێ، لێیمەدە (عَنْ لُطْمِهِ کُفَّ الکفَه»**
**ناصیح حەیدەریو شیعر وەرگێڕان لە تورکی‌یەوە:ـ**

مامۆستـا ناصیح وەك لەمەوبەر دەرمان بری شاعیرێکی بەدەستـەلاتـەو جگـە لە زمانی کوردی، کە زمانی زگماکی خۆیـەتی، زمـانـەکـانی تورکیو عارەبیو فارسی بە چاکی دەزانێ، بێجگــە لە دیــوانێکی شیعــری خۆی بە زمـانی کوردی، کۆمــەڵـە شیعـرێکی شاعیـرە ناودارەکـانی تورکی عوسمانلی وەرگێراوەتە سەر زمانی کوردی وەك ئەمانەی خوارەوە:ـ

(1 ـ شیعــری شاعیــری نیشتمــان پەروەری تورکی عوسمـانلی (محـەمـەد نامیق کەمال) 1840 ـ 1888ز)ی کردووە بە کوردی هەروەك ئەم نموونەیەی خوارەوە:ـ

**خزمی بێکەڵك هەروەکو دووپشك نەبینێ ڕۆژی خۆش**
**خاوەنی هیممەت وەکو ڕۆژ شوعلەداربێو ژینی خۆش**

(2) ـ لە شیعــرەکـانی ضیـاپـاشـای شاعیـری ناوداری تورکی عوسمانلیش ئەم یەك دوو پارچە شیعرەی کردووە بە کوردیو دەڵێ:ـ

**دەبێتە موستەحەققی تیغ ئەگەر موو**
**زیادی کرد لەحەددیو زێدە دەرچوو**
**لەبەر وەی بوو کە ئازادن لە تیغان**
**موژەی چاوان و موویی هەردوو ئەبروو**

هەروەهـا دێـرە شیعـرێکی‌تـری هەمان شاعیری کردووە کوردیوودەڵێ :ـ

**کەس نی‌یە بێ‌کەس بێ ئەمرۆ هەر کەسێ هەیتی کەسێ**
**مامەوە بێ‌کەس مەدەد ئەی تۆێ کەسانەی بێ کەسێ!!**

(3) ـ تاکــە شیعــرێکی مەلا محـەمـەدی هەولێـریشی لەتورکی‌یەوە کردووە بە کوردیو دەڵێ:ـ

**گوتم: گیانە لەسەر کوڵمت نی‌یە خاڵی سیاهت تۆ،**
**گوتی: بۆ سەر وولاتی ڕۆم حەبەش قەت پادشا نابێ!**

خوێنــەری بەڕێــز. . . بۆیــە لە ناصیــح حەیـدەریی شاعیـرەوە بە درێـژ ی نەدوام چونکـە لەمـەوبـەر شتێکمـان لە... نووسیـــووەو بلاوکـــردۆتـەوە. لەبـارەی زانیـاری‌یـە گشتی‌یـەکانیشی‌یەوە، بەوەندە نووسینەی سەرەوە وەستاین و ڕێگـا بۆ کەسـانی‌تـرو بۆ دەزگـە ڕۆشنبیـری‌یە کوردی‌یەکان چۆڵ دەکـەین تاکـو بە فریـای ئەم گەنجینـە گرانبـەهـایەی کەلــەپــووری نەتـەوەی کوردمـان ڕابگـەن و بەر لەوەی لە کیسمــان بچێت چەنــد دیـداری تەلـەفزیـۆنی لەگـەڵـدا سازبـکـرێـت تاکــو نەوەی دوارۆژمــان سوود لە بەهــرەو زانیـاری‌یـەکـانی وەرگـرن. لەگـەڵ ڕێـزو سوپـاسمـاندا بۆ مامۆستا ناصیح حەیدەریو بۆ ئێوەی خۆشەویست.

**پەراوێزەکان: :**

(1). هەر چەنـدە شێـخ محـەمـەدی خاڵ لە کتێبەکەی «البیتـوشي»دا نووسیـویـەتی «أحمـد بن الحیـدرین» بەڵام مامــۆستــا ناصیــح دەڵێ: «ڕاستی‌یــەکـەی «أحمـد بَیْنَ الحیدرین»» چونکە باوکی ناوی حەیدەر بووەو کوڕەکەشی هەر ناوی حەیـدەر بووەو کەوتـۆتـە نێـوانی دوو (حـەیـدەر) انەوەومنیش ئەم ڕایەم پەسەندکردو نووسیم «ئەحمەد بین ئەلحەیدەرین»

(2). شێــخ محـەمـەدی خاڵ لە کتێبـەکـەی «الشیـخ معــروف النـودهی البــرزنجی»دا دەڵێ صبغــەتــوڵڵای حەیــدەریـی گەورە لە ساڵی 1186ی کۆچی بەرامبــەر بە 1772ی زانینی لە شاری بەغــدا بە نەخــۆشی طاعــون مردووە. بنوارە ل: 36

(3). بۆ زانینی تەواوی قەصیــدەکـە بروانـە ـ [الشیـخ محمد الخال ـ البیتووشي ـ بغداد 1958 ص231]

(4). بۆ زانینی تەواوی شیعرەکە بروانە [الشیخ محمد لخال ـ البتوشي ـ بغداد 1958]ە مەبەست لە (ئینقلاب) واتا عەرەبێکەیەتی.

درەختی ڕەچـەڵـەکی بنـەمـاڵـەی حەیـدەری‌یـان لە هەریرو ماوەران و بەغدا وهەولێر


حەیدەری یەکەم
ئەحمەد بەینە لحەیدەرین
حەیدەری دووەم
ئەحمەد
ئیبراهیم
عەبدوڵلا
عاصیم
محەمەد ئەمین
نیعمەتوڵلا
فەتحوڵلا
ئیسماعیل
صالح
صیبغەتوڵلا هەرەگەورە
ئیبراهیم
صیبغەتوڵلای گەورە
ئیبراهیم
صیبغەتوڵلای بچووك
عاصیم
عەبدوڵلا
ناصیح حەیدەری
ئیبراهیم حەیدەری
حەیدەر حەیدەری
شەیخولئیسلام
عوبەیدوڵلا
عیسا غیاتوددین
ئەحمەد
ئەسعەد صەدرەددین
عەبدوسسەلام
صیبغەتوڵلا
ئیبراهیم فەسیح حەیدەری

### بەبۆنەی ساڵێك بەسەرکۆچی شاسواری جوڵانەوەی ڕوشنبیری کورد مامۆستا

# علاء الـدین سجادی دا



● «غفور میرزا کریم» ●

پار لە 13 لەسـەر 14ی مانگی کانـونی یەکـەمی ساڵی 1984دا، دڵـی گەورەی پڕ لە خوزگـەو ئاواتـی بەرزو ئامـانجی پیـرۆزی شا سواری جوڵانەوەی ڕۆشنبیریی کورد لە لێـدان کەوت، مێشـك و بیـری بلیمـەت و زانـاو بە هەروەرێکی چابـوك سواری ڕێگـای پێشکـەوتنی کاروانی ڕۆشنبیری لە بیرکردنەوەو بەخشین ڕاوەستا.

ئەو خامـە ڕەنـگینـەی، کە لەنـاو پەنجـەی دەستی‌دا بێ‌ووچـان ڕازو نیـازی دڵسـۆزی دوو تووی دڵی، داخی دەروونـی هەڵاڵـەو شیـلەی بیـری تیـژی بێ گەردی کە مێژووی ڕۆشنبیریی کوردی پێ تۆمار دەکرد لەناکاو لەکار کەوت.

بەڕاستی هەر ڕۆشنبیـرێ ئەگـەر بە بەرهـەمی زۆرو تێرو پڕو پوختـــەو بەپێـز، بە بەخشنـدەی بە چێـژ و شاکـارو برشت دار سوود بەخش و دڵگیر، بە چۆنیەتی کارتێ‌کردنی ووشـەکـانی بۆ سەر بارو دۆخی کۆمـەڵ و بۆ پێشـەوەچوونی کاروانی ڕۆشنبیـری هەڵسـەنگێنـدرێت بنـرخێندرێت، ئەوا بێ‌چـەنـدوچـوون مامـۆستا علاءالدین لە ڕیزی جوڵانەوەی

رۆشنبیری کوردیدا نازناوی شاسواری رۆشنبیری وەردەگرێت.

ماموستا علاءالدین بە وێنەی هەر رۆشنبیریکی مەزن لە پێناوی گەشەسەندن و دەولەمەندکردنی زمان و ویژەو زیندوکردنەوەو بوژاندنەوەی کەلەپوری نەتەوایەتی لەکۆشش دا بووە، هەمیشە شەونخونی بەدیار لاپەرە مێژوویەڵ، یا ژیانەوەی شاعیرێکی گووم بووە کێشاوەو لەسەر ساغ کردنەوەی ژیانی ئەم رۆشنبیرو ئەو کەڵە پیاوی کورد لەبەر قوتیلکەی چرای مزگەوت شەوگاری زستانی.

گرتووە بە بەرەوە بۆ خزمەتی رۆشنبیریو پێشخستنی کاروانی نەوەستاوی ،بە وێنەی مەلەوانێکی کارامە گەوهەرو پیرۆزەی لەبن دەریای گووم بودا، دەدۆزیەوەو هەڵی دەبژاردو دەیهونیەوەو دەیکردە ملوانکە بەسەر سنگی جولانەوەی رۆشنبیری کورددا، بە وێنەی زانایێکی بێ هەوتا کیومالی بەناو هەردو دەشت و هەریزەجاری بازاری کزو کەساسی رۆشنبیریدا دەکرد، تا شاعیرێکی لەبیرەوچوو کە لە پیاوێکی گووم بوو، لاپەرە مێژوویێکی نەزانراوە زیندووەبکاتەوەوبو ژێنیتەوەو بیخانە ناو گەنجینەی مێژووی کوردەوە..

بەم چەشنە ماموستا علاءالدین خۆی گەیاندە لووتکەی بەرزی رۆشنبیریی کوردیو بوو بە مایەی شانازی نەتەوەکەیو جێگەی تایبەتیو گرنگی خۆی لەناو جوولانەوەی رۆشنبیریی کوردیدا، کردۆتەوە.

شاکاری کتێبەکانی کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی) بەرگەکانی کتێبی «رشتەی مرواری» لەگەڵ چەندان کتێب و نامیلکەو نووسینی لە گۆڤارو رۆژنامەکانی کوردیدا بەڵگەی نەویست و بەتین لەبەر چاوە بۆ بلیمەتیو بەهرە وەری شاسواری رۆشنبیری کۆچ کردومان، کە رۆشنبیرانی ئەمرۆ دەتوانن مەشقی دەرس وەرگرتنی لەسەر بکەن و رەنجی پر بە پێزی بکەن بە توێشو بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی تا رێچکەی هەورازی پێشکەوتن ببرن و دەست لە مل هیوا بکەن..

بەرێوەبردنی کاروباری (گۆڤاری گەلاوێژ) بۆ ماوەی دە ساڵی رەبەق لەگەڵ دەرکردنی گۆڤاری (نزار) بە شاکارێکی گەورە لە رێرەوی کۆششی نەپچراوی ماموستا علاءالدین دا دەژمێردرێ بە تایبەتی (گۆڤاری گەلاوێژ)، کە ئەمرۆ هیچ رۆشنبیرێکی تازە کوورە ناتوانێ بۆ کەڵك وەرگرتن لە هەموو مەیدانێکی رۆشنبیریدا دەست بەرداری بێ، یا بیخاتە پشت گوێ، شەونخونی کێشانی لەگەڵ گۆڤاری گەلاوێژدا و دەرهێنانی بەو شێوە نایابە گرنگە بەتایبەتی لە رووی ناوەرۆکیەوە کە بووبوو بە جێگەی رەزامەندی تێکرا جولانەوەی رۆشنبیری بە ئەرکێکی مەزن و فەرمانێکی پیرۆز دادەنرێ، کە ئەمرۆ نرخی وەکو ئەرشیفێکی گرنگ و تایبەتی بۆ گشت جولانەوەی رۆشنبیریی کورد دێتەبەرچاو ،کە رۆشنبیران بۆ هەڵهێنجانی زانیاری و زانستی، پەنای بۆ دەبەن و سوودی لێ وەردەگرن.

ماموستا علاءالدین لە مەیدانی رۆشنبیری ونیشتیمانی تردا هەر سەرکەوتوو، و شاسوار بووە، دەوری بالاو لە بەرچاو و گرنگی وەکو ئەستێرە لە ئاسمانی رێرەوی کاروانی نەپچراوی یانەی سەرکەوتنی کورددان دا دەدرەوشێتەوە ئەم یانەیەی کە دەزگایێکی رۆشنبیری بووە کە نزیکەی 33 ساڵ (1930 ـ 1963) لە خزمەت کردن دا بووە، کە دەوری بالای ماموستا علاءالدین زیاتر لە کاتی بوژاندنەوەی یانەدا کە بە دیاریکراوی رێکەوتی ساڵی 1943 گەرمەی جەنگی دووەمی جیهانی دەکەوێ بە زەقیو روونی دەکەوێتە بەرچاو ،کە دووبارە ئەم تاقیکردنەوەی ژیانی رۆشنبیرییەی ماموستا علاءالدین لە بواری هەڵسوراندنی کاروباری یانەی سەرکەوتن دا پێویستە بکەوێتە بەرتیشکی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی، رۆشنبیرانی ئەمرۆ، تا نەوەی تازە کەڵك و سوود مو تاقیکردنەوەیە وەرگرن تا ببێتە مایەی سەرکەوتن و پیش کەوتن یان کە ئومێدەوارین ئەم ئەرکەش، بە پیرۆزیو سەرکەوتویی ئەنجام بدەن..

لەم ههلوێستەدا بە باشم زانی ئەم ووتووێژە کە لەسەر یانەی سەرکەوتنەو لەپێش چەند ساڵێکدا لەگەڵ ماموستای بەرێزدا کردومە بیکەم بە دیارییێکی بچووك بۆ یاد ـ

کردنەوەی ساڵێ بەسەر کۆچ کردنی شاسواری کاروانی ڕۆشنبیریی کوردیدا. . کوردواتانی ،دیاری دەستی هەژاریێ هەر مستێ هەرزنەوبەس. .

## وتو ویژێك لەگەڵ شاسواریکی ڕۆشنبیریی کوردیدا.

لە ڕۆژی هەینی 1982/3/19 لەگەڵ ماموستای بەڕێز علاءالدين سجادی لە ماڵی خویدا وتوویژێکمان دەربارەی یانەی سەرکەوتن و چالاکیەکانیو دەوری ڕوشنبیریی کوردی لە پیکەوەنان و بەجیهێنانی ئەرکی ئەستۆیان بەرامبەر ئەم دەزگا ڕوشنبیرییە کرد، کە لە ئەنجامدا ئەم چەند لاپەڕە زانینە ووردە باسە میژوویەمان دەست گیر بوو، کە وا ئیمەش بە بوختەیی و چری تۆماری دەکەین و دەیخەینە بەرچاوی خوینەری بەڕیز. .

ڕوشنبیرانی کورد لە سالی 1930دا بۆ هەل و دەرفەتێك دەگەران چاوەڕوانی ڕوژێکی گونجاویان دەکرد، کە بتوانن تێیدا بە چاوگەیکی زانستی،دڕ بە شەوە زەنگی دواکەوتن و نەزانین و بێ ئومیدی بدەن، بازاڕی کزو کەساسی جوولانەوەی ڕۆشنبیریی کورد گەرم و گوڕو خوش بکەن وە کاروانی نەسرەوتی ڕۆشنبیریی کوردیی، برێ بۆ پیشەوە بەرن.

لە پێش گرتنی پەیمانی دیلییەتی لە حوزیرانی سالی 1930دا بەر لە ڕاپەڕینە گەورەکەی شەشی ڕەشی ئەیلولی سلیمانیدا. دەزگای میری لەژێر پالەپەستۆی جوولانەوەی ڕۆشنبیریی کوردا ڕێگەی دا، کە ڕوشنبیرانی کورد ڕێکخراوێك بە ناوی یانەی سەرکەوتنی کوردانەوە بیننەکایەوە، (بویە) هەر لە سەرەتای سالی (1930)وە ڕۆشنبیرانی کورد بەپێی تواناو ووزەی خۆیان بەگوێرەی بارودۆخی گونجاوی ئەو ڕۆژە هاتنە مەیدانی خەباتەوە بۆخزمەتی ڕۆشنبیریی کوردو ووشە گەلی ڕەسەن و دلسوزی کورد. بەم بۆنەیەوە کۆبوونەوەییکی گەورەو ئاهەنگێکی بە جۆش. . بە بەشداربوونی سەدان ڕۆشنبیری کورد لە بەغدا لە سینەمای (ڕویاڵ) سازکرا. لەو ئاهەنگەدا بانگی دامەزراندنی دەزگای یانەی سەرکەو تنیان بە گوێی گەلدا. دا. . ئامادەبونی خۆیان بۆبەرەوپیش بردنی کاروانی نەوەستاوی ڕۆشنبیریی کورد پیشان داو داوایان لە تیکرای خوینەواران و کۆمەلانی خەلك کرد بۆ یارمەتی دان و پشت گرتن. لەو ڕۆژەوە ئینگلیز پێی لە وولاتمان توندکردو چنگی خوێناویو چەوسانەوەی لە لەش و دلی گەلەکەمان ئالاند، هەمیشە بە پوازی دووبەرەکی دیوارو شورەی یەکیتیو پتەوی گەل، تیك دەدا. بە موشەدەمی ناکۆکیو برا لە برا کردن. . ئاگری ئاژاوەو شەڕی براکوژی خوش دەکا، وە بۆ پوچ کردنەوەی هەموو تەقەللاییك و هەلوەشاند نەوەی هەموو پردیکی برایەتی نێوان ڕۆشنبیرانی عیراق بە گشتیو ڕۆشنبیرانی کورد بە تایبەتی لە کنەکردن و تەقەللادابوو.

لە نەخشەو پیلان نانەوە لە تەگەرە دانان، لە کەندو کۆسپ دورست کردن بۆ تێکدانی کاروانی ڕوشنبیریی کوردیو سەرلێشێواندنی هیچ ساتێك نەوەستاوەو سستی نەنواندوە.

ئینگلیزەکان لە سییەکاندا ـ بۆ بەستنی پەیمانی دیلیەتی لە سالی 1930 لە پشت پەردەوە کاریان دەکرد، لە پنیاوی یەك نەگرتنی هێزی بەربەرەکانی عیراقی دژ بە پەیمانی دیلیەتی تێدەکۆشان و، وایان پێشان دەدا، کە دوبەرەکی سەرەکی لە نێوان کوردو عەرەبدایەیەنەك لە نێوان گەلی عیراق بە گشتیو ئینگلیزەدا بەندو باوی وایبلاودەکردەوە، کە گوایە هەر بەلاو کێشەو سەرگەردانیێك بەر عەرەب دەکەوێ لەسەر ئەستوی کوردە، هەرپیشێل کردن و مافی نەتەوایەتیو بەش خوراویکێش توشی کورد دەبێ ئوبالی دەکەوێتە سەر عەرەب.

بۆیە بلاویان دەکردەوە کە گوایا تاوانی نەبوونی مافە ڕەواکانی کورد لە پەیمانی دیلیەتی سالی 1930دا، کە تەنانەت کۆمەلی نەتەوەکان ـ عصبة الامم ـ بڕیاری لەسەر

داوه بۆ عەرەب دەگەڕێتەوەو بەریتانیا لەم ڕووەوە بێتاوانە.

لەم بارو دۆخە ناهەموارەدا بوو، کە دەرفەتێك بۆ بەرەی ڕۆشنبیـــرانی کورد ڕەخســاو بانگی دامــەزرانـدنی یانـەی سەرکەوتنیان ڕاهیشت، وە بە بیرو میشك بە ووتاری دڵسۆز بە خامـەی ڕەنگین بەربـونـە ویـزەی لەشکری دوواکەوتن و نەزانـین و بو خزمــەت کردنی جوولاّنـــەوەی ڕۆشنبیـــریی، چاکی مەردانـەیـان هەڵکـردوە بۆ بەرزکـردنـەوەی کۆشـك و تەلاری ڕۆشنبیری کەوتنە چالاّکی نواندو خەبات کردن.

بەراستی دامــەزرانـــدنی یانـــەی سەرکـەوتن لە بەغـدا مژدەی سەرکـــەوتـن و پیش کەوتن و ئومێــد بەخشی دا بە کورد وە بە بنکەیێك بۆ کۆکردنەوە ڕێکخستنی جوولاّنەوەی ڕۆشنبیـری وە گەشـە سەنـدن و پەرەپێـدانی ووشـەو زمـانی کوردیو بوژانــدنـەوەو زینـدوکـردنـەوەی مێـژ ووی کوردیو ناسینی بە گەلی کوردو بە جیهان.

باس و خواستی یانـــەی سەرکـەوتن لە بەغـدا دەنگیکی گەورەی لە ناو ڕۆشنبیرانی کورد، دایەوە بە تایبەتی لیژنەی بەڕێـوەبـەری لەو سەردەمـەدا لە زانـاتـرین و دڵسـۆزتـرین و ناودارتـــرین ڕۆشنبیـرانی کورد پێـك هاتبـوو کە ئەمـەش لە گرنـگــیو دەوری زیــاتــر دەکــات و ناوی لەبــەرچــاو خوێندەوارانی کورد زیاتر بەرزترو خوشەویست تر دەکات.

لێرەدا مامۆستا پرسیاریکی گچکە دێتە گۆڕێ؟!

نازانـم بۆچـی روشتبیـــرانی کورد لە دەزگـــای یانـــەدا هەڵویستی گۆشەگیرییان بەرامبەر ڕووداوەکانی عیراق وەردەگرت؟

یاخـود بۆچی بە یاشی تێکـوشـانی خویـان گرێنـەدەدا لەگـەڵ تیگـرای هێـزە بەربـەرەکـانبـەکـانی عیـراق دا دژی ئیـــنگـلیــز، کە ئەمــە ڕێـگـــەی راسـت و ڕەوان بوو، بۆ بەگژاچوون لەگەڵ دژمن داو سەندنەوەی مافی ڕەوای گەل؟

ووتمـان ڕێگـەو ماوە بۆ کردنـەوەی یانـە بە دەرەفـەتیکی پچووك بۆ روشنبیرانی دادەنرێ کە تیایدا ناتوانی بەگۆیرەی پێـویستی گەل و بە ئارەزووی خۆیـان ئەسپی لێتـاوبدەن و لەو سنـوورەی کە دەزگـای میـری بۆی دانـایاوون تێپەرن و زیــاد رووی بکــەن، هەروەهــا لە سەرێـکی تــریشــەوە جوولاّنەوەی کوردیش لەو تواناو دەستەلاتداریەدا نەبوو، کە هەل و مەرجـی خۆی بســەپێنێ بەســەر دوژمن دا ،واتــە پێویست بوو بەپێی بەرەی خۆی هەنگاوینێ بە کورتی بارو دۆخی ئەو ڕۆژە لەوەندە زیاتری بۆ روشنبیرانی کورد، دابین نەکـردبـوو یان نەرەخســاندبوو جگە لەمە دەزگای ئینگلیز بە بەراووردکــردن لەگــەڵ دەستــەلاّتی هێـزی جوولاّنـەوەی نیشتمانی لە پایەیێکی بەرزی بە تواناداد بوو، بە ڕەنگێ کە لە نەخشـەو پیـلانـەکـاتی لە هەمـوو ڕوویـەکەوە بە ئاسانی بەسەر هیزی نیشتمانیدا دەرۆی..

هەر ئەم هۆیــەش بوو، کە جوولاّنـــەوەی ڕۆشنبیـــریی کوردی خستبوە چوارچێوەییکی کزو لاوازو بێتواناییەوە کە نەیدەتـوانی تەنـانـەت هاوبـەشی خۆی لەگـەڵ ڕۆڵـەکانی شەشـی ڕەشـی ئەیلول دا بنـوینیو برایــەتیو یەکیــەتیو تێکـوشـانی بۆ ئەم جوولاّنـەوە شورشگیـرێیە دەربیرێت بە پێچـەوانـەوە پچرپچربوونی جوولاّنەوەی نیشتمانی کاریکی ناهـەمـواری وای پێـك هینـابـوو تەنانەت شیخی گەورەش (شیـخ محمـودی نەمـر) بێئـاگـا بوو لەم ڕاپـەڕینـە کە بە چەشتی پاش ڕوودانی بە عەشقی ئاگری تولەسەندنی لە (پیـرانـەوە) بە هیـوای سەنـدنی خوێنی (عـەولـە سیس) بۆ مافی ڕەوای کورد جاریکیتــر هاتـەوە مەیـدانی خەبـاتـەوە شەری (ئاویاریکی) دژی میریو ئینگلیز هەڵگیرسانەوە.

بەداخـەوە ڕۆشنبیـرانی کورد لەو ڕۆژەدا بە هێـزو توانـاو هوشیاری لە پابەو پلەیێکی وادا نەبوون کە بە بیرو باوەڕ، یا بە هەرشێـوەییکی ڕەخســاو پشتی ڕاپـەڕینـەکەی بەردەرگای سەرا بگرن و بە ئەرکی پێویستیان بەرامبەری بجولێنەوە.

پاش ئەوەی بڕیـار بە کردنـەوەی یانـە دەرچـوو دەستوبرد باوەڕ پێکــراوی گشتی مارف جیــاووك ماڵـەکـەی خۆی لە گەرەکـی صابــونچی لە بەغــدا کرد بە بارەگــەی یانــە بۆ کۆبــونــەوەو گفتــوگــۆ، چاو پیبکــەوتن، پێنــاسین و بۆ بەڕێوەبردنی گشت کاروباری یانەی تەرخان کرد.

یانەی سەرکەوتن لە ساڵەکانی (سی)دا بە گۆشەگیریو

سستی و خاوی و بێ‌دەنگی ژیانی دەبردە سەر لەم ماوەیەدا زۆر قەوماوی نەتەوەیی ،نیشتمانی . . وە ڕووداوی گەورە ئەو ولاٚت دا هاتە سەر شانۆ کەچی بەداخەو، یانەی سەرکەوتن تیایا بەشدار نەبوو وە هیچ چەشنە دەورێکی چ لە ڕووی قسەو بیرورا دەربرین یا بەکردەوە پیشان نەداوە، دیارە دەزگای میری ڕیگای بە چالاکی نواندنی یانە نەداوەو جوولاٚنەوەی ڕۆشنبیری کوردییش ئەوەند بە هیزو توانا نەبووە کە سنووری دیاری کراوی خۆی بشکێنێ‌و بانگی خۆی بەئاشکرا بداو بیروڕای بسەپێنێ بەسەر ڕۆژگاردا ـوی خۆی دەرخات و لەسەر ڕووداوەکانی ولاٚت بنوسی دوایی ساڵ هاتوو ساڵ ڕوویی شەڕی دووەمی جیهانیش لەلایەن ئەڵمانیای هتیلەریەوە هەلگیرسا بەم چەشنە گێتی بوو بە دوو بەشی سەرەکی دژ بە یەکتری بەرەی دیمکراتیەت لەگەڵ تێگرا گەلان دا کە لە پنیاوی ڕزگاری‌و سەربەستی بەرامبەر بەربەست کردن و لەناوبردنی ئەلمانیای نازی‌دا کەوتنە خەباتیکی سەختی خوینیاویەوە لەناو جەرگەی جەنگ بە هەڵهاتنی

ئاسۆی سەرکەوتن و زاڵ بوونی بەرەی گەلان تەرازووی هێزو باری جیهانی کەوتە گۆڕین و ستەمی زۆرداری‌و چەوساندنەوە لە گرێژەنە دەرچوو، شنەی شەماڵی ئازادی دڵی تیگرا گەلاٚنی فێنك دەکردەو، و ئازادی خوازانی جیهانی لە خەوی بی‌داری ڕاست بونەوەو بۆ داواکردنی مافی ڕەوای گەلانیان کەوتنە چالاکی نواندن و تێ‌کوشان. لەم یارووده‌وخە تازەیەدا دەزگای میری کەوتە پاشەکشێ‌و لەژێر پاڵەپەستۆی جوولاٚنەوەی گەلان دا دەرگای ئازادی‌و دیمکراتیەت کرابەوە نیشتمان پەروەران لە سەراسەری عیراق دا، هاتنە مەیدانی خەباتەوە، بۆ مافی پێ‌شیل کراوی گەل کەوتنە خۆکوکردنەوەو ئامادەبوون و، بیرو باوەڕدەربرین و تێکوشان.

یانەی سەرکەوتن لە ساڵی 1943دا بە ناوی دامەزرینە کۆنەکانیەوە لەسەرو هەموویانەوە باوەڕین کراوی گشتی مارف جیاوك هاتنە کۆری مەیدانەوە، بۆ پێك هینانی ئامانجەکانی جوولاٚنەوەی ڕۆشنبیری بە گەرمی‌و گورجی کەوتنە خەباتەوە. شیاوی باسە لاوانی تازە پێ‌گەیشتو، و قوتابیانی خوێن گەرمی قوتابخانە، بەرزەکان و تێگرا خوێندەواران باوەڕیان بە شێوەی تێکوشانی کۆن نەما دۆست و دوژمنی گەل بە ڕوونی دەرکەوتن، پشت بەستن بە هیزی گەل، تێکۆشانی بێ‌ووچان دژی ئیستعمارو دەرەبەك و کۆنەپەرست، بوو بە باوو بۆیە هێزی تازەی گەل بە نوێنەرانی کۆنی یانەی سەرکەوتن ڕازی نەدەبوون، داوای گۆڕینیان دەکردو خواستی هێنانی نوێنەری تازەیان دەکردوو بۆ گۆڕین و هەڵبژاردنی لیژنەی بەرێوەبەر کەوتنە جموجووڵ وابزانم ساڵی 1944 کە لەلایەن لیژنەی بەرێوەبەری‌یانەوە بڕیارێ دەرچوو کە لە بارەگا لە گەرەکی عبلوازیە پێویستە تیگرا ئەندامانی یانە بۆ هەلبژاردنی لیژنەی تازە ئامادەبن، بەم چەشنە وەکو مامۆستا دەڵێت:

هەرچی دەستی قەڵەم دەیگرت چاوی بە کلچیۆی خوێندەواری ڕشتبوو، سەرەووایکی دڵسۆزی‌و زانینی لە مێشك دا بوو، ئەو ڕۆژە لە بارەگەی یانەدا کۆبوەوە، واتە ئەگەر دەرزیت هەڵبدایە نە دەکەوتەسەر زەوی ئیتر تیکرا ڕۆشنبیرو خوێندەواری کورد لە بەغدا لەیانەدا کۆبونەوە بۆ هەڵبژاردنی لیژنەی بەریوەبەری تازە. . هیچ سوێندتان لەسەرم نیە، ئەگەر باوەڕیش ناکەن، زۆرم لەسەرتان نیە. ئاگام لەوە نەبوە کە ڕوشنبیرانی کورد من و ماموستا ئەمین زەکی بەگیان، خستبوە لیستەی هەڵبژاردنی خۆیانەوە. بەراستی ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی میژوویی دیاربوو کە هەرگیزاو هەرگیز لەبیرم ناچیتەوە نەك لەبەر ئەوەی ئەو لاو، قوتابیانەو ڕۆشنبیرانە منیان هەڵبژاردو بەس بەڵکو دیمەنی ئەو کۆمەلاٚنی ڕوشنبیریەی کە بە ئازادی‌و دیمکراتیانە هاتبونە کۆری هەڵبژاردنەوە بە تونـدی دڵ و مێشکی دەهەژاندو خوزگە خوازیم دەکرد کە کۆمەلاٚنی خەڵکی بەم چەشنە مەشقیان دەکردو بەم دڵ وگیان ئازادی‌و دیمکراتیەوە دەچوونە کۆری هەڵبژاردنەوە بۆ تێکرا دەزگاکانی میری تا

گەل خۆی بۆ خۆی فەرمانڕەوایی بنوێنی، تا چاکەو باشە لە هەموو مەیدانیکدا چەکەرە بکات و چەوتی و خراپەش تۆوی بە کوڵـەکـەی ئاش دا بچێ. بەڵام بەداخـەوە ئاواتـەکـەم نەهـاتـەدەی، خۆمـان نەمـان توانی لەم تاقی کـردنەوەیەدا سەرکەوتن بەدی بهێنین و ئەم هەڵبژاردنە بە دروستی بەرین بەرێـوە، نەمـان توانی ئەوانـەی کە خۆمـان دەمـانـەوێ هەڵبـژێـرین و بیـان خەینـە سەردەزگـای کار تا بۆ پێشـەوە چوونی کاروانی رۆشنبیـری هەمـوو لە چالاکیـا بین. دیارە دیمکراتیەت هەر قسەی رووت نیە. زۆری ئەویت؟، کە مرۆڤ یا گەل فێـربێ و مەشقی لە سەر بکـا تا بە کردەوە دیمکراتیەت بەجێ دەهینی و لێی لائەدات.

بە داخەوە لە هەڵبژاردنەکەدا دەستەی کۆن بردییەوە لە جیـاتی ئەوەی ئارەزووی لاوان و قوتـابیـانی تازەپێگـەیشتوو ئاواتی رەوای کۆمـەڵانی رۆشنبیـری جیگیربێ و سەرکەوێ، بەپێچـەوانـەوە بەرێـوەبـەرانی پێشـوو، شێـوەی کۆن لە تێکوشاندا پیاوانی رۆشنبیری نەگونجاو لەگەڵ باروو دۆخی تازەی وولات و جیهـان دا هاتنـەوە سەرکـار، لە ئەنجـام دا پاداشتی بەشداریم لەم هەڵبژاردنەدا، کە پشتگیری لاوان بووم خستیـانـمەپـاڵ دەستـەی لاوان و قوتـابیـان و بە ناوی ئاوانـەوە دەستـەی دەزگـای میـری منیشیـان لەگـەڵ ئەو دەستـەیـەدا راپێچی بەنـدیخـانـەکـرد کە بە هەزار حاڵ و تکـاکـردن ئەوسـا بەرەڵـلا بووین بە تایبـەتی ئەوانـەی کە لەگـەڵم دا گیـرابـوون هەریەکەیان لە بنەماڵەیێکی ناسراو و دەستەڵاندار بوون، ئەگەر پێم باوەڕیکەن هەر منی تیابووم لە ناویـانـدا کە بێکـەس و بێ پشت و پەنابێت، بۆ وینە لە بنـەمـاڵـەی قەزاز، عبـدالقـادر قەزاز، لە بنـەمـاڵـەی سیـد ئەحمدی خانقاە، کاکە حمەی سید. لە بنەماڵەی تاڵەبانی ،مکرم تاڵەبانی. لە بنەماڵەی دزەیی جوهر کانەبی، لەگەڵ جلیـل یوسف و مامـوستـا علاءالـدین. شیـاوی باسـە هەرچەندە رۆشنبیرانی کورد تیکرا ئامانج و ئاواتی بەرزیان خزمـەت کردن و پێش خستنی کاروانی رۆشنبیـری بوو، بەڵام لەگـەڵ ئەمـەش دا نابێت ئەوە لە بیـرکـەین، کە بەرژەوەنـدی چینـایـەتی بێ، یا تاکـە کەسی جیـسـای دەکردنەوە، بۆیە ناکۆکی لەنێوان ئەم رۆشنبیرو ئەو رۆشنبیر، ئەم دەستـەو ئەو دەستـەیـەدا هەبـوو ئەمیـان پلارو توانجی دەگرتە ئەو لا، یا ئەو دەستەیە ئەمی تری بە گوناهی گەورە تاوانبـار دەکـرد کە لە ئەنجـامـدا دەرکـەوت، پاش چەندان ساڵ و گۆرانـی زۆر قونـاغ و پلە کە ئەو گونـاهـانـەی دەخرانەپاڵ ئەم و ئەو زۆری راست نەبوو، بەڵکو زۆربەی زۆری رۆشنبیـران ئەگـەر هەمـوو نەڵێین کوردایـەتی پاك و بێ گەردو خزمەت کردنی خاك و نەتەوە لە کانگای دڵیان دا قوڵپی دەداو لەم پیناوەدا هەموو ڕێگەو شێوە تێکوشانێکیان دەکرد.

دوا قسـەم مارف جیـاووك کە لە ماوەیـێـکـی زۆردا باوەڕپێکراوی گشتی یانە بوو، رۆشنبیریکی کوردی ئازابوو لە پیناوی مافی رەوای کورددا، لەگەڵ هاواڵەکانی تری هیچ دریغیـەکیـان نەکـردوە چەنـد لە توانـایـانـدا هەبـووبێ لەم مەیـدانـەدا پێش کەشیـان کردوەد ئیتر مارف جیاووك نوینەر بوویێ یا متصەرفی سلیمانی یا باوەڕپێکراوی گشتی یانەی سەرکـەتن بوویێ لە هەمـوو حالـەتیکـدا لە خزمەت کردنی وڵات و رۆشنبیری کوردی کەم تەرخەمی نەکردوە.

ئەگـەر وەکـو مامـوستـا علاءالـدین دەڵێت ئەگـەرچـەند جاریـکیـش لەسـەر کوردایـەتـی و کێشـەی رۆشنبیـری مشتومریشمان بوویێ بەڵام دوایی خۆی ئاشتی کردومەتەوەو ئاو کراوە بە ئاگرداو لە ریزی جووڵانەوەی روشنبیران دا دەرنەچووە،

لە دوایی دا ئومێـدەوارم جووڵانـەوەی رۆشنبیـری ئەمـرۆ کەلك و سوود لە راوبوردووی رۆشنبیرانی کۆن وەربگرن و ئیستـایـان لەسـەر تاقی کـردنـەوەی کۆن دابنێن تا کاروانی رۆشنبیریمان کاژی کۆنی بێ کەڵك و بێ فەر فری بدات و لە هەمـان گانـدا کەڵـك لە رابـوردووی پرشـنگـداری سوودبـەخش بیبنی تا بەرەو ئامـانجی گەورەی رۆشنبیـری برۆیـن. کوردواتـانی هەر عەقلەو بیـرە لە خەسـارێ، تا نەدەی رەنج ناگەیت بە گەنج.

# ئەستێرەیەك ئاوابوو

غازی فاتح وەیس... ئەستێرەیەکی تازە هەڵبووی ئاسۆ تاریکەکەی زمانەوانیمان بوو.. لەگەڵ ئاوابوونیا ئەو ئومێدە زۆرەی پێمان بوو نێژرا..

غازی فاتح وەیس... خونچەیەکی تازە پشکووتووی گوڵزارە کەم گوڵەکەمان بوو. وەری پێش ئەوەی بۆن و بەرامەکەی جیهانی زمانە شیرینە هەناسە ساردەکەمان داگیربکات..

غازی فاتح وەیس.. بەگیانێکی ئەکادیمیی پتەو و تواناو تاقەتێکی بێپایان و پشتێکی ئەستوور بە مەنهەجیەتەوە پێی نایە مەیدانە یەکجار کزەکەی زمانەوانیمان... هات و لەگەڵ خۆیا ڕێچکەی تازەی شیکردنەوەی هێنا..

...بەم تەمەنە کورتەی ژیانی ئەکادیمیی بەرهەمێکی زۆری پێشکەش کردین.. کتێب و گەلێ ووتارو لێکۆڵینەوەی بڵاوکردەوە.. زۆری تریشی بە دەست نووسی ماوەتەوە... گەر مەرگ وازی لێ بهانیبا پرۆژەکەی ژیانی خۆی تەواو بکات.. گەنجینەیەکی یەگجار بەپیت و بە نرخی بۆ دادەگرتین...

بەرهەمەکانی غازی فاتح وەیس هەموو جێی شانازین. هەموو کەرەستەن بۆ لێکۆڵینەوە.. هەموو وانەن بۆ فێربوونی مەنهەجیەت و پەیرەوی زانستی لە نووسیندا.

پار بوو کتێبێکی لەژێر ناوی (فۆنەتیك)دا بڵاوبووەوە.. ئەم کتێبەی ئەشێ بە سەرەتای دەست پێکردنی قۆناغێکی تازەی لێکۆڵینەوەی دەنگسازی لە زمانی کوردیدا بژمێردرێ... چونکە یەکەم جارە لە مێژووی کوردا کتێبێك بەم ناو و نیشانەوە دەرچێ بگونجێ لەگەڵ ناوەڕۆکەکەی و لەژێر تیشکی تازەترین دەسکەوت و پەیرەوەکانی مەیدانی دەنگسازیی تازە کەرەستەی دەنگەکانی زمانی کوردی شیبکاتەوە...

یەکەم جارە کتێبخانەی کوردی پێشوازیی کتێبێکی وا ئەکات بەخوێنەری کوردی بناسێنێ، کە فۆنەتیك ئەلف وبێ و ریزکردنی پیتەکان و هەرای تیپ یا پیت نییە.. بەڵکو بیناغەیەکی پتەوی دامەزراوی لەسەر ئەنجامی پەرەسەندنی بیر کردنەوەی سەدان ساڵ و کێشەی دەیەها قوتابخانەیە.. بێ ئاگاداربوون و شارەزا بوون وزانینی ئەمانە هەموو. هەرکارو نووسینێك دەربارەی فۆنەتیك ساکارو پووچ و بێکەڵك و سەرپێیی دەر ئەچێ..

ئەم کتێبەی مامۆستای جوانەمەرگ غازی فاتح وەیس بەکارێکی رەسەن لەقەڵەم ئەدرێ چونکە هەموو خاسیەکانی ئەکادیمیی لێ بەدی ئەکرێ..

چ زیانێکمان پێ گەیی بە نەمانی ئەم گەوهەرە نایابە چی ئەتوانێ ئەم بۆشاییەی بەجێی هێشت پڕکاتەوە بێبەخێ نەبێ چی ئەم کارەساتە لێك ئەداتەوە..

**هەر ئەوەندەمان لەدەست دێ بڵێین..**

**هەزار رەحمەتت لێبێ. غازی فاتح وەیس.**

**وریا عمر أمین**

# دەست نیشانێك بۆ کەڵکی دەواو دەرمانی کوردی

نووسینی ئەمین نەقشبەندی

لە ڕۆژێکەوە مرۆڤ بەسەری ئەم زەوی‌یەوە ژیاوە، بێگومان دەردو ئازاریش هاودەم و ڕێگری خۆشی‌و کامەرانی بوون، هەروەهایش ئاشکرایە مرۆڤ دەبێ هەر لەو سەردەمەوە تێکۆشابێ بۆ بەربەرەکانی‌و بەگژاچونی دوژمنی هەرەگەورەی ژیان، واتە، دەردو ئازار، زۆرجار وا ڕێکەوتوە مرۆڤ بە هۆی خواردنی گژوگیاییکەوە نەخۆشیێکی لە کۆڵ کەوتبێ بگرە کاتی‌وایش بووبێت بەپێچەوانەوە، خواردنی گژوگیایێك، یان گۆشتی گیان لەبەرێك بووبێتە هۆی کوشتن، ویان زیان و ئازارێکی زۆری مرۆڤ.

مەبەست ئەوەتە لەو ڕۆژەوە مرۆڤ هەیە ئێش و ئازاریش هەربووە، تێکۆشان بۆ لەناوبردنی ئەم ئێش و ئازارانەش هەر بەردەوام بووە، کە برێ‌جار پەنایش براوەتە بەری جادوو، یان دوعا، یان موعجیزە، وە ئەو جۆرە شتانەی کە پەیوەندیان بە دەرونەوە هەیەو جیاوازن لە چارەکردنی نەخۆشی لە ڕێگای دەرمانی تەنیاوە.

هەروەکو دەزانین موعجیزەی عیسی بریتی‌بووە لە چارەکردنی ئەو نەخۆشی‌یانەی کە بەدەرمان چارەناکرێن.

بگرە زۆر جار پێش هاتوە کەسێك شوێنێکی برینداربووبێت وە بەو دەوروبەرەدا چی دەست کەوتبێ خستبێتە سەری برینەکەی، وە بگرە چاکیش بووبێتەوە یان خراپتر بووبێت، لێرەدا ئازمون بۆ چارەسەرکردنی دەردو ئازار دەست پێ‌دەکات، لە ناوی ئەم خەڵکەیشا هەروەکو ئاگادارین مرۆڤی هەڵکەوتو هەیە، جا هەرکەسەو لەشتێکا بلیمەت بووە، هی‌وا بووە لە شکارکردنا ئازابووە، هی‌وایش بووە لە کشتوکاڵدا هی‌وایش بووە لەپزشکی‌ی یان لە دەنگە خۆشیدا... هتد.

شوێنەواری دەرمان کردن و چاك کردنەوەی نەخۆش بە هەردوو شێوەکەی، چ بەدەرمان و چ لەڕووی هەستی‌دەرونی‌یەوە، لەناوی گەلانی پێشوی میصرو یونان و عیراق و چین و گەلانی‌تری ڕووی زەویدا باو بوەو لە شوێنەوارەکاندا بەدی دەکرێ، ئەوەی کە هۆی داخە ئەوەتە زۆر جاری وا پێش هاتوە کە لەڕێگای ڕێکەوتەوە دەرمان دۆزراوەتەوە بۆ زۆر دەرد، بەڵام بگرە ئەو کسە هەر نەی‌زانیبێ هۆی خۆش بونەوەی چی‌یە، یان ئەگەر زانیبێتی ڕەنگە وەکو نهێنیێك لە دەرونیا مابێتەوە، یان بەهۆی نەخوێنەواری‌و نەبوونی کەرەسەی یادداشت کردنەوە، یان هەزاران تەگەرەی تر، بوونەتە هۆی تیاچوونی دۆزینەوەی ئەو دەرمانە، جاری‌وایش بووە هەروەکو گوتمان شتەکە نوسراوەتەوەو لەپاشان کەڵکی لێ‌وەرگیراوە، وە هەرچی شێوەی نووسینەوە سادەتر بوەتەوەو قەڵەم و کاغەز هاتونەتەڕوو، ئەم نووسراوانە باشتر جێ‌یان گرتوەو بونەتە کتێب کە پێیان گوتراوە کتێبی «حیکمەت».

بێگومان لەناوی کوردەواری ئێمەشا ئەم سەرگوزەشتانە هەبوەو دەواو دەرمانی دەردەداران کراوە، بەتایبەت چونکە دەرو دەشت و شاخ و کێوەکانی کوردوستان پڕن لە گژوگیای هەزار جۆرو هەمەڕەنگە، بەڵام بەداخەوە زۆر کەم هەوڵ دراوە ئەم سەرمایە بەکەڵك و گرنگە بنووسرێتەوەو کۆبکرێتەوە کە، لەمڕۆ بە هۆی دەزگاو مەکینەی جۆراو جۆری ئەم چەرخەوە بخرێنە بەری ئازمونێکی زانیارانەی ڕێکوپێك بۆ ئەوەی بەو جۆرەی کە بشێ کەڵکی لێ وەرگیررێت.

جا من لێرەدا هەم ناوونیشانی چەن کەسێکی لای خۆمان دێرم و سەرگوزەشتیان دەگێرمەوە، هەم ناوی برێ لەو دەرمانانەی کە جارەهای جار ئازمون کراون، بەڵکو بکەوێتە پێش چاوی پزشکەکانمان و کەڵکەڵەی بشکنینی کەلەپوری پزیشکی‌ی خۆماڵی‌یان زیاتر ببزوێت و دەروێکی زیاتری ئەم کارە چاکە ئاوەڵا بکەن.

نزیکترین کەس بە هەر مرۆڤێکەوە باوکودایکە، هەر بەم بۆنەوە لە نزیکترین کەسەوە باسەکەم دێرمەناو.

یەکێ لە شارەزاترینی سەردەرچوانی پزیشکی‌ی خۆماڵی‌ی دەوروبەری ئێمە، خوا لێ‌خوش بو شێخ عەلائەدینی باوکم بوو، ئەم شارەزایی یەش لە چەن ڕوویێکەوە بوو:

یەکەم: بەدەستەوەبوونی باشترین کتێبی پزیشکی‌ی چاپ کراوو دەست خەت، چ بە عەرەبی چ بە فارسی‌و تورکی،

باوکم هەرسێ زمـانـەکـەی باش دەزانی. هەر بەم بۆنەوە بوو ریسالەیێکی نووسی بوو بەناوی «طبّ القلوب»، کە پاشان یەکێ لە گەورە پیاوانی «شەریعەت و تەصەووف» بەناوی «شیخ حسین رمضـان الخـالـدی» کە یەکێ بـوو لە خەلیفـەکـانی باوکم، لە کووردەکـانی سووری‌یـە بوو کە لە «دیـرالـزور»دا دەنیشت، شەرحێکی لەسەر کردووە چاپ کراوەو ئیستە من نوسخەیێکم لایە.

جا باوکم بەناوی پیرێکی تەریقەت و پزشکێکی خۆماڵی‌یەوە هاتـووە نەخـۆشی‌یـە دەروونی‌یـەکـانی بەرانبـەرکـردووە لەگـەڵ نەخۆشی‌یەکانی لەش دا وە دەرمانەکانیشیان هەربەم جۆرە.

بۆ نمـوونـە: پاش پێشـەکـی‌یـێـکـی جوان بەعـەرەبـی‌یێکی زۆربەجێ.. دەڵێ.. «فهلكنا في تيه الضّلال فَلا نُفرِّقُ بين الحـرام والحـلال، وحُـرمنـا من أنـوار رحمـة الرّحمان المنّان، بواسطة هجومنا على الخطيئات والعصيان، وَبه قَسَتْ قُلوبُنا، فَوَيْلٌ لِلقاسِيَةِ قلوبُهم عَن ذكر الله.

واعلمـوا إخـواني أنَّ جُنـون حُبّ الـدُّنيـا، وصرع الجهلِ، وكابوسَ الكسَلِ، وصُداع الحَسَد، وشَقيقة البخُلِ، وقروح سوداء طولِ الأملِ، و وسـواس حُبِّ الـرِّيـاسـة وزُكام الخيانة وقـذر العُيـوب، ورَمَـد غُبـار الذنوب...... هتد بەم چەشنە ناوی نەخـۆشی‌یـەکانی دەروون هەڵ دەدات و بەیێی هەڵ گرتن و لەیـەکتـرچـون، بەراوردیـان دەکـات لەگـەڵ نەخـۆشی‌یـەکـانی لەش دا، پاشان دەس ئەکاتە دەرمان دیاری کردن، وە ئەڵێ، «یاإخواني لاتكونوا كالذين نَسوا الله فَأَنْساهُمْ أنْفُسَهُمْ أولئك هم الفـاسقـون... وعـالجـوا الامراض المذكوره... بدوائها عند الحكماء الربانيين.. وواظبوا على التداوي عندهم»...

........ تا ئەگاتە ئەوەی ئەڵێ.. «يامن تريد أن تقبل نصيحتي فتكون من الأبرار خُذ بعد الاستغفار بالتكرار، مِنْ لُبِّ حَبِّ الانـابـة، ومن ورق النـدامـه، وزهـرة الانفعـال، وعَـرق التّوبة، وصَمغ الزّهد، وعِلك التقوى، وجوهر الذّكرِ... هتد، أجزاء متسـاويـةً خالصـةً من قِشـر الوجود، واجعلها في هاون الصِّـدق... هتـد پاشـان پیشـان دەدات چۆن دەرمـانـەکـان ئامـادەکـات وە چۆن، چل شەو ئەم دەرمـانـانـە کە ذیکـروفیکرە بەکاریان بێرێت.

جا دەگاتە ئەوەی پارێزی بۆ دابنێ... کە دەڵێ.. «واجتنب النظـر الى الأنـام واتـرك بَصَـل اليأس وبيضـة الـرِّيـا، ولحم الاستـراحـة. هتـد...، تا دەڵێ إلى أنْ تَرى نفسـك راضيـةً مرضيّةً، طاهرةً من عِللها وعيوبها الظاهرة والخفيّة، خالية عن الأهواء الرديّة...

بەم چەشنـە تا دەگـاتـە دواپلەی مەبـەست کە گەیشتنە پلەی «عين اليقين» لە تەصەووف دا، وە پلەی لەش ساغی‌ی تەواو، لەجیهانی ماددی‌دا کە «العقل السّليم في الجسم السليم» بێت.

جا ئەمـە ئەگـەر ئەوپـەڕی شارەزایی لە هەردوو ڕەوشـەکـەو، پەرمیـنـەوە بەخـۆدا نەبێ، ئەم کارە ناکـرێت، لە هەمـووی گرنگـە تر، ئەم ریسالـە دە لاپـەرەیی‌یـە، کە شێخ حوسەین لە (79) لاپـەرەدا شەرحی‌کـردوە، شێخ عەلائـەددین لەیـەك ڕۆژ بەڵکـو لە دانیشتنێکـا نووسیـویەتی کە ئومێدەوارم چاپی بکەمەوە

دووهەم: سەر دەرهاوردن و شارەزایی‌یە لە دەواو دەرمانی کوردیی.

سێ‌هـەم: ئازمـون و وردبـوونـەوەو ئامـادەیی و پەیوەندی دەروونی و حەزلێ‌کردنی ئەو ئیشەتە.

چوارەم: هەسـتی خزمـەت بە دەردەداران و نەخـۆشـەکـان، بەتایبەت لەو سەردەمەدا خۆ وەکو ئەمرۆ نەبووە، دەواو دەرمان و پزیشك و خەستەخانەو دەرمان خانە هەمولاگر بێت، بەتایبەت لە سەردەمی پێش لە بیـرەوەریی منیشـا، واتـە لە سەرەتـای ئەم سەدەیـەدا، بۆنمـوونـە: لە ساڵـەکـانی (1900) تا (1920)دا باوەرناکەم لە سولەیمانی‌یەوە تاسنە، لە خانەقی و کرماشانەوە تا سەقـز و سابـلاغ و بانـە، حەبێکی حکـومـەتی‌یو دەرمـانێکی لە کارگە دروست کراودا دەستی دەست دار کەوتبێ، لە ئاوا کاتێکا ئەگـەر پیـاوچـاکێکی خوێنـەوارو شارەزا لە پزشکی‌یـەکـانی خۆمـاڵی‌ی، کە بە هەمـوو بارێکـا جێگـەی باوەڕی خەڵـك بووبێت و، ویستبێتی خزمەت بکات، دەبێ ئەو کارەی چەندە بەکـەڵـك بووبێت، وە هەروەکـو دەزانن لابنی «نـەفـسی» بۆ دەرمان کردنی نەخۆشێ چەندە کار دەکات.

جا هەر لەو سەردەمـەدا کە باوکـم لە (دووڕۆ)دا بووە، ئەو دەمەی دوکتور سەعیدخانی کوردوستانی‌ی هاتوتە هەورامان، بۆ دەرمـان کردنـی چاوی «عـەبـاس قوڵی سان» کە یەکێکـە لە

باوەگــەورەی بەگــزادەکــانی ڕەزاو، کە خزمــایــەتــی ژ ن و ژ ن خوازیی یـان لەگـەڵ خانـەوادەی ئێمـەدا بووە، چەن شتێکی گرنــگ ڕووی داوە، کە وردبــینیو شارەزایی باوکم لە هەمـــوو بارەکانا دەردەخات.

یەکەم: دۆزینەوەی ئەو بەڵگە گرنگە مێژوویی‌یەی کە بە سەنەدی هەورامان بەناوبانگەو، دوکتور جەمال ڕەشید لەکتێبی «دراسات کردیــة في بلاد سوبــارتــو»دا باسی کردوە، لەوێـدا هەڵـەیێـك بەدوکتــور کراوە کە وتــراوە ئەو بەڵگـەیـە لە قەڵای «ســورن»ی بەرانبــەری گونــدی «بــن دۆڵ»ی هەورامــان دا، باوکــم دۆزیــویــەتــەوە، بەڵام ڕاستـەکـەی ئەوەتـە لە خواری گونـدی «پاڵنگان»ی هەورامانی ژاوەرۆوە لە قەراغی سیروانا لەشوێنێك بەناوی «تەنگی‌بەر»دا لەداوێنی شاهۆدا دۆزراوەتەوە، ئەویش بەم جۆرە دەبێ، شێــخ گوزەر دەکــات بە بەرانبـەری ئەو شوێنـەدا کوتـوپـڕ چاوی دەکـەوێت بە ئەشکـەوتێکی دەسکـاریی‌کـراو بە تەموی «ماە»و «زەردێ» کەوە، دەڵێ هەبێو نەبێ ئەو ئەشکەوتە شوێنەواری کۆنی تیایە، پاشان چەن کەسێکی وریاو شاخەوان بە سەرکردایەتی پیاوێکی سەختەوانی وریا کە خەڵکی «ڕەزاو» بووەو ناوی «وەرگڵە» بووە، دەکــاتــە پێ‌سپێــرراوی گەیشتن بەو ئەشکــەوتــەو، پشکنینیو بەدەست هێنــانی ئەو شتــانــەی کە تیـایـەتی.. «وەرگڵە»، بە هەورامی، واتــە «گـورگڵە»، گورگـە بچکۆڵە، ... پاچ و نوێلیان دەداتە دەست و، گوریسی زۆر، تا لەو شاخەوە بێنە ناو ئەشکەوتەکە.. وە چی بکەن و چی نەکەن، کە ئەوە خۆی پێــویستی بە باسێکی جیــاوازە کە بینــووسم... پاشــان کە ئەو سەختــەوانــانــە دەڕۆنــە ئەشکــەوت لەســەر ئامـۆژگـاریی‌یـەکـە، کوپـەڵـەیێك دەدۆزنەوە لە شێوەی شوتێیکی سەوزا، کە گۆزەبـووە، ئەو «بـەڵگـە»یـەی تیـابـووە، کە لەسەر، پێست نووســراوەو ئەوەتــە دوکتــور جەمــال ڕەشیـد ئەحمـەد لە کتێبـەکـەیـا، هەروەهـا لەباسێکا لە (گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ)دا باسی کردوە.

جا کە دوکتــور سەعیـدخــان دێت چاوی عەبـاس قولی سان «عەمەلیات» بکات، لەوێ دێتە خزمەتی شێخ و هەروەکو گوتم چەن شتێ ڕوو دەدات.

یەکــەمیــان ڕزگــارکــردنی دوکتــور سەعیـدخــان بە مەرگە.. عەبـاس قولی سان وادیـارە زۆر قەڵـەوبـووەو، ورگی زۆر گەورە بووە. پاش عەمـەلی‌یـاتی چاوەکـەی.. دوکتور بە هەڵاوداوان و شپرزەیی دێت هاواردێنێ بۆ شێخ، دەڵێ وا دەمکوژن، چارەم بکە.

شێــخ دەفــەرمێ، هۆکــەی چی‌یــە؟ دەڵێ نازانم (ســان) چی‌یــەتی، واخــەریکــە دەمــرێو هەنــاســەی سوارەو کەف دەچەرێنێ.. خەڵکەکەش دەڵێن (سان) بمرێ هەزار گیانت بێ یەکێکی دەرناکەیت.

شێخ کە دەڕوا سەیردەکات سان لەسەر گازی پشت بەسەر قەرەوێڵەیێکــەوە کەوتـووە پەرێشـانـە خێـرا دەڵێ زوو دوو پارچـە خشت فریا خەن، پارچە خشتەکان دێرن، دەڵێ دەسا بە دوو سێ کوڕی ئازا سەری ئەم قەرەوێڵەیەم بۆ هەڵبرن و سەری سان بەرز دەکـاتــەوە بەســەر لەشیا.. سەیر دەکەن سان هەناسەیێکی باشــی داو چاوی کردەوە، مەگێـــر لای خواروی قەرەوێڵەکـــە بەرزەو ئەویش زۆر قەڵـەوە وە دەست وشـانـەی بەستـراوەتـەوەو، ورگی سەردڵ و سی‌یــەکــانی گرتــوە.. بەم جۆرە دوکتــور لەم کێشەیە ڕزگاری دەبێت، لەکاتێکا کە دوکتور سەعیدخان هەرگیز بیری بەلای ئەوەدا نەچوە کە ئەم هەناسە تەنگی‌یە هی نزمی‌ی جێگـەی سەری نەخـۆشـەکەیەتی شێخ هەر بەچاوپێ‌کەوتن بۆی دەرکەوتووە چارەی کردوە.

جا دوکتــور داوای ئەو سەنــەدە دەکــات لە شێـخ و، بەڵێن دەدات، هەرکـە گەیشتـە «ئـەورووپـا» دەیـدا بیخـوێننـەوە، هەم چۆنیەتی دۆزینەوەکەی بە هەموو جیهان ڕادەگەیێنێ، هەم ئەگەر پارەیێکیشی کرد بیکـاتـە دوو بەشـەوە، بەڵام بەداخـەوە دوکتـور بەڵێنـەکـەی نەبـردەســەرو، شوێنی دۆزینـەوەکـەیشی ڕاست نەگوتبوو، لام وایە بۆ ئەوە بووە شوێنەوار ناسان نەگەنە ناوچەکەو ڕازەکـەی ئاشکـرا بێت، ئێمــەش چەن و چۆنی ئەم کارەمـان نەدەزانی تا جارێکیان «فؤاد سەفەر» کە بەرێوەبەری (ئاثار) بوو لە بەغـدادا، لە ئەحـمــەد ئاوادا کە مێـوانــی من بوو، لە پەنجــاکــان دا، ئەو، باسی ئەم سەنـەدەی کرد، کە دوکتــور سەعیـدخـان فرۆشتـویـە، منیش باسەکەم بۆ گێڕایەوەو زۆری لا سەیربوو، وە لەم دواییەشدا دیم کە دوکتور جەمال لە «گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (103و 104» باسی‌کردوە.

مەبەستی دووهەم، بریتی‌بووە لەوەی کە باوکم نمونەی زیاتر

له «چـل» گیـای ولاٌتی خوٌمـانی داوتـه دەستی سەعیـدخـان، نمونەی ریشەو لاسك و گولٌ و گەلاٌی ئەو گیایانە، ناوی هەمو گیـاکـانی بوٌ نووسیـوە بە (یـوٌنـانی) بە (عەرەبی) بە (فارسی) بە (کـوردی)، هەروەهـا ئەم گیـایـانە بوٌ چ دەرمانیٌك بەکار دەبریٌن بەکار دەهیٌنریٌن).

جا پرسیاری کردبوو ئایا لە ئەوروپادا پیٌویستیان بەم گیایانە هەیە؟ ئایا ئەگەر (صادیر) بکریٌن بەچەند دەیان کرن؟

دوکتـور ئەو وەلاٌمـانـەی وەرگـرتبـووەوو داوای کردبـوو کە بوٌی رەوانـەکـریٌن. . هی وایـان هەبـوە، کە نرخـەکـەیان بە «مثقال» دانـابـوو، جا تا ئەم هاتـوهـون و هاتـوچـویـانە کرابوون، چەن ساڵیٌکی پیٌچووبوو، هەم باوکم تەشریف دیٌریٌتەوە بوٌ بیارە، کە بیٌتـە جیٌنشینی شیٌخ عومـەر ضیـاءالـدین باوکی و هەم هەواڵ دەگات کە سەعیدخان لە ئاینی ئیسلام رووی وەرگیٌراوەو بوەتە مەسیحی، وە هەم دەردەکـەویٌ کە سەبـارەت بە سەنـەدەکـە بیٌ بەڵیٌن بووە، ئەمیش دڵی لیٌی سارد دەبیٌتەوەو دەڵیٌ دەرمانەکانیش دەکاتە سەنەدەکە.

جا شارەزایی باوکم لەپزشکیدا تا لەم رادەیەدا بوو. . . . وە زوٌر جار دەم دیٌ، نەخـوٌش کە دەهـات بوٌ خزمـەتیو «نەبضی» دەگـرت زوٌر جار هەر لەو نەبـزگـرتـنـەدا وادیـاربـوو نەخـوٌشی یـەکـەی ناسیبـو. . . ، ئەویش لەوەدا دەردەکـەوت هەرچی ئەم دەیپـرسی نەخـوٌشـەکـە بەڵیٌی دەکـرد. بوٌ نمـونـە دەیگوت فلاٌن شویٌنت دیٌشیٌ؟ دەیگوت بەڵیٌ. . بەیانیان تامی دەمت بەم جوٌرەیە؟ دەیوت بەڵیٌ. . . هتد.

دیـاربـوو ئەمیش ئەو پرسیـارەی دەکـرد کە هی نەخـوٌشیٌکی تایبەتە چونکە دیارە هەرنەخوٌشیٌك نیشانەی تایبەتی خوٌی هەیە.

. . . . لە ناوچـەی هەورامـان دا، لە شاری هەورامـان و گونـدەکـانی دەوروبـەریا، وەکو «کەمالاٌ»و «وەیسیا» هوٌزی شیٌخ هیدایەت دەژین، کە پیٌیان دەڵیٌن. شیٌخانی شاری هەورامان، ئەمـانـەش، لە گرتنـەوەی شکستـەو دەرمـانی برینـداران دا، بلیمەت و بیٌویٌنەبوون، وەلە گژوگیای ئەو کویستانانە، دەرمانی وایان دەگرتەوە، بگرە «ئانتی بیوتیکی» ئەمروٌیش ئەوەندە بەکار نەبوویٌ.

ئەم خیٌـڵە بە ژن و پیـاوەوە، لەم رشـتـە پزشـکـیـەدا شارەزابـوون، تەنـانـەت کچیٌکی شیٌتـوٌکـەیـان بووە، جاریٌکیان پیاویٌکیان، شانی یەکیٌك دەگریٌتەوە کە شانەکەی باڵی داخزاوە، پاش بەستنـەوەی کە دەیـەویٌ ریٌی بدات، بروات، ئەو کچـە شیٌتـوکـەیـە بە هەورامی دەڵیٌ، بابـە «گـوٌ» یەکەت لە یاد چوو، ئەویش سەیـر دەکـا راستـە لە یادی چووە. . . . ، ئەم «گـوٌ»یە، بریتییـە لە گلوٌلـەییٌـك لە پەروٌو پیتـاڵ دروستی دەکەن بە قەدەر هەنـاریٌـك، پاش گرتنـەوەی شانەکەی باڵ، ئەیخەنە بن دەستی نەخوٌشەکە، بوٌ ئەوەی شانەکەی دانەخزیٌتەوەو لەجیٌ بچیٌتەوە.

لەمانە، شیٌخ هیدایەت، پاشان شیٌخ مەحمودی کوری کە من دیومە ریش سپییٌکی ئیٌسك سوك بوو وە شیٌخ صادقی کوری شیٌـخ مەحـمـود کە ئەویش هەشـت نوٌ ساڵیٌ لەمـەوبـەر بە شیٌریەنجەی گەدە عەمری خوای‌کرد. وە شیٌخ موحەممەدی شیٌخ مەحمود، بگرە چل ساڵ لەمەوپیٌش شیٌخ مەحموودم دییٌت کە دەهات بوٌ خزمەتی باوکم لە بیارە.

ئیستـەش زوٌر کەس لەم خیٌزانە ماون و هیٌشتا هەر بەهانای خەڵکی ناوچـەکـەوەن. بلیمـەتی گیٌـرانـەوەی ئەم بنـەمـاڵـەیـە هەردوایی نایێ، باوڕ بفـەرمـون کاری وایـان کردووە مەگـەر عەمەلیاتی ئەمروٌ، بگاتە رادەیان.

هەروەهـا لە گونـدی «بیـارە»ی خوٌیشمـان دا پیـاویٌکی رەوش بەرزو، کەڵـك گرو، زوٌر بەدین هەبـوو، هەمـو خەڵکی بیارە ئەوەنـدەیـان خوٌش دەویست، هەمـوویـان پیٌیـان دەگـوت «مامە»، کە بە «ماموٌ جافە»، مامە جافە، بەناوبانگ بوو.

ناوی جافری شیٌخ فەتاح بوو، نەوەی شیٌخ عەلی تەویٌڵەیی، کە یەکیٌ بـووە لە خەلیـفـەکـانـی شیـخی سیـراجـەدین، نەخویٌنەواریش بووە. مامە جافە لە دەرمان کردنی برینی تیٌغ و گوللەو زامی‌تری لەشدا زوٌر شارەزابوو، شکستەیشی دەگرتەوە.

مامە جافر لە ساڵاٌ دوو سیٌ جار دەروٌیشت بوٌ کویستانەکان، بوٌ هاوردنەوەی گژوگیا، بریٌ جار بوٌ گیاکان بە سەوزیی، بریٌ جار بوٌ گوڵی گیاکان، بریٌ جار بوٌ ریشەی گیاکان، نازانم مامە جافـە ئەم زانستـەی لەکـویٌ دەست کەوتبـو، لام وایێ زوٌرتری ئازمونی خوٌیبوو. . .

مامە جافە لەمنەوە زوٌر نزیك بوو زوٌر زیاتر لە خەڵك. . . ، بەو بوٌنەیەوە زوٌر شارەزابووم لە کارەکانی. . . . ، ئەم گیایانەی وشك دەکردەوەو دەیکوتان وەکو گەردیٌکی زوٌر جوانی شوشەکانی ئەمروٌ، زوٌرەکەی بوٌنی خوٌشی گژوگیای گرتبوو، هەر بە بوٌن

ئەو دەرمانانەی لێك جوێ دەكردنەوە.

ئاگام لێیە دەرمانی وابوو دەیگوت ئەمە نابێ هەموو ڕۆژێ بدرێت لە برین چونکە زوو لەسەرەوە سارێش دەبێ، وە هێشتا لە خوارەوە برینی هەیە.

جا هەر دەرمانێکیشی بۆ جۆرە برینێ بەکار دەهانی، ئەوانەی هی ڕیشەی گیاکان بوون و، وەکو (پاودر) ئاوا کرابوونە (گەرد) زۆریان سپی بوون.

مامە جافە لە «پێوەند» واتە «موتربە» کردنیشا زۆر شارەزابوو، هەمیشە یارمەتی خەڵکی دەدا، ساڵی (1962) لە ئەیلولدا بوو، لە تەمەنی حەفتاساڵیدا دنیای بەجێ هێشت.

بەداخەوە منداڵەکانی لەم بەهرەیە بێبەشن، بەڵام لام وایێ خێزانەکەی ئەو گژوگیایانەی دەناسی، کە ئیستەش ماوە.

لە کۆتایی‌دا وامن بۆ نمونە ناوی یەك دوو گیایێك دەبەم، کە ئەوەندە تاقی کراونەتەوە کارکردیان ئاشکرایە.

بۆیە دەینوسم بەڵکو پزشکەکانمان بکەونە پشکنینی لە بارەیانەوە:

1 ـ گیای «قەیتەران» ئەم گیایە بەعەرەبی پێی دەڵێن «کرفس البیر»و لە شوریجەدا لە بەغدا هەیە. بەفارسی پێن دەڵێن «پرسیاوشان»یان «سیاپوز»و لەناوچەی ڕەواندزیش پێی دەڵێن «گیا بالوکە»... . وەکو دەڵێن، ناوی خۆی وا بە خۆیەوە.

ئەك گیایە گەلاکەی وەکو مەعدەنوس وایەو لاسکەکەی ڕەشی ڕەشە، هەروەکو موی‌سەر تۆزێ ئەستورترە، لاسکەکەشی زۆر ڕەقە... لە شوێنێکا سەوز دەبێت ئاڵگەی ئاوبێت و، هەمیشە (نم ناك) بێت، چەمی زەڵم پڕیەتی.. هەفتەیێ تا دەرۆژ، وشك کراوی ئەم گیایە، کە لەسیبەرا وشك کرابێ‌و، ورد هاڕدرابێ، هەربەیانیەی بە ئەندازەی پڕی کەوچکێکی چێشت خواردنی بە دڵی ناشتا، شوێنەمای «بالوکە» نایێڵێ، ئەربۆی نەخورا بەو شکی‌و بە تەنها، دەتوانێ تێکەڵاوی دوو کەوچك ماستی بکات بۆ ئەوەی بۆی بخورێ، ئەر هەر بۆی نەخورا هەر ئەو ئەندازەیە چوارپیاڵە ئاوی تێ‌دەکات و وەکو چایی دەمی دەکات، هەر جارەی پیاڵەیێکی لە بەیانی تائێوارە، سێ پیاڵەی لێ دەخواتەوە، سبەی سەرلەنوێ دەمی دەکاتەوە.

لای ژورەوەکەی تا دەر ڕۆژ. هەر ئەم گیایە ئەگەر زۆرتر دەوامی لەسەر بکرێ بەردی (مەثانە)و گورچیلەیش دەکاتە (لم)وە لەگەڵ میزا دەروات، بەتایبەت هەر هەفتەیێ جارێکیش، یەك ڕۆژ، «خەیاتە»ی زەراتیشی بۆ بکات بە چایی‌و بیخوات، بەڵام هەر یەك ڕۆژ، چونکە ئەم خەیاتەی گوڵە زەراتە زۆر «مودەربیر»و میزی زۆر دەکات، نابێ زۆری بخوات.

هەر ئەم قەیتەرانە بە چایی، بۆ کۆکە باشە بەڵام ئەو کۆکەیەی کە زۆر مابێتەوەو چارە نەکرابێ، نەك کۆکەی هەڵامەت و تازە.

جا ئەوە مەگەر پزشکەکان پاشی تاقی‌کردنەوەی لە دەزگاکانی پزیشکی ئەمرۆدا، بزانن بۆچی قەیتەران ئەم کارە دەکاتە سەر ئەم شتانەو، چونەوا دوو سێ جۆر سودیشی هەیە.

2 ـ هەروا تۆوی گیایێك هەیە بەکوردیی پێی دەڵێن (خاك شیر) وەکو تۆوی توتن وایەو وردتریشە، لە شوریجە بە «خوبیة عجم» بە ناوبانگە ئەمەش هەر بەیانی بەدڵی ناشتا بە ئەندازەی کەوچکێکی خواردنی دەکرێتە ناوی دەم و ئاوی بە شوێنیا دەخورێ، یان دەیکەیتە ناو پەرداخێ ئاوی ساردو تۆزێ شەکریشی تێکەی ئەمەیان بە ئارەزوی خۆتەر ئەمیش زۆر بە کەڵکە بۆ لابردنی «حەساسیەت»، وە من خۆم بە خواردنی پەتاتە، حەساسیەتم هەیە بۆ هەفتەیێ خواردم و بۆ هەمیشە ئەو حاڵەم نەما...، جا هەر ئەم خاك شیرە لەناو ئاودا خواردنەوەی بۆ کەم کردنەوەی «تا»و گەرمای لەش زۆر بەکەڵکە.

دەڵێ مشت نمونەی خەرواره، هەروەکو دەزانن هەم (بالوکە)و هەم (حەساسیەت) ئەمرۆ چارەکردنیان دەردی‌سەری هەیە، کەچی بەم ئاسانیە لای خۆمان چارەیان هەیە، بەتایبەت ناوی گیای قەیتەران کە برێ لە کوردەکان پێی ئەڵێن (گیابالوکە) ئەوە خۆی پیشان دەری ئەوەتە باو باپیرانمان لە مێژەوە ئەو دەرمانەیان دۆزیوەتەوە، وە من خۆم هەردووکیم تاقی کردوەتەوە، خاك شیر، خۆم، وە گیابالوکە ئابتی برام و دەیان کەسی‌تر.

من هەرچەن لەم ڕشتەیەدا خۆم ماندونەکردوەو شارەزانیم، لەگەڵ ئەوەشا دەتوانم لای کەم کەڵکی دەیان، وە بگرە نزیکەی سەد شت لەم گژ و گیایانەم لە یاد بێت و، دیومە کە بە کەڵکی خەڵکی خواردوەو لە دەستی زۆر ناساغی ڕزگاری کردون.

ئایا باشترنیە پزشکەکانمان برێ لە کاتی خۆیان تەرخان بکەن، بۆ تاقی‌کردنەوەی ئەم سەرمایە گەورە سورشتی‌یەی کە خودا داویە بە وڵاتەکەمان؟

# بەرهەڵستە کۆمەڵایەتیەکانی ڕێگەی بەشداری کردنی ئافرەتانی ناوچەی حوکمی زاتی کوردستان لە پرۆسەی پیشەسازیەکاندا

**د. مجيد حميد علي عارف**
**کۆلیجی ئاداب - بەشی کۆمەڵ زانی**
**زانکۆی بەغداد**

ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە شی‌کردنەوەی باری ڕاستی‌ی ژیانی ئافرەتی کوردە لە ناوچەی حوکمی‌زاتی‌ی کوردستاندا لەگەڵ دیاری‌کردنی ئەو بەرهەڵستانەی دەبنە هۆی بەشداری نەکردنی ئافرەت لە کاری پەرەپێدان و لە زۆربەی چالاکی‌یەکانی کۆمەڵدا. . بە مەبەستی گەیشتنە باشترین شێوەی پەرەپێدان لە ڕێگەی بەشداری کردنی ئافرەتی کوردو سوود وەرگرتن لە ووزەکانی کەوا نیوەی ووزەی کۆمەڵ دەنوێنێ، چونکە مانەوەی ئەم سەرچاوە ئادەمی‌یە دوور لە بەکارهێنان و سوودلێ‌وەرگرتن، ڕێگا لە کرداری پەرەپێدان و پێشکەوتن دەگرێ.

هەر لە کۆنەوە ئافرەت بە دەست چەند گیروگرفتێکی کۆمەڵایەتی‌یەوە ناڵاندوویەتی بە تایبەتی یەکسان نەبوونی لەگەڵ پیاو لە ماف و ئەرکەکانیدا لە ناوەوەو دەرەوەی خێزاندا، بەڵام پێشکەوتنی تەکنەلوجی‌و پێویستی‌ی وولات بە ئافرەتی کرێکارتا لە بەرهەم هێناندا شان بەشانی پیاو بەشدار بێت، پاڵی بە ئافرەتەوە نا باسکی لێ‌هەڵماڵێ‌و هەوڵی گوزەران بدات و بچێتە کارگەو دەزگا کۆمەڵایەتی‌یەکان بۆ بەشدار بوون لە وەدەست خستنی پێویستی‌یەکانی خێزاندا. لەم ڕووەوە چەند گیروگرفتێکی تووش بوو لە سەردەستەیاندا مەسەلەی هاوسەنگە کردنی تای تەرازووی ئەرکەکانی ماڵەوە لەگەڵ ئەرکی کارەکەی دەرەوەیدا چونکە سەرباری ماندوێتی‌ی لە شوێنی کاردا کە دەگەڕێتەوە ماڵ ئیش وکارێکی زۆر چاوەڕوانی دەکات ئەمەش شان بەشانی چەند گیروگرفتێکی تریش کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا ڕوونیان دەکەینەوە، کە بریتین لە چەند گیروگرفتێکی تووش بوو لە سەردەستەیاندا مەسەلەی هاوسەنگە کردنی تای تەرازووی

ئەرکەکانیء ماڵەوە لەگەڵ ئەرکی کارەکەی دەرەوەیدا چونکە سەرباری ماندوێتی‌ی لە شوێنی کاردا کە دەگەڕێتەوە ماڵ ئیش وکارێکی زۆر چاوەڕوانی دەکات ئەمەش شان بەشانی چەند گیروگرفتێکی تریش کە لەم لێکۆڵینەوەیدا ڕوونیان دەکەینەوە، کە بریتین لە چەند گیروگرفتێکی شارستانەتی یان گیروگرفتی نرخ بابەت (القيمية) (واتا خوو و نەریتە رزیوەکانی کۆمەڵایەتی) کە لە ژیانی مرۆڤی عیراقیدا دەورێکی گەورە دەگێڕن.

کۆمەڵی عیراق کە لە بەرەبەیانی مێژووی مرۆڤایەتی‌یەوە باوەشی بۆ شارستانەتی‌یەکی گەشاوە گرتۆتەوە بەرەنگاری چەند کردارێکی تێکەڵاوی‌و پەیوەندی‌ی شارستانەتی‌و رۆشنبیریانە بووە، ئەمەش کاری کردوەتەسەر باری کۆمەڵایەتی‌و شارستانەتی‌ی کۆمەڵ، چونکە ئەم شەپۆلە مرۆڤانەی هاتوون چەند خوو و نەریتێکی بیابانی‌ی کۆچەرییان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە کە لە دوایدا بوونەتە هۆی ئەوە گەلی عیراق بکەوێتە نێوان دوو رژێمی داب و نەریت و نرخ، یەکەم داب و نەریتی شارستانەتی‌ی کۆنی لە کەلەپورر وەرگیراو دووەم نرخەکانی کۆچەری‌ی زادەی بیابانەکان، ئەم مل ملانێ‌ی نرخ بابەتە (الصراع القيمي) بووە هۆی سەرهەڵدانی مل ملانێ‌یەکی شارستانەتی‌و دەروونی‌و رۆشنبیری لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر[1]

بەڵام لە هەموو ناوچەکانی عیراقدا لەسەر یەك دۆخ نا، چونکە ناوچەی چیاکان کە گەلی کوردمانی تێدا نیشتەجێیە نرخەکانی بیابان کاریان تێ نەکردووە بەڵکو نرخەکانی چیا کاریان تێ کردووەو کێشەو مل ملانێ‌ی رۆشنبیری لە هەندێ ڕوویدا لەو کێشە رۆشنبیریانەی کە لە باشوورو ناوەڕاستی عیراقدا سەریان هەڵداوە جیاوازن.

بێگومان، باری کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسی‌ی ناوچەی حوکمی زاتی‌ی کوردستان، لە کۆنەوە تا ئێستا، کاری لە ئافرەتی کوردی ناوچەکە کردووە، کەوا لەبەر بڵاوبوونەوەی نەزانی‌و نەخوێندەواری لە سەردەمە جیاوازەکانی مێژوودا گەلێك گیروگرفتی کۆمەڵایەتی‌ی وەکو کێشەی خێزانایەتی‌و کێشەی هۆزایەتی تێدا دەرکەوتووە، کە بوونەتە هۆی دواکەوتنی کۆمەڵی کوردەواری، سەرباری بەڵای دەرەبەگێتی کە بۆ سەرهەڵدانی زۆر گیروگرفت دەورێکی دەورێکی گەورەی بینیوە، لە پێش هەموویانەوەش هەژاری‌و نەبوونی هێمنایی‌و ئاسایش بووە، ئەم بارەش لە دواییدا کاری لە ژینی ئافرەتی کورد کردووەو لە بواری کۆمەڵایەتی‌و شارستانەتی‌یەوە دواخستووە[2] هەروەکو پیاو، بەڵام بەشی ئافرەتەکە لە کێشەی رۆشنبیری‌و دواکەوتنی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی لە بەشی پیاو زیاتر بووە، ئیتر تووشبونی ئافرەتی کورد بە چەندین گیروگرفتی شارستانەتی شتێکی دیارو ئاشکرابوو، بڵاوبوونەوەی نرخ و نەریتی رزیوە بەردینی لە کۆمەڵی بیانی‌یەوە هاتووش وای‌کرد ئافرەت لە بەرو بەراتی پەروەردەو فێرکردن بێبەش بێت و لە دواییشدا ببێتە کۆسپی رێگەی بەشداری‌کردنی لە کرداری بەرهەم هێناندا.

ئافرەتی کورد دوای شۆڕشی 14ی تەمووزی 1958 چووەتە گۆڕەپانی کاری بەرهەم هێنان و خزمەت لە دەرەوەی ماڵدا، پاش شۆڕشی 17 ـ 30 تەمووزی 1968یش بایەخدان بە ئافرەت فراوان بوو، بەو پێیە کە ئافرەت ئامانج و بناغەی کرداری گۆڕینی کۆمەڵایەتی‌و پەرەپێدانە.

ئەوە بوو پەیمانی نیشتمانی داوای رزگارکردنی ئافرەتی کرد لە هەموو کۆت و زنجیرو کۆسپێکی رێگەی پێشکەوتن و وای‌دانا کە ئافرەت سەرەتای راست و دروستی پێکەوەنانی نەوەی دوارۆژە کە دەتوانێ بەرپرسیاریی نیشتمانی‌و نەتەوەیی لە ئەستۆی خۆی بگرێ.

عیراق ئەمڕۆ راپەرینێکی شارستانەتی بەخۆیەوە دەبینێ‌و بەرەو پێشکەوتن و گەشەکردن کەوتوەتە رێ، رەوڕەوەی پیشەسازی هەنگاوی گەورەی ناوەو زۆر زیاتر بایەخ بە ژینی کرێکارو شاگردو پیشەگەران دەدرێ، پێوەندی‌ی هەر کەرتێك (قطاع) بە کەرتی ترەوەو هەر پیشەیێك بە پیشەی‌ترەوە توندو تۆڵتر بووە، لەگەڵ ئەم هەستانەشدا ئافرەت دەستی بە ئیش کردن کردو لە زۆر کاردا شارەزایی پەیداکرد، لە ئەنجامی ئەمەدا تووشی چەند گیرگرفتێکی کۆمەڵایەتی‌و شارستانەتی هات چ لە ماڵ و چ لە کارگەو شوێنی کاردا، ئەوە بوو لە زۆر لاوە کارەکەی فەڕو قازانجی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی وەدەست خست بەڵام

گونجاندنی نێوان فرمانەکانی ناوماڵ و فرمانەکانی کارکردن، لەبەر نەبوونی ئەو دەزگا کۆمەڵایەتیانەی کە ئەرك و کاری بۆ سووك و ئاسان دەکەن، ئەرکێکی سەخت بوو.

بەڵێ کارکردن وای لە ئافرەت کرد هەست بە سەربەستی و دڵنیایی بکات و سەرچاوەیێکی ژیان بۆ خۆی و خاوخەیزانی پەیدا بکات بەڵام دایانخانەو باخچەی منداڵان، ئەم دوو دەزگا کۆمەڵایەتی یە پەیدانەبوون هەتا لە پەروەردەو بەخێوکردنی منداڵانی ژنە کارکەرەکاندا بەشداری بکەن، لەم بوارەدا زۆر پێویستە.

دیاری کردنی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیای ی ئافرەتی ناوچەی حوکمی زاتی ی لە رێی ئەو لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیانەی کە پێشتر بکراون بۆی دەرخستووین کە تا چ رادەیێك مایەی ئەو گیروگرفتانەن یکە ئافرەتی کورد بەدەستیانەوە گیری خواردووە.

ئەو نرخانەی کە پێوەندییان بە ئافرەتەوە هەیە گەلێك جار زۆرن و جۆرە حەساسیەتێکی تایبەتییان هەیە کە لێ ناگەرێن ئافرەت دەوری داوالێ کراوی لە کۆمەڵەکەیدا یاری بکات، چونکە سروشتی کرداری پەرەپێدان گشتی و فراوانەو بۆ پێش خستنی کرداری گۆرانی کۆمەڵ پێویستی بە بەشداریی ئافرەت هەیە، هەر لەبەر ئەمەشە هەر راییك، لە سۆنگەی هەندێ برو بیانووی نازانستی یەوە، لە چالاکی ی ئافرەت کەم بکاتەوەو لە سروشتی بزووتنەوەی کۆمەڵی دابیرێت، رایەکە کرداری پەرەپێدان دوا دەخات.

ئەو کارنامەیەی کە یەکێتی ی گشتی ی ئافرەتانی عێراق ئامادەی کردووە، لە گەلێك شوێندا کاری هۆیە کۆمەڵاتی یەکان لە کەم کردنەوەی بەرهەمی ئافرەتی کارکەر بە گرنگ داناوە، ئەم هۆیانەش بریتین لە چەند هۆیێکی تێکچرژاوی کۆمەڵایەتی و پەروردەکردن و رۆشنبیری، کاری ئەم هۆیانە پەلی راکێشاوە بۆ ئیشی ئافرەت و پاشان بەرهەمداری یەکەی، هەروەها (بووە هۆی ئەوەی کە تێچوونی راستەوخۆی مادی و مەعنەوی کە بۆی دێتەدی لەودا دابێت). [٤]

تەفسیری ئەمەش لە کاریگەری ی مل ملانێ ی نێوان ئەو نرخە کۆنیانەدایە ـ کەوا کاریگەریان تەنیوەتەوە سەر کارکردنەکە خۆی ـ لەگەڵ ئەو نرخانەدا کە لە رێگەی گۆرینی پلان کردی (المخطط) سروشت و جەستەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی کۆمەڵەوە چەسپیون، لەوانەشە ئەم بەیەکدا چوونە ئەم مۆلەکە دەروونی یەمان جاروبار بۆ شی بکاتەوە کە تووشی ئافرەت دەبێت لە نێوان باری ژینی ئاسایی و ئەو فرمانانەی کە پێی سپێردراوەو ئەو بارە گرانانەی کە چاوەروانین پێش دەرچوونی بۆ کارکردن لە لایەکەوەو ئەو نرخە نوێیانەی کە هەندێ نرخی نوێیان لەگەڵدایە بەرەو کارکردن و کات و بەرهەم هێنان لەلایەکی ترەوە. [4]

## مافە کۆمەڵایەتی یەکانی ئافرەت: ـ

ئەگەرچی ئافرەت لە سەردەمی پێش پیشەسازی و نیشتەجێ بوونی کۆمەڵدا بەشێکی گەورەی ئەم کۆمەڵە بووە، بەڵام هەر نەیتوانیوە بوونی خۆی لە کۆمەڵەکەدا بچەسپێنێ و ووزە مافەکانی خۆی لە کۆمەڵدا دەربرێت، کەوا لە کۆنەوە لە دەرخستنی رای خۆی لەو کارانەی کە پێوەندییان بە خێزان و دوارۆژی منداڵانی یەوە هەیە، بێبەش کراوە، پیاویش دەسەڵاتێکی فراوانی بەسەر ئافرەتدا هەبووە، چونکە داب ونەریتی ناو کۆمەڵ وایان کردووە ئافرەت لە کۆزی دواکەوتن دا بمێنێتەوەو دووی پیاو بکەوێ بە شێوەیێك کە مرۆڤایەتی و کەسێتی یەکەی شێوێندراوە. [5]

ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییانەی لەو قۆناغەدا لە کۆمەڵدا چەسپابوون، شان بەشانی گەلێ رووالەتی خراپی کۆمەڵایەتی بوونە هۆی کەم کردنەوەی رێزی ئافرەت و دەوری ئافرەت لە کۆمەڵدا، بۆیە کەسێتی یەکەی بێ هێز بوو، خواستی لە دەست دەرچوو. جا ئەو ئافرەتە ناونیشانی خێزانی ژن، یان دایك، یان کچ بووبێت هیچ بایەخ و رێزێکی ئەوتۆی نەبووە، واتا سەربەستی بۆ پیاوو مل کەچی بۆ ئافرەت، زانیاری بۆ پیاوو بۆ ئافرەتیش نەزانی. هەرچەندە ئافرەت رەنجیشی دەداو لە کشتوکاڵدا لە شەتڵ لێدان و بژارو چنینەوەو پەلك لێکردنەوەدا

كاري دەكرد، پياوەكەش نرخي ڕەنجي ئافرەتي وەدەست دەكەوت، بەو پێيە كە بەرپرسياري بەخێوكردني ئافرەت و منداڵان و ئەنداماني خێزانە. (6)

زوربەي لێكۆڵينەوەكان لەسەر ئەوە يەك دەگرن كە چەند تەگەرەيێك وەك نەريتي ناو كۆمەڵ نەيان دەهێشت كچ بڕواتە قوتابخانە سەبارەت بە چەند بيانوويێك كە لێكدانەوەيان لە گيرفاني كۆمەڵدا بوو، چونكە وادەزانرا جێگەي ئافرەت هەر ماڵەو هيچي ترنا، لە تواناشدايە بڵێين ئەم ڕواڵەتە گشتي يەو لە سەرژمێري هەندێ وولاتاني عەرەبدا ئاشكرا خۆي دەنوێنێ، كەوا ڕێژەي مێينەي خوێندەوار لەچاو نێرينەي خوێندەوار دەگاتە 25٪ لە لادێ و 50٪ لە شاردا، ديارە ئەمەش كەلەبەرێكي گەورە لە نێوان شارو لادێدا پيشان دەدا.

دۆخەكاني ياسايي و تەشريعي مافي ئافرەتيان پشت گوێ خستوەو تواناي بەرهەم هێنانيان ئيفليج كردووەو كردوويانە بە ئامرازێكي بڕوا بە پڕوپووچ و غەيب هێن و هۆيێكي گواستنەوەي ڕەفتاري دزێو لە نەوەيەكەوە بۆ ئەو نەوانەي كە بەخێويان دەكات. بێگومان ئەم دۆخەش ڕەنگدانەوەي سروشتي كۆمەڵ دەنوێنێ، لەبەر ئەمەش پياو بە چاوێكي نزم رواني سەيري ئافرەت دەكات و جوولانەوەي لەگەڵ ئافرەتدا خراپ دەبێت، تەنانەت بە چاوي نۆكەرو كەلوپەلي خۆي سەيري دەكات، ئەمەش كاري كردوەتە سەر ئافرەت و سەر بەخێوكردني منداڵەكاني و چەنديي بەشداري كردني لە پەرەپێداني كۆمەڵدا. (7)

لەمەوە بۆمان دەردەكەوێت كە ياساو پەيرەوەكان ڕۆڵەي هەندێ هەل و مەرج و ڕۆژگاري تايبەتين، جا ئەگەر شۆڕشێك هاتە دي و بۆ گۆڕيني كۆمەڵ جۆرە ئايديۆلۆجيەتێكي لە جاران جياوازي هەبوو بۆ ئەوەي بتوانێ ڕێگەي خۆي دياري بكات دەبێت چاو بە بارو ڕۆژگاري جاراندا بخشێنێتەوە، هەر لەسەر ئەم بنەڕەتە ياساي دووەم دەستكاري كردني ياساي (ئەحوالي شەخسي)ي ساڵي 1978 پێويستي يێكي تەواو پێويست بوو بۆ خێراكردني كرداري بەشداريي ئافرەت لە كۆمەڵي نوێدا، ئەو كۆمەڵەي كە چەند جۆرە ڕەووشت و پێوەندي يێكي لە هەموو بوارێكدا تێدا هاتە كايەوە، لەبەر ئەمە دەرچووني ئەم ياسايەو هەڵداني هەنگاوە چاكەكاني تر پێويستي يێكي زانستي بوو چونكە لەسەر بنەڕەتي تێروانينێكي گشتي هەستاوە (دامەزراوە)، تێروانينێك كە لە واقيعي كۆمەڵەوە سەر هەڵ دەدات و لە ئەنجاميشدا دەگەڕێتەوە باوەشي كۆمەڵەكە.

ئەو پێشكەوتنە شارستاني و كۆمەڵايەتي يەي كە وولات پاش شۆڕشي 17 ـ 30ي تەمووزي ساڵي 1968 بينيويەتي كارێكي بەهێزي كردوەتە سەر گۆڕيني بارە كۆمەڵايەتي يەكاني ئافرەت و بەرزبوونەوەي پايەي لەناو خێزاندا لە بابەت پاڵپشتي و دامەزراوەي ژياني خێزانەوەو گۆڕاني تێرواننيي پياو بۆ ئافرەت و پەيدابووني چەند نرخێكي نوێ لە جوولانەوەو ڕەفتار لەگەڵ ئافرەتدا.

بەم بۆنەيەوە ئافرەت تواني بەرەو سەربەستي و شكاندني ئەو زنجيرانەي كە لە ماوەيێكي دوورەوە پێوەي بەندبوو، ڕێگاي خۆي ببڕێ و تواني هەڵ كوتێتە سەر مەيدانەكاني پێشكەوتن و گەشەكردن و جێگاي خۆي لە ناو خێزاندا بچەسپێنێ.

ئەوە بوو ئافرەت لەلايەن سەركردايەتيي سياسي يەوە چاوێري كراو، كە مەسەلەي ئافرەتي بە ئامانجێكي سياسيي خۆي داناو هەوڵي دا ئافرەت لە گشت بوارەكاني ژياني كۆمەڵايەتي و شارستانەتيدا تەواو ڕزگار بێت و لەگەڵ پياودا هاوتا بێت، جا بواري بەشداري كردني لە كۆمەڵدا كاريگەرانە فراوان بوو، هەروەكو لە ڕاپۆرتي سياسيي هەشتەم كۆنگرەي هەرێمي حزبي بەعسي عەرەبي ئيشتراكيدا هاتووە:

«ئامانجي ڕزگاركردني ئافرەتي عەرەب لە زنجيرو كۆتي كۆنينەي ئابووري و كۆمەڵايەتي و ياسايي و ڕێكخستني هەل ومەرجي لە باري بەشداري كردني تەواوو كاريگەرانەي لە كۆمەڵي عەرەبداو لەو ڕاپەڕينە عەرەبايەتي يەي كە حزبي بەعسي عەرەبي ئيشتيراكي هەوڵي بۆ دەدات ئامانجێكە لە پێش هەموو ئەو ئامانجەوە دەوەستێ كە حزب بۆ هێنانەدييان كاردەكات. (8)

**گیروگرفتەکانی ئافرەت لە سەردەمی پیشەسازیدا:**

**چەند لێکۆڵینەوەیێکی رووبەڕوو (مەیدانی) لەم ناوچەیەدا[9]**

دەربارەی باری ئافرەت کراون سەرەڕای ئەو شتانەش کە حکومەتی شۆرش پێشکەشی ئافرەتی کردووە وەکو ئەو یاسایانەی کە بۆ پشتگیریی مافی ئافرەت لە کارو کرێوەرگرتن و فرمان پێ کردن لەگەڵ بەرچاو خستنی جۆری تایبەتی ژینی ئافرەت و ئیجازە پێدانی و گەلێ شتی تر دەرچوون وەکو یاسای کارو پشتگیریی کۆمەڵایەتی (العمل والضمان الأجتماعي).

حکومەتی شۆرش لە رێگەی یاسادانانەوە وەك یاسای دەستکاری کردنی دووەم جاری یاسای (ئەحوالی شەخسی) بە مەبەستی رزگارکردنی ئافرەت و یەکسان بوونی بە پیاو تاکو ئەم کاروبارانە لەگەڵ گیانی چەرخ و ئەو قۆناغە گۆڕینی کۆمەڵایەتی‌یەی کە کۆمەڵ پێیدا تێدەپەڕێ رێك بکەوێت. بەمەش ئەم یاسایە چەند بنەمایێکی بنچینەیی پێشکەش کرد کە یارمەتی ئافرەتیان دا، بە شێوەیێکی کاریگەرانە لە کرداری پەرەپێدان و پێش خستنی کۆمەڵدا بەشداری بکات. ئەم یاسایە ژن هێنانی بە زۆریان ژن هێنانی دەرەوەی دەزگا دەوڵەتی‌یەکان کە بەپێی داب و نەریتی کۆن و بۆ خاتری ماڵی دونیا بەدی هاوسەری و ئەنجامەکانی دانا.

لە بابەت رەچەڵەك و خاوەندییەتی‌ی منداڵان و بەرپرسیاری و پێویستەکانی‌تر کە پەیمانی مارە برین پەیدای دەکەن.

یاساو پەیڕەوەکانی دەزگاو دایەرەکان لە سێبەری یاسای حوکمی زاتیدا لەگەڵ ئەو دەستکەوتە دوولایانەی (الثنائية)ی ئافرەتی کورد لەمانەو لە یاساو گشتی‌یەکانی گەلی عیراق وەدەستی هێناوە کارێ وایان کرد بەشداری ئافرەت لە چالاکی‌یە سیاسی و سەرکردایەتی‌یەکاندا لە سەردەمی دوای شۆرش بگۆڕێت و وای لێ بێت لە جوولانەوەی نیشتمانی و سیاسیدا دەورێکی «گەورە» بنوێنێ، ئەوەبوو لە پەرلەمان و لە نەقابەو رێکخراوەکاندا بەشداری کرد لەمانەش: یەکێتی‌ی گشتی‌ی ئافرەتانی عیراق، کە ئەرکی تەخت کردنی کۆسپی رێگەی بەراستی بەشداری کردنی ئافرەتی لە کرداری پەرەپێداندا گرتۆتە ئەستۆی خۆی، کەوا بە کۆڕو کۆبوونەوەو ئاهەنگ و پەخشنانەو چاپەمەنی و شتی‌تر هەوڵ دەدا کۆمەڵانی ژنان هوشیاربکاتەوەو بۆ هاوبەشی‌یێکی بەراستی لە بەکارهێنانی مافی سیاسییاندا پاپان پێوە بنێت. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەم هەوڵانەش هێشتا ژمارەی کارکەران لە رادەی ئاوات نزمترە، ئەگەرچی ژمارەشیان بەرەو زیادی دەڕوات هەروەکو لە لێکۆڵینەوەیەدا دەردەکەوێ کە دایەرەی لێکۆڵینەوەی دەزگای ناوەندی سەرژمێری پێی هەستاوە.

**خەمڵ کردنی ژمارەی ئافرەتی کارکەر**
**بە پێی پارێزگاکانی حوکمی زاتی**

| پارێزگا | بواری کار | 1972 | 1973 | 1974 | 1975 |
|---|---|---|---|---|---|
| | کشتوکاڵ | 51285 | 52308 | 54570 | 54428 |
| سلێمانی | پیشەسازی | 845 | 897 | 1661 | 1149 |
| | بازرگانی | 325 | 345 | 360 | 386 |
| | کارگوزاری | 1932 | 1928 | 2030 | 2189 |
| | پیشەسازی | 1275 | 1315 | 2728 | 1810 |
| هەولێر | بازرگانی | 42 | 45 | 47 | 50 |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | کارگوزاری | 1536 | 1532 | 1614 | 1740 |
| | کشتوکاڵ | 25708 | 26020 | 26714 | 26672 |
| دهۆك | پیشەسازی | - | 2 | - | - |
| | بازرگانی | 3 | 4 | 4 | 4 |
| | کارگوزاری | 503 | 504 | 528 | 570 |
| | کشتوکاڵ | 79958 | 108560 | 138331 | 112567 |
| سەرجەم | پیشەسازی | 2120 | 2214 | 4389 | 2959 |
| | بازرگانی | 370 | 394 | 411 | 440 |
| | کارگوزاری | 3971 | 3963 | 4172 | 4499 |

له کاتێکدا که ژمارەی ئافرەتی کارکەر له کەرتی پیشەسازی‌دا ساڵی 1972 (2120) کەس بوو، ئەم ژمارەیه زیادی کردو له ساڵی 1973دا گەیشته (2214)کەس لەدواییدا بووه (4389) کەس له ساڵی 1974دا، پارێزگای هەولێریش لەم ژمارەیەدا لەسەردەستەی پارێزگاکانی ناوچەی حوکمی زاتیدا بووه که بەشی ئافرەتی کارکەر له کەرتی پیشەسازیدا ساڵی 1974 گەیشتوەته (2728) کەس.

هەر بەم جۆرەش یەکێتی‌ی گشتی‌ی ئافرەتانی عیراق له چەند لێکۆڵینەوەیەکدا رێژەی ئافرەتانی کارکەری له بواری پیشەسازیدا بەم جۆره پیشان داوه.[12]

**رێژەی ئافرەت لەچاو ژمارەی**
**ئافرەتانی کارکەر له بواری پیشەسازیدا**

| | |
|---|---|
| 1 ـ چنین | ٪23 |
| 2 ـ دروومان | ٪41 |
| 3 ـ دروست کردن | |
| تێك بەستنی کاتژمێر | 32,3٪ |
| 4 ـ دروست کردنی خواردەمەنی | ٪31 |
| 5 ـ پیشەسازی‌ی تووتن | ٪21 |
| 6 ـ پیشەسازی‌یه | |
| ئاڵوگۆڕی‌یەکانی‌تر | ٪16 |

لەگەڵ ئەو دەستکەوتانەشدا هێشتا ئافرەت بەدەست چەند گیروگرفتێکی سەردەمی پیشەسازی‌یەوه گیری خواردووه، به نموونه ئەرکی ناوماڵ که هەر لەسەر شانی ئافرەتی کارکەره یەکێکه لەو کاریگەره کۆمەڵایەتییانەی که رێ له کارکردنی ئافرەت دەگرن نەخوازه که ئەو ئەرکانەش لەگەڵ کارەکەیدا رێك نەکەون، دوور نی‌یه ئەرکی تازه لەگەڵ ئەرکی ناوماڵدا ناکۆك بێت ئەوسا یەکێك لەم دوو ئەرکەی لەدەست دەچێت. ئەو کرێیه کەمەش که ئافرەت لەچاو پێداویستی‌یەکانی ماڵ و خێزانی‌دا وەری‌دەگرێت یەکێکه له گرنگترین گیروگرفته ئابوورییەکانی.

ئافرەتی کارکەر بەدەست هەڵبژاردنی جۆری کارەوه گیری خواردووه، چونکه نەریت و رەووشتی باوی ناو کۆمەڵ (که دەستبەرداریان نی‌یه) لێ‌ناگەڕێن به تەواوی‌و به پێی ئارەزوو و بەهرەی خۆی کارێك هەڵبژێرێت.

بەڵکو له دابەش کردنی ماف و ئەرکدا هێشتا بەیەك چاو سەیر ناکرێت لەگەڵ پیاودا، بۆیه دەبینین هەلی کارکردنی بریتی‌یه له چەند جۆره پیشەیێك و زۆر مەیدانی کارو پیشەی‌تری له روودا، داخراوه، ئەمەش ئەنجامی ئەو کەلەپووره کۆمەڵایەتی‌و دەورروبەری‌یانەی کەڵەکه بوون و بۆ هەڵبژاردنی چەند جۆره پیشەیێك که له پیشەکانی‌تر گونجاو و باشتر خۆ دەنوێنن پاڵی‌پێوه دەنێن.

هەروەها ئافرەتی کارکەری ناوچەی حوکمی زاتی دووچاری گیروگرفتی کەم پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بووه، کەوا

پەیوەندیەکانی لە سنوورێکی زۆر تەسکداو زوربەی جار کورو مێردو خزم و کەمێکیش دراوسێ تێ ناپەڕێت. دیارە بێبەش بوونی لە پەیوەندیە مرۆڤایەتی یەکان دەبێتە هۆی بێبەش بوونی لەهاوکاری و یاریی هاوڕێیانی کارکردنی، ئەمەش لە کرداری بەرهەمداریدا بەخراپی رەنگ دەداتەوە، چونکە بیری کۆن و نەریتی ڕزیو دەبنە کۆسپی رێگەی ئەوە کە ئافرەت پایەی کۆمەڵایەتی و کارگێری وەربگرێت و وا لە کۆمەڵ دەکەن کە لای وابێت ئافرەت ناتوانێ زۆر کار هەڵبسووڕێنێ، بە پێچەوانەی راستی هەموو ئەو بروبیانووانەی کە دەڵێن ئافرەت ناتوانێ هەندێ کار بگرێتە ئەستۆ زانستانە نین و لێکۆڵینەوە دەریخستووە هەندێ چالاکیی کارگێری کە وا دەزانرا بۆ ئافرەت کارێکی سەختە زۆر باش تێیدا سەرکەوتووە.[13]

سەرژمێری دانیشتوانیش پیشانی داوە کە لە عیراقدا ژمارەی مێینە لە نێرینە زیاترە[14] لەگەڵ ئەم زیادیەشدا هێشتا ئەم ژمارەیە لە «روانگەی پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی و ئابووری»دا کەم وکورتی دەنوێنێ، ئەمەش سەبارەت بەو بارە کۆمەڵایەتی یەی ئافرەتە کە ناهێڵێ گشت تواناو ووزەکانی بە تەواوی بێنە مەیدانی بەرهەم هێنان و بەشداریی یەکەڵك لە هەموو بوارەکاندا، چونکە بەرهەڵستە کۆمەڵایەتی یەکان (چ نرخ و چ کردەوە) چالاکیی ئافرەتیان زنجیر کردووەو لێ ناگەڕێن لەگەڵ پیاودا بەراستی یەکسان بێت، لەبەر ئەوە حکوومەتی شۆرش هەوڵ دەدا زۆر نرخ و کردەوەی زیاندار لەناوبەرێت و بایەخ بە بەهای خۆشویستنی کاری بەکۆمەڵ و بەشداری تێداکردنی و شتی تر فرەبکات.[15]

**ئەنجامەکان: ـ**

دوای ئەوەی لەو گیروگرفتانە ئاگاداربووین کە ئافرەتی کرێکاری ناوچەی حوکمی زاتی هەیەتی، دەتوانین چەند پێشنیارو راسپێرییەك بخەینە ڕووکە گیروگرفتە شارستانەتی یەکانی کە بریتین لە (نرخ و نەریتە خراپە کۆمەڵایەتی یەکان) بۆ تەخت بکەن، بێگومان دەشبێ لەو پێشنیارانە لەگەڵ واقیعدا گونجاوبن، کە ئەمانەن: ـ

1) بایەخ دان دەوری رێکخراوە جەماوەرییەکان لە پەرەپێدانی توانستەکانی ئافرەتدا بۆ ئەوەی بتوانێ لە کرداری بنیات نانی شارستانەتی و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا بەشداری بکات، خۆ ئەگەر لەلایەنی بیرو کۆمەڵایەتی و فەرمانبەرییەوە رزگاری نەبێت، ئەوا نیوەی ووزەو توانای کۆمەڵ پەکی دەکەوێت، ئەمەش دیارە خزمەتی نەخشەی پەرەپێدانی نەتەوەیی ناکات و یاریدەی پێشکەوتنی کۆمەڵ نادات.

ئەرکی سەرشانی رێکخراوە جەماوەرییەکانی وەکو یەکێتیی ئافرەتان، لاوان، قوتابیان، کرێکاران و جووتیاران و هی دی ئەوەیە بایەخێکی زۆربدەن بە مەسەلەی گۆڕینی بیروڕاو نرخەکانی کۆمەڵ دەربارەی کارکردنی ئافرەت و هاندانی بۆ کارکردن و بەجێهێنانی ئەو کارانەی کە لەگەڵ تواناو ئارەزوو و ئاواتەکانی دا رێك دەکەون، ئەمەش لە رێی کۆڕبەستن و کەوبوونەوەی گشتی یەوە کە شارەزاو پسپۆران قسەی تێدابکەن و ئەم بابەتەی تێدا شی بکەنەوە، لێرەشدا دەوری دیاری دامەزراوو دایەرەکانی راگەیاندن نابێت بخرێتە پشت گوێ، هەروەها شایانە هەندێ خەڵاتی تایبەتی و نیشانەشی بێشکێش بکرێت بارتەقای کارزانی و گورج وگۆڵی لە فرماندا.

2) لەسەر کارگێری و بەرپرسیارانی دەزگا بەرهەمی یەکان پێویستە رێزی ئافرەتی کارکەر بگرن و هەوڵ بدەن پێوەندییە کۆمەڵایەتی یەکانی لەگەڵ هەڤالانی کاریدا پتەوبکەن چونکە پتەوکردنی ئەم جۆرە پەیوەندییەوا دەکات زیاتر بایەخ بە کارەکەی خۆی بدات. پێشکێش کردنی پاداشتی مادی و مەعنوی هۆیێك دەبێ بۆ بەردەوام بوونی لەسەر کارەکەی. بۆیە نابێ خاوەن کارانی کەرتی تایبەتی باری گران بخەنە سەرشانی ئافرەت و کاروباری وەهای پێ دەن کە نەتوانێت بەجێیان بگەیەنێ، بەتایبەتی ئەگەر شووی کردبێت، دەبێ ئەوە بزانن کە ئافرەتی کارکەر تەنیا ئەرکی فرمانی دایەرە یان کارگەکەی لەسەر

شان نی‌یە بەڵکو ئەرکی ماڵ بەڕێوەبردن و منداڵ بەخێوکردنیشی لەسەرشانە.

هەروەها سووك كردنی باری سەرشانی ئافرەت بە زۆرکردنی دایانخانەو باخچەی منداڵانی سەر بەشوێنی کارەکە هۆیێکی گرنگە بۆ هاندانی ئافرەتی کارکەو بەخێوکردنی منداڵەکانی.

لەم مەیدانەوە دەورێکی باشی هەیە بەتایبەتی کە ڕێبازی دەوڵەت سوشیالیزمە.

جگە لەمانە دانانی هەندێ بەرنامەی دڵخۆشیو شادکامی لەلایەن ئەو دەزگایانەوە کە ئافرەت کاری تێدا دەکات، شتێکی باشە بۆ نوێ کردنەوەی ووزەو توانستەکانیو لابردنی هەست کردن بە بێزاریو وەرزبوون لە ئیشوکاری ڕۆتینی داو هۆیەکیشە بۆ پێ گەیاندنی توانا بە بەهرەکان.

3) هۆیەکانی ڕاگەیاندنی بەردەست وەکو ڕۆژنامەگەریو رادیۆو تەلەفزیۆن، چاکترین ئەو هۆیانەن کە کار لە دەروونی جەماوەر دەکەن، بەتایبەتی کە ئامۆژگاریو ڕێ‌نیشان دان لەم ڕێگایانەوە لە بەرگێکی خۆش و جوان داپێشان دەدرێن و بە خەڵکی ڕادەگەیەندرێن، جا بە هۆی ئەمانەوە دەتوانری هەڵویستی کۆنی کۆمەڵ بەرامبەر بە پایەی ژن و یەکسانی لە ماف و ئەرکدا لەگەڵ پیاو بگۆڕدێت، گۆڕینی ئەم هەڵوێستانەش دەبێتە مایەی هەڵقوڵای توانستەکانی ئافرەت و ژیاندنەوەی هێزو دەسەڵاتەکانی بۆ خزمەتی کۆمەڵ. چونکە ئەگەر ووزەو توانستەکانی ئافرەت وەبەرنەهێنرێت مانای وایە نیوەی ووزەو توانستەکانی کۆمەڵ لە کار خراوە، ئەمەش تەنیا بە ڕزگاربوونی کۆمەڵایەتیی ئافرەت دێتە دی.

بڵاوبوونەوەی ئەو بیرو ڕایانەی کە لە بابەت شووکردن و کارکردنی ئافرەتەوە یاریدەی ئافرەت دەدەن کە خۆی ڕای خۆی هەبێت و بەبێ زۆر لێ کردن ڕێگەی ڕاست هەڵبژێرێت کارێکی باشە، هەروەها دەتوانرێ پەیڕەوی ئامۆژگارییە ئاینی‌یەکان ـ لەو کۆمەڵەدا کە ئایین بەسەریدا زاڵ بێت ـ لەگەڵ واقیعی ژیانی شاریدا تێك ببەسترێت، بەڵکو لەم ڕێگەیەوە زۆر دیمەن و ڕواڵەتی ناپەسندی باری ناو هاووڵاتان بگۆڕێن و بمرێن بە هوی یەککردنی ڕەنج و کۆششی هەموو لایەك بۆ ژیانێکی بەکەڵك و پەسەند. هەروەها لە تواناداییە پیاوانی ئاینیش لە بابەت ئەیدیولوجیەتی کۆمەڵ و فەلسەفە چاکەخوازی یەکەیەوە هوشیار بکرێنەوە، ئەمەش بە هۆی چەند بەرنامەیێکی ڕاهێنانەوە کە لەگەڵ دەوریان لە پایەی ئاینیو دەسەڵاتی کۆمەڵایەتیدا بگونجێت.[16]

(پیداچوونەو دارشتنەوەی: ع. بیمار)

## پەراوێزەکان

(1) بڕوانە د. علي الوردي ـ دراسة في طبيعة المجتمع العراقي، بغداد/ 1965 ل 120.

(2) هاشم طه عقراوی ـ الاسس النفسية والاجتماعية للقبائل الكردية كركوك ل 137.

(3) الاتحاد العام لنساء العراق ـ ورقة عمل حول الصيغ العملية لزيادة انتاجية المرأة العاملة ـ كانون الثانی، 1977 ل 2.

(4) د. احمد الخشاب ـ الاجتماع التربوي والارشاد الاجتماعي ـ القاهرة 1971 ل 496.

(5) عبدالحسين عيسى البهاتى ـ بين الرجل والمرأة ـ النجف 1977 وقاسم أمين ـ تحرير المرأة ـ القاهرة 1937 ل 38.

(6) بڕوانە:

(1) د. احمد الخشاب، سەرچاوەی باسکراو ل 219، 220، 223.

(2) د. اكرم نشأت وجماعته، دراسة معوقات الاقبال على التعليم الابتدائى في العراق ـ وزارة التربية ـ المديرية العامة للتخطيط التربوى ـ قسم التوثيق والراسات /1971 ل 25.

(7) الاتحاد العام لنساء العراق ـ المؤتمر السادس، بغداد 1974 ل92.

(8) بروانه راپۆرتی سیاسی هەشتەم کۆنگرەی هەرێمی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالست ـ كانون الثاني ـ 1974 ل 153 .

1 ـ ئاسۆ ابراهيم عبدالله ـ المشكلات الاجتماعية والحضارية للمرأة العاملة في منطقة الحكم الذاتي ـ گیروگرفتە کۆمەلایەتی و شارستانییەکانی ئافرەتی کرێکار لە ناوچەی حوکمی زاتیدا (لێکۆڵینەوەیێکی ڕوو بەڕووە دەربارەی گیروگرفتەکانی ئافرەتانی کارکەری شاری سلێمانی) نامەی ماجستێرە ـ بەغداد ـ کانوونی یەکەمی 1982 .

2 ـ عبدالكريم عبدالسادة النصار ـ دراسة ميدانية للإوضاع الاجتماعية والاقتصادية للمرأة العاملة في مصانع السليمانية ـ لێکۆڵینە وەیێکی ڕووبەڕووی دۆخە کۆمەلایەتی و ئابوورییەکانی ئافرەتی کارگەکانی سليمانی ـ قەفە لێکۆڵینەوەیێك کە یەکێتیی گشتیی ئافرەتانی عیراق بە هاوکاریی زانکۆی سلێمانی لە سلێمانی ساڵی 1978 ڕێکی خستووە.

3 ـ مامۆستا مسعود محمد ـ چۆن پایەی گشتیی ئافرەتی ناوچەی حوکمی زاتی بەرز دەکەینەوە ـ كيف نرفع المستوى العام للمرأة في منطقة الحكم الذاتي ـ قەفە لێکۆڵینەوەکەی یەکێتیی گشتیی ئافرەتانی عیراق و زانکۆی سلێمانی.

4 ـ مامۆستا شاكر فتاح ـ ئافرەتی کورد ـ هەمان قەفە لێکۆڵینەوەکەی پێشوو.

5 ـ مامۆستا هاشم طه عقراوي ـ الأسس النفسية والاجتماعية للقبائل الكردية ـ بن. كووكرەك ـ دروك ىناكەزوە ىناكەيى تەيلاۆك وىجولوحكياس ەني3

6 ـ سهيلة محمد عباس ـ دوافع المرأة العراقية العاملة في الصناعة وعلاقتها بالانتاجية ـ پاڵنەوەکانی ئافرەتی کارکەری عیراقی لە پیشەسازیداو پێوەندیی بە بەرهەمدارییەوە ـ نامەی ماجستێر ـ بەغداد 1978 .

7 ـ یەکێتیی گشتیی ئافرەتانی عیراق ـ کارنامەیەك دەربارەی ڕێگاکردەوەییەکانی فرەکردنی بەرهەمداریی ئافرەتی کارکەر ـ ورقة عمل حول الصيغ العملية لزيادة إنتاجية المرأة العاملة ـ بەغداد ـ 1977 .

8 ـ عبدالرحمن سليمان الدربندي ـ المرأة العراقية ـ تامعاصرة ـ ئافرەتی هاوچەرخی عیراق ـ بەرگی دووەم ـ بەغدا 1968 .

9 ـ بروانه:

10 ـ تقديرات المشتغلين حسب المحافظات والنشاط الأقتصادي للسنوات 1972 ـ 1975، دائرة الابحاث. الجهاز المركزي للاحصاء. آب 1976، وزارة التخطيط.

11 ـ بروانه ـ الاتحاد العام لنساء العراق ـ المرأة وعام 1975 ل 12 ـ 14 هەروەها ورقة العمل ـ ل 2.

12 ـ المركز القومي للاستشارات والتطوير الاداري ـ دەوری ئافرەت لە چالاکییە کارگێڕییەکاندا ـ بەغدا /1976 ل 54 ـ 46.

13- وزارة التخطيط ـ دراسة تفصيلية حول واقع القوى العاملة وتطورها في العراق سنة 1971، ل 30 ـ 34.

14 ـ راپۆرتی سیاسیی هەشتەم کۆنگرەی هەرێمی هزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالست ل 157 ـ 160.
(بەشی ژ بێنجەم ـ ڕەوتی گۆڕانکارییەکان).

15 ـ الفاروق زكي يونس ـ تنمية المجتمع في الدول النامية ـ القاهرة 1967 ل 273 ـ 274.



# دۆزینەوەی ڕوانگەیێکی ئەستێرناسی کوردی لە گوندی گراو

عبدالرقیب یوسف

پاش تێکدرانی ئەو ساڵنامە «التقویم الشمسي»یەی کە شێخ حەسەنی گڵەزەردە لە سەدەی هەژدەیەمدا لە شێوەی تاقداو بە گەچ لەسەر دیواری مزگەوتی دێی گڵەزەردە دروستیکردبوو، لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی سلێمانییەوە لە نیسانی ساڵی (1982)دا، بەدەست کەوتمە دەست کرا بە پشکنینی گڵی مزگەوتە ڕووخێندراوەکە بۆ دۆزینەوەی پارچەکانی ساڵنامەکە. لە پاڵ ئەوەشدا، دەستم کرد بە کۆکردنەوەی زانیاریی سەرزاری ئەو خەڵکانەی کە بە ساخی دیویانە. تاکو پاش پازدە مانگ و لە ڕۆژانی (27 ـ 29)ی ئابی (1983)دا توانیم سەرلەنوێ لەسەردیواری مزگەوتە نوێیەکە دروستی بکەمەوە.

ئەم هەوڵدانە کلیلی دۆزینەوەی چەند ساڵنامەیێکی دیکەی کوردیی خستە دەستەوە. پێشینانمان بە هۆی تیرۆژی خۆر یا ئاوابوونی هێندێك ئەستێرەو خۆر یان هەڵاتنی خۆرەوە، ساڵنامەیان لە نێو مزگەوت و سەر چیاکان سازکردووە. ئەوەیش بۆ زانینی چەند کات و قۆناخێکی گرنگی ساڵ، وەك سەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایی وەرزەکان و چلەی زستان. بە نموونە، چلەی زستان بایەخێکی یەکجار زۆری هەبووە، چونکە کە بەفر شاخەکانی دادەپۆشی ڕێگەی کاروان و هاتوچۆکردن دەبەستراو مەڕومالاّت دەکەوتە سەخڵەتییەوە. (ساڵنامەی بارێ) یەکێکە لەوانەو، زانایێکی کورد بە ناوی (مەلانەبی)یەوە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی شازدەیەمدا واتە نێزیکەی (450) ساڵ لەمەوبەر ـ بە قووچەبەرد لەسەر چیایێکی بەرانبەر گوندی (بارێ گچکە)ی داوێنی زنجیرەچیای (سورکێو)ی ناوچەوی سیوەیل، دروستی کردووە. چیاکەش ناوی «گردی تەرازوو»ە. (ساڵنامەی دۆڵپەموو)یش (شێخ عەلی کۆستە) سەدەی هەژدەیەم لەسەر دیواری مزگەوتی دێی دۆڵپەمووی ناوچەی شاربازێڕ پێکی هێناوەو نیشانەیێکی تایبەتی (ساڵنامەی بارێ)یشی تێهەڵکێش کردووە.

بەڵگەمان ئەوەیە کە جیاوازیی ساڵی هەردوو ساڵنامەکە تەنیا سێ ڕۆژە.

ساڵ بە پێی ساڵنامەی دۆڵپەموو لە چواردە (14)ی کانوونی یەکەمەوە دەست پێدەکا، کەچی لە ساڵنامەی

بارێدا دەکەوێتە حەڤدە (17) یان (21)ی هەمان مانگەوە.

سالْنامە لە چەند جێگایێکی تریشدا هەبووە، وەك (کەناروێ)و (کانییتوو)ی مەرگەو کورەداوێ. لە دوارۆژدا بە نامێلکەیێکی تایبەت لێیان دەدوێین. هەروەك سۆراخکردن بۆی دەرخستووین، کوردستانی تورکیاو ئێرانیش لە سالْنامە بێ بەش نین. دێی (چەم پاراو)و دێی (گەرماوان) لەو دیوی سورکێوی کوردستانی ئێران شتێکی لەم بابەتەیان تێدایە. لەوە بێگومانم کە سالْنامەی (کەلیخان) لە حیسابی هەموو سالْنامە کوردییەکانی دی بەناوبانگترەو، لە روانگەو سالْنامەیێکی کۆنەوە پەیدابووەو، لە شاخی کەلیخان و بەتایبەت سنووری دێی (کێلەشین)، یان دێیەکانی تری دەوروبەریدا وەك دێی (سونج) - سازدراوە. بە هیواین لە داهاتوودا زانیارییەکی زۆرمان لەم بارەوە چنگ بکەوێ‌و ئەم سالْنامەیە بدۆزینەوەو بەتەواوی ساخی بکەینەوە لە دێی «کانیی توو» لە ناوچەی مەرگە، شاخی (هێلانە قەل) کراوە بە سالْنامەو لە سیازدە جێگەی سروشتی پێك هاتووە لەگەلْ هێندێك ئیشارەتی تریش، لە دێی خورخورەی دراوسێی کانیی توویش بە قوچە بەرد شتێك هەیە، هەروەها دێی (گردەسوور)یش لە بەینی (جەلْدیان)و (سیلوە) لە ناوچەی لاجانی کوردستانی ئێران حسابێك هەیە بە قوچەبەردو هەروەها لە (کورەداوێ)ی ناوچەی شاربازێریش لە سلیمانی. رەنگە لەسەر دنگە و پایەی (پرابافت)ی سەر رووباری دیجلە، سالْنامەیێك یان کارێکی ستێرناسی هەبێ، چونکە هەر دوازدە کەلوو (بورج)ی ئاسمانیی لەسەر هەلْکولْدراوە، جا ئیتر چ لە سەدەی دوازدەیەمی زایین، یان پێش ئیسلامدا ئاواکرابێتەوە. ئەم پردە گەورەیە ئەمرۆکە زۆربەی رووخاوەو دەکەوێتە خوارووی شاری (جزیرا بوتان)ی سەر سنووری تورکیاو سوریا. بەبێ رێگەدانی هەر دوو وولات مرۆڤ ناگاتە ئەم پردە گەورەو گرنگە.

**هەندێك لە وێنەکانی لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی شوێنەوار لە سوریاوە بۆمان هاتوون.**

## چۆنیەتی دۆزینەوەو ساخکردنەوەی روانگەو سالْنامەی گراوێ‌و گوندیگراو:

هاوینی سالّی (1982) بە مەبەستی بەدەست هێنانی پاشماوەی کەلەپووری، سەرم لە هەولێرو رەواندزدا. یەکێك لەو بابەتانەی کە لە دووی دەگەرام سالْنامەی کوردی بوو، لە هەولێر لە مالّی پیرەمێردی شارەزا مامۆستا ناصیخ عبداللە حەیدەری کە دەکەوێتە دووری (300) مەتری = باکووری قەلاّوەو دیواری دواوەی خانووەکەی لەسەر کۆنەشوورای هەولێر بنیات نراوە، بۆ یەکەمین جار گوێم لە ناوی (حسابی گراوێ)بوو، ئەویش لە کاتی تۆمارکردنی بیرەوەرییەکانیدا. شایانی باسە ئەم پیرەمێردە پێش (80) سالْ لە ناوچەی (سوێرەك)ی دیاربەکر لەدایك بووە. مامۆستا پێ‌گوتم: جاران لە هەولێر تەنیا ناوی (حسابی گراوێ)و (حسابی رۆمی) لە ئارادابوون و خەلْك بەکاری‌دەهێنان.

ئیتر چوون بۆ بینینی ئەم شاکارە کوردییە مەزنە بوو بە خولیام و هەر لەو سەفەرەدا بۆم چووەسەر کە تێیدا پتر لە سەد بەلْگەنامە (وثیقة)ی قوتابخانەی قوبان (قبهان)و بنەمالّەی (موفتیی ئامێدی)م دۆزییەوە، کە هێندێکیان فەرمانەکانی سولْتانە عوسمانییەکانن. جگە لە دەست نیشانکردنی خانوویێکی میرەکانی بادینان لە ئامێدی‌و کۆلّینەوە لە هونەری بیناسازی (معماری)ی ئەم شارە میرنشینەو دهۆك و شێخان و ئاکرێ‌و گرتنی زیاتر لە پێنج سەد وێنە، کە بە بەرهەمێکی پیرۆزی گەرانی مانگی ئەیلولی (1983)ی خۆمیان دەزانم.

لە رۆژی 14 ئەو مانگەدا چووم بۆ دێی گراو، کە نزیکەی (120) مالّەو دەکەوێتە خۆرهەلاّتی شاری هەولێر بە (32کم)و [بە (10کم)] خۆرهەلاّتی دووریانی

باستـــوران كه وا له دۆڵێكى بەرى باشـــوورى زنجيـــرەى (چيـــاى پيـــرمـام)دا، ئەو زنجيـرە شاخـەى كە هەوارگـەى هاوينـــەى (ســـەلاحـــەددين) و (ســـەرى‌ڕەش)ى لەســـەرە. گوندەكە پاڵى داوەتە لاپاڵێك و تەنيشتى باكوورو خۆرئاواى باخ و باخـاتـەو، ڕەزێكى زۆر لە خۆرهەلاتى‌يەوەيە. دارى بادەم و هەرمـێـــيـــەكـــى زۆرى لە نێـــودا هەيـــەو بەرى خۆرهەلاتيشى دەكشێ تا ژێرڕاى هەوارگەى (سەرى‌ڕەش) دەكەوێ.

درەختى (قەرەقاچ) لە دەوروبەرى گراو زۆرە قەلايێكى كۆن لە خوارووى دێيەكەدا بووەو خەڵكەكە ڕووخاندويانەو كووپـــەو شتى كۆنيـــان تێـــدا دۆزيـــوەتـــەوە. جێ‌يێـك وا لەنێو ڕەزەكانى ڕۆژهەلاتى گراو وگۆرستانى گراو پێى دەڵێن «بـــەردە نەخشينـــە»، شوێنـــەوارى خانـووى دێـرينى تێـدا چنگ دەكـەوێو تابـووتى بەستـۆكەى لێ‌دۆزراوەتەوە، دوو نييـە شوێنـەوارى شارێـك بێت. ئەم دێيـە كانييـەكى ئاوى كانـــزايى (معـــدنى)ى لێيـــەو ناوى «گـراو»يش هەر لەوەوە هاتـووە. لەســـەر شاخـەكـەى سەرووى دێيـەكـەو بەرامبـەر (شـاخى دارى لولكـان) شوێنـەوارى بنـاخـەى قەلايێـك و هەروەها چاڵەبەفرێكيش هەيەو خۆرهەلاتى ئەم گردە، كە خاكێكى تەختـانـەو ئێستـا ڕەزە، جێگـاى شارێكى كۆنـە، خشتى سووركراوو گۆزەو بناخەى ماڵى لێ‌دەبينرێ لەگەڵ چەند كارێزيكى كۆندا. پێى دەڵێن «مولكى حەنا»، دوور نييە (حنە) لەناوى (خانێ)وە هاتبێ كە ناوى شاخى صلاح الـــدين يان شاخـــە نزمـــەكـــەى تەنيشتى باشـوورى دوڵى (بـاستـۆران)ە كە ناوى لە نوسينى بزمـاريى (سنحاريب)ى ناشووريدا هاتووە.[1]

لەلاى دەزگـــاى شوێنـــەوار ناوى‌گـراو «خـربـة گراو» بە شوێنـــەوارى كۆن تۆمـــاركـراوە. گراو لە كۆنـدا گونـدێكى پێشكـەوتـوو بووە، لە بارەى ڕوونـاكبيـرىو كۆمـەلاتييـەوە، چونكە مەڵبەندێكى گرنگى خوێندن بووەو مەلايانى باشى لێ‌هەڵكەوتووەو خەڵكەكەى هەموو خزم و مەلازادەن، تەنيا چەند ماڵێك نەبێ.

دەبێ ئەوەيش بڵێين، كە گراو سەر بە ناوچەى «خۆشناوەتى»يە.

شاخى «دارلولكان» كە ئەم ڕوانگەيەى لەسەر دانراوە وا لە تەنيشتى خۆرئاواى دێيەكەوەو زۆر بەرز نييەو، پشت تيژە لە زنجيرە (چياى پيرمام)ەوە وەكو پەراسووێك بەرەو باشوور درێژ دەبێتەوە.

لەپێشدا وێنەى شاخ و ساڵنامەكەم لە دێيەكە وەرگرت. ئەوجا لەگەڵ كاك ئيسماعيل نورى خەڵكى گوندەكە بەسەر شاخ كەوتين.

ئەم برايـــە لە پێـوانى درێـژايىو بەرز كردنـەوەى چەنـد قووچە بەردێكى ڕووخاودا يارمەتى‌يێكى زۆرى دام، وەك قوچى گەڕانەوەى سەرەتاى هاوين»كە لاى باكوورەوە خاڵى كۆتايى ڕوانگەو ساڵنامەكەيەو دەركەوتنى لە وێنەدا گرنگە. بۆيـــە دوو كەســمـــان لەســـەر ئەم قوچـــە ڕاوەستـــانـــد بۆ ديـارى‌كـردنى جێگـەكەى. لە قووچى سەرەتاى زستانەوە تا قووچـى گەڕانـــەوەى هاويـن واتـــە لەم سەر تا ئەوســـەرى ساڵنامەكەمان پێوا. هێندێك لە قوچەكان ڕووخابوون تەنيا چوار قوچ بەتـــەواوى بە ساخى مابـــوونـــەوە. سێ قـوچى تەرازوو لەگـــەڵ قوچـى بەهـــاردا، بەلام قوچى سەرەتـــاى زستـــان و دارى لولكـــان بە يەكجـارى نەمـابـوون، تەنيـا خەڵكەكە جێگەكەيان دەزانى.

ئێمـــە، كە گەڕاينـەوە، پيـرەمێـردو شارەزايـانى خەڵكى گراومان لە سەربانى مزگەوت و نێو حەوشەكەيدا كۆكردەوەو ڕووبەڕووى ساڵنامەكە كەوتينە زانياريى وەرگرتن لێيان و بە دەنگى خۆيـــان لەســـەر شريتى كاسێت تۆمـــارم كرد. لەم ڕووەوە، پتـــر سوودمـــان لە حاجـــى حەســـەن و حاجـــى محـەمـەدەمين و خاليـد ڕەسـووڵ و محـەمەد عەلىو عومەر حەكيم وەرگـرت. حاجى حەسـەن كە ناردمـان بە شوێنيدا لەنـــاو ڕەزەكـــانـــدابـــوو، هات و گوتى: من لە (حـــاجى ئيسماعيل حەمەدى مام عەباى)يەوە فێرى ساڵنامەكە بووم، چونكـە هەم بەتـەمـەن و هەم يەكـەم (حسـابگەر)و شارەزاى ئەم ساڵنـــامـــەيـە بوو و لەم زستـانـەدا كۆچى دوايى‌كـرد.

خەڵکی دێیەکە هەموو باسی لێهاتوویی ئەویان دەکرد.

لەکاتی دەنگ تۆمارکردندا، هەوڵم دا بکەونە مشتومڕو دەمەتەقێیەکی گەرم لەگەڵ یەکدا، بۆ ئەوەی زیاتر گشت شتێکمان بۆ ڕوون بێتەوە. لە گراوێ مامەوە تا ڕۆژ ئاوابوو. لە دەمی خۆرئاوابووندا، تەماشام کرد خۆر لە نێزیك قووچی سێیەمی ئەستێرەی تەرازوودا ئاوابووو، ئەو دووریـیەیش کە مابووی بە شەش ڕۆژی دی دەیبڕیو دەگەیشتە قووچەکە، چونکە شەش ڕۆژ بوو بۆسەرەتای پایز کە (21)ی ئەیلولە.

## بۆچی دەڵێین ڕوانگەی گراوێ

ئەم ڕوانگەیە لەسەر بناخەی پشت بەستن بە دوازدە بورجی فەلەکیو حەوتەکانی کوردی) وئەو ئەستێرەی گەلاوێژ کە بەعەرەبی (الشعری - الشعری الیمانیة)یە، کۆمەڵە ئەستێرەی (پێرو - کۆ) - کە بەعەرەبی (ثریا)ی ناوەو سێ ئەستێرەی پێشەوەی چوار ئەستێرەکانی (تەرازوو) - واتە ئەو کۆمەڵە ئەستێرانەی کە بە کەلووی تەرازوو (برج المیزان) ناسراون و لە ستێرناسیی ئیسلامیدا یەکێکە لە دوازدە کەلووەکانی ئاسمان - دامەزراوە. بە پێی ئەم ساڵنامەیە دەبێ ڕۆژ لە جێی ئاوابوونی ئەم ئەستێرانە، ئاوابێ. دیارە بەشەو لە ئاسۆی شاخەکەوە چاودێریی ئاوابوونی ئەو ئەستیرانە کراوەو، خاڵی ئاوابوونیشیان بە قووچەبەرد دەست نیشان کراوە. دەبێ ئەم ڕوانین (رصد)ەیش بە دوو کەس یان کۆمەڵێك ڕێك - خرابێ، هێندێك لە نێو مزگەوتداو هێندێکیش لە هەمان کاتدا لەسەر شاخ بووبن و بە دەنگ، یان هۆیێکی دیکە یەکتریان ئاگادارکردبێتەوە. جێی ڕوانینەکەیش دەرگای مزگەوتی گراوێ بووە، پاش ڕوانین لە گەولاوێژ و پێروو تەرازو، دووەم کاریان ڕوانین بووە لە ڕۆژ لە ئاسۆی شاخەکەوە لە جێی ئاوابوونی هەریەکە لە ئەستێرەکان لە ستێرناسی میللی کوردی (الفلکیات الشعبیة الکردیة)دا یان بڵێین لە چەند ناوچەیێکی وەك ڕانیەو قەڵادزێی کوردستاندا بە (دەرەجە) ناسراوەو جیاوازە لە زاراوەی (برج)ی عەرەبی. بەوێنە، حسابدارە کوردەکان دەڵێن ئەمشەو ڕۆژ لە دەرەجەی پێرووداو ئاوادەبێو یا لە دەرەجەی گەلاویژدا ئاوادەبێ.

ئیتر ئەم ڕێك کەوتنەی خۆرو ئەستێرەکان لە یەك دەرەجەدا، پێشینانمان بەکاریان هێناوە بۆ حسابی ساڵ، واتە بۆزانینی هێندێك ڕۆژو کاتی گرنگی ساڵ. بە پێی ئەو زانیارییانەی کە هاوینی ساڵی (1982) لەبارەی ستێرناسیو کەشناسی (الانواء الجویة)ی کوردییەوە کۆم کردنەوەو لەسەر شریت تۆمارم کردن، ئەویش لە ناوچەی ڕانیەو قەڵادزێو بە تایبەت لە خەڵکی ناو دەشتی قەندیل و خەڵکی دێی (سلە) کە تا ئەم ماوەیەی پێشوویش بۆ ئاودانی باخەکانیان شەو بەهۆی ئەستێرەکانەوە ئاویان لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکرد بۆم ئاشکرا بووە کە پێشینانمان حسابی ساڵیان بە گەلاوێژو تەرازوو پێروو ڕاگرتووەو، بەم شێوەیەی خوارەوەیش: -

1 - ئەگەر ڕۆژ لە دەرەجەی تەرازوو ئاوابوو، زستان تەواو دەبێو سەرەتای بەهار دەست پێدەکا کە (21)ی ئادارە.

2 - ئەگەر لە دەرەجەی پێروو ئاوابوو، ئەوە کۆتایی بەهارو سەرەتای هاوینە واتە ئەو ماوەیەی کە ڕۆژ لە هاتنیدا بەرەو باکوور بڕیی دواییهات و ڕووەو باشوور گەڕایەوە. ئەم بارە لە ستێرناسی ئیسلامیدا پێدەڵێن لاریی تێکرایی (المیل الکلی، العرض الکلی، والأوج).

3 - ئەگەر ڕۆژ لە زستاندا گەیشتە دەرەجەی گەلاوێژ، ئەوە نیوەی زستانە.

4 - ئەگەر ڕۆژ لە گەڕانەوەیدا گەیشتە دەرەجەی تەرازوو دەبێتە سەرەتای پاییز.

5 - ئەگەر گەیشتە دەرەجەی گەلاوێژ، مانگ ونیوێك بەسەر پاییزدا تێپەردەبێ جا ساڵنامەی گراوێیش لەسەر ئەم حسابە کوردییە دانراوە. هیچ زانیارییەکی لەمچەشنە لە ستێرناسیی ئیسلامیدا ناوی نییەو، دەبی لە ستێرناسیی یۆنانیشدا هەر نەبێ کە لە ڕاستیدا بووەتە بنچینەی

ستێرناسیی ئیسلامی. بێگومان پێك هێنانی ئەم جۆرە ساڵنامەیە لە ساڵێكدا كارێكی یەكجار دژوارەو بە زەحمەت تەواو دەبێ چونكە ئاسمانی كوردستان بە زستان زۆربەی كات هەورینەو ئەمجا ئەو شەوە، یان ئەو ئێوارەیەی هەوربێ ئەستێرەو خۆر دەرناكەون و دەبێ ساڵێكی‌تر تەماشا بكرێن.

هەر لەم بارەوە لە نێو خەلكی (باری بچوك)دا بڵاوە كە (مەلا نەبی) بە (36) ساڵ ساڵنامەو روانگەی بارێی سازكردووە. ئەوەی شایانی باسە ئێمە كە دەڵێن: بەپێی ئاوابوونی خۆرە، مەبەستمان ئاوابوونی خۆرە لەسەر ئاسۆی شاخەكەدا، كە سێبەری شاخەكە دەگاتە مزگەوتی گراو، چونكە پاش ئەمە بە دەوری (40) دەقیقە یا زیاتر ئەوجا خۆر بەتەواوی ئاوادەبێ.

ئەو زانیاریانەی خستمانە روو ئەوەمان بۆ روون دەكەنەوە كە ئەم ساڵنامەیە كارێكی ستێرناسییەو بە روانگە (مرصد)یێكی شوێنەواری (أثري) حسێب دەكرێ خاڵێكی گرنكە لە كەلەپووری شارستانەتیی كوردیمان، چونكە دروستكەرەكەی ئەستێرەو خۆری لە جێگەی ئاوابوونیان لە ئاسۆ (افق)ی شاخی داری لولكان ئاواكردووەو بە قوچە بەرد دیاریی كردوون.

هەروەها جێگای دوازدە كەلووی ستێرناسیی بە ئاوابوونی رۆژ دیاریكردووە لەگەڵ هێندێك شتی‌تریش بۆ زانینی كات.

پیرەمێردەكانی خەلكی گراو دەڵێن لە پێشینانمان بیستووە كە مەلا ئومەر (مەلاعمر)ی دروست كەری ساڵنامەكە بە شەو نەنوستووەو هەر ئەستێرەی ئاواكردووە. ئەم گوزارەی (ئەستێرە ئاواكردن)ە لە ستێرناسیی میللیی كوردیدا مانای (رصد النجوم)ی عەرەبی دەدا بە دەستەوە.

دورنییە ئەم روانگەیە فراوانتریش بێ و هێندێك ئەستێرەی تریش ئاواكرابێ و قوچیان بۆ دروست كرا بێ، چونكە چەندین بناخەی ترمان دۆزییەوە لە رۆژی (2نیسانی 1984)دا كە رەنگە شوێنەواری قوچی - تر بێ جگە لەوە لە رۆژی یەكەمی كەلووەكانی ستێرناسیی ئاسمانی و چەند رۆژێكی‌تریشدا، خۆر ئاواكراوە.[2]

## چۆن زانیمان روانگەكە بەگوێرەی بورجەكانی فەلەكی ئاسمانی‌یە

جاری یەكەم كە چووم بۆدێی گراوو روانگەكەم دۆزییەوە نەمزانی پێوەندیێكی بە دوازدە بورجەكانەوە هەیەو ساڵنامەكە لە بنچینەدا لەسەر بورجەكانە. تا لە ئەنجامی ئاواكردنی خۆر لەم ساڵەدا یانی (1984) لەسەر (قوچی بازبەران)و لە ئەنجامی لێكۆڵینەوەو لێكدانەوە، بۆم دەركەوت كە لەسەر حسابی بورجەكانەو بەڵگەیشمان ئەمان:

1 - (قووچی بازبەران) بەگوێرەی تەماشاكردنی خەڵكی گراو لەم ساڵەی ئێستاماندا لە رۆژی هەژدەی شوباتدا خۆر گەیشتە سەر ئەم قوچەو بەمە بۆمان روون دەبێتەوە كە ئەم قوچە نیشانەی (كەلووی نەهەنگ)ە (بورجی حوت)، چونكە لە «18»ی شوباتدا خۆر دەگاتە كۆتاییی كەلووی دۆلكە «بورجی دەلو» وە لە رۆژی «19» شوبات دا خۆر دەكەوێتە كەلووی نەهەنگ «بورجی حوت» كە سێیەمین بورجی زستانە.

هەروەها زانیمان ئەم قوچە نیشانەی كەلووی دوپشكە «بورجی عەقرەب». لە گەرانەوەی خۆردا لە قوچی دواییی روانگەكەوە كە «قوچی گەرانەوەی سەری هاوین»یانی «نقطة الانقلاب الصیفی» یانی «لە مدار السرطان»ەوە بۆ قوچی یەكەم كە قوچی سەرەتای زستانە یانی «نقطة الانقلاب الشتوي» لە (مدار الجدي)دا، بورجی عەقرەبیش دووەمین بورجی پاییزە كە لە 23ی تشرینی یەكەمدا خۆر دەگاتە ئەم بورجە.

2 - قوچی تەرازوو: سێیەمین قوچی نیشانەی كەلووی كاور حەمەل لە بەهاردا كە یەكەمین بوجی بەهارەو لە دوای (بورجی حوت) دێت.

پانــی له ڕۆژی «20ی ئادار» خۆر بورجــی حوت بەکــوتــایی دێنێو ڕۆژی «21» سەری دەکــاتــە بورجی حەمــەل، ئەمــەیش لە هاتــنــەوەی خۆردا لە (مــەداری جەدی)یەوەلە باشوور بۆ مەداری قرژال (مەداری سرطان) لە باکوور.

هەروەهــا زانیمــان کەئــەم قوچــە لە گەڕانــەوەی خۆردا نیشــانــەی کەلــووی تەرازووە «بــرج المیــزان» کە بورجی یەکەمە لەسێ بورجی پایزو لە 21یان 22ی ئەیلولدا خۆر دەگاتە ئەم بورجە. ئەم قوچانە نیشانەی سێ شتە واتە ئەم دوو بورجە لەگەڵ کۆمەڵە ئەستێرەی تەرازوو.

ئەوەی شایانی باسە لە ساڵنامەی «کانیی توو»دا هەر بە جێگای تەرازوو دەڵێن «بورجی تەرازوو».

وەها بۆمان ئاشکرابوو نیشانەکانی چوار بورج لە نێو ئەم روانگــەیــەدا ماوەتــەوە بەڵکــو زانیمــان نیشــانــەی دوو بورجی‌تریش هەیە، «قوچی سەرەتای زستان» کە نیشانەی کەلــووی کارژەلــە «بــرج الجــدي»یــەو «قــوچی گەڕانەوەی سەرەتــای هاوین» کەنیشــانــەی کەلــووی قرژاڵــە «بــرج الســرطــان». ئێستــا کە نیشــانــەکــانی شەش بورج لە ڕوانگــەکــەدا ماوەتــەوە، بێ‌گــومان دەبێ نیشانەکانی شەش بورجــەکــەی تریش هەبــووبێ. باوەڕمــان وایــە کە ئەوزانــا کوردە ستێــرەنــاســەی دروستکــەری ڕوانگــەکــە شەش بورجەکانی‌تری لەبیر نەچووەو بێ نیشان بە جێی نەهێڵاوە، باوەڕم وایە سێ قوچی‌تر بۆ کەلوەکانی‌تر هەبووە، بەم شێوەیەیە:

أ ـ قوچێــك لە بەینی قوچی سەرەتــای زستــان و قوچی گەلاوێژ کە دەبێتــە نیشــانــەی کەلووی دۆلکە «برج الدلو» دەبێ لە ڕۆژی (19)ی کانونی دووەمدا خۆر بگاتە سەری کە کۆتایی ڕۆژەکانی کەلووی کارژەلە (برج الجدی)ە کە لە ڕۆژێ دوایی ئەودا خۆر لە هەڵاتنیــدا دەگــاتــە کەلــووی دۆلکــە. هەروەهــا دەبێتــە نیشــانــەی کەلــووی کەوان «برج القوس» کەسێ‌یەمین بورجی پاییزە، ئەمەیش لەگەڕانەوەی خۆردا کە لە ڕۆژێ 22ی تشرینی دووەمدا سەر دەخاتە ئەم بورجە.

ب ـ قوچێك لە باکــوری «قــوچی تەرازوو»ە کە دەبێتــە نیشانەی کەلووی گا «برج الثور» لە هاتنەوە خۆرداو، دەبێ ڕۆژی 19 نیســان خۆر بگــاتــە سەری کە کۆتایی ڕۆژەکانی کەلــووی کاورە «بــرج الحمــل»، چونکــە ڕۆژی دوای ئەو «بورجی ثور» دەست پێ دەکا، ئەمەیش لە هاتنەوەی خۆردا.

هەروەهــا ئەم قوچــە دەبێ بە نیشــانــەی کەلــووی فریك «بــرج السنبلة» لە گەڕانــەوەی خۆردا، چونکــە کەلــووی سێ‌یەمینی هاوینە، کە ڕۆژی 23ی ئاب خۆر دێتە نێو ئەم کەلووە.

جـ ـ قوچێــك لە بەینی قوچی بیــوەی بەهــارو قوچی گەڕانەوەی سەری هاوین.

دەبێ لێــرەیش قوچێــك هەبــووبێ بۆ ئەوەی ببێ بە نیشــانــەی «بــورجی جەوزارە» لە هاتنــەوەی خۆرداو دەبێ ڕۆژی «21»ی ئایار خۆر بگاتە سەری کە کۆتایی کەلووی گا «بــورجی ثور»یــەو ڕۆژی دوایی «بــورجی جەوزاء» دێتــە پێش. هەروەهــا ئەم قوچــە لە گەڕانــەوەی خۆردا دەبێتــە نیشانەی کەلووی شێر «برج الاسد» کە لە 23ی تەموزدا خۆر دێتە نێو ئەم بورجەوە.

ڕۆژ لە هاتــنــەوەیدا شەش بورجــی دەبــڕیو لە گەڕانــەوەیدا شەشی‌تــر کە بەرامبــەر شەشــەکــانی‌ترن لەبەر ئەمــە یەك قوچ دەبێتــە نیشــانــەی دوو کەلــوو تەنیا کەلووی کارژەلــە «بــرج الجــدی»و کەلــووی قرژاڵ «برج السرطان» نەبێ چونکە هەریەك بەتەنیایی قووچێك بۆی هەیە.

ئەو سێ قوچــەی دیــار نی‌یــە دەبێ ڕوخــابن و لە بیــری خەڵــك نەمــابن چونکــە لە لایــان گرنــگ نەبــووە بەڵکــو قوچەکانی سەرو ناوەڕاستی وەرزەکانی ساڵ لەلایان گرنگ بووە تا «قوچی باز بەرانیش» کە هەندێکی لێ ڕووخابوو لە بیــری خەڵکی گراوێ نەمــابــوو، من کە لەســەر شاخــەکــە گەڕامەوە بۆ حەوشی مزگەوت و خەڵکەکە لەوێ کۆبوونەوە من لە شارەزاکــانیــانم پرسی‌و گوتم قوچێکی ڕوخــاو لەژێــر

قوچی بەهاردا هەیە ئەوەیان چی‌یە؟ گوتیان ئەوە قوچ نییە کە چەند جارێکم لێ‌پرسین و بیریانم جولاند ئەوسا هاتەوە بیریان و گوتیان ڕاست دەکەێت پێی دەوترا «قوچی بازبەران»و ئێستاش ئەو قوچەی بەینی بازبەران و قوچی گەلاوێژ کە بناخەی دیارە ـ دەڵێن قوچ نییە هەروەکو مانای هەندێك لە قوچەکانی ڕوانگەو «ساڵنامەی بارێ» لە بیری خەڵکی بارێ چووتەوە تەنیا سەرەتاو ناوەڕاستی وەرزەکان نەبێ لەبەر ئەوەی بناخەی قایم و بە گەچ قوچەکانی ڕوانگەو ساڵنامەی گراو نەکراوە.

ئیتر ئەو سێ قوچەی بورجەکانی‌تر ڕوخاون و جێگە شیان لە بیری خەڵك نەماوەو دوور نییە هەندێك قوچی‌تریش هەبوویێ بۆ دەست نیشانکردنی هەندێك بابەتی‌تری گرنگ و ڕوخابن و لە بیری خەڵك نەمابێ و ئێمە ئەگەر فریای ئەم ڕوانگەیە نەکەوتینایە پاش ماوەیێکی‌تر پاش مردنی بەسالاچووەکان بەتەواوی بزر دەبوو، چونکە گەنجەکان هیچی لێ‌نازانن و ئەم شوێنەوارە شارستانی‌یە کوردییە لەکیس کورد دەچوو، هەروەها بەڵێندەر (مقاول)یش چوویووە گراو بۆڕوخاندنی مزگەوتەکە چونکە بەڕێوەبەریتی ئەوقافی هەولێر بڕیاری ڕوخاندن و ئاوا کردنەوەی مزگەوتێکی نوێی بەجێگاکەی دابوو، ئەگەر مزگەوتەکە لەناو بچوایەکە جێگەی تەماشاکردنیەتی، ڕوانگەکە تێك دەچوو، لەبەر ئەوەی ئەم مزگەوتە پارچەیەکە لە ڕوانگەکە پێویستە لەسەر مۆسسەی ئاسار بەبڕیارێك مزگەوتەکە بکات بە «اثری»و بە هیچ شێوەیێك نەڕوخێنرێ و دەستکاری نەکرێ، وە ئەگەر تەعمیریش بکرێ دەبێ لەژێر چاودێری ئەندازیاری ئاساردا تەعمیر بکرێ وەك خۆی.

## دۆزینەوەی هەندێك بناخە

پاش ئەوەی کە زانیم ئەم ڕوانگەو ساڵنامەی گراو لەسەر بورجەکانی فەلەکی دروست کراوە زانیم چەند قوچێکی‌تری بزربووەو نەماوە، پێویستە دروستی بکەینەوە لەبەر ئەمە لە ڕۆژی 2ی نیسان چووم بۆ گراوو دوو شەو لەوێ مامەوە، بۆ ئاواکردنی ئەستێرەی گلاوێژ و تەرازوو پێرو «کۆ»و بۆ پشکنینی کتێبە دەست نووسە پەرپوتەکانی گراوو لەو ڕۆژانەدا بانی لە 2 ـ 4 نیسان ئەم کارانەمان ڕاپەڕاندووە:

1 ـ دۆزینەوەی جێگەی قوچی کەلووی دۆلکە «برج الدلو» ڕۆژی یەکەم چووین بۆ سەر شاخەکەو دەوری شەش سەعاتمان پێ چوو، توانیم جێگەی کەلوی دۆلکە بدۆزمەوە لە بەینی قوچی ئەوەلی زستان و قوچی گەلاویژ بە مەسافەی «41م 30سم» سەرو قوچی ئەوەلی زستان و «15م و 50سم» لە خوارووی قوچی گەلاوێژ بەردەکانی قوچەکە نەمابوو بەلام چونکە لەم ساڵانەدا خەڵك بەردەکانی بردوون، یان بڵێم فرێی‌داون زەوی بناغەکەی وەکو زەوی‌یەکی نوێ، لە زەوی دەورووپشتی جیابوو، قوچەکەمان لەو جێگایە دروست کرد بەلام هەردەبێ لە داهاتوودا موراقەبەی خۆر بکەین. دەبێ ڕۆژی 19 کانوونی دووەم خۆر لەم جێگایەدا ئاوابێ کە کەلووی کارژەلە «برج الجدی» لێرەدا تەواو دەبێ کە دەبێتە ئەوەلی کەلووی دۆلکە بەلام دووریش نییە، ئەو قوچە نیشانەی شتێکی تربێ.

2 ـ دۆزینەوەی چوار بناخە لەو قوچە نەناسراوی بەینی قوچی گلاوێژ و قوچی بازبەران ـ تا قوچی بازبەران یەکەمیان بەیەك مەتر نزیکەی «قوچی نەناسراوە» بە لای باشوری ڕۆژهەلاتەوە، دووەمیان بە مەسافەی «2م» نزیك «قوچی نەناسراو» بەلای باکوری ڕۆژ هەلاتەوە. سێ‌یەمیان نزیك «قوچی بازبەران» بەلای باشوورەوە، چوارەمیان لە سەروو بازبەران بە مەسافەی «4م». دوور نی‌یە ئەم بناغانەی هەندێك قوچ بن بۆ ئیشارەتی هەندێك ئەستێرە وەیا هی هەفتەکانی چلەی زستان بێت. من نیشانەی پرسیارم (؟) بۆ بۆیاخی سوور لەسەر ئەم بناغانە، یان ئەم شوێنەوارانە دانا بۆ ئەوەی ئەگەر هەندێك لە ئەستێرەناسەکان هاتن بۆ تەماشای ڕوانگەکە هەست بەم بناغانە بکەن. بەلام ئەو بناغەی سەرو قوچی بهارێ

کەدەورەکــەی (580سم)ە بە نبــاخــەی قوچــەکــان ناچێ بباغەیەکی خڕو رێك وپێکە.

3 - دوزینــەوەی هەنــدێـك بنـاغە لە باکوری قوچەکانی تەرازوو لە خاڵی 38م و43مو 71م و91م و94م و114م.

دەبێ ئەمـانـەش ساغ بکـرێنـەوە ئایا بناغەی قوچەکانی هەفتــەکـانی چلەی هاوینە یان هی شتیتـرە. نیشـانـەی «پرسیارم» لەسەریان نووسیوە. خەڵکی گراو ئاگری نەورۆز لەسەر هەندێکیانی دەکەنەوە.

هەروەهـــا لە رۆژی «2» نیســـان دا ناوی قوچـــەکـانی روانگـەکـەم بەبـۆیـاغ لەسەریان نوسیوە. ئەوەی شایانی باســـە خەلــك دەڵێن قوچێکی‌تـر هەبـوو لە سەروو قوچی گەرانــەوەی سەری هاوین بەڵام ئێستـا نەمـاوە. ئێستـاش قوچێکی گەورە هەیە لە باکوری قوچی گەرانە وەی سەری هاوین و دوور لەوەش دەڵێن موهــەنـدیســەکـان دروستیـان کردووە بۆ مەسـەلـەیێکی سنـوری بەڵام دوور نییە لەوپێشتر ئاســاری قوچێــك لەوێ هەبــووبێ‌و ئەوانیش بەرزیــان کردبێتــەوە. پێـویستـە لەم دوو قوچـەش بکـۆڵێنـەوە بەڵکـو ئیشارەتی فەلەکی بن.

5 - پێوانی روانگەکە لە سەفەری نیسان دا سەرلەنوێ روانگـەکـەم پێوا درێژییەکەی لە (قوچی ئەوەلی زستان)تا (قـوچی گەرانــەوەی سەری هاوین) گەیشتـە (331م) لە قوچی ئەوەلی زستان تا سێیەمین قوچی تەرازوو کە دڵی روانگەیە چونکە نیشانەی ئەوەلی ساڵە (177م)ەو لەوێ تا قوچـی گەرانــەوەی سەری هاویـن (140م) یانـی نیــوەی دەستەچەپ یانی نیوەی باشوور کە بۆ سێ مانگەی پاییزو زستانە بە «37» مەتر درێژترە لە نیوەی دەستەراست یانی نیــوەی باکـوور کە بۆ سێ مانگی بەهـارو هاوینـە. بەشی باشوور زۆر سەربەرەوژێرە تەنیا دەوری «55» مەترە نەبێ لە بەینی قوچی سێیــەمی تەرازوو و (قــوچی بەهــاری - قوچی رەزبرین).

ئەوەی شایانی باسە ئەم پێوانەیەش قابلی کەم و زیادە بە چەنـد مەتـرێـك چونکـە دور نییە بە خەتێکی راست (خط مستقیم)مان نەپێوابێ هەروەها بو جاری سێیەمیش پێوام لە رۆژی 14/نیســانی (1985)دا کە دیسـان چومـەتـە گراو بەتایبەتی بو مەوزوعی حەوتەکان.

## بازنەی کەلوەکان

لەبــەر ئەوەی روانگــەی گراو لەســەر ئەساسی کەلـوە (برج)ە فەلەکیەکانی ئاسمان دروست کراوە لەگەڵ هندێك ئەستێرەو شتی‌تر پێویستە هندێك زانیاری لەم بارەیەوە بنووسین.[3]

مرۆڤ لە کۆن دا سەرنجی لە ئەستیـرەکـانی ئاسمـان و خۆرو مانگ داوەو سودی‌لێیان وەرگرتووە بۆ زانینی کات بۆ ئیش و کاری کشتـوکـاڵ و ئابـوری‌تـری، وەیان رێکردن لە شەوداو دەرکەوتنی هەندێك لە ئەستیرەکان کردووەتە نیشانەی هەنــدێـك رووداوی ناخـوش وەك لافـاو وبیمـاری، وەیـان نیشــانــەی خۆشی‌و بەختــەوەری هەروەهــا هنــدێـك لە بیــروبـاوەڕی ئایینیـان بەستـۆتـەوە بە ئەستێـرەکـانـەوەو، نەتەوەکونەکانیش دیتویانە کە هندێك لە کۆمەڵە ئەستێرەکانی گومـەزی ئاسمـانی هنـدێـك شیـوەو وەزعییـەتێکی وەهـای گرتووە، کە بەشوان و یا ڕاوکەر، وەیا تیرهاویژ دەچێ وەیا هی هندێك گیان لەبەری‌تری وەك شێر، وورچ، ئەسپ، دوپشـك، نەهــەنـگ و ئیتـر لە شێـوەی ئەوشتـانەدا وێنەیان دروست کردووەو هنــدێـك لەو کۆمـەڵـە ئەستێـرانـە بە کەلـو ناسراون و هندێکیان لە کاتی سومەری‌و ئەکەدی‌دا ناسراوبوون.

فەلـەکی کەلـوەکـان دابـەش کراوە بۆ دوازدە کەلو، وەك پشتێنێك لە دەوری ئاسمان خەیاڵ کراوە پانایییەکەی (16)° وەیــا دەوری (18)°یــە، هەر کەلــوێــك بۆ (30) رۆژ دابـەش کراوە یانی رۆژ بەســەر بازنی کەلـوەکـان دا هاتوچو دەکات و هەر مانگێك کەلویك دەبڕێ‌و ساڵی کەلوو کراوە بە (360) رۆژ.

هەروەهـا ئەم کەلـوانـە کراونـە ساڵنـامـەو کلدانیـەکان و

## فەلەکی کەلوەکان «فلك البروج»



مصرییە کونەکان ئەم ساڵنامە بەیان کار هێناوە. ساڵنامەی ئەستێرەییش (التقویم النجمي) زانای کلدانی (نابو ریمانو) دروستی کردووە.

فەلەکی کەلوەکان لە رۆژئاواوە دەسورێتەوە بۆ رۆژهەڵات بە پێچەوانەی خۆر جا ئەگەر فەلەکی کەلوەکان، یانی بازنەی کەلوەکان کەوتە سەر بازنەی (معدل النهار) ئەوکاتە ئەوەڵی کەلوی کاور یان بڵێین بەران (برج الحمل) دەکەوێتە سەر نوقتەی رۆژ هەڵات و ئەوەڵی کەلوی تەرازوو (برج المیزان) دەکەوێتە سەر نوقتەی رۆژئاواو خۆریش لەو کاتەدا دەکەوێتە سەر هێڵی (معدل النهار) لە نوقتە (الاعتدال الربیعي) کە رۆژ و شەو بە قەدەر یەك دەبن، واتە وەك یەکیان لێ دێ ئەوەش لە رۆژی 21 ئادار دا، کە دەبێتە سەرەتای وەرزی بەهار پاشان بازنەی کەلوەکان لەسەر ئەم خەتە دەترازێ وورده وورده لێی دوور دەکەوێتەوەو خۆریش لەسەر کەلوەکان دەسورێ‌و لەنوقتە ئیعتدال دوور دەکەوێتەوە تا دەگاتە ئەوپەری قوناغەکەی کە ئیتر لەوە تێپەر نابێ کە نوقتەی گەرانەوەی سەری هاوینە (نقطة الانقلاب الصیفي)، کە دەرەجەی (28)ە ئەوەش لە رۆژی 21 حەزیران دا کە سەرەتای وەرز (فصل)ی هاوینەو ئەوەڵی کەلوی قرژال (سرطان)ە خۆر لەم مەسافەیەدا سێ کەلوی کاور (حمل)، گا (ثور)و جیوك (التوأمان ـ جوزاء) ـ دەبرێ کە سێ کەلوی بەهارە خۆر لە نوقتەی گەرانەوەی سەری هاوین دەگەری تا بۆ جاری دووەم دەگاتە سەر خەتی (معدل النهار) کە نوقتەی بەرامبەر یەکی پاییز (نقطة الاعتدال الخریفي) کە شەوو رۆژ بەرامبەر یەك دەبن یانی کورت و دریژی لە بەینیان دا نامینێ ئەوەش لە 21 ئەیلول داو دەبێتە سەرەتای پاییز یانی خۆر گەیشتە کەلووی تەرازوو (برج المیزان) لەم مەسافەدا روژ سێ کەلوی هاوین دەبری: کەلوی قرژال (سرطان)، شێر (اسد)، فەریك یان کچ (برج السنبلة ـ برج العذراء) پاشان خۆر لە خەتەکە دەترازێ، تا لە رۆژی 21 کانونی یەکەم دەگاتە سەر نوقتەی وەرگەرانی زستان (نقطة الانقلاب الشتوي)و دەگاتە ئەوەڵی کەلوی کارژەلە (برج الجدي) کە سەرەتای وەرزی زستانە لەو مەسافەیە رۆژی سێ کەلووی پاییز دەبرێ: تەرازوو (برج المیزان)، دووپشك (برج العقرب)و کەلووی کەوان (برج القوس). خۆر لە نوقتە وەرگەرانی زستان ئەولاتر ناچێ بەڵکو دەگەرێتەوە تا لە 21 ئاداردا دەگاتە خەتی بەرامبەر بوونی روژ (خط معدل النهار) کە سەرەتای بەهارەو لەو مەسافەیەدا سێ کەلووی کارژەلە (جدي)، دوو لچە (دولك) (برج الدلو)، نەهەنگ (برج الحوت) دەبرێ کە سێ کەلوی زستانن.

سورانەوەی خۆر لە نوقتە ئیعتدالی بەهارەوە تا هەمان نوقتە بە 365 رۆژەو 5 ساعەتو 48 دەقیقەو 46 سانیە کە ئەمە مقداری ئەو کاتەیە کە زەوی بەدەوری خۆردا دەسورێتەوە، هەروەها ئەمە ژمارەی روژانی ساڵی رۆژی (السنة الشمسیة)یە، چونکە ساڵنامەی رۆژی لەسەر ئەساسی ئەم سورانەوەی خۆر لە نوقتە ئیعتدالی بەهاردا تا هەمان جێگە دروست بووە.

بێ گومان کوردەکانیش لە کۆنەوە هندێك لە ئەستیرەکانیان ناسیون و سودیان لێ وەرگرتوون و حیسابی ساڵیان بە کەلوەکانیان کردووە.

لە کاتی بابلیەکان دا روانگە (مرصد)یێکی فەلەکی لە قەلای هەولێر هەبووەو لە کاتی ئیسلامیشدا لە سەدەی نووەمی زایینی‌دا زانای کوردی گەورە ابو حنیفە (ئەحمەدی کوری داود کوری وەنەند)ی دینەوەری روانگەیێکی فەلەکی لە شاری دینەوەری رۆژهەڵاتی کەرمانشا دروست کردبوو وە لە پێش دا روانگەکەی لە شاری (أصفهان)بووە.

بە سەدان زانای فەلەکی لە کوردستاندا پەیدابوون، وەك ابن رەزازی جزیری کە گەورەترین کتێبی لە هەندەسەی میکانیکی‌دا لە کاتی ئیسلام دا داناوە لە شاری (دیاربەکر)و ساڵنامە بە حیسابی کەلوەکان بەئالەتی جۆربەجۆرو بە شێوەیێکی میکانیکی دروست کردو لە نێو هندێك لەو ساعەتە گەورانەی کە دروستی کردووەو وێنەیان بە دەستی‌خۆی کیشاوە لە کتیبە دەسنوسەکەش دا «الجامع

بازنه‌ی كه‌لوه‌كان .



( شكل ـ ٩ ) : واجهة الساعة الموجودة في مخطوطة ابن رزاز الجزري والتي نقلها عن يوسف الاسطرلاب نقلها عن المخطوطة السيد ماجد عبدالله الشمس .

بين العلم والعمل في صناعة الحيل» بەسوڕانی ساعەتەکە بازنەی کەلوەکانیش دەسوڕاو هەر کەلوێلك دابەشی کردبووە بۆ (30) ڕۆژ ڕۆژیش لە چی کەلوێلك دابایەو لەچی ڕۆژێك لە سی ڕۆژی کەلوەکەدا بایە بەچاو دیاردەبوو، هەروەها یوسفی ئەستورلابی «یوسف الاسطرلابی»ش ساعەتێکی وەهای لەگەل کەلوەکانی فەلەکی دروست کردووەو ابن الرزازی جزیری ساعەتەکەی دیوە لە پاش کوچی دوای ئەو وەسفی لە کتێبەکەی خۆیدا نوسیوە بە ڕەئیی من یوسفی ئەستورلابی زانایەکی ئەستێرەناس و ڕەسام و موهندسێکی میکانیکی خەلکی کوردستان بووە وەك (سدید الدین)ی[4] حانی بە تایبەتی خەلکی ناوچەی دیاربەکر وەیا سێرت (سعرد)و ماردین بووە وەك ابن ڕەزاز لە زانایانی سەدەی دوازدەهەمی زایینی بووە. هەروەها لە سەدەی سیزدەهەم دا پزیشك و زانای ئەستێرەناس فخرالدین ی خەلاتی بەشداری کردووە لە دروست کردنی ڕوانگەی فەلەکی لەشاری مەراغە کە نصیرالدینی طوسی دروستی دەکرد بۆ هولاکو وەتا ئەو کاتە گەورەترین ڕەوانگە بووە لە کاتی ئیسلام داو «عبدالله کوری یوسف کوری ابوبکری ئەستورلابی» لە بەینی سەدەی دوازدەو سیزدەمین دا دەستێکی بالای هەبووە لە زانستی کات (علم المیقات)و لە ئەستورلاب دا ئەم زانای فەلەکی‌یە لە شاری دمشق کۆچی دوایی کردووە لە ساڵی (734ك = 1333 ـ 1334ز)داو خەڵکی سێرتی بووە.[5]

## نیشانگرەکانی ڕوانگەو ساڵنامەی گراوێ

بە پێی ئەو زانیارییانەی کە دەستمان کەوتوون گوزارەی (نیشانکرد) لە ناوچەی شارباژێرو مەرگەو ڕانیەو قەڵادزێ بۆ هەر شتێکی دەستکرد یا سروشتکرد بەکاردێ، جا ئیتر یاقووچەبەرد یا درەخت بێ، کە کرابێتە نیشانە بۆ هەڵهاتن یان ئاوابوونی خۆرو ئەستێرە، یان کرابێ بە بەڵگەی سێبەر یا هەتاو بەرکەوتن، ئەویش بۆ زانینی دەست پێ کردنی کاتێکی تایبەت لەو ناوچەیەدا.

هەروەها وشەی «نیشانگر»یشیان تێداباوە کە ساڵنامەکان بەهەموو قووچەکانەوە، دەگرێتەوە، بەلام لە دێی (بارێ)و دەوروبەریدا، لە ناوچەی سیوەیل، لە باتی وشەی نیشانکرد وشەی «مەردەك» بۆ نیشانەکانی ساڵنامەی بارێ بەکاردێنن، لە کاتێکدا هەمان وشە لە شارباژێریشدا باوە. هەرچی گوندی (گراوێ)یە «قووچ»ی پێدەڵێن. ئێمە لێرەدا «نیشانگر» لەبەر چاو دەگرین.

نیشانگرەکانی ساڵنامەی گراوێ لە کۆمەڵە بەردی نەتاشراوی پچووك و مام ناوەندیی شێوە کەللەشەکر دروست کراون کە نەگەچ و نەقوریان تێدا بەکار نەهاتووەو نە بناخەیان بۆ هەڵ کەندراوە، بەڵکو هەر لەسەر ڕووی زەوی داندراون. هەرچی (مەلانەیی)یە بناخەی بۆ (ساڵنامەی بارێ کردووەو، خەڵووزو توێکڵە هێلکەی خستووەتە جێی نیشانگرەکان تاکو بزر نەبن، چونکە خەڵووزو توێکڵەهێلکە نارزێن، وەك خەڵکی دێیەکە دەڵێن.

نیشانگرەکانی ئەم ساڵنامەیەمان لە (14) دانە کەمترنیە بەلام یەکێکیان جێگەی گومانە. من کەچوومە سەر چیاکە (10)دە نیشانگرم بینی، هێندێکیان ساخ و دیارن ئێمە لێرەدا یەك یەك باسی ئیشارەتەکانی مرصدو ساڵنامەکە دەکەین، بە گوێرەی جێگەی هەڵکەوتنیان لەسەر شاخەکە یانی بەشێوەی تەماشاکردن بەچاو نەك بەگوێرەی هەڵکەوتنی دائیرەی بورجەکان «دائرة البروج» چونکە ئەگەر وابێ دەبێ لە نیشانەی بورجی کاوڕ «برج الحمل» دەست پێبکەین کە قوچی سێیەمین تەرازووە کە نیشانەی سەرەتای ساڵەو «نقطة الاعتدال»ە گەرچی لە ناحیەی زانستیانەوە وەها ڕاسترە، بەلام بە شێوەی یەکەم کە شێوەی «المظهر الخارجی»یە باشتر ڕوون دەبێتەوەو بە ئاسانتر باس لە تەسلسلی قوچەکان و مەسافەی بەینیان دەکرێ.

ئێمە لە باشوورەوە دەست پێدەکەین لە قوچی سەرەتای زستان چونکە خەڵکەکەش لەوەوە دەهێنن و زیاتر اعتبار

الشهر إذا وصل إلى الابتداء والأخير لآخر الحلقة في الشهر ناقص إلا المائة

والثاني يليانهما يخرق في كل واحد خرق كأنه هلال لليلتين

وبعد بينهما على نقوش متصلتهما ثم يخرق الثاني يليانهما في كل

واحدة خرق كأنه هلال لثلاث ليال أقل تقعيرا ثم يخرق

الثاني يليانهما في كل واحد خرق لأربع ليال وأقل تقعيرا

ثم يخرق الثاني يليانهما وأقل تقعيرا في كل واحدة خرق لخمس

ليال وأقل تقعيرا وتجدهما على النسق ثم يخرق الثاني

يليانهما في كل واحد خرق لست ليال وأقل تقعيرا ثم يخرق

الثاني يليانهما في كل خرق نصف دائرة تجدهما على النسق

ثم يخرق الثاني يليانهما خرق في كل واحد خرق لثمان ليال

[illegible] على النسق كل

دائرتين يخرقان أكثر تحديبا حتى يصار بالكمال في الدائرتين

اللتين يليان الدائرة المخروقة كملا قمر . هلال أول

ليلة إلى الدائرة المخروقة كلا تماما أربع عشرة ليلة في الزيادة ومن بعد ما

في النقصان إلى سبع وعشرين ليلة ثم تنتهي الدائرة المسدودة بالليلتين

ومن

# وهذه صورة أظهر الأفلاك الثلاثة والقرص

مقسومة جميعا بأي ذكرنا من قبل اتصال بعضها ببعض



دەکەن نەك لە قوچی گەڕانەوەی سەری هاوین.

## قوچی سەرەتای زستان

ئەم قوچە دەکەوێتە تەنیشتی خواروی کەلێنێك لە بەینی دوو بەردا کە زۆر گەورە نین و بڵندییان (150سم) بەڵام کەلێنەکە لە مزگەوت کە جێگای روانینە باش دیارەو کەلێنێکی تری وەك ئەو لە شاخەکەدا لە مزگەوتەوە دیار نابێ.

ئەم قوچە نیشانەی گەڕانەوەی سەری زستانە «نقطة الانقلاب. الشتوي» چونکە لێرەدا (لەم کەلێنەدا) کوتایی بە پاییز دێت و خۆر دەگاتە خولگەی کارژەلە (مدار الجدي) کە خەتی پانی (خط العرض) (28, 23)° دەرەجەیەو ئەوەش لە ڕۆژی کانونی یەکەم دا خۆر دەگاتە ئەم نوقتەیەو کورت ترین ڕۆژەو دوا ڕۆژانی کەلوی کەوان «برج القوس»ە لە ڕۆژی دواییدا کە 21کانوونی یەکەم، خۆر دەکەوێتە کەلوی کارژەلە «برج الجدي» یانی ئەم قوچە نیشانەی ئەم کەلووەیەو یەکەم ڕۆژی زستانە. ئەوەی شایانی باسە کەلوی کارژەلە لە 28 ئەستێرە پێك دێت وەك لە کتێبی «صورة الكواكب الثمانية والأربعين» ل 222ی عبدالرحمن رازیدا نووسراوە.

## قوچی سەرەتای چلەی زستان:

لەپێشدا باسمان کرد قوچی گەلاوێژ دەبێتە نیشانەی ناوەڕاستی چلەی زستان و «قوچی بەهاری ـ قوچی رەزبرین» نیشانەی کۆتایی چلەی زستان و بەم حسابە دەبێ دروست کەری ڕوانگەو ساڵنامەی گراو سەرەتای چلەی لەبیرنەچوویی و دەبێ قوچێکی بۆ تەرخان کردبێ چونکە دیاری کردنی ئەوڵی چلە وەك ناوەڕاست و کۆتایی گرنگە ئەگەر گرنگتر نەبێ، سەرەتای چلەی زستانیش ڕۆژی «15» کانوونی دووەمە یانی دەبێ ئەم قوچە کە نەماوە دەکەوێتە نوقتەی ئاوابوونی خۆر لە ڕۆژی «14»ی ئەو مانگەدا، یانی دەکەوێتە باکووری قوچی کەلووی کارژەلە بە مەسافەی دووری (35م)و لە ژێر قوچی کەلووی دۆلکە بە «5» مەترێك.

## قوچی کەلوی دۆلکە «برج الدلو»

وەك لەپێشدا باسمان کرد ئەم قوچە نەمابوو بەڵام لە ڕۆژی دووی نیسانی 1984دا جێگەی ئەم قوچەم دۆزییەوەو دروستم کردووە لە مەسافەی «41م و30سم» لە باکوری قوچی سەرەتابی زستان لە ڕۆژی 19ی کانوونی دووەم، دەبێ خۆر لەسەر ئەم قوچەدا ئاوابێ کە دەبێتە کۆتایی ڕۆژەکانی کەلوی کارژەلە «برج الجدي»و نیشانەی کەلووی دۆلکە کە لە 20ی کانوونی دووەم ـ 18ی شوباتە بەڵام هەر دەبێ ڕوژ لە سەری ئاوابکرێ بۆ دلنیایی کەلووی دولکە لە 45 ئەستێرە دەگرێتە خۆی وەك لە «ل 231 لە صورة الكواكب الثمانية والاربعين»دا هاتووە.

## قوچی گەلاوێژ

بە (15م و50سم) دەکەوێتە سەرو قوچی کەلووی دولکەو 51م لە قوچی کەلوی کارژەلە دوورەو کاتێ چووین بۆ دۆزینەوەی ڕوانگەکە قوچەکە کەمێك ڕوخابوو دەوری بنەکەی (2م و53سم) بوو ئەم قوچە نیشانەی ئەستێرەی گەلاویژە یانی ئەم ئەستێرە گەشەی ئاسمان لەسەر ئەم قوچە ئاوادەبێ. لە شەوی 24/23ی نیسانی ئەم ساڵدا (1984) من لە مزگەوتی گراو چاودێری ئاوابوونی گەلاوێژم دەکرد تا بزانم بەتەواوی لەسەر نیشانگەکەیدا ئاوادەبێ یانا، بەراستی بینیم لە سەعات (11و37) دەقیقەدا لەسەر قوچەکە ئاوابوو «بە گوێرەی کاتی هاوین» یانی سەعات «10و37» دەقیقە بە گوێرەی کاتی جاران چونکە عیراق سەعاتێك لە بەهارو هاوین دا هێناوەتە

پێش واته پێش خستووه.

ئەستێرەی گەلاوێژ ئەستێرەی شیعرای یەمەنە «الشعری الیمانیة» لەعەرەبیدا چونکە لە هنداوی یەمەن ئاوا دەبێو گەشترە لە ئەستێرەی شیعرای شام «الشعری الشامیة»وە لە لای ئیغریقیەکان «اغریق» ئەستێرەی «سیروس»ە کە پەرستویانە.

گەلاوێژ ئەستێرەیەکە لە کۆمەڵە ئەستێرەی سەگی گەورە «الکلب الاکبر» بە گوێرەی ئەستێرەناسی نوێ گەلاوێژ لە هەموو ئەستێرەکانی «ثابت» نزیك تری گۆی زەوییەو 16 جار لە خۆر گەورەتـرە، هەروەهـا 26 جار لە خۆریش رووناکترە پلەی روناکی یەکەی «1/43 ـ» لە ژێر سفرەو لە ئەستێرنـاسی نوێدا یەك پلە، لە ژێـر (سفر) رووناکترە لە دوو پلەونیو لەسەر سفر.[6]

جا هەر کاتێ خۆر گەیشتە جێگای ئاوابوونی گەلاوێژو لەسەر قوچەکەیدا ئاوابوو بۆ 45 رۆژ لە زستان دەچێ کە دەکاتە رۆژی 5/ شباتێ «بەو رۆژە لە کوردەواریدا دەڵێن «شــەری خۆرو گەلاوێــژ» جا بە گوێـرەی روانگـە کوردی یەکەی گراو قوچی گەلاوێژ نیشانەی سێ کاتە:

1 ـ نیوەی وەرزی زستان.
2 ـ نیوەی چلەی زستان.
3 ـ نیــوەی وەرزی پایـز کە رۆژی (5)ی تشـرینی دوومـە ئەوەی شایـانی باســە نیشـانـەی وەرزی پایـزو زستـان لە «روانگەی باری»یشدا هەیە.

## قوچێکی نەناسراو

ئەم قوچە بە «4م» دەکەوێتە سەرووی قوچی گەلاوێژەوە لە پاڵ بەردێك دایە، بەرزییەکەی (85)سم و هەندێك لە سەرەکەی رووخاوە، تا ئێستا ئێمە نازانین بۆچییە؟...

## قوچی بازبەران (کەلوی نەهەنگ) برج الحوت

ئەم قوچــە بە (5م و20ســم) دەکــەوێتــە سەرو قوچی نەناسراوو «19م و 20سم»سەرو قوچی گەلاوێژ.

وەك لەپێشــدا باسمـان کرد خەڵکـەکـە لەوە زیـاتـریـان نەدەزانی کە کاتی خۆر دەگاتە ئەم قوچە خۆر بە خیرایی دەروا هەر رۆژی بە ئەنـدازەی بازی بەرانێـك چونکـە دنیـا بەرەو بەهـار دەرواو لەبـەر ئەمـە ناونـراوە «قـوچی بازبەران» بەڵام ئیمساڵ خەڵکی گراو بەتایبەتی حاجی حسن و کاك عثمــان قادر تەمــاشـای خۆریـان کردبـوو لە رۆژی (18) شوبات خۆر لەسەر ئەم قوچە ئاوابیوو بەمەدا بۆمان ئاشکرا دەبێ کە ئەم قوچــە نیشـانـەی کەلـووی نەهـەنگـە «بـرج الحوت» کە لە رۆژی (19)ی شوباتدا دەست پێ‌دەکات، ئەوەی شایانی باسە «بازبەران» لە حسابی کوردەواریدا لە ناوچەی هەولێرو سلیمانیدا هەیە بەڵام لە بارەی بازبەران جیاوازی هەیە هەروەها (بازبەران) کراوە بە ناوی مانگێك لە مانگـە کوردییـەکـان، کە مانگی رەشـەمییە، یانی ئەم مانگـەی کە خۆر دکـەوێتـە کەلـوی نەهەنگ هەر لەبەر ئەم مانایەی رابوردومان.

## قوچی بهارێ - قوچی رەزبرین

**کوتایی چلەی زستان.**
**حیسابی کوێستان و گەرمیان.**

ئەم قوچــە دەکــەوێتــە سەرو (قــوچی بازبــەران) بە (18م و50سم)وە (175سم) بلندەو دەوری بنەکەی (4م و50سم)ە.

دوو ناوی هەیــە دەڵـێـن «قــوچی بهــارێ»و «قــوچی رەزبرین»و ئەم سێ مانایە دەبەخشێ:

1 ـ کوتـایی چلەی زستــان چونکـە بەگـوێـری روانین (ارصــاد)ی ئەم ساڵـەمـان (سـالی 1984) لە رۆژی 24 شوبـات خۆر گەهیـوەتـە (گـەییشتۆتە) سەری وە باسیشمان کرد کە (قـوچی گەلاوێـژ) نیشـانـەی نیـوەی چلەیـەو دەبێ

بزانین مەسەلەی چلەی زستان لە کوردەواری‌دا گرنگ بووە لە حیسابی ساڵداو حیسابداره کوردەکان رۆژ بە رۆژ یان حساب دەکردو نیشانەی دەستکردە، ویان نیشانەی سروشتی وەك لوتکەشاخ و بەرد، یان کەلێنەبەرد، ویان درەختیان دەکردە نیشانەی سەرەتاو ناوەراست و کوتایی چلە، چونکە کورد، لە چلەی زستان دا بەتایبەتی جاران زۆر سەغلەت دەبون لەبەر بەفرو سەرماو زۆر جار رێگەی هاتوچوکردن لەبەینی گوندەکان و بەینی گوندوشار دەهاتە گیران لەبەر بەفر، مەرو مالاتیان لە برسا توشی سەغلەتی دەبوو.

2 ـ هەروها ئەم قوچە کراوەتە نیشانەی کاتی رەزبرین کە مانایەکی ئابوری کشتوکاڵ دەبەخشێ وەك لە دواییدا باشتر باسی لێ دەکەین.

3 ـ حیسابی کوێستان و گەرمیان.

لە حیسابی کوردەواری‌دا ناوچەکانی کوێستان و گەرمیان لەیەك جیاکراونەتەوە، چونکە بە گوێری ئاوو هەوای ناوخویی بەهاری ناوچەکانی گەرم زووتر دەستی پێ‌دەکرد، لە بەهاری ناوچە کوێستانیەکان ویان بڵێین ناوچە شاخاوی‌یە بەرزەکان، هەروەك زستانی ناوچە کوێستانیەکان زووتر دەستی پێ‌دەکردو لە هەندێك ناوچەکانی کوردستان دا بەم حیسابەش گوتراوە «حیسابی لەیلاخ و گەرمیان» لەم بارەوە هەندێك زانیاری هاتووە لە ووتاری (بورجەکانی ساڵ) لە نامیلکەی «سرنجیك لە دەروازەی فولکلوری کوردی»ل 118و 122 لەم سەرچاوەیەدا واهاتووە، کە (ژمێرەی لەیلاخ یانی کوێستان 20 ـ 22 رۆژ پێش ژمێرەی فارسەوە دەست پێ‌دەکا بەڵام ژمێرەی گەرمیان (15) رۆژ لە پێش ژمێرەی فارسەوەیە) یان پینج تاحەوت رۆژ بەینی کوێستان و گەرمیان فەرقیان هەیە ئەمەش دەبێ بە گوێری وەرزی زستان بێ یانی زستانی ناوچە کوێستانیەکان (لەیلاخ) لەپیش ناوچە گەرمیەکان دێت هەروەها لەم سەرچاوەیەدا واهاتووە کە سەری ساڵی گەرمیان (15) رۆژ پێش سەری ساڵی (گلەزەردە)یەو سەری ساڵی گلەزەردەش چوار رۆژ پێش سەری ساڵی (بارێ)یە.

بە گوێری لێکۆڵینەی خوم سەری ساڵی گلەزەردە (14)ی ئاداره کە دەکاتە ئەوەڵی ساڵی حیسابی رومی‌و سەری ساڵی بارێ (17)ی ئاداره.

یانی سەری ساڵی گەرمیان دەبێ لە 28 شوبات دا بێ‌و ئەمەش زۆر نیزیکی سەری ساڵی گەرمیانە، بە گوێرەی روانگەی گراو یانی بە گوێری (قوچی بهارێ) کە رۆژی 25 شوباتە، یانی بەینیان سێ رۆژە.

رۆژی یەکەم کە چوم بۆ گراو لەسەر بانی مزگەوت بەرامبەری قوچەکانی روانگەکە لە شارەزاکانی گراوم پرسی: چۆن دەبێ ئەم قوچە نیشانەی بهار بێ لە کاتێك دا ئێوە دەڵێن بهارمان (تەرازوو)ە یانی 21 ئاداره؟ گوتیان ئەم قوچە نیشانەی سەرەتای بهاری (قەراج)و دەشتی هەولێرە (یانی زنجیرە شاخی قەرەچوخ کە بەرزییەکەی (798م)ە دەکەوێتە پشت شاری مەخموری قەزای هەولێر (اربیل)و بە مەسافەی دووری (67کم) لە باشوری خۆرئاوای هەولێر).

هەروەها گوتیان ئەم قوچە نیشانەی بەهاری ناوچە دەشتاویەکانە بەڵام (تەرازوو) نیشانەی بەهاری «کێلەشین»و ناوچە شاخاویەکانە، دیسان گوتیان گراویش سەر بە (کیلەشین)ە.

مەبەستیان لەو کێلەشینە کوێستانەیە کە کەوتووەتە بەشی باکوری رۆژهەلاَت لەناوچەی رەواندز کە شوێنەوارێکی کۆنەشە جا دیارە ئەم قوچەی روانگەکە کراوەتە نیشانەی «حیسابی گەرمیان» لە «حیسابی کوێستان و گەرمیان»ی کوردەواری یانی نیشانەی بەهاری ناوچە گەرمیەکانی کوردستانی باشوری‌یە کە دەکەوێتە نێوبەینی زنجیرە شاخەکانی (زاگروس)و روباری (دیجلە) وەك دەشتەکانی هەولێرو کەرکوك و حەمرین و خانەقین و هەروەها ناوچەی شاخاوی پێل دار کە دەکەوێتە پشت شاخەکانی قەرەداغ تا کوفری‌و طوز خورماتو و دەقوقا وهەروەها دەشتە کوردیەکانی خارو زنجیرە شاخەکانی (تورس)و رۆژئاوای روباری دیجلە وباکوری روباری فورات وەك دەشتەکانی جزیرا بوتان و

نسیبین و ماردین و ئورفاو دیاربەکرو ئەدیەمان و عینتاب و مەرەش کە بەنسبەت ناوچە شاخاویەکانی کوردستان و ئاووهەوایی ناوخوییەوە گەرمیانن.

## قوچەکانی تەرازوو «المیزان»

قوچەکانی تەرازوو سێ قوچەو هەرسێکیان ساغ بوون و دەکەونە ئەو جێگا تەختاوییەی ناوەڕاستی شاخەکە.

أ ـ بەینی لەگەڵ (قوچی بەهاری ـ قوچی ڕەزبەرین) 52م و40 سم، بڵندی قوچەکە «2م و 20سم» دووری بنەکەی «4م و 35سم»ە خەڵك دەڵێن خۆر بە خێراخیرا دێت لە مەسافەی مابەینی ئەم قوچەو (قوچی بەهاری).

ب ـ قوچی دووەم بە (5م و 30سم) لە قوچی یەکەمی تەرازوو دوورەو بڵندایەتی (2م و 20سم)ە، دووری بنەکەی (4م و 74سم)ە.

جـ ـ قوچی سێیەم بە (4م و 70سم) لەگەڵ هی دووەم دوورە، بەرزییەکەی (1م و 50سم)و دووری بنەکەی (4م و 70سم)ە.

## قوچی سێیەمی تەرازوو

لە ڕاستیدا ئەم قوچە یەکەمین نیشانگەرەکانی ڕوانگەکەیە چونکە نیشانەی یەکەمین دوازدە بورجەکانی فەلەکی ئاسمانە کە کەلووی کاورە «برج الحمل» کە نیشانەی سەرەتای ساڵەکە «21 ئازارە» «ڕۆژی نەورۆزە» ئەم قوچە لەسەر خاڵی یەکتربڕین «دائرة معدل النهار» دانراوە کە لە فەلەکیاتی ئیسلامیدا پێیدەڵێن «الفلك المستقیم» لەگەڵ خاڵی «دائرة البروج» ولە (هنداوی) خەتی ئیستیوائی ئەرزی ئەم نوقتەیە لە دەست پێکردنی هێلی درێژی ئاسمان (خطوط الطول السماویة) مقابل گرینویچ لە دەست پێکردنی (خطوط الطول علی الارض)و بەم نوقتەیە دەڵێن «نقطة الاعتدال الربیعی» وەهەروەها ئەم نوقتەیە زەبتی گۆشەی کات ژمێری «الزاویە الساعیە» دەکا بەنیسبەت هەرئەستێرەیێك شەو و ڕۆژ لەسەر ئەم قوچە بەرامبەر یەك دەبن بێکەم و زیاد چونکە «میل الشمس» لە سەر قوچەکە سفرە لە ڕۆژی (12 ئازاردا) دوایی وورده وورده کە خۆر بەرەو باکور دەچێ ڕۆژ زیاد دەکا وشەو کورت دەبێ تا دەگاتە قوچی گەڕانەوەی سەری هاوین، یانی دەگاتە (مدار السرطان) ویان بڵێین کەلوی قرژاڵ (برج السرطان) لە ڕۆژی 12 حوزیران کە درێژترین ڕۆژەو ئیتر وورده وورده خۆر بەرەو باشوور دەگەڕێتەوە تا جارێکیتر دەگاتە سەر (خط معدل النهار) یانی سەر ئەم قوچەی سێیەمینی تەرازوو کە ئەم جارە دەبێتە «نقطة الاعتدال الخریف» لە ڕۆژی 12 ئەیلول دا کەشەوو ڕۆژ بەرامبەر یەك دەبن کە ڕۆژ سەری دەگاتە کەلووی تەرازوو «برج المیزان» کەسەرەتای پاییزە دوایی دیسان ڕۆژ کورت دەبێو شەو درێژ دەبێ تا ڕۆژ دەگاتە قوچی سەرەتای زستان یانی کەلووی کارژەلە «برج جدي» هەروەها هەر ئەم قوچە نیشانەی «نقطة الاعتدال الخریفی»یە بەڵام بەگوێرەی «الشکل الظاهر»ی ڕوانگە یانی چونیەتی قوچەکانی لەسەر شاخەکە نەك بەشێوەی وەزعیەتی بورجەکان لە «دائرة البروج»ی فەلەکیدا وەکو لە پێشا باسمان کرد، قوچەکانی تەرازوو نیشانەی ئەم سێ شتانەیە:

أ ـ ئەستێرەکانی تەرازوو یانی سێ ئەستێرەی پێشووی هەر ئەستێرەیەك لەسەر یەکێك لەم سێ قوچانەدا ئاوادەبێ بۆ دڵنیای ئەمە شەوی 4/3 نیسانی ڕابووردو لە مزگەوتی گراو چاودێری ئاوابوونی ئەستێرەی تەرازوم کرد لەسەر ئاسۆی شاخەکەدا لە سەعات «10 و 45» دەقیقەدا لەسەر قوچەکان ئاوابوو ئەمەش بە تەوقیتی هاوین کە سەعاتێك هاتووەتە پێش یانی لە سەعات «9 و 45» دقیقەدا.

ب ـ نیشانەی بورجی تەرازووە «برج المیزان» کە «17» ئەستێرە دەگرێتە خۆی وەك لە «ل 198 من صورة الکواکب الثمانیه والاربعین» دا هاتووە.

جـ ـ نیشانەی بورجی کاوڕ «برج الحمل»ەوئەم کەلووە «18» ئەستێرەیە.

خەڵکی گراو دەڵێن جاران ناوی (نەوروز) لە لامان نەبو بەلکو لە باتیٚ ئەو (تەرازوو)مان بە کاردەهێنا دەمان گوت خۆر گەیشتە تەرازوو وە بۆ سەرەتای بەهارو بەهارمان تەرازوو بووە هەروەها مامۆستا مەلا مستەفای بێلنگەیش کە تەمەنی دەوری «80» ساڵەو زانایێکی باشە دەڵی بەهاری بێلنگە «تەرازوو»ە نەك نەوروز بێلنگەش دەکەوێتە ناوچەی هیران لە خۆشناوەتی بەلای بتوێنەوە.

لە «کانی توو»ش هەربەم شێوەیە کە جێگایەك لە شاخی هێلانەقەلی کانیتوو دەست نیشان کراوە بۆ تەرازوو بەلکو لە ناوچەی قەندیلیش هەرحسابی بەهارو پایز بەتەرازووە یانی ناوی تەرازوو هەبوو ناوی نەوروزیان بە کار نەدەهێنا.

## شەڕی ڕۆژو تەرازوو

لە حسابی کوردەواریدا ئەم پەندی «شەری ڕۆژ و تەرازووە» بەناوبانگە بەو ڕۆژانە دەڵێن کە خۆر دەگاتە سەرەتای تەرازوو تا ئەوپەریتری تەرازوو کە بریتییە لە چەند ڕۆژێك یانی هەروەك ئەوەی خۆر حەز بکات لە تەرازوو تێپەر ببێت و تەرازوو نایەڵێت بە گوێرەی تەماشاکردنی ئیمساڵی ڕوانگەی گراو یانی «ساڵی 1984» خۆر حەوت ڕۆژ لە تەرازوودا مایەوە یانی ڕۆژی «14» ئادار خۆر گەیشتە قوچی یەکەمی تەرازوو وڕۆژی «20»ی گەیشتە قوچی سێیەمی یانی بەحەوت ڕوژ قوچەکانی سێ ئەستێرەی تەرازوو دەبڕێ کەدرێژییان (14م)ە بەلام لە کانیتوو دەڵێن ڕوژ نۆ ڕوژی لە تەرازوودا دەمێنی ماموستا مەلا مستەفاش دەڵێ: تەرازوو نۆ ڕۆژە چوار لە زستانەو چوار ڕۆژ لە بەهارە و حیسابدارەکان ئەو ڕۆژەی تریش دەدەنە پاڵ زستان یانی پێنج ڕۆژی زستانەو چواری بەهارە. بەرێز مەلا احمدی سەردڕەیی لە (ساڵنامەی کورپاشا)دا دەڵێ شەڕی ڕۆژ و تەرازوو سێ ڕۆژە و لە 17 ئادارەوەیش حیسابی کردووە یانی خۆر سێ لە تەرازوودا دەمێنی بەلام ئەمە هەڵەیە چونکە ئەگەر سێ ڕوژ بێ دەبێ لە 18 ئادارەوەبێ نەك حەڤدەوە بێ. دوور نیە ئەم جیاوازییە لە مانەوەی خۆر لە تەرازوودا لە دوررو نیزیکی نیشانگرەکانی تەرازوو پەیدا بووە، لە جێگای تەماشاکردن (مکان الرصد) کە لە چەند ناوچەیێك دا هەبووە لە کوردستان وەك کەلیخان و کانیتوو گراو.

ئەوەی شایانی باسە سێ قوچی تەرازوو لەنێو ڕوانگەو ساڵنامەی (باری)ش دا هەیە تا ئەو گردەی ڕوانگە کە لەسەریەتی ناوی تەرازووی لێ کراوەو پێ دەڵێن «گردی تەرازوو»و زانیاریەکی باشمان لەم بارەوە وەرگرتووە بەتایبەتی لە غەفور ئاغای باری و دورنیە ئەم ڕەوانگەیەش ڕێك بێ لەگەڵ هی گراو)دا.

## حیسابی رومی

خەلکی گراو باسی حیسابی ڕۆمیش دەکەن من کە دەربارەی (قوچی بهاری، قوچی ڕەزبرین)م لێیان پرسی هیندێکیان گوتیان نیشانەی بهاری دەشتی هەولێرو (قەڕاج)ە و نیشانەی حیسابی رومییەش، گوتیان باسی حیسابی ڕۆمیش لە نێو ئێمەدا هەبووەو لە گراو زانراوە. بەلام ئێستا کە حیسابداری باش لە گراو نەماوە پاش حاجی ئیسماعیلی حەمەدی مام عەبابی کەس بەسەر نیشانگرەی حیسابی ڕومییەوە هەڵنایێ لە نێو ڕوانگەکەدا، من دەڵێم ئەگەر هەبوبێ دەبێ نیشانەکەی قوچی یەکەمی تەرازوبێ چونکە بەتەماشاکردنی ئیمساڵمان یانی ساڵی (1985)و ساڵی پاریش لە ڕۆژی 13 /ئادار خۆر لەسەر ئەم قوچەدا ئاوابوو، وەها بەم شێوەیە دەبێتە نیشانەی حیسابی رومی چونکە ڕۆژی دوایی یانی ڕۆژی 14 ئادار سەری ساڵی رومی خۆرهەلاتە. من لەو قەناعەتەدام کە ئەم قوچەی یەکەمینی تەرازوو کراوتە نیشانەی سەری ساڵی ڕومیو بیبری خەلکی ئێستا نەماوە لەبەر ئەمە هیندێکیان

دەیان گوت قوچی بهاریّ نیشانەی حیسابی رومی‌یە

## قوچی کەلوی (گا)و کەلوی فەریك

(برج الثور وبرج السنبلة)

ئەم قوچە لە نێو روانگەکەدا نەمابوو چونکە لە کاتێك دا لەناوچووە لەبەر ئەمە لە رۆژی 22 ئابی 1984 چووم بو گراو و ئەم قوچەم دروست کرد لە نوقتەی (63م و 50سم)دا سەرو قوچی سێیەمی تەرازوو و (27م) خارووی (قوچی داری لولکان): چوار قوتابی خەڵکی گراوم نارده سەر شاخەکە و خوّم لە مزگەوت لە جێگای روانین مامەوەو لەگەڵ زوّر کەس لە خەڵکی دێیەکەدا تەماشای ئاوابوونی خوّرمان دەکرد بە ئیشارەت و بە بانگ کردن وامان کرد کە یەکێکیان لە نوقتەی ئاوابوونی خوّر لەسەر ئاسوّی شاخەکەدا بوەستێ کە ئاوابوو، هەروەك ئەو کەسە لە نێو «قرص»ی خوّردا وەستابێ ووتمان بەرد لەوی دابنێن و قوچ دروست بکەن، ئەوسا چووم بوّ لایان و قوچمان بلند کردەوە بە بەرد بە بێ ئەوەی کە هیچ قورو گەچ بەکاربهێنین ، وەك قوچەکانی ئەسلی کە بەم شێوەیەن وە چەند وێنەیەکی ئەوانم گرت لە کاتی دروست کردنی قوچەکەدا بوّئەوەی ئەو قوچە لە هاتنەوەی خوّردا ببێتە نیشانەی کەلووی گا «برج الثور»، چونکە خوّر لە (20) یا (21)ی نیسانەوە تا (21)ی ئایار بەحسێبی کەلووەکان لەسەر ئەم کەلووە دەبێ. هەمان قووچ لە گەرانەوەی خوّردا لە خولگەی قرژال (مدار السرطان)ەوە بوّ خولگەی کارژوّلە (مدار الجدي) دەبێتە نیشانەی فەریك (برج السنبلة) کە لە ئەستێرەناسیی ئیسلامیدا پێ‌دەڵێن کەلووی کچ (برج العذراء)ش، چونکە خوّر لە (22)یا (23)ی ئابەوەتا (21) یا (22)ی ئەیلوول دەکەوێتە ئەم کەلووەوە. دەبێ ئەوەش بزانین کە سەرچاوەکان لە رووی دەست پێکردن و کوّتایی هاتنی کەلووەکانەوە جیاوازییان لە نێواندا هەیە. شایانی باسە چەند مەترێك لە نێزیك ئەو جێگەیەوە کە ئەم قووچەمان تێدا دروست کردەوە دوو بناخە هەن یەکێکیان لەبەر ئەوەی کە رێکوپێکەو بەردەکانی لە هیی دیواری خانوو دەچێ بەلامانەوە گرینگە. بەڵام هێشتا ناتوانین بڵێین ئەوانە هیی چین و پێویستە لە داهاتوودا لێیان بکوّڵدرێتەوە.

## قووچی داری لولکان

ئەو قووچە نیشانەی نیوەی وەرزی بەهارو نیوەی وەرزی هاوینیشە. ئەم قووچە وا دیارە زوو رووخاوە، بوّیە خەڵکی گراو داربەروویێکی نێزیك قووچەکەیان کردووە بەنیشانە، جا ئیتر ئەوە دوو سەد ساڵێك لەمەوبەر یا زیاتر بووبێ بەڵکوو دوور نییە زیاتریش بێ‌چونکە شاخەکە بە ناوی ئەو داربەرووەوە ناونراوە (شاخی داری لولکان). پاشتر لە بیری خەڵك چووەتەوە، کە ئەوە نیشانەی نیوەی هەردوو بەهارو هاوینەو، تەنیا بە نیشانەی (خاکەلێوەی بەهار)یان داناوە. ئەو کاتە ئازووخەو تفاقی کوّن کەم بووەو باری ئابووری نارەحەت بووەو خەڵك جوّرە شوّربایێکی ئاردیان دروست کردووە کە پێیان گوتووە «شوّربای لولکان». هەروەها خەڵك ئەو قووچەیان کردووە بەنیشانەی هەڵاتنی ئەستێرەی گەلاوێژ لە هاویندا، ئیتر بەوەدا بوّم دەرکەوت کە ئەو داربەرووە نیشانەی نیوەی دوو وەرزی بەهارو هاوینە، واتە خوّر لە (5)ی ئایارو (5)ی ئابدا دەگاتە ئەو جێگەیە. رەنگە لەکاتی پێك هێنانی روانگەکەدا ئەو داربەرووە هەبووبێ‌و کرابێتە نیشانگرێك و، ئیدی دانانی قووچەبەرد لەو شوێنەدا پێویست نەبووبێ. لەم چەند ساڵەی پێشوودا دارەکە وشك بووەو خەڵکەکەش دارکاژ (سنوّبەر)ێکیان لە جێدا رواندەوە، بەڵام ئەویش خوّی نەگرتووەو زوو وشك بووە. داوام لە خەڵکی گراو کرد لە رۆژی (4)ی ئایاری 1984دا چاودێریی خوّربکەن و هاتە سەر هەر جێگەیێك قووچێکی لێ دروست بکەن، ئەوانیش داخوازەکەیان جێ‌بەجێ‌کرد. ئەوەم بوّ ئەوە بوو، چونکە رۆژی (5)ی ئایار نیوەی وەرزی بەهارە ئەگەر وەك خەڵکی گراو دەڵێن

سەرەتای هەر وەرزێك لە ڕۆژی (21)ەوە دەست پێ بکا. بەڵام ئەمە قابیلی دوو ڕۆژ دواخستنە. ئەوەی شایانی باسە هەمان قوچ لەنێو ڕوانگەو ساڵنامەی (بارێ) ش داهەیە.

قووچی داری لولکان بە دووریی (91) مەتر دەکەوێتە سەرووی قوچی سێیەمی تەرازووەوەو بە دووریی (47) مەتریش دەکەوێتە خواررووی قووچی گەڕانەوەی سەری هاوینەوە.

بەینی لەگەڵ قوچی کەلوی گادا (27م)ە.

## قووچی کەلووی «جوزاء»و کەلووی شێر (برج الأسد)

ئەم قووچە شوێنەواری نەمابوو، بۆیە ڕۆژی (21) ئایار من کە لە گەڕانێکی بەلگەنامە (الوثائق)دابوم لەکرکوك چووم بۆ دێی گراوو سەرلەنوێ قوچەکەم دروست کردەوەو، شێوە دروستکردنەوەکەشی لە هیی قووچی کەلووی گا و کەلووی فەریك دەچێت. کەلووی (جوزاء) لە ئەستیرەناسیی ئیسلامیدا پێشی دەڵێن (جیوك) (التوأمان) چونکە لە کۆنەوە وێنەی کورو کچێکی بۆ بەخەیاڵ وێنە کێشراوە. ڕۆژی (22)یا (21) ئایار خۆر دەکەوێتە ئەم کەلووەوە کە سێیەمین کەلووی بەهارە. ئەم قوچە لە گەڕانەوەی خۆردا دەبێتە نیشانەی کەلووی شێر (الأسد) کە کەلووی دووەمی هاوینە. چونکە خۆر لە ڕۆژی (23)ی تەموزدا دەگاتە سەر ئەم کەلووە. ئەم قوچە (16) مەتر وا لە خواررووی قووچی گەڕانەوەی سەری هاوینەوەو یانی (16) مەتریش دورە لە نێزیك خاڵی کۆتاییی ڕوانگەکەوە. بەینی ئەم قوچە لەگەڵ قوچی داری لولکان (27م).

## قووچی گەڕانەوەی سەری هاوین (برج السرطان)

ئەم قووچە ئەگەرچی هێندێکی لێ ڕووخابوو بەڵام (80) سانتیمەتر لە بەرزاییەکەی مابووەوەو دەوری بنکەکەی (2,46) مەتربوو (27) مەتر لە قووچی جەوزاء دوورە.

ئەم نیشانگرە کەلووی قرژاڵ (برج السرطان)ە کە بریتییە لە (13) ئەستێرە. ڕۆژی (20) حوزەیران کە درێژترین ڕۆژی ساڵە، خۆر دەگاتە ئەم قووچەو چیتر بەلای باکوورەوە ناچێ. واتە خۆر دەگاتە سەر هێڵی پانیی (23,5)پلە کە خولگەی قرژاڵە (مدار السرطان)و ئەمجا بەرەو باشوور دەگەڕێتەوە. ڕۆژی (21) حوزەیران سەرەتای هاوینە. بۆیە خەڵکی گراو بەم قووچە دەڵێن «قووچی گەڕانەوەی سەری هاوین» یانی «نقطة الانقلاب الصيفي». دیارە دروستکەری ئەم ساڵنامەیە ئەو ناوە وردو زانستییەی لەم قووچە ناوەکە (اشارة بداية الانقلاب الصيفي) دەگرێتەوە.

## ئەستێرەی «پێروو»و ئەم قووچە

قووچی گەڕانەوەی سەری هاوین ڕاستەوڕاست بەناوی ئەستێرەی پێروو (کۆ) (ثریا)ەوە دەست نیشان نەکراوە، بەڵام وەك لەپێشەوە گوتمان نیشانەی جیێ ئاوابوونیەتی.

جاوەك خەڵکی گراویش دەڵێن کە خۆر دەگاتە جێگەی پێروو دەبێتە سەرەتای هاوین.. بۆ دڵنیابوونم لەوە شەوی (24/23)ی نیسانی 1984 لە مزگەوتی گراوەوە چاو دێریی ئاوابوونی ئەستێرەی پێرووم کرد، بینیم سەعات (10)ی شەو بەپێی سەعاتی هاوینە لەسەر ئەم قووچە اوابوو. شارەزایانی گراو دەڵێن شەوی (21/20)ی کانوونی یەکەم پێروو لەسەر قووچی گەڕانەوەی سەری هاوین ئاوادەبێ و، خۆریش لە ئێوارەی ئەو شەوەدا لەسەر قووچی سەرەتای زستان ئاوادەبێ. واتە پێروو لەم سەری ڕوانگەکەو خۆر لەو سەریتری و، ئەم شەوەش سەرەتای زستانە. ئەوەیە ڕاستیی ئەوە کە دەڵێن: «ئاوابوونی پێروو لە قووچی سەری زستاندایە».

مەبەستیان لەوەیە کە لەم شەوەدا پێروو بۆیەکەمین جار ئاوادەبێ، چونکە پێش شەوی (20)ی کانوونی یەکەم

پێروو هیچ شەوێك ئاوابێ، بەڵکە هەر بە ئاسمانەوە دەبێ و دەمێنێتەوە تاکوو بەیانی. بەڵام پاش ئەو شەوە پێروو هەموو شەوێك ئاوا دەبێ و تا بەیانی نامێنێتەوە، تا بە یەکجارەکی ئاوا دەبێ و ئیتر هیچ شەوێك دەرناکەوێت. حسێبداری کورد مەلا عومەری ڕەنجووریی شالەبەگی لە (ڕۆژنامە) کەیدا دەڵێت: - «پێروو بۆماوەی چل شەوی تەواو، واتە لە شەوی (14)ی نیسانەوە بۆ (22)ی ئایار، ئاوادەبێ و دەرناکەوێت تا لەم شەوەی دواییاندا هەڵدێتەوە». بەڵام خەڵکی ناوچەی قەندیل دەڵێن پێروو لە (2)ی حوزەیراندا هەڵدێت.

شایانی باسە کە پێروو (کۆ) حەوت ئەستێرەیەو وەك هێشووەترێ دەردەکەوێ و لە کۆمەڵەی ئەستێرەکانی گا (الثور)یەوە، پلەی ڕووناکییێکەی لە پۆلی (5)ەو (23,410) ساڵی ڕووناکی لە زەوییەوە دوورە.

## گەڕانەوەی خۆر

ئەوەی باس کرا، هاتنەوەی خۆر بوو لە قووچی سەرەتای زستانەوە بۆ قووچی گەڕانەوەی سەری هاوین، واتە هاتنی خۆر لە خولگەی کارژەلە (مدار الجدي)وە بۆ خولگەی قرژاڵ (مدار السرطان). چونکە یەکەم خولگەی کارژەلەو قووچی دواهەمین خولگەی قرژاڵ پێشان دەدەن. هاتنەوەی خۆر شەش مانگی ڕەبەق دەخایێنێ، سێ مانگی زستان و سێ مانگی بەهار. گەڕانەوەی خۆریش بەسەر نیشانگرەکانی ساڵنامەکەدا لە قووچی گەڕانەوەی سەری هاوینەوە تا قووچی سەرەتای زستان شەش مانگە دەگرێتەوە، سێ مانگی هاوین و سێ مانگی پاییز. کاتێك خۆر دەگاتە قووچی داری لولکا دەبێتە نیوەی هاوین کە ڕێکەوتی (5)ی ئابە. کاتێك دەگاتە قووچی سێیەمی تەرازوو دەبێتە سەرەتای پاییز کە ڕێکەوتی (21)ی ئەیلولە. لە قووچی گەلاوێژدا دەبێتە نیوەی پاییز کە ڕێکەوتی (5) تەشرینی دووهەمە. کە گەیشتە قووچی سەرەتای زستان لە ڕۆژی (20)ی کانوونی یەکەمدا شەش مانگە کە تەواو دەبێ و ڕۆژی دوایی سەرەتای زستان دەست پێ دەکات. بیستەمین ڕۆژی مانگەکان کە کۆتایی وەرزەکانی ساڵە. خۆر دەگاتە سەر قووچەکان و ڕۆژی دواییش دەبێتە سەرەتای وەرزەکان. بەڵام هەندێك ساڵ وەك یەك نیە بەڵکو پێویستە چەند ساڵێك تەماشای ڕۆژ بکرێ تا بزانرێ ئەو فەرقەی بەینی ڕۆژی 20 - 23 چۆنە لەدواییشدا باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین.

## سوود وەرگرتن لە ساڵنامەکە بۆ ئامانجیتر

خەڵکی گراو جگە لە زانینی کاتەکانی ساڵ کەڵکیتریان لە ڕوانگەکە بینیوەو بەستوویانەتەوە بە باری ئابوورییانەوە کە بە زۆری کشتوکاڵ دەگرێتەوە، لەوانە کاتی ڕەز برین. کاتێك خۆر لەسەر (قووچی ڕەزبرین) ئاوادەبێ، خەڵك دەست بە برینی ڕەز دەکەن، ئەوەش ڕێکەوتی (25)ی ئادارە. ئاشکرایە ڕەز لە ناوچە شاخاوییەکاندا دەورێکی گرنگی لە ژیانی ئابووریی کوردەواریدا هەیە. دێی واهەیە زۆربەی گوزەرانەکەی لەسەر ڕەزە، وەك گراو لە سەردەمی ڕابردوودا، چونکە ڕەزێکی فرەی هەیە.

خەڵکی گراو دەڵێن گەرچی ئێمە لەم کاتەدا دەکەوینە ڕەزبرین، بەڵام سەرەڕای ئەوە گوتەیێکی بە نرخ لە نێوماندا بڵاوە دەڵێت: - **«هەر ڕەزەکی خۆشت دەوێ باوێژە پاش تەرازووێ»**.

واتە کە خۆر لە تەرازوو تێپەڕبوو - پاش (20)ی ئادار - ئەو دەمە ڕەزبرین باشترە خەڵکەکەش دەڵێن ئەگەر پێش تەرازوو ڕەزنەبرین فریاناکەوین و دوادەکەوین لەبەر ئەوە کە خۆر دەگاتە قووچی ڕەزبرین (قووچی بەهارێ) ڕەزبرین دەست پێ دەکات.

## هەڵاتنی ئەستێرەی گەلاوێژ

هەڵهاتنی ئەستێرەی گەلاوێژ بەلای ئێمەی کوردەوە

بایەخدارە، چونکە هەر پاش ئەوە گەرمای هاوین دەشکێ و دنیا فێنك دەبێ و ترێش لە ناوچە شاخاوییەکان پێ دەگات و دەخورێت.

هەروەهــا کە گەلاوێــژ هەڵـدێت خەڵـك گەنم و جۆ، دەچێنن. بۆیـە کوردو بەتـایبـەت حسێبـدارەکان چاوەڕوانی هەڵهاتنەکەی دەکەن. بە پێی ئەم ڕوانگەیە، قووچی داری لولکــان نیشــانـەی دەرکـەوتنی گەلاوێـژە لە پشت چیـای (سەفین)ەوە، وەك چۆن نیشانەی نیوەی وەرزی هاوینە.

## پەڵە کەوتن

کاتێــك باران بە ئەنــدازەیێــك ببـارێت کە زەوی تەڕو پاراوبکــات و بە کەڵـکی شیـن بوونـی گەنـم و جۆ بێ، پێیدەڵێن (حـەقـە پەڵـە). بە گوێـرەی ساڵنـامـەکـە، (5 ـ 10)ی تەشــرینــی دووەم کە خۆر لە قووچـی گەلاوێــژدا دەبێ، ئەو دەمە وەختی پەڵە کەوتنە. چونکە لە (5)ی ئەو مانگــەدا خۆر لە گەرانـەوەیـدا دەگـاتـە قووچی گەلاوێـژ. بێ گــومــان ئەم کات دەست نیشــانکــردنــە بۆ زۆربـەی ساڵـەکـانـەو، ئاشکـرایشە کە هێندێك ساڵ باران پێش یان پاش دەکەوێ.

دوورنییە ئەم مەسەلەی پەڵە کەوتنە هەروەکوو ڕەزبرینەکە لە دانـانی ئەو زانـا ئەستێـرەناسە بێ کە ساڵنامەکەی ئامادە کردووە. پاشتـر دووجـار بە هۆی بەڕێـز کاك قادر عوسمـان قادری گراوییـەوە لەم کاتی پەڵـە کەوتنـە دڵنیا کراومەتەوەو هەمـان وەڵامی داومـەوە، ئەویش بە ڕاوەرگـرتنی پیـرەمێردە شارەزاکـانی ئەم دێیـە. لە شاربـاژێـرو دەوروبەری وشەی (پەڵەدان) بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێنن.

## سەرمای پیرەژن (برد العجوز)

کاتی هاتنی سەرمـای پیـرەژن لە کوردەواریـدا، بە پێی ئاوو هەوای کوردستــان، پاش سەرمـای زستـانـە. هەمـوو ساڵێــك لەم سەروەختــەدا بایێکی بە هێـزو سارد بۆ ماوەی چەنـد ڕۆژێـك هەڵـدەکـات کە بە کرمانجی باکوور (بایێ زیپا)ی پێ دەڵێن، کە خۆر دەگاتە سێ قووچی ئەستێرەکانی تەرازووی ئەم ڕوانــگــەیــە سەرمــای پیــرەژن دەســت پێ دەکات، ئەویش وەك خەڵکی گراو دەڵێن و ئاشکرایە لەلایان.

## خاکەلێوە

وەك باس کرا. خەڵکەکە نیشانگرێکی ئەم ڕوانگەیە کە داری لولکـایـە بە نیشـانـەی خاکـەلێـوە (ئاخلیفە)ی بەهار دادەنێن. لە ڕۆژی (5)ی ئاياردا خۆر دەگاتە سەر ئەم قووچە.

## بەربوون و زایینی حەیوانە کێوی

خەڵــك کاتی بەربـوونی (حـەیـوانـە کێـوی) کە دەمی ڕاووشکارە بە ساڵنامەکەوە دەبەستنەوەو، دەڵێن کە خۆر لە گەرانـەوەکـەیـدا گەیشتـەوە قووچی یەکـەمی ڕوانگەکە ئەوە کاتی بەربــوونی «واتـە: گوهنیـری»ی حەیـوانـە کێـوییـەو ڕێکــەوتی شەوی (21/20)ی کانــوونی یەکــەم دەبێ و، ڕاوکـەر (نێچیـرڤـان) دەچێ بۆ ڕاوکـردن. جاران حەیـوانـە کێوی لە کوردستاندا زۆر بووەو ڕاویش یەکجار بڵاوبووە. کاتی زایینی حەیــوانــە کێــویش بە پێی ئەم ساڵنــامـەیـە نیشــانگــری (قــووچی گەرانـەوەی سەری هاوین)ە. لەم حەلــەدا بزنــە کێــوی دەزێــت و مرۆڤــی دڕنــدەیش بە هەلیدەزانێ ڕاوی ئەم گیانلەبەرە جوانە بکات.

## تەرازووو چاندنی جۆ

خەڵـکی گراو دەڵێن کە خۆرەگەیشتــە تەرازوو، ئیــدی کاتــی چانــدنــی گەنـم بە سەردەچێـت و چانــدنــی جۆ

دێتەگۆڕێ. دەڵێن ئەم پەندە لە نێوماندا باوە: ـ «ئەگەر ڕۆژ گەیشتە تەرازوو، کارەشوو مەیکە بە توو، ئەگەر کردت بە توو، بکــە بە جۆ». کارەشـــوو یەکـــەم کێـــڵانی زەوییـــەو دووەمیش «وەرددانـــەوە»ی پێدەڵێن و، کێـڵانی سێیـەمیش «تـۆوکـردن»ە. بەڵام هەمـوو کەسێـك سێجـار زەوییەکەی ناکێڵێ، ئەگەرچی بۆ زەوی یەکجار باش و کەڵك بەخشە.

## پێگەیینی هەنجیر

دەڵێن لە حەوتەی «ئۆغەن»دا هەنجیر پێدەگات، واتە لە ئۆغەنی هاویندا، چونکە حەوتەکانی هاوینیش هەمان ناوی حەوتـەکـانی زستـانیـان هەیـە. ئۆغەن دەکەوێتە دە ڕۆژەی کۆتایی مانگی تەموزەوە.

## گەڕانەوەی حاجی لەقلەق

خەڵکـەکـە دەڵێن لە حەوتـەی ئۆغـەنـدا حاجی لەقلەق دەگـەڕێتـەوە بۆ ئەوەش قووچی «ئـۆغـەن» لەنێو ڕوانگەکەدا هەبـووە. مەسـەلـەی کۆچـکـردنـی حاجـی لەقلەق لە باشـــوورەوەو هاتـنی لە حسێبی کوردەواریـــدا چەسپـــاوە، چونکـە بەهـاتنی ئیتـر سەرمـاو سۆڵـە بەرەوکزی دەچێ. بە ڕاددەیێك بەپێی حیسابی (کانیتوو) جێگەیێکی تایبەت لە شاخی (هێلانە قەل) هەیە پێیدەڵێن «بورجی لەقلەق» کە خۆر دەگـــاتـە ئەو جێیـە حاجی لەقلەق پەیـدا دەبن. بۆیـە حسێبدارە کوردەکان بایەخیان بەهاتنی حاجی لەقلەق داوەو چاوەڕوانی هاتنیان کردووە. تەنانەت هێندێکیان زانیویانە لە چ ڕۆژێکـــدا دەگـــاتــە ناوچــەکــەو، گرەوکـردن و مەرج و مەرجکاری کەوتووەتە نێوانیانەوە لەسەر ڕۆژی تەواوی سەر هەڵـدانی، کە ئێستـاش لەنێـو خەڵکدا بڵاوە. ئەم باڵندەیە زستانان بەرەو ئەفەریقا کۆچ دەکات و بەهاران و هاوینانیش لە کوردســتـــان دەمـێـنێتــەوە. دەبێ ئەوە بزانین کە حاجی لەقلەق لە کۆتـایییـەکـانی کانـوونی یەکـەمـدا لە حەوتەی (ئـــۆغـــەن)دا دێتـە ناوچـەکـەمـانـەوە تەنیـا چەنـد ڕۆژێـك دەمێنێتـەوەو دەگـەڕێتـەوە، لە کاتێکدا کە هەمووێشی نایێت بەڵکە چەند دانەیێکی بۆپشکنینی دێن و کە دیتیان هێشتا هەر بەفرە دەگەڕێنەوە وپاشان بەتەواوی دێن و خەلکی گراو کاتیهاتنیان بەروانگەکە دەزانن.

## جێگەی ڕوانینی ڕوانگەکە

جێگەی ڕوانینە ڕوانگەکەو چاو دێری کردنی ئاوابوونی خۆرو ئەستێـرەکـان لەســەر قووچـەکـانی شاخـەکە دەرگای مزگـــەوتی گراوە. جاران لە شانی خۆرئـــاوای دەرگـــاکـەوە تەمـــاشـــایـــان کردووەو ئەوسـا هیـچ هەیـوانێـك لەبـەردەم مزگەوتەکەدا نەبووە بۆیە هەموو قووچەکان لە خاڵی ڕوانین (إرصـــاد)ەوە دیـاربـووون، چونکـە بوونی هەیـوان وەکـوو ئێستـاکـە ڕێگـە لە بینینی قووچی گەڕانەوەی سەری هاوین دەگـرێت: پێـوانـەی دەرگـاکـە (160×75 سم)و دەکەوێتە گۆشەی باشووری خۆرهەڵاتی مزگەوتەکەوە. هەرچی دەرگا کۆنەکەیە جێگەکەی پڕکراوەتەوەو دەکەوێتە بەری خۆرئاوای دەرگا تازەکەوەو دەوری (5) مەترێك لێوەی دوورە. دەرگا کۆنەکە (ئەسلییەکە) پێشتر، وەك بە جێیەکەیدا دیارە، هەر گۆشـــەی باشـــووری خۆرهـەڵاتی گرتـووەتـەوە، بەڵام کە مزگەوتەکە تەعمیر کراوەتەوەو لەلای خۆرهەڵاتیەوە ئەندازەی (7) مەتـــرێکی خراوەتـە سەرو کراوە بە جێی دانیشتن ئیتـر دەرگـــاکـە گوێـزراوەتـەوە بۆ دەرگـایێکیتـرو پاشـان ئەوەش گوێـزراوە بۆ ئەم شوێنـەی ئێستـای. بەم پێیە دەردەکەوێ کە مزگەوتەکە بەشێکە لەم ڕوانگەیە.

پێـــوانـــەی مزگـــەوتـــەکـــە (7:40×19,70)مـەتـرەو بەرزییەکەی (3,50) مەترە. پێش تەعمیر کردنەوە واتە لە سەرەتـادا درێـژ ییـەکـەی (12,70)مەتر بووە، چونکە دوو جار تەعمیر کراوەتەوەو ئێستاکە سێ چینی جیا لەو مزگەوتەدا دەبینرێ. چینی یەکەم بنەڕەتەکەیانە. لە دیواری باشوورو باکـووریـدا هێنـدێکی لێ ماوەتـەوە. بە بەردو قسـڵ کراوەو



گوندی گراو

خەڵکەکە دەڵێن هێلکە لەگەڵ قسلەکەدا تێکەڵ کراوە. مانەوەی ئەم بەشە لە دیوارە بنچیەیی‌یەکەی مزگەوتەکە نیشانەی ئەوەیە کە بەشێوەیێکی پتەوو مەحکەم دروست کراوە. پاش ئەوە دوو جار تەعمیر کراوە کەسیان بیری نایێ کە جاری یەکەم کەنگێ بووە. جاری دووەم دەوری چل ساڵێك لەمەو بەر بووەو زۆریان لەبیریانەو وەستا (مەولوود)ی کوری مەعرووفی خەڵکی گوندی (سێوکە) تەعمیری کردووەتەوە. هەردوو جارەکە بە بەردو گەچ ئاوا کراوەتەوە. دیواری خۆرئاواو بەشێك لە دیواری باشوورو باکووری هیی دووەم ئاوا کردنەوەن، لەکاتێکدا دیواری خۆرهەڵاتی دەستی لێ نەدراوە. لە یەکەم تەعمیر کردنەوەدا ئەندازەی (7)مەتر خراوەتە سەر بەری خۆرهەڵاتی مزگەوتەکەو بەشێکی وەك هۆدەیێکی درێژ بۆ دانیشتن تەرخان کراوە. لە هەر ئاواکردنەوەیێکدا دەرگای پێشوو گیراوەو دەرگایێکی نوێ داندراوە. دەرگای ئێستا سێیەمیانەو شوێنی دوو دەرگای‌تر دیارن. پاش چوونی یەکەم جارم بۆ گراو خەڵکەکە هۆدەی دانیشتنیان فراوان کردووە.

نێزیکەی بیست ساڵێك لەمەوبەر لەپێش دەرگای مزگەوتەکەدا دیوارێکیان بە بەردو قوڕ دروست کردووە بۆ ئەوەی دارتەرم و داری سوتەمەنی لەپشت دابنێن. بەڵام کونێکیان لە بەرانبەر دەرگای مزگەوتدا لە دیوارەکەدا هێشتووەتەوە بۆ تەماشاکردنی ڕوانگەکە. هەیوانێك لە بەردەم مزگەوتدا کراوە. کاریتەی زۆر گەورەی تێدایە کە لە کاریتەکانی مزگەوتی شەقڵاوەوە هێنراوون. لە ساڵانی حەفتادا کە سەر لەنوێ مزگەوتی شەقڵاوەیان بە چیمەنتۆ ئاواکردووەتەوە، ئەو کاریتانەیان لێوە هێناون بۆ گراو. ئەم مزگەوتەی شەقڵاوە ساڵی 1304ی کۆچی (1886 - 1887ی زایین) لەلایەن مەحموود بەگ و «بووك عەنبەر»ی ژنیەوە ئاواکراوتەوە. مزگەوتەکەی گراو هێندێك کۆڵەکەو کاریتەی گەورەو زۆر کۆنی تێدایە. بناخەی دیوارێك وا لە نێزیك دیواری پشتەوەی مزگەوت بە دووریی دەوری مەترێك هەیە. خەڵك دەڵێن کە یەکەمجار مەلائۆمەر مزگەوتەکەی ئاواکردووە، وەستاکە دیان (مەسیحی)بووەو بناخەکەی بەخواری‌و مەیلەو خۆرئاوا داناوە، مەلا ئۆمەریش تووڕە بووەو دیواری پێ بە ڕووخاندن داوەو پێی ڕاست کردووەتەوە. جا ئەم پاشماوەی بناخەیە هیی ئەوەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم بناخەیە وەك دیواری ئێستای مزگەوتەکە ڕاست هەڵکەوتووەو هیچ خوارییێکی تێدا نییە،

من دەڵێم ڕەنگە کاتی خۆی مزگەوتەکە بە ئەندازەی مەترێك لەلای باکووریەوە تەسك کرابێتەوە یان دەبێ ئەم مزگەوتەی ئێستا لەسەر جێگەی مزگەوتێك یا بینایێکی کون تر ئاواکرابێتەوە.

بە داخەوە هیچ مێژوویێکم لەم مزگەوتەدا بەرچاو نەکەوت تا بزانم لە چ ساڵێکدا ئاواکراوە، بەڵام ئەگەر لە دیوارە کۆنە بنەڕەتەکەی وردبینەوە دەکرێ بڵێین تەمەنی چوارسەد پێنج سەد ساڵ کەمتر نییە. زانینی مێژووی تەواوی دروستکردنی مزگەوتەکە یان بە نێزیکی زۆر گرینگە، چونکە لەوەوە مێژووی ئاواکردنی گراوو دروستکردنی ڕوانگەکەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە. خەڵکەکە هاودەنگن لەسەر ئەوە کە (مەلا ئۆمەر) دروستکەری مزگەوتەکەیەو ئەو خۆیو براکانی گراویان ئاواکردووە. دیاری کردنی تەمەنی هیچ نەبێ نێزیکی مزگەوتەکە ئەرکی دەزگای شوێنەوارەو لەم بارەوە درێخی کردووە، چونکە سێ چوار جار پێوەندیم بەم دەزگایەوە کردووەو، ڕاپۆرتی یەکەم و دووەم لەسەر ئەم ڕوانگەیە بۆ ئەم دەزگایەو بۆ (المديرية العامة لآثار ومتاحف المنطقة الشمالية) لە موسڵ ناردوون. بەڵام هیچ وەڵامێکیان نەداومەوەو ئەم بابەتە گرنگەیان پشت گوێ خستووە کە دەبوو مزگەوتەکەیان بدیباو بڕیاریان لەسەر ئەوە بدابایە کە پاشماوەیێکی شوێنەوارییە تا کەس و هیچ لایەنێك لەهیچ کاتێکدا توانای ڕوخاندنی و نەبێ. وەك چۆن بەڕێوەبەرایەتیی ئەوقافی هەولێر بەڵێندەر (مقاول)ێکی ناردبوو بۆ ڕووخاندنی بیناکردنەوەی مزگەوتێکی نوێ لە شوێنی. ئەگەر بەڵێندەرەکە توورە نەبایە لەسەر مەسەلەی چۆنیەتیی گەیشتنی لۆرییەکانی بە نێو باخەکاندا بۆ مزگەوت و نەگەڕابایە دواوەو ئەگەر لەبەر شەڕ بڕیاری ڕەسمی بۆ وەستاندنی هێندێك پرۆژە دەرنەچووبایە، ئەوا ئەم مزگەوتەش وەك مزگەوتی گلەزەردە پێش چوونم بۆ گراو دەڕووخێندراو ڕوانگە کوردییەکەش تێك دەچوو.

شایانی باسە، مزگەوتەکە دەکەوێتە باکووری خۆرئاوای گوندو باشووری خۆرهەڵاتی کانیی پیاوانەوە کە پێی دەڵێن «کانیی مزگەوت»، چونکە ئاو لە مزگەوتدا نییەو ئاودەستخانەی مزگەوت کە هیی پیاوانە لەکن کانییەکەیەو خەڵك لەوێ دەستنوێژ دەشۆن و دێن بۆ مزگەوت بۆ نوێژ کردن. دووریی نێوانیان (38)مەترە. لەم بەری دێیەکەدا تەنیا ئەم کانییە هەیە کە نێزیکی شاخی ڕوانگەکەیەو مزگەوت و کانییەکە وان لە سنووری باخەکاندا.

## کێ ئەم ڕوانگەو ساڵنامەیەی دروست کردووە

بەڕێز مامۆستا ناصیح حەیدەری لەم ڕووەوە پێی گوتم: دەڵێن زانایێکی خەڵکی گراو کە مودەڕیس بووە دروستی کردووە، ناوی مەلا عەبدوڵلایا ناوێکی لەم چەشنە بووەو، مامۆستای (مەولانا خالید) بووە چونکە مەولانا خالید لەمەدرەسەی گراو خوێندوویە. ئەم زانایە لە باپیرانی مەلا مەجیدی شەقڵاوەیە. پاش ئەوە نامەم بۆ مامۆستا مەلا عەبدولمەجید ناردو، بە نامەیێکی ڕۆژی (30/7/1982) وەڵامی دامەوەو ئیمزای کاك عبدالباری‌ی کوڕیشی پێوەیە.

لە وەڵامەکەدا دەڵێت: دەڵێن ئەوەی ساڵنامەکەی ئامادە کردووە مەلا عەبدوڵلای گەورەیەو بە (مەلا عەبدوڵلای مودەڕیس) ناسراوە، مەلا عەبدوڵلا (120) ساڵ پتر ژیاوەو، ئەو کاتەی مەولانا خالید لەلای ئەم خوێندوویە ئەم زۆر پیر بووەو، مەلاوناش تازە پێگەیشتوو بووە. شەجەرەی ئەم بنەماڵەیە بەم جۆرەیە (مەلا عەبدولمەجیدی کوڕی مەلا عەبدوڵلای کوڕی مەلا عەبدولکەریمی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا عەبدوڵلای گەورە. بەڵام من کە لە شارەزا بەساڵداچوانی دێیەکەم پرسی، گوتیان: ئەوەی مزگەوتەکەی ئاواکردووە ناوی مەلا ئۆمەر (مەلا عمر) بووەو پیاوێکی خواناس بووەو، هەر ئەویش ئەم (حسێب)ە واتە ساڵنامەیەی سازکردووە.

پاش گەڕانەوەم لە گراو بەنامە لەم بارەوە پرسیارم لە کاك قادر عوسمان قادری گراویی مامۆستای قوتابخانەی گراو

(كە لە تايەفەى مەلا ئۆمەرە)و بەرێز مەلا جەبار عوسمانى مەلاى دێيــە كرد. كاك قادرى دەڵـێـت: گەورەكــانـى گونـدەكـەم كۆكـردووەتەوەو لێم پرسيون، هەموو دەڵێن مەلا ئۆمـەر نەك مەلا عەبـدوڵـلا ئەم «حـسێب»ەى ئامادەكردووە. جارێكى ديكـەيش هەمـان پرسيـارم ڕووبەڕووى كاك قادر كردووەتـەوەو، ئەويش هەر ئەو وەڵامـەى هەبووەو گوتوويە: دەڵێن مەلا ئۆمـەرو سێ براكـەى (مـەلا محـەمـەدو مەلا مستـەفـاو مەلاوسـو) بەڕۆژێـك لە گونـدى (بـانە) [واتە: شارى بانە]و (بەر ڕۆژە)ى كوردستانى ئێرانەوە كە دەكەونە سەر سنوور هاتوون و ئاڤاكەرى گراوبون مەلا ئۆمەر براى باپيـرى مەلا عەبـدوڵـلاى گەورە بووەو، ئەو مزگـەوتـەكەى بنيـادنـاوەو ئاواى‌كـردووە هەرچى مەلا عەبدوڵلايە قوتابخانە (مدرسة)كەى ئاواكردووە.

پاشـان چەنـد نامـەيێكى ديكـەم بۆ بەرێـز مامۆستا مەلا مەجيــد ناردو تێـيـانــدا داوام كرد ناوى دروستـكــەرى ڕاستەقينەى ڕوانگەو ساڵنامەكەم بە بەڵگەى بڕواپێكراوەوە بۆ ساغ بكــاتــەوە. هيـچ وەڵامێكى نەبـوو. تا ڕۆژى (6)ى شوبـاتى (1984) لە بەغـدا لە (تـەكيـەى خالـديـە) واتە تەكيەى مەولانا خاليد (كە نێزيكى شارع النهر ودجلة)يە، چاوم پێى‌كەوت و زۆر پرسيارم لەم بارەوە لێ كردو گوتى: من لە تەمەنى يازدە ساڵى‌يەوە گراوم بەجێ‌هێشتووەو ئێستا تەمەنم (66) ساڵ دەبێ‌و، دوور نييە خەڵكى دێيەكە لە من باشتـر ئاگـادارى ئەوشتـانە بن و بيانزانن و گوتى. چوار برا هاتــوون بۆ گراو بەنــاوى مەلا ئۆمــەر (مــەلاعمـر)و مەلا عەبدوڵلاو مەلا ئەحمەد، ئەوەى چوارەميانم لە بيرنەماوە. وا زانــدراوە كە كوڕى مەلا يوســف بوون و لەلاى سنــەو شارەزوورەوە هاتوون. هەروەها گوتى بيستوشمە كە دەبێ لە (بانە)وە هاتبن، يا دەيگوت لە جافى مكايەلى بوون. ديـاربـوو لەسـەدداسـەد لە هندێك لە قسەكانى دڵنيانەبوو. گوتى ئەوانــە گراويــان ئاوەدان كردووەو، مەلا ئۆمـەر پێش مەلا عەبــدوڵــلا مودەريس بووەو خۆم هێنـدێـك لە كتێبـە دانەراوى ئەوم (يانى مەلا ئۆمەر) لەسەر زانستى (حكمة)و (منطق) ديوە.

مەلا عەبــدوڵـلاى مودەريس كە بە (مـەلا عەبـدوڵـلاى گەورە) ناسراوە مامۆستاى مەولانا خاليد بووەو گۆڕەكەى لە گراوە. ئەم مەلايـە زۆر بەنـاوبـانـگ بووە لە كاتى خۆيدا، دوور نييــە هەر لەبــەر ئەوە بووبێ كە بيستــومــانــە ئەو ئامادەكەرى ساڵنامەكەيە. ڕێيشى تێدەچێ مەلا ئۆمەر بێ وەكو خەڵكى دێيەكە دەڵێن. هەروەها گوتى: كاتى خۆى فەرمانێك لە دەوڵەتى عوسمانييەوە بۆ مەلا عەبدوڵلا هاتووە لەبـارەى دەرزگـوتنەوە. پارچەيێكى ئەو فەرمانەى لەلا بوو، بەڵام نە ناوى ئەو كەسەى لەسەر بوو كە بۆى نێردراوەو نە مێـژووش. ديـارە لەسـەر پارچـەكەى‌ترى بووە كە ئێستاون بووەو مامــۆستــا مەلا مەجيـديش زانـايـەكى باش و ديـارە لەناوچەكەدا، وەمرۆڤێكى ڕاست گۆيە.

من خۆيشم لەم ڕووەوە پرسيارم لە خەڵكى گوندەكەو لە حاجى ڕەســوولى قيـژەيى كردووە كە بە بنەچـە گراوييــەو تەمـەنى (85) ساڵێـك دەبێ‌و لە هەولێـر دادەنيشێ. بەڵام قسەكانيان هەموو لێك جياوازن چونكە هەم نەنووسراونەوەو هەم لە بيرى خەڵكەكە چوونەتەوە. تەنيا لەسەر ناوى مەلا ئۆمــەر هاودەنگن كە لەگــەڵ براكـانيـدا هاتـووەو گراويـان ئاواكــردووەو حوكمـەتى عوسمـانى بە فەرمـانێكى ڕەسمى گراوى داونێ، يا دەبێ فەرمــانـەكـە پاش سەردەمى ئەوان بووبێ، لەبــەر ئەوە ئاغــاكـان نەيـان توانيـوە گراو لەوان و نەوەكـانيـان بستێننــەوە. هێـنـدێك دەڵێن مەلا مستەفاو مەلا ئەحمــەدو صالــح سێ براكـەى مەلا ئۆمـەرن و صاڵحيـان مەلانەبووە. يا دەڵێن يەكێك لە براكانى ناوى (وسو) بووەو نەخوێندەواربووە. يا دەڵێن پێنج برا بوون كە هاتوونە گراو. يا كەسانێكى كەميش دەڵێن باوكيان هاتووەو گراوى ئاواكردووە.

گراو ئێستـاكـە ئەم بەرەبـابـانـەى تێدايە. بەرەبابى مەلا ئۆمــەر، مەلايـى كە لەپـشـتـى مەلا عەبــدوڵــلاى گەورە كەوتونەوە، مەلا مستەفايى كە لە مەلامستەفا كەوتونەوە، وسوويى‌و بەرەبابى (مامارى)يش هەن، دەڵێن ئەم ناوە لە

(مام ئاری)یا (مام مەعمەری)یەوە هاتووەو، ئەم پیاوە لەگەڵ مەلا ئۆمەرو براکانیدا هاتبووەو هاویەشی دروستکردنی دێیەکەی کردووە. ئەم بەرەبابەیان لە مەلا زادەکان نین. خەڵکی گراو کە (120) خێزانێك دەبن لەم مەلایانە کەوتوونەوە، بیست خێزانێکیان نەبێت. زۆریشیان لێ کۆچی کردووە بۆ هەولێر دێهاتیتر.

بۆ ئەوەی زانیاریم لە بارەی مەلا ئۆمەرو زەمانەکەی‌و ئەم ڕوانگەوە دەست بکەوێت کەوتمە پشکنینی کتێب و قاقەزە دەستنووسەکانی گراو کە فەردەیێك قاقەزی پرژو بلاوی لە مزگەوتەکەدا بوورو هێندێکی زۆرتر لە ماڵی مەلا موحسین بور کە هیی مەلا ئەبوبەکری باوکی بووەو لە دوایین مامۆستاکانی گراو بووە. نێزیکەی دە هەزار پەڕەیێکم ئەم دیوەو ئەودیو کردو هێندێکیانم لەگەڵ خۆمدا هێنایەوە سلێمانی‌و پشکنیمن، کەچی هیچ زانیاری‌یێکم دەستگیرنەبوو، ڕەنگە نووسینی‌تر هەبوویی‌و فەوتابێ وەك پوورە خەدیجەی خێزانی مەلا ئەبوبەکر دەڵێت چەند جارێك کتێب و قاقەزی دەستنووسی پەڕپووتمان لە نێو باخەکەماندا خستووەتە چاڵەوە. ئێمە دەتوانین ئەم نووسینانە بە دەستنووسەکانی قوتابخانەی گراو ناوببەین. لەم کۆمەڵە دەستنووسەدا ناوی چەند زانایێکی خەڵکی گراوو غەیری گراویشمان بینی کە ناویان بەتایبەت لە پەراوێز (هامش)ی لاپەڕەی کتێبەکانی شەریعەت (فقە)و نحوو صرف و منطق و کلام و فلکیات و ریاضیات و چەند زانستێکی‌تردا هاتووەو، زۆربەیان ڕوونووسکار (ناسخ)ی ئەوکتێبانە بوون. لەوانە (عەبدوڵڵا) ناوێك کە لە بەغدا کتێبێکی لەسەر نەحو نووسیوەو، دوورنییە مەلا عەبدوڵڵای گەورە بێ چونکە ناوبراو بۆماوەی چەند ساڵێك ماڵەکەی بردووەتە بەغدا. ناوی مەلا محەمەد ئەمینی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای گەورەو نورالدین گراوی‌و مەلا عەلی گراوی‌و هێندێکی‌تریش هاتوون کە لە پاشکۆی ئەم باسەدا لێیان دەدوێین.

ڕۆژی (3)ی نیسانی 1984 گۆڕی مەلا ئۆمەرو مەلا عەبدوڵڵای گەورەو مەلا محەمەد ئەمینی کوڕی‌و چەندانێکی‌ترمان دەست نیشان کرد، لەوانە مەلا مستەفا ئەزەڕوومی کە موستەعیدێکی خەڵکی ئەزەرووەمی کوردستانی تورکیا بووەو لەلای مەلا عەبدوڵڵای گچکە خوێندوویەو حەفتا ساڵێك لەمەوبەر مردووەو ئەوانەی لەرزوتێیان لێ‌دیت دەچنە سەرگۆڕەکەی بۆ چاك بوونەوە چونکە دەڵێن ناوبراو لە غەریبایەتی مردووە. ئەم گۆڕانەمان بەهۆی پوورە خەدیجەی مەلا ڕەسووڵ مەلا مستەفای ژنی خوالیخۆشبوی مەلا ئەبو بەکرەوە بۆ دیاری‌کردرا کە تەمەنی هەشتا ساڵ دەبێ‌و ژنێکی وریاو ئایینی‌یەو قورئان و مەولوودیشی خوێندووەو گۆڕی هەموویانی دەناسیەوە. کاتێك باسی گۆڕی ئەوانی بۆ من و کاك قادر عوسمان دەکرد، من دەنگیم بە شریت تۆمارکردو، بە بۆیاخ ناوەکانم لەسەر کێلەکان دەنووسی بۆ ئەوەی بەئاسانی بناسرێنەوە. ئەم گۆڕانە وان لە نێو گۆڕستانی گراودا کە بە «قەبرستانی مەلا ئۆمەر» ناسراوەو دەکەوێتە خۆرهەلات و نێزیکی دێیەکەوەو گۆڕستانێکی زۆر گەورەیەو درەختی گەورەو جۆربەجۆری هەیەو درەختی قەرە قاچی‌یشی تێدایەو، بەهاران سوێسن و نێرگزو نیلۆفەڕ (شیشەلاق)ێکی زۆری لێ شین دەبێ‌و دیمەنێکی یەکجار جوانی هەیە، گۆڕی مەلا ئۆمەر وا لە نێوەڕاستی بەشی خۆرئاوای گۆڕستانەکەداو لەنێو غەرە (سیاج)یێکی بەردو (وشکەکەڵەك) دروستکراودایە. گۆڕەکەی لە تەنیشتی باکووری خۆرئاوای غەرەکەدایە. هەردوو کێلی ئەم سەرو ئەو سەری نیوەتر بەرزن و (کێلی مەلایەتی)یش لەبەر سینگیدا واندراوە، لە گراودا ئەوەی مەلا بێ کە مرد کێلی سێیەم لەبەرسینگیدا یا ڕاستتر بلێین سینگی گۆڕەکەیدا دادەنێن، بۆ ئەوەی بزاندرێ کە مردووەکە مەلا بووە. ئەم گۆڕستانە زۆر گۆڕی تێدایە کە کێلی مەلایەتی‌یان هەیە، ئەوەش بەڵگەیەکە گراو مەڵبەندی زانست و زانیاری بووە (بە درێژی لە بارەی زانایانی گراوەوە، دەنوسین کاتی ئەم مەوزوعەمان دەکەینە کتێبێك لەگەڵ ڕوانگەو تەقویمە کوردیەکان).

خەڵکی گراو مەلا ئۆمەر بە پیاوچاك و وەلی‌یێکی خوا دەزانن، بۆیە نەخۆش بەتایبەت بادارو ئەوانەی تووشی تاو کۆکەڕەشە دێن دەچنە سەر گۆڕەکەی. دەوری پێنج گۆڕی‌تریش لە نێو غەرەکە (کاڤل) دایەو وان لە تەنیشتی باکووری خۆرهەڵاتیداو یەکیان هی عەزیزی ڕەسوڵی گراوە کە پوورە خەدیجە کۆچی دوایی کردنەکەیی بەبیردێت. ئەم گۆڕستانە گەورەو کۆنەو لەوەناچێ هی دنیەك بێ کە سێ سەد چوارسەد ساڵێك دەبێ دامەزراوە. ئەگەرچی هێندێك مردووی دوو تایفەی ناگراوی‌یشیان لەنێودایە، بەڵام وابێ‌دەچێت پێش ئاواکردنی گراو هەبووبن، یا دەبێ گراو پێش سێ‌سە دچوارسەدساڵ لەمەوبەر بنیادنرابێ. چەند دیوارێکی گەورە لە نێزیك گۆڕی مەلا ئۆمەرەوەن بەلای باکوورەوە، ڕەنگە پاشماوەی شارێکی کۆن بن، چونکە دیواری غەرەکان بەو شێوە بەردو ڕێکوپێکی‌یە نین و زۆر غەرەی کۆنیش لەو نێزیکانەدا هەن. دیارە هەر بەرەباب و بنەماڵەیێك مردووەکانی خۆیانیان لە یەك جێگەدا ناشتوون، ئیتر گۆڕستانەکەش بەش بەش بووە. کێلەقیت و قنجەکانیش نیشانەی ئەوەن کە مردووەکە گەنج بووە.

جاکە ئێستاکێ هیچ بەڵگەیێکی نووسراومان لەم بارەوە نەکەوتە دەست ناچارین ئێستا پشت بە قسەو بیرەوەریی پیرەمێردەکانی خەڵکی گراو ببەستین لەو ڕووەوە کە مەلا ئۆمەر دانەری ڕوانگەکەیەو دورنییە لە دەوروبەری سەدەی شازدەهەم دا ژیابێ، وەیانە هەر هاوکاتی (مەلانبی) بوبی کە ئەویش لە کوردستانی ئێرانەوە هاتووەتە دێی (بارێی پچووك)و ڕوانگەو ساڵنامەکەی لەسەر شاخ دروست و ئامادەکردووە.

ئەمە لە سەدەی شازدەهەمدا بووە، چونکە مەلا نەبی ماموستای مەلا مووسای کوڕی بایز (أبایزید)ی شابەدینی بووەو، مەلا مووساش وەك خۆی لە قورئانە دەستنووسەکەیدا نووسیویە دەوری ساڵی (950)ی کۆچی (1543 ـ 1544ی زایین) لەدایك بووە. مەلا ئۆمەریش وەك شارەزایانی گراو دەڵێن لە (بانە)و (بەرۆژە)وە هاتووەو، بەرۆژەیش ناوی گوندو شاخێکە لە کێوی (کەلیخان) کە بەرەو باکووری خۆرئاوای بانە شۆڕدەبێتەوە، بۆیە دوور نییە ناوبراو بیری دروستکردنی ئەم ڕوانگەو ساڵنامەیەی لە (حیسابی کەلیخان)ەوە وەرگرتبێ و دەبێ لە کەلیخان لە جێگەیێکیدا ڕوانگەیێکی وەها هەبووبێ، هەتا خەڵکی (کانی‌توو)ش دەڵێن (حیسابی کانی‌توو) لە حیسابی کەلیخان وەرگیراوە. ڕەنگە لە پاشەڕۆژدا زانیاریی زۆرترو بگرە هی نووسراویش بدۆزێتەوەو هەروەها هەوڵیشمان داوە، بۆ دۆزینەوەی ڕوانگەی کەلیخان.

## بەردە قیبلە

بەردێك لە بەردەم دێی گراودایە پێی دەڵێن «بەردە قیبلە»، قیتەو ڕاست دانـدراوە، شێوەکەی سێگۆشەیی «مثلث»یە بڵێین هەرەمی‌یە، بەرزی‌یەکەی (1,20) مەترو دەوری بنەکەی (3,70) مەترە. ڕۆژی (3)ی نیسانی 1984 ئەم بەردەم پێواو بە بۆیاخ لەسەریم نووسی‌و وێنەیم گرت. ئەم بەردە وەك خەڵکەکە دەڵێن بۆ دەست نیشانکردنی قیبلەیەو بۆ ناسینی نوێژ کردن دانراوە. منیش لە نیوەڕۆدا لە حەوشی مزگەوتەکەدا لە ڕاستی میحرابەکەی تەماشای بەردەکەم دەکرد تا بزانم لە ڕاستی قیبلەدایە یان نا. دیم واخەریکە خۆر کەمێك لە بەردەکە دەترازێ بەلای خۆرئاواوەو دیم لەوکاتەدا ماموستا مەلا جەباری مەلای گراو دەستی بە بانگدانی نیوەڕۆ کرد. بەوە بۆم دەرکەوت کە ئەم نیشانەیە ڕاستاو ڕاست و ڕەوانەو لەجێی خۆیدایە بۆ پێشاندانی ڕووکاری باشوور واتە قیبلە «سمت القبلة» بەکار بهێندرێت.

نابێ بەسادەیی بڕوانینە ئەم بەردە، بەڵکە ئەو کەسەی ئەم بەردەی دانـاوە دەبێ مەلاییێکی زاناو ئەستێرەناسێکی گراوی بووبێ کە دوور نییە مەلا ئۆمەر خۆی لەکاتی دروستکردنی ڕوانگەکەدا ئەم بەردەی دانابێ. ئەم بەردە

مەبــەستێکی جیــۆگــرافی دەدات بەدەستــەوە ئەویش بۆ دیاریکردنی هەرچوار رووکارەکان (تحدید الجهات الأربع) یانی باشوورو باکوورو خۆرهەلاّت و خۆرئاوا لە گوندی گراودا. رەنگە بۆ سێ رووکارەکەیتریش نیشانگری وەها داندرابێت.

لەهەمان کاتدا ئەم بەردە نیشانگرێکی ئەستێرەناسی «فلکی»یە، چونکە لەباتی ئەم پێوەرە «مقیاس»ە کە بۆ زانینی رووکاری قیبلە لە نێو قەدی بازنە دادەندرێت کە لە ئەستێرەناسی ئیسلامیدا بە بازنەی هیندی «الدائرة الهندیة» ناسراوە. وەك زانای گەورە حسین ی خەلخالی لەلاپەرە (40)ی کتێبەکەیدا «شرح الدائرة الهندیة في معرفة سمت القبلة» دەڵێت ئەم بازنەیە زانایانی هیندستان دایانهێناوە بەلاّم بەبازنە لەلای ئاشووریو بابلیەکان بۆ هێندێك مەسەلەی حیسابیو ئەستێرەناسی بەکار هاتووە. وئیغریقیەکان لەوان وەریان گرتووە.

موسڵمانەکان بۆ راستکردنەوەی قیبلە بازنەێکیان دروست کردووە کە بازنەی نیوەی رۆژ «دائرة نصف النهار»ە ئەم بازنە ئەستێرەناسی یە بەسەراسەری ئاستی سەرویێ (سمت الرأس والقدم)و هەردوو جەمسەر (قطب)ی زەویدا دەکێشرێو، هێڵی نیوەی رۆژ (خط نصف النهار) لە خاڵی نێوەراستی بازنەکەدا هێڵی خۆرهەلاّت و خۆرئاوا (خط معدل النهار) دەبرێ. بەم پێیە بازنەکە دەبێ بە چوار بەشەوەو هەر بەشەی دەکرێت بە (90) بەشی پچووکترەوە کە سەرجەم دەکاتە (360) بەش و هێندەی بەشەکانی کەلووەکانە (أجزاء البروج).

پێوەرێك (مقیاس) لە نێوقەدی بازنەی رووکاری قیبلەدا لەسەر هێڵی نیوەی رۆژ دادەندرێت. ئەگەر مرۆڤ لەسەر خاڵی رووکاری قیبلە بوەستێ کە خاڵێکی بازنەی ئاسۆ (دائرة الأفق)یە، ئەوا رووبەرووی قیبلە دەبێ. بەلاّم دەبێ تێروان (الراصد) هێڵی درێژیو پانی (خط الطول والعرض)ی ئەو ناوچەیە لەگەڵ هی شاری (مەکە)دا بزانێ جاکاتێك خۆر گەیشتووەتە ئەوپەڕی بەرزی لە ئاسماندا، سێبەری پێوەرەکە لە کورتترین خاڵیدا بووەو ئیتر لەوە کورتتر نەبووەتەوەو، ئەوساش خۆر لە نێوە راستی قیبلەدا واتە لەسەر خاڵی باشوور بووە. بەلاّم ئەم کاتە هی نوێژی نیوەرۆ نییە، بەڵکوو کە خۆر لە پێوەرەکە لایداو رووی لە رۆژئاوا کردو سێبەری پێوەرەکەش زیادیکردو ترازا بەلای رۆژهەلاّتدا ـ ئەودەمە بەپێی شەریعەتی ئیسلام کاتی نوێژی نیوەرۆیەو بەعەرەبی پێی دەڵێن «وقت الزوال». هەر کاتێکیش سێبەری پێوەرەکە دوو هێندەی درێژیی پێوەرەکەی لێهات، ئەویش جگە لەبری سێبەرەکەی لەکاتی نیوەرۆدا «وقت الزوال»، ئەوا دەبێتە پاش نیوەرۆ «عەسر».[7]

ئەو کەسەیی بەردەقیبلەی لە گراو داناوەو بەوچەشنە رێکیخستووە، حسێبی زانستی ئەستێرەناسی تێدا جێبەجێ کردووەو، کردوویە بە پێوەرێك لەسەر خاڵی ناوەراستی بازنەی نیوەی رۆژ (دائرة نصف النهار)و لە ئاسۆی گراودا بۆی چووەو زانیویە کە (مەکە) دەکەوێتە سەر هێڵی درێژی (خط الطول)ی (77) پلەو (6/1)ی پلەیێك و هێڵی پانی (خط العرض)ی (21)پلەو (3/1)ی پلەیێك و، گراویش لەسەر هێڵی درێژیی (69,5) پلەو هێڵی پانیی (35,5) پلەو (3/1)ی پلەیێکە.

ئەمە وێنەی بازنەکەیە وەك لە کتێبەکەی «خەلخالی» داهاتووە بۆ دەست نیشانکردنی رووکاری قیبلە «سمت القبلة» کە بەردە قیبلەی گراویش بەپێی ئەم حسێبە ئەستێرەناسی یە واندراوە.

## رۆژانی ساڵ بە گوێری روانگەی گراو

وەك باسمان کرد رۆژانی ساڵ بە گوێرەی حیسابی کەلووەکان (360) رۆژەو بەم شێوەیە دەبێ ساڵ بە گوێرەی روانگەکەش هەر (360) رۆژبێ یانی 5 رۆژو 48 دەقیقەو 46 سانیە لە ساڵی رۆژی (السنة الشمسیة) کەمترەو کورد بەم پێنج رۆژە کەمە دەڵێن «رۆژەکانی تار»و «پێنج رۆژی تار» ئایا روانگەی گراو هەر بەتەواوی چاوی لەم رۆژانە



پۆشیوه وەیان بە رێگایێك خراوەتە سەر رۆژانی ساڵ وەك هەندێك لە ساڵنامەکانی تری نەتەوەکانی جیهان کە هەندێکیان ئەو پێنج رۆژەو ساعەت و دەقیقەو سانیە خستویانەتە سەر مانگی کوتایی ساڵ وەك میسری‌یەکان و فارسە کونەکان یانی مانگی ئەخیری ساڵ بووە بە (35) تا ساڵ ببێتە (365) رۆژ هەروەها لە ساڵنامەی (بەهائی)یەکانیشدا کە لە سالی 1844 علي محمد (باب) ئەو ساڵنامەیەی دروستی کردووەو ساڵی کردووەتە 19 مانگ و هەر مانگێك (19) رۆژ ـ ئەو پینج روژە خراوەتە بەینی مانگی (18)و مانگی (19) کە دەبنە رۆژانی 26 شوبات تا 2 ئادار یانی تەسادوفی ئەوانە دەکا، ئەگەرچی ناوی مانگەکانی خۆیان جیایە (8) لە هەندێك ساڵنامەش دا رۆژەکانی تار خراوەتە کۆتایی مانگی تەشرینی یەکەم وەك زانای کورد مەلا عومەری رەنجوری لە (رۆژنامە)کەیدا پەرەی (8)دا دەڵێ بەلام لەبەر ئەوەی هەندێك لە رۆژنامەکە لەم شوێنەدا کەوتووە کە دانەی دەسخەتی مەلا محمد امینی هەوایی‌یەو هەر ئەم دانەیە تا ئیستا دوزیومانەوە ـ ئیمە نازانین لە کامە ساڵنامەدا خراوەتە پاش تەشرینی یەکەم ئایا مەخسەدی ساڵنامەی سوریانی وەیا یونانی وەیا قبطی‌یە کە ناویانی لەو جێگایەدا هێناوە وەیان ساڵنامەیەکی‌ترە کە باسەکەی کەوتووە کە دورنیە ساڵنامەی یەزدەجردی فارسی بێ، بەلام بە پێی دەسنووسێکی کون کە باسی ساڵنامەی فارسی قبطی تێدا هاتووە ئیشارەتی ئەمەی تێدانیە ئەوەش کتیبی دەسنوسی «کتاب الأزمنة» کە ئلیابرشینایای مەترانی نسیبین (نصیبین)ە بە زمانی عەرەبی‌و سوریانی دای‌ناوە لە سەدەی یازدەیی زایینی لە کاتی دەوڵەتی دوستکی کورددا دانەی دەسنوسەکە لە نامەخانەی موزەخانەی بریتانی دایە لە ژێر نمرەی (7197)دا.

لە ووتاری «بورجەکانی ساڵ» لە ناملیکەی «سرنجێك لە دەروازەی فولکلوری کوردی»دا دەربارەی رۆژەکانی تار هاتووە کە ئەم رۆژانە دەخرێنە نیو مانگی ئادار تا ساڵ ببێتە (365) چونکە ساڵ (360) رۆژەو هەر مانگێك (30) رۆژە بەلام یەکسەر لە دوای نەوروز لە 22 ـ 26 ئادار رۆژەکانی تارەو رۆژی پاش ئەوان سەری ساڵە. یانی رۆژی (27)و هەندێك زانیاری تریشیان دەربارەی ئەمە تێدا هاتووە کە بریتی‌یە لە پەیوەندی بەینی تارەکان و کەژناسی

لەلای حیسابدارە کوردەکانەوەو ئەم گوتارە زۆر گرنگەو نوسەر ناوی نەنوسیوە من دەڵێم دورنییە کوردەکان ئەم پێنج رۆژەیان خستبێتەسەر نیو مانگی ئادار، بەڵام نە لە دوای (21) ویان نەك سەری ساڵ دواخراوە چونکە دو کۆسپ لێرەدا هەیە:

1 ـ چونکە ئەگەر رۆژەتارەکان بخرێتە پاش 21 ئادارو رۆژی 27 ببێتە سەری ساڵ، ئەوا 21 ئادار نەبوتە نەورۆزو نەبوە بە سەری ساڵ لە کاتێکدا کە ئەو رۆژە لەلای کوردو ساڵنامەی هەندێك میللەتانی تریش دا وە ساڵنامەی فارسیو ساڵنامەی جەلالیو هەروەها ساڵنامەی بەهائیش ـ سەری ساڵی نوێیە هەروەها ئەو رۆژە سەری ساڵە چونکە ئەوەڵی کەلوی کاورە (برج الحمل) کە کەلوی یەکەمینی ساڵە.

2 ـ ئەگەر نەوروز یانی 21 ئادار سەری سال بێ دەبێ رۆژەکانی تار لە پێش رۆژی 21 ئادار لە کۆتایی ساڵی پێشودا بێن چونکە ئەو رۆژانە تەواوکەری ئەو ساڵەن و ئەگەر لە دوای 21 بێن دەکەونە سەرساڵی نوێ نەك ساڵی پێشو ئەم رۆژەش کە سەری ساڵی کوردییە دەبێتە رۆژی یەکەم لە مانگی یەکەمینی ساڵ لە مانگەکانی کوردی کە مانگی (خاکەلێوە)یە جادوور نیە پێنج رۆژەکە خرابێتە کوتایی ساڵەکە یانی پاش تەواو بوونی مانگی رەشەمێ یانی ئەو مانگە بە (35) دەژمێردرێ وەك چۆن میسریە کونەکان کە پێنج رۆژەکەیان لە کوتایی ساڵدا هیناوە.

ئەگەر ئەم حیسابەش راست بێ دەبێ زۆر کۆن بێ بەلایەنی کەمەوە لە دەوری هەزار ساڵ لەمەوبەر یان لە پێش ئیسلام لەوکاتەی کە نەورۆز کە سەری ساڵ بوو (ثابت) نەبوو لە یەك رۆژی دیارکراودا یانی ثابت نەبوو لە رۆژی 21 ئاداردا بەڵکو دەسورا یەوە جار هەبووە نەورۆز لە کاتی ساسانیەکان دا دەکەوتە وەرزی هاوین. یانی بڵێین ئەو کاتەی پێنج رۆژی تار خراونە پاش رۆژی 21 ئادار، رۆژی نەوروز کە سەری ساڵ بوو، دەکەوتە (27) ئادار.

لە (ساڵنامەی کورپاشا)ی ساڵی 1984دا شەش مانگی کوردی (بەهارو هاوین) هەریەکیان بە (31) رۆژ حیساب کراون و شەش مانگی (پاییزو زستان) بە (30) رۆژ یانی پێنج رۆژی تار دابەش کراوە سەر مانگەکانی بەهارو هاوین، دەشبێت رۆژی شەشەم بەنسبەت ساڵ کەبیسەوە بێ) تا ساڵە ببێتە (365) بەڵام خۆم نازانم ئەو چارەسەرکردنە لەم زووانەدا دۆزراوتەوە یان کۆنەو ساڵنامەی گراویش بەو شێوەیە پێنج رۆژەکە خراوەتە سەر ساڵ، لە ساڵی (بسیطه)دا.

## سەرەتای وەرزەکان

سەرەتای وەرز (فصل)ە کانی ساڵ بەگوێرەی روانگەی گراو وەك شارەزاکانی خەڵکی دنیەکە دەڵێن لە رۆژانی بیست و یەك یانی 21 کانونی یەکەم سەرەتای زستانەو 21 ئادار سەرەتای بەهارەو 21 حەزیران سەرەتای هاوین و 21 ئەیلول سەرەتای پاییزە، بەڵام سەرەتای پاییزە 23 ئەیلولە بەپێی لیستەی کەلوەکان لەکاتی رومانیەکان دا کە لە کتێبی (علم الفلك عند العرب ل 22 ـ 24 والموسوعة الفلكية المبسطة 146 ـ 149 وساڵنامەی کور پاشا داهاتوە رۆژی 22 حەزیران ئەوەڵی هاوینە بەپێی سەرچاوەی دووەم وسێیەم و 21 حەزیران بەپێی لیستەی رۆمانیو 22 کانونی یەکەم سەرەتای زستانە بەپێی سەرچاوەی یەکەم و دووەم بەڵام هەموو یەکن لەسەر 21 ئادار. مەلا ئەحمەد لە ساڵنامەی کورپاشادا هەندێك بورجی کردوە بە 31و 32 رۆژیش دیارە ئەم دەستکاری کردنەی بورجەکان بەزیادی کردنی رۆژێك ویا دوو رۆژ لەسەر رۆژانی ئەسلی بورجەکان بۆ ئەوەیە تا لەگەڵ مانگەکانی ساڵی رۆمی یان بڵێین زایینی بگونجی وەتا ساڵ ببێتە (365) یانی پێنج رۆژی تار خراونەتە کۆتایی هەندێك لە بورجەکان تا باشتر لە روانگەکە بگەهین (بگەین)، پێویستە بە وردی موراقەبەی قوچەکانی بکەین بۆ ماوەی ساڵێك ویا زیاتر.

## مانگەكان لە گراو

خەلكی گراو مانگەكانی سالنامەی رۆمی بەكاردێنن یانی: كانونی یەكەم وكانونی دووەم و شوبات... هتد وە هەروەها مانگەكانی عەرەبیش بەلام كەمتر، بە پێی حیسابی كۆچی (هجری)ین: محرم، صفر، ربیع الأول، ربیع الآخر... هتد لەبەر ئەوەی پەیوەندییان بە ئایینەوە هەیە، یانی بە هەندێك كاتی ئایینی وەك رۆژوو و رەمەزان و حەج و جێژنە ئایینیەكان و مانگەكانی كوردی لە نێو خەلكی

گراو باو نیە یانی مانگەكانی: سەرماوە زو رێ بەندان... هتد یانی لە حیسابی سالدا بەكاریان ناهێنن بەلكو حیسابی روانگەكە لەگەل مانگەكانی رۆمی پێكەوە دەكەن لەكاتێك دا مانگە كوردیەكان لەگەل حیسابی كەلوەكان رێكن، لەگەل رومی رێك نین و ئەمەش نیشانەی ئەوەیە كە كورد لە كۆن دا حیسابیان بە كەلوەكان كردووە كە دەبایە ئەم مانگە كوردییانە بەكار هاتبایە شان بەشانی كاتی حیسابی روانگەكە، دور نیە لە ئەسل دا مانگە كوردییەكان لەگەلیدا بەكار هێنرابن بەلام پاشان وازیان لێ هێنرابن بە زال بونی مانگەكانی رومی.

لەبەر ئەوەی مانگەكانی كوردی لە حیسابی كەلوەكان پەیدا بوون لە كون دا، وابە باش دەزانین لێرەدا لیستەیەك دروست بكەین بۆ بەرامبەر كردنی كەلوەكان و مانگەكانی كوردیو رومیو ئەم لیستەیەش بەگوێری (سالنامەی كورپاشا)یە بێ مەلا كاك احمدی سەردرەیی كە خۆی سەپاندووە كە باشترین ویا لە باشترین حیسابدارە كوردەكانی ئیمرۆمانەو سالنامەكەی كە لە ئەسل دا لە سییەكان دا داناوە لە بارەی حیسابی كوردەوارییەوە زۆر گرنگە بەگوێری ئەم سالنامەیە شەش مانگی بەهارو هاوین لە مانگە كوردییەكان دا (31) رۆژ ن و مانگەكانی پاییزو زستان (30) رۆژ ن، بەم شێوەیە سال دەبێتە (366) رۆژ لە سالی كەبیسەدا یانی دەبێ سالانی‌تر رۆژێك لە یەكیان كەم بێ تا سال ببێ بە (365) رۆژ.

دیارە رۆژەكانی تار بەم شێوەیە خراوتە نێو سال. بەلام نازانم ئەمە لە كۆن دا وا كراوە، یان نوێیە. ئەوەی شایانی باسە هەر مانگێكی كوردی بە چەند ناوێك دێن بە گوێری ئەم ناوچەو ئەو ناوچەی كوردستان، بۆ نمونە مانگی یەكەمینی سال ئەم ناوانەی هەیە:

خاكە لێوە، ئاخە لێوە، نەورۆز، دارپشكێو، هەرمێ پشكێو زۆربەی مانگەكانی كوردیش مانای كشتوو كالیو ئابوریتری وەیا كەژناسی دبەخشن، وەك بەرێز كاك نافع كاكە (9) ومەلا احمد باسیان كردووە.

ئەمەش لیستەكەیە:

| مانگەكانی كوردی<br>رۆژ مانگ | مانگەكانی رومی | بورج (كەلوو) |
|---|---|---|
| 1 خاكەلێوە | = 21 آذار | = 1 حمل |
| 31 خاكەلێوە | = 20 نیسان | = 1 ثور |
| 1 گولان | = 21 نیسان | = 2 ثور |
| 31 گولان | = 21 ایار | = 1 جوزاء |
| 1 بەختەباران | = 22 ایار | = 2 جوزاء |
| 31 بەختەباران | = 21 حزیران | = 32 جوزاء |
| 1 ـ پوش كال | = 22 حزیران | = 1 سرطان |
| 31 پوش كال | = 22 تموز | = 31 سرطان |
| 1 پوش بەر | = 23 تموز | = 1 أسد |
| 31 پوش پەر | = 22 آب | = 31 أسد |
| 1 رەز بەر | = 23 آب | = 1 سنبلە |
| 31 = | = 22 ایلول | = 31 سنبلە |
| 1 گەلارێزان | = 23 ایلول | = 1 میزان |

| | | |
|---|---|---|
| 30 = | = 22 تشرینی یەکەم | = 30 میزان |
| 1 خەزەڵ وەر | = 23 = = | = 1 عقرب |
| 30 = = | = 21 تەشرینی دوەم | = 30 عقرب |
| 1 بەرروویەز | = 21 تشرینی دووەم | = 1 قوس |
| 23 = | = 14 کانونی یەکەم | = 23 قوس |
| 29 بەرروویەر | = 20 کانونی یەکەم | = 29 قوس |
| 30 بەرروویەز | = 21 کانونی یەکەم | = 1 جدي |
| 1 سەرماوەز | = 21 کانونی یەکەم | = 2 جدی |
| 1 سەر ماوەز | = 22 کانونی یەکەم | = 2 جدی |
| 29 سەر ماوەز | = 19 کانونی دووەم | = 29 جدی |
| 30 سەر ماوەز | = 20 کانونی دووەم | = 1 دلو |
| 1 رێ بەندان | = 21 کانونی دووەم | = 2 دلو |
| 30 ری بەندان | = 19 شوبات | = 1 حوت |
| 1 رەشەمە | = 20 شوبات | = 2 حوت |
| 30 رەشەمە | = 20 ئادار | = 1 حمل |

بەم لبستەیە دەزانین کە مانگەکانی کوردی بە پێ حیسابی بورجەکانی فەلەکییە وئەم کەم و زیادەی بە روژێك لە بەینی هندێك مانگ و بورج دیارە گورینی وەختییە یانی ئەسلی نیە ودوریش نیە ئەگەر هەلەیەکی چاپیش هەبی بۆ نمونە بیست و یەکی ئادار یەکی بورجی (حمل)ە نەك دووی (حمل)ە ئەگەرچی زانایانی ئیستای فەلەك دەلێن وەرزەکانی سال بەرەو دوا دەکشێن وئیستا نوقتە اعتدالی بهار کە سەرەتای بهار لەوە دەست پی دەکا ـ لە بورجی (حوت)دایە یانی لە بورجی (حمل) کشایەوە بۆ (حوت) (2200) سالی‌تر دکشێتە بورجی حوت لە کوتاییدا داوای لێبوردن دەکەین ئەگەر جیاوازیو هەڵە دۆزرایەوە لە رۆژەکانی سەرەتای بورجەکان و قوچەکان دا چونکە تائێستا ئەم مەوزوعە بەتەواوی بوم چارەسەر نەکراوەو جیاوازیش هەیە لە بەینی سەرچاوەکان دا.

هەروەها مەوزوعی حەوتەکانی هاوین و زستانیشمان نەخستوتە نێو ئەم باسە چونکە قوچەکانی حەوتەکانمان، تەواو نەکردووە لە رەوانگەدا چونکە روخاون و نەماون و لەپێش دا هەبوون هەر حەوتەیەك لەمانی خارەوە قوچی تایبەتی خوی هەبووە:

بێندە، بیندرخێ، مێرەم، ئوغەن، پیت و پاروس، خدر والیاس.

ئەوەی شایانی باسە دوا راپۆرتمان دەربارەی روانگەکەمان داوەتە مرکز بحوث الفضاء والفلك ویونسکو لقی عیراق والمؤسسه العامة للآثار والمدیریة العامة لآثار ومتاحف المنطقة الشمالیة ووزارة الأوقاف والاتحاد الفلکي العالمي.

سوپاسم هەیە بۆ بەرێزان کاك صدیق صالح و مامۆستا حسین رشید صالح کە ئەم باسەیان بۆ من پاکنوس کردووەو پاشان لەبەر زورفی گۆڤارەکە دەوری بیست لاپەرەیەکمان لەم باسە کورت کردووە.

## پەراوێزەکان:

1 ـ دەربارەی شاخی خانی تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە: (المرشد الی مواطن الآثار والحضارة ـ بغداد ـ اربیل ل 7)ی طه باقر وفؤاد سفر، ئەم شاخە دەکەوێتە باشووری گراوو بەینیان دۆلی باستورانە.

2 ـ ئەگەر لە کوردستان بگەرێن باس و حکایەتێکی زور دەبیسین دەربارەی حیسابدارە کوردەکان یانی ئەو کەسانەی کە لە حیسابی سال و لە کەشناسی (الأنواء الجویة) شارەزاییکی زوریان هەبوەو کوردەکان زور سودیان لێ وەرگرتوون، وەك محمد علی هەمەوەندی کە کاتی عەشیرەتی هەمەوند لە سەدەی نوزدەهەم دا لە (طرابلس)ی روژئاوا لە باکوری ئەفریقیا. بە دژی دەولەتی عوسمانی‌یەوە رایان کردو بە شەو بە رێگادا دەهاتن ئەگەر لە رێ خەلەت بیانە محمد علی (اتجاهی) رێگای بە ئەستێرەکان راست دەکردەوە محمد علی هەمەوەندی

حیسابداریکی زۆر زانا بووە دەوڵەتی عوسمانی ئەم عەشیرەتە کوردەی دور خستبووەوە بۆ (لیبیا)، موسی و برایی (براهیمەك) حیسابداری کۆنن لە ناوچەی (گەورکان) لە هەریما (سەدەشت. و حکایەتی لەسەر هەیە دێی «موسی و «براهیم خەسار» بەناوی ئەوانەوەن دیارە لە مێژوێکی دووردا بووەو هەروەها کچی براهیمەك یش حیسابدار بووە.

هەروەها بەکر بەگی هیرانی کە دەوری (50) ساڵە کۆچی کردووە بە قوچەبەرد حیسابێکی لە هیران دروست کردبوو، وە حیسابداریکی زۆر باش بووە.

حەمەدی مەلا محمودیش حیسابداری خەڵکی دێی (لگە بن)ی لاجان بووە، حیسابداریکی بەرزو بەناوبانگی بەجێ هێلاوە لە ناوچەی (لاجان)دا لە کوردستانی ئێران وەك بەرێز ملا عبدالله مصطفی لاجانی هەندێك لە باس و حکایەتی بۆمن باس کردووە. هەروەها (حەمەدی فاتما) خەڵکی دێ (مەمەندئاوا) لە دەشتی بتوێن حیسابداریکی بەرز بووەو هەندێك قوچی بۆ زانینی هەندێك لە حیسابی ساڵ لە مامەند ئاوا دروست کردبوو.

ڕەحیم دەرویش ی کەلوڕی (کەلهوری) حیسابداریکی کوردستانی ئێران بووەو لە وێوە هاتووتە ناوچەی هەڵەبجەو حەمەی سلیمان ی وەلەدبەگی لە ساڵانی بیستەکان دا وەیا لە پێش بیستەکان لە (ڕەحیم)ەوە فێری حیسابداری بووە ناوی ئەم دووحیسابدارە لە ووتاری «بورجەکانی ساڵ»دا کە باسێك بووە لە باسەکانی ناملکەی «سرنجێك لە دەروازەی فولکلوری کوردی» کە نقابەی مامۆستایانی لە هەولێر ساڵی 1960دا دەریکردووە یا ساڵی دوایی ئەوە بە ڕاستی ئەم گوتارە زۆر گرنگە وەك شتێکی سەرەتایی، چونکە دوور نیە وەك ووتارێك یەکەم هنگاوێك بێ لە مەیدانی ئەستێرەناسی و کەشناسی لەنێو کوردەواریدا، خاوەنی ئەم ووتارە، کە ناوی خۆی نەنوسیوەو دەڵی سودم لە (حەمەی سلێمانی)و (مەلا قادری مەڵکەندی) وەرگرتووە ناوی (حیسابی گلەزەرد)ەو (حیسابی بای)شی هێناوە، ئەگەرچی بە تەقویمی شێخ حسنی ی گلەزەردەو بە تەقویم وەیا ڕوانگەی مەلا نەبی لە باری - نەزانیوە ودوای کە روونوسی ئەم باسەم لە کۆتایی دا بوو برای بەرێزو دڵسۆزی کەلەپوری کوردی کاك ئەکرەمی صالحی ڕەشە ئەم ووتارە بەئیستینساخی بۆ منی هێنا بۆ ئەوەی سودی لێ وەرگرم.

حیسابدارەکانی عەشیرەتی گەڵباخی لە ناوچەی سنە زۆر بەناوبانگ بوون لەو ساڵەی ئەم عەشیرەتە کوردە نیازی بوو ڕاپەڕی بەرامبەر زوڵم و زورداری ڕەزاشای ئێران حیسابدارەکان بەسەرۆکەکانی وەك ئەمینی نەغەو اجلال وقبیلەی عالەم گوتیان ئیمساڵ شەر نەکەن چونکە ئەم زستانە زۆر سارد دەبێ ئەوانیش باوەڕیان بە قسەکە کردو نیازی شەڕیان نەبو لەو زستانەدا بەڵام هێزی ڕەزاشا مەجالی نەدانێ و ناچاری شەڕی کردن و ئەوە بوو بە هۆی ئەوە کە لە سەرما گەلباخیەکان دووچاری کارەسات بین و ئەوانەی بەشداری ڕاپەڕینەکەشیان بون لە ساڵی (1937؟)دا وەك عەشیرەتی مەنمی و گەلاڵی و تیلەکۆ - تائیمرو بووەتە پەند زۆرکەسیان لە سەرماو لە نێو بەفردا مردن بەتایبەتی لە کێوی (تەورێزخاتون) تا سید باقری سەرکان کە چو بووە هندێکیان بهێنێ بۆ کوردستانی عیراق لە هەندێك دیهات بیان حەوێننەوە لەسەر داوای شێخ محمود کە گەلباخیەکان پەیوەندییان پێیەوە کردبوو سید باقرو شیخ محمودی برای لەگەڵ برێك لە گەلباخیەکان لە ڕێدا (میشیاو) لەسەر سنوری پێنجوین لە سەرما مردن وەك ئەم زانیانەمان لە بیرەوەریەکانی بەرێز مامۆستا عبدالقادری دەباغی سەقزی و مام توفیق محمودی سەرکان وەرگرتووە کە تومارمان کردووە.

(حسن گابەك)ی مەنگوڕی ی خەلکی ناوچەی قەلادزە کە لە ڕۆژی سێ شەمەی (1971/2/9)دا کۆچی دوایی کردووە دەتوانین بڵێین بەناوبانگترین حیسابداری ناوچەی سلیمانی بووە، لێرەدا ماوەمان نیە ئەو زانیاریەی دەربارەی ئەومان کو کردووە لە خەڵك و لە هەندێك لە خزمەکانی نیزیکیش - بنووسین.

(7) هەندێك لەو کەسانەی کە سودمان لێوەرگرتوون لە بارەی ئەستێرەناسی لە کوردەواری دا ئەم بەرێزانەن: مام مینە (محمد امین رسول) وززار باپیرو عبدالله زەر (عبدالله قادر) لە خەڵکی دێ (سلە)و ماموستا ملا عیسی فقی عزت مەلای دێ یەندزو کاك حاجی محمود کاك ڕەسول خەڵکی یەندز لەناو دەشتی

نێزیکی شاخی قەندیل.

ئومێدوارم بەدرێژی باسی حیسابی کوردەواری بکەین لە داهاتودا چی بەشێوەی ووتارو چی لەو کتێبەدا کە دەربارەی ساڵنامەو ڕوانگە کوردییەکان دادەنین وە ئەم باسەی ڕوانگەی گراوو باسی تەقویمی شێخ حسن گڵەزەردە لە مەوزوعەکانی ئەو کتیبەن.

(3) دەربارەی مەوزوعی کەلوەکان تەماشای ئەم سەرچاوانە بکە: میخائیل عبدالأحد/ الموسوعة الفلكية المبسطة چاپی بەغدا 1977، جلال امین/ مبادیء علم الهيئة، امین فهد/ المعجم الفلکي و شرح چغمینی، محمد رجب السامرائی/ علم الفلك عند العرب.

(4) دەربارەی سدید الدین محمود کوری عمر لە ساڵی 1237 ئـ = 1168زا کوچی دوایی کردوە گوتارێکمان پلاو کردوە لە رۆژنامەی العراق ژمارەی رۆژی 1982/10/21.

(5) باسی ژیانی «عبدالله بن یوسف بن ابوبکر الاسطرلابی» نوسراوە لەلایی ابن حجر العسقلانی‌یەوە لە (الدرر الکامنة بەرگی 2ل 308 و لەلای (ابن کثیر)ەوە ل (البداية والنهاية)ب 4 ل 168.

(6) میخائیل عبدالاحد/ الموسوعة الفلكية المبسطة ل 655 ـ 656 جلال امین زریق/ مبادیء علم الهيئة ل 23، 242.

(7) خەلخالی/ شرح الدائرة الهندية في معرفة سمت القبلة/ ل 40 ـ 52 لێکولینی درید عبدالقادر 1981.

(8) تەماشای ئەم کتێبە بکە: ج.1. اسلمنت، بهاء الله و دەوری نوێ ل 218 وەرگیرانی محمود جودت چاپی 1933.

(9) بەرێز کاك نافع کاکە ووتارێکی بەنرخی دەربارەی مێژووی ساڵنامەی کوردی بلاوکردووە لە کاروان ژمارە 17و لە ژمارەیەکی تریدا زۆر زانیاری لە ووتارەکەدا هەیە رێکە لەگەڵ ساڵنامەی کور پاشا، بەلاّم نازانم بۆچی ئیشارەتی نەکردوە بۆ ئەم ساڵنامەیە کە چەند جارێکی تر چاپ کراوە کە تا ئەو کاتە گرنگترین سەرچاوەی کوردییە لەم مەیدانەدا.

(10) میخائیل عبدالأحد بەدرێژی باسی کشانەوەی وەرزەکانی کردووە لە کتێبە بەنرخەکەیدا الموسوعة الفلكية ل 170 ـ 171.

## سەرچاوەکان


1 ـ ابو الحسن عبدالرحمن بن عمر الرازی/ صورة الكواكب الثمانية والأربعين طبع حيدر آباد 1954.

2 ـ ایلیا برشینایا/ کتاب الأزمنة بە عەرەبی‌و سوریانی دانەی دەسنووسی نامەخانە موزەخانەی بریتانی (7197).

3 ـ ابن رەزازی جزیری/ الجامع بين العلم والعمل في صناعة الحيل دانەی وینەکراوی معهد مخطوطات جامعة الدول العربية لە قاهرە کە لە سەردانە دەسنوسەی (أيا صوفيا) لە استنبول وینە کراوە.

4 ـ شرح چغمینی چاپی (1911؟).

5 ـ حسین الخلخالی/ شرح الدائرة الهندية في معرفة سمت القبلة توژینەوەی درید عبدالقادر 1980.

6 ـ ابن حجر العسقلانی/ الدرر الكامنة.

7 ـ ابن کثیر/ البداية والنهاية.

8 ـ رۆژنامەی رەنجوری (عمر کوری خالد بەگ) دەسنووس.

9 ـ میخائیل عبدالاحد/ الموسوعة الفلكية المبسطة 1977.

9 ـ امین فهد/ المعجم الفلكي.

10 ـ جلال امین زریق/ مبادیء علم الهيئة.

11 ـ محمد رجب السامرائی/ علم الفلك عند العرب 1984.

12 ـ سەرنجیك لە دەروازە فولکلوری کوردی/ نقابة ماموستایانی کورد دەریان کردوە دەوری ساڵی 1960.

13 ـ کاروان ژمارە 17: «مێژووی ساڵنامەی کوردی» هی نافع کاکە.

14 ـ اطلس المواقع الأثرية في العراق 1979.

15 ـ طه باقر وفؤاد سفر/ المرشد الى مواطن الآثار والحضارة: الرحلة الخامسة.

16 ـ ساڵنامەی کۆرپاشا ـ ساڵی 1974.

# ل دیڤ چونەك ل سەر یەكەمین رۆژناما كوردی

● حجی جعفر ●



رۆژنا ١

حجی كاغدێ ڤی دیكە
دڤی دیكێ مصری سر
ناڤێ خوییێ ڤی جریدەیێ
لاوێ بدرخان پاشا
مقداد مدحت بكی
هر جار دوهزار جریدەیا
بی پرە ...
كردستانێ دەبلین ... دیكم
پازدە روژا جاركی تبت
تقسیماندن

سالا ئێكێ

عدد ١

كردستان

١٣١٥

* كردلری ایقاظ و تحصیل صنایعه تشویق ایچون شمدیلك
* اون بش گونده بر نشر اولنور كردجه غزتەدر

عنوان
مصرده «كردستان» غزتەسی
صاحب و محرری بدرخان
پاشا زاده
* مقداد مدحت

* روژا پنجشنی ده ٣٠ ذو القعده سنه ١٣١٥ پنجشنبه فی ٩ نیسان سنه ١٣١٤

دەمێ رۆژنـامـا (كـوردسـتـانێ 1898)، ل قاهیـره دەردچـوو، رۆژنـامـا «البرهان»، «القاهرة»، «الأهرام» ژی ب پشتگیـریـیـا سلطـان عبـدالحمیـد دەردچـوون و بەرهەنگارییا رۆژناما «الوطن»، «الزمان»، «مرآة الشرق»، «النیـل»، «المقطم» دكر، چونكی ڤێ دەستـەكا دوماهیێ عەیب و كێماسیێت سولطان عبدالحمید دیار دكرن، دیسان رۆژنانا «اجتهاد» كو ب ناڤێ «توركیێت لاو» دەردچو دگەل رۆژنـامـێت ئەرمنی مل ب ملی ڤەنـابـوون دژی سولطان

عبدالحمیدو دەستەکا وێ.[1]

دڤێ گەرمیاتیێ‌دا، ڕۆژنامەگەرییا تورکی د دراڤەکێ تەنگەو ئالۆزدا بو، سولطان عبدالحمیدو نوکەرێت خو ب هەمی ڕەنگا دوژمناتییا ڕۆژنامە ـ گەرییا پاك و پەیڤا ڕەسەن دکر، گەلەك ژ پەیڤا پاقژو ڕاست ترسیان، هەتا ڕادەیەکێ هندەك پەیڤ ل سەر لاپەرێت ڕۆژناما هاتنە قەدەغەکرن، وەك پەیڤا:

(دیموقراطیەت، هەڤ پشکی، سەربەستی.. هتد) گەلەك جاران ژی دەرگەهێ هندەك ڕۆژناما ل سەر نڤیسینەکا چونەیی دهاتە گرتن، ژ لایەکێ دیڤە زولم و زورییا سولطان عبدالحمید هند دژوارو تیژ بوو کەسێ ئەو هیڤی نەما بو داخوازا دەرئێخستنا ڕۆژنامەیەکێ بو خو بکەت.[2] د دەراڤەکێ هوٚیێ تەنگەو یێ سەرویەردا، ب زەحمەت ڕۆژنامەیەکا کوردی ب شێت هیڤیێ و داخوازێت میللەتێ خو ب نڤیسیت و بگەهینتە خەلکێ، لەوما دلسوزێت پەیڤا کوردی بیرو هزرێت خو کرن، کو ڕۆژنامەیەکا کوردی ژ دەرڤەی وەلاتی دەربێخن.

دڤیا ئەم وێ ژی بزانین کو بەری ڕۆژناما کوردستانێ پەیدا ببیت، ڕۆژنامەگەرییا ئەرمنی و یونانی و تورکی هەبو، هەر ل سالا (1942) جوهیا چاپخانە کێشانە دناڤ ئیمبراطوریەتا تورکی‌دا، پاشی ل سالا (1567) ئەرمنا دەست ب ڕۆژناگەریێ کر، پاشی ل سالا (1627) یونانیا.

یەکەمین چاپخانە ب زمانێ تورکی هاتیە وەلاتی سالا (1726)ێ بو، لێ ب ڕاست و دروستی ڕۆژنامەگەرییا تورکی ل سالا (1831) دەست پێ دکەت، ل سەر دەمێ سولطان مەحمودێ دوویێ (1808).[3]

ب ڕاستی ئەڤ پێنگاڤا ڕۆژنامەگەرییا ئەرمنی و یونانی و تورکی هاڤێتی، هەتا ڕادەیەکێ کار کر بو سەر بیرو هزرێت ڕوشنبیرێت کورد، کو ئەو ژی بیرا هندێ بکەن ڕۆژنامەیەکێ ب زمانێ میللەتێ خو دەربێخن، لێ هەر وەکی مە بەری نهو گوتی، دەرئێخستنا ڕۆژنامەیەکا کوردی ل کورد، ستانێ تشتەك گران بو، لەوما جوتە برایێت بەدرخانی خودێ ژ هەر دوان ڕازی بت، بەرێ خو دانە وەلاتێ میسرێ چونکی:

1 ـ میسر نزیکترین وەلاتە بو کوردستانێ، کو بشێت خزمەتەکێ بکەت، ڕاستە لوبنان نزیك ترە بەلێ ئەو سەرویەرێ ل میسرێ ب دەست کوردان دکەت، ل لوبنان نەبو.

2 ـ میسر پێشکەڤیترین وەلاتە، لە بارەی ڕوٚشنبیری لە وەلاتی عەرەب دا.

3 ـ هەر ل سەر دەمێ ناپلیون چاپخانەو شارستانیەتا ئەوروپی کار ل میسرێ کر بو.

4 ـ خالا ژ هەمیا گرنگ تر ئەو بو، کو دەرگەهـ بو هەمی «معارضا» تورکی ڤەکری بو دژی سولطان عبدالحمید، وەکو ئەرمنییا و پارتا (اتحاد وتەرقی)، کو هەر ئێکی ڕۆژناما خو هەبو دژی سولطانی، لەورا کوردان ژی بەرێ خو دابو وێ دەرێ داکو بکارن خزمەتا ڕۆژنامەگەرییا کوردیو میللەتێ کورد بکەن.[4]

ل سالا (1898) ڕوٚژا (22)ێ نیسانێ ل باژێرێ قاهیرە دو برایێت دلسوز خو گوری کەرێت پەیڤا کوردیو زمانێ کوردی شیان بو جارا ئێکێ د مێژوویا میللەتێ کورددا، ب زمانێ کوردی ڕۆژنامەیەکێ بو کوردان ل بن ناڤ و نیشانێت «کوردستان» ب چوار لاپەرا ل چاپخانا (الهلال) دەربێخن.

ب ڤێ پێنگاڤێ «مقداد مدحت بەدرخان»

یەکەمین نەمرە ل بیبلوگرافیا ڕۆژنامەگەرییا کوردی وەرگرت، واتا مقداد مدحت بەدرخان ب یەکەمین ڕۆژنامەنڤیسێ کورد دێتە ژمارتن ل دیڤرا ناڤێ خودێ ژێ ڕازی عبدالرحمن پاشا بەدرخان نەمرا دوویێ وەردگریت.[5]

ڕوٚژا «22» نیسانێ ڕوٚژەکا گەشە د ڕۆژنامەگەرییا کوردیدا، پێنگاڤەك هێژاو سەرکەتیە دبیرو هزرێت

ڕەوشـەنبیـرێت کوردىدا، لەومـا ئەڤ ڕۆژە بویـە جەژنـا ڕۆژنـامـەگـەرییـا کوردیو هەر سال ڤی دەمـی ڕۆژنـامـەنڤیسێت کورد ب بیـرهـاتنـا ژ دایك بونـا ڤێ ڕۆژنـامێ ڤەلـەمـا تیـژ دکـەن و دکـەڤنـە ڤەکۆلین و بشکنینا ڕۆژنامەگەرییا کوردی.

ئەڤ ڕۆژنـامـەیـە ب چوار لاپەرا دەردکەفت ب قەوارێ (25,50 × 32,50سم) ب شێـوا کورمـانجێت بوتـان سەرنڤیسەڤانێت ڤێ ڕۆژنامێ ژی هەر ژ خەلکێ بوتانن و بنەمالا میر بەدرخانن، ئەڤ بنەمالە ژ عەشیرەتا خالتیانن، هەر ژ کەڤن دا میراتیا کوردان کریەو ڤەلەم ب دەستەکیو تڤـەنـگ ب دەستێ دی گرتیـە، ژ بۆ کوردان را ڕاست و دروست بوینە، جان و مالێ خو گۆری کوردو کوردستانێ کرینە.

ڤێ بنەمالێ بەری سالا (1514) هەتا سالا (1847) سەرۆکاتیا ئیمارەتا بوتان کریە.

یەکەمین میر ناڤێ وی (عەلی بەگ) بویە، دوماهی میر ناڤێ وی (بـەدرخـان پاشـا) بویـە، کو خودانێ شۆرشـا (1842، 1847) بویەو (90) کوڕو نەڤی ل دیڤ خو هێـلاینـە،[6] هەمی خودان ڤەلـەم و ڕوتبـەو کەنکـەنێت دەولەتێ بوینە ژوانا:

(ئەمین عالی بەدرخان، عبدالرزاق بەدرخان، جەلادت بەدرخـان، کامیـران بەدرخـان، مقـداد مدحت بەدرخان، عبدالرحمن بەدرخان... هتد).

مێجر نوئێل دبێژیت:

(کـوڕەکـانـی ئەمیـن عالی بەدرخـان لە ئەستنبـول گەورەبـوون و پێـداویستی ژیـانیـا لە ڕۆژنـامـە ـ نووسی دەست دەهێنا[7] پاشی دبێژیت؛

(ڕۆژنـامـەی سەربـەستی)و چاپەمەنیەکانی تری (یانەی کوردی) لە ئەستنبول هەر لە لایەن ئەوانەوە ـ بەدرخانیەکان ـ سەرپـەرشتیو ئاراستـەی سیـاسی دەکـرێت،....)[8]

یاریـدەرێ سەرنـڤیسـێ ڤێ ڕۆژنـامێ خودێ ژێ رازی جەلادت بەدرخان بو.

هێـژا (ثـریـا بەدرخان)ی ژی ڕۆژنامەنڤیسێ ل میسرێ کریە، بەلێ نە هاتیە زانین کو چ ڕۆژنامە دنڤیسی، ژبلی هنـدێ کو خودێ ژێ رازی خودانـێ کتێـبـا «الـقضیـة الکردیة»یە، یاکو بناڤێ دکتور بلەچ شێرکویی دەرئێخستی.

پروفیـسـور کامیـران بەدرخـان و جەلادت بەدرخـان ل سالێت چلان گوڤارا (ڕوناهیو هاوارو ستێرو ڕۆژانو) دەردێخستن.

خو مقداد مدحت بەدرخان و برایێ خو عبدالرحمن پاشا سەرکێشێت ڕۆژنامەگەرییا کوردینە، چونکی بۆ جارا ئێکێ د مێژوویا میللەتێ کورددا (22)ێ نیسانێ سالا (1898) ڕۆژنامەیەکا کوردی ژ دەهمەنا دایکا خو کەفت.

هێشتـا ڕۆژنـامـەگـەرییا کوردی رابیە سەر پیاو نە رابی کەفتـە شەرگـەهێ شەڕەنیخێ دگـەل سولطـان عبـدالحمید ورژیما وییا پاشکەفتی.

هێژاو خودێ ژێ رازی مقداد مدحت بەدرخان، سەر پەرشتیا ژمارا ئێکێ، هەتا ژمارا پێنجێ کریە، پاشی پشتی چویە بەر دلوڤانیا خودێ برایێ وی هێژا عبدالرحمن پاشا بەدرخان جهێ وی گرتیە.

ڤان هەر دۆ برا گەلەك سەر ئێش و نەخوشی ب دیڤ ڤێ ڕۆژمـامێ ڤـە دیتینـە سولطـان عبـدالحمیـدو نوکـەرێت خۆ تەخسیـری نە دکـر بۆ گرتن و ئازار دانـا ڤان هەر دۆ برا، چونکی دوژمنێ کوردو پەیڤا کوردی بوویە... گەلەك جارا داخـواز ژ (خـدیـو)ێ میسـرێ کریـە کو مقـداد مدحت و عبـدالـرحمن پاشـای بگـریت و بۆ وی بنێرتە ئەستنبولێ..

لەوما دێ بینین ژمارە (1 ـ 5)ل میسرێ دەرچوویە، ژمارە (6 ـ 19) ل جنێف، ژمارە (20 ـ 23) دۆبارە ل قاهیرە، ژمارە (24) ل لندن، ژمارە (25 ـ 29) ل فولکستون، ژمارە (30 ـ 31) دۆبارە ل جنێف دەرچوویە.

ئەڤ گەریان و ڤەگوهازتنا هە ژ سالا 1898 ـ 1902

كێشا و (31) ژمارە ژێ دەرئێخستن وەكو ژ ناڤەرۆكا ڤێ ڕۆژناموێ دەردكەڤیت، ئارمانجا دەرچوونا وێ هوشیار كرنا میللەتێ كورد بویە، خزمەت كرنا ئەدەب و پەیڤا كوردی بویە.

ڕۆشنبیرو بیرروناكێت كورد هەست ب هندێ كربو، كو میللەتێ بێ ڕۆژنامە وەك مرۆڤێ لالە نكاریت هیڤی و داخوازێت خو بگەهینیت خەلكێ.

لەوما چاكترین ڕێ بۆ هۆشیار كرنا میللەتێت بن دەست دەرئێخستنا ڕۆژنامایە.

ب راستی ڕۆژناما كوردستانێ دەورەكێ مەزن و بەركەتی د مەیدانا خەبات و بزاڤێدا كریە ژ بۆ بەرژەوەندیا میللەتێ كورد.

نهۆ مەزانی ئارمانج ژ دەرئێخستنا ڕۆژناما كوردستانێ چ بویەو چەند ژمارە ژێ دەركەڤتن و ل كیرێ، بەلێ یا مە بڤێت بزانین كا چەوا دگەیشتە خاكێ كوردستانێ؟! خویایە كو دەرچوونا ڤێ ڕۆژنامێ ل قاهیرە ژ بۆ كوردێت كوردستانێ بویە لەوما پێتڤییە ئەڤ ڕۆژنامەیە بگەهیتە خاكێ كوردستانێ، ئەگینا دەرچوونا وێ بێ قازانج و مفایە، ب راستی ژی گەهاندنا ڕۆژنامەكا كوردی دژی سولطان عبدالحمید بیت و داخوازكەرا ماڤێ كوردان بیت ب ساناهی نینە كو بگەهیتە ناڤ دەستێت خوێندەوارێ كورد ل كوردستانێ، ئەڤە ژ لایەكیڤە، ژ لایەكێ دیڤە هاتن و چوون دوی دەمێدا وەكو نهۆ پێشكەفتیو ساناهی نە بویە لەوما ب درەنگی ئەڤ ڕۆژنامەیە دگەیشتە دەستێ خوێندەوارێ كورد ل كوردستانێ، لێ هەر چەوا بیت و ب چی حالێ بیت چ زوو چ درەنگ «كوردستان» دگەیشتە كوردستانێ، چونكی ژ وان نامەو نڤیسینا دیار دبیت كو ژ دیاربكرو ئەدەنەو موسلێو سولیمانیێ، ژێرا شاندین و وێ ژی بەلاڤەكرین.

بۆ هندێ كو ئەڤ ڕۆژنامە بگەهتە دەستێ خوێندەوارێ كورد، سەرنڤیسەڤانێت وێ پەنا بریە بەر سەد حیل وحەوالا بۆ نموونە ڤێ ڕۆژنامێو ڕۆژنامێت تر بێت كو قەدەغە ل ئیمپراطوریەتا توركی، دا ئێخنە بن هندەك گوڤارو ڕۆژنامێت دی یێت كو نە قەدەغەو وینێ بسولطانی ل سەر[9]. . . . . بڤی حالی ئەڤ ڕۆژنامە بەلاڤەبویە هەتا «31» ژمارە ژێ دەرچووینە و سالا 1902 ڕاوەستایە، ئەمما بۆچی ڕاوەستا؟ هندەك دبێژن، ژ بەر دەست تەنگیا عبدالرحمن پاشای بویە، هندەك ژی دبێژن سولطان عبدالحمید ب سیاسەتا خو كاری عبدالرحمن پاشای بكێشیتە بن پەرێ خو،[10] لێ ئەگەرا ئێكێ ڕاسترە ژ یا دووێ.

یێت كو ل سەر ڤێ ڕۆژنامێ ئاخفتی بۆ جارا ئێكێ ژ بیانیان (ئەدموندس، م بی لازەیڤ، مینورسكی، گەردلیڤسكی) بویە، بگرە هندەك ژی تێدا هاویەش بوینە وەك زانایێ هێژا، (هارتمان)، دبیت پارستنا ژمارێت كوردستانێ یێت كو ل كتێبخانا ماربورگ ل ئەلمانیا هاتینە پارستن و هەلگرتن، هەر یێت هارتمان بن.[11]

ژ عەرەبان، دكتور عبدالعزیز سلیمان نوار، شاكر خصباك، ل سەر ئاخفتینە، ژ كوردان دكتور بلەچ شێركو، محمد عەلی عونی، جەلادت بەدرخان، محمد ئەمین زەكی، علاءالدین سجادی، دكتور عزالدین مستەفا رەسول، دكتور كەمال فوئاد، دكتور كەمال مەزهەر، ل سەر ئاخفتینە.

ئەڤ ڕۆژنامە ل چاپخانا هیلال و كوردستان و جمعیەتا تفاق و قەنجیا موسلمانا هاتیە چاپ كرن، لەوما ئەم دكارین بێژین یەكەمین چاپخانا كوردی چاپخانا (كوردستانێ) بویە، یا كو ڕۆژناما كوردستانێ سالا 1898 لێ هاتیە چاپ كرن، نەكو چاپخانا زارێ كرمانجیە یاكو مێژووڤانێ هێژا (حسین حزنی موكریانی) پشتی جەنگا جیهانا ئێكێ ژ ئەلمانیا بۆ حەلب و ڕاوندوز هینای.

هندەك ژ ڕۆشنبیرێت كورد دبێژن:

ئەو چاپخانا ڕۆژناما كوردستانێ لێ هاتیە چاپ كرن بناڤێ «كوردستان» چاپخانەك وەهمی بویە، داكو سەرێ میری ب ئالۆزینیت!!

ئەز دبێژم نەء... چاپخانەك راستەقینە بویە چونكی:

1 ـ هەكـە چاپخـانـا كوردستـانێ وەهمی بیت، دڤیـا چاپخـانـا هلال و جڤـانـا موسلمـانا ژی وەهمی بیت، ئەو چاپخـانێت رۆژ نامێت؛ «الـوطن»، «الـزمـان»، «مـرأة الـشـرق»، «النيـل» «المقطم»، ژی وەهمی بن چونكی هەمی دژی سلطـان عبـدالحمیـد بون، ڤێجا بۆچی ئەڤە هەمی وەهمی نەبن بەس كوردستان وەهمی بیت! یا زانا ئەوە ژی كو زمانێ ڤان دژی سلطان عبدالحمید دژوارترو درێژتر بو ژ رۆژناما كوردستانێ.

2 ـ «قانون المطبوعات» ڤێ ئێكێ قەبول ناكەت، كو چاپەمەنیەك ل چاپخانەكێ چاپ بیت بناڤێ ئێكا وەهمی، یان خەیـالی، چونكی ب سانـاهی ئەو كارە دێ ئاشكـرا بیت، ل قاهیـرە هەمی بلا «10» چاپخـانـا دوی دەمیدا هەبن، ئایا گەلەك ب زەحمەتە حكومەتا ئۆسمانی بزانیت كا رۆژناما كوردستانێ ل كیش هەر دەها چاپ بویە؟

3 ـ دەرچـونـا كوردستـانێ نەهینی نەبو، هەتا چاپخانا وێ نەهینی بیت، بەلكو ب ئاشكرا ناڤ و نیشانێت خو نڤیسینە.

4 ـ دەمێ كوردستـان دژی سلطـان عبـدالحمیـد، رۆژنـامێت دن ژی هەبـون دژی سلطـان عبـدالحمیـد، كوهێشتـا تیـژتـرو دژوارتـر بون، ئایـا ئەڤ رۆژنامە ژی ل چاپخانێت وەهمی د هاتنە چاپ كرن؟!

5 ـ هەتـا رادەیـەكـا باش میسـرێ سەربـەخـویـا خۆ وەلگرتبو، دەستێ سلطان عبدالحمید ب زەحمەت د گەیشتێ.

6 ـ رژێمـا ئینـگلیـزی ل وی دەمی ل میسـرێ بۆ بەرژەونـدیـا خو، دەرگـەهـ بۆ «معارضا» توركی ڤەكر بو ب ئاشكرایی هاریكاریا ڤێ معارضێ دكر.

ژ لایێ زمانێ كوردیڤە. ئەڤ رۆژنامە ب زارێ مەلایێ جزیـری دەرچـویـەو ب زمانەكێ پاك و ڤەشەنگ لاپەرێت كوردستـانێ نەخشـانـدینـەو ب تیپێت عەرەبیو ب رێنڤیسا فارسی هاتیە نڤیسین.

یەعنی ل شوینا (و، سە، ی) بورو سەرو ژێر بۆ دانانە بۆ نمونە:

«خودێ» نڤیسهیە «خُدێ»، «كرین» نڤیسییە «كرِن»، «لكودەرێ» نڤیسییە «لكودَرێ».

دیسان تێیا همزە «ك» بكار نە هینایە، وەك:

شوینـا «ئـاڤ» نڤیسییـە «آڤ»، «ئـەز» نڤیسییە «از»، تیـپـێـت كوردی وەك «پ»، «ڤ»، «گ»، «ژ»، «چ» بكارهینانینە بۆ نمونە:

ژمـارە ـ 1 ـ ل3 «ژاپـونیـا»، «مـروڤـان»، «نڤنگین»، «ژمـل»، «بـاژێـر» لێ گەلـەك جارا تیـا عەرەبیا «ظ» ل شوینا «ژ» یا كوردی بكارهینایە، وەك:

ژمارە ـ 1 ـ ل3 «ظارویێن خوە»، ل شوینا «زارویێن خوە» نڤیسییە، «دظانن» ل شوینا «دزانن» نڤیسییە.

دیـسـان ل شویـنـا «ت» یا كوردی «ط» یا عەرەبی بكـارهینـایـە، وەك: «طوپ» ل شوینا «توپ»، «بوطان» ل شوینا «بوتان».

هندە جارا ل شوینا «ڤ»، «و» دانایە، وەك:

ژمارە ـ 1 ـ ل2، ل شوینا «دوو هەیڤا» نڤیسییە «دوو هیوا». تیا «ل» جودا نە نڤیسییە، بۆ نمونە:

ژمـارە ـ 1 ـ ل3 «لمصـرێ» شوینـا «ل مصـرێ»، «لمصحفا شریفدا» شوینا «ل مصحەفا شریفدا نڤیسییە.

ئامرازێت كۆ یێت كو ڤێ رۆژنامێ بكارهینایێن ئامرازێ «ان» مشە تێدا هاتیە پشتی «ن» ژێ ڤەكری، «دێن ژی د حالەتێ ئیضافێدا بكارهینایە، وەك:

ژمارە ـ 1 ـ ل3 «دە جارا»، «طوپ و تڤنگا»، «كُردا» بۆ «ێن»، وەك:

«باژێرین خوە»، «علمایێن كُردا»، ئامرازێ «ێد» تێدا نە هاتیە، كو ل بایزیدو هەكاریا بكاردێت.

ئامرازێت پێوەندی وەك، «لە، بە» كو نهۆ ل كرمانجیا ژێری بكارتێن مشە بكار هاتینە.

وەكی هەر نڤیسینـەكـا كلاسیكی لاپەرێت ڤێ رۆژنامێ دپرن ژ پەیڤێت عەرەبی، بۆ نمونە:

ژماره ـ 1 ـ ل3 «گەلی عولەماو میرو ئاغایێن کوردا هون هەمی ئەصل و فەصلێ من دزانن، جدێ من حضرەت. . . ».

---

ژ لایێ مێژوویێڤە، ل دیڤ چاخ و دەمێ خۆ ڤێ رۆژنامێ تەخسیری نە کریە، هەتا ئەم دکارین بێژین ژێدەرەکا گرنگە بۆ نڤیسەڤان و مێژووڤانێت کورد.

بابەتێت مێژوویێ یێت کو د ڤێ رۆژنامێدا هاتین گەلەکن ژ وانا، بابەتەك جوان و درێژ، سێ جارا هاتیە ل سەر (صلاح الدین الایوبی)و بنەمالا وی.

دیسان گەلەك جاران ل سەر میرێت جزیرا بوتان ئاخفتیەو ناڤێت وان برینەو توخمێ وان دیار کریە، لێ بە داخەوە گەلەك جارا ئارمانج نە هەنگاڤتیە بۆ نمونە دبێژیت:

(گەلی عولماو میرو ئاغایێن کوردا، هوٚن هەمی اصل و نەسلێ من دزانن، جدێ من حضرەت (خالد ابن ولیدە؟) عەشیرا مە بوطانن شوهرتا نەسلا مە عەزیزانن. . . ). [12]

ب راست نهۆ زانا دیار کریە کو خالد کورێ ولید چ کەسی ب پشت خوڤە نە هێلایە، واتا ئوجاخ کۆر بویە، لەوما مێژووڤان دبێژن ئەڤ بنەمالا بەدرخانیان نا گەهتە خالدێ کورێ ولید ءلکو، دگەهنە عەشیرەتا (خالتیا ـ خولدیا). [13] هەروەسا دۆ جارا ل سەر کوشتنا ئەرمنیا و چەتێت سولطان عبدالحمید ئاخفتیە، د ڤان هەر دۆ گوتارادا دیار کریە بۆ هەمی جیهانێ کو هەرچەندە هندەك کوردان دەست دگەل ڤێ کوشتنێدا هەبویە، لێ کورد چ جارا نە بوینە دوژمنێت ئەرمنیاو نابن دوژمنێت وان، لەوما کورد ب ڤێ کریارێ بەرپرسیار نینن هەروەسا هێرشا دبەتە سەر سولطان عبدالحمیدو چەتێت وی، ئو گازی کوردان دکەت کو دەستێ هاریکاریێ ژ ئەرمنارا درێژ کەن.

هاوسۆزیا ڤێ رۆژنامێ گەیشتە هندێ هەتا عبدالرحمن پاشای حاشایی. ل کورێ خو بکەت، چونکی پشداری د کوشتنا ئەرمنی‌یادا کربو.

ل سەر ڤێ کوشتنێ مێجر نوئێل دبێژیت:

(ناتوانین چاو لەو راستی‌یە، بپوشین کە ژمارەك لە کوردەکان بەشداری‌یان لە کوشتاری ئەرمەنیەکاندا کردوە، بەلام (راستی‌یەکەرووتی) تریش هەیە کە ئەو کوردانە کەمن، ئەو کردنەوانەش لەواناوە دور نین، بەلام وەرنە تەماشای دەولەتێکی گەورە بکەن کە لێپرساوی ئیش و کاری ولاتێك بێ‌و دەسەلاتی دین و دونیا بێ بۆ خۆی زەوت کردبێ، شورەیی نیە بۆ ئەو دەولەتە ئوتوکراتی‌و ستەمکارە سەربرین و قەسابخانەی ئەرمەنیەکان بکات بە شتیکی ئاسایی‌و نەك هەر ئەمەش بەلکو بە ئەرکێکی پیرۆزی دابنێت!! لە کۆمەلگایەکی خێلەکی دواکەتودا کە زۆربەی کوێرو نەخوێندەوار بێت، فەرمانێکی رەسمی وەها چۆن ئەنجام ئەدرێت، وەهموو شتێك چۆن ئاسایی نابێت) [14]،

پاشی دبێژیت:

(ئەو کوردانەی کە بەشدار بون لە کوشتاری ئەرمنیەکان لە دێر زەمانەوە هەست ناکەن کە کوردن و دەماری نەتەوایەتیان خەساوە. . . ). [15]

هۆسا بۆ مە روون دبیت کو کورد بێ‌گونەهن دڤێ قەسابخانێدا چونکی:

أ ـ سولطان عبدالحمید ل پشت ڤێ کوشتارێ راوەستا بو، هەر ئەو بو ئەڤ قویحەتە راست کری، داکو جهێ کورسیکا خو قایم بکەت و بێژتە ئەوریا تەماشا کەن، کوردن وەکو وەحشا ئەرمنا دکوژن!!! [16]

ب ـ کوردێت د ڤێ قەسبخانێدا بەشدار دبون، چەتێت سولطان عبدالحمید بون و دەمارا کوردینیێ ژ وان کێم بو، ژ بەر هەر ئەگەرەکێ بیت.

جـ ـ کورد هەمی ل پشتا ئەرمنا راوەستان و ڤەحەواندن و مل ب ملیڤە شەر د گەل تورکا دکرن، هەروەسا گەلەك ئازار ب دەستێ تورکان دیتن سەخمەراتی پارستنا ئەرمنا مێجرنوئێل دبێژیت:

(له هەمان دێدا ئەرمەنیەکی قژ خاوی له بلەبانی زمان لوسمان بینی، کابرا کەوتە ستایش و پیاهەلدانی کوردان.

چونکە ئەوان له چنگی تورکەکان رزگاریان کرد بو، نەیان هێشتبو سەری ببرن، ناوی «گریگور پار لاکیام» بوو، له مەرعەشەوە هاتبووە ئەوێ، حەسەن ئاغای باوکی «ئاسەق»کە یەکێك بوە له سەرۆکە گەورەکانی سینا میللی، له کوشتاری سالی 1895دا رزگاری کرد بوو..). [17]

دیسان مارك سایکی دبێژیت:

(تاپۆ ئاغا بە دوور و درێژی بۆی باسی کردین کە چۆن هۆزەکە ل پەنای ئەرمەنیەکانی داوەو له چنگی مردن رزگاری کر بون.. کە ئەفسەرو کاربەدەستە تورکەکان، هەلوێستی خانەدانیو مروڤانەی کوردیان زانی بەرامبەری.

ئەرمەنییەکان بە پەلە فەرمانیان دەر کرد کە ئەرمەنیەکان و کوردەکانیشی سزا بدرێن!!). [18]

دیسان لەسەر پێلانەکا دەولەتی نڤیسیە دبێژیت:

(دەولەتێن مەزن دڤێت کوردستانێ بدەن ئەرمنیا..)

دیارە ئەڤ پیلانە جهێ مەترسیا کوردان بویە لەوما شاعیرێ کورد حاجی قادر دەنگی خۆ بلند کریەو دبێژیت:

**خاکی جزیرو بۆتان یەعنی وەلاتێ کوردان**

**سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بە ئەرمەنستان** [19]

.

بێگومان کورد دژی هندێ نە بوینە کو ئەرمەن ببنە دەولەت، بەلکو دژی هندێ بوینە کو کوردستان ببت پارچەیەك ژ ڤێ دەولەتێ، لەوما کوردا ب هۆشیاریو گومان بەرێ خو دایە ڤێ دەولەتێ چونکیدا ل شەرگەهێ کوردستانێ هێتە دانن.

مێجرنوئێل دبێژیت:

(چاڤێ مە ب ئێکێ ئەرمن کەت ئەم دگەل ئاخفتین بە توندی نری:

(کورد کییە؟ ئینگلیز کییە؟ تەنها ئەرمەنەو ئەرمن، له دوا رۆژێکی نزیکدا دەبێتە گەورەی ئەم وولاتە!!). [20]

پاشی دبێژیت:

(ئەرمنییەکان زیرەکانە بلاویان دەکردوە، کە پێویستە هەموو پەیمان و پەیوەندەیەکی نێو دەولەتان، لەسەر ئەم بناغەیە دابنرێت کە دەولەتێکی ئەرمنی بنیات بنرێت). [21]

ژ بلی دەنگێ و باسێت کوردو کوردستانێ هەوال و دەنگێ وباسێت ژ دەرڤەی کوردستانێ ژی بەلاڤە کرینە، وەك دەنگێ وباسێت شەرێ سودانێ و میسرێ، شەرێ ئەمریکاو ئەسپانیا، شەرێ یونان و تورکان...

هەروەسا گوتارەك ل سەر دەولەتا ئەمەوی ل ئەندلسێ بەلاڤەکریەو گەلەك تشتێت تر....

---

ژ لایێ ئەدەبێ کوردیڤە، هەر ژ ژمارا دۆوێڤە دەست هاڤێتیە بەلاڤەکرنا شاکارێ خانی (مەم و زین)ێ هەروەسا مێژووا مرنا شاعیرێ مەزن (حاجی قادرێ کۆیی) ب راستی نڤیسیە کو سالا (1897)یە.

بەری سالا 1972، یان بەری دیتنا کوردستانێ کەسێ ژ نڤیسەڤان و مێژووڤانێت کورد ب دروستی نە دزانی کا (حاجی قادر) کەنگی مریە، هندەکا ب سالا 1895 ـ 1894 ـ 1896دا قەلەم، لێ بە داخەوە هەتا کو نهۆ ژی هندەك ب دروستی نانڤیسین!! [22]

دەربارا ڤێ گوتنێ کوردستانێ دژمارا (3)دا نڤیسییە:

(عالمەك ژ سورا هەبی سالا دی وەفات کر، رەحمەتا خودێ لێبە، خودێ گوهێن وی بغفرینە، ناڤێ وی (حاجی عبدالقادر)بی، ئەڤ مروڤە د ساخیا خوەدا گەلەك خەبتی دەر حەقا عەلمانەدنا عیلم و مەعریفتێرا، گەلەك بەیت و ئەشعارێن کرمانجی د نڤیسی، رێدکر وەلاتێ خوە سورا، عەزمانێ وی، عزمانێ سورایە، لەوما کورد حەمی ڤی عەزمانی نزانن، پشتا کتێبا مەم و زینێدا بخەت دەستێ خوە هندە بەیت نڤیسینە تبرکا من ئەو ئەبیات لڤێ جریدەیێدا نڤیسین وەکی بدقەت بێ خوندن مەعنا وان خوش تێت فەهم کرن؛

زەمانە ڕەسمی جارانی نەماوە
چراغی ناظم و مونشی کوژاوە
لە دەوری ئیمە ڕومان و جەریدە
ئەگەرچی مەقصەدە زانین باوە
ئەمان قەدری بزانن ئەم کتێبە
لەو دونیا ئیستەکێ هەمتاوی نەماوە
لە ئەبیاتی حەیاتی شێخێ خانی
لەسەر نوسخەی خەتی ئەو نووسراوە
لە لای ئەربابی خۆی بۆ قەدرو قیمەت
خەزینەی گەوهەرەو کیسەی دراوە
لە مەجموعی دووەل سۆران وبوتان
لە سایەی ئەم کتێبە ناسراوە
لە کوردان خەیری حاجی و شێخێ خانی
ئەساسی نەظمی کوردی دانەناوە

هۆزانەك دی ل بن ناڤێ (لاوێ شێخ أ ـ فتاح)ڤە هاتیە بەلاڤە کرن، ئەڤ هۆزانە ژ شامێ وەکو پیرۆزبایەکێ بۆ ڤێ ڕۆژنامێ شاندیە، ئەڤ ژی دەقێ وییە:

پیرۆز ژ تەرا هزار جارا
ئەڤ دەنگە نهۆ لناڤ یارا
مزگینیا ڤێ جریدەیا قەنج
شاباش دبتن چقا هەبت گەنج
ئەڤ شوغلێ مەزن تە کریە بدعەت
جارا عەولی تە کریە هیمەت
ئەڤ ڕەهبەرا قەنج تە دانی بنیاد
کرمانج حەمی تە کرنە ئیرشاد
ڤێ مەعریفەتێ توجا نە هێلە
دائم ژ تەرا موعین ڕەسولە
ڕۆژا کو جریدە تێتە بازار
هەر دەر دبیتە میثالی بازار
چقا هەبتن ل شهری ئەکراد
ئەولێ خوشیا تە کرنە معتاد
روحانیا باب و کال و ئەجداد
بڤێ هندێ تە کر نهو شاد
بەبیوینا دەولەتا تە گەش بت
قاسی تۆ هەبی دلێ تە خوش بت

---

هەروەسا چەند گۆتانێت هێژا و بها ل سەر خودێ ژێ رازی (یوسف ضیاءالدین)ێو کتێبا وی (الهدیة الحمیدیة في اللغة الكردية) هاتینە، دبێژیت:

(من خالدی هەنە لقدسا شریف، یەك ژ ڤان خوێ یێ فضل و کەرەم (شێخ یوسف ضیاءالدین پاشایە) خودێ عەمرێ وی درێژ و عیلمێ وی زێدە بکە.

بەری شەش سالا کتێبەك چێکریە ناڤێ ڤێ کتێبێ (الهدیة الحمیدیة في اللغة الكردية). ئەڤ کتێبە وەك عەرەبیی بەحثا قواعدێن عەزمانێ کرمانجی دکە، الوغاتێن کرمانجی حەمی گهاندنە هەڤ، دڤێ کتێبێدە نفیسییە.

مالا وی ئاڤا ئەساسەك ژ عەزمانێ کرمانجارا دانی، ئەز هیڤی دکم کو عولەماو میرو پاشایێن کوردا قازانجێ ژ ڤێ کتێبێ بکەن، گەلەك کتێبەك قەنجە، عولەمایێن کوردارا لازمە کو ئەو ژی ژ عزمانێن خەرا تشتکی بنڤیسن).[23]

هەرچەندە ئەڤ ڕۆژنامە، ڕۆژنامەیەکا رامیاری بویە، لێ گەلەك ئایاتێن قورئانا پیرۆزو گۆتنێت پێغەمبەری ل سەر خوندن و نڤیسینێ ل سەر لاپەرێت ڤێ ڕۆژنامێ هاتینە بەلاڤەکرن، هندە جارا ژی بۆ خو کرینە پەردەو لپشت وێ پەردێ مەبەستەکا سیاسی دەربریە، چونکی مەبەست ژ ڤان ئایات و حەدیثا هۆشیار کرنا میللەتێ کورد بویە، ئەڤە ژی هندەك ژ وان ئایات و حەدیثا:

«العلماء ورثة الانبياء»، «العلم علمان علم الأبدان وعلم الأديان» والكاسب حبيب الله، «وجاهدوا في سبيل الله»، «اطلبوا العلم ولو كان في الصين»، «اطلبوا العلم من المهد الى اللحد»... هتد.

## هندەك تێبینیو رەخنە:

1 ـ هەمی گوتارو نڤیسینێت ڤێ رۆژنامێ ژ لایێ مقداد مدحت بەدرخان و برایێ وی عبدالرحمن پاشای هاتینە نڤیسین، ژبلی ژمارە (21) گوتارەك بناڤێ (عمر خوزی)ب زمانێ تورکی هاتیە، دیسان ژمارە (22) گوتارەك دی ب تورکی ل بن ناڤێ (رؤوف قوللری) هاتیە دگەل هندەك ناماو تقریفا ژی بۆ ژ سولیمانیێو موسلێو شامێو دیاربکرێو ئەرنە هاتینە.

لێ چ گوتارو نڤیسین ل بن ناڤێ ڤوتابێت زانکۆیان نەهاتینە بەلاڤەکرن.[24]

2 ـ گەلەك ل سەر بنەمالا میرو بەگێت بوتان ئاخفتیەو پەسنا وان کریە، دیسان هەر گازیەك و هاوارەك ژ وان را شاندیە، بەلێ دەمێ گازی میرو بەگا دکەت، دڤێت ئەم ب زانین بەری رەخنێ لێ بگرین، کو سەرۆکێت بزوتنا کوردی بەگ و میر بوینە، خواندن و نڤیسین ژی دناڤ وان دا بەلاڤە بویە، کار کرنا وان ل سەر خەلکی گەلەك بویە.. لەوما کوردستانێ بەرێ خوەدا بۆ وان، چونکی خاسیەتێت نیشتمان پەروەری ددلێ وان میرادا هەبو.

3 ـ یەکەمین ژمارەیا ڤێ رۆژنامێ ل قاهیرە دەرچویە پاشی ل جنیف ولندن و فولکستون و دوبارە ل قاهیرەو جنیف دەرچویەڤە، لێ چ جارا ل ئیەستنبول دەرنەچویە.[25]

4 ـ ژ مارێت ڤێ رۆژنامێ یێت هەتا نهۆ نە هاتینە دیتن، ژمارە (10 ـ 12 ـ 17 ـ 18 ـ 19) بەلێ ژمارە (8)و (9؛ هەردوو دناڤ ژمارێت دن دا هەنە.[26]

5 ـ رۆژنامەیەکا کوردی بناڤێ کوردستانێ سالا 1916 ـ 1919 ب سەرۆکاتیا (محمد شفیق ارواس) دەرچویە، وەلێ وەنەبیت کوردستانا قاهیرە بێت.[27]

6 ـ ثریا بەدرخان پاشا چ جارا نەبویە سەر نڤیسەرێ ڤێ رۆژنامێ.[28]

7 ـ هەرچەندە دکتور کەمال فؤاد دبێژیت:

«کوردستان یەکەمین رۆژنامەی کوردی 1898 ـ 1902» بە دوو هەفتە جارێك لە چوار لاپەری (25,50 ـ 32,50 سم)ی‌دا دەرئەچوو).[29]

بەلێ یا راست ئەڤ رۆژنامەیە ب هەمی ژمارێت خوەڤە دوو هەفتیا جارەکێ دەرنەچویە!! بەلکو هەر ژمارە (1) هەتا (24) هەرپازدە رۆژا جارەکێ دەرچویە، بەلێ هەر ژمارە (25 ـ 31) نڤیسیە:

(کردستان هەیڤێ جارەکێ دەردکەڤە جەریدەیا کوردیە).

8 ـ د. کامیران بەدرخان پشداری د دەرئێخستنا ڤێ رۆژنامێ‌دا نە کریە،[30] چونکی وی دەمی هێشتا مندال بو، سالا (1895) ژ دایك بویە ئو رۆژناما کوردستانێ سالا (1898 ـ 1902) دەردچو.

9 ـ ئەڤ رۆژنامە سالا 1898 دەرچوویە، نەکو هندەك ب خەلەتی هەتا نهۆ بۆ دچن وەکو هێژا عبدالرحمن زەبیحی کو سالا 1977، د قاموسا زمانێ کوردی‌دا، بەرگی یەکەم، لاپەرە (7) دبێژیت:

(کە بۆ یەکەم جار سالی 1897 رۆژنامەی «کوردستان» دەرچووە).

## ژێدەرو پەراوێز


1 ـ بنێرە، تێگەیشتنی‌راستی، شوێنی لە رۆژنامەگەری کوردیدا، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، بەغدا، 1978، ل 56 ـ 57.

2 ـ هەمان ژێدەر.

3 ـ رۆژنامەیا عیراقی ژمارە (2509) رۆژا 30 نیسانێ 1984.

4 ـ تێگەیشتنیڕاستی هەمان ژێدەر.

5 ـ (کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی، 1898 ـ 1902) کۆکردنەوەو پێشەکی د. کەمال فۆاد، بەغدا، 1972.

6 ـ یاداشتەکانی مێجرنوئیل، لە کوردستان، وەرگێرانی: حسین ئەحمەد جاف و حسین عثمان نێرگەزەجاری، بەغدا، 1984 ل 88 ـ 89.

7 ـ هەمان ژێدەر.

8 ـ هەمان ژێدەر.

9 ـ تێگەیشتنیڕاستی هەمان ژێدەر.

10 ـ هەمان ژێدەر.

11 ـ هەمان ژێدەر.

12 ـ ژمارە (1)، کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ـ

13 ـ خلاصة تاریخ کردو کردستان، ل 395 قاهیرە 1939 ترجمـة محمـد علی عونی، هەروەسا بنێرە یاداشتەکانی مێجرنوئیل، ل 215، بەغدا، 1984.

14 ـ یاداشتەکانی، هەمان ژێدەر ل 88.

15 ـ هەمان ژێدەر.

16 ـ کوردستان خلال الحرب العالمیة الأولی، د. کەمال مەزهەر، بەغدا، 1977، ل 230 ـ 301.

17 ـ یاداشتەکانی هەمان ژێدەر.

18 ـ هەمان ژێدەر.

19 ـ دیوانی حاجی قادری کویی هەولێر، 1969، ل 43.

20 ـ یاداشتەکان هەمان ژێدەر، ل 19.

21 ـ هەمان ژێدەر.

22 ـ دروۆژنا عیراق دا ژمارە (2725) ڕۆژا 985/2/16، جەلال زنگابادی مرنا حاجی قادر ب سالا (1892)دایە قەلەم!!

23 ـ هەر وەکی مقداد مدحت بەدرخانی، گوهـ ل ڕێزمانا عەلی تەرماخی نە بویە، نەخودا بەحسێ وێ کەت.

چونکی پێش کتێبا (الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة)دا ل سەر ڕێزمانا کوردی هاتیە نڤیسین، لێ (تومابوا) د کتێبا خودا (د گەل کوردان)دا، ناڤێ زانایی د لاپەرێ (145)دا بریە، هەروەسا مێژووڤان محمد ئەمین زەکی د لاپەرێ (353)دا، دبێژیت (عەلی تەرموکی) یەکەمین کەسە ڕێزمانا کوردی نڤیسی.

24 ـ هندەکا وەسا زانیە کو قوتابێت کورد ل زانکوا (قاهیرە)و ئەستنبولێ پشداریا د نڤیسینا ڤێ ڕۆژنامێدا کری!! بنێرە هاوکاری ژمارە (734) ڕۆژا 1984/4/19، هەروەسا بنێرە، ڕۆژنامەگەری کوردی، جبار جباری، 1970، ل 64.

25 ـ محمـد ئەمین زەکی ومحمـد عەلی عەونی بۆ هنـدێ چووینە کو ئەڤ ڕۆژنامە یا ل ئەستنبولێ ژی دەرچوی.

26 ـ د ڕۆژناما عیراقیێدا، ژمارە (2509) ڕۆژا 1984/4/30 ب زمانێ عەرەبی چەنـد گوتنەك ژ زار دەڤێ هێژا (عبدالستار طه شریف) د بێژیت:

دەمێ ئەو ل تورکیا ـ عبدالستار ـ چاڤێت وی ب دو ژمارێت نە دیتی کەڤتن ژمارە (8)و (9) بون.

27 ـ جریدة العراق، (4) تەموز، 1984، هەروەسا جریدة العراق ژمارە (2509) 3 نیسان، 1984.

28 ـ محمد ئەمین زەکی، دبێژیت: لڤێ دوماهیێ (کوردستان) ل بن ناڤێ (ثریا بەدرخان) دەردچو، ئەڤە ژی ژ خودێ ژێ رازی (محمد علی عونی) وەرگرتیە.

29 ـ کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی (1898 ـ 1902)...

30 ـ د گۆڤارا کاروان دا ژمارە (14) سالا 1983، پێزانێ ئالیخانی گوتارەك ل سەر پرۆفیسور کامیران بەدرخان نڤیسیە دبێژیت:

(هەروەسا د. کامیران بەدرخان دژیانا خودا گەلەك بزاڤ و خەبات کری ژ بو بو ڕۆژنامەگەریا کوردیو ساخ کرنا پەیڤا رەسەنا کوردی ژمارە (:2)یا ڕۆژناما کوردستان 1898، مقداد مدحت بەدرخان هەتا ژمارا دویماهیکێ کو ژمارە (30 ـ 31) بون ل جنیف دەرکەتی، د. کامیران هاریکاری کرو ب ڕێ ئێخست!!).

تێبینی:

ئەڤە دەقێ وێ نڤیسینێیە، یاکو ل ڕۆژا 1985/3/11ل کۆرەکێ ئەدەبی، ل دهوکێ هاتیە خواندن.

## هونەری ڕۆژنامەنووسی

# هونەری ڕیپۆرتاج

شێرزاد عبدالرحمن

چاو پێ کەوتنی ڕۆژنامە نووسیو لێکۆڵینەوەو ڕیپۆرتاج Repovtage «یەکێکە لە لایەنەکانی هونەری ڕۆژنامەنووسیی»[1] کە پەیامنێرو ڕۆژنامە نووسان دەخاتە کار بۆ جوڵانەوەی زیاترو نزیك بوونەوە لە ڕاستیی ڕووداوەکان و چوونە ناو خەڵك و لێ کۆڵینەوە لە کاروبارەکانی تری پیشەی ڕۆژنامەنووسیی ئەمەش، وا لە ڕۆژنامەنووسان دەکات، تەنیا ژیانی خۆیان لە دامەزراوی ڕۆژنامە نووسیی‌دا بەسەر نەبەن، بەڵکو سەراپای ئەو لایەنە دیارانەی پەیوەندی ڕاست و خۆیان بە ئەرکەکانی هونەری ڕۆژنامەنووسییەوە هەیە. .

وانەبێ، سازکردنی ڕیپۆرتاج، کارێکی هێندە سووك و سانایێ، بەڵکو، وەك زۆربەی لایەنەکانی تری ڕۆژنامە نووسیی، پێویستی بە شارەزایی‌و لێ هاتووی هەیە. . .

کێشەیەکی زۆر هەیە بۆ وەڵام دانەوەی ئەوە:

کە ئایا «ڕیپورتاج، هونەرێکی سەربە خۆیە، یان بەشێکە لە هونەرەکانی ڕۆژنامە نووسیی؟»[2]

بێ گومان ڕیپورتاج وەك هەموو لایەنەکانی تری ڕۆژنامە نووسیی گەلێ ووردەکاری تێدایە، بەڵام ئاخۆ جیاوازی چیە لەگەڵ هەواڵ؟!.

هەواڵ، وەڵامی ئەم چەند نیشانە ئەداتەوە: «کێ، بۆچی، چی، لەکوێ، کەی، چۆن؟!»[3]، بەڵام هونەری ڕیپورتاج، بەشێوەیەکی تێکرایی، چونە پێشەوەی زیاترە لە کێشەکەو پێویستی بە پشکنین و بە دوا داچونەو، وا لە ڕۆژنامە نووس دەکات، هونەرمەندی بنوێنێ لە ئاخاوتن و دووان و شارەزایی لە سەراپای لایەنەکانی‌ژیان، بۆ ئەوەی لە ڕوویەڕوویوونەوەی هەر مەسەلەیەك، بتوانێ، شتی تازەتر پێش کەش بکاو ڕاهێنان لە پیشەی ڕۆژنامە نووسیی دروست بکات. .

ئاشکرایە، ڕیپورتاج، تەنیا بە تۆمارکردنی ئاخاوتنی بەرپرسیارێك، یان ناودارێك، یان لێ دوان لە پرۆژەیەکی گشتیی کۆتایی نایەت، بەڵکو داهێنانێکی گەورەیەو کەم ڕۆژنامە نووس دەتوانێ بە قووڵی‌و فراوانی سەرکەوتنی تێدا دروست بکات.

ریپـورتـاج، پشت بە چەنـد لایـەنێـك دەبـەستێ، لەوانـە: «پێـویـستـی بە دوورەگـەزی تایبـەتی هەیـە کە قەڵـەمی ڕۆژنامەنووسەکەو کامیراکەیەتی..»[4]

چونکـە بەبێ وێنـە، ڕێپـورتـاج، ووشکـە، تەنـانەت بابەتی ڕێپـۆرتـاجـەکـە بەزینـدوویی خۆی نانـوێنێ و خوێنـەر ناتـوانێ ڕاستـەوخـۆ بچێتـە ناو بابـەتی ڕیپورتاجەکەوە.. یان لە چۆنیەتی کاروبارەکانی بابەتەکە بگات و سەرنجی ڕابکێشێ..

ڕۆژنـامـەنـووسی ی سەرکـەوتوو، تەنیا لەلایەنێکەوە تەماشای هونەری ڕێپورتاج ناکات، بەڵکو لە تێ ڕامانی هەموو ئەو پەیوەندیە بنەڕەتی یانەی ڕۆژنامە نووسەکە بەژیان ئەبە ستێتەوە.

خوێنـەر، لەکـاتی خوێنـدنەوەی ڕیپورتاج دا، بەدوای بابەتی تازەدا دەگەڕێ، کە ڕۆژنامە نووسان، دوای هیلاکی بەرفراوان، لێرەو لەوێ کۆی دەکەنەوە..

بۆیە، ڕۆژنامەنووس، دەبێ بە دوای بابەتی نوێدا بگەڕێ و ڕاستی ی بگوازێتەوە بۆ خوێنەرو بایەخ بەو بابەتە زیندووانە بدات کە خوێنـەران بۆی دەگـەڕێن.. ئەمـەش، وا لە ڕۆژنـامەنووس دەکات، کە تەقەللابنوێنێ بۆ فێربوون و تێ گەیشتن لە سەراپای بوارەکـانی جمـوجـۆڵی مرۆڤـایـەتی، چونکـە لە ماوەی ژیـانی ڕۆژانـەی‌دا، ڕووبـەرووی هەمـوو لایـەنـەکـان دەبێتـەوە، چ کۆمـەڵایـەتی بێ، چ ئابـووری، یان رامیـاری.. تاد، تا لە لێ کـۆڵینـەوەی ڕۆژنـامە نووسی‌دا ئەرکی تەنیا گوێ شل کردن نەبێ و بتوانێ بەرگری لە ڕاستی بکات..

چونکە بەبێ ڕێپۆرتاجی سەرکەوتوو، ڕۆژنامە ناتوانێ پەیامی خۆی بەجێ بگـەیـەنێ بەڵکـو «بەبێ ریپورتاج، ڕۆژنامە، ناوی لێ ناندرێ ڕۆژنامە»[5]

کەوابێ نووسـەری ڕێپـورتـاج، تەنیـا لە دەوری بابـەتێـك دا ناخولێتەوە، بەڵکو بەناو زۆربەی مەسەلە دیارەکانی کۆمەڵایەتی‌دا ئەگـەڕێ، بۆ ئەوەی لەو ڕێگـەوە، کێشـەکـان بەرچـاو بخـات و تەقەللای چارە سەرکردنی ئەو لایەنە زیندووانە بدات، کە وەك ڕۆژنامە نووسێك، ڕووبەروویان دەبێتەوە.

لە بەر ئەوە، شارەزایی، لە سازکـردنی ڕیپـورتـاجی ڕۆژنـامە نووسی‌دا، بەخاڵێکی دیار دائەندرێ، بە نموونە: «ریپورتاج پێویستی بە خۆ ئامادەکردن هەیە، کە گریمان، ڕۆژنامە نووسێك دەیـەوێ گفتـوگـۆ لەگـەڵ ناو دارێـك بکـات، پێـویستـە کە زانیارییەکی تەواوی دەربارەی هەبێ».[6]

بەڵام ئاخۆ، ئەگـەر ڕۆژنـامـەنـووس لەگـەڵ ناودارێك، یان کەسێکی تـری دیـار لە ژیـانی کۆمـەڵایـەتی‌دا ڕووبەڕووبوو، لە هەمـان کات ئەو کابـرایـە ئاڵـۆزبـو، یان ڕێگـەی ئاخـاوتنی ڕۆژنامەنووسی ی نەدا، کەچی ئاخاوتنەکەشی زۆر گرنگ و تازەبو بەلای ڕۆژنامەکەوە..

دەبێ ئەو ڕۆژنامەنوسە چی بکات؟!

«بـەهـرەو زیـرەکی ڕۆژنـامـەنووسەکە لێرەدا دەر ئەکەوێ، کە بتوانێ حاڵی بکات، یان فرت و فێڵ بەکار بهێنێ، کە ئەمانە لە ڕێزی ڕۆژنامە نووسی ی کەم ناکەنەوە».[7]

قەڵـەم ولێ هاتـوویی و بەهـرەی ڕۆژنـامـەنـووسـەکـە، لە ڕیپـورتـاجی ڕۆژنـامـە نووسی‌دا دەرئـەکەوێ.. چونکە گەلێ جار، گەورەتـرین بابـەتی ڕۆژنـامـەنـووسی ی، لە ئەنجامی بێ بەهرەیی ڕۆژنامەنووسەکە، ووشك دەبێتەوە..

کەچی بە پێچەوانەوە، زۆرجار، بابەتێکی بچووك، بەدەست ڕۆژنـامـە نووسێکی لێ‌هـاتـوو، فراوانتـر دەکرێ و دەبێتە هەوێنی ڕیپۆرتاجێکی بە پێزو داهێنانی ڕۆژنامە نووسەکەی تێدا دەرئەکەوێ..

دیارترین چەشنەکانی ڕیپورتاج ئەمانەن:

1) ڕیپۆرتاجی هەواڵ
2) ڕێپۆرتاجی بیرورا دەربڕین opinion Inter
3) ڕێپۆرتاجی زانیاری و بەسەر بردنی کات Featue Interve
4) ڕیپۆرتاجی کۆمەڵایەتی Group Interview
5) ڕیپۆرتاجی کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی ی press Confevence InteY[8]

ئاشکـرایـە، سازکـردنی ڕیپـۆرتـاج، پێـویستی بە شارەزایی دەروونیش هەیـە، وە مامـەڵـەیـەکی تایبـەتی دەوێ، چونکـە ڕۆژنـامـەنـووس لە ماوەی ژیـان و پیشـەی ڕۆژنـامە نووسی‌دا ڕووبـە ڕووی چەنـدەهـا کەس دەبێتـەوەو لەگـەڵ ئاخـاوتنی هەریەکێ لەوانە شتێك دەخاتە سەر ژیان..

ڕۆژنامەنووسیش، لەکاتی ئاخاوتنی ڕۆژنامە نووسی ی‌دا فێری هونەرێکی گەورەی ئاخاوتن و ناسینی کۆمەڵانی خەڵك دەبی‌و پێویستە پێش دەست پێ کردنی ئاخاوتنی ریپۆرتاجەکەش، بەلایەنی کەمەوە خۆی بۆ بابەتەکە ئامادە بکات. . . «ئەمیل لۆرفێج» لەو بڕوایەدابو، کە پێش ئەوەی ڕۆژنامەنووس بکەوێتە دووان، لەگەڵ ناو دارێك ،دەبێ ماوەیەکی دوور لەوێنەکەی ووردبێتەوەو بەتەواوی‌لە کەسایەتی بگات».[9]

ریپورتاج بە چەند قۆناغێك دا ڕەت دەبێ، لەوانە: ناوونیشان، کە دەبێ ناوەڕۆکی بابەتەکە دەربخات و بە شێوەیەکی وورد سەرنجی خوێنەر ڕابکێشێ بەلای خۆی‌دا، ئەگەر لەوەدا ڕۆژنامە نووسەکە سەرنەکەوت، خوێنەر لە خوێندنەوەی ریپورتاجەکەووشك دەبێتەوە، ئەم هەڵبژاردنەش، لەناوونیشاندا، پێویستی‌بە بەهرەو شارەزایی هەیە لە تێکەڵاوی هونەری ڕۆژنامە نووسی ی‌دا. قۆناغی دووەم: زانیاری پەیدا کردن لەسەر بابەتی ریپورتاجەکە، وە لێ‌کۆڵینەوەی هەموو ئەو لایەنانەی کە پەیوەندی بە سازکردنی ریپورتاجەکەوە هەیە. گەلێ جار، لەکاتی ئاخاوتنەکەدا، شتی‌نوێ‌تر سەر هەڵئەدات واتە قۆناغی سێیەم لە ریپورتاج دا، کە بە دووادا چونی بابەتەکەیە، ئەمەش نیشانەی لێ‌هاتووی ڕۆژنامە نووسەکە ئەنوێنێ لە پیشەکەی خۆی‌دا. . قۆناغی چوارەم:

پێدا چونەوەی ریپورتاجەکەیە، پاشان نووسینەوەی بابەتەکە بە شێوەیەکی هونەری. .

بەڵام لەهەموو ئەوانەش گەورەتر ئەوەیە، ڕۆژنامەنووس، لە هونەری ریپورتاج بگا. .

«گەلێ ڕۆژنامەنووس، لە ریپورتاجی ڕۆژنامە نووسی ی‌دا یەخەی هەندێ ڕێ‌و شوێنی ووشکیان گرتووە»[10]. . لەبەر ئەوە، ڕۆژنامەنووس، دەبێ پەرە بەتاقی کردنەوەکەی خۆی بدات و بەهرەی ڕۆژنامە نووسی ی پێ بگەیەنێ. . .

## دەرهێنان لە ڕۆژنامە نووسی ی‌دا

گومانی تیانیە، ڕۆژنامەنووسی ی، تەنیا هەواڵ و ڕاپۆرت و ریپورتاج ناگرێتەوە. . بەڵکو هونەرێکی سەربەخۆیەو گەلێ ووردەکاری تێدا کۆ ئەبێتەوە، لەوانە: هیچ ڕۆژنامەیەك ناتوانێ بچێتە دڵی خوێنەرەوە، ئەگەر هات و لە پاڵ ناوەڕۆکی بابەتەکانی، ڕوخسارێکی دڵگیری نەبێ کە ئەمەش دەکەوێتە ئەستۆی دەرهێنەری ڕۆژنامە نووسی ی دەرهێنەری هونەرمەند لە بواری ڕۆژنامە نووسی ی دا مەودای هیلاکی پیشەی ڕۆژنامە نووسی ی لەبەردەم خوێنەر یەکالا ئەکاتەوە، بەتایبەتی دەرهێنەری ڕۆژنامەی ئەم سەردەمە کە پێویستی‌یەکانی هونەری‌ی لەبەردەم دایەو تەکنیکی پێشکەوتوو لە چاپخانە هاوچاخەکاندا بووەتە هۆیەکی گەورە لە داهێنانی دەرهێنەری ڕۆژنامە نووسی‌و هەنگاونان بۆ دروست بوونی ڕێبازی نوێ لە بواری ئەم هونەرەدا. .

لەبەر ئەوە، وولاتە پێشکەوتووەکان، لە دامەزراوەکانی ڕۆژنامەنووسی ی‌دا چەندەها بەشی هونەری بۆ بەڕێوە بردن و جێ‌بەجێ کردنی لایەنەکانی‌تری ڕازاندنەوەو پێشخستنی باری ڕۆژنامەنووسی ی تەرخان دەکەن. . چونکە، دەرهێنەر بەبێ‌بوونی ئەو لایەنە هونەری‌یانە، ناتوانێ نەخشەکانی خۆی لە پێشکەوتنی دەرهێنانی ڕۆژنامەیەك دا بەدی بێنێ، لەوانە، کێشەو ڕۆتۆجراو فۆرو وێنەو ئۆفسێت و تەکنیکی چاپی نوێ‌و، پێویستی‌یەکانی تری دەرهێنان، بۆ ئەوەی دەرهێنەر بەپێ‌ی نەخشەو ڕێبازی هونەری نوێ ڕۆژنامەکە زیندوو بکاتەوە. .

«دەرهێنەر دەتوانێ گیان بنێ بەبەر ڕۆژنامەدا، هەروەکو چۆن، ئەندازیار بەر لە بیناکردن نەخشە دائەڕێژێ»[11]، هەڵبەتە ڕۆژنامەکانی سەردەمی پێشوو ئەمەیان بەلاوە گرینگ نەبووە، لەبەر ئەوە، لەسەر ڕووی لاپەڕەکانیان، هەست بە چەشەیەك ناکرێ‌و بەشێوەیەکی زۆر ساردوسڕولاسایی کەرەوە دەهاتە بەردەم خوێنەر. .

«سەیرنیە، کە ڕۆژنامە، لەڕووی دەرهێنانەوە وەکو کتێب وابوو»[12]. .

بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ و بەگوێرەی ئەو گۆڕانکارییە فراوانەی لە بواری هونەری ڕۆژنامە نووسی ی‌دا هات، دەرهێنانیش وەك لایەنێکی هونەری‌ی کەوتە قۆناغێکی نوێ ترەوەو بەتەواوی تەشەنەی کرد، بەتایبەتی کاتێ پسپۆڕی‌ی لە دەرهێناندا

هاتەکـايـەوە، «لـەسالّى 1890دا شۆڕشێکى نوێ لەبەردەم ئەم هونـەرەدا هاتـەکـايـەوە، کاتێ ڕوو بەرووى پسپـۆڕى‌ى بووەوە، بەتـايبـەتى لە ڕۆژنـامـەى «ورلـو» کە «بـولتـرو» دەرى دەکـرد، هەروەها ئەو ڕۆژنامەى «هيرست» کە لە نيورۆك دەرى دەچوان وە لە ئينگلتەرا، بەهۆى دەرچونى ڕۆژنامەکەى «لۆرد نۆرثکيف» کە لە ژێـر ناوى «ديلى‌ميـل» دابـو، لە سالّى 1896دا ئەوەى ڕاگەياند کە وێنەى فۆتۆگرافى دەتوانێ گيان بنێ بەبەر هەوالّ دا»[13] هەلّبـەتـە، ئەو بۆ چوونـەش، زۆر نزيکـە لە ڕاستى‌يـەوە، چونکـە ڕۆژنـامـەنـووس ناتـوانێ بەبێ وێنـە فۆتۆگرافى‌يەکە، بابەتەکانى خۆى بە زيندوويى پيشان بدات و، دەرهێنەرى ڕۆژنامەش لە بارى دانيە لە پالّ نەخشەکانى خۆى، بەبێ وێنەى فۆتۆگرافى تيشك بداتە بەر لاپەڕەى ڕۆژنامەو گۆڤارێکەوە. .

ئەمەيان وا، بەلاّم ئاخۆ، دەرهێنەر چۆن دەتوانێ دەست بە کارەکـەى خۆى بکـات، کاتـێ داواى لێ دەکـرێ لە ڕۆژنامەيەك دا ئەو کارە ئەنجام بدا؟.

لە پێشەوە دەڕوانێتە قەوارەى ڕۆژنامەکەو ژمارەى لاپەڕەکانى، ئەنجـا يەکێ لە قوتـابخـانەکانى هونەرى دەرهێنان، وەکو ڕێباز، لەجێبەجێ کردنى کارەکەى‌دا بەکاردێنێ، چونکە هەر ڕێبازێك لە دەرهێناندا، ڕێو شوێنى تايبەتى خۆى هەيە. .

ئەنجـا، پێش ئەوەى دەست بداتـە کارەکـەى، دەبێ بيـر لە هەنـدێ لايـەنى زينـدوو بکـاتەوە، لەوانە: چەشەى خوێنەرانى ڕۆژنامەکەو مەوداى هەست و بيرو سەرنجى گشتى‌ى. .

لەبەر ئەوە، دەبێ لە سەرەتاى کارەکەى‌دا، نوێ بوونەوەيەك دەربخات، بۆ ئەوەى بە شێوەيەکى لاسايى کەرەوەو بێ ڕاهێنان ڕۆژنـامـەکـە پێش کەش نەکـات. . بەلاّم وەك بابـەتى گشتى‌ى دەبێ ڕەچاوى ئەم چەند خالّە بکات:

1) هەستى ڕيـزکـردنى هەوالّ و پێشخستنى گرينگتـرينيـان، پاشان دەست نيشان کردنى شوێنى هەوالّەکە لە لاپەڕەکەدا.

2) پسپـۆڕى‌و شارەزاييـەکى فراوان لە کاروبـارى چاپخـانـەو کۆکردنەوەو پيت ڕێك خستن و نەخشەو لايەنە هونەرييەکان.

3) چەشـەيـەکى هونـەرى‌ى ڕەسـەن و پشت ئەستووربون بە زانينى لێ کۆلّينەوەى هونەر بەگشتى‌ى‌و دەرهێنان بەتايبەتى.

4) زانينى حەزو ئارە زووى خوێنەران و هۆيەکانى سەرنج ڕاکێشان»[14]

بەلاّم ئەگەر هات و يەکێ لەو خالاّنە لەبەر چاو نەگيرا، ئەو ئەلّقـەيـە دەپچـرێنێ کەلـەنێوان خوێنەران و دەستەى نووسەران و ڕۆژنامەکەدا هەيە، چونکە دەرهێنەر بەشدارە لە دروست کردنى خۆشەويستى‌ى نێوان خوێنەرو ڕۆژنامەدا. .

ئەمەش هەلّبەتە لە هەموو دەرهێنەرێك دا کۆنابێتەوە، چونکە ڕەچاو کردنى ئەو خالاّنەى پێشەوەش داد نادات ئەگەر بە ووردى بير لەم چەند لايەنە نەکرێتەوە:

1) بنەڕەتى‌يەکانى کارى ڕۆژنامەنووسى‌ى.

2) بنەڕەتى‌يەکانى «نەفسى‌ى» خوێنەران.

3) بنەڕەتيەکانى لايەنى فسيۆلۆجى.

4) بنەڕەتيەکانى هونەرى‌ى.»[15]

وانـەبێ، دەرهێنـانى لاپـەڕەکـان، يـەك ڕێبـازى لاسـايى کردنەوەيى هەبێ، بەلّکو هەر لاپەڕەيەك لە بوارى دەرهێنان دا، پێويستى‌بە شارەزاييەك هەيەو چەشنە ئالۆ گوربوونێکى دەوێ لە چەشەى گشتى‌ى خوێنەراندا. .

ئاشکـرايـە لاپـەڕە «يـەك» سەرچـاوەى هەوالّـە، تەنـانەت لە ڕۆژنامە پێشکەوتووەکاندا، گرينگيەکى تايبەتى بە دەرهێنانى ئەم لاپـەڕەيـە ئەدرێ، چونکـە ئەلّقـەيەکە خوێنەر بە ڕۆژنامەکە ئەبەستێتەوە، وە سەرچاوەى ووردبينى‌يە، واتە «Starter» لەبەر ئەوە دەبێ ڕەچـاوى گەورەتـرين هەوالّى سەرنـج ڕاکێشـەر لەم لاپـەڕەيـەدا وەربگيـرێ، يان دوو هەوالّى سەرەکى، بەمـەرجێ هەردوو هەوالّـەکـە گرينـگ بن بەلاى خوێنەرەوە، بۆ ئەوەى هەر لەسـەرەتـاوە، خوێنـەر لە خوێنـدنـەوەى ڕۆژنامەکە سارد نەبێتەوە لەبـەر ئەوە، چاکتـر وايـە بۆ دەرهێنـانى لاپـەڕەکـان ڕەچاوى ئەم خالاّنە بکرێ:

1) دەرهێنـانى تەرازوويى Balanced کە بەچـەنـد ڕێگـەيـەك ئەتوانرێ جێبەجێ بکرێ:

أ ـ بەکـار هێنـانـى ناونيـشـان لە سەرەوەى لاپـەڕەدا، بەشێوەيەکى دووريەك، واتە، بۆ نموونە: لە ئەستونى يەکەم و

سێیەم و پێنجەم، لەنێوانیشیان وێنە هەبێ، یان چەند ناونیشانێکی بچووك.

ب ـ دانانی ناونیشان لە ئەستوونەکانی یەکەم، کە لە بەرامبەر یەکتردا رووبەروون، دەشێش وێنە لە ئەستوونەکەی سەرەوە بدرێ.

ج ـ ئەگەر هات و «ئاگاداری ـ اعلان» زۆر بوو، دەشێ هەمەرەنگی لەم لایەنەبکرێ، بەدانانی ناوو نیشانی سەرەکی لە ئەستوونی یەکەم و ناونیشانی هاوکۆك لە ئەستوونی هەشتەم دا.

2) دەرهێنانی لەسەرخۆیی: Pesending : لەمەدا دەبێ ناوو نیشانی بەهێز لە ئەستوونی یەکەم دابێ، ئەنجا ریزکردنی ناونیشان ،یەك لە دووای یەکتردا، ئەمەش وا لە خوێنەر دەکا کە لەبابەتی گرینگترەوە، بێتە خوارەوە بۆ بابەتی تر.

3) دەرهێنانی ووردبینی، یان تێ رامان Focused کە تیایدا وێنەیەکی قەبە دائەنرێ ،بەرامبەر بەمەش ناونیشانێکی گەورە، کە پەیوەندی بە وێنەکەوە هەبێو وا لە خوێنەر دەکات بە پەرۆشی بیخوێنێتەوە. . [16]

ڕێبازی لاسایی کردنەوە لە دەرهێناندا تا ئێستاش لە گەلێ رۆژنامەی پێشکەوتووی جیهان پەیرەو دەکرێ، بەتایبەتی «تایمز»و «ئوبزێرفر»و «نیورك تایمز» ئەمەش لەبەر پوختەو رازاوەیی ئەم رێبازەیە. . .

بەلام ئاخۆ، کە دەرهێنەر ویستی لەپاڵ دەرهێناندا، وێنەیەك لە رۆژنامەکەدا، یان بڵێین چەند وێنەیەك بۆ زیندووبوونەوەی بابەتەکانی رۆژنامەو گۆڤارێك هەڵواسێ، دەبێ پەیرەوی چی بکات، بۆئەوەی داهێنان لەم پیشەیەدا بنوێنێ؟:

1) دەبێ وێنەکە مەغزایەکی فراوانی هەبێ، واتە گرینگی‌یەکی هەبێو بەروونی گیرابێ.

2) درێژیو قەوارەی گشتی‌ی وێنەکە بەگوێرەی‌بابەتەکە بێ

3)ناگونجێ وێنەکە لە نێوان بابەتەکەدا بێ، چونکە بابەتەکە لەبەر دەم خوێنەردا دەپچرێ، هەروەها ریزبوونی ئەستوونەکان لەبەر دەم خوێنەردا دەشێوێ.

4) لە کاتی زۆر بوونی وێنە لەیەك کات دا، دەتوانرێ بەشێوەیەکی درێژی، یان پانی، دابەش بکرێ بە شێوەیەکی رێك.

5) هەندێ جار، ئەگەر ماوە هەبو لاپەرەیەك بۆ وێنەی پر مانا تەرخان بکرێ، وەکو رۆژنامەی «وشنطن» دو لاپەرەی بۆ وێنەی هەمەرەنگ تەرخان کردووە.

6) چاکتر وایە وێنەکە چەند لایەنێك بگرێتەوە: ژیانی ناو دارێك «بەوێنە»، کارەساتێك لەم بابەتانە: ئاگر کەوتنەوە، لافاو، بومە لەرزە. .

7) گومانیشی تێدانیە، کە دەبێ وێنەکە بەقەد گرینگی بابەتەکە بێ» [17]

بێ‌گومان، گرینگی وێنە، لە رۆژنامەیەك، تا رۆژنامەیەکی‌تر دەگۆڕێ، هەندێ وێنە هەیە، خۆی لە خۆی‌دا بابەتێکی گرینکە، واتە خۆی لە خۆی ئەدوێ، بۆ وێنە: بەرچاوخستنی پیس و پوخلی شار، یان وێنەیەکی پێشکەوتوو لە وولاتداو دەستی ئاوەدان کردنەوە، هەر چۆنێ بێ، وێنە لە کاروباری رۆژنامەنووسی‌دا لایەنێکی زیندوو ئەگرێتەوە، بە تایبەتی لە دەرهێناندا، «وێنە رەگەزێکی دیاری رۆژنامە نووسی‌یە، کە فۆتۆگرافیاو نەخشەو کاریکاتێر، ئەگرێتەوە». [18]

گەلێ جار وێنەی کاریکاتێر، دەبێتە مایەی لە دایك بوونی بابەتێکی مەزن لە رۆژنامەدا، تەنانەت ئەمرۆ لە رۆژنامە نووسی‌ی وولاتە پێشکەوتووەکاندا، رووبەرووی رژێم دەبێتەوە، یان گەورەترین کێشەی گوزەرانی‌ی بە دەردەخات و هونەرمەندانە باسی لایەنەکانی ژیان دەکات.

هەڵبەتە، دەرهێنانی نوێ، دەرهێنانی ئەو ساڵانە نیە کە رۆژنامەنووسی‌ی، لەئەنجامی نەبوونی دەستی شارەزا لە کاروباری رۆژنامەنووسی‌و نەبوونی بابەتی گرینگ و پر بایەخ

تەنیا بەپروپاگەندە بڵاو ئەکرایەوە، «هەروەکو لە وڵاتە یەك گرتووەکاندا، لاپەڕەیەك تەنیا بە پروپاگەندە بڵاو ئەکرایەوە»[18]

تەنانەت ئەمڕۆ، بایەخێکی فراوان دەدرێتە ئەم لایەنەو گەورەترین پسپۆرەکانی دەرهێنان لە رۆژنامەکاندا کاردەکەن. .

تەنانەت گەلێ ڕێبازی نوێتر هاتۆتەکایەوە کە دەرگایەکی نوێی لەبەردەم ئەم هونەرەدا کردۆتەوەو بەردەوام لە نوێ بوونەوەدایە، هەروەکو پسپۆرێکی بلیمەت لە رۆژنامەیەك دا دەڵێ: «من دەمەوێ لەم شێوازە ووشکە رزگاربم و نامەوێ رۆژنامەکەم بریتی بێ لە تەنیا ژوورێکی کۆن کە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەیەت».[20]

## سەرچاوەو - پەراوێز


1 - اديب مروة، الصحافة العربية، نشأتها وتطورها ل40

2 - دکتـور عبـداللطيف حمزة، المدخل في فن التحرير الصحفي ل317

3 - هەمان سەرچاوە ل317

4 - فاروق خورشيد، بين الادب والصحافة ل69

5 - توماس بيرى - مروان الجابري، صحافة اليوم ل162

6 - ستانلی جونسون - وديع فلسطين - استفتاء الانباء فن ل254

7 - جلال الدين الحماصيى، المندوب الصحفي ل192

8 - دکتـور عبـداللطيف حمزة، المدخل في فن التحرير الصحفي ل227

9 - هەمان سەرچاوە ل227

10 - دکتور محمود فهمي، الفن الصحفي ل109

11 - الدكتور ابراهيم امام، فن الاخراج الصحفي ل251

12 - هەمان سەرچاوە ل254

13 - هەمان سەرچاوە ل254

14 هەمان سەرچاوە ل256

15 - هەمان سەرچاوە ل257

16 - الدكتور حسين الهاوي، طباعة الصحف واخراجها ل296

17 - الدكتور ابراهيم امام، فن الاخراج الصحفي ل353

18 - الدكتور عبداللطيف حمزة، المدخل في فن التحرير ل408

19 - الدكتور ابراهيم عبده، الصحافة في الولايات المتحدة.

20 - الدكتعور ابراهيم امام، فن الاخراج الصحفي ل293

# گوڤـــارا "ژيـــن" ێ و چەند راستیەك




عبدالكريم فندى دوسكى

روژنـامـا «ژ ین»ێ روژنـامـەکـا هەفتانەی بو وەك کوڤارەکێ دەردکــەفــت وژمــارا ئێــکــێ ل روژا 7/ب20/1334 رومـی دەرچــویــە. خودانێ وێ هێــژا «حمـزە»یـەول چاپخـانـا «نجم إستقبـال»ل پاژ یـرێ ستەمبولێ هاتیە چاپکرن ول سەر بەرگێ وێ هاتیــە نڤیسین «دینی، ئەدەبی، إجتمـاعی إقتصـادی». بەلێ هەتـا بەری نهـو هنـدی دەربـارەێ ڤێ کوڤاری هاتیە نڤیـسین هەمی کەتینە شاشبون و تەحسینا.

مامـۆستـا «جمـال خەزنـەدار»ل رابـەری روژنامەگەری کوردی لاپـەرە (24) نڤیسیە: روژنامەی «ژ ین»ێ ئەستەمبول 1919 ژ ین روژنــامـەییکی ئەدەبی، کومـەلایـەتی بووە. بە زمـانی کوردی لە شاری ئەستـەمبـول لە لایەن «مەمدوح بەگ سەلیم وکەمال نوری» دەردەچــو. ژمـارە یەکی لە سالی 1919دا دەر دەچـو. دبێت ئەڤ زانینە من ژ مێژ وی ئەدەبی کوردی یا مامۆستا علاءالدین سوجادی وەرگرتینە.

بەلێ دەمێ من سەحکـریـە ڤێ پەرتـوکێ من چوتشتێ وسا تێدا نەدیت. د. پلەج شێـرکـودبێت «پشتی راوەستیـانا چەنگا جیهانی هێـژایـان حمـزە أفنـدیومـمـدوح سلیم بەگێوکمال فوزی ئەوێ هاتیە سێدارەدان ل دیاربەکرێ روژناما «ژ ین»ێ ب کوردی دەرئێخست.

هەر وســا مێــژ ونڤیسێ کورد «محمـد أمین زکی» بەحسێ ڤێ کوڤارێ کرییەو دبێت: «روژناما «ژ ین» یا حەفتی ل سالا (1337 ـ 1919 )ل ستـەمبـولێ دەستـەکـەکـا تولازێـد روناکبیرێد کورد وەك ماموستا همزە، ممدوح سلیم وکەمال فوزی دەردئێخست مەبەستا کوتـارێـد وێ دڤیـا ئاخـا کوردستـانێ بۆخودانێن وێ بیت. ژمـارە (32)ێ ل جمــادی الاول سالا 1338 ـ 1920 زاینی دەرکـەت. بەلێ ژ ئاخفتنا ڤان هێژایان وسا دەردکەڤیت کو کوڤار نە دیتیە ژ بەر

هندێ هەمی ب راستیێ نەکەتینە بەلێ هێژا د. کەمال مظهر د پەرتوکا خوەدا «تێگەیشتنی راستی»دا مشە بەحسێ ڤێ کوڤارێ کرییەو نیزیکی راستیێ بویەو دبێت: «ئەم کوڤارە دوای شەری یەکەمی جیهان لە ئەستەمبول لە چاپخانەی ـ نجم أستقبال ـ بە کوردیو تورکی چاپ دەکرا.

خاوەن ئیمتیازو لێ پرسراوی ئەشرەف حەمزەو دوای ئەو مەمدوح سەلیم بو. عەبدولرەحیم رەحمن خەلکی هەکاری ئەندامی دەستەی نوسەرانی بو لە ژێر ناوی کوڤارەکە نوسراوە «دین، ئەدبیات، إجتماعیات، إقتصادیاندن بحث إیدر تورکچە ـ کوردجە مجموعەدر». ئەو سەر چاوانەی «ژین» یان بە روژنامە داناوە هەلەن.

«ژین»ێ ئەستەمبول پرە لە زانیاری گرنگ دەربارەی ئەدەبی کورد. بە وێنە پیرەمێردی نەمر یەکەم جار «قوربانی تورزی ریگەتم» ە کەی نالی لەودا بلاو کردەوەو دێر بە دێر کردوە بە تورکی. وا دیارە ئەوسا پیرەمێرد بە ناوی «پیرە کورد»ەوە نوسینەکانی خوی بلا دەکردەوە.

لە ریگەی «ژین»ی ئەستەمولەوە دەتوانرێ توماری ناوی شاعیرانی کورد دەولەمەند کرێ. ع. رەحمن هەکاری لە هەمو ژمارەیەکیدا شیعری پر هەستی نەتەوەیی بلاو کردوتەوە کە تا زادەیە هەست بە نویکاری لە بەرهەمەکانیدا دەکرێ..

دیسان «ژین» بەرهەمی (سیاهـ پوش) ناویکی بلاو کردوتەو کە کەسمان تا ئێستە ناویمان نەبیستوەو لەوە دەکا شاعیرێکی وردکارو خویندەوارکی باش بوبی. هیچ لە راستی دور ناکەومەوە گەر بلێم لە هەمو ئەم جیهانە پان و بەرینەدا تەنها کورد شاعیری خاوەن بەهرەی وەهای خوی نا ناسێ؟ پاشی د. کەمال دبێت: «ژین» بوخوی سەرچاوەیەکی رەسەنە بو باسی چالاکی دەستەی روناکبیری کورد. دوماهیێ دبێت ژمارە 6ی روژی 25/ك1/1334 لە سەر نوسراوە کە دەکاتە 25/ك1/1918. بەو ژمارانەدا کە من دیوم وا دەردەکەوێ مانگی [3 ـ تا ـ 4] ژمارەی لێ دەرچوو هەتا ژمارەیەی (15) تا (20) لاپەرە دەبو. بە کوردیو تورکی چاپ دەکرا. خاوەن ئیمتیازو لێ پرسراوەی ئەشرەف هەمزەو دوای ئەو مەمدوح سلیم بو. کوڤارەیکی دەولەمەندە».

ئەڤە بو هندی دەربارەی کوڤارا «ژین» هاتیە نفیسین. بەلێ بەری دەمەکی هێژا (محمد أمین بوز ارسلان) ئەڤ کوڤارە کومکرو جارەکا دن ل چاپێ دا و هەمی گوتارێن وێ تویژاندن و بەرگێ ئێکێ دگەل پێنج ژمارێد کوڤارێ ل چاپێ دان د ئێك جلد دا.

لێکولینەکا زانستی ژ (82) لاپەرا پێك هاتیو پر مفاووج ل پێشیێ نفیسی یە. ئەز نهو چەند ژ وان راستێن هێژا «ئەرسەلان» ئاشکەرا کرین و مژ و مورانا ب سەر دا هاتی ژ ێ ڤەداین ژ وەرا پێشکێش کەم. پێشەکی ژڤان پشکا یا پێك هاتی:

أ ـ هایدارییێن گشتی د حەقێ کوڤارا «ژین»دا.
1 ـ زاناو خوندایێن کورد د دەسپێکا سەو سالا (20)ێ دا.
2 ـ پشتی شەرێ جیهانێ یێ پێشین.
3 ـ دیروکا کوڤارا «ژین».
4 ـ زمانێ کوڤارا «ژین».
5 ـ تیپێن عەرەبی.
6 ـ سەرکارو پەرپرسیارێن «ژین»ێ.
7 ـ نڤیسکارو هوزانێنت «ژین»ێ.
8 ـ «ژین» چماو چاوا هاتییە گرتن؟
9 ـ یەك پەرهەڤوك ل هەمی جیهانێ:

ب ـ ئیدیولوژییا کوڤارا «ژین».
1 ـ میراسا خانی
2 ـ کوزدیتی
3 ـ نە ل دژی گەلێن دی
4 ـ دین و وەلاتەڤینی.
5 ـ ژ فکرێن ناڤبەر نەتەوەی دور

حـ ـ بەرگەهێ «ژین»ێ یێ سیاسی.
1 ـ کومەلێن کورد د دەسپێکا سەد سالا (20)ێ دا.
2 ـ کومەلا پێشکەتنا کوردستان ێ.
3 ـ سیاسەتا کومەلا پێشکەتنا کوردستان ێ.
4 ـ پەسنێ بنکێن (پرەنسیپێن) ویلسون.
5 ـ هیڤی و تەوقە ژ ئینگلستانێ.
6 ـ داخوازا ئەرمەنیان ل سەر کوردستانێ.

7 ـ كونفرانسا پاريسىٚ و شەريف پاشا .

8 ـ پەيمانا سيڤەرىٚ .

9 ـ كارگيٚريا تەڤگەرا رزگاريىٚ ژ دەرى كوردستانىٚ .

10 ـ كومەلا كوردستانىٚ بيٚينگەهـ كوردستان ژى بيٚـسەرى دمينە .

11 ـ مروڤ ژ هەسپىٚ خەلكىٚ زو پەيا دبە .

12 ـ دوبەندى و پوشمانيا پاشين .

13 ـ دڤىٚ كو ئەم كيٚماييٚن خوە ببينن .

د ـ رونيكرنا بويەريٚن ميٚژين .

1 ـ شورشا كاوە

2 ـ تاريخا شورشا كاوە (31)ىٚ تەباخىٚ يە؟

3 ـ نەوروز سەر سال

4 ـ دڤىٚ كو ليٚگەرين بىٚ كرن .

5 ـ بەرخوە دانا هيزانىٚ .

6 ـ بابەتيٚن دى .

هـ ـ بويەريٚن روژين و جڤاكى .

1 ـ ڤيٚكخستن و خەباتا ڤيٚكخستنىٚ .

2 ـ يەكيتى و هەڤگرتن .

3 ـ رەوشا جيهليٚن كورد .

4 ـ رەوشا كاركەريٚن كورد .

5 ـ خەباتا خوەندەكاران .

6 ـ خەباتا پيرەكيٚن كورد .

7 ـ مەفاو گرنگيا زانينىٚ .

و ـ خەباتا چاندەيى و پيٚژەيى .

1 ـ كومەلا كورد ژ بو بەلاڤكرنا زانينىٚ و وەشانان .

2 ـ وەشاندنا «مەم و زين»ىٚ .

3 ـ پيەسا «مەمىٚ ئالان» .

4 ـ سىٚ چيروك .

5 ـ پەيڤيٚن پيٚشيان .

6 ـ خەباتا ل سەر زميٚن .

7 ـ روپەليٚن هەلبەستان .

ز ـ چيروكا ڤەژاندنا كوڤارا «ژين»

1 ـ يەك پەرهەڤوك چاوا فەلتييە؟

2 ـ دڤىٚ كو ئەم «ژين»ىٚ ڤەژينن .

3 ـ نە تەنىٚ وەرگەراندنا تيٚيان .

ح ـ ناساندنا چاپا نو .

1 ـ ريٚزكرنا ژمارەيان .

2 ـ نڤيسينا ژمارەييٚن روپەلان .

3 ـ نڤيسينا ژيٚرە نوتان و تاريخان .

1 ـ ديروكا كوڤارا «ژين»

---

كوڤـارا «ژين» د بايـزا سالا 1918ىٚ دا ل ستەمبولىٚ دەست ب دەركـەتنىٚ كريـە . وسـا تىٚ زانين كو ئورگـانـا نەرەسمى يا كومـەلا پيٚشكـەتنا كوردستانىٚ بويە . «ژين» (25) بيست و پيٚنج ژمارە ژىٚ هاتينـە وەشـانـدن . تاريخا ژمارەيا پيٚشيين 1918/11/7 يە دڤىٚ ژمـاريٚـدا ب نڤيسارەكا كورتا ب سەر نڤيسار «ئامانجا مە» سەمەدىٚ (سەبەب) وەشاندنا كوڤارىٚ و ئامانجا وىٚ وەها هاتيە راگەهاندن .

«ژين» نە ژ بوٚ دەستخستنـا لشتـەكـا (منفعـە) مادى دەردكەڤە . ئامـانجـا وىٚ، بەلاڤكـرنـا زانينىٚ يە ل سەر ژيـانا كوردا ديروكى، هەڤىٚ وى يىٚ نەتـەوەى، بيـٚژەيـا وىٚ و رەوشـا وى يا جڤاكى . كوژ سەد ساليٚن دريٚژ ڤر دا هاتنە ئيهمالكرن .

ل گورا باوەريا مە، ئامادەكرنا جيەكى لايق ژ بونەتەوىٚ كورد د جڤينگـەهـا نەتـەوەيـان دا . ب خەبـاتەكا وسا مومكن كو ئاواىٚ وىٚ خەباتىٚ ل گورا فاما ڤى دەمى بيت .

ئەم تيٚـدگيهين كو ئەڤ تەشـەبـوسـا مە، خەبـاتـەكـا پر دژ وار داخـوازە . بەلىٚ دەمـا مە ئەڤ وەزيفـا گران دا سەر ملىٚ خوە مە ب راستى هيڤى كر كو ئەم دكـارن خوە بسپيٚـرن ئاليكـارى و هيسـانيٚن مادى و مەعـنـەوى ييٚن نەتـەوىٚ كورد . ئەو نەتـەوىٚ كورد كوژ بو وەلات و گەلىٚ خوە هەر تم ب قەبولكرنا فيداكاريٚن مەزنترين هاتيە ناسكرن و ليٚكانين ژ خوەدىٚ يە» .

كوڤـارا «ژين» ب وىٚ با وەيىٚ و ب وىٚ بريـارى ژ يـانـا خوە

نێزیکی سالەکێ بوراندیە. ژمارەیا وێ یا پاشین، یانی یا (25) ئان د تاریخا 2/1/1919ێ دا دەرکەتییە.

کوڤار پشتی وێ تاریخێ هاتیە گرتن وب وی ئاوای د دیروکا گەلێ کورد دا ڤەشرییە.

ژ (25) ژمارەیێن «ژین»ێ (22) ژمارە (16) روپەل دەرکەتنە. هەمی ژمارە ب قابێ کارتون قابکریبونە. گەر مروڤ هەر چار روپەلێن قابێد وێ ژ ی تێوبکە، روپەلێن وان (22) ژمارەیان دین (20). لێ بەلێ دبنیاتدا ل هەر چار روپەلێد قابێ نە هاتینە نڤیسین. تەنێ ل روپەلێن مەتنێ کوڤارێ هاتنە نڤیسین. ژمارەیێن [15، 16، 25]ژ ی (24) روپەل دەرکەتنە. ئەو هەر سێ ژمارە ژ ی وەك یێن دی قابکری بونەو دگەل روپەلێن قابێن خوە (28) روپەل بونە. بەلێ دواندا ژ ی ژمارە تەنێ ل روپەلێن مەتنێ کوڤارێ هاتنە نڤیسین.

2 ـ سەرکارو بەرپرسیارێن «ژین»ێ.

چاوا کو بەری نهو هات گوتن «ژین» ئورگانا نەرەسمی یا کومەلا پێشکەتنا کوردستانێ بویە. بەلێ دەهقێ وێ یەکێدا د کوڤارێدا تشتەك وەها نە هاتیە نڤیسین. بەلکی ژ بەر میریێ ئەورێ هاتیە بژارتن و نە هاتیە نڤیسین کو کوڤار ئورگانا کومەلێ یە.

د دەستپیکا سالا 1919ێ دا کومەلەکا چاندەیی (رەوشەنبیری) ژ ی هاتیە سازکرن. ئەو کومەلە ژ ی پێگرتیێ کومەلا پێشکەتنا کوردستانێ بویە. ناڤێ وێ «کومەلا کورد ژ بو بەلاڤکرنا زانینێ و وەشانان» بویە. چاوا ژ ناڤێ وێ تێ زانین، ئەو کومەلەکا چاندەیی بویە. بەرناما وێ کومەلێ د تاریخا 2/2/1919ێدا و «ژین»ێدا بەلاڤوکەکا درێژ هاتیە چاپکرن و راگەهاندن.

کومەلا کورد ژ بو بەلاڤکرنا زانینێ و وەشانان، دوێ بەرناما خوەدا راگەهاندیە کو ژ دەما سازبونا خوە پێڤە کارگێرییا کوڤارا «ژین» ژ ی گرتیە دەستێ خوە. پەیڤا کومەلێ ل سەر کارگێرییا «ژین»ێ وەها یە:

«کومەلە، کوڤارا «ژین» کو ژ دەمەکا [illegible] دەردکەڤەو هەتا کو خوەدێ ب ڤێ دێ دەرکەڤە، دگرە بنێ کارگێرییا خوە، ب ڤێ واستێ هەمی هەڤ نەتەوەیین خوە د ئێختە مەیدانا خەبات و جوامیری و مەردینیێ. راستانین و لێکانین ژ خوەدێ یە».

وسا تێ زانین کو وێ کومەلێ، ژ بەر کو کومەلەکا چاندەیی بویە، د کارگێرییا کوڤارا «ژین»دا تو مەهزورەك نەدیتیە. لێ بەلێ ئەم ب هیسانێ دکارن بێژن کو ماکە کومەلە کومەلا پێشکەتنا کوردستانێ بویەو کارگێرییا راستین ژ ی د ئەسلێ خوەدا د دەستێ وێ کومەلێدا بویە.

سەرکارو بەرپرسیارێ کوڤارێ، بەرێ هەمزەێ موسەکی بویە، هەمزە، یەك ژ سەرکارێد کومەلا پێشکەتنا کوردستانێ بویەو ب ناڤێ هەمزەیێ موسەکی هاتییە ناسکرن. هەمزە ولاتەڤین و نەتەوەڤینەکێ کوردێ تێر باوەری و دلسوز هەر وەها ژ ی نڤیسکارەکێ خورت بویە. خورتیا قەلەمێ وی ژ پێشە پەیڤا کوژ بو «مەم و زین»ێ نڤیسییە کفشە. ئەو پێشە پەیڤا هەم د چاپا «مەم وزین»ێ یا 1919ێدا، هەم ژ ی دژمارەیا «ژین»ێ یا (19)ێدا هاتیە وەشاندن.

بەرپرسیارییا هەمزە ژ ژمارەیا پێشین هەتا ژمارەیا (20)ێ دوم کرییە، ژ ژمارەیا (21)ێ هەتا ژمارەیا (25)ێ یانی هەتا ژمارەیا پاشین ژ ی مەمدوح سەلیم بویە بەرپرسیارێ کوڤارێ. ئەڤ گوهارتن چما قەومییە؟ گەلو دوێ پێلێدا هەمزە وەزیفەکا دی ستاندیە لەوما مەمدوح سەلیم بویە بەرپرسیارێ کوڤارێ؟ یان سەمەدەکی دی دوێ گوهارتنێدا هەبویە؟ د هەقێ ڤێ شولێدا «بوز ئەرسەلان» دبێت ئەم تشتەك نزانین و تو هایداری د دەستێ مەدا تونن.

3 ـ نڤیسکارو هوزانێن «ژین»ێ.

گەلەك نڤیسکارێن قەدر بلندو زانا یێن مەزن د کوڤارا «ژین»دا نڤیسارێن رومەتگران نڤیسینە. هن ژ وان نڤیساران ب کوردینە. هن ژ ی ب ترکینە. هەر وەها گەلەك هوزانێد وەلاتەڤین ژ ی روپەلێد «ژین»ێ ب هەلبەستێن خوە یێد هێژا

خەمـلانـدنـە. یەك ژ هوزان و نڤیسكـارێـد كوڤـارێ یێـد تمی هوزان و نڤیسكارێ گەورە پیرەمێرد بویە. پیرەمێرد هوزانا مارشا «نـەوروز»ێ د «ژیـن»ێـدا ب ناڤێ خوە یێ راستێن «تـوفیقێ سلیمـانێ» نڤیسییـە. چەنـد نڤیسارێن وی‌و هن هەلبەستێد وی ب تركی د كوڤارێدا دەركەتنە.

یەك ژ نڤیسكـارێن «ژین»ێ یێـد تمی ژی (خلیـل خیـالی) بویە. زاناو نڤیسكارێ گەورە (خلیل خیالی) نڤیسارێد خوە ب ناڤێ كوردیێ بەدلیسی» نڤیسینە، د وان نڤیسارێن خوەدا گەلەك شولێن دیـروكی، میتـولـوژیـك، چڤـاكی، زمانزانی‌و فەلسـەفی گرتنـە دەستێ خوەو ب ئاوایـەكی زانیـاری ئەو تەهلیـل كرینـە. نڤیسارێت (خلیل خیالی) هەمی ب زمانێ تركینە.

سەیدا كەمال فوزی ژی یەك ژ نڤیسكارو هوزانێن «ژین»ێ بویە. نڤیسارو هەلبەستێن وی د نومینن كو دلێ وی تژی ئەڤینا نیشتمانێ بویە نڤیسارو هەلبەستێن كەمال فوزی یێن ئاگریین ب تركینە.

ئەڤـدرەهـمـان رەحـمـێ هەكـاری ژی یەك ژ هوزان و نڤیسكـارێن كوڤـارێ یێن تمی بویـە. پرێ نڤیسـارو هەلبەستێن وی ب كوردی نە. هەر وەها پەیسا وی یا كوردی «مەمێ ئالان» ژی د «ژین»ێدا دەركەتییە وسا زانین كو ئەڤ پەیسا كوردی یا پێشینە.

سەركار و بەرپرسیارێ كوڤارێ یێ دوێ مەمدوح سەلیم ژی یەك ژ نڤیسكارێد تمی بویە. وی نڤیسارێد خوە یێن سیاسی‌و چڤـاكی ب ناڤێ «مـەمـدوح سەلیم بەگ» نڤیسینـە. نڤیسارێن وی هەمی ب تركینە.

عەزیـز یامـولكی ژی د «ژین»ێـدا گەلـەك نڤیسـارێن هێـژا نڤیسینـە. نڤیسـارێن وی ب پرانی ل سەر دیـروكـا میـرگـەهـا «بـابـان»یـا كوردینـە. یامـولكی د وان نڤیسـارێن خوەدا میرگەها «بـابـان»ژ هەر ئالیفـەڤە ناساندینە، گەلەك گوشەیێن دیروكا وێ میرگەهێ رون كرینە هەر وەها لێكدانێن ئوسمانیاو ئیرانێ ل سەر كوردستانێ ژی ئانینە بەر چاڤان. نڤیسارێن یامولكی ب تركی دەركەتنە.

پەیڤێن پێشیـان یێـد كوردی خەمـلانـدینـەو ل سەر وان پەیڤێن پێشیان گەلەك ئاخفتنێن هێژا نڤیسینە، سەر چاڤێن وان پەیڤان و سەمەدێن دەركەتنا دانە زانین.

ژ بل پەیڤێن پێشیان، چەند نڤیسارو هەلبەستێن وان ژی د كوڤارێدا هاتنە وەشاندن.

هەروەسا (إحسان نوری) زانایێ كورد كامران عالی بدرخان، قازی زادە مسـتـەفـا شەوقـی، قازی زادە لەتـیـف، حوسـێنێ دێـرسمێ، میـرزایێ جزیـری، زاخویی‌و هن نڤیسكارو هوزانێن دی ژی د كوڤارێدا نڤیسینە.

ژ بل نڤیسـارو هەلبـەستێن ڤان هوزان و نڤیسكـارێن ژوری هن هەلبەستێن هوزانێن كورد یێن بەرین، وەك مەلایێ جزیری، ئەحمەدێ خانی، سیاهـ پوش، نالی، حاجی قادرێ كویی‌و هتد.

ژی د كوڤارێدا هاتنە چاپكرن. مروڤ د كارید بێژیت كو ئەو هوزانـێـن كوردێـن نەمـر ژی د «ژین»ێـدا بونـە هوزانێن شەرەڤێ، شەوقا خوە دانە روپەلێن وێ‌و خوەندەڤانێن وێ.

كوڤـارا «ژیـن» ب وێ دەستـەكـا خوە خورت، نێـزیكی سالەكێ ژیایە، ئەو نە تەنێ ژ ئالیێ سیاسی‌ڤە، لێ هەر وان ژ ئالیێ چڤـاكی، بێـژەیی‌و چانـدەیی ڤە ژی كوڤـارەكـا گەلـەك گرنگ‌و هێژا بویە، خزمەتەكا پر گەورە ژ نەتەوەیێ كوردراو ژ فكـرا كوردیتیێ‌را، ژ فكـرا وەلاتـەڤینێ‌و نەتـەو ئەڤینیـا كوردارا كرییە، هەڤە كو هەر كوردەك سەرێ خوە ل پێشبەزی خاترا وێ‌و خاترا دەستەكا وێ ب رێزادری بتەوینە (ب چەمینە).

4 ـ ژین چماو چاوا هاتیە گرتن؟

---

وەك مە بەرێ زانی، ژمـارەیـا «ژین»ێ یا دومـاهیێ د روژا 2/10/1919یـدا دەركـەتیـە. پشتی وێ تاریخێ كوڤـار هاتـە گرتن. بەلێ د هەڤێ سەمەدێ گرتنا وێدا زانینەكا بەلگەیی تونە.

لاوروشیـدوحیلمێ سوبـرەكی ژی روپەلێ «ژین» كا ب گەلـركوڤلر ژ ئالێ میرێڤە هاتیە كرتن، یان دناڤ دەستەكا

وێدا یان ژی د ناڤا کومەلا پێشکەتنا کوردستانێدا دوبەندیەك دەرکەتیەو ژ وێ بونێ کوڤار هاتیە گرتن؟

ژ هەوایێ کوڤارێ، خاسما ژ ژمارەیا دوماهێ وسا تێ زانین کو دەستەکا وێ د هەڤێ دوماندنا وێدا بریاردار بویە تەور وێ دەستەکێ خواستیە کو سنورێ خەباتا خوە فرەتر بکەن. ئەم د ژمارەیا (23)یدا راگەهینەك دبینن د وێ راگەهینێدا هاتیە ئاشکەراکرن کو وان بریار دایە کو «ژین»ێ بکەن کوڤارەکا سیاسی، بەلێ معاملا رەسمی هێژ تەمام نە بویە، ژ بەر وێ یەکێ ژی ژمارە (23)ێ دەرەنگ دەرکەتیە ژ بو کو خوەندەڤانان ژ بێسەبرییێ دەرخن وێ جارێ ژی کوڤار وەك بەرێ دەرخستینە.

ب راستی ژی ژمارەیا (23)ێ گەلەك دەرەنگ دەرکەتیە تاریخا ژمارەیا (22)ێ 2/7/1919یە. تاریخا ژمارەیا (23)ێ ژی 28/8/1919یە! لێ بەلێ دگەل وێ دەرەنگییێ ژی، ئەو راگەهین دنومینە کو نیەتا گارگێرێن کوڤارێ دوماندنا وەشاندنا وێ بویە. تشتێ بالکێش ئەڤە کو کوڤار، پشتی وێ راگەهینێ ژی دو ژمارە دیسا ل سەر ئاوایێ بەرێ دەرکەتینە.

د ژمارەیا پاشیندا ژ راگەهینەکا بالکێش دەرکەتیە. د وێ راگەهینێدا هاتیە گوتن کو د بونیا کوڤارا «ژین»دا کومیتەکا دوی چونا «تعقیب» کارێن کوردا ل ستەمبولێ هاتیە سازکرن و ئەو کومیتە دێ کارێن کوردا یێد ئیداری، عەسکەری و عەدلی ل ستەمبولێ تەعقیب بکەن. ئەو دوی چون ژی دێ مفت (بەلاش)بە، یانی کومیتە تو کرێ ژ خوەدانید وان کاران نا خوازە. ئاشکەرا یە کو دەستەکا خەیاتەکا وەها فرە ب دەتە بەر خوە ژ نیشکاڤەو بێ سەمەدی کوڤارا خوە ناگریت و دەستێ خوە ژ هەر تشتی نا کشینە.

گەلو «ژین» ژ ئالیێ میرێڤە هاتیە گرتن یان ژی ژ بەر زوردەستیا میرێ دەستەکا وێ نەچار مایەو ئەو گرتیە؟ ئەڤ ئیحتمال نە دوری ئاقلە. لێ بەلێ، د هەڤێ ڤێ یەکێدا د دەستێ مەدا تو هایداری و بەلگە تونە.

سەیدا زنار سلوپی «قدری جمیل پاشا»د پەرتوکا خوە «دوزا کوردستان»دا ددە زانین کو روژنامێن ترکی -وی دەمیدا ل دژی سەرەکێ کومەلا پێشکەتنا کوردستانێ «شێخ عبدالقادر» هەم سەرەکێ شورایێ دەولەتە، هەم ژی سەرەکێ کومەلا پێشکەتنا کوردستانێ یە. حال ئەو حالە کو ئەڤ کومەلە داخوازا سەرخوەبونا کوردستانێ دکە. دڤێ کو عبدالقادر یان ژ سەرەکیا شورایێ دەولەتێ، یان ژی ژ سەرەکیا کومەلا پێشکەتنا کوردستانێ ڤە کشە.

ل سەر وێ بکرو ڤەکێشێ عبدالقادر بەیانەك دایە روژنامان و گوتیە کو «گەلێ کورد سەرخوەبون ناخوازە، موختاریەت دخوازە» ئەڤ بەیانە بویە سەمەدێ دەرکەتنا دوبەندیێ د ناڤا کومەلا پێشکەتنا کوردستانێداو د دوماهیا وێ دو بەندیێدا ئەڤ کەسینە ژ کومەلێ ڤەقەتیان.

ئەمین عالی بدرخان (بوتان)، فرید بەگ، شکری بابان (سلیمانیە)، فؤاد بابان (سلیمانیە)، حکمت بابان (سلیمانیە)، د. عبداللە جودت (أربکیر) د. شکری محمد (پاخرمادەن)، کمال فوزی (بدلیس)، أکرم جمیل پاشا (آمد)، نجم الدین حسین (کرکوك)، ممدوح سلیم (وان)و مولانا زادە رفعت.

ئەڤ کەسە، پشتی کو ژ کومەلا پێشکەتنا کوردستانێ دەرکەتنە، کومەلەکا دی ب ناڤێ «کومەلا ڤێکخستنا جڤاکی» سازکرنە، کوڤارا «ژین» ژی گەریایە روژنامەو بویە ئورگانا وێ کومەلا نوی.

زنار سلوپی د هەڤێ ڤەومینا وێ بویەرێدا، وێ دو بەندی و پارچەبونێدا تو تاریخ نە نڤیسینە، هەر وەها نە دایە زانین کو «ژین» کەنگێ گەریایە روژنامەو ژ کیژان تاریخ پێڤە روژنامەکی هاتیە وەشاندن. ئەگەر «ژین»ب راستی گەریایە روژنامەو روژنامەکی دەرکەتیە، دڤێ کو مروڤ ل ژمارەیێن وێ یێن روژنامەکی ژی ب گەرە و ژ بو پەیداکرنا وان ب خەبتە.

هەر وەها، دڤێ کو مروڤ ب خەبتە کو تەسبیت بکە کە کو ئەو روژنامە چ قاسی ژیایە، کەنگی و چاوا وچما هاتیە گرتن.

5 ـ یەکیتی و هەڤگرتن: ـ

ژ نڤیسارێن «ژین»ێ تێە زانین کو دەردێ بێ تەفاقیێ وی

دەمی ژ ی د ناڤ کوردا دا هەبویە، هەلە ژ وی دەردی ژ ی شولا یەکیتیی و هەڤگرتنێ دەرکەتیە مەیدانێ. ئەو شول وی دەمی ژ ی شولەکا روژ ین بویە کو وەلاتەڤینێن کورد ل سەری فکرینە. نڤیسکارو هوزانێ هێژا «قازی زادە مستەفا شەوقی» د نڤیسارا خوە یا ب سەر نڤیسارا «وزعیەتێ ئیمە کوردا د عەسرێ حازردا» کوردا دڤێ یەکیتیی و هەڤگرتنێ د دوماهیا نڤیسارا خوەدا ژ ی وەها گوتیە:

«فەقەت لە بو ئیوە حەیفە د گەل ئەو شان و شوهرەتان وا بە فەقیری راوەستن و بەتەمبەلی مولکی ئازیزتان لە دەست بدەن. ئەلبەتە ئیوە کە ساحب شەرەفن، قسەی من دە گوی دەگرن. وەرن تا زو وە لەبو خاتری ئیسکی باب و باپیرمان ئیتفاق بکەین و وەتەنی خوشمان قوربانی مەنفەعەتی و رەزیلەو کورسی ریاسەت نەکەین. چونکە وەقت تەنگەو دوژمن لە خەلفەتی مە ئیستفادە دەکا.. هایە ـ ئالەل ـ فەلاهـ! وە ئیلا پەشیمان دەبنەوەو ئیدی دەمێ هیچ فەیدە نیە.

هوزان و نڤیسکار عەڤدورەحیم رەحمی ژ ی ل سەر شولا یەکیتیی و هەڤگرتنێ نڤیسارو هەلبەست نڤیسینە. د هەلبەستا خوە «دەستێ تەنێ دەنگە ژ ێ نایت»دا وەها گوتیە:

ئەی مللەتێ ساحب نیفاق
لازم ژبو تە ئیتفاق
ئەسیس نەکن ئەم یەک ویفاق
مە هاوبیە یە بیلە ئیتفاق
ئاقلێ خوە بەر هەڤ کن هەمی.

★ ★ ★

وەقت، زەمان پر نازکە
بێ ئیتفاقی تەهلوکە
خەلقان هەمی دگەل مە رکە
مەحویەتا مە بێ شکە
ئاقلێ خوە بەر هەڤ کن هەمی.

★ ★ ★

شەخسییەتێ باڤینە دەر
یەک شەخسی شول نایتە سەر
یەک بن، نەمینیت بێ ئەسەر
شولا ئومێدا مە ل سەر
ئاقلێ خوە بەر هەڤ کن هەمی.

★ ★ ★

دەست دەتە یەک شبی برا
هنگن ژبو خوە یەک چرا
ریا کو تاری یە ژ مەرا
روناهی لازم ڤێ سرا
ئاقلێ خوە بەر هەڤ کن هەمی

★ ★ ★

[ژین ژمارە (5) روپەل 14]

**6 ـ مەڤاو گرنگیا زانینێ: ـ**

ژ کوڤارا «ژ ین» تێ زانین کو وەلاتەڤین و نەتەوە ئەڤینن کورد وی دەمی گرنگیەکا مەزن د دانە زانینێ. د کوڤارێدا ل سەر مەڤاو گرنگیا زانینێ گەلەک نڤیسارو هەلبەست هاتنە نڤیسین. نڤیسکارو هوزانێن کورد دانە زانین کو نەزانینێ چ قاس تەخریبات د کومەلا کورد دا ئانیە مەیدانێ و چاوا بویە سەمەدێ پاشمانا گەل. هەر وەها کفش کرنە کو گەلێ کورد مەجبورە کو ڤێ رەوشێ بگوهێرەو خوە ب زانینێ موجەهەز بکە مەسافا ناڤبەرا خوەو گەلێن پێشکەتی داگرە. بو نمونە: شفیق ئەرواسی د نڤیسارا خوەدا «زانین د پێشیا هەمی تشتانە» ژ کوردا را وەها گوتیە:

«ئەی برایێ مە، هون دزانن کو ئیرو عیلم و مەعارف دنێڤ هەر مللەتەکی دا بەلاڤ بویە، ژ بچوک هەتا مەزنێد وان هەمی ژ ئەحوالێ دین و دنیا خوە ئاگاهدارن، ژ خەیرێ مللەتێ مە کو ئەم تەنێ ژ ڤێ نیعمەتا مەزن ماینە بێبەهر. ژ بەر وی قاسی یە

ئەو فەزايلێ کو د ملەتێ مەدا هەنە هەمی بێفایدە دچن، بەرو ڤاژی دبنە سەبەبێ فەزەلەت و مەزەمەتا مە.

خايەت ئەم دیندارین، لاکین ئەحکام و کەمالاتێ کو دینێ مە ئەمـر دکـە ئەم نزانین، هەتـا کو پێ عەمـەل بکین. و ب خایـەت شەجیعین، لاکین شەجاعـەتـا خوە د کوشتن و خرابیا هەڤدا سەرف دکین و ئەم زەهف سەخی نە، لێ ژبو متربان د داوەتان داو ژبو رەشوەتان د دەعوانداو ژبو کوچەکان د تیاترواندا و ژبـو هەدیێ ئاغـاو بەگ و شێخـان د عیـدانـدا، نەکـو ژبـو مەنفەعەتەکێ عمومیو یا ئەمرەکێ دینی.

سەبەبێ ڤان ژی هەمی نەزانینە. وەکی تە ئەڤ زانی. ئیرو دا ژ مەرا ژی هەمی تشتـەکی لازمتـر عیلمــە. ریـا وی ژی خوەندن و نڤیسینە. ئەو ژی ئانجاخ ب لوخەتێ مە بت. لەورا لوخـەتێ پاشڤـە، عومـرەك لازمـە هەتـا کو مروڤ وی لوخـەتی بزانت، ژ ئەو پاش کو ب وی لوخەتی عیلمەکی بزانت. ئەو ژی ژ هەر کەسێرا مومکن نابت کورد زادە (کمال) ژی نڤیسارا خوە «ژ کوردان را وەزیڤا مە یا ئیروین»دا وەها گوتیە: «یەك ژ وەزیـڤـێـن مەیـێـن گرنـگـتـرین و پێـویسـتـرین ئەڤـە کو ئەم پێکانینا هەبون و پاراستنا بەختیاریو حقوقێن کوردیتیێو نەسلێن هاتی تەسلیمێ پشتگرییا زانینێ بکن. داخوازو ئامانج و ئارەزو ئەڤـە کو ئەم جوانـێـن کوردان بجـڤینن بال هەڤ و فەلاکـەتـا نەزانینێ ژ کوردستانێ بقەتینن. لەورا دەورا مە دەورا پێشکەتنێ یە کەسێن کو نەخەبتن، ل ریا پێشکەتنێ وان کاش دکەو ب خوەرا دبە.

کوردی زادە «E سایت» ژی و هەلبەستا خوەدا ژ «کورمانجا را»ل سەر گرنگیا خوەندنێ وەها نڤیسیە:

**گەلی کوردا شورەك دکم**<br>
**هەمو کورمانج دەستەك بین**<br>
**پاشێ ئەمێ راحەت بکن**<br>
**لاوێ خوەنا خوەندش بدن**<br>
**بونا مە مەکتەب لازمی**<br>
**بونا مە سنعەت لازمی**<br>
**بونا مە ئیمان لازمی**<br>
**بونا مە نمێژ لازمی**<br>
**هەر گوندیدا مەکتەب ڤەکن**<br>
**پاشێ قەدرێ وێ فێم دکن.**

هوزان عەڤـدورەحـیـم رەحـمـی ژی د هەلبـەستـا خوەدا «نەزانین» وەها ئیریشی نەزانینێ کریە:

**ئەی جەهل و نەزانین، تویی دوژمن، تویی خاین**<br>
**زولما تەیە هێلان هەمی بێ سنعەت و بێ دین**<br>
**قەهرا تەیە وێران کری ئاها، وەتەنێ من**<br>
**کینا تەیە بێلانە کری جیسم و تەنێ من**<br>
**سەرووت تە ژ مە ستاندیە، بێمال و دراڤن**<br>
**ئەم ماینە بەلنگازو فەقیر، خانە بەلاڤن**

**پەیڤێن پێشینان: ـ**

---

یەك ژ بابەتێن چاندەییو بێژەیی یێن کو د کوڤارا «ژین»دا جی گرتنـە، پەیڤێن پێشینـانن. نڤیسکـارێن کو دوی بابـەتیـدا خەبات کرنەو نڤیسینە [لاو رەشیدو حیلمی سوێرەکی] بونە تشتێ کو بابەت دەولەمەند کریەو رەنگەگێ زانستی دایێ ئەڤە کو وان نڤیسکـاران، تەنێ ب رێـزکـرنـا پەیڤێن پێشینـان فیمـا خوە نە ئانینە، لێ هەر وەها ل سەر وان ئاخفتن ژی نڤیسینەو سەمەدێن دەرگەتنا وان و بەلاڤبونا وان ژی کفش کرنە لێ بەلێ، ئاخفتنێن کو ل سەر پەیڤێن پێشینـان نڤیسیت گشت ب ترکی بونـە. دل دخـوەسـت، هەق ژی وسـا بو کو ئەو ئاخفتن ژی ب کوردی هاتبونا نڤیسین.

ئەو پەیـڤـێـن پێشینـان یێن کو [لاو رەشیـد] بەرهەف کرنـە ونڤیسینە، د پێنج ژمارەیێن «ژین»ێدا د ژمارەیێن [3، 4، 5، 7، 8]دا دەرکـەتـنـە. یێن کو [حیلمی سوێـرەکی] بەر هەف کرنـە، ئەو ژی دسێ ژمـارەیـانـدا، د ژمـارەیێن [14، 19،

24]دا هاتیه وەشاندن.

لاو رەشید، د دەسپێکێ‌دا دەما خەباتا خوە ل سەر پەیڤێن پێشینان پێشکێش کرییە، ئاخفتنەکا کورت ژێ نڤیسییە، د وێ ئاخفتنێدا دایە زانین کو پەیڤێن پێشینان، ژ ئالیەکیڤە تەنگا وێ زمانێ کو پێ هاتنە گوتن دنوینن، ژ ئالیەکیڤە ژی ل گورا مانەو تێدایێن خوە، رەوشا وی گەلێ کو ئەو گوتنە تینن بەر چاڤان. وی راگەهاندییە کو ژ بەر ڤێ یەکێ، پەیڤێین پیشینان گەلەک گرنگن، خاسما یێن نەتەوەیەکی وەک نەتەوەیێ کورد کو هێژ ب تەمامی نە هاتیە ناسکرن. نڤیسکار د دوایا ئاخفتنا خوەدا دایە زانین کو وی پەیڤێن کو بەر هەڤ کرنە، ل گورا بابەتێن وان کرنە چەند پشك، وەك پشکا چڤاکی، پشکا مێرخاسی، پشکا بێژەیی، پشکا دیروکی.

حیلمی سوێرەکی ژی د دەسپێکا نڤیسنا پەیڤێن پێشینان‌دا ئاخفتنەکا کورت نڤیسییە، رومەت و گرنگیا پەیڤێن پێشینان دایە زانین. وی د ئاخفتنا خوەدا ل سەر پەیڤان یێن کو ژ ئالیێ [لاو رەشید] ڤە هاتنە نڤیسین، وەها گوتیە:

ئەو پەیڤێن پێشینان یێن کوردیی یێن شیرین یێن کو رویەلێن «ژین» یا خوەشتڤی یێن بێژەیی خەملاندینە، بێ‌گومان بالا هەر کوردیی و هەر هەوەسکاری کشاندنە، ل سەر کێژان ژ وان ب هەقی لێکولان بێ کرن و بێ فکراندن، تێ دیتن کو دبنێ وێدا گەلەک مەعنەیێن نە یەکسەر و گەلەک شیرەتێن راستین ڤە شارینە. تشتێ بالکێش ئەوە کو هەر پەیڤەك، ژ بو بویەرەك خاترەیەکا نەمرو دیروکەکا ژیندارە، هەر پەڤەکەکا وێ قانونەکا تەبیعی یە کو ل سەر تەجرویان هاتیە سازکرن.

نڤیسکار پاشێ گازند، کرییە کو پەیڤێن پێشینان یێن کوردی ب تەمامی نە هاتنە بەرهەڤکرن، دایە زانین کو ئەو وەزیفە وەزیفا خورتانە. ئەڤە چەند نمونە:

1 ـ لەوما دنیا ئاڤایە، هەر کەس ب ئاقلێ خوە شایە.

2 ـ رێ بی بلا دور بی، بور بی بلا کور بی.

3 ـ کەسادی دکە فەسادی.

4 ـ وەستا نەجار، رازە وەکی هەر جار، خوەیدێ یەکە دەری هەزار.

5 ـ بلا مروڤ ژنا مێران بە، بلا ل بەر شورو رمان بە.

6 ـ بلا مێرێ مروڤ لاو بە، بلا کراسێ مروڤ چاو بە.

7 ـ دێ کو بو دێماری، باڤ دبێ کاڤاری ـ

8 ـ کو دێ بە داماری، باڤ ژی دبە باماری.

9 ـ یەك بانە، دو زوزانە.

10 ـ پرا باتمانێ، مەدرەسا گومەیدانێ، مزگەفتا هیزانێ، خراب نابی هەتا ئاخر زمانێ.

**خەباتا ل سەر زمانی:**

زمانێ کوردیی و خەباتا ل سەر وی، د وی دەمی ژی د بەرمانا وەلاتەڤین و نەتەوەڤینێن کورد دا مادەکا گرنگە پێکانییە. ئەڤ یەك ژ هن نڤیسارێن کوڤارا «ژین» ب ئاوایەکی ئەشکەراو بەرچاڤ کفش دبە. گرنگیا زمان و گرنگیا خەباتا ل سەر زمان و بەلاڤوکا «کومەلا کورد ژ بو بەلاڤکرنا زانینێ و وەشانان»دا وەها هاتیە نوماندن.

«دبێژن کو بەراتا هە و ئیستیحقاقا نەتەوەیان، هەبونا تاریخێ یەو هەبونا زمانەکێ وسا یە کو بەرانبەرێ جەرەیانا دەمێ بە، یانی هەبونا زمانەکێ وسا یە کو بەرانبەررێ جەرەیانا دەمێ بە، یانی هەبونا سازگەهێن نەتەوەیی یە.

تەنێ ئەڤن کو ژ مروڤ را دبن کاخەدێ هوییەکێ و نیشانا دەستورا کو مروڤ دکارە ب وێ تێکەڤە وی خانیێ هەق و تەمانێ بێ کو عەدالەتێ بەلاڤ دکە. بێ کو ئەم ئیدعایێن جاهلکی و دەرسینور بکن، دڤێ کو ئەم ل خوە بێن مکورێ کو ژ ڤی ئالیڤە کێمایا کوردیتێ مەزنەو دلێشینە.

د بەلاڤوکێ‌دا پاشێ هاتیە راگەهاندن کو تەمامکرنا ڤێ کێمایی و داگرتنا ڤێ ڤالاییێ نە تشتەکی بێ مومکنە، ب خیرەت و خەباتێ، د دەمەکا نە درێژ دا مومکنە کو ئەڤ کێمایی بێ تەمامکرن و ئەڤ ڤالایی بێ داگرتن. پاشێ وەها گازند هاتیە کرن: دڤێن دەماندا کو نەتەوەیێن دی دوایی ل خەباتا خوە یا

ل سەر ڤێ ئاخـا پـیـر ئانینـەو دەست ب خەبـاتـا ئاسیمانان کرنە تشتەکی دلێشینە کو مروڤ هێژ ب زمان و سەر راستکرنا زمان و وەك هەڤگرنا زمان خەریك بە. لەورا زمان، دهێمێ مەدەنیەتا مروڤیدا کەڤرێ پێشینە.

چاوا کو مە ل بەری نهو گوتبو، خەباتا ل سەر زمانێ کوردیێو ئامادەکرنا فەرهەنگەکا نەتەوەیی، یەك ژ مادێن بەرناما کومەلێ بویە.

کوردیێ بدلیسی ژی شولا زمانێ کوردیێو خەباتا ل سەر وی گرتیە دەستێ خوە. د وی بابەتیدا دو نڤیسارێن هێژا نڤیسینە، د وان نڤیسـارانـدا ژ بو خەبـاتا ل سەر زمانێ کوردی بەرنامەیەك و رێبـازەك زانستی دانیـە. وی د نڤیسـارا خوە یا پێشینـدا شولا هەبونا زارێد کوردی یێن جورە ـ جورە گرتیە دەستێ خوەو دوی بابەتیدا وەها نڤیسیە:

گەلو مومکنە کو زمانەکی یەکبویی بێ قەبولکرن؟ دگەل کو ئەڤ شول خەباتەکا تمیو دەمەکا درێژ دخوازە ژی، وەلاما ڤێ پرسێ ب کورتی «بەلێ یە». ما دەم کو وسا یە، ئیجار لەم کورد ب چ ئاوای دکـارن بین خوەدیێ زمـانـەکی یەکـبویی؟ کەسنـا دناسم کو هەبونا زارێد جورە ـ جورە د کوردیدا، ژ بو گیهانا ڤێ ئامانجێ وەك رتمەك قەبول دکن ـ لێ ئەو دخاپن و پر د رودا د فکرن، زارێد جورە ـ جورە نە کو دبن رتم. لێ ژ بو زمانێ مە کانەکا پەیڤکانا بێ دوماهی نەو نیعمەتەکن. پسپورەکی کو ریا ئیستیفادێ ببینە، دکارە ژ زاران مەڤایێن بێ دوماهی ب دەست خوە بێخیت. یەك ژی، ئەڤ بویەر نەکو تەنێ دناڤا مە کورداندا هەیـە؛ ئەو نەتـەوەیێـد کو خوەدیێن زمـانێـد تێکـوزتـرین و دەولەمەندترینن دگەل کو سەد سالان دەمێن وان یێد بێژەیی ژی هەبـون د ناڤـا وانـدا هێـژ ژی زارێـد وسـا هەنـە کو وەك بەرێ دژین و تێن پەیڤیین. د ناڤـا وانـدا زار هەنـە کو ژ ئالیێ پرانیـا پەیکان ڤە ژوردا ل زمانێ گشتیو بێژەیی دنێرن، زار ژی هەنە کو ژ ئالیێ خودانێ زارێ دیڤە قەت نایێن فامکرن. لێ جوداییا زارێد مە، هەما ژ گوهارتنا تیپان و دەنگا عیبارەتە. ل گورا ڤێ یەکێ، زار دکارن ل ناڤا کیتلەیێد خوە هەڤێ ژیانا بپارێزن، لێ دگـەل ڤێ پاراستنێ ژی ئەز وسـا باوەر دکم کو مروڤ دکـارە زمانەکی یەکبوییو پێرەیی پێکبینە کو ئەو ببە مالێ گشت.

نڤیسکار د نڤیسارا خوە یا دوێدا ژی دایە زانین کو خەباتا ل سەر زمـانـێ کوردی دڤـێ کو ب ئاوایـەکـی جدییو ب بەرپرسیاری بێ مەشاندن، ژ بو کو ئەو خەبات بەردار ببە، دڤێ کو بەرێ هازری بێ کرن و بەرنـامـەیـەکـا زانـسـتـی. بێ ئامـادەکـرن. پاشێ ل سەرکـان و سەرچاڤیا زمێن (زمانی) وەها گوتییـە: [بنگـەهـوکـەك هەیـە کو ب ئاوایەکی گشتی هاتیە قەبولکرن. ئەو ژی ئەڤە: زمانێ راستین و سافی ئەو زمانە کو کیتلەیا نەخوەندی یا وی نەتەوەی، خاسما پیرەژنێن وی پێ د پەیڤن. ل گورا ڤێ بنگـەهـوکێ، ئەز ژی د خوازم کو، ئاواو پەیڤکێن کو کیتلەیا نەخوەندی ئەو بژارتنە د تێکوزکرنا زماندا ئەو بنگەهـ یێن گرتن. ئەو سەر چاڤیو خزنەکا راستینن. ئەگەر ئەم بکـارن تێـدا یێن وێ سەرچـاڤیـا بـبـەرەکـەت ب دەستێ خوە بێخین و کەرەستـە کو دەستێ مە دکـەڤـە ئەم بکـارن ل گورا بنگەهوکێن زانستی یێد دوماهیێ رێزو سازبکن، ئەز دکارم بێ دو دلی ئیدیعا بکەم کو، ئەمێ د دەمەکا کورتدا ببت خوەدیێ زمانەکی نڤیسینێ پەیڤینێ کو دێ ژ پرێ زمانێن روژهەلاتێن ئیرو بین دەولەمەنتر بە».

نڤیسکـار پاشێ، ل سەر رێو ئاوایێن خەبـاتـا ل سەر زمان و ئاوایێن ئیستیفـادەکـرنـا ژ وان کان و سەرچـاڤیـان د یتنێن خوە نڤیسینـە، د وی بابـەتیـدا بەرنـامـەیەك پێشکێش کرییە. یەك ژ مادێن وێ بەرنامێ ژی ئەو بویە کو، دبونیا [کومەلا کورد ژ بو بەلاڤکـرنـا زانینێو وەشـانـان]دا کومیتـەکا تمی ب ناڤێ «کومیتا زمان» [دل ئەنجومەن] بێ سازکرن و ئەو کومیتە سرف ل سەر زمانێ کوردی بخەبتە، وی ئاواو شێوەیێ خەباتا وێ کومیتێ ژی دبـەرنـامـا خوەدا کفش کرییـە، ئەو بەرنـامـە ژ نەهـ مادەیێن سەرەکیو دەهـ مادەیێن شاخین پێکهاتییە.

لێ بەلێ، گەلـەك مخابن کو ئەو بەرنـامـە ژی وەك هەمی خەباتێن دی یێن وی دەمی ل سەر کاخد مایە، وەلاتەڤیێن کورد ژ بو پێکانینا وێ ژی مەجال و فەرسەند نە دیتنە. ب راستی ئەو بەرنامەوسا کو، ئیرو ژی مروڤ دکارە ب هن گوهارتنێد بچوك، وێ ژ بـو خەبـاتـا ل سەر زمـانێ کوردی وەك بەرنامەکا هەڤدەم و

زانستی قەبول بکەو خەباتا ل سەر زمان ل گورا وێ سەرەراست بکە. وی دەمی رێزمانەکا کوردی ژی دەرکەتییە. ناڤێ وێ «مقدمة العرفان» بویە. لێ نڤیسکارێ وێ نە کفشە. د چەند ژمارەیێن «ژین»ێدا دەرکەتنا وێ هاتیە راگەهاندن و ژ خوەندەڤانانرا تەو سییە هاتیەکرن، بەلێ ناڤێ نڤیسکارێ وێ نە هاتیە نڤیسین. ژ ئالیەکی دیڤە د «ژین»ێدا ئەلفەبا کوردی ژی ب تیپێن عەرەبی هاتیە نڤیسین. دوێ ئەلفا بێدا دەنگێد کو دزمانێ کوردیدا هەنە یەکا ـ یەك ب تیپێن عەرەبی هاتنە نوماندن و ژبو هەر یەکێ ژ وان ژی پەیڤکەك وەك نمونە هاتیە نبشاندن. ئەو ئەلفا یە ژی د چەند ژمارەیێن کوڤارێدا دەرکەتییە.

**روپەلێن هەلبەستان:**

هەر تشت ل ئالیەکی، ئەو هەلبەستێن رومەتبلند یێن کو روپەلێن کوڤارا «ژین» خەملاندنە، ب سەرێ خوە خزنەکا بێژەیی ژ بو بێژەیا کوردی پێکتینن. ژڤی ئالیڤە مروڤ دکارە بێژە کو «ژین»ێ باقەك گول ژ هەلبەستێن کوردی بەرهەڤ کرییە و ژ مەرا ئانیە، یان ژی کانەکا جەوهەران ژ هەلبەستێن کوردی گرتیەو گەهاندییە دەما مە. د روپەلێن کوڤارێدا نە تەنێ هەلبەستێن هوزانێن وی دەمی دەرکەتنە، لێ هەر وەها یێن هوزانێن مەزن یێن مێژین یێن وەك: خانی، مەلایێ جزیری، سیاهپوش، نالیو حاجی قادرێ کویی. ژی جی گرتنە. هن ژ وان هەلبەستان، ژ بل کوڤارا «ژین»دا جیەکی دیدا دەر نەکەتنە، تەور بەرێ نە هاتنە زانین و هایا کەسێ ژی ژ وان تونە بویە. یەك ژوان هەلبەستێن وەها، هەلبەستەکا خانی یە، ئەو هەلبەستەکا فەلسەفی یەو تەنێ د «ژین»ێدا دەرکەتیە. وەك گەلەك هەلبەستێن کلاسیکی.

ناڤێ وێ هەلبەستێ ژی تونە، خانی، د هەر دو پارچێن پێشین یێد هەلبەستێدا وەها دبێژە:

**زاهدێ خەلوەتا نوشین پابەندێ کردارێ خوەیە**
**تاجرێ ریحلەت گوزین دلنارێ دینارێ خوەیە**
**عاشقێ دلبەر حەبین دلدارێ دیدارێ خوەیە**
**دا بزانی هەر کەسەك بێ شوبهە خەمخوارێ خوەیە**

★ ★ ★ ★

**بێ ئەمەل تو ژ کەس مەکە هیڤی عەناو هیمەتێ**
**بێ خەرەز ناکێشتن قەد کەس ژ بو کەس زەحمەتێ**
**کەس نەهن هلگرن بارێ تە ئەو بێ ئوجرەتێ**
**گەر چ عیسا بت ئەوی ڤێك راکەرێ بارێ خوەیە**

★ ★ ★ ★

ژ بل ڤێ هەلبەستێ، کوڤارێدا چەند پارچە ژ «مەم و زین»ێ ژی دەرکەتنە.

یەك ژ هەلبەستێن کو تەنێ د «ژین»ێدا دەرکەتنە ژی، هەلبەستەکا «سیاهپوش»ە ناڤێ وێ هەلبەستێ ژی نونە. چەند مالکێن هەلبەستێ ئەڤن:

**ئەی حەبیبێ قەلب و روحی، ئەی قەرارێ جانێ من**
**دێ چ بیتن جارەکێ گەر تو ببی میهمانێ من**
**بیێ ل سەر چاڤێ م رونی، نەزەرا قەلبێ م بی**
**ئەز خولامێ کەمتەرینم. هەر تویی سولتانێ من.**

★ ★ ★ ★

**قەلب و دل مەجروحێ عەینێ ئەسوەدو برهێ تەنە**
**نینە بێ جاما مەیێ قەد مەرهەم و دەرمانێ من**
**سەد وەکی عیساو ئەفلاتون، جالینوسێ حەکیم**
**چارەیێ دەردێ م نەکی بێ تە، ئەی لوقمانێ من.**

★ ★ ★ ★

یەك ژ هوزانێن کورد یێن کو ب هەلبەستێن وان روپەلێن کوڤارا «ژین» هاتنە خەملاندن ژی «میهری» بویە وی د

هەلبەستەکا خوەدا ژ ئازارو ستەمێن بارا خوە گازند کرییە، پاشێ دایــە زانـــیـــن کو، ژ بەر کو ئەو کوردە وەهــا د بنــێ زولـم و زوردەستیێ دایە، لەورا نەتەوەیێ کورد نەتەوەیەکی بەشخواریو سەرشکەستی یە چەند مالکێن هەلبەستا وی ئەڤن:

**بە تەعزیی ئەمن مەقسودی دیلبەر تێگەیاندن بو**
**کەمن کوردم، بەش من دایما هەر خواری‌یە، پەستی**
**حەقیقەت هەیکەلی ئەم مللەتە بێجارە، بێمارە**
**براوە لێوو ئەزمانی شیکاوە پێو سەرو دەستی**
**لەکن هەر کەس عەیانە حالی ئێمە، تو لی پێ ناوی**
**نیفاق و بوغزی خومان کالی بە بو یەئیس و بو سستی**

★ ★ ★ ★

ئەم د کارن ژ هوزان «مەشوی» ژی ڤان مالکێد ژێری بنومینن:

**بە نوری بادە کەشفی زولمەتی تەقوا نەکەم، چی بکەم!**
**بە شەمێکی وەها جارەی شەوێکی‌وا نەکەم، چی بکەم!**
**لەگەڵ دەستی منا رێکناکەوێ زناری زولفی یار**
**وەکو شێخ ئێختیاری مەزهەبێ تەرسا نەکەم، چی بکەم!**
**لە رێ شوخەدا خوم کرد بە خاك. پێ پیا نە نام جارێك**
**دەسا خاکی هەمو عالەم بەسەر خوم دا نەکەم، چی بکەم!**

★ ★ ★ ★

ژ هوزانــێــن وی دەمــی ژی ئەم دکــارن چەنــد مالــك ژ هەلبەستەکا [قازی زادە ـ مستەفا شەوقی] نیشان بدن.

ناڤێ وێ هەلبـەستێ [تـەحـەسوری جوانی‌و تەرانی وەتەن]ە هوزان، د دواییـا هەلبـەستێـدا ل هەڤێ ئاخـا کوردستانێدا وەها شیرەت ل کوردان کرییە:

**کە خاکی پاکی وی لانکە لەبو ئێسقانی باپیرمان**
**لەسەر قەبری جوانان دیدەیی شلڵێرە گریانە**
**تەماشای هەر قەدیدارێ مەکە ئەورو بە گیانسەختی**
**کە ئەو شینا بە یادگاری قەدیمی دایکی کوردانە**
**لە دێ ئیرو بە بێ تو دەردە دارە دایکی سەر شینت**
**بە بێ تو دەزکیرانت قانی چاو جوان دیدە گریانە**
**ئەوێ مولکی قەدیم و مەوتنی ئەجدادی پێشوتە**
**بە مەردی مەیروخێنە، چون هەریمی مولکی بابانە**
**بە عیلم و مەعریفەت تێراو بکە فکری جوانت، تا**
**دەگەل شەوقی ب جوتە موتەفق بن مەردو مەردانە**

★ ★ ★ ★

[قازی لەتیف] ژی د هەلبەستەکا خوەیا ب ناڤێ «خەزەل» دا، ژ هوزانێن کورد خوەستییە کو ل سەر بەژن و بالایێن کەچان نە نڤیسن، لێ ل سەر رەوشا گەلێ کورد بنڤیسن.

د هەلبەستا خوەدا وەها گوتییە: ـ

**چالێ خوە ڤەکن، ل دورا خوە بنێرن**
**چەر قرینە، هەوارێ وان بنێرن**
**ئیرو هەڤە، هەڤکێ مە ل پێشە**
**ژ ئەزمانا نایێ خوارێ ب کیسە**
**چیا بلند، دەشتا فرە بێزلام**
**نەوالا مەزن هەمی تێدا بێزمان**
**سەرەك دبن، ئاغا دبن بێمەری**
**روژ هەڤە، دیسا د کەڤن بێسەری**
**گش کەتنە بن لهێڤێ نەرم د گەرم**
**کەس نابێژە چ پو ئەول ئەزم و رەزم**

★ ★ ★ ★

هوزان [زاخویی] ژی بەرێ خوە دایە باژارێن کوردستانێ‌و ئەو دانە بەر رەخنەیێد عەقلانە زاخویی د هەلبەستا خوەدا [ژ باژاربیا را] رەوشا باژاربیاو نهێرتنا وانا ل ژینێ، ژ دەڤێ وان وەها سالخ دایە:

**باژارینو، ڤینو سورنو**
**هون مەزنن، هون ماقولن**

ژ بو وێ یە خوە تەڤ نادن
ژ خوە شەرمە خوە رەحتکرن
مللەت چ یە، چ تەبا یە!
وان چەپەلا، گوهـ وان مەدن!
ئەم ئەشرافن، ئەم عەیانن
هون رەنجبەرن، جەوێلەکن
بخەبتن مە تێر بکن
پیرەکێ مە بازن زێرکن
حول و مەرجان ل گەردەن کن
لڤینێن گەرم گەلەك خوەشن

مە تەڤ مەدن مە رەحتکن
فللەتێ، چ ژ مە یە
مە بهێلن ل کێفێ خوە
ل حالێ خوە ل زەوقێ خوە
چاوا دبە برا ببە
برا وەلات خرا ببە
شوشا عەرەق ل پێش مە بە
پیرەك و کەچ ل رەقسێ بە
پاشلا مە تژی زێر بە
برا شەوقە ل سەرێ مە بە
چاوا دبە وسا ببە
برا دنیا خرا ببە.

★ ★ ★

هوزان [سلیمان بوتانی] ژی د هەلبەستا خوەیا ب ناڤێ [سترانا کوردان]دا گوتییە:

ئاڤا خوەشیێ ل سەر مە دەرکەت
فەرزە ژ مەرا تەفاق و هیمەت
تاڤا خوەشیێ ل سەر مە دەرکەت
بەختێ مە ژی وێ ڤەبت وەکی گول
نامینە وسا وەکی دلێ کول
تاڤا خوەشیێ ل سەر مە دەرکەت
مێرو ژن و کەچ هەمی نەزانن
هولێ نە خەریب و بێمەکانن
تاڤا خوەشیێ ل سەر مە دەرکەت
سێ دەولەتێ زالم، وە قاس هار
تالان کرنە سەریرو دیار
تاڤا خوەشیێ ل سەر مە دەرکەت
یأسێ ژ دلێ خوە هەر دەرینن
تاجا زافەرێ ئەمێ ببینن
تاڤا خوەشیێ ل سەر مە دەرکەت
روحانیا حەبییان هەڤالە
بێخیرەتی پاش نوها وەبالە
تاڤا خوەشیێ ل سەر مە دەرکەت

★ ★ ★

[حلمی سوێرەکی] ژی ژ بو زاروکێن کوردان هەلبەستەك ب ناڤێ «یەك دەنگە» نفیسینە:

ئەم نە بەگن، نە پاشانن
ئەم گشك کەکن، گشك بزانن
ژ دوستان را جانفیدانن
ئەم بەلایێ دوشمنانن
باڤێ مە یە هەر حەفت ئەزمان
دییا مەیە خوەشی کوردستان
ئەم ئەولادێ هەمو کوردان
ئەم دخوازن عیلم و عیرفان
دەرس و راستی مە هەڤالە
شورو قەلەم مە هەم حالە
دەرباز نابی مەهـ و سالە
هەر چی دبی گول و لالە.

★ ★ ★

**يەك بەرهەڤوك چەوا بدەست كەت:**

وەك مە ل پێش نهــو گوتــی ژ كوڤــارا «ژیــن» تەنێ یەك بەرهەڤوك ژ شەوتاندنێ و تونە بونێ رزگار بویەو گەهایە دەست و دەورا مە. ئەڤ بەرهــەڤــوك جلد كری بوو ل جیێــەك بو. ئەم نزانین ئەڤ جلد چاوا ژ شەوتــانــدنێ فلتییــە. د هەڤێ رونكــرنا بەرسڤــا ڤێ پرسیــارێ د دەستێ مەدا تو بەلگــەو وەسیقــە نینن ـ تشتێ ئەم دزانین ئەڤە كو ژمارێن كوڤارێ یێد ڤێ بەرهەڤوكێدا ژ هندەك تاخێن ستەمبولێ هاتیتە پوستەكرن. ئەو ژمارە تاریخ و جیێن پوستەكرنا وان وەها نە:

ل سەر ژمــارە (2)دو تامخــا پوستــەخــانــا ستەمبولێ یا هەیو تیپێن (IST) ژێ تێن خواندن. هەر وسا ژمارێد (18 ـ 11 ـ 334/). ژمــارە (17) هەڤــدە تامخــا (كــزلتــوپــراك) یا ل سەر هەی. [كــزلتــوپــراك ب خوە تاخەكێ ستەمبولێ یە] ل سەر وێ تامخێ ژمارە (19 ـ 4 ـ 35) تێن خوەندن. ل سەر ژمارە (19) نوزدەهـ دیسا تامخا (كزلتوپراك) دگەل ژمارێن (21 ـ 5 ـ 35) دەركە تیە.

ل سەر ژمارەیا (20) بیست ژی تامخا (كزلتوپراك) یا هەی بەلێ تاریخا وێ دەر نە كەتیە.

ل سەر ژمــارە (22) بیست و دو ژی تامخــا (ئــوسكــودار) هەیە. [ئوسكودار ژی تاخەكێ ستەمبولێ یە]. ل سەر تامخێ ژمارەیێن (11 ـ 7 ـ 9/335) تێن خوەندن.

ل سەر ژمــارەیــا (24) بیــست و جار ژی دیــســا تامخــا (كزلتوپراك) دگەل ژمارەیێن (11 ـ 9 ـ 9/35) تێن خوەندن.

گەلو ئەڤ ژمارە ژ كیدەرێ راو ژ كێ را هاتینە شاندن؟ ئەم ڤێ یەكێ نزانین. ل سەر وان ژمارەیان ژ بل تامخان تو ناڤ و نیشان دەر نە كەتینە.

وسا تێ زانین كو ئەڤ بەرهەڤوك. یا خوەندەڤانەكێ «ژین»ێ بویە. خوەندەڤانی هەمی ژمارەیێن كوڤارێ بەرهەڤ كرنە. ب دیقەت و ئیهتمام ئەو وەك پرتوك جلد كرنە. دەما زمانێ كوردی قەدەخە كرین و دەست ب.

شەوتــانــدنــا پرتــوك و روژنــامــەو كوڤــارێد كوردی كری. وی خوەنــدەڤــانی «ژین» دانــایــە جیێــەكیو پارازتییــە. ئەگــەر وی خوەنــدەڤــانی ئەو بەرهــەڤــوك ڤەنــەشــارتبــا «ژین»دێ ببــویا وەك «تەیرێ عەنقا» دێ ناڤێ وێ هەبویا، لێ ئەو ب خوە تونە بویا.

**تێبینی:**

1 ـ گەلــە جارا هێــژا بوزئــەرســەلان پەیڤــا «هــوزان» لجهێ هوزانڤان بكار ئانیە.

2 ـ هەر وسا هێژا بوزئەرسلان پەیڤا نڤیسكار لجهێ نڤیسەر بكار ئانیە.

**ژێدەر:**


1 ـ د. بلێج شیركو ـ القضیة الكردیة. ماضی الكرد وحاضرهم ـ 1930 ـ مطبعة السعادە بجوار محافظة مصر ص52.

2 ـ جمال خەزنەدار ـ رابەری روژنامە گەری كوردی. 1973 ـ دار الحریة للطباعة ـ مطبعة الجمهوریة ـ بغداد.

3 ـ د. كمال مظهر ـ تێگەیشتنی راستیو شوێنی لە روژنامە نوسی كوردیــدا ـ 1978 ـ چاپخــانــەی كوردی زانیــاری كورد ـ بغداد لاپەرە. [49 ـ 72، 75، 95، 153، 156، 202، 232، 233].

4 ـ محمد أمین زكی ـ خلاصة تاریخ الكرد وكوردستان ـ من أقدم العصور التاریخیة حتی الآن 1936م مطبعة صلاح الدین ـ بتاوین ـ بغداد ص 350.

5 ـ محمد أمین بوزأرسلان ـ ژین ـ جلو ـ ئێك ـ كانونا پاشین 1985م ئەپسالا/ سوید.

# دەروازەیەك بۆ ناسینی کاویساغای نەمر

جلال ملا حسن خۆشناو

- بنەماڵە -

.. ئەحمەد هەرکی خوالێخۆش بوو باوکی کاوێساغا بوو، لە تیرەی (ماڵەبی)یە کەتیرەیەکە لە لقی (سیدان)ە، ئەو خێڵەو لە زستاناندا لە ناوچە دەشتایەکانی رۆژهەڵاتی (مووسڵ)و گوندی (شێخکان) جێنشین دەبوون. ئەحمەد هەرکی دوای مردنی دوو کوڕی لە پاش بەجێ دەمێنێت یەکیان ناوی (کاك وەیس)ەو تەمەنی (10) دە ساڵان بووە ئەویتریان کە لە کاك وەیس بچووکتر بوو ناوی (کنۆ) بووە.

(لەیلێ)ی خێزانی ئەحمەد هەرکی ماڵەکەی بارکردووەو گوندی (شێخکان)ی بەجێ هێشتووەو ڕووی کردۆتە هۆبە هەرکیەکانی ناوچەی سۆران، بۆ لای (خانەمیر) کە خوشکی ئەحمەد هەرکی لەلا بووە ناوی (بسکێ) بووە، ئەو کاتە خانەمیر لەگەڵ خێڵەکەی بەرەو کوێستانەکان کەوتبووە ڕێ‌و لە هەواری (کونەمار) هۆبەکەیان هەڵدابوو لە نزیك ناوچەی (دیانە).

لەیلێ ڕەشماڵەکەی لە ڕۆخ ماڵی خانەمیری هەڵداو زۆری نەخایاند هەر لەوێ (کنۆ)ی برای کاك وەیس مرد، بەڵام کاك وەیس و لەیلێ مانەوە.

هەروەها کورەازاو پوورزای کاك وەیسیش (دەروێش چەلەبی) کە بە (شێتە) بەناو بانگ بوو لەگەڵ خوشکی (دەروێش فاتیمە) ناوچەی بادینان بەجێ دێڵن و بەرەو هەرکیەکانی ناوچەی سۆران دەکەونەڕێ‌و لە یەکێك لە کوێستانەکان دەبنە دراوسێی لەیلێ‌و خانەمیر.

- کاوێساغا -

کاوێس ئاغای هونەرمەندی کورد، ناوی (کاك وەیس)ە کوری ئەحمەدی کوری جەمیل کوری کانەبی (کانۆ)یە لە خێڵی هەرکی‌یەو لەتیرەی (ماڵەبی)یە.

لە ساڵی 1889 دا کاوێساغا لە کوێستانی (چارچەلی) هەرکیان لەدایك دەبێت.

کاوێساغا هەر لە منداڵی‌یەوە پەروەردەی ئاووهەوای خۆش و سازگاری کوێستانە دڵرفێنەکانی کوردستان بووە، وەك (تەرگەوەر، مەرگەوەردەشتەبێل، دەشتی براندیز، چارچەلی هەرکیان، هەوار خاتون، هەوار مامز، مێرگە میرو مێرگەزەر) کە وەك بەهەشتێکی سەر رووی زەمینن.

کاوێساغا بە دەنگی شالوورو قاسپەی کەوی دەم کەویە بەفرەکان گوێی کراوەتەوە سۆزو هەست و ئەڤینی بزڤتی‌یە لەگەڵ باعەباعی بەرخۆڵەو شمشاڵی (کاکەی) شوان و لەگەڵ ئاوازی شەنگەبێریان کە تێکەڵ بەناو کەژ و کێوە سەرکەشەکانی کوردستان دەبوون، دەنگی دەدایەوەو دەبوو بە جوانترین سیمفۆنیا.

لە پاییزێکی درەنگدا کاوێساغا لەگەڵ خێڵەکەی کوێستانەکانیان بەجێ دەهێشت و بەرەو گەرمێن دەهاتنەوە خوارێ، تا دەگەیشتنە پاوانەکانیان لە دەورو بەری ناوچەی پیرمام و دەشتی زرارەتی‌و لە گوندەکانی (هەرشەم، میر ئاخور، خاڵوان، ڕەشوان، زیارەت، دە. بەندی سەیدی، قەفەریان، قەپەکیان، دێرێ، کودەریان، هەبابان، گەرو دەلالان) جێنشین دەبوون، بۆ لەوەڕاندنی مەڕو ماڵاتیان لە زستاناندا.

کاوێساغا پاش مردنی (لەیلی)ی دایکی دەچێتە لای (ئەحمەد خانی هەرکی). ئەحمەدخان لەبەر ئازایی‌و زیرەکی‌و راپەڕاندنی ئیشوکاری ناوماڵیان زۆر خۆشی دەویست، لەپاشان - دەبێتە شوانی ئەحمەد خانی هەرکی، بەدەم شوانی‌یەوە بۆ دڵ خۆش کردن و دامرکاندنەوەی ژان و ئازارو کەف و کوڵی ناو دڵ و دەروونی لاوك دەکات بە هۆگری خۆی تا خەم و دەردو پەژارەو داخی دڵی پێ دابمرکێنیت، دوا بە دوای شوانی دەبێتە چەك هەڵگری ئەحمەدخانی هەرکی لەبەر مێرانی‌و نیشان پێکاندن.

کاوێساغا تا ساڵی 1915 لەگەڵ خێڵەکەی کوێستان و گەرمیانی کردووە لە پاشانـدا خۆیو پوورزاکـەی دەروێش فاتیمە لەگەڵ (تاهیر ئاغای هەرکی) دێتە شاری رواندوز لە ماڵی (حاجی نەورۆز ئەفەندی) مێوان دەبن، (چونکە ماڵی حاجـی نەورۆز ماڵـێـکـی خانـەدان بوون و هەروەهـا پەیـوەنـدیـەکی پتەو لە نێوان سەرۆکەکانی هەرکیو حاجی نەورۆز ئەفەندیدا هەبووە، هەرکییەکان کە بەرەو کوێستان دەچـوون سەریـان لە ماڵی حاجی نەورۆز دەداو هەروا لە گەرانەو شیاندا بۆ گەرمێن هەر لەو ماڵەدا دەبوون بە میوان.

ئەوەی ئاشکراش بێت خێزانی حاجی نەورۆز خزمایەتی لەگەڵ هەرکیەکاندا هەبووە). کە شەو دادەهات تا هیر ئاغا داوای لە کاویساغا دەکرد تا لاوکیان بۆ بڵێ، کاوێسیش تا درەنگی شەو دەستی بە لاوك گوتن دەکرد، حاجی نەورۆز شەیدای دەنگ و ئاوازی کاوێساغا دەبێت و بە جارێ کاری تێدەکات بۆیە داوا لە تاهیر ئاغا دەکات کە کاوێس رازی بکات و لەلای بمێنێتەوە.

تاهیر ئاغا بە کاوێس و دەروێش فاتیمە دەسەلمێنێ کە لەلای حاجی نەورۆز بمێنێنەوە، کاوێساغا رەزامەندی خۆی پیشان دەداو لەگەڵ دەروێش فاتیمە لە ماڵی حاجی نەورۆز دەمێننەوە بەم جۆرە کاوێساغا واز لە ژیانی کۆچەرایەتی دێنێ.

کاوێساغا ئەو ماوەیەی لە رواندز بووە زۆر هات و چۆی دیوەخانەی نوری باویل ئاغای کردووە چونکە نووری باویل ئاغا دۆستی (محمدی حاجی نەورۆز) بووەو یەکتریان زۆر خۆش ویستـووە. بەم شێـوەیـە پەیـوەندیو خۆشەویستی لە نێوان کاوێساغاو نووری باویل ئاغای رواندزی پەیدابووەو دەنـگ و ئاوازی کاری کردۆتـە سەر نووری باویـل ئاغـاو شەوان کۆری دیوەخانی بەلاوکەکانی بۆ جۆش داوە، هەر بۆیەش بە دڵ وگیان یارمەتی کاوێساغای داوە.

کە شەری یەکەمی جیهان دەستی پێکرد عرووسەکانی قەیسەری هێرش بۆ سەر رواندز دەهێنن و ئابلۆقەی دەدەن خەڵکی رواندز تا لە توانایاندا بووە روو بە رووی هێرشی عرووسـەکـانی قەیسـەری راوەستـاون بەڵام.لە دوایی‌دا لە 13ی مانگی مایسی ساڵی 1916 شاری روانـدوز داگیـر دەکـەن و دەیسـووتێنن و ئەوانـەی رزگـاریـان دەبێت شار بەجێ دەهێڵن و دابـەش دەبن بە سەر ئەو ناوچـانـەی لە جەنگ و هێرشی عرووسەکانی قەیسەری دوور بوون.

ماڵی حاجی نەورۆز لەگـەڵ کاویسـاغـاش خۆیو پوورزاکەی دەروێش فاتیمە رواندز بەجێ دەهێڵن و دێنە شەقڵاوە.

میـری عوسمـانی فەرمـان دەردەکـات حاجی نەورۆز دەکاتە (مودیر ناحیە)ی شەقڵاوە. ئەویش کاوێساغا دەکات بە لێپرسراوی ئازووقەی عوسمانی لەگەڵ (حەسەن عەبدول قادری یاریو مجید لوول ئەحمەد) جەندرمەی عوسمانی بە زۆری دانـەوێڵەو کەل وپـەلی پێـویستیـان لە خەڵکی کوردستـان دەستـانـد، ماڵ بە مالیان دەپشکنیو هەر جۆرە دانەوێڵەیەکیان بەرچاو بکەوتایە بە زۆری لێیان دەستاندن و لە (دێرە)ی دیانەکانی شەقلاوەیان ئەمبار دەکرد.

کاوێساغاشیان کردبووە لێپرسراوی ئەمبارەکە.

بەم جۆرە کاوێسـاغـا بوو بە مووچـەیخۆری میـری عوسمانی تا شەری یەکەمی جیهان کۆتایی هات.

کاوێس نەخـوێنـدەوار بوو، بەلام حاجی نەورۆز فێـری کرد کەچۆن لەکاتی وەرگرتنی ئازووقەو کەل وپەلدا ئیمزا بکات.

جەنـدرمـەی عوسمـانی شەوان دەرگـای دێـرەیان لەسەر کاوێس و هاورێیـەکـانی دادەخست نەوەك ئازووقـە بدەنـە هەژارو لێقەوماوان.

کاوێس هەستی بەئـازاری چەوسـاوەکان و بێ دەرتانان و لێقەوماوان دەکرد، لەگەڵ ئازاریان دەژیا، بۆیە رێگایەکی تایبـەتی دۆزیـبـووەوە بۆ یارمـەتیـان، ئەو یارمەتی دانەش بەم جۆرە بوو، هەروەکـو (وەیـردوێ جۆتیـار) کە لەدیـانەکانی شەقلاوەیە ئێستاش لەژیاندا ماوەو گێرایەوەو گوتی:-

«کـە شەو دادەهـات بەنهێنی خۆمـان دەگـەیـانـدە بەر دەرگای دێرە بۆئەوەی کاوێس و هاورێیەکانی ئارد، برنج،

گەنم، جۆ، ساوار، نیسک ،نۆك) مان بدەنێ ئەویش لەکونی دەرگای دیرە کەوە بە هۆی (پشبێندیکەوە) کە سەرێکی بەدەست کاوێسەوە بوو، سەرەکەی ترمان لەناو هەمبانەکەدا دادەنا.

لەکاتێکدا کاوێس ئازووقەی ڕوودەکردە ناو کونی پشبێندەکە تا یەکسەر بچێتە نێوهەمبانەکەوە ،بەم جۆرە لوا ئازووقە لەجەندرمەی عوسمانی وەربگیریتەوە) هەروا وێردۆی جووتیار دەڵێ:-

(زۆرجار من بەم جۆرە ئازووقەم وەرگرتووە)

(پاش کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانیو دەرچوونی عرووسەکانی قەیسەری لەشاری رواندز پەیتا پەیتا خەڵکەکە بەرەو شارە خامۆشەکەیان گەڕانەوە. بەڵام کاوێس و پورزاکەی لەگەڵ حاجی نەورۆز نەگەڕانەوە.

لەپاشا کاوێس و پورزاکەی نیشتەجێ بوون.

کاوێساغاش پاش ئەوەی واز لە مووچەخۆری میری عوسمانی دێنێ دەبێتە دۆست و هاونیشنی (سلێمان بەگی کوڕی باییز بەگی) شەقلاوە، سلێمان بەگێش زۆر خۆشی دەوێت و هەر لەخەڵکی شەقلاوە ژنێکی بۆ دەهێنێ کە ناوی (هەمینەی محمود شریف)ە کە لە 22ی شوباتی 1982 لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کردوە لەگۆرستانی شەقلاوەدا نێژراوە.

خێزانی کاوێس چل و شەش ساڵ پاش کاویساغا ژیاوە، بەڵام دروێش فاتیمە لەگوندی (سپی گرە) شوو دەکات و کوڕێکی دەبێت کەناوی (عەبدول کەریم)ە کە ئێستا لە ژیاندا ماوە لەشەقلاوە نیشتەجێیە. هەروا دەروێش فاتیمە دەنگ و ئاوازێکی زۆر خۆشی هەبووە هەردەم لەپرسەو مەولود خوێندنەوە بەدەف ستایشی ئاینیی گوتووە کۆڕی دانیشتوانانی خستوتە جۆش.

کاوێس هەردەم لەگەڵ سلێمان بەگدا لەدیوەخانەو گەڕان و هات وچۆدا بووەو بۆ سەردانی دەشتی هەریر زۆر جار بەسواری ئەسپ لەگەڵ یەکتردا بەرەو گوندی «سوور سوورە» دەچوون کە کاوێس سواری ئەسپ دەبوو بەرەو دەشتی هەریر دەستی دەکرد بە لاوك گوتن، دۆڵە کپەکانی دەهێنانەوە لەپاشدان بە هەمان شێوە دەگەڕانەوە تا لە ئەسپەکانیان دادەبەزین.

زۆر جار کە سلێمان بەگ دەچووە سەردانی سەرۆك خێل و برا گەورەکان، کاوێس وەك هەڤاڵ و هۆگرێکی گیانیبەگیانی لەگەڵیدا بوو، چونکە سلێمان بەگ سەردەمی لاویی پیاوێکی د..لتەر بوو هەروا شەیدای لاوك و حەیران بوو بەتایبەتی دەنگ و ئاوازی کاویساغا.

کاوێس زۆربەی ژیانی خۆی لە دیوەخانەکانی ئاغاو میرو سەرۆك هۆزەکانی کورد بردۆتە سەر شەوان کۆڕی دیوەخانەکانی بە ئاوازو دەنگ زوڵاڵەکەی گەرم کردوەو جۆشیداوە.

کاوێس بۆ دیدەنی خێڵەکەی لە کوێستان و گەرمیان ناوەناوە سەری لێداون، لەو سەردانانە زۆر جار (ئەحمەدی سمایل بەگی شەقڵاوە)ی لەگەڵ خۆی بردووە چونکە زۆر دۆست و هۆگری کاوێساغا بووە.

جارێکیان کاوێس نیازی سەردانی هەرکیەکانی ناوچەی کۆیە دەکات بەڵام لەم سەردانە پەشیمان دەبێتەوەو بڕیاری سەردانی هەرکیەکانی ناوچەی پیرمام دەدات و دەکەوێتە ڕێ لەگەڵ خوا لێ خۆش بوو ئەحمەدی سمایل بەگ و لە گوندی میر ئاخور و هەرشەم و لەناو زۆمەکانی ناوچەکە میوان دەبێت. محمدی کوری کاوێساغا دەڵێ:-

«باوکم لەو دیدەنیە نەخۆش دەکەوێت بە ئەحمەدی سمایل بەگ دەڵێ:- تۆ بگەڕێوە شەقڵاوە من دەمێنمەوە تاکو چاك دەبمەوە ئەحمەدی سمایل بەگ دەگەڕێتەوە شەقلاوەو کاوێساغای باوکم نەخۆشی یەکەی زیاتر بەسەردا زاڵ دەبێت و گیانی پاکی کپ دەبێ و لە ڕۆژی چوار شەمەی مانگی ڕەشەمێی ساڵی 1936دا تەرمەکەی لە گۆڕستانی (هەرشەم) دەنێژرێت»

هەروەکو باس دەکرێت و دەگێڕنەوە کاوێس پێش مردنی داوای بەفر دەکات، لەو کاتەشدا بەفر دەبارێت و هەندێ بەفری بۆ دێنن کە بیخوات، دوای بەفر خواردن، گیانی

پاکی دەردەچێت -

**- کاوێسی لاڵ -**

کاوێس لە کاتی گفتوگۆدا ووشەکانی زۆر بە زەحمەت بۆ دەهــات ئاخــافتنی پچرپچڕ بە نیـوەچڵی دەبـڕیـوە بە پێچـەوانـەی ئەمـانە هەمو، لە کاتی لاوك و بەستەو حەیران ووتندا زۆر ڕەوان و زمان پاراو بووە، هەرگیز زمانی نەگیراوەو ڕانەوەستاوە.

کاوێس کە مردوە، ڕیشی دان وماش بووەو کابراییەکی بە قەڵافـەت و بەژن درێـژ بـوەوە، چاوی چەپی تانـەییەکی سپیی بچووکی لەسەر بووە، بە زۆری بەرگی خۆشناوەتی پۆشیوە، جار بە جاریش جل و بەرگی هۆزەکەی پۆشیوە کە س شاڵ وشەپکی پیٚ دەگوترێ.

**- هۆی تێگیرانی کاوێس -**

**محەمەدی کوڕی کاوێساغا دەڵێ:-**

**«بـاوکـم دەی گیـرایـەوەو دەیگـوت: لە سەردەمـی** هەرزەکاریمدا زستانێك ماڵمان لە کوردستانی ئێران مایەوەو بەرەو گەرمێن نەهاتین، ڕۆژێك باراشمان نەمابوو، دایکم پێی گوتم تا بچم بۆ ئاش، منیش ئەسپەکەم بارکردو چوومە گوندێکیتر کە ئاشی لێبوو، لەپاش ئەوەی گەنمەکەم لە ئاش کرد (هـاڕی) گەڕامـەوە، لە ڕێگـا خۆم و ئەسپـەکـەم کەوتینە ژێر ڕەنووە بەفرێك ئیتر بێهۆش کەوتم، کە هۆشم هاتەوە سەیرم کرد ئەسپەکەم لە دوور ڕاوەستاوە، منیش لە ڕەنـووە بەفـرەکـە ڕزگـارم بووە، وا دیـاربـوو ڕەنووە بەفرەکە بەتەواوی لوولی نەدابوین، بەرەوماڵ گەڕامەوە، «بەڵام ئەم کارەســاتـە سامنـاکـە بوو بە هۆی لاڵ بوون و تێگیرانم لە کاتی گفتو گۆکردندا».

**- کاویساغای هونەرمەندو بوێژ -**

کاوێسـاغـای بلیمـەت و بەهـرەمـەندی، هونەرمەندێکی بەتـوانـاو هەڵکـەوتـوو و دڵ تەڕ بووە، لاوك و بەستەکانی بە شێـوەی دیـالکتی کرمـانجی ژووروو دای ڕشتـون و خێڵی هەرکی شعیوەی گفتو گۆیان بادینیە.

کاوێس بوێــژ بووەو بە شێـوەو زمـانی میللی فۆلکلۆری گۆرانییـەکـانی ووتـوە، هەرخـۆیو وشـەی جوان و بەپێـزو ڕەوانــی بۆ گۆرانـیـیــەکــانـی، هەڵ بژاردووەو ئاوازی بۆ دانــاون، وەك لاوکی (شێــخ مەحمـودی نەمـر، ملێکـۆ، ئیسماعیل خانی شکاك (سمکۆ) جەوێ، بیلمەز، نارێ، دۆتمام، سەگڤانۆ). . .

کاویسـاغـا هەرچـەنـدە نەخـوێنـدەوار بوو بەڵام کارامەو لێهـاتـوو بووە، توانیـویـەتی بەرێك وپێکی و بە شێوەییەکی وەســتـایـانــە بەســەرهــات و ڕووداو لە بەرگـی داستــانی شیعــریدا بکـات بە لاوك و جۆرەهـا کێشـەی گەلی کورد باس بکـات وەك: ڕامیاری، کۆمـەڵایــەتـی، شەڕوشــۆڕ، سوارچــاکـی، ئازایــەتیو قارەمانیەتی سەرۆك خێل و پیاوماقووڵانی کورد.

گۆرانیــەکــانی کاوێس ڕەنــگ دانــەوەیێکی ژیــانی کۆچـەرایـەتیو کۆمـەڵگـای کوردەواری ئەو سەردەمە بە دیار دەدات لە پاڵ چەوســانــدنــەوەی میللەتی کورد لە لایـەن عەجـەمـەکـان و عوسمـانییەکان کە کاری لەم هونەرمەندە کردووەو هەستی میللیو نەتەوایەتی جولاندووەو جۆشیداوە.

ئەو سترانـانـە نرخێکی یەکجـار زۆری هەیە گەر بێتو لە بنـج وبنـاوانی بکـۆڵینـەوە لاپەرەییەکی شاردراوەی مێژووی گەلی کوردمــان بۆ ڕوون دەبێتـەوە کە مێـژ وونـووسـەکـان دەتــوانن کەڵکی لێوەربگــرن بیکــەنـە سەرمـەشقێـك بۆ نووسینەکانیان، چونکە گۆرانی فۆلکلۆری کوردی بەتایبەتی (لاوك) ڕووداوە مێـژوویـەکـان بە دیـار دەخـات و ژیـانی کۆمــەڵـی کوردەواری لە خوو و ڕەوشت و گۆرانــدا دەست نیشان دەکات.

دەنگ و ئاوازو هەستی ناسك و هونەرو بەهرەی کاوێس لەنــاو سازو ئاوازی کوردیدا مۆرکــێـکــی تایـبــەتیو ڕەســەنــایــەتـێـکی تەواوی کوردی پێــوە دیــارەو خۆی چەسپاندووە، چونکە لە جەرگەی کۆمەڵگای کوردەوارییەوە هەڵ قوڵاوە.

هەر ئەو دەنگ و ئاوازە لە شەقەی باڵ دەدەن و لە چیا

سەرکەشەکانی کوردستان بەرزتر دەبنەوە.

کاوێس گوێ‌یـــەکی مۆسیقـایی‌و شاعیـرانـەی هەبـووەو خاسیەت و (ڕێباز)ی تایبەتی‌و شێوەی کەسایەتی خۆی لەناو هەموو گۆرانی‌بێژانی کورد دیارە.

ئەو لاوك و بەستــەو حەیـرانـانــەی کاویس دایناون و گوتــونیــەتی گۆرانی‌بێـژانی‌تـری کوردیش هەمـان ڕووداو کارەساتەکانی ئەو سەردەمانەیان بە لاوك گوتوە وەك:

(عەزیز ئاغای قەوان، حەمەدمەندۆئاغا، عەلی مەحمود پالانی، سەیدۆی گردەپانەیی، شەریفە شەرویژن) بەڵام ئامـرازو گوتنیـان لەیـەکتری جیاوازە، هەریەکە تام و چێژی خۆی هەیــە، چونکــە هەر هونــەرمــەنــدێ بەدەنگیــدا دەناسرێتەوە، لەم بوارەدا هەر یەکە خاوەن ڕێبازێکی تایبەتین.

- کاوێساغای نێچیروان -

کاوێساغا لە ناوچەی شەقڵاوەدا نێچیروانێکی بەناوبانگ بوو، هەروا تفەنگچیەکی لێهاتوو بووە لە پێکاندنی نیشان و نێچیردا.

کاویس بۆ ڕاوی کێـوی لەگـەڵ دۆست و هەڤـاڵـەکـانی بەتـایبـەتی خواڵێ خۆش بوو (سـەید فەتاح سەید مەحمود) دەچووە چیای سەفین.

لەپاڵ ئەوەش توانایەکی وا قورمێنی هەبووە لە لاسایی کردنەوەی دەنگی نێریە کێوی بەتایبەتی لە وەرزی پاییزاندا کە بەفـرێکی کەم دەبـاری‌و پێی دەڵێن (کـەری نێـریـان) کاوێس لە حەشــارگــەیــەك خۆی حەشـار دەداو لاسـایی دەنگی نێــریــە کێــوی دەکــردەوە، ئیـدی مێیـەی بزنـە کێوی‌یەکان لە حەشارگەکە نزیك دەبوونەوە بەدوای دەنگی کاوێســاغــادا دەهــاتن، ئەویش بە ئاســانی نیشــانــەی لێ‌دەگرتن و دەی‌کوشتن.

عزیز عەبدوللا شەرکانی گێرایەوەو گوتی!

(جـارێکیـان (خـدرئـاغـا)ی کەڵـەکین لەگـەڵ کۆمـەڵە سوارێك لە بلەی ژووری لەلایەن (حاجی شێخ کاکەمین) دەگەڕانەوە، کاوێس لەگەڵ (خدرئاغا)ی کەڵەکین دا دەبێ لە دۆڵی ئالانی‌و چاوی بە بزنە کێوێك دەکەوێ‌و دەڵێ ئاغا تەماشـاکـە!! نیشـانەی لێ‌دەگرێ‌و دەی کوژێ، خدرئاغا تفەنگێکی جامێزارو یەك ڕەختە فیشەکی خەڵات دەکات).

خوا لێ خۆش بووی باوکـم (مـەلاحـەســەن) بۆی گێـڕامـەوەو گوتی: (جـارێکیـان کاوێســاغـا دەچێتـە چیای سەفین بۆ ڕاوی کێـوی لەوێـدا چاوی بە نێـری‌یـە کێوێك دەکـەوێت کە لە، کاتێکـدا خەوتبـوو لێی نـزیـك دەبێتەوە، بەڵام نای کوژێت چونکە لەخەودا بووە، بۆیە لاوکێکی پێ هەڵ دەڵێ کە لاوکی (سـەگڤـانـۆ)یە نێری‌یە کێوی‌یەکە بەو دەنگــە لە خەو ڕادەپــەڕی ڕادەکــات، ئەمیش نیشــانــەی لێ‌دەگرێ‌و دەی کوژێت.

- کاوێس و چایخانەی عەلی فلەییح -

لە هەولێر گەلێك چایخانە هەبوون کە بەناو بانگترینیان ئەمانە بوون:-

چایخانەی (مەچکۆ).

ئەم چایخانانە مەڵبەندی هونەرمەندو گۆرانی‌بێژان بوون.

ئەوەی پەیوەندی بە باسەکەمانەوە هەیە چایخانەی عەلی فلەییحە.

عەلـی فلەییــح لە ساڵـی 1886دا لە شاری هەولێــر لەدایك بووە لە ساڵی 1946دا کۆچی دوایی کردووە.

لە ساڵانی 1920دا ئەو پیاوە چایخانەیێك لەژێر ئوتێلی (فەرەح) دەکاتەوە.

لەپاشا لەوێش دەگوێزێتەوە تەنیشت گەراجی (مووسل) کە ئیستاکە بووەتە کەبابخانەی قەڵات و کەبابخانەی هەولێر.

عەلی فلییح دۆستی هەرە نزیکی کاوێساغای هونەمەندو (سەعید قەساب) و پیرەی زڕ دۆشاو) بووە.

چایخانەی ئەم پیاوە هونەر دۆستە ناوبانگی لەناو شاری هەولێرو دەرەوەدا دەرکردبوو، گەورە پیاوان و ماقولانی شار، هەروا سەرۆك خێڵەکان کە دەهاتنە شار ڕوویان دەکردە ئەو

چایخانەیە هەر ئەو شوێنە مەڵبەندی گۆرانیبێژان بوو، لە هەمـوو لایـەك، لاوك بێـژ و حەیران بێژ دەهاتنە چایخانەکە چونکـە خاوەنی زۆر ڕێـزی لێدەنـان و یارمـەتی دەدان سەرەڕای ئەوەش حەزی لە لاوك و حەیرانی کوردی کردووە بەتایبەتی لاوك و حەیرانەکانی کاوێساغای نەمر.

ئەو چایخانـەیـە باشتـرین ئامـۆژگـاییـەك بوو بۆ ئاوازی بەسـۆزو گۆرانی ڕەسـەنی کوردی، ئەو هونـەرمـەندانەی کە لەوێدا کۆدەبوونەوە، ئەمانە بوون!

(کاویساغا، علی مەحمود پالانی، عزیز ئاغا قەوان، حەمەد مەندو ئاغا، سەیدۆی گردەپانەیی، شەریفە شەرۆی ژ ن) ئەو هونەرمەندانە دەیان کردە (گەرە لاوژە) لەو ناوەدا.

عەلی فلەییحیش دەستـەسـرێکی بۆ ڕادەخست ئنجـا سەرۆك خێـڵ و ئاغـاو پیـاوە ماقـوولانی شارو خەڵکی تـری هەولێـرو دەورو بەری کە ئامـادە دەبـوون و حەزیـان لە گۆرانیو ئاوازی ڕەسەنی کوردی دەکرد، پەیتا ـ پەیتا پارەو پولیان دەخستە سەر دەستە سرەکە لەپاشدان عەلی پارەکەی دابەش دەکردە سەر ئەو گۆرانی بێژانەی کە ئامادەی گەرە لاوژەکە دەبوون.

گەلێ جاریش دانیشتوانی چایخانەکە پاداشتی تایبەتیان دەدا بەو گۆرانـیبێـژەی کە دەنـگە و ئاوازەکـەی هەستی دەجولاندن و کاری لێدەکردن و لەگەڵ گیانیان تێکەڵ دەبوون.

بۆ ئەرشیفیش دەڵێین ئەو چایخانەیە تا ساڵی 1940 لە برەودا بووە.

**کاویساغاو تۆمارکردنی گۆرانییەکانی ـ**

لە ساڵـی 1930دا کاوێس ئارەزووی تۆمـارکـردنـی گۆرانییـەکـانی دەکـات، لەبـەر ئەو لەلایـەن دۆست و هەڤـاڵـەکـانـی باسـی چوونـە بەغـدا دەکـات تا لە کۆمپانیاکان بەرهەمەکانی خۆی تۆمار بکات، بەڵام هاوڕێکـانی وەك عەلی فلەییـح و سەعیـد قەساب و پیرەی زر دۆشاوی لە جیاتی هان دانی، پێی دەڵێن کە نەچێت بۆ بەغـدا چونکـە لە گفتـوەکـۆکردندا سەرناکەوێ لەبەر لالیو تێگیـران، بەڵام ئەم بڕیـار دەداو بەرەو بەغـدا دەچێت، لەوێدا ڕوو دەکاتە کۆمپانیایەك، کەچی لەچاو پێکەوتن و گفتـو گۆدا سەرنـاکـەوێت و پێی دەڵێن تۆ لالی دەنگت بە کەڵکی تۆمـارکـردن نایـەت ئەویش بە دڵێکی شکـاوەوە لە کۆمپـانیـایـەکـە دەردەچێت و لە چایخـانـەیـەك نزیـك کۆمپـانیـایـەکـە دادەنیشێت و دەست دەباتە بناگوێی لاوکی (گـەنـج خەلیـل) دەڵێ هەروەك کەوی قەد پاڵ شاخـەکـان دەنگە زوڵاڵەکەی بەرز دەکاتەوە، ئەو ناوە دێنێتە گڕ، خەڵك لێی کۆدەبنەوەو لە کۆمپانیایەکە گوێیان لە دەنگە بە سۆزەکەی دەبێت و دێن بۆ لایو داوای لێبوردنی لێدەکەن لەگەڵ خۆیـانـدا دووبـارە دەیبـەنەوە کۆمپانیایەکەو یەکەم قەوانی بۆ تۆمـار دەکـەن کە لاوکی (گـەنـج خەلیـل) بووە هەر لەو قەوانەشدا دەڵێ: (لە چاوی عەلی فلەیح)!!!

لە کومپانیایەکە پارەیەکی باشی دەدەنیو یەك (عەبای بە کورك)ی خەڵات دەکەن.

بەم جۆرە کاوێس دەست دەکات بە تۆمارکردنی لاوك و حەیران و بەستە لە کۆمپانیایەکاندا.

کاوێس لەم کۆمپانیانەدا گۆرانییەکانی خۆی تۆمار کردووە.

1 ـ کۆمپانیای (نەعیم) بۆ تۆمارکردن.

2 ـ کۆمپانیای (نایف) بۆ تۆمارکردن.

3 ـ کۆمپانیای (بیزافۆن) بۆ تومارکردن.

لە کاتی تۆمارکردنی قەوان (ئەسکەندەر ساز) سازی بۆ لێداوە.

**ـ گەشتەکانی کاوێساغا ـ**

**1 ـ سلێمانی!**

ـــــــــــ کاوێس زۆر جار چووەتـە دیـدەنی شێخ مەحمـوودی نەمـر لە سلێمـانیو لە گونـدی داریکـەلی. لەوێنـدەر بە دەنگـە زوڵاڵـەکـەی لاوکی بۆ شێـخ مەحمود گوتوە، ڕاوی لەگەڵ کردووە، کاوێس زۆر بەرێك و پێکی باسی شۆڕشی گەلی کورد دەکـات لەژێـر فەرمـانـدەی ئەو شێخـە نەمـرە، دژی ئیمپـریـالیـزمی ئینگلیـزی وەك دیـارە

ئاگادارێیکی تەواویشی هەبووە لەو شۆڕشە مەزنە، هەروەکو جەنگــاوەرێـك کە لەنـاو جەنگـەکـەدا جەنگــابێت، باسی شۆڕشەکەو باسی هاوپەیمانەکان دەکات، سەرباری باسی پاشگـەزبـوونـەوەی سوێنـدخـۆرەکـانیش ڕوون دەکـاتەوە، بەمەش ئاشکرا دەبێ کاوێساغا کە شارەزاییکی تەواوی لە شۆڕشەکەدا هەبووە.

شێخی نەمـر کاوێسی زۆر خۆش ویستـوە ڕێـزی لێناوەو خەلاتـی کردووە، لەو خەلاتـانــەی کە شێــخ مەحمــوود پێش کەشی کاوێســاغـای کردووە ئەسپێکی کحێلی چاك و تفـەنگێکی جامبێـزارو لەگـەڵ دوو ڕەختـە فیشـەك و (40) لیرەی زێڕ.

2 ـ **کوردستانی ئیران:**

کاوێساغا زۆر جار بۆ دیدەنی ئیسماعیـل خانی شکاك چووەتە کوردستانی ئیران، لەوێ لاوکی بۆ سمکۆ گوتووەو ئەویش خۆشی ویستووەو ڕێزی لێناوەو خەلاتی کردووە، لە کاتـی هاتنی ئیسمــاعیــل خانی شکــاك بۆ لای میــرانی (قــادربــەگ) لە شەقـلاوە کاوێس پێشـوازیی لێ کردووەو لەگــەڵی هاتــووەتـە ناوچـەی (دێـرێ) بۆ دیـدەنی سەرۆك خێڵەکــانی هەرکیو گەردی ئینجـا لەگـەڵ سمـایـل خانی شکاك چووەتە دیدەنی شێخ مەحموودی نەمر لە سلێمانی.

بە لاوك کاوێس باســی دەکــات کە چۆن عەجــەمــە ڕەگەزپەرستەکان بە پیلانێکی چەپەڵ ئەم قارەمانەیان لەناو برد.

جگــە لەوە کاوێس زۆر جار لەگـەڵ (حـەمـەدی کاکـە عەودی) کە خەڵکی شەقلاوە بوو دەچوونە کوردستانی ئێران بۆ کڕیـنـی (شــەدە، پۆشی، دەسمــاڵ، خەنــە، شاڵ، خامـەك، خارا، پەستـەك) لەپـاش کڕینیـان دەیـان هێنـایە شەقلاوەو دەیان فرۆشت.

3 ـ **ناوچەی بیتوێن:**

کاوێس زۆر جار چووەتە سەنگەسەرو قەلادزێو ڕانیە بۆ سەردانی سەرۆك خێڵەکـان، لەشـەوانـدا دیـوەخـانـەکـانی بەسۆزو ئاوازە دڵڕفێنەکەی جۆش داوە.

بەکر ئەیوب دەگێڕێتەوە دەڵێ:

لە ساڵی 1935دا ماڵمان لە ڕانیە بوو گوتیان کاوێس هاتـووە بۆ ڕانیـەو لە چایخـانـەی (عـەلی شکاك)ە خەڵکی ڕانیە پیاو، ژن، کوڕوکچ ڕوویان کردبووە ئەو جێگەیە تا کاوێس ببینن و گوێیــان لە دەنــگ و ئاوازە بە سۆزەکــەی بێت، منیش وەك ئەو خەڵکـە چووم بۆ چایخـانـەکەو گوێم ڕاگرت لە گۆرانیەکانی کاوێس دوو شەوو دوو ڕۆژ خەڵکی ڕانیـە لەگـەڵ ئەو گۆرانیبێـژە هونـەرمـەنـدە بردیـانە سەر، لەپاشدان بووە مێوانی قایمقامی ڕانیە کە ئەو ساکە جەلال سائیب بوو، لە ماڵی قایمقام سەرۆك خێل و پیاوەماقوڵانی شار کۆدەبــوونـەوەو کاوێسـاغـاش خۆشتـرین ئاهـەنگی بۆ دەگێڕان ئیتر بۆ بەیانی نیشانەیان دادەنا هەرچی تفەنگ چی هەبوو دەهات بۆ شکاندنی ئارمانجەکە، ئەوەی سەیرو جێی سەرنـج ڕاکێشـان بوو، دەیـان گووت کاوێس ئارمانجەکەی شکــانـد، لەدوایـیـدا کاوێس لەلایـەن گەورە پیـاوەکـانـەوە خەلات کرا.

لە یەکێـك لە سەردانـەکـانی کاوێس بۆ ناوچـەی بیتوێن (حەمەد مەندۆ ئاغای گۆرانیبێژی لەگەڵدا بووە.

4 ـ **کوردستانی تورکیا!**

کاوێس گەلێك جار چووەتە کوردستانی تورکیا بۆ کڕینی کەل وپـەلی پێـویستی سەرۆك خێـڵ و ئاغـاو میـرەکان، لە دیــدەنیێــك لە کوردستــانی تورکیـا چاوی بە (ئـەحمـەد مەدحـەت) ئەفـەندی دەکەوێو پارەییەکی زۆری پێدەبێ، جەنـدرمـەی عوسمـانی کە پێی دەزانن دەیگرن و پارەکەی لێدەستێنن و بەندی دەکەن.

5 ـ **ناوچەی بادینان:**

کاویس زۆر جار سەری لە ناوچــەی بادیــنــان داوە بەتــایبــەتی چووەتـە گونـدی (جـوجـەرە) چونکـە دۆستی (محـەمـەد جوجەری) لاوك بێژ بووە، سەرەڕای ئەوەش زۆر هۆگرو هەڤاڵی (حەسۆو حەمۆی) لاوك بێژ بووە، کە هەر دووکیان لە دانانی لاوك و هۆنراوە بەهرەمەندو بلیمەت بوون ،تاکو ئیستاش ناوبانگیان لە ناوچەی گۆران و لەناو خێڵی

هەرکیو زراریو شێخ بزینی هەر ماوە، ئەو دوو هونەرمەندە (واتا حەسۆ و حەمۆ) خەڵکی جزیرەی (بۆتان) لەپاش تێکچونی فەرمانڕەوایی بۆتان ئاوارەی ناوچەی گۆران بوون و لە گوندی (کەویلان)نیشتە جێ بوون.

ئەو دوو هونەرمەندە دەورێکی باڵایان هەبووە لە بلاوکردنەوەی لاوك لە ناوچەی هەولێر.

حەسۆو حەمۆ زۆر هاتوچۆی گوندی (کەورگۆسکیان) کردووە کە مەڵبەندی لاوك گوتن بووە، لە هونراوە بەناوبانگەکانی حەسۆ و حەمۆ:ـ

1 ـ هۆنراوەی (مەئموور و کەرێ)

2 ـ هۆنراوەی (چاڵە گەنم)

3 ـ هۆنراوەی (شێوێ ماشێ) تەمەرێ مەلکۆ شانی).

**5 ـ کۆیێ:**

ــــــــــــ مامۆستا سەیفەدین سەعدی ئاغا دەڵێ (باوکم گێرایەوەو گوتی:ـ

گەلێ جار کاوێس هاتوەتە کۆیێو بە دەنگە زوڵاڵاکەی کۆڕی ئێمەی بە ئاوازە خۆشەکانی جۆش داوە) هەروا سەعدی ئاغا گوتویەتی کە (زۆر جار چووەتە شەقڵاوە تاکو کاوێس لەگەڵ خۆیا بێنێتە کۆیێ تا لاوك و جەبرانیان بۆ بلێو چەند ڕۆژێ لەم شارە خۆشەویستە ماوەتەوە،

هەروا مامۆستا (باقی دروێش قادر)ی کۆیی دەڵێ:ـ

باپیرم (سۆفی خدر) گێڕایەوە گوتی: کاوێساغا گەلێ جار بۆ دیدەنی من لە دەشتی کۆیە هاتووەتە گوندی (پێبازۆك) چونکە برادەرێکی خۆشەویستی من بوو، بەتایبەتی لە ساڵی (1927) بە بۆنەی لەدایك بوونی دروێش قادری کوڕم کاوێس هاتە پێبازوك، شەو بە دەنگە خۆشە ئەفسوناویەکەی ئاسماتی پێبازۆکی هێنابووە لەرزین، هەروا بەیەکەوە راومان کردوەو نیشانەمان شکاندوە.

**ـ نەوەکانی کاوێساغا ـ**

کاوێس چوار کوڕی لەپاش بەجێ ماوە کە ئەمانن:ـ

**1 ـ ئەحمەد کاوێس: خانەنشینەو لە هەولێر نیشتە جێ بووە.**

**2 ـ محەمەد کاوێس: خانە نشینەو لە شەقڵاوە نیشتە جێیە.**

**3 ـ عەبدوڵلا کاوێس: خانەنشینەو لە هەولێر نیشتە جێیە.**

**4 ـ جەمیل کاوێس: کاسبەو لە شەقڵاوە نیشتە جێیە.**

**بەرهەمەکانی کاوێس ئاغای نەمر**

**1 ـ لاوك:ـ**

---

1 ـ دەهەرێ

2 ـ دەخالۆ

3 خێلیدۆ

4 ـ عەرەبێ

5 دۆتمام

6 ـ بیلمەز

7 ـ لاوکۆ

8 ـ لاوکۆ بەکەلێ کاش خانێ سەرکەتم

9 ـ میر پەنجۆ

10 ـ بابێ عەبدول کەریم

11 ـ یارێ

12 دەلال

13 ـ شێخ مەحمودی نەمر

14 ـ بەلێ هەی لۆلۆ

15 ـ بەلێ دیلبەر

16 ـ لۆلۆ سوارۆ

17 ـ سەودالی

18 ـ ئەسمەر

19 ـ ئەی لێ زالمێ

20 ـ بێریوانێ

21 ـ یار گوندۆ

22 ـ نەزانێ

23 ـ لاوکێ سموقی

24 ـ لێلێ پەیانۆ

25 ـ ئیسماعیل خانی شکاك
26 ـ گەنج خەلیل
27 ـ میوانۆ
28 ـ فەیزۆ
29 ـ کۆچەرێ
30 ـ جەوێ
31 ـ گەورێ
32 ـ مەلیکۆ
33 ـ سەگڤانۆ
34 ـ حەسەنێ والیکی
35 ـ شەرێ تورك و یۆنان
36 ـ عبدول مجید لەسەرێ مەیدانێ
37 ـ غەزالم
38 ـ ئەو شەو شەوە

2 ـ بەستە:ـ

1 ـ مامر مامر
2 ـ کاروانە
3 ـ نارێ
4 ـ هەی دۆت
5 ـ گۆزەلێ
6 لۆرکە

3 ـ حەیران:ـ

1 ـ ئەمن دەرێم سەردەمەکی راوچی بوم.
2 ـ نادری بە من نادری
3 ـ حەیران لە دۆرێ لە دۆرێ خۆشاوێ.

سەرچاوەکان


1 ـ گۆڤاری هیوا ژمارە 12 حوزیرانی 1958 ل77. جمال بابان.
2 ـ رۆشنبیری نوێ ژمارە ـ 32 1974/10/1 ل8 محمد توفیق ووردی.
3 ـ کردستان خلال الحرب العلمیة الاولی. د.کمال مظهر
4 ـ بیری نوێ ژمارە 310 ـ 1978/10/7
5 ـ حاج محمود پەرێ هەرکی تەمن 90 ساڵ لە ناوچەی کەلەك جێ‌نشینە.
6 ـ مجیدئاغا کوڕی قورشید ئاغای هەرکی
7 ـ مجید نعمت خان هەرکی
8 ـ سلیمان بەگ کوڕی بایز بەگی شەقلاوە
9 ـ عزیزخان کوڕی فەتاح ئاغای هەرکی
10 ـ حاج نازی فاضل نعمت خان هەرکی
11 ـ مامۆستا بەگوك عزیز
12 ـ ملاحسن صالح خۆشناو
13 ـ باپیر ئەفندی (عرووس)
14 أحمد کاوێس ئاغا
15 ـ محمد کاوێس ئاغا
16 ـ وێردۆی جۆتیار
17 ـ محمد مولود (مەم)
18 ـ محمد علی فلەییح
19 ـ انور محمد نەورۆز رواندوزی
20 ـ مظهر محمد نەورۆز رواندوزی
21 ـ حسین سلیم خان رواندوزی
22 ـ سیف الدین سعدی ئاغا کۆیی
23 ـ باقی دروێش قادر کۆیی
24 ـ بکر أیوب قاسم

25 ـ سوپاسێکی گەرمی هاورێم کاك محمود زامدار دەکەم بۆ یارمەتیدانە تایبەتیەکەی.
سەرنج

سەرلەبەری لاوك و بەستەو حەیرانەکانی کاوێساغام کۆکردۆتەوەو ئامادەی چاپن.

## هونەری تەشکیلی

# گۆیای مەزن

● وەهبی رسول
ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان ـ بغداد ـ



△ عائلة الملك شارل الرابع ـ تفصيل / خێزانی شارلی چوارەم

له ئەراگـۆن له خاکی جادوگـەرو فاڵگـرەوەکاندا منالێك لەدایك بوو، دایك و باوکی ناویان نا «فرانسیسکو» لەسەر رێو شوێنی ئیسپـانیـەکـان بەنـاوی دایـك و باوکی‌یەوە ناو نووس کرا، له 30 ئازاری ساڵی 1746دا لەنزیك شاری (سـرقسطـه)وە هەر لەوێدا فێـری جوتیـاری‌و، خوێنـدن و نووسـیـن و پەروەردەی ئایـنـی بوو، کاتـێ که له لادێ بوو لەسـەر تاشـه بەردەکـان وێنەی بەهۆی چڵەداری سووتاوەوە ئەکێشـا بەمـە سەرنجی خەڵکی دێکـەی بە جۆرێ راکێشا هێشتـا تەمـەنی دوانـزە ساڵ بوو، که نەخشـانـدنی پەردەی بەردەم قوربانگەی کەنیسـەی پێ سپێردرا.

پاش دوو ساڵ فەرمـان رەوای «ئـەراگـۆن» له ئەنجـامی سەرنج راکێشانی ئەم پەردەیەوە ناردیە شاری «سرقسطه» بۆ خوێنـــدن لەســـەر دەستی «لـــۆزان مارتیتـر» بۆ ماوەی چوار ساڵ، نازی «لۆزان مارتیتر» لەوانە بوو لە بیربچێتەوە ئەگەر مامۆستای گۆیا نەبوایە.

کاتێکیش کە قوتابی بوو یەکەم کاری هونەری بۆ ڕژێم کرد ئەویش بەهـۆی دڵ گەرمـی یەوە بوو بۆ ئایـن، هەر بەهۆی ناکۆکی ئاینی‌یەوە لە تەمەنی 17 ساڵیدا چووە مەدرید.

لەوێ وەکـو یەکێ لە نووسـەرەکـان باسی ئەکـا [لـە منـاڵێکی خەمبـارەوە بوو بە گەنجێکی لەش پتـەو کە بە چاوێکی نەترسەوە سەیری جیهان بکاو بەهرەیەکی ناوازەو شەخسیەتێکی سەرنج ڕاکێشی ببێت.

لەوێ ویستی ببێت بە قوتـابی لە ئەکـادیمیـای «سـان

فرنـانـد» کە باشتـرین پەیمانگەی هونەری بوو لە ئیسپانیای ئەو کاتـەدا، ئەو ساڵـە سەرکـەوتنی بەدەست نەهێنـا، پاش سێ ساڵ دوبـارە «گـۆیـا» پێشکـەشی کردەوە بە هەمـان شوێن، هەرچـەنـدە ئەم جارەش ناوی دەرنـەچـوو بەڵام سوودی لەم هەوڵـدانـەی وەرگـرت چونکـە پەیـوەندی‌یەکی باشی پەیداکرد لەگەڵ پیاوێکی زۆر گرنگدا کە «فرنسیسکو بایوسونیس» بوو کە هونەرمەندێکی بەناوبانگی کۆشکی شا بوو.

گۆیـا دەستی کردە خوێنـدنی هونـەر لە ستـودیـوی ئەم هونـەرمـەنـدەدا، هەر بەهۆی ئەمیشەوە کەوتە ژێر چاودێری یەکـەم هونـەرمـەنـدی کۆشـك «مینجـز»ەوە، ئەو سەردەمـە «گۆیا» زۆربەی کاتی خۆی بە کۆپی کردنی تابلۆکانی ناو کۆشك ئەبردە سەر، هەر لەوێ چاوی کەوت بە تابلۆکانی «بۆش و برۆگڵ و تیتیان و ڤیرنووهی»لای گۆیا هونەرمەندی ئیسپانی بەناوبانگە «ڤلاسکیوز» نموونەیی بوو.

هەمـوو ڕەخنـەگـرە هونـەری‌یـەکـان لەو بڕوایـەدان کە «ڤـلاسکیـوزو گۆیـا] بە مەزنتـرین هونـەرمـەنـدی ئیسپـانیا دەژمێـردرێن، بەڵام ئەوەی گۆیـا جیـا ئەکـاتەوە لەو زۆری و



△ دوق ودوقة اوسون تابلۆی [illegible]

هەمـە چەشتـەیی بەرهـەمـەکـانێتی هەر لەو ماوەیـەدا توانی شارەزایی لە هونەری ئیتالیدا پەیدا بکاو لە **پێش بڕکێیەکی** هونەری لە ئەکادیمیایەکی ڕۆما پلەی **دوهەمی بەدەست** بهێنێ.

دوای ئەمە گۆیا گەڕایەوە ئسپانیا بۆ شاری **سرقسطە کە** بۆ یەکەم جار ئەرکێکی میری تیا وەرگرت **ئەویش برِیتی بوو** لە ڕازاندنەوەی دیوارەکانی کەنیسەکەی شار، **نزیکەی سێ**

سالّی بەم ئیشەوە بردە سەر کاریکی جوان و مەزن بوو بەلاّم لە لایەن سوپای فەرەنسی‌یەوە لە کاتی داگیرکردنی ئیسپانیادا لە ناو برا.

لە هەمان کاتدا تابلۆ گەورەکەی «خێزانی پیرۆز»ی دروست کرد لەم تابلۆیەدا ئەوی «گۆیا» جیا ئەکاتەوە لە هونەرمەندانی هاوچەرخی خۆی ئەوەیە «گۆیا» مریەمی وەکو ژنێکی ئاسایی خۆبەخت کەرو دایکێکی خۆشەویست دروست کردووە.

لە سالّی 1773دا گۆیا بوو بە هاوسەری (جۆزفین بایو) خوشکی مامۆستاکەی پێشووی «فرانسیسکوبایو» لە شەقامێکی مەدریدا جێنشین بوون، گۆیا لەم سەردەمی گەنجییەیدا زۆر سەرنجی ئافرەتی را ئەکێشاو زۆربەی ئافرەتانی کۆشکی شا لە ئاهەنگەکاندا حەزیان بە هاوڕێیەتی دەکرد، ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی کە ژنەکەی دلّنیا نەبێ لە کردەوەکانی بەلاّم خۆی لەسەر ئەوە راهێنا بوو کە رەفتاری هونەرمەندان ناشێ بخرێتە ژێر هیچ جۆرە پێوەرێکی ئاسایی‌وە.

* ژنەکەی گۆیا لە تەمەنی 70 سالّیدا مردو کە لێنێکی گەورەی خستە ژیانی گۆیاوە، لەم ژنەی لە 20 منالّ تەنها کورێکی بۆ مایەوە بە ناوی «جاڤیر»ەوە.

هەر لە سالّی (1773)دا مینجزی هونەر مەندی کۆشك داوای لە گۆیا کرد کە لە کارگەی فەرش و حەسیری شاهانەدا ئیش بکات، ئەو کاتە لەسەر فەرش و حەسیرەکان وێنەی پەری داستانە ئەفسانەیی‌یە کۆنەکانیان ئەکێشا لەسەر شێوازی باوی فەرەنسی لەسەر ڕێو شوێنی هونەری «رۆبنز» بە هێلّی پێچاوپێچ دروست ئەکرا، بەلاّم گۆیا لەم شێوازە یاخی بوو ڕووی کردە دروست کردنی هەندێ دیمەنی ژیانی ئیسپانی ئەو کاتە بە شێوازێکی داهێنەرانەی دلّ رفێن، ئەم کارە هونەریانەی کە لە داهێنانی خۆی بوو پلەو پایەیەکی هونەریی مەزنی بە گۆیا بەخشی.

لەم ماوەیەدا گۆیا داخوازی پێشکەش کرد کە ببێ بەوێنەکێشی کۆشك بەلاّم داواکەی ڕەت کرایەوە.

بەلاّم ئەوەی ئەم شکستی‌یەی لە بیربردەوە ئەوە بوو کە بە ئەندامی ئەکادیمیای شاهانەی (سان فرناند) هەلّبژێردراو دوا جار کرا بە جێگری بەڕێوەبەری ئەکادیمیەکە، پاش سالّێك شارلی سێیەم مردو براکەی کە هاوڕێی گۆیا بوو هاتە سەر تەخت و گۆیای کرد بە وێنەکێشی کۆشکی شا.

زۆربەی هونەرمەندە ئیسپانی‌یەکان بایەخیان بە بابەتی ئاینی دەدا بەلاّم مەزنی گۆیا لەو ڕاستی یەدایە کە وێنە کێشێکی ئاینی بوو، چێژو خۆشی لەوەدا بەدی ئەهێنا، کە ڕوو داوی ڕۆژانە وەکو خۆی تۆمار بکات دەمو چاوەکانی چۆن ببینیایەو تێبگەیشتایە وەها دروستی ئەکردن لەوانەیە لەبەر ئەم هۆیە بوویێ کە دانراوە بە یەکەم کەسێك کە شێوازی واقعی هێناوەتە کایەوە کە لە پاش قوتابخانەی ڕۆمانسیەت لە ئەورووپادا دامەزرا.

گۆیا دەستی کرد بە وێنەکێشانی ژیان و پیاوانی کۆشك، لە وانەی سەرسام بوون بە گۆیا (دیوك ئۆسۆن و ژنەکەی) بوون کە وێنەی خۆی‌و خێزانەکەی کێشاو خانووەکەی لادێیانی بۆ ڕازاندنەوە بە چەند تابلۆیەکی نایاب کە تا ئێستاش لە مۆزەخانەی مەدریددا ماونەتەوە.

هەر چەندە گۆیا چەند پۆرترێتێکی دروست کرد بۆ خێزانی «ئۆسۆن» کە بەناو بانگترینیان «دیوك ئۆسۆن و خێزانەکەیەتی» بەلاّم ئەمە لە ئیشەگرنگەکانی نەبوو، گۆیا ئەلّێت: خۆم بە وێنەکێشی پۆرترێت نەزانیوە هەتا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم واتە لە کاتێکدا تەمەنی لە (50) تێپەڕیوە، هەر لەم ماوەیەدا پەیوەندی پەیدا کرد لەگەلّ ژنی (دیوك ئەلبا) کە ژنێکی جوان و ناسك بوو، زوو زوو سەری لە گۆیا ئەدا لە ستودیوەکەی ئەمیش چەند تابلۆیەکی بۆ کێشا گرنگترینیان ئەو تابلۆیە بوو کە بە جلی بەیانیانەوەیەو دوو موستیلە لە پەنجە یایەتی، لەبەر پێ شیا لەسەر زەوی‌یەکە وەك نوسینی سەر لم نووسراوە «تەنها گۆیا» ژنەکەش پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە.

گۆیا ناسراوە بەوەی کە حەز بە کێشانی وێنەی ڕووتی ئافرەت ناکات بەڵام دوو تابلۆی ناوداری «ماجای ڕووت و ماجـا بە بەرگی تەنکـەوە»ی هەیـە ئەوکـاتە ئەم دوو تابلۆیە شتێکی ناپەسەند بوو بە لای گەورە پیاوانی کەنیسەوە بەڵام ئەمڕۆ لە ئامێزی مۆزە خانەی ئەلپرادۆیان لەسەر پولی پۆستە بە پشتی نامەوە ئەم سەرو ئەو سەری جیهان ئەکات، ئەم دوو تابلۆیە تەواو ترین کاری گۆیا یە لە ڕووی هونەریەو دەربـڕینـەوە، ئەڵێن وێنـە کێشـانی ئەم تابلۆیە لە ئەنجامی خۆشـەویستی ئەلبـا بووە، وا دەر ئەکـەوێ کە بە کۆتـایی هاتنی پەیـوەنـدی نێـوانیـان بەهـۆی مردنی ئەلباوە کۆتایش هات بە قۆناغی ڕۆمانسی گۆیا.

لە ساڵی 1795دا گۆیا کرا بە بەڕێوەبەری وێنە کێشان لە ئەکـادیمیـا بەڵام پاش دوو ساڵ بەهـۆی تێکچـوونی تەندروستی یەوە وازی هێنا، هەر پاش چوار سالیش کرا بە وێنـە کێشی یەکـەمی کۆشـك کە بەرزتـرین پلەیـەکـە هونەرمەندی ئەو کاتەی ئیسپانیای گەیشتۆتێ، گۆیا ئەم ڕێز لێنانەی زۆر پێ‌خۆش بوو.

گۆیـا لە ترۆپکی سەرکـەوتنی هونـەری‌دابوو کە تووشی نەخـۆشی‌یـەکی کتـوپـڕی ترسنـاك بوو بە تەواوی نەخۆشی یەکەی نەزانرا، چەند مانگێك ئیفلیجی ناو جێگا بوو، کەڕ بوو کوێـریش هەڕەشـەی لێ ئەکـرد پاش ئەوەی کە چاك بۆوە، بەهـۆی کەڕی‌یـەکـەیـەوە لە خەڵـك دورە پەرێـز بوو چونکـە توانـای دوانـدنـی نەمـا بوو، مێـشکی تووشی بیروباوەڕی ڕەش و مۆتەکە بوو بوو هۆشی ووریا بوو بەڵام بێ‌هێزو توانا بوو نەی‌دەتوانی لەبەر دەم تابلۆکانیدا بوەستێ.

بۆیـە زۆربـەی کاتـەکـانی بە ئیشی گرافیك لەسەر مس ئەبـردە سەر کە بەرهـەمی ئەمـەش کۆمـەڵـە بەناوبانگەکەی «کاپریکۆس»ە کە تیایا ئەندیشەی میللی هونەرێکی ڕەسەنی تیـا بەکـار هێنـابـوو، ئەمـە یەکەم بزکێشی کردنێکی بوو لە ڕەخنـەی ڕامیـاریو کۆمـەڵایـەتی و ئاینی‌دا، بوونـە هۆی ناوبانگێکی فراوان بۆی. هەروەکو توانی زاڵ ببێت بەسەر ئەم جۆرە هونـەرەدا کە بە پێشـەنگی هەڵکـەنـدن لەسـەر کانـزاکـان دا ئەنـرێت کە هەر دانـەیـەك لەو (80) دانـەیـە بەنرخی یەك ئۆنس ئاڵتون فرۆشرا.

بابـەتـەکـانی ئەم کۆمـەڵـەیە پەیوەندی‌یەکی ڕاستەوخۆی هەبوو بەو تاقی‌کردنەوانەی کە گۆیا لەم دوایەدا پێیدا تێپەری بوو، لەم تابلۆیـانـە «کـاتێ هۆش چاو لێـك ئەنێ خێوەکان دەر ئەکـەون»، «بـەچی ئەمـرێت» لێرەدا گۆیا ویستوویەتی گاڵتـە بە پزیشکـەکـان بکات لە ئەنجامی نائومێدی‌یەوە کە بینی لێ‌یان لەکاتی نەخۆشی‌یەکەیدا بۆیە وەکو گوێ درێژ پزیشکەکانی دروست کردووە. ئەم کۆمەڵە تابلۆیە لە بازاڕ کێشرانەوە لەبەر ئەوەی گاڵتە کردنێك بوو بە ڕژێم و نەریتی ئەوکاتە.

لە ساڵی (1789)دا شارلی چوارەم هاتە سەر تەخت، گۆیا کۆمەڵێك تابلۆی بۆ ئەم خێزانە دروست کرد، کە بە ناوبـانگتـرینیـان تابلۆی خێـزانی (شـارلی چوارەم)ە لەم تابلۆیـەدا وێنـە شارلی کێشـاوە بە پیـاوێکی نەرم و نیـان بەدەم و چاوێکی پەمـەیی‌یـەوە لە هەمـان کاتـدا لە شێـوەی پیـاوێکی گێـل دا، شاژنی دروست کردووە بە ڕوویـەکی فێـڵ بازو مەکـربـازەوەو دەمـوچـاوی کوڕە گەورەکـەی بە دەموچاوی (جودی) دڵداری دروست کردووە.

لە ساڵی (1808)دا فەرەنسی‌یـەکـان ئیسپـانیـایـان داگیـرکـردو کوشتـار دەستی پێ‌کرد «گۆیا» کۆمەڵی دووەمی دروست کرد بەناو نیشانی «کارەساتەکانی جەنگ» لە هەمان ساڵـدا کوشتـارێکی زۆر ڕوویدا لەنێـوان شۆڕ شگێڕەکانی ئیسپـانیـاو لەشکـری فەرەنسا کە بوونە سەرچاوەی دوو تابلۆ مێژ ووی‌یەکەی گۆیا بە ناونیشانی(( (2) مایس 1808 ))وە (3 مایس 1808 ) کە تا ئێستـاش سەرنـجی هەزارەهـا بینـەران ڕائـەکێشێ، یەکـەمیـان لەوشـەڕە ئەدوێ کە لە مەیـدانی مەدریـدا ڕوویداو دووەمیـان بەرجـەستەی گوللە باران کردنی کۆمەڵێك لە شۆڕشگێڕانە کە گۆیا لەم تابلۆیەدا

زۆر بە ووردی ئەو چرکەیەی پێشان ـ داوە کە چەکدارە فەرەنسی یەکان گوللەکانیان ئاراستەی سنگی شۆڕشگێڕەکان ئەکەن، کە پڕە لە ترسی تێکەڵ بەسەر شۆڕنەکردن، گۆیا بە هەر یەکێ لەم ڕووانە دەربڕینێکی سایکۆلۆژی واقعی داونەتێ کە سروشتی هەڵوێستەکە هێناویەتە کایەوە. هەر ئەم تابلۆیە بوو کە کارێکی گەورەو دیاری کردە سەر هونەرمەندانی وەکو: دیلاکرواو مانێت و پیکاسۆ کە تابلۆکانی «کوشتارگەی سیسو»، گوللە باران کردنی مەکسیمیلیان»و «گوللە بارانکردن» دروست بکەن.

گۆیا هەر لەم ماوەی داگیرکردنەی فەرەنسیەکاندا هەست بە دروست کردنی تابلۆکانی «زەبەلاح (عملاق)» و «لە پەیامی مەدریدەوە»و چەندە های تر کە پیان ئەوترێ تابلۆ ڕەشەکان کە ڕەمزبوون بۆ ژیانی ئەو قۆناغەی ئیسپانیا گۆیا لەسەر داخوازی جەنەراڵێکی ئیسپانی چوو بۆ شاری سرقسطە بۆ بینینی ئەو وێران کاری‌و تەرمی مردوانەی کە لە ئەنجامی گەمارۆدانی فەرەنسەدا ڕووی دابوو چەند تابلۆیەکی بۆ ئەم کارەساتە دروست کرد بەڵام بەداخەوە بە نووکی نێزەی سەربازە فەرەنسی‌یەکان لەت و پەت کران.

هەر دوای پەیدا بوونی شەڕی پارتی زانی دژی فەرەنسا گۆیا پۆرترێتێکی بۆ سەرۆکی پارتی زانەکانی ئیسپانیا کرد، دوای سەرکەوتنی ئیسپانیەکان بە سەرۆکایەتی دیوك (و لنگتن)، گۆیا سێ تابلۆی مەزنی دەموو چاوی ئەم سەرکردە یەی دروست کرد.

لە مایسی 1813دا فرناندی حەوتەم بە پاشایی بۆ مەدرید گەڕایەوەو کەوتە گرتنی ئەوانەی پەیوەندییان لەگەڵ فەرەنسی یەکاندا هەبوو. گۆیاش ڕای کردو پەنای بردە هاوڕێ‌یەکی، پاش سێ مانگ گەڕایەوە مەدریدو پێشکەش کرا بە پاشای نوێ ئەویش پێ‌ی گوت: ـ

[تۆ شایەنێ دوور خستنەوەو بگرە خراپتریشی.. شایەنی مردنی بەڵام هونەرمەندێکی مەزنی بۆیە هەموو شتێك لە بیر خۆمان ئەبەینەوە].

گۆیا وەك وێنەکێشی یەکەمی کۆشك مایەوە لە ساڵی 1816 هەندێ ئیشی گرافیکی لەسەر زۆران بازی گا دروست کرد.. پاشان گۆیا لە وێنەکێشانی دەموچاوە ئەرستۆکراتیەکان بێزار بوو گەڕایەوە بۆ وێنە کێشانی دەموچاوی چینە زەحمەت کێشەکەی خۆی تابلۆکانی (ئاسنگەر) (ئاسنگەری چەقۆکان) و (ژنە ئاو ـ فرۆشەکە)ی دروست کرد لەم تابلۆیانەدا مژدە هێنەری واقعیەت و (انطباعیە)ی سەدەی نۆزدەهەمە کاتێ چووە ئەشبیلیەش هەستا بە نەخشاندنی کەنیسەکەی، بێ باوەڕی گەیشتبووە ئەو ڕادەیەی کە لە باتی دەموو چاوی دوو فریشتە دەموو چاوی دوو ئافرەتی سوزانی بە ناوبانگی ئەو کاتە دروست بکات.

گۆیا لەگەڵ ئەو دوو کۆمەڵە کارە هونەریانە (کاپریکۆس)و (کارەساتی جەنگ) کۆمەڵەی سێ‌یەمی تەواو ـ کرد لەژێر ناونیشانی (پەندە میللی‌یەکان) کە بە ڕاستی مەزنی هونەری گۆیای دەرخست.

لە ساڵی 1819 گۆیا ماڵێکی گرت لە دەرەوەی مەدرید پێ‌یان ئەوت ماڵی (پیاوە کەڕەکە) لێرەدا گۆیا دوایین کارەکانی ئەنجام داو گەڕایەوە ناو جیهانە ناخۆییە پڕ لە شەیتان و خێوو ترس و یادگارە ئازار هێنەرەکانی خۆی، لەوە ئەچێ گۆیا لەم ساڵەدا تووشی نەخۆشی‌یەکی بە ئازار بوو بێ ئەمەش لەو وێنەیەدا دەر ئەکەوێ کە دەموچاوی خۆیەتی لەگەڵ دکتۆر «اریتا» ئەمە بەناو بانگترین کاری هونەری یە کە چارەی بابەتێکی مرۆڤایەتی ئەکا.

گۆیا دیواری ماڵەکەی بە زۆر لە (تابلۆ ڕەشەکان) کە لە ساڵانی 1820 ـ 1823دا کردوونی ڕازاندوێتەوە بابەتەکانی ئەفسانەو ڕەخنەی ڕەمزی ئەو کاتەی ژیانی ئیسپانیا ئەنوێنێت، لە هەمووی ترسناك تر تابلۆی «زوحەل منالەکەی خۆی ئەخوات» بریتی‌یە لە وێنەی ئادەمیزادێکی ترسناك کە بە درندەیی‌وە یەکێ لە مناڵەکانی ئەخوات ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئیسپانیەکان پیشان ئەدات

خەریکی یەکتر خواردن بوون لەو سەردەمەدا، هەروەها تابلۆکانی «ماڵی شێتەکان و دوو پیاوە شەڕکەرەکەو تابلۆی کۆچ» کە لەو جۆرە بابە تانە ئەدوێن.

دوای تێکچوونی باری رامیاری لە ئیسپانیا (1823) گۆیا داوای لە رژێم کرد کە بینێرێ بۆ فەرەنسا لەبەر خراپی باری تەندروستی، گۆیا ماڵەکەی (ماڵی پیاوە کەڕەکە)ی بەجێ هێشت بۆ - جالیر - ی کوڕی بە هەموو ئەو تابلۆ قەشەنگ و ترسناك و گەورانەوەو رووی کردە فەرەنسا چوو بۆ شاری (بۆردۆ) لەوێ چاوی کەوت بە هاورێ دێرینە بەناوبانگەکەی - مۆرتان - ی شاعیرو بەسەردان چوو بۆ پاریس و سێ مانگ لەوێ مایەوەو پیشانگەی دیلاکرواو گیریکۆی تیا بینی‌و کارەکانیانی بە دڵ بوو.

گۆیا جارێکی تر گەڕایەوە بۆ مەدرید بۆ ئەوەی ماوەی لە فەرەنسا بۆ درێژ بکەنەوە ئیتر بۆ دواجار مەدریدی بەجێ هێشت و ماڵ ئاوایی یەکجاری لێ کرد چونکە مەرگ رێی نەدا جارێکی تر بگەڕێتەوە. کە گەیشتەوە فەرەنسا تەندروستی زۆر خراپ بوو بوو چاوی کز بوو بەڵام خۆی نە ئەدا بە دەست نائومێدیەوە ژمارەیەك تابلۆی دروست کرد لەسەر زۆران بازی گاو چەند تابلۆی کە یەکێ لەو تابلۆیانە پیرەمێردێك بوو بەسەرو ریشێکی سپی وەك بەفرەوەو بە دوو دارشەق ئەرۆیشت ماندوێتی ساڵانی ژیانی باری شانی قورس کرد بوو لە تاریکیەوە رووەو تیشکێکی رووناك ئەرۆی‌و ,دەموچاوی ژیری‌و ناسکی‌و نەرم و نیانی تیا بەدی ئەکرا.

گۆیا لەسەر ئەم تابلۆیە نووسی بووی «هێشتا هەر فێر ئەبم» ئەم تابلۆیە خۆی لە خۆیدا وەڵامێکی توندو تیژە بۆ ئەو نوسەرانەی کە مانای ئیشەکانی گۆیا ئەشێوێنن لەوانە (ئەندریە مارلۆ)و چەندە های ترن وای بۆ ئەچن کە هونەری گۆیا هونەرێکی گۆشەگیری هەمیشەیی یەو لە رەشبینی‌و نائومێدی ئەدوێ، بەڵام هونەری گۆیا هەتا کۆتایی دژی ئەمەیە.

لە 15ی مایسی 1828دا گۆیا تووشی (جلطەی مێشك) بوو بێ هۆش بو بەو بێ هۆشیەوە گیانی سپارد بە نامۆیی‌و دوور لە خاك و نیشتمان و لەوێش نێژرا. پاش زۆرتر لە 7 ساڵ لە مردنی لاشەکەی بەبێ سەر لە گۆڕ دەرهێنراو برایەوە بۆ گۆڕستانی - سان ئسدرو - لە تەنیشت هاورێ شاعیرە کەیەوە - مۆرتن - نێژرایەوە.

ئەگێرنەوە گۆیا وتویەتی «مامۆستاکان هەمیشە باسی هێڵەکان ئەکەن و هەرگیز لە (كتلة) نادوێن بەڵام ئەو-هێلانە لەکوێن؟ من نەهێڵ و نە رەنگ نابینم لە سروشتدا تەنیا سێبەرو رووناکی ئەبینم».

بەم تێبینی‌یە کە ئەڵێ رەنگ بوونی نی‌یە ئەگەر رووناکی نەبێت - گۆیا پێش زانیاری نوێ کەوتووە لە بارەی کیمیای تیشکەوە بەیەك سەدە هەرچۆن بە دەیان ساڵ پێش کەوتووە لە زانستی بینین دا (البصريات).

رەخنەگرە جیهانی‌یەکان ئەڵێن: - مێژووی هونەر داماوە لەوەی کە - گۆیا - ی مەزن بخاتە چوار چێوەی کام قوتابخانەی هونەری‌یەوە هەندێ بە کلاسیکی‌و رۆمانتیکی وهەندێکی تر بە واقعی‌و ئینتباعی دا ئەنێن هەر وەکو هەندێکیشیان بە تەعبیری‌و سوریالی دا ئەنێن.

قاسم حسين صالح

سەرچاوەکان: -

1 - المبدعون في تأريخ الفن الانساني (گويا)، افاق عربية 8 نيسان 1983.
2 - قصة فن الحديث - ساره نيوماير - تعريب: رمسيس يونان.
3 - افاق النقد التشكيلي - عباس الصراف.
4 - الواقعية في الفن - سدني فنكلشتين - مجاهد عبدالمنعم مجاهد - 1971.

* جودی - سەرەك وەزیرانی شارلی چوارم بووە.

# چەند لێکۆڵینەوەیەکی کوردی لە بابەت وڵاتی سوبارتۆوە

نووسینی: دکتۆر جەمال رەشید
کەمال غەمبار لەسەری نووسیوە

١ ـ ئەم کتێبەی لەسەرمان نووسی بە ناوی (دراسات کردیة في بلاد سوبارتو)وە بڵاوکراوەتەوە. لە بڵاوکراوەکانی ئەمانەتی گشتی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستانە، بریتی یە لە 192 لاپەرە، ساڵی 1984 لە چاپخانەی «دار آفاق عربیة للصحافة والنشر»دا چاپ کراوە.

## پێشەکی:




لەدوا دیداری تەلەفزیۆن لەگەڵ دکتۆر طه حسین»دا کە دەستەیەکی نووسەرو رۆشنبیری میسری ناودار لەگەڵی دانیشتبوون، طه حسین وەك مرۆڤێکی وردبین و رووناکبیر لەناو قسەکانیدا وتی: «بەلای منەوە رۆشنبیر ئەو کەسەیە کە جگە لەزمانەکەی خۆی زمانێکی جیهانی ی زیندووی‌تر بزانێ».

لە راستیدا ئەم بۆ چوونەی نیشانەی زیرەکی و بیر قووڵی ئەو نووسەرە گەورەیە بوو کە چ خزمەتێکی گرنگی بە نەتەوەی عەرەب کردووەو ئاسۆی بیرکردنەوەی خوێنەرانی فراوان کرد. رۆشنبیرێ کە زمانێکی جیهانی بزانێ و بەردەوام خەریکی خوێندنەوەو وەرگێران و نووسین بێ، دەبێ چ جۆرە خزمەتێك و سوودێك بەرۆشنبیریی گەلەکەی خۆی ببەخشێ؟ جا ئەگەر ئەمە لەرێگەی زانینی زمانێکی جیهانی‌یەوە بێ و ئەوەندە بایەخی هەبێ، دەبێ رۆشنبیرێ کە جگە لە زمانی زگماکی خۆی چەند زمانێکی دیکەش بزانێ و لەتەك زمانەکەی خۆیەوە بەو زمانانە بخوێنێتەوەو

لەسەر چاوەی سامانی مرۆڤایەتیدا زانیاریو رۆشنبیریی هەمە جۆر هەڵێنجێو پەیتاپەیتا شتی تازە بخاتە سەر خەرمانی رۆشنبیریی نەتەوەکەی خۆی، ئەو حەلە دەبێ لەو گۆرەپانە فراوانەدا چ سوار چاکێ بێ کە ئەسپی خۆی تاو بدات؟!

دکتۆر جەمال یەکێکە لەو رۆشنبیرانەی کە شیاوی ئەوەن بتوانن دەوری مێژوویی خۆیان ببینن و بە جۆرێکی کارامەو لێهاتوانە لەو بوارەدا شوێنی تایبەتیو دیاری خۆیان بکەنەوە، لەبەر ئەوەی جگە لە زمانی کوردی چەند زمانێکی‌تر دەزانێو لەرێگەی خوێندنی بالاوە توانیویەتی جۆرە بەرنامەییەك و نەخشەییەك بۆ خۆی دیاری بکات کە رێبازێکی زانستیانەیەو، دوورە لە (پشتبەستنێکی) رووت بەسەرچاوە یاخود وەك هەندێ نووسەرو مێژوونووس نەهاتووە سەرچاوە پشتگوێ بخات و ئەوی دەیخاتە روو بە هی خودی خۆی بزانێ وەك سرووشێکی خودی - «ئیحای زاتی» -.

مێژوونووسین «لێکۆڵینەوەو شی‌کردنەوە»یە، پشتبەستنە بە باوەرنامەو بەڵگە هێنانەوەو ساغ کردنەوەی بۆ چوونەکانی نووسەر. تەنیا ریزکردنی کۆمەڵێك سەرچاوەو پەراوێز نووسین و پێرست دانان نابنە نیشانەی رەسەنیو توانینی دەسەلات شکانی نووسەر یاخود بڵێین مێژوونووس بە لەخۆدان لە بابەتی گەلێ مەسەلەی مێژوویی کە دەبێ بخرێنە سەر بەردی محەك و بە ووردی شی‌بکرێنەوەو ئەو رایانەی کە پاڵپشتێکی رەواو چەسپاویان نیە پووچەڵ بکرێنەوە، ئەو لایانەی کە شێوێنراون یاخود تەمی گومانیان لەسەرە، لەبەر رووناکی لێکۆڵینەوەو سرنجی ووردو بیری تیژ ساغ بکرێنەوە. ئەم ئەرکەش شتێکی ئەوەندە ئاسان نیە کە هەموو کەسێ بتوانێ شانی بداتەبەر. لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە ئەو ئەرکەی دکتۆر جەمال وەك لێکۆڵەرێك کە خستویەتی‌یە ئەستۆی خۆی هەوڵ و تەقەلاو رەنجێکی زۆری گەرەکە، چونکە کارەکەی ئەو چەند لق وپۆپێکی لێ‌دەبێتەوە کە تەنیا لە چوارچێوەی بوارێکی سنووردار‌دا گیر خوات، بەڵکو ئەو هەر وەك لەو کتێبەی لێ‌دەدوێین بە روونی بۆمان دەردەکەوێ پەلی بۆ زۆر لایەن هاویشتووە وەك زمان و مێژوو و جوگرافیاو باری کۆمەلایەتیو ئابووریو رامیاریو هەندێ لایەنی‌تر لە ژیانی مرۆڤایەتیدا لەناوچەکانی ژووروو رۆژهەلاتی وولاتی نێوان دوو رووبارەکە واتە «میزۆپۆتامیا»ی کۆن.

**ناوەرۆکی کتێبەکە:**

دکتۆر جەمال پێشەکی‌یەکی تێرو تەسەلی بۆ کتێبەکە نووسیوە، ئینجا هاتووە ناوەرۆکەکەی بەسەر پێنج بەشدا دابەش کردووە، هەر بەشەشی کردۆتە چەند باسێك و بۆ هەر بەشەش کۆمەڵێك تێبینیو سەرچاوەی جیاجیا وەك پەراوێز دەخاتە بەردەم خوێنەر کە ئەم کارە زیاتر لێکۆڵینەوەکان بەپێزترو پتەو تر دەکات.

ئەوەی کە شیاوی باسە نووسەر پشتی بەژمارەکی زۆر لە سەرچاوەی هەمەجۆر بەستووە کە کردوونیەتی بە بنەگەی کتێبەکەو یەك بە یەك دەیانخاتە بەر تیشکی زانیاریی خۆیو بۆچوونە تایبەتی‌یەکانی. سەرچاوەکان عەرەبیو کوردیو فارسیو تورکیو هی وەرگێردراون بۆ زمانی عەرەبی، هەروەها کۆمەڵێك سەرچاوەی‌تر بە زمانی رووسیو ئینگلیزیو سلۆڤیو ئەلمانیو مەسیحیو سریانیو یۆنانیو رۆمانیو هیتر.

دکتۆر جەمال لەپێشەکی کتێبەکەیدا دەڵێ: ئەم کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیە کە هەندێ مەسەلەی زمانەوانیو مێژوویان تێدایە پێشکەش بە هەر کەسێ دەکەم کە بایەخیان پێ‌دەدا، بۆ بەشداری کردن لەهەول و تەقەلای بەردەوام بۆ گەیشتن بەکاکڵ و کرۆکی ئەو رووداوانەی کە رۆڵێکی دیاریکراویان نواند لە مێژووی پارچەیێکی گرنگ و جیاکراوەی مەڵبەندی ئادەمیزاد، ئەویش ئەو ناوچە شاخاوی‌یە گەردن کەشانە دەگرێتەوە کە ناوی لەکۆنترین رێزەی جوگرافیی سۆمەری گشتی‌دا بەشێوەی SU. BIR «سوبیر»دا دەرکەوتوە.

مێژووەکەی بۆ سەردەمی «لۆکال ـ ئانی ـ مۆندۆ»ی کاربەدەستی شاری «ئەدب» لەچارەکی یەکەمی سێ هەزارەی بەر لەزایینی کە لەتەك «ئیلام، ماراهشی، کوتیۆم، سوبێر، ئامۆرۆ، سوتیۆم»دا نووسراوە. نووسەر ناوەکە ساغ دەکاتەوە، شوێنی جوگرافیای وولاتەکە دیاری دەکات، ئەویش ئەو ناوچەیە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە ژووررووی رۆژهەلاتی «ئیلام» لەرێگەی ماراهشی‌یەوە بەرەو ژووررووو و رۆژئاواوە درێژدەبێتەوە تا دەگاتە ئەمانۆس «چیای ئورز» لە وولاتی ئامۆرادا.

هەروەها ئەم کتێبە وەك خۆی نووسیویەتی کۆمەلێك مەسەلەی تێدایە کە پەیوەندییان بەسەردەمێکەوە هەیەو چەندین سەرچاوە پێك دێنن کە دەبێ ببنە بنەگەی بەراستی بۆ سەر هەلدانی خاسیەتی نەتەوایەتی لە ناوچەیێکی جوگرافیی دیارکراودا «سوپارتۆ» کە لە دواییدا بەشێکی ناونرا کوردستان واتە وولاتی کوردان. جگە لە خاسیەتە نەتەوایەتی‌یەکان یەکبوونی هۆزەکانی کارتی «کارتاوی‌یەکان»ی رەوەند کە لەسەردەمی سلوقی‌یەکان لەرۆژهەلاتی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتیدا دەرکەوتن. دوایی کاردۆخی‌یەکان خەلکی دانیشمەندی لادێ‌ی ناوەراستی ئەو وولاتە دەورێکی جیاکەرەوەیان لە بینای رەگەزو زمان و شارستانێتی‌ی کوردەکان بینی، بە جۆرێ سرنجی هەندێ پسپۆرو شارەزایان لەم بابەتە راکێشا.

بەشی یەکەمی کتێبەکە تەرخان کراوە بۆ «بنچینە مێژوویی‌یەکانی زمانی کوردی» لە باسی یەکەمدا دکتۆر جەمال رای وایە کە زمان ئامرازی پەیوەندی کردنە، دەتوانێ ئارەزوەکانی مرۆڤ و گواستنەوەی بیروباوەرەکانی بۆ هی‌تر دیاری بکات، ئەویش بە گۆرینی جیهانی بیر «ذهن» بۆ جیهانی ئاخاوتن لەگەل کۆمەلدا، بە دەربرینی میراتێکی رۆشنبیریی کە لە دانانی تاکە کەسێك نیە، بەلکو رەنگدانەوەی کۆمەلێك رۆشنبیریی سەر بە کۆمەلێکی دیاریکراوە لە چەندین قۆناغ لە تەمەنی شارستانێتی‌یەکەیدا. ئەو کەرەستانەی کە زمانیان لێ‌پێك دێت هەمان کەرەستەن کە سەرجەمی رۆشنبیریان لێ‌پێك دێ. لە دواییدا مەسەلەی بەکار هێنانی زمان لە ئاخاوتن و نووسیندا بۆ دیارکردنی خواست و هەست و نەستی جیاجیا بەگەورەترین داهێنانی شارستانێتی دەداتە قەلەم کە میللەتە کۆنەکان وەدەسیان هێناوە.

جیهانی بیر لای مرۆڤی کۆن بەجیهانێکی ئایدیالیست یاخود رەمزی لەقەلەم نادرێ وەك هی ئەمرۆمان، بەلکو بە درێژ بوونەوەی خودی جیهانی مەوزووعی دەرەوە بەتەواوەتی دادەنا، وەك ئەوەی لەباری خەوبینین دا دەمان بێ. ئەوان بڕواییێکی تەواویان هەبوو کە خەو دەیانخاتە بەردەمی پەیوەندی‌یەکی راستەوخۆ لەگەل هێزی نەبینراودا، ئەوەی کە خەویان پێوە دەدی راستن و رووداون و لە واقیعدا روو دەدەن. ناولێنانی شتیان بەکردەی دروستکردن لەقەلەم دەدا، بۆ نموونە سۆمەری‌یەکان وشەی «نەم» یان بەکار هێنا بۆ ئەو خاسیەتە کاریگەرانەی کە لە شتەکاندا زانیوویان، خاسیەتەکانی کاری «شت یا بابەت» توانای دەگەیەنێ، ئەکەدی‌یەکان وشەکەیان بە «شەمتۆ» وەرگێرا، واتە خوو و رەوشت و ئەو سروشتەی کە تیایەتی، هێشتاش لە زمانی عەرەبیدا زیندووە «سمة، شيمة» کەوا وشەی «نەم»ی عەرەبی جەوهەری مرۆڤ و سروشتەکەی دەگەیەنێ‌و لە بەکار هێنانی وەك فرمان ـ فعل ـ دەرخستنی شتی نهێنی‌ی شت و خاسیەتەکان دەگەیەنێ. لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە وشە، گۆرانێکی زۆری بەسەرا دێ وەك وشەی «کور» واتە «چیا»، لەسۆمەریدا دووپات بوونەوەی «کورکور» چیاکان دەگەیەنێ.

هەرچەندە ناوە کوردی‌یەکەی بۆ چیاکانی «کورکور داغ»ی سەر زێی بچووك، نزیك گوندی «کانی توو»ی سەر بە قەزای پشدەر ماوەتەوە. لە سۆمەریدا شار دەگەیەنێ‌و ووشە سۆمەری‌یەکە «کۆ» بەمانای چیا لە زمانی کوردی‌دا بەردەوام بوو، وەك ووشەی «گامێش ـ جامووس»ی سۆمەری، هەروەها «هەتاو» هەرچەندە لە روالەتدا پەیوەندی بە «ئافتاب»ی فارسی‌یەوە هەیە، بەلام

له ڕاستیدا ڕەمزی خواوەندی سۆمەرییەکانە «ئۆتۆ»ی خواوەندی خۆر کە بەسەدان ساڵ بەر لە سەدەی نووسین لایان پیرۆز بوو، هەروەها وشەی «مزگەوت، مزگەفت» لە «مسجد»ی عەرەبییەوە نەهاتوە، بەڵکو خۆی کوردییەو لە «مزد ← مازدا ← ئاهورا مازدا»وە هاتوە، ناوی پەهلەوی بۆ پەرستگا «مزگیت»ە کە دەبێ بەر لە چەند سەدەیێك پێش ئیسلام بەشێوەی کۆن هەبووبێ.

زۆر وشەی تریشمان بۆ ساغ دەکاتەوە کە لە بنچینەی خۆیان دوورکەوتۆنەتەوەو گۆڕانێکی زۆریان بەسەر هاتوە وەك «باژێر»و «خێزان»و «گوند»و «کاروان»و جوامێرو «مەهرەجان». زۆر وشە کە لە عەرەبی باون لە کوردییەوە وەرگیراون و چوونەتە ناو زمانی عەرەبییەوە وەك «المرج، الدستور» کە کوردییەکەیان «مێرگ و دەستەوەر»ن.

لە باسی دووەمدا بۆ ئەوە دەچێ کەفەلسەفەی گریك لەگەڵ دینەکانی ڕۆژهەڵاتیدا یەکیان گرت و لە ئەنجامدا ئەفسانەی بابولیو گریکیو هیتر تێکەڵ بەیەکتر بوون، ئەم دیاردەیە چەمکی هیلنستی بەخۆیەوە دی کە ڕێبازی جیاجیا بەیەك دەگەیەنێو تەباییان دەکات. خواوەندەکانی بابولیو گریکیو هیتر بە خواوەندی ناوچە کوێستانییەکان دانران، بەمەوە ئاهورامازدا لەگەڵ سن و زیوس و مردۆك و عەشتار. هتد تێکەڵاوبوون. لە ئەنجامی ئەوەوە زمانی کوردی بە وشەی فەلسەفیو زانیاریو دیالێکتیکی زمانەوانی دەوڵەمەند بوو کە ئەدەب و سامانی هونەریو ڕۆشنبیریان مشتومال کردەوە.

بۆ نموونە وشەی «میثرادات ← میهرداد» کە زۆر جار لە ناوی پاشاکانی ناوچە شاخاوییەکان یا پاشای ئەو ئیمپراتۆریەتانەی حوکمرانیان کرد دەردەکەوێ. پاشان لە کوردیدا ئەمرۆ بەشێوەی «خوداداد» کە بەرامبەرەکەی «عطاء الله»و تورکییەکەی «الله وێردی»یەو سلاڤییەکان «بوغدان»ە دەردەکەوێ. هەروەها تەقەلادانی پاراستنی دەنگەکانی سروشت بنەچەی پێکهاتنی وشەکان بوو کە هێشتاش بەشێکیان لەناو ڕستەو دەربریندا بەکار دەهێنرێن.

بۆ نموونە وشەی «گرۆم»ی ڕووسی کە هەورەتریشقە دەگەیەنێ هەمان دەنگی دیاردەکەیە لە سروشتدا، بەڵام لە کوردیدا دەنگەکەی هەورەتریشقە خۆی «گرمە گرم»ە، ئەم وشەیە لە کوردیدا نەگۆڕاوە تا ئەو قۆناخەی لە ڕووسیدا پێی گەیشتووە تا هەمان دیاردە بگەیەنێ، یاخود «خوڕە خوڕە» دەنگی ئاوە لەعەرەبیدا بۆتە «خریر».

هەندێ وشەی کوردی لەکۆنەوە دیاردەیێکی دیارکراو دەبەخشن، بەڵام بەدرێژایی زەمانە بوونەتە واتای شت و پاشکۆیەکانی وەك وشەی «سەر» کەبوەتە سەردار، سەر تیپ، سەربەست. لە مانای ڕەسەنی خۆی دوورکەوتۆتەوە بوەتە وشەیەکی لێکدراو، هەروەها «پیاو» مانایتری بەخۆیەوە دی کەپەیوەندی بەچەمکی کۆمەڵایەتییەوە هەیە، پاشان وشەی «پیاوەتی» دەرکەوت کەمانای ئازایەتیو ڕەوشت باشیو شتیترە. بە هەمان شێوەو ڕێچکە ڕووسەکان هەموو موسلمانێکیان ناو نا «تەتەر» چونکە لەڕێگەی تەتەرەکانەوە ئیسلامیان ناسی، ئەمرۆش وشەی «شەرقی»لای تورکەکان «سروود، مەقام، گۆرانی» دەگەیەنێ، کە بنەچەکەی دەگەڕێتەوە سەر شەرقی «ڕۆژهەڵات»ی ئەنەزۆڵ، هەروەها «ئاسیا» وشەیێکی ئاشوورییە کە مانای «ڕۆژهەڵاتی دەگەیاندو لە ـ ئاسۆ ـ وە گۆڕاوە بە ئاسیا. وشەی «ئاب AP» وەك دیاردەیێکی سروشتی لە زمانی هیندو ئەوروپیدا مانای ئاوە، پاشان وشەکە بۆ هەموو ڕووبارێك بەکار هێنرا کە خێڵە هیندو ئەوروپاییەکان لە کەنەرەکانیدا نیشتەجێ ببوون، ئێستاش بۆتە برگەی ناوی هەندێ ڕووبار وەك ڕووباری «پێنج ئاب ← بنجاب»، «دۆن ئاب ← دۆن ئاو ← دۆن ئاڤ» لەو بابەتانە وشەیتر زۆرن کە کوردین و کەوتوونەتە ناو زمانی عەرەبی دکتۆر جەمال نەیویستووە درێژە بە باسەکەی بدات بۆ نموونە «سەرئاو ← سرآب ← سراب»، سەرداو ← سردآب ← سرداب»، «گول هەنار ← گلنار ← جلنار»و هیتر.

لە باسی سێیەمەدا لەوە دەدوێ کە دانیشتوانی وڵاتی

سوپـارتـۆم گۆڕانێکی لەتێکی بەسـەرا نەهـات بەقـەد ئەو گۆڕانـەی کە هاتـە سەر ناوەکـان. ناوی حوری‌یەکان پاش سەدەی حامورابی شوێنی زۆربەی دانیشتووەکانی گرتەوە. ناوی «هـوڤـارداتـا» کە بەمـانـای بەخشینی خودا دێ، لە نووسـراوەکـانی بابـولی‌یـەکـانـدا بەرێـژەی «ئـومـرداتـوو، خورداتوو، پاشان خومرداتوو».

هاتووە هێشتا ئەم ناوە، بەناوی خورماتوو بەکار دەهێنرێ «طووز خورماتوو، تازە خورماتوو» وەك لە ناوی «باگاداتوو ← باگادات ← بەغداد» واتە بەخشینی باگای خواوەندا هەیە. لەبـابـەت میتـانی‌یەکانیشەوە ئەوە دەسەلمێنێ کە لە ناوچـەکـەدا ناوی «کـورد» وەك چینێکی سەرخـان هێشتـا لەنـاوچە ناوبـراوەکـەدا دەرنـەکـەوتـوە. هەروەهـا زمانێکی هاوبـەشی دەرنـەکـەوتـوە، تەنیـا ئەو بۆچـوونـە نەبێ کە پەیـوەنـدی‌یـەکی بەتینی کوردیی هاوچـەرخ هەیـە لەگـەڵ میتـانـی کۆنـدا، لەتـەك ئەوەشـدا زۆربـەی ناوە جوگـرافی‌یـەکـان و ئەتنـۆمیکی‌یـەکـان بە شێوەی سۆمەری‌و ئەکەدی‌و حتی مانەوە. وە لە ئەنجامی ئەو گۆڕانەی بەسەر ناوچـەکـەدا هات ناوی شاری‌تـر لەو وڵاتـەدا دەرکـەوتن و گۆڕان بەسەر چەند ناوێك دا هات وەك «بیث گەرمی» بوو «باجرمی» لە عەرەبی، هەروەها «بیث زیدیتا» بوو «بازبدا» وەك «بیث فردو» بوو «بـاقـردی»و «بیث درایـە» بوو «بـدرە» هەروەهـا لە ناوی (جـرمی) وشـەی «جـرمیق»ی عەرەبی وەرگیرا، کوردی‌یە کۆنەکەی «گەرەمیك»ە کە بوو گەرمیانی.

کووتی‌یـەکـان کۆنتـرین خەڵکن کە ئەم ناوچـەیان کردە هەوارگەی خۆیان. هەرچەندە کە «عرفە ـ ئەراپخا» لایەکە لە شاری «کەرکووك»ی ئێستا، بەڵام ناو لێنانی (کەرکووك) کورتکردنەوەی ناوە ئارامی‌یەکە نیە «گەرخابێت سلۆخ» کەلە سەدەی ئیسـلامیـدا بووە «کـەرخێنی» بەڵکو بەر لەو مێژووە بەشێـوەی (کـورکـور) وەك لاسایی‌کردنەوەی دەنگی ئاگری بیـرەکـانی نەوتی ئەم ناوچـەیـە هاتوە کە دوایی ناو نرا «بابە گور گور» کە لە کۆنەوە دەورەی پەرستگای «ئەناهیتا»ی دابوو.

هەرچـەنـدە کە وشـەی نوێ هاتـەکـایـەوە بەڵام زمانی کوردی خاسیەتی خۆی پاراست. وەك وشەی «سپادا» کە بە مانـای سوارە دێ، هاو واتـای لەشکـرە. «سـوپا» وشە کۆنـەکـەی «ئـەسپاکا» بوو. جگە لەمە وشەی «پادیکا» بە مانای ـ پیادە ـ ماوەتەوە، بەڵام هەندێکی‌تریان شوێنەواریان کوێر بۆوەو لەناو کوردی‌دا وون بوون، «پا» نەبێ بە مانای «پێ» کە پیـادەی لێ‌وەرگیـراوە «بیـدق»ی عەرەبیش هەر لەپیادەوە وەرگیراوە. «ك. غ». هەروەها «بانداکا ← بەند، لەیسـە ← وەیس، تنـوکـا ← تەنـو ← تەن، ناسوکا ← نازوکا ← ناسك، نازك»و هیتر.

بەشی باسی چوارەم بریتی‌یە لە لێکۆڵینەوەیێکی پوخت لەبـابـەت شوێنەکانی ژووروی وڵاتی سوپارتۆوە، بەڵام ناوچـەی زێ کە بە ئاشـووری بە «ئـەنـزیت» ناسـراوەو بە «حتی» کە لە بەشی دەقەکانی (بوغازی کوی) بینراوە کە دەکـەوێتـە تەك سوفـانینی‌و باشـووری ئەزنینی کە لەدواییدا بەزمـانی سریـانی وەك (ئـەرزۆن) تۆمـار کراوەو بە ئەرمەنی وەك (ئەرزنیك و ئەلزنیك) پاشان لە سەردەمی ئیسلامی‌یەوە بە (میـافـارقین) ناوبـرا، بەتایبەتی بووە مەڵبەندی دەوڵەتی مەروانیی کوردی لە سەدەی دەیەمی زایینیدا.

دانەر لەوە دەدوێ کە ئەو ناوچانەی ناوهێناون حتی‌یەکان لە کاتی هێرشەکانیان بۆ سەر بابول لەسەرەتاکانی سەدەی شانـزەمی زایینیـدا ئەم وڵاتـەیـان وێـران کرد، پاشـان یەکـگـرتـنـی ئەم ناوچـانـەی بەدواوە هات بەتـایبـەتی سەرچاوەکـانی ڕووبـاری خابووروو هیرماس پاشان هوری‌و دەرسیم و ئەنزیت و ناوچەی «هانی گلبات»یان پێکهێنا کە بووە مەڵبەندی دەوڵەتی میتانی. لێرەدا بۆ ئەوە دەچێ کە ناو نانـی «پـالـو» دەوروبـەری بە «بـورشخنـد» لەلایـەن حتی‌یـەکـانـەوە کە ڕەمـزی برگەی یەکەمی «بورگە»ە (bhrgh) بەمـانـای بەرز بەزمـانی خۆمـاڵی، هێشتـاش لە زمـانـە جەرمـەنی‌یـەکـان خۆیـانـدا «چیا berg» ماوەتەوەو شێوەی لە کوردیی نوێدا «برز ← بەرز»ە، هەروەها ناونانی ناوچەی «مـاشـوهانـدا، ماشهونتا»وە بە یۆنانی «میز» کەبەرامبەرەکەی

«مەزە»ی کوردیی کۆنەو «مەزن»ی نوێیە، لەم ڕووەوە نموونەی زۆرمان بۆ دێنێتەوە.

هۆیەکانی جوگرافی لەتەك واقیعی ڕامیاری‌و نەتەوایەتی دەوری خۆیان دەنوێنن لە گۆڕانکاری‌یەکانی ئەتنیکی کە لە بەشی ڕۆژئاوای ئەنەزۆل دەردەکەون، بەتایبەتی لە نزیك سەرچاوەکانی ڕووباری دیجلەو چەندین ئەو چەقانەی دێنە سەری، لەکاتی ڕووتێکردنی هەندێ خێڵی ڕۆژئاوایی بۆ ناوچەکە. ناوی دیجلە کە لە سەردەمی میدی بەشێوەی تیگرا Tigra دەرکەوت، سترابۆی جوگرافی یۆنانیش ڕەسەنی ئەمە دووپات دەکاتەوە، ئەمەش ئەو ڕاستی‌یە دەردەخات کە خێڵی میدی لە کەناری سەرچاوەکانی‌دا دانیشمەند بوون.

ئەم ڕووبارە لەم ناوچەیەدا سێ لقی هەیە:

1 ـ دیجلەی ڕۆژئاوا: ئەرغانە صو لەنزیك گۆمی گولچکەوە دێ.

2 ـ زیبانە صو: کە لەسەدەکانی ئیسلامیدا بە ئاڤی ذو القرنین لەکوردی‌دا باوبوو.

3 ـ دیجلەی ڕۆژئاوا «بهتان صو».

ناوی «جولیمێرگ یاخود جولا مێرگ»مان بۆ ساغ دەکاتەوە کە لە سەرچاوەکانی ئەرمەنی‌دا بەناوی «جلمارگ»ەوە هاتووە، بەڵام ناوەکە کوردی‌یەو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە پێش تۆمار کردنی، دەبێ ـ گۆلی میرگ ـ بێ.

ناوی «ساریساو پیناکاو ساتالکا»مان بۆ شی‌دەکاتەوە کە لە چیەوە هاتووەو بنەچەکەیان چیە، لەدواییدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە وڵاتی سوپارتۆم مەڵبەندی کۆبوونەوەی هەمە ڕواڵەتی شارستانێتی پێك دێنێ کە لەو وڵاتەی دەورەی داوە سەری هەڵداوە، ئەویش لەئەنجامی تێکەڵاوبوونی ڕاستەوخۆی ئەو شارستانێتی‌یە خۆماڵی‌یانەی کە لە وڵاتی دوو ڕووبارەکەو ئەنازۆڵ و قەفقاس و باشووری دەریای قەزوین گەشەیان سەند.

باسی پێنجەم هێنانەوەی هەندێ بەڵگەیە کە ڕێگامان بۆ ڕۆشن دەکەنەوە بۆ دەرخستنی پەیوەندیی زمانەوانی نێوان کوردیی هاوچەرخ و میتانیی کۆن. دکتۆر جەمال لەو ڕایەدایە کە چینێکی دیاریکراو لە سوارە «ئەسپا بارا»ی کۆمەڵگای میتانی خەریکی بەخێوکردنی وولاغ بوون، ئەوانە پەرەیان سەندو هێزو دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان هەبوو کە بە توندی ڕووبەڕووی هێزەکانی تەحوتمسی یەکەم، فیرعەونی میسر بوونەتەوە، بەڵام ئەوان بەرەنگاری تەوژمی هێزەکانی ئاگۆمی دووەمی کاشی بوون لەباشووررو هەرچەندە کە مل ملانێ لەنێوان چینی کاربەدەست لەم وڵاتە هەردوو تاقمی لایەنگری میسر یاخود حثی‌یەکان دەرکەوتوە، بەڵام تاقمی‌یەکەم سەرکەوتوەو پەیوەندی لەنێوان میسرو میتانی‌یەکان بەهێز بووە، بەرادەیێ نامە لەنێوانیاندا ئاڵوگۆڕ کراوە، لەمەش زیاتر ئەمنۆفیسی دووەم خوازبێنی یەکێ لە کچەکانی پاشای میتانی کردوە، ئەویش داوای چەردەیێك زێری کردوە لەجیاتی ئەوەی کچە جوانەکەی خۆی کە «تۆ دۆ هیبا» بوو بداتێ، پاش مەرگی ئەمنۆفیسی دووەم بوە خێزانی ئەمنۆفیسی چوارەم، ئەویش ئەوەندەی خۆش دەویست تا ڕادەیێ ناوی نا «نەفەرتیتی».

دکتۆر جەمال چەند ناوێکی‌ترمان بۆ ساغ دەکاتەوە وەك واشکانی‌و کۆنترین ڕێژەی جوگرافی ناوی وڵاتی میتانی‌یەکان، هەروەها باسی سوارسوارانێ دەکات کە (کیکۆل) ناوی نا «ناڤارتانی ڤاژنە سەیە» کە نۆ کۆرسی بووە مەودای هەر کۆرسێك باسی دەکات کە نزیکەی حەوت میل دەبوو، هەروەها شێوەی پێشبرکێ‌یەکە دیاری دەکات کە چۆن بووە لەمەش زیاتر زاراوەی «ئەسپا رڤیسە» کۆنی میتانی لەکوردیدا بەشێوەی ئەسپ ڕێز ماوەتەوە. هەروەها ئەو ژمارانەی کە کیکۆل تۆماری کردوون لەگەڵ ژمارەی کوردی‌دا ئێستا هاوجووتن، ئەمەش دەمانگەیێنێتە ئەو باوەڕە کە کوردی تاکە میراتگری ئەو زمانەیە کە ڕۆژێ لەڕۆژان زمانی شارستانێتی لەدین و سیاسەت لەووڵاتی باڵادا دروست کرد.

دیارە شاژنە (نەفرتیتی) هاوسەری ئەمنۆفیسی چوارەم دەورێکی گەورەی بینیوە لە ناوگۆڕینی مێردەکەی بۆ ـ ئاخن

ئاتوون ـ (ئاتوون خواوەندی خۆرە بە زمانی میسری کۆن) ئەمەش بەڵگەیەکە کە خوی میتانی بووەو لەسەر ئەو باوەرە بووە کە لە کۆمەڵەکەیدا باو بووە بەر لەوەی شوو بە فیرعەونی میسری بکات. گومانیشی تێدا نیە کە ئەو گۆرانە ئایدیاییە لە ناوچەکەدا پەرەی سەندو زۆر بیرو باوەری کۆنی گۆری. پاشان ئایینیتر دەرکەوتن کە باوەری کۆنی کوردی کە دیلی ئایدیای میثۆلۆژی سۆمەرییەکان بوو، بەلاّم ئەو فیکرە نوێیە نەبووە بنەچەیێکی روحی بەهێز لە پەیوەندییە مادییەکانی ئەو کۆمەڵگایانە هەتا تیرە میدییەکان لە وولاتی چیادا بلاوبوونەوەو ئەو دەورە دینییە گەورەیەی کەتیرەی (ماگ)ـەکان لە ناوەراستی هەزاری یەکەمی بەر لەزایین نواندیان. . پاش کۆچکردنی ئارییەکان، دەتوانین ئەوە بسەلمێنین کە دەسەلاّت سەندنی زمانی پیرۆزی کتێبی (ئاڤێستە)و بلاوبوونەوەی هەندێ تیرەی میدی، راستەوخۆ لەو وولاتەدا بووە هۆی ئەوەی کە زمانی میتانی لەگەڵ هەندێ زمانی ناوخۆ، خۆماڵی کردنی بە میدی بووە هۆی دەرکەوتنی چەکەرەکانی زمانی کوردی.

باسی شەشەم لەرێگەی هەندێ ناوەوە دەیەوێ بگاتە هەندێ راستی کە رێچکەی پێناسینی مێژوویی کوردستان بن و رەگ و ریشەی یەکەمی مێژووی کورد بن کە ئەوانەش لەزمانانی جیهان دا هەن، لەبەر هەندێ هۆی خودیو مەوزووعی، چەند بەڵگەیەکی ئاشکراو روون ژمارەیێك ناوی کۆنن کە لە زمانی کوردیدا ماونەتەوە، وەك «ئامۆمۆن، یاخود ئامۆمۆم» کە پوختەی بەردی کریستالن کوردەکان لەچیاو ئەشکەوتەکان دەریدێنن، یاخود (گاگات) کە وەك گوگردەی کوردییە یاخود (گەزگەز). کە دارێکە بۆ تیمارکردنی برین بەکار دێ.

بەشداری کردن لە بەکار هێنانی ئەو وشانە لە زمانی یۆنانیو لاتینیو کوردی کۆن و نوێ دیاردەیێکی کارتێکردنی هلینزمە لە شارستانێتیی ناوخۆی وولاتی کوێستان بەر لە تۆمارکردنی ئەم وشانە بە چەند سەدەیەك بە تایبەتی کە مەقدۆنییەکان دەستیان نایە ناو کاروباری رۆژهەلاّت.

لەبەر رۆشنایی ئەم بۆچوونەی دکتۆر جەمال ناونانی ـ پێنجوین و بیتوێن ـ نیشانەی دەسەلاّت سەندنی شارستانێتیو سیاسی هیلنستییە لەدەسەی مەقدۆنی سلووقی. برگەی یەکەم (پێنج) لەسەر دەمی میتانییەوە هەبووە، هی دووەمیش لەگەڵ دەرکەوتنی یۆنانییەکان لەو ناوچەیەدا لە کۆتایی هەزاری یەکەمی بەر لە زایین دا دەرکەوت. بیتوێن ـ بیت وێن»یش لە کارتێکردنی ئارامییەوە هاتووە.

لەم رووەوە کۆمەڵێك ناومان بۆساغ دەکاتەوەو شوێنە جوگرافییەکانیشیان دیار دەکات و ئەو گۆرانانەی کە بەسەر وشەکاندا هاتووە بەیەك دیاری دەکات کە لە بنەچەدا چۆن بوون، ئایا کارتێکردنیان پێوە دیارە یان نا؟ لە چییەوە هاتوون، لە کۆنەوە چ بوون؟ ئەم گۆرانانەش بۆ باری خودیو ئایینیو رامیاریو ئابوویو مەوزووعی دەگەرێنێتەوە.

دکتۆر جەمال لەو سێ باوەرنامە گرنگانە دەکۆڵێتەوە کە ساڵی 1905 لەناوچەی هەورامان دۆزراونەتەوە. دوویان بەپیتی یۆنانی کلاسیکی نووسراون و سێیەمیان بەخەتی ئارامی کۆن. کاولی ئەو باوەرنامانە بۆ سەدەی فرثی دەگەرێنێتەوەو باوەرنامەی سێیەم بە دەقێکی پەهلەوی دەداتە قەڵەم کە بە ئەلفبای ئارامی لەگەڵ چەند وشەیێکی سامی نووسراوەتەوە.

نووسەر بە دوورودرێژی لە باوەرنامەکە دەدوێو بۆمان شیدەکاتەوە ئەو گیروگرفتانە دەس نیشان دەکات کە دێنە پێش خوێندنەوەی پسپۆر لە کاتی خوێندنەوەی دەقەکانی ئەو قۆناخە، ئینجا دەگاتە ئەو بروایە کە زمانی کوردی هەر لەسەرەتاوە کەوتبوە ژێرکارتێکردنی دوو جیهانی گەورە لە زمانەکانی هیندیو ئەوروپیو سامی، ئەو جۆرە کارتێکردنەش دەردەخات. هەروەها ئەو دەورانەی کە زمانی ناوخۆی وولاتی سوپارتۆ یاخود کوێستان پێیاندا تێپەریوەو کە بوونەتە بنچینەی یەکەمی زمانی کوردی هاوچەرخ بەسەر پێنج قۆناغ دا دابەش دەکات و یەکە یەکە لێیان دەدوێ.

دکتۆر جەمال بەشی دووەمی کتێبەکەی بۆ کاردۆخی یەکان تەرخان کردوە. قسەی (وایسباخ) لە بارەی کاردۆخی یەکانەوە بۆ نموونە دێنێتەوە کە گەلێکن لە بەرزاییەکانی دیجلەوە دانیشمەندبوون و سنووری ژووروی ناوچەکەیان لقی گەورەی دیجلە بوو.

گریکەکان لە کاتی گەڕانەوەی دە هەزار کەسەکەوە، کاردۆخی یەکانیان ناسی کە کسینۆفۆن سەرکردایەتی کردو بەدرێژی خاسیەتی وولاتەکە وەسف دەکات «چیای جودیی ئێستا»و لەو شەڕە قورسانەی کە سوپای یۆنانی یەکان تووشی هات لەکاتی کشانەوەیدا - کە ناچارکرا - بەرامبەر لەو کەسانەی شارەزاییەکی چاکیان لەکاروباری جەنگدا هەبوو. باسی چەك و جبەخانەی کاردۆخی یەکان دەکات کە بەکاریان دەهێناو دێتەسەر لەو ڕایە کە لەو کاردۆخیانە هەرچەندە لە هەموو لایەکدا فارسەکان دەورەیان دابوون، بەلام توانیان سەربەخۆیی وولاتی خۆیان بپارێزن. کسینۆفۆن دەلێ: دوانزە هەزار سەرباز پەلاماری وولاتی کاردۆخی یەکانیان دا، دوا کەسیان لێ قڕکرا، یۆنانی یەکان خۆشیان لەوانەی لەگەڵ کسینۆفۆن بوون کاتی حەو ڕۆژەکە کە بەم وولاتە تێپەڕین زیاتر زیانیان لێکەوت لەوەی لە هێرشە دووڕو درێژەکەدا زیانیان لێ کەوت: بەدەگمەن پاش کسینۆفۆن هەواڵ لەبابەت کاردۆخی یەکانەوە تۆمار کراوە.

دکتۆر جەمال هەندێ زانیاری دەربارەی کاردۆخی یەکان ساغ دەکاتەوە بەتایبەتی ڕایەکانی سترابۆن کە ئەویش هەمان ڕایەکانی ئیراتو - شنینیس دووپات دەکاتەوە کە پڕن لە هەڵە، هەروەها ئەو ڕایانە شی دەکاتەوە کە لە ئەفسانەی لافاوەکەوە دەدوێن و کەشتی یەکە لەسەر کام چیا گیرساوەتەوە کە ڕای مووسا ئەوەیە کە کەشتی نووح لەسەر چیای ئەرارات گیرساوەتەوە، واتە قردو کە لە هەموو نووسینەکانی سریانی دا دەبینرێ. ناوەکە خۆی لە وەرگێڕانی کتێبی پیرۆز لەلایەن ئۆرشلیمەوە «قردون»ەو لە نووسینەکانی مەندائیدا «قاردون»ە.

هەروەها کەشتی نووح بەڕای نیقولای دیمەشقی لەسەر چیای باریس گیرساوەتەوە.

بەشی سێیەم لە پەیوەندیی کورد بە کاردۆخی یەکانەوە دەدوێ کە ئەمومۆ بەگشتی مێژووی گەلی کوردی لە کۆنەوە تەنیوەو ئەو تەقەلایەی کە دراوە خاسیەتە نەتەوایەتی و چەندیەتی بنەمایەکانی کە نیشانەکانی ئەم گەلەی ئێستا دیاری دەکەن لەپێشەوە ناونانی نەتەوایەتی - لەگەڵ ئەو ناوانەی بەشێوە لێوەی نزیکن بەتایبەتی، گشتیان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، پاشان شی کردنەوەی ڕەوتی ئەو مێژووە تەنیا لەناو ئەو ناوانەداو دروستکردنی چەند ڕایەك کەپشت بەو باوەڕە، خودی یە دەبەستن لە گەشەپێدانی یاخود ورن بوونی هۆیەکی سەرەکین بۆ دەرکەوتنی ناکۆکی لەنێوان تیئۆری ئەو کەسانەی پسپۆڕیان هەیە لەو لێکۆڵینەوانەدا لەبابەت ناونانی ڕەسەنی ئەو نەتەوەیە، وەك لەناو کۆڕەکانی جیهانی دا دیارە کوردەکان سەربە کاردۆخی یەکانن، هەشە دەلێ کە دەگەڕێنەوە سەر کیرتی یەکان. درایڤەر ویستی ئەم دوو ناونانە بە هەموو ئەو ناوانەوە ببەستێتەوە کە لە ڕەنگە و ڕوخسارا لەگەلیاندا نزیك دەبنەوەو هەوڵی دا کەپەیوەندی ئیتمۆلۆژی نێوانیان و ناوی ئێستای کورد بدۆزێتەوە. هێشتا ئەو ڕایانە باون بەوەی کە کاردۆ - خ + وی دانیشتوانی کۆنی ناوچەی ئێستای بۆتانن.

دکتۆر جەمال ڕایەکانی کوردۆییف شی دەکاتەوە کە لەبابەت وولاتی کاردۆخی یەکانەوە چی وتوە، کە هەموو ئەو تیۆرانەی پەیوەندیان لە نێوان کوردی کاردۆخی نێوان هەردوو لاو نێوان کازداکای سۆمەری لەلایەك و نێوان ئەو ناولێنانەو زاراوەی سامی کاردۆ کە بە مانای بەهێز یاخود جەنگاوەر دێ، دۆزیوەتەوە پووچەڵ دەکاتەوە، ئەویش ئەو تیئۆرەیە کە درایڤەر لەمەوبەر پشتی پێ بەستووە هی ئەوە نیە لایەنگیری بکەین. چونکە درایڤەر کورد بەو کەسانە دەداتە قەڵەم کە جۆرە زمانێکی ئێرانی بەکاردێنن ئەم ڕایەش دوورە لەواقیع.

هەروەها کسینۆفۆن بەڕوونی وولاتی میدیا لەناوچە شاخاوی یەکان جیا دەکاتەوە، گریمان کە کوردەکان

راستەوخۆ دەگەڕێنەوە سەر کاردۆخی یەکان و بەکوردی قسەیان کردوە ئەو حەلە دەبێ ئەو تیئۆرە پشتگوێ بخەین کە کورد هەرنەبێ چ گەل چ زمان دەگەڕێنەوە سەر میدی یەکان هەروەکو مینۆرسکی لەو سالآنەی دوایی ژیانیدا ویستی بیسەلمێنێ. لەگەڵ ئەوەش دەبێ ئەوە بڵێین کە میدی یەکان کەم یا زۆر راستەوخۆ کاریان کردە سەر گۆڕینی ڕوخساری دانیشتوانی ناوخۆیی غەیری ئێرانی لەناوچە شاخاوی یەکانی ژووروی وولاتی نێوان هەردوو رووبارەکەو ڕۆژهەلاتی ئاسیای بچووك.

لەبەر ئەوە نابێ باوەر بەئێرانی یەتی کاردۆخی یەکان بکەین لەگەڵ گۆڕانی خاسیەتە نەتەوایەتی یەکانیان پاش سەدەیەك، سەرەرای ئەوەش کە ئەوان بەجیا لە تیرەکانی ئێرانی ناوبراون و نەسەربە وولاتی ئێران بوون نە ئەرمەن.

دکتۆر جەمال بەمەندەش ناوەستێ، بەڵکو کۆمەڵێك راو سەرچاوەی تریش شی دەکاتەوەو نەژادی کورد ساغ دەکاتەوەو دەمانخاتە ئەو قەناعەتە کە کوردەکان لە کۆمەڵێکی دیارکراودا نەهاتوون وەك کیرتی یەکان یاخود کاردۆخی یەکان یا کاداکا بەشێوەیێکی راستەوخۆ بەڵکو پەیوەندی یەکی ڕەگەزی و شارستانەتیان لەگەڵ گشت ئەو کۆمەلانەو دانیشتوانی کۆن و وولاتەکەیانەوە لە چەند قۆناخێکی دیارکراوی مێژوودا هەیە. هەروەها کورد شێوەیێکی گەشەسەندووی ناوی کادۆ یاخود کردۆ (قردۆ) نیە، وشەی کوردیش پێش گەلی کورد کەوتۆتەوە کەوا بەمانایەکی تایبەتی بەکارهاتوە، بەر لەوەی مەرجی نەتەوایەتی تێدا بێ.

بەشی چوارەمی لێکۆڵینەوەکان «دەوری کرت»ە لە مێژووی کوردا، دکتۆر مەکنزی لە راپۆتی سالآنەی کۆمەڵەی زمانان سالی 1961 ئەوەی باس کردووە کە «تاکە ئیشارەت پێدانی ئاشکراو روون لەبابەت کوردەکانەوە بەلای کۆنە نووسەرانی بەر ئەم سەدەیەمان وا دەردەکەوێ کە ئەوەی دوابەدوای یەکەوە هاتوە لەپۆلیبۆس و لیڤی و سترابۆوە کە لە کرتەوە دواون وەك دکتۆر جەمال دەڵێ بێ گومان مەبەس «کیرت»ە»، دوو مێژوونووس یەکەم لە زمانی توفیق وەهبی یەوە وایان باس کردوون کە تیرهاوێژی چەکداری بەدەگە بوون لە سوپاکانی مادی و ئاسیای بچووکدا. کەچی ئەوی سێیەم ناوی ناون «شاخاوی سەرەتایی دانیشتووی وولاتی مادو ئەرمێنیاو فارس «ئەمە ئەو رایە دەسەلمێنێ کە لە نووسینەکانی ئەو رۆژهەلآتناسانەوە هاتووە کە دکتۆر جەمال لەمەوپێش ناوی هێناون.

لە راستیدا دەنگوباسی کیرتی یەکان لەتەك تیرەی دیکەوە هاتوون وەك کاردۆسی یەکان و ماردی یەکان و دیلم و تیرەی تر کە لە ناوچەکانی ئەترۆپاتینا «ئاذەربیجان»و ئەو لەوەرگایانەی کە کەوتونەتە باشووری دەریای قەزوین، هاتوچۆیان دەکردو ڕێکخستنی کۆمەلآیەتی و ئابووری کە مۆرکی شوانکاریی جەنگاوەریان پێك هێنا «ئیمپراتۆریەتەکانی ئێرانی و رۆمانی زۆر جار سوودیان لێ بینین».

دکتۆر جەمال رای وایە کە هەرچەندە رووداوی راست کە پەیوەندی بەتیرەکانی کیرتی یەوە هەیە لە تۆماری سیریانی مەسیحی نووسراونەتەوە کەچی چ سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو نیشتمانێکی دیاریکراوی ئەوانە نیشان نادات دەنگوباسەکانیان وەك سوارەکانی تیرەو خێلی ڕەوەند هاتوون لە رۆژئاوای ئاسیای بچووکدا بلآوبوونەتەوە «واتە ناوچەکانی ژووروی وولاتی ئێستای کورد» کە لەبەر چەند هۆیەکی ئابووری و سیاسی بووە مەلبەندێك بۆ بلآوبوونەوەی چەند کۆمەڵە شوانکارەی جەنگاوەر، بە چەند دیالێکتیك دەدوێن زمانەکەیان دەگەڕێتەوە سەر جیهانی زمانی هیندو ئیرانی کە بووە بنچینەیەکی دیالێکتیکی کرمانجی ژووروو لە سەردەمی میدی یەوە.

مینۆرسکی لەکاتی خۆی دا لەو باوەڕەدا بوو کە کوردەکانی زازا لەژووروی دیاربەکرەوە تا سنووری پالوو دەرسیم بە خۆیان دەوت دیملی، هێشتاش ئەوانەی بەدیالێکتیکی زازای کوردی ئێستا دەدوێن بەخۆیان دەڵێن (دیملی)، وا دیارە خێلی (دومبولی) لە ناوچەی خۆی (کوردستانی ئێران) لەسەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە پەیوەندی

بەو دیملیانەوە هەیە، بەرمەکی‌یەکان بەوە ناویان دەرکردبوو کەسەر بە خێڵی «دنبلی»ن.

کارل هەنك ئەوە دەسەلمێنێ کە هاوجووتی ناولێنانی دیملی «ناوی نەتەوایەتی زازا»یە، هەروەها ناولێنانی زمانەکەیان لەلایەن ئۆسکارمانەوە دەستی پێ‌کرد، ئەنترانێکی ئەرمەنیش لە شی‌کردنەوەی زمانەوانی‌دا گەیشتە هەمان ئەنجامەکانی ئۆسکارمان. ئەو لێکۆڵینەوانەی کە کراون ئەوە دەسەلمێنن کە زازا خۆیان بە «دیملی» ناو دەبەن و دیالێکتیکی غەیری تورکی دەدوێن. کەچی لەکاتی خۆیدا گەریدەی عوسمانی ئۆلیا چەلەبی بەهەڵە چووە کە گوایە ئەو «دومبلی»یانەی لەدەوروبەری گۆمی ئۆرمیاە دەژین تورکمانن و بەتورکی دەدوێن. بەڵام گەریدەی ئێرانی «نعمت الله شیروانی» توانی واقیعی (دونبەلی) ئەوانەی لەناوچەی خۆی‌دا هەن ساغ بکاتەوە کە کوردن.

لەڕاستیدا (دیلم) لە کۆنەوە لەناوچەی بەرزی گیلان، باشووری دەریای خەزەر تا گەیشتە شاخەبەرزەکان لەباشوور تاسنووری تەبرستان دا هەبوو، بەڵام ئەم ناوە لە ڕووی جوگرافی‌یەوە پەرەی‌سەند، هەروەها خێڵە دێلمی‌یەکان بەرەو ڕۆژئاوا کۆچیان کرد، بۆلیبۆس وەك دراوسێی باکووری میدیاو نزیك کاردۆسی‌یەکان و میتانی‌یەکان ناوی هێناون.

دکتۆر جەمال ڕووناکی دەخاتە سەر ئەو ڕاپۆتەی درایڤەر ئەگەر ڕاست بێ کە شوێنی جوگرافی وڵاتی کارداری سۆمەری لە باشووری گۆمی وان دیاری دەکات، ئەوە تارادەیێك لەگەڵ شوێنی کاردۆخی‌یەکان کە وایسباخ شوێنەکەی دیاری‌کرد بە پێی قسەکانی کسینۆفۆن، دەگونجا، کە ناوچەی بوهتانی ئەمرۆیە، بەڵام ئەم شوێنە پارچەیێك لە وڵاتی گوردۆیای پێك دێنێ کە سترابون ناوی بردوون. هەروەها لە ڕووی ساغ کردنەوەی ووشەی (جودی)یەوە کە کەشتی نوح لەوێ‌دا گیرساوەتەوە، دکتۆر جەمال دەگاتە ئەنجامی کە وەرگێرانی عەرەبی «گودی»یە، ووشەکەش لە ڕێگەی نووسەرە ئارامی‌یەکانەوە کراوەتە عەرەبی، ئەو چیا بەرزەش لە وڵاتی قردۆیە کە بەناوی ـ گودك ـ ی ئەرمەنی بەدەستمان گەیشتووەو شوێنەکەی نزیك جودی، زۆزن، ئەویش زۆزان)ی کوردی‌یە کە بەمانای لە وەرگای بەرز دێت. لە لایەکی‌ترەوە ناوهێنانی «ئارارات» لەکتێبی «العهد القدیم» ڕاستی‌یەکەی پێشوو هەڵناوەشێنێتەوە ئەگەر زانیمان مەبەست لەناوی ناوبراو وڵاتی ئۆراتۆیە کە لە ناو بەرزاییەکانیدا ئەم «گودك»ە دەگرێتەوە. لە حاڵەتی هاوجووتی ووشەی «قردۆ» لەگەڵ ناولێنانی (کورد) لەلایەك و بڕواکردن کە گەلی کورد یا (کورد) مادبین وەك مامۆستا توفیق وەهبی سوورە لەسەری لەلایێکی‌ترەوە، ئەو حەلە ووشەی (قردۆ) بەشێوەیێکی مەنتیقی میدی (مادی)یە، ناوچەکە خۆی بەشێك دەبێ لە وڵاتی مادی‌یەکان «میدیا».

یوسف فلاوی وتاتسید لەو ڕایەدان کە خێڵە جەنگاوەرە بەهێزەکانی ئالان لە قەفقاس و میدیاو ئاسیای بچووك و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی‌دا بڵاوبونەوە، هیچ سەیر نیە کە بە چەند کۆمەڵێکی خێڵەکی جەنگاوەری‌تر گەیشتوون کە سەربە هەمان جیهانە لە ڕووی زمان و ژیاری‌یەوە وەك دێلم و ماردی‌یەکان و غەیری‌تر لە کورد. لەبەر ئەوە ئێمە دەتوانین پێشبینی بەشدارکردنی خێڵەکانی ئالان بکەین لە دەرکەوتنی چەکەرەکانی نەتەوایەتی کوردی پەیوەند بە مەسەلەی زمانەوانی‌و ئەدەبیاتەکانی، سەرەرای ئەتنۆگرافی دانیشتوانی ژووروی کوردستان، چاکترین بەڵگەش بۆ ئەوە دەوڵەمەندبوونی ئەدەبی کوردی کرمانجی ژووروو»ە بە داستانی شیعری مەردایەتی‌و جەوانمەردی کەشەخسیەتی ئالانی «مەم» دەوری تیادا دەبینێ.

لە ڕاستیدا حەوت گوندەکەی کورد کە ناویان لەکتێبی «سنووری جیهان»دا هاتووەو لە دەشتەکانی ئەندخوذی (ناوەڕاستی ئاسیا) بەر لە سەدەی دەیەمی زایینی‌دا هاتووە پاشماوەی ئەو یەکە ئالانیانەن کەکۆچیان بۆ ڕۆژئاوا کردو لەگەڵ خێڵی خاوەن زمانی ئێرانی تێکەڵاو بوون.

دکتۆر جەمال تیۆرەکەی هەریەك لەنۆلدکەو هارتمان و

وایسباخ ڕاست دەکاتەوە کە لە بابەت گیرتی‌یەکانەوە دەریان بریوە کە باپیرانی کورد تەنیا کیرتی‌یەکان نین، بەڵکو دەورێکی گەورە دەبینن لە تەواوکردنی دەرکەوتنی نەتەوەی کورد لەسەر شانۆی ڕووداوە مێژوویی‌یەکان لەژووروی وولاتی نێوان دوو ڕووبارەکەو ڕۆژهەلاتی ئەنەزۆڵدا، سەرەرای دانیشتوانی دیالێکتیك لێك نزیك کە زەمانێکی پێشتر تیادا دانیشمەندبوون کە توانیان خۆیان بەسەر زمانی ناوخۆیی بچەسپێنن کە سەر بە جیهانی هیندو ئەورووپی نین و گومانی تێدا نیە کە کرتاوی‌یەکان بوونە بەشێك لە نەتەوەی کورد پێش دەرکەوتنی ئیسلام.

دوابەشی کتێبەکە لە «چەمکی کوردو کرمانج لەمێژوودا» دەدوێ کە کورد، ناوی نەتەوەی گەلی کوردی دانیشمەندە لەو وولاتە شاخاوی‌یەی کە ڕۆژهەلاتی تورکیاو ڕۆژئاوای ئێران و ژووروی عیراق و چەند بەرزەکیکی زەقە لە ژووروی سوریادا، ئەم وولاتەش پێی‌دەوترێ کوردستان واتە وولاتی کوردان ـ کورد ـ سنووری رامیاری نیەو لەنەخشەی‌میریدا سنووری بۆ نەکراوە، هەر بەشێکیان لەو بەشانە پارچەیەکە لەو دەوڵەتانەی ناومان هێنان. ناوی کورد بە چەند شێوەیێکی جیاواز هاتووەو بە پێی خاسیەتی زمانی گەلە دراوسێ‌یەکانی کورد، بۆ نموونە: (کرد) کۆیەکەی (أکراد)ە لەکن عەرەبەکان و (کورد) کۆیەکەی «کوردەها»یە لەکن فارسەکان و (کیورت) کۆیەکەی «کیوتلر»ە لەلای تورکەکان.

بەلام کوردەکان خویان نەتەنها کوردەوە ناوی (کورمانج یاخود کرمانج) لەزۆر ناوچەی ژووروی وولاتەکەیان دەنێن و (کورمانجی یا کرمانجی) لەزمانی نەتەوایەتیان دەنێن. بەلام پەرەسەندتی ڕۆشنبیریو گەشەکردنی پەیوەندیی ئابووری لەوولاتەکەیان پشتگیری ناولێنانی یەکەم (کورد)یەکەن کەبەرەبەرە شوێنی گونجاو و لەباری خۆی لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا کردۆتەوە، سەرەرای بەکارهێنانی لەدەرەوەی کوردستاندا تەنیا بەو ناوە. ئەوەی کەزانراوە کورد لەلایەنی جیاجیاوە واتای ناوێکی گشتی کۆمەڵێك مرۆڤایەتی کە خاوەن خاسیەتی نەتەوایەتی دیارکراوە بە چەند قۆناخێکی مێژوویی ئاڵۆزو تێك ئالاودا تێپەریوە، بە چەند گۆرانێکی جۆریەتی بەسەر چەمکی ئەم ـوەدا هاتوە. بۆ ڕاستی ئەمەش دکتۆر جەمال ئەوەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە وشەی کورد بەر لە وشەی (کرمانج) بووە، وشەی (کورمانج) لە هیچ سەرچاوەیەکی سریانی یا عەرەبی یاخود ئەرمەنیو زمانی‌تر تۆمار نەکراوە (کورد) وشەیێکی کوردیی ڕووتە هەر تەنیا لەلایەن کوردەکانەوە خۆیان تۆمارکراوەو ناوی نەتەوەیی گەلی کوردە لە زمانی کوردیدا، کرمانج چینێکی دەسەلات بەسەر سەپێنراوە لە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی کورد وەك وشەیێك لەگەڵ دەرکەوتنی دەرەبەگایەتی لە کوردستان و گەشەسەندنی پەیوەندی‌یەکانی بەرهەم هێنان تیایا لە ژیانی شوانکاریو کۆچەری‌یەوە بەرەو دانیشمەند بوون گیرسانەوە، دەرکەوتوە.

«وابزانم هێشتاش لە هەندێ ناوچەدا وشەی کرمانج باوەو بەکار دێ، لای شارستانی خەڵکی لادێو گوند بە کرمانج دەدرێتە قەڵەم. ك. غ».

بەم جۆرە چەند تروسکەیێك ڕووناکیمان خستە سەرکتێبە بەنرخەکەی دکتۆر جەمال رەشید کە گومانی تیا نیە بەگیانێکیَ زانستیو مەوزووعیانە لە زۆر شتی کۆڵیوەتەوە کە پەیوەندیان بەزمان و خاك و نەژادی کوردەوە هەیەو بە پێی لێکدانەوەو شی‌کردنەوەی خۆی ئەو ڕایانەی دەربارەی کورد وەتراون و ناچنە خانەی ڕاستیو بە بەڵگەی پتەوی مێژوویی پووچەڵی کردوونەتەوەو، ئەو ڕایانەی کەبەلایەوە مایەی پشت پێ‌بەستن و جێی متمانەن پەسندی کردوون. ئەم چەند لێکۆڵینەوەیە بۆ ئەوەمان رادەکێشێ کە زۆر وشەو زاراوەو ناوی ناودارو گەورە پیاوان و بنەماڵەو تیرەو هۆزی دیارو سەربەرز لەبنەچەدا کورد بوون بەلام گۆڕانیان بەسەرا هاتوەو لە سەرچاوەکەی خۆیان دوورکەوتۆنەتەوە یاخود وا دراونەتە قەڵەم کە کوردنین، ئەمەش لە ڕاستیدا پێشێل کردنی تەواوی واقیعی مێژوون و پێویست بە شی‌کردنەوەی زانستانە دەکات.

ئەم کتێبەی دکتۆر جەمال مایەی لێکۆڵینەوەو دەمەقاڵی درێژە، کە گفتوگۆیەکی زۆری لەسەر بکرێو شیاوی تۆژینەوەی گەلێ وشەیە کە بخرێنە بەرتیشکی زانیاری. کتێبێکی ئاوا هەڵبەتە شوێنی دیارکراوی خۆی لەناو کتێبخانەی عەرەبی دەکاتەوەو بەم کارە نووسەر خزمەتێکی گەورەی نەتەوەی کوردی کردەوەو شیاوی ئافەرین و سوپاسە، هیوادارم کە لەو بوارەی بۆی لواوەو تیایدا پسپۆری هەیە لەبەرهەمی بەپێزو ڕەنجی هێژای خۆی خوێنەری کوردیش بێ‌بەش نەکات.[1]

د. کامل بەصیر

# ووشەیێك بۆ نووسەرە بەرێزەکانمان

دەستەی نووسەران کە سازکردنی گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)یان گرتە ئەستۆ، ئامانجی سەرەکییان بوژاندنەوەو پەرەپێدانی زانیاریی نەتەوایەتی و نیشتمانی رەسەن بووە.

وەدی هێنانی ئامانجی وەهاش پێویستی بە دوو مەرجی یەکدگیر هەیە: ـ

یەکەم: دابین کردنی گۆڤارەکە بۆ هەموو پێنوسێکی کوردی پەیامدارو ملتزم وەکو کێڵگەیێکی بەربڵاو.

بۆ ئەوەی لە زەمینە بە پیتەکەیدا دەیان گوڵی بیری رەنگاورەنگ و جیاواز ئازادانە بپشکوێن و بشنێنەوە.

دووەم: بڵاوکردنەوەی توێژینەوەی ئەکادیمی کە بەپێی رێو شوێنێکی زانستی لە رووی سەرچاوەو سروشتی بابەت و چۆنیەتی نووسین و گەیشتن بە مەبەست ئەنجام دراوە ئەم دوو مەرجە ـ هەڵبەت ـ پێکەوە ئەوە دەگەیەنن کە نووسەر لە رووی بیروراوە چەند سەربەست و سەرفراز بێت لە سووچی بەرهەم هێنانی کارەکەیەوە دەبێ خۆی بە هەل و مەرجێکەوە ببەستێ.

ئەم هەل و مەرجەش پەیوەندی بە چەمەگ و مفهومی زاراوەی توێژینەوەو زاراوەی رێبازەوە هەیە.

کەوابوو توێژینەوە چی‌یەو رێباز چلۆن پەیرەوی دەکرێت؟

توێژینەوە بابەتێکە لە بیروکەیێکی دەست نیشان کراو دەکوڵێتەوە پشت بە سەرچاوەو بەڵگە دەبەستێ بە مەبەستی گەیشتن بە راستی.

رێبازیش کۆمەڵە دەستووررو بنەواشەیەکە دەربارەی ئامادەکردنی سەرچاوەو تۆمارکردنی دەق و شی‌کردنەوەی زانیاری‌و خستنە رووی ئەنجام، پێویستە بە وردی پەیرەوی بکرێن.

ئەم چەمەگەی توێژینەوەو رێباز هەرچەندە بە گشتی جێگای مشتومڕ نی‌یە، بەڵام تا رادەیێك بە هۆی جیاوازی پسپۆڕی‌یەوە دەگۆڕێ‌و لە هەر بابەتێکی زانستیدا رەنگێکی تایبەتی وەردەگرێت.

هەروەها ئەنجام دانی توێژینەوەو پەیرەوی کردنی دەستووررو بنەواشەکانی رێباز بە گوێرەی کەسایەتی بیری توێژەرەوە رەنگ دەداتەوە، بۆیە رەگەزەکانی توێژینەوەو رێبازی زانستی بەسەر دوو رووکاردا دابەش دەکرێن:

یەکەم: رەگەزە ناوخۆیییەکان کە پەیوەندی‌یان بە چۆنیەتی هەڵبژاردنی سەرچاوەو شی‌کردنەوەی دەق و گەیشتن بە مەبەستەوە هەیە.

دووەم: ڕەگەزە ڕواڵەتیەکان کە بەندن بە ڕێکخستن و دەرهێنانی توێژینەوەکەوە. ڕەگەزە ناوخۆییەکان واتە: (العناصر الداخلیة للبحث ومنهجه) بە ئاسانی مل کەچی دەست نیشان کردن و ژماردن نابن، چونکە لە توێژەرێکەوە بۆ توێژەرێکی دی ـ هەروەکو وتمان ـ تا ڕادەیێك دەگۆڕێن. کەچی ڕەگەزە ڕواڵەتییەکان واتە: (عناصر البحث الشکلیة وخطته). بە وردی دەست نیشان کراون و پێویستە هەموو توێژەرێك هەنگاو بە هەنگاو پەیرەوییان بکا.

ئێمە کە لە سەرەتادا هێمامان بۆ ئامانجی سەرەکیمان کردو مەرجەکانی وەدی هێنانی ئەم ئامانجەمان خستە ڕوو لێرەدا دووپاتی دەکەینەوە کە پەیرەوی کردنی ڕەگەزە ڕواڵەتیەکانی توێژینەوەو ڕێباز لە لایەن نووسەرە بەڕێزەکانی گۆڤارەکەیانەوە گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) ناشێ بە جۆرە کۆت و زنجیرێك لە قەڵەم بدرێت، چونکە جگە لەوەی سازکردنی گۆڤارەکە بە ڕێك وپێکی دەهێننە بەرچاو، ئەرکی سەرشانی نووسەرەکانیشمان سووك دەکەن و بە ئاسانی دەیان گەیەننە مەبەستە زانستییەکانیان.

سەر ئەنجام ئێمە کە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێین، تەنیا پێویستییەکانی سەرشانمان دەهێنینە دی بە چەسپاندنی ئەم خاڵانەی خوارەوە بۆ نووسەرە بەڕێزەکانمان دەربارەی ڕەگەزە ڕواڵەتییەکانی توێژینەوەو ڕێبازی زانستی:

یەکەم: چەسپاندنی سەردێڕو عنوانی توێژینەوەکە بە جۆرێکی وەها کە بە وردی لەگەڵ ناوەڕۆك و مەبەستەکانیدا بگونجێت.

دووەم: نووسینەوەی پێشەکیەکی کورت دەربارەی بابەتی توێژینەوەکەو هۆی هەڵبژاردنی و دەست نیشان کردنی ئامانجە زانستییەکەی و خستنە ڕووی ئەو توێژینەوانەی کە لەمەوپێش لەم ڕووەوە بڵاوکراونەتەوە، بۆ ئەوەی خوێنەر بەر لە هەموو شتێك بزانێ چ جۆرە باسێك دەخوێنێتەوەو چلۆن شرۆڤەیێك وەچنگ دەهێنێ.

سێیەم: یەکالاکردنەوەی هەموو خاڵێکی توێژینەوەکە بە ڕیزکردنی بیرۆکەکانی بە پێی ڕێکخستنێکی مێژوویی واتە: بەر لە توێژەر هەرچی بیرۆکە دەربارەی خاڵە باسکراوەکەی هەن لە کۆنترینیانەوە پێویستە یەکە یەکە شی بکرێنەوەو هەڵبسەنگێنرێن، ئەمجا بیرۆکەی تایبەتی توێژەر بخرێتە ڕوو.

چوارەم: دانانی هەموو دەقێکی وەرگیراو لە نێوانی دوو کەوانەداو هێماکردن بۆ گشت بیرۆکەیێکی سوود لێ وەرگیراو.

پێنجەم: چەسپاندنی ژمارەیێك لەسەر دەق و بیرۆکە وەرگیراوەکەو دووبارەکردنەوەی ئەو ژمارەیە لە کۆتایی توێژینەوەکەدا بە سەردێڕی سەرچاوەکان، بۆ ئەوەی زانیاری پێویست دەربارەی دانەرو لاپەڕەو بەرگ و شوێن و کاتی ئەو کتێبانە بنووسرێنەوە کە توێژەر بەکاری هێناون و لە توێژینەوەکەیدا کەڵکی لێ وەرگرتوون.

شەشەم: هەڵهێنجاندنی ئاکامەکانی توێژینەوەکە بە چەند خاڵێك لە کۆتاییدا بەسەر دێڕی (ئەنجامەکان).

حەوتەم: ڕیزکردنی سەرچاوەکان بە گوێرەی ئەو ژمارانە کە لە دوو توێی توێژینەوەکەدا چەسپاون بە سەردێڕی (سەرچاوەکان).

دەستەی نووسەران کە ئەم خاڵانە بۆ نووسەرە بەڕێزەکانی دەچەسپێنن دووپاتی دەکەنەوە کە بڕیاردانی بڵاوکردنەوەی توێژینەوەکان، پاش هەڵسەنگاندنیان لەلایەن پسپۆڕێکی زانستی و شارەزاییێکی زمانییەوە، وەردەگیرێ، بۆیە تکامان وایە بە ووردی ناونیشانیانمان بۆ بنووسن، هەتا بتوانین بە ئاسانی پەیوەندیتان پێوەبکەین.

لەخوارەوە دەقی ئەم نامەیە بلاودەکەینەوە، کە لە (زانکۆی بەغدا)وە پێمان گەیشتوە، ناوەڕوکەکەی بریتیە لە دان نانی (زانکۆی بەغدا) بە گۆڤاری (ڕوشنبیری نوێ) بە گۆڤارێکی ئەکادیمی و زانستی

بسم الله الرحمن الرحيم

الجمهوريه العراقيه

وزارة التعليم العالي والبحث العلمي
جامعة بغداد
سكرتارية لجنه الترقيات العلميه

العدد / ٢٧٧٧٧
التاريخ / ١٩٨٥/١٢/٨

الى / كافه العمادات
كافة المراكز التابعه للجامعة

م / اعتماد مجله

تحية طيبه

قررت الهيئه العلمية بقرارها ( رابعا - د - أ ) المتخذ بجلستها السادسه المنعقده في ١٩٨٥/١١/١٧ اعتماد مجلة ((روشنبيرى))) المثقف الجديد التي تصدرها وزارة الثقافه والاعلام / دار الثقافه الكرديه - بغداد لاغراض الترقيات العلمية لاستيفائهما متطلبات الفقره ( ٢ ) من تعليمات وملاحظات عامة •

راجين العلم واشعار منتسبيكم بذلك •

مع التقدير •

الدكتور حمدي عبد العزيز الفياض
المساعد العلمي لرئيس الجامعه

نسخه منه الى /
وزارة التعليم العالي والبحث العلمي - سكرتارية وكيل الوزارة
وزارة الثقافه والاعلام / دار الثقافه الكرديه - بغداد / للعلم • مع التقدير
كافة الجامعات العراقيه / مكتب الساده المساعدين العلميين للعلم • مع التقدير
سكرتارية الهيئه العلمية / اشاره لقرار الهيئه اعلاه • مع التقدير
سكرتارية لجنه تنضيد البحث العلمي والتدريب / مع التقدير
سكرتارية لجنه الترقيات العلمية / ٥
ملفة الكتب الصادرة

Roshinbiry Nwo
Periodcal Magazine for
Scientific researches
Issued: by Kurdish Culture and Publication House
Ministry of Culture and intfomation
Baghdad - Iraq

رۆشنبیری نوێ
مجلة فصلية تعنى بالدراسات
تصدر عن: دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغداد



وێنەی بەرگی یەکەم

(زستانی سەری رەش)، بە کامیرای فارس سعدی.

بەرگی دووەم

وێنەی (منارەی چۆلی هەولێر)، لە سالانی پەنجادا

نرخی سالانەی 4 دینارە
نرخی 500 فلـسـه

